




# ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە

## لە 2001/1/1 تا 2007/10/31

## عەلی کەندی

بەرگی چوارەم - چاپی دووەم

بژارکراو و پترکراو

باشووری کوردستان - هەولێر

2709 - 2009

گەنجینەیەکی پڕ لە مێژووی ڕووداوی کۆمەڵگاکانی جیهان لەهەموو بوارەکان لەماوەی بیست سەدە دا




**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**

**بەرێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە**

ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

نووسینی: عەلی کەندی

دیزاینی بەرگ: دانەری مێژوونامەکە – عەلی کەندی

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا بۆ کۆمپیوتەر

بەرگ: بەرگی چوارەم ٢٠٠٩

چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٩

چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان - هەولێر

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نرخ: بۆ هەرچوار بەرگ (٢٠٠٠٠) دینارە

لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ ژمارەی سپاردنی(٢٢٥٥) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.


-----------------------


بۆ هەر رەخنەیەك یان پێشنیارێك یان هەر زانیاریەك لە هەڵەو بەسەرچوون ئاگادارمان بکەنەوە بە ژمارەی مۆبایـــــل/ ٤٥٤٨٠٩٨ ، یـــــان ژمـــــارەی ئاریـــــافۆنی / ٠٦٦٢٥٣٣٥٢٢- یـــــان ئیمێلی:Alikendi@yahoo.com

# دەسپێك بۆ چاپی دووەم

لە گەڵ پەرەسەندن وپێشکەووتن و گەشەکردن و بووژانەوەی بەردەوام بە پێی تێپەر بوونی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکانی مرۆڤایەتی لە هەموو بوارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و ئاینی و جووگرافی و زمان و مێژوو وکەلتوورو داب و نەریت و شووێنەوارو شارستانیەت ، و بازرگانی و پیشەسازی وکشتووکاڵ و .... هی دیکە .
ئەمەش پێویستی بە زانیاری تەواو هەیە لەم بوارانەدا ، لە پێناو هەڵسەنگاندن و شێکردنەوەی رووداو بەسەرهاتەکان لە هەموو بوارە جیاجیاکان و گوونجاندنی لەگەڵ ئێستا دا .؟
ئەویش لە پێناو هێنانە کایەوەی بارێکی لە بارەو گوونجاوتر بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی، بە دابین کردن و سەقامگیرکردن و مسۆگەر کردنی داد پەروەری کۆمەلایەتی و دانان بە مافی مرۆڤ و چارەسەر کردنی کێشە تەشەنە دارەکانی لەو بوارانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن ، بە تایبەتی لە بوارەکانی نەتەوەیی ونیشتمانی و زمان و مێژوو و مێژووی جووگرافی و کەلتوور داب ونەریت و شووێنەوارو شارستانیەت وئاین وچارەسەر کردنی لە رێگەی دەست لەناو دەستدا و رازی بوون بە بەرامبەرەکە ، کە سەرچاوەی چارەسەری هەموو کێشەکانە ، بە دوورکەوتنەوە لە هەرەشە لێك کردن و پەلاماردانی یەکتری و بە پێچەوانەشەوە لە رێگەی گفتووگۆو دایلۆگ ودانی مافە زەوت کراوەکان لەلایەن دەسەلاتداران .
جا من نامەوێ بە درێژی بچمە ناو باسەکەم ، بەلکوو دەسپەکەی چاپی یەکەم وبەرگی یەکەمی مێژوونامەکە ، ئاماژەم بە هەموو لایەنەکان کردووە بە شێووەیەکی لە بار لە بوارەکانی پەرەسەندن و پێشکەووتن ، بە پێی تێپەربوونی قۆناخەکان .
وادیارە ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکە جێگای خۆی کردۆتەوە لە دەرونی خووێنەوەران وسەراکەوتنی بە پلەی ٨٥ ٪ ی بە دەست هێناوە ، لە سەر باری کوردو کوردستان لەو هەموو بوارانەدا . بەلگەش بۆ ئەمە بەرگی یەکەمی مێژوونامەکە بە تیراژی ٤٥٠٠ دانەی لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی هەرێم لە باشووری کوردستان کڕاوەتەوە و بۆتە سەرچاوەیەکی سوود لێوەرگرتن وەك سەرچاوەیەك . کە بووە هۆی ئەوەی کە داواکاری زۆری لە سەر بێت .

جا منیش بەو پەری دڵخۆشیەوە ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکەم ، لە چوار بەرگدا دەخەمە بەردەستتان بە شێوەیەکی تێرو تەسك لە هەموو بوارەجیاجیاکان . بە ناوێکی دیکە کە – ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە – یە ئەمەش لە سەر داوای مامۆستایانی شارەزا بە هۆی لە خۆگرتنی هەموو بوارێك بەتایبەتی لە سەر کوردو خاکی کوردستان .

وەك بوارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و ئاین و جووگرافی و زمان و کەلتوورو مێژوو شوێنەوارو ئابووری و بازرگانی وکۆمەلایەتی و رۆشەنبیری و زانست و ئەدەب و گەردوون و یاساو شەرو ئاشتی و بە بەڵگە نامەکان . ئافرەت و رووداوەکانی تیرۆرستەکان و فرۆکەو پزیشك و .... ئەوەی بتەوێ لە بەر دەستت دایە لە ناوەرۆکی ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکەدا .

کە بەرگی یەکەم لە ١/١/ ٠٠٠١ دەست پێدەکات تا ٣١ / ١٢/ ١٩٠٠ ، هەروا بەرگی دووەم لە ١٩٠١/١/١ دەست پێدەکات تا ١٩٥٠/١٢/٣١ ، بەرگی سێیەم لە ١٩٥١/١/١ دەست پێدەکات تا ٢٠٠٠/١٢/٣١ ، هەروا بەرگی چوارەم لە ٢٠٠١/١/١ دەست پێدەکات تا ٢٠٠٧/١٠/٣١ .

لە هەمان کات بە پێی پێویست وێنەکانیشی لەگەڵ دانراوە لەگەڵ نەخشە جیاجیاکان بە پێی رووداوو بەسەرهات و ئەنجام دانی بەرۆژو مانگ و ساڵ .

بەلام بۆ ئەوەی وێنەو نەخشەکان دووبارە نەبنەوە دەتوانرێت لە جێگەی دیکە سەیری بکەیت لە ناوە رۆکی ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکەدا . لە بەر ئەوەی دانەنراوە ، یا وێنەکە دەست نەکەوتووە یا وێنەکە زۆر کۆن بووە ، لە هەمان کات نەم ویستووە وێنەکان دووبارە ببنەوە . وەك بەڵگەیەکی راست و دروست و رێك و پێك لەم کتێبە دانراون .

لە هەمان کات داوای لێبووردن لە خوێنەرانی هەڵگری ئەم کتێبە دەکەم لە هەر کەموو کوریەك ، لە بەر ئەوەی مرۆڤ گەر هەڵە نەکات پێش ناکەویت .

لە کۆتایی هیوادارم خزمەتێکی بچووکی کتێبخانەی کوردی و خووێنەری کوردم کردبێت لە کوردستان و وولاتانی دراوسێی کوردستان و هەرێم و ناوچەو جیهان .

**عەلــی کەندی**

نووسەرو رۆژنامەنووس

دانەری ئینسکلۆپیدای مێژوونامە

٣١ / ١ / ٢٠٠٩

# بەرەو چەندین ئینسکلۆپیدیا کە هەموو لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە

## پارێزەر/ تارق جامباز

ئەم خەمخۆریە تاقە کەسییە کە لایەن مامۆستا عەلی کەندی ئەنجامدراوە شایانی سوپاس و پێزانینە ، چونکە پشوویەکی فراوان و ماوەیەکی زۆرو ئارامیەکی ئەیووبیانەی گەرەکە ، لە بەر ئەوەی ئەم ئینسکلۆپیدیایە چەندین ئینسکلۆپیدیا لە خۆدەگرێ .

لە وولاتاندا بۆ هەر بوارێك لەم بوارانەدا دەزگایەك بە کۆمەلێ پسپۆرو شارەزاو لێزان بەماوەیەکی دیاریکراو بەمەرجێ هەموو کاتێکیان بۆ جۆرێك لەجۆرەکانی ئینسکلۆپیدیا تەرخان دەکەن وەك ( ئینسکلۆپیدیای زمان ، فۆلکلۆر ، سیاسەتمەداران ، شاعیران ، رۆژنامەنووسان ، ...هتد ) ئەم ئینسکلۆپیدیانە لە کتێبخانەکانە و لەسەر تۆڕی مالپەرەکان هەن و هەروەختێ یەکێك ویستی لە چ بوارێك پێویستی پێی هەبێ ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ ، بەلام بەداخەوە لایەنی پەیوەندار لە کوردستان چ حکوومەت و دەزگاکانی تایبەتمەند نەمزانیووە پلانێکیان بۆ ئەم بوارانە هەبێ کە بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی زانیارییەکان لەلایەن خەمخۆرانەوە بەووردی و قوولی بنووسرێنەوەو پێداچوونەوەیان بۆ بکرێ ، ئینجا چاپ و بلاوبکرێنەوەو جارێ خەرمان بەرەکەتی زمانی کوردی بەهەموو شێووە زارەکانی کۆنەکراونەتەوەو تاکو لەبەردەست دابێ ، ئەوجا دەزانین چ زمانێکی زەنگین و رەنگینمان هەیە .

لە بەر ئەوەی زمان ناسنامەو گیانی نەتەوەیە هەر نەتەوەیەك بێ ، بۆیە هەرچەندی بایەخ و گرنگی و بەها بەزمانی کوردی و زمانی نەتەوەکانی دیکە کە لە کوردستان دەژین بدرێ هێشتا کەمە ، چونکە هێندەی تر هزرو رۆناکبیری و ووشیاری نەتەوایەتی پێگەیشتن و پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینێ و گەر خاك نیشتمان و وولات بێ ، ئەوا زمان گیانەکەیەتی و هەلگری ناسنامەی تایبەمەندیەتی لەنێوو زمانانی جیهاندا هەیە .

ئەندامی پەرلەمانی کوردسـتان
باشـووری کوردستان – هەولێر
٢٠٠٩/٨/١٠

# کارێـــکی کەلتـــووری مـــەزن

... ئەم کارەی پیشەسازییەی ووشە :

(( ئینسکلۆپیدیایە – مێژوونامە )) قەلأیەکی کلتووری مێژووی مەزنە ، وەکو قەلأکەی شاری مێژوو – هەولێر – ، هەردەم زیندووە .

بەڵێ ، کارگە ووشە سازیەکەی مامۆستا عەلی کەندی ، مەزنترین سەرمایەی کوردو کوردستان و مرۆڤایەتیە . لە لایەنی دارِشتن و زمانەوانییەوە ، خۆزگە باشتر بوایە .

مومتاز حەیدەری
باشووری کوردستان – هەولێر
٢٠٠٩/٧/٧

# پـــــــێشەکی

لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری مێرگ چەند تێبینیەکم لە سەر چاپی یەکەمی کتێبی – مێژوونامە – ی نووسەر – عەلی کەندی – نووسیبوو ، دیارە ئەمەش لە بایەخی بەرهەمەکەی کەم ناکاتەوە ، چونکە ئەگەر بزانم کتێبێك لاوازە و کەم بایەخە کاتی خۆم و خوێنەرانی پێ ناکوژم و هەر لە سەری نانووسم ، بەڵام دیارە کتێبەکەی نووسەر عەلی کەندی لەم جۆرە نییە ، پاش ماوەیەك عەلی کەندی بە تەلەفۆن پەیوەندی پێووە کردم و باسی لەوە کرد کە مێژوونامەکەی کردووە بە چوار بەرگ و دەیەوێت بۆی بەسەردا بچمەوە و پێشەکی بۆ بنووسم .

منیش خۆشحاڵی خۆم پێشانداو کاتێکمان بۆ یەکتر بینین دانا ، ئەوە بوو ئێوارەیەك سەردانی بارەگای کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستانی کردو دڵخۆش بووم بەوەی کە هاورێیەکی نوێم بۆ پەیدابوو ، بەڵام بینیم کە چوار بەرگەکە زۆر گەورەن و ژمارەی لاپەرەکانی زۆرە ، بۆیە داوای کاتێکی باشم کرد بۆ ئەوەی بتوانم پێداچوونەوەی بۆ بکەم ، بەڵام دیارە ئەویش بە پەلە بوو بۆیە بریارمدا لە کاتێکی کەمتردا ئەرکەکەم ئەنجام بدەم ، بەڵام بە هۆی سەرقاڵیم و کەمی کات و گەورەیی بابەتەکە لە چوار بەرگدا نەمتوانی بە تەواوی بەسەر بابەتەکەدا بچمەوە ، بۆیە لەوانەیە ئەم بەرهەمە وەکو بەرهەمێکی تر لە هەڵەی چاپ و هەندێ جاریش هەڵەی زانیاریش بەدەرنەبێت ، بەڵام لە هەمان کات کارێکی مەزنە بە ماندووبوونێکی زۆر ئەنجام دراوە . نووسەرێکی دڵسۆزی وەك عەلی کەندی پێی هەڵساوە ، کە پێویستە هان بدرێت و پشتگیری لێ بکرێ تاکو بەرهەمی زیاتر پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکات ، بە تایبەتی کە هێشتا کتێبخانەی کوردی لە زۆر بواردا هەژارەو، ئێستاش نەوەی نوێ لە کوردستانی ئێراقدا پتر هەر زمانی کوردی دەزانن ، بۆیە چاپکردنی کتێبی کوردیش لە هەموو بوارەکاندا بەشداریکردنە لە بەرەو پێشبردنی رەوتی رۆشنبیری کوردی ، بۆیە داوا لە خوێنەران و رەخنەگرانی کورد دەکەم کە بە بایەخەوە سەیری ئەم بەرهەمە

بکەن و بیخوێننەوە و لە سەری بنووسن و لایەنە چاك و خراپەكانی بە دیار بخەن ، تاوەکو گەر هەر کەم و کوریەکیشی هەبێت لە چاپەكانی تردا راست بکرێتەوە .
نووسەر كارێکی زۆر باشیش دەکات کە نووسینی خۆی پێش چاپ كردن بە خەڵكانی تر پێشان دەدات ، چونكە مرۆڤ ناتوانێت هەموو هەڵەكانی خۆی ببینێ ، لە كۆتایشدا هیوادارم کە عەلی كەندی ئەم توانا باشەی هەیەتی لە بواری کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی بەڵگەنامەی تایبەت بە مێژووی کورد و لێکۆڵینەوەی مێژوویدا بەكاربهێنێت . بەمەش بابەتەكانی نووسینی لە باشەوە بەرەو باشتر دەچێت و هەر نووسەرێکیش لە پرۆسەی نووسیندا بریتیە لە چەند قۆناخێك .

د . محەمەد عەبدوڵلا کاکە سوور
جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان و
سەرنووسەری گۆڤاری مێژوو
سەرۆکی بەشی مێژوویی ئێواران / کۆلێجی ئاداب لە زانکۆی
سەلاحەدین ٢٥ /٧/٢٠٠٩

# پێشەکی

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

فەرهەنگی زمان و ئەدەب و زانستی و هونەر بەهەموو بابەتەکانیەوە، هەروەها ئەنسیکلۆپیدیاو رێبەری هەموو شتێك و بیبلیۆگرافیای تایبەتی و گشتی لەگەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ نرخیان گرانترو پێویستیان زیاتر دەبێ. ئەگەر لەرۆژگاری ئەمڕۆی تەکنۆلۆجیاو ئەنتەرنێت و مۆبایل بیری کەسانێك بۆ ئەوە بچێ سەرچاوەکانی فەرهەنگی زمان و ئەنسیکلۆپیدیاو بیبلیۆگرافیا ئەو نرخەیان نامێنێ، یا کەس پێویستی پێ یان نابێ بەهەڵە چووە، چونکە هێشتا ئەم ئامارە تازە داهاتوانە بەسەرهات و کردەوەو پاشماوەی مەدەنیەتی چەندان هەزار ساڵەی ژیانی ئادەمزادیان تۆمار نەکردووە لەمرۆڤی نیاندرتالەوە تا ئادەمزادی سەردەم.

ئەمە ماوەییێکی زۆری دەوێ، جگە لەوەی ئەم ئامارانەش لەبەردەستی هەموو کەسێك نین، تەنیا خوێندەوار کەڵکیان لێ وەردەگرێ. ئەدی نەخوێندەوار لەسەر رووی زەوی ژمارەیان چەندە! نەك تەنیا ئەمە، بەڵکو بەتایبەتی لەهەموو رۆژهەلاتی ناوەڕاست و کوردستان ژمارەی نەخوێندەوار چەندە!

لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوانەی باسم لێوەکردن لەناو کۆمەڵی ئێمەی کوردەواری بایەخیان پێ نەدراوە، لەم لایەنەوە نامەخانەی کوردی هەژارە، لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێتەوە یەکێ لە مەرجە هەرە گرنگەکان ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك خۆیان بە نەتەوە (الأمة Nation) بزانن پێویستە تۆماری زمان و ئەدەب و مێژوو و جوگرافیاو کولتووری نەتەوەیی یان هەبێ، ئەوەی ئەم هەموو مەرجە کولتووریانە دەپارێزێ و رێکی دەخا ئەو کارەیە کە بەشێکە کەوتۆتە ئەستۆی عەلی کەندی.

تاقیکردنەوە لەناو کوردەواری ئێمەدا لەم بابەتەوە کەمە، ئەوەی کراوە لەو پلەیەدا نییە باوەڕی تەواوی پێ بکرێ، چونکە دوو هۆی سەرەکی دوژمنی ئەم جۆرە کارە زانستییانەن، یەکەمیان ئیدۆلۆجییەت و دووەمیان سۆزی نەتەوەیی (قەومی)، ئەم دیاردانە هەوێنی کاری داهێنانی ئەدەبی و هونەرین، بەلام پێویستە زۆر دووربن لە کاری لێکۆڵینەوەی زانستی، بەتایبەتی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیا. لەناو میللەتانی کەم پێشکەوتوودا شوێنەواری ئەم دوو ڕەوشتە سایکۆلۆجی و کۆمەلایەتیە تا پلەییێك دەمێنێ.

عەلی کەندی خۆی لەم کارە قورس و پڕ هەوەس و بە کەڵکە داوە، بۆ ئەوەی ئەم لایەنەی

نامەخانەی کوردی هەندێ دەوڵەمەند بکا. بەناوی ڕێز لێنانەوە پێی خۆش بوو دوو قسەی بۆ بکەم، منیش بەناوی ڕێز لێنانەوە پێویستە داواکاریەکەی بهێنمە دی.

ئەم کارەی دانەر بەبێ سەرچاوە نەگەیشتۆتە ئەنجام. ئەم سەرچاوانەش دەکرێن بە دوو بەشەوە، سەرچاوەی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی. ئەوانەی ڕۆژئاوا مەرجی ڕاستی و بابەتیان تێدا هەیە.

بەڵام سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان، بەتایبەتی کوردییەکان هەندێ جار جێی متمانە نین، چونکە ئیدیۆلۆجییەت و سۆزی نەتەوەیی تیایاندا کاری خۆیان کردووە، لەو کاتەی ئەو جۆرە فیکرو سۆزە پێویستە لەکاری لەم بابەتەوە دوور بکەونەوە .

هەر چۆنێ بێ ئەگەر شێوازی ئیدیۆلۆجی و عاتیفی لەهەندێ جێگە لەم کارە گرنگەدا بەرچاو بکەوێ دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان بەتایبەتی کوردییەکان، هەروەها ئەم دیاردەیە هەندێ جار لەسەرچاوە ئەوروپاییەکانیش دەکەونەبەرچاو، بەوەی ئەو کتێبانەی لەزمانانی ئەوروپاییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی لەهەندێ شوێن ئەمانەتی زانستیان تێدا وون بووە یا بەشێوەیێك دەسکاری کراون.

هەر چۆنێ بێ ڕۆشنبیری کورد عەلی کەندی کارێکی گەورەی کردووە، ئەمە تەنیا لە کتێبی "مێژوونامە"دا ناکەوێتە ڕوو، بەڵکو لەپێش ئەوە هەندێ کاری دیکەی لەم بابەتەوە بەرهەمی ئەو کۆششە بووەو بلاوکراوەتەوە. هەروەها لەکارەکەی دا بەردەوامە بۆ بەرهەمهێنانی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیای بەکەڵکی دیکە.

لەم مەیدانە گرنگەی کولتووری هەموو نەتەوەیێك عەلی کەندیش دەبێتە سەربازی نەناسراوی ئەو جۆرە کارە زانستیانە.

ئەمانە نەك تەنیا لای ئێمە، بەڵکو لەهەموو گێتی دا سوود بەخوێندەوارو ڕۆشنبیران دەگەیەنن، کەچی نووسینەکانیان دەبن بەسەرچاوەی بنچینەیی بۆ هەموو جۆرە بەرهەمێك، بەڵام ناویان ناچێتە ناو بیبلیۆگرافیای ئەو کتێبانەی خاوەنیان سوود لەکارە فەرهەنگیەکانیان وەردەگرن.

دەسخۆشی لەبەڕێز عەلی کەندی دەکەم، هیوام وایە لەسەر کارەکەی بەردەوام بێ، هەمیشە ئەوەی کردوویەتی بەکەمی بزانێ بۆ ئەوەی زیادی بکا.

**هەولێر : مەڵبەندی ڕووناکی**

**٤ ی مایسی ٢٠٠٧**

# دەسپێك بۆ چاپی یەکەم

خووێنەری بەڕێز :- ئەوەی دەیخەمە بەر دەستتان کارێکی مێژوویی گرنگە لە مێژووی ڕووداوەکانی کوردو کوردستان و وولاتانی جیهان لە ٢٠٠١/١/١ زاینی تاکوو ٢٠٠٦/٦/١ بەپێی قۆناخە تێپەر بووەکانی پەرەسەندن و پێشکەووتن و گەشەکردن لە هەموو بوارە جیاجیاکانی نەتەوەیی و نیشتمانی و رامیاری و ئابووری و سەربازی و زمان و مێژوو کەلتوورو داب و نەریت و شووێنەوارو شارستانیەت.

لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەرەو دامەزراندنی کەسایەتی تاك و خێزان و بنەماڵەو کۆمەڵگاو نیشتمان و نەتەووەو زمان و مێژوو و داب و نەریت و کەلتوورو شووێنەوارو بەرەو شارستانیەت، بەپێی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان ، کە هەر هەمووی لە ئەنجامی کێشەو ململانێی بەردەوام بووە چ لە ململانێی مرۆڤ لەگەڵ سرووشت و سەلماندنی بوونی خۆیی و چ لە ململانێی ناو خوودی مرۆڤایەتی . لەپێناو پێك هێنانی یەکەم:- نیشتمان و، دووەم :- نەتەووەو دووایی بە چەسپاندنی سنوورو دەسەلات و دەووڵەت و بەرەو دام و دەزگاکان .

کە کوردیش نەتەوەیەك بووە لەپێشەوەی بەر لە نەتەوەکانی دیکەی سەر زەوی لەناو ئەو کێشەوململانێیەدا خوولایتەوە ، کورد بەر لە ٢٨٤٥ ساڵ خاوەنی ٢٧ وویلایەتی خۆیی بووەو ٢٧ سەرۆك و شانشین دەسەلاتداریەتی نیشتمان و گەلەکەیان کردووەو بەردەوام بوونە لە پاراستنی دەسەلاتەکەیان ، کە پایتەختەکەیان هەمەدانی رۆژهەلاتی کورستان بووە، خاکی کوردستان و گەلەکەی سەرچاووەی یەکەمی بە دەست هێنانی باری پیشەسازی و کشتووکاڵ و بناسازی و بازرگانی بوونەو سەرچاووەی پەرەسەندن و پێشکەووتن و گەشەکردنی گەلانی دیکە بوونە . بە تایبەتی سۆمەری و بابلی و هەروا ،... هەتا

لـه بوواری نووسین بەهـەموو بووارەكـانی كـه بـەر لـەو مێـژووەی سـەرەوە لەسـەر خاكی كوردستان گەلەكەی نووسینو خوێندنی بەدەست هێناوە . لە بەرئەوەی مێژوو و جووگرافیا جەستەیەكی زیندووی هاوبەشن لە دوو رێگای هاوسەنگ بـە سەلماندنی بوونی یەكیان بۆ ئەویدیكە بە پێچەوانەش راستە.

جا هەر كارێكی سەربازی یاخوود نەتەوەیی . یاخوود جووگرافی و ئابووری ، كە رۆڵی بنەڕەتی خۆی هەبووەو هەیە لە كاردانەوەی لەسەر لایەنەكەی دیكە بـە هـۆی دابەش بـوونی كـۆمەڵگای مرۆڤایـەتی بـەدوو بەشـی دژ بەیـەكتر لەسـەرەتای سـەرهەڵدانی مـرۆڤ و كـۆتـایی نایـەت تـا كووتـایی مـرۆڤ ئـەویش بـه نـەمانی ژیـان لەسەر زەویدا .

زانستەكانی مێژوو سرووشتو كۆمەلایـەتی ئـەوەیان سـەلماندووە كـه مێـژوو گەنجینەیەكـەو بـاشو خـراپ دەچێتە نـاو لاپـەرەكانی... مێـژووی پەرەسـەندنی قۆناخە یەك لە دووای یەكەكانی مرۆڤایـەتی لـە كرداره نالـەبارو لـەبارەكان ... لـە نێووان چەووسانەووەو چەووسێنەرەوە ... لە داگیركردنو لـە رزگـار كـردن... لـە سـەركەووتنو لـە ژێركـەووتنو بەزانـدن... لـەئاوەدان كردنـەووەو لـە وێرانكـردن ... لـە دەووڵەمەنـد بـوونو لـە بەهـەژار كـردن... لـە بـوونو لـە مـردن... لـە سەرهەڵدانو لە تووانەوە ... لە قەدەخەكردنو لە ماوەدان ... لە دادپـەروەریو لە ستەمدیدەیی ... لەدزینو تالانكردنو لە یارمەتیدانو پێدانو دابین كـردن... لـە راسـت گـۆییو لـه ناراسـتیو فـرتو فێـل ... لەخۆشـیو لـه كارەسـات ... لەداگیركردنو لە ئازادكردندا.

ئەمانـە هەرهـەمووی بـەكاری مێـژوویی دەچـێتە ژوورەكـانی تۆمـاركردن هـەر یەكـەو لـــە لاپـــەرەكانی خـــۆی بـــەجیاو ، هـــەر یـــەكێش لەووانـــه بەیەكـــەوە بەسـتراووەنەتەووەو هێـزیش نیـە بتووانـێ یـەك دێـر لـە دێـرە تۆماركراوەكـانی مێژووی تۆمار كراو بشێووێنێ، چونكە بە ملیۆنەها لاپەڕە خۆی تۆمـار كـردووەو بێ ئەوەی كرداری كارەكە هەستی پێ بكات لە بەرامبەریدا.

بـەلام لـە دوای خۆتۆمـار كردنـەكانی وردە وردە خـۆی دەردەخـاتو راسـتو

چەووتەکان‌و باش‌و خراپەکان بە رووی کرداری کارەکە دا دەداتەوە بەپێی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکاندا .

خووێنەری بەرێز :– چ سرووشت‌و چ مرۆڤ ، دوو جەمسەری بەیەکەوە بەستراون لەخەبات‌و هاوبەشی بەیەکەوە ژیان‌و یەکیان بەبێ ئەویدیکەیان بەمردوو دەمێنێتەوە، لەهەمان کات دژ بە یەکترن لەپێناو خزمەتکردنی یەکتری لە ناو هەر یەکیان ، بە مانایەکی دیکە، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خۆی لە خۆیدا کێشەو ململانێیە لە دوو جەمسەردا ، هەروا لەناو سرووشتیشدا... بەپێی یاساکانی کۆمەڵ‌و سرووشت وەك یاساکانی (وحدة وصراع الاضداد– نفي نفي– كمية و نوعية– الشكل والمحتوى– الصدفة والضرورة).

جا لە بەرئەوە بەپێی پەرەسەندنی تەمەن ، پەیتا پەیتا ساتەکان‌و کاتەکان‌و رۆژەکان‌و چاخەکان ، سەرکردەکان دێن‌و دەڕۆن‌و رادەبوورن... چونکە هەر کارێك گەر سەرەتای هەبیێت کۆتایی هەیەو بەپێچەوانەش زۆر راستە ... لەبەر بوونی کێشەو ململانێ‌و تەنگ و چەلەمەی نێووان ئایین‌و زانست لەناوچەو هەرێم‌و جیهان ، لە پێناو سەرکەووتنی یەکیان بەرامبەر ئەوویدیکەیان‌و لەناووبردنی یەکیان بەرامبەر ئەوویدیکەیان بەردەوامە.

ئەوەی من بیری لێدەکەمەووەو کردوومەتەوە . هیچ شتێك کۆتایی نیەو مالانهایەیەو هەردەم لە گۆڕیندایە بۆ گۆڕانێکی دیکە ، گەر وونیش بێت لە قۆناخێك بۆ قۆناخێکی دیکە... واتە مێژوو خوول دەخوواتەووەو ژیانیش بەردەوامەو بەردەوام دەبێ ، گەر قەدەری لێك ترازانی گۆی زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی رۆژەکانی دیکەو بە بوونی بەزریانێکی خوڵاوی‌و بەرەو ئەستێرەیەکی دیکەی بەهێزتر، ئەوکات ژیان لە سەر ئەو زەویە کۆتایی دێت لە سەر ئەم هەسارەیەدا .

دڵنیاشم لەووەی کە ژیان لە سەر ئەستێرەی دیکە لە گەردوون دا هەیە وەك ئێستای ئێمەو هەمان بارو دۆخ دەگرێتە خۆ، بەڵام لە شێووەو شێووازێکی دیکە ، بە هەمان یاساکانی کە لە سەرەوە باسم کردووە . کە ئەو پێنج یاسایە

بەندە بە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و سرووشت... سەرجەم ڕۆژەکانی هەفتەو مانگ و ساڵ پڕن لە رووداو کارەساتی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی و فرمێسك ڕشتن و پێکەنین لە هەموو بووارو لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیان چ بە نەخشێنراو چ بەخۆڕسکیەوە.

خووێنەری بەڕێز:- بەر پابوونی رووداوەکان چ ناخۆش و جەرگبڕبن یا خوود رووداوی مووژدەبەخش و دلخۆشکەر بن ... لاپەرەکانی مێژوو بەدەست پاکی و بەئەمانەتەوە لە لاپەرەکانی رۆژنامەی ژیانی خۆی تۆماریان دەکات ، گەر تۆو هەر کەسێکی دیکەو لایەنێك و هێزێك و بنەماڵەیەك بەرگری لە خۆی بکات... چونکە مێژوو لە گەڵ پەرەسەندنی ژیان بەردەووامە، مرۆڤ مێژوو دورست دەکات بەپێچەوانەش راسترە ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات و مردنی بۆ نیە ، تەنیا مرۆڤ و ئاژەڵ و گیان لەبەروو داروودرەخت و شاخ و داخ نەبێت . کە بوون و مردنی تیا بەردەوامە هەر یەکەو بەپێی بارودۆخی تەمەن.

کارووانی پەرەسەندن و پێشکەووتنی مرۆڤایەتی لە قۆناخە جیاجیاکاندا ،. کە نەتەوە سەرهەڵدەدەن و دەتووێنەوە ، چیاو شاخ و دۆڵ تەخت دەبن و چیاو دۆڵ و شاخی دیکە سەرهەڵدەدەن، دەریا لەجێگەی خۆی وون دەبێ و لەجێگەی دیکە سەر هەڵدەدەن ،. هەروا بەرامبەر بە سرووشت و گەردوون و مرۆڤ و کەش و هەواو ئەستێرەکان ، کە هەر هەمووی بە یاساکانی سەرەوە بەستراوەتەوە ،. لەهەمان کات مێژووش لەناو ئەو یاسایانە لەکارەکانی خۆی بەردەوام دەبێ ، لە بە ئەنجام گەیاندنی کاری فەرمانبەریەتی خۆی لەکات وساتەکان و کاری ئەمڕۆی ناخاتە رۆژی دوواتر لەهەموو بووارە جیاجیاکاندا.

جا بە هەر حاڵ ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ، کەبارووودۆخی ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان و وولاتانی جیهان بەقۆناخێکدا تێپەدەڕێت کە لەژێر دەستی سەرەك کۆمارو شانشین و ئەمیرو سەرەك پارت و گرووپ و رێکخراوی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئیسلامی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بنەماڵە بەبوونی داد پەروەری و نەبوونی دەکەوونە بەر دەستی سزای گەل بەپێی تۆمارکراوەکانی

مێژوو بۆ دادگایکردنیان لەدزینی سامانە هەمەجۆرەکانی گەل ونیشتمان ، لە هەموو بوارە جیاجیاکانو هەنگاووننان بەرەو چەسپاندنی دادپەروەری بەرێنماییەکانی مێژوو، بەرامالێنی بیروو بۆچوونی چەووتی خۆپەرستیو خۆویستیو فەسادو دزی وگەندەڵی، بەهێنانەکایەوەی دادپەروەری لەکارو ژیانو لەئەرکو مافدا...!!

بۆ مێژوو دەڵێم تورکو فارسو عەرەب ، لە هەمووکاتو ساتێکدا دووژمنی یەکتر بوونە بەپێێ ڕووداوەکانی مێژوو . لە هەموو بووارەجیاجیاکان،.. تەنیا لەسەر چاسەرەنەکردنو پێشێل کردنی مافی کورد، هاووخەباتو هاووبەشو هاووخەمی یەکتر بوونە ، . بەتایبەتی لە دوای دروست کردنی سنووری جووگرافی وولاتەکانیان لەسەر خاکی گەلانی هەرێمەکە بەتایبەتی لە سەرخاکی کوردستان...!

سەرکردایەتی کوردیش بگرە لە سەرەتای بوونی دەسەلاتیان لەسەر تیرەو هۆزو ئیمارتو بنەماڵەو پارتو ڕێکخراو لە هەموو بووارە جیاجیاکان دژی یەکتر بوونەو مێژوو بوونی گەلو نیشتمانیان پڕکردۆتەوە لە شەڕی خۆکووژیو کێشەو ململانێ ، لە ئاسانکاری کردن بۆ دووژمنانی گەلو نیشتمان، تەنیا لە سەر دەسەلاتو سامان کۆك بوونە ، کە ئەمەش دوو هۆکاری سەرەکی بنەڕەتی بوونە لە نەگەیشتنی کورد بە وولاتێکی سنووورداری قەووارە سەربەخۆ . وەك وولاتانی دیکەی جیهان، کە کورد لەکیشووەری ئاسیا لەنەتەوە یەکەمەکانی ئەو کیشووەرە بوونەو دوا نەتەوەش بوونە لە بەدەستهێنانی وولاتێکی سەربەخۆدا..!!..!!..

جا هیوادارم لەناوەڕۆکی پێشەکیەکەم گەیشتبن ، کە ئەوەی لەتووانامدا هەبووەو دەستم کەوتووە لە مێژووی ڕووداوەکانی کوردو کوردستانو داگیرکەرانی کوردستانو ناووخۆی کوردستان و گەلانی جیهانم کۆکردۆتەوە بەرۆژو مانگو ساڵ لەو کتێبە تۆمارم کردووە بەدڵنیاییەوە .

دڵنیاشم لەووەی کە مێژووەکان لە ٩٩٪ ڕاستن بەپێی مێژووی سەرچاوە

كوردیـەكان و عەرەبیەكان وبـە تایبـەتی بیانیـەكان ، وەك لـە كۆتـایی كتێبەكـە سەرچـاوەكان هـەمووی تۆمـار كـراوە ... لـە هـەمان كـات بەشـێووەیەكی رێـك و دورست لە زجیرەیەكی یەك لە دووای یەك و سـاڵ بەسـاڵ بەپێی دەست كـەووتن و برووا پی بوون تۆماركراون..

خووێنـەری بـەڕێز:- لـە كۆتاییـدا هیـووادارم خزمـەتێكی بـچووكی مێـژووی گـەل و نیـشتمانەكەم و سـەرجەم مێـژووی گـەلانی دیكـەی جیهـان و مرۆڤایـەتیم كردبـێ ، بـە دەووڵەمەنـد كردنـی كتێبخانـەی كـوردی، هیـووادارم كـە ئـەم كتێبـە ببێتە هۆكارێكی زیاتر دەووڵەمەند كردن و پەرەپێدان بە پەرتووكخانەی كوردی و بیانی . بەتایبەتی وولاتانی دراووسێیی داگیركەری كوردو خاكی كوردستان ، بـە تێگەیـشتنیان لـە راسـتیەكان و هەڵـەی رابردوویـان و گەرانـەوە بـە گرتنەبـەری بنەماكانی ژیانی بەیەكەوەی سەردەمیانە لـە هـەموو بوارە جیاجیاكـانی خـۆیی و بوونی دراووسێیەتی برایانە...

هیوادارم كە یارمەتی دەرم بن لە هەر رەخنەیەك یاخوود كەمووكووریەك كـە لـە نـاوەرۆكی كتێبەكـەم بـەدی دەكـرێ ... تـا بـەهاووكاری و یارمـەتی ئێـووەی بـەڕێز راستبكرێتەوە ، بۆ زیاتر پووختكردنی ، كە مایەی خۆشحاڵی و دەستخۆشـییە... ئـەویش بـە پەیووەنـدی كـردن بـەژمارە مۆبـایلی ٤٥٤٨٠٩٨ یـاخوود ئاریـافۆنی ژمارە (٠٦٦٠٢٥٣٣٥٢٢)..

لەگەڵ رێزم بۆ هەڵگری ئەم مێژوونامەیە.

عەلی كەندی

باشووری كوردستان – هەولێر

٢٠٠٣/٣/ ١

## ٢٠٠١

٢٠٠١/١/٥ مـۆركرنی ڕێكەوتننامـەی نێـوان بـەریتانیاو ئیتاڵیـا دژی ڕووتێكردنـی كۆچبەران لـە وولاتـانی هـەژارو توندرەو لـە دەسـەڵات بۆ وولاتـەكانیان بـە تایبەتی كۆچبەری كوردو قەدەخە كردنی بازرگانی كردن بە مرۆڤ بە هۆی نا لە باری باری ژیانیان لە هەموو بارە جیاجیاكان لە وولاتەكانیاندا .



٢٠٠١/١/٢٠ سەرۆكی ئەمەریكا بیل كلنتۆن لە دوای هەشـت سـاڵ لـە دەسـەڵات وتـاری مالئـاوییی بـۆ گـەلانی ئەمـەریكا خوێنـدەوەو لـە هـەمان كـات جـۆرج بـۆش سـوویندی یاسـایی خـوارد بـە وەرگرتنـی پۆستی سەرۆكایەتی ئەمریكا كە چـل و دوومـین سـەرۆك بـوو بـۆ سـەرۆكایەتی ئەمـەریكا. لـە كێشوورەكەو لە جیهاندا .

تێبینی :– من ئەم ویستووە وێنەكان دووبارە بكەمەوە یاخوود دەستم نەكەوتووە بۆیە دانەنراوە.



٢٠٠١/١/٢١ پەرلەمانی كۆماری خاكی سـۆماڵ داوای كـرد ، كـە دان بـە نووێنـەری نەتـەوە یـەكگرتووەكان – دیڤیـد سـتیڤن – نـەنێ ... ئـەویش بـە هـۆی تێبینیـە نادروسـتەكانی لـەبارەی ئەو كۆمـارە لـە سـۆماڵ ... جێگـەی ئامـاژە پێكردنـە كـە پەرلـەمانی خـاكی سۆماڵ یەك لایەنە ئەو كۆمارەی ڕاگەیاند ... كە خاكی سۆماڵ ژێر دەستەی

بــەریتانیا بــووەو ســەربەخۆیی خــۆی لــە ســالّی ١٩٩١ راگەیانــد لەچوارچێوەی سنووری سۆمالّ .

هەروا بەردەوام بووە لە بەرهەڵستکاری کردنی دەست پێشخەریەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان . دوای ئەوەش لە ٢٠٠١/٥/٣١ دانیشتووانی ئەو سنوورە بەرەو سندوقەکانی دەنگدان رۆیشتن بەدەنگدانی راپرسی لە سەر دەستووری نوێی کۆمارەکە .

ئــەم راپرســیەش دووپاتکردنــەوەی ســەربەخۆیی ئــەو کۆمارەیــە بــوو سەرەرای ئەوەی ئەم کۆمارە لەلایەن هیچ دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی جیهان دانیان بەم کۆمارە نەنا ... ئەم راپرسیەش بووە هۆی سەرهەڵدانی مشتوومرێکی زۆر چ لەناوخۆی هەرێمەکەو چ لەنێوو وولاتانی جیهان .

بەلام سەرۆکی خاکی سۆمالّ – محەمەد ئیبراهیم عەقال – گووتی :– ئەم راپرسیە لە سەر دەستووری نوێ بوو کە ئامانجی دووپاتکردنەوەیە ، لە پێناو سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە سۆمالّ .

کە سۆمالّ بۆتە مۆڵگەی شەڕو ئاژاوەو وێرانکردنی ژێر خانی ئابووری و لێك ترازاندنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، هەروا سەرۆکی کۆمارەکە محەمەد عەقال بەڵێنی دا بەهەڵبژاردنی گشتی لە هەرێمەکەدا.

ئەم هەرێمەش بەشێکە لە باشووری سۆمالّ و راگەیاندنەکەش هۆکاری شەڕی بەردەوامی ناوخۆی وولاتی سۆمالە .

بەلام حکوومەتی سۆمالّ ئەو راپرسیەی بە پیلانێکی دا بەشکردنی سۆمالّ داناو دژایەتی کرد ، لەهەموو لایەنێك و ئەم کێشەیەش بەردەوامە بە هۆی باری ناوخۆی سۆمالّ و دەست تێوەردانی لە لایەن هەندێ وولاتی دراوسێیدا .

٢٠٠١/١/٣٠ ئەندامی لۆرداتی بەریتانیا– نەزیر ئەحمەد – سەردانی هەرێمی باشووری کوردستانی لکێنراو بەئێراقی کرد . کە لە لایەن بەرپرسانی هەرێم پێشوازی لێکرا لە شاری هەولێری پایتەخت .

٢٠٠١/٣/١ دادگای بالای دوورگەی ڤیژی لە بریارێکیدا ئەو حکوومەتەی کە لە رێگای کودەتای سەربازی دەسەلاتی ڤیژی وەرگرت



یاسایی نیە ... لە بریارەکەیدا هاتووە ، کە ئەو حکوومەتەی هێزی سەربازی پشتیوانی لێکردووە و دەکات یاسایی نیە .
کە هێزەکانی سووپای ڤیژی ساڵی پار یەکەم سەرۆکی وەزیران بۆ وولاتەکەی دانا کە ئەویش لە نژاد هندیە .
لە لایەکی دیکە دەستەی قەزاکەو ئەندامانی قەزای ئوستralیا و نیوزیلەندە و تۆنگا و بابوانیووگینا پێکهاتوون ، لە راگەیاندنێکیدا رایگەیاند کە سەرکردەکانی سەربازی لە ڤیژی هەڵس و کەوتێکی یاساییان ئەنجام نەداووەو وازیان لە دەستووری فرە نەتەوەیی هێناوە لە ولاتەکەدا .
جێگەی باسکردنە کە سەرکردەی کودەتا سەربازیەکە – جۆرج سبیت – وولاتەکەی تووشی ئاژاووەو لێك ترازان کرد ئەویش بەلادانی سەرەك وەزیران – لازانیا کواراسال – لە سەر دەسەلات لە وولاتەکەدا .

٢٠٠١/٣/٢٤ زیاتر لە ٣٠ وولاتی جیاجیا لە کیشووەری ئەفریکیا یاسای دامەزراندنی یەکیەتی ئەفریکیایان مۆر کرد ، بە دەست پێشخەری سەرۆك کۆماری لیبیا سەرهەنگ معەمەر قەزافی لە پێناو یەك هەلوێستیدا لە کیشووەرەکە .



٢٠٠١/٣/٤ جولانەوەی تاڵیبان دەستی کرد بە رووخاندنی پەیکەرە مێژوویەکان لە ئەفگانستان ، بە تایبەتی پەیکەری – بوزا – کە بەگەورەترین و مەزنترین پەیکەر دادەنرێت لە جیهانی شووێنەوارەکان.
ئەویش بە هۆی ئەوەی کە ئەمانە – بتن ، اصنام – و دژایەتی بوونی ئاایینی ئیسلام دەکات . بەلام ئەو پەیکەرانە دژی هیچ ئاینێك نیە

وبەڵکوو ئەمە بەرهەمی مێژووی هەوڵ و خەبات و تێکۆشانی مرۆڤایەتیە ، لە پێناو بەرز ڕاگرتن و پەرەپێدان و گەشەپێدانی شارستانیەتە لە جیهان.

٢٠٠١/٣/١٦ لوتکـەی هەشـت وولاتـی زلهێـزی ئـابووری و سـەربازی لـە شـاری نـاپۆلی ئەنجامـدرا ، کـە ١٢٢ وولات بەشـداریان تێـدا کـرد لـە گـەڵ ١٥ ڕێکخـراوی ناحکومی دژ بە جیهانگەری و ڕەگەزپەرستی و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ و نەتەوەو گرفتەکان لە جیهاندا .

٢٠٠١/٢/٢٣ کـــەوتنی وێـــستگەی ئاسمـانی میری ڕووسـی لـە سـەر زەریـای هـادی دوای ١٥ســـاڵ لـــە سووڕانەوەی لە بۆشایی گەردوون ، کە میر یەکەم کەشتی ئاسمانی بـووە بـــە درێـــژترین مـــاوە کارەکانی ئەنجام بدات لەگەردوون بەگۆڕینی کەشتیەوانەکان.

٢٠٠١/٤/٢٧ ملیـۆنێری ئەمـەریکی – ژینـکس تیـۆ – گەشـتێکی گـوزاری بـۆ بۆشـایی ئاسمـان ئەنجامـدا ، ئـەویش بـە کەشـتی ئاسمـانی ڕووسـی بەرامبـەر/ ٢٠ ملیۆن دۆلار ، کە یەکەم کاری گەشت و گوزاری بێت لە جیهاندا.



٢٠٠١/٤/٢٨ حکوومـــــەتی فلـــــپین دەســــــتی کـــــــرد بەگفتووگۆکردن لـە گـەڵ بەرهەڵـــــــــستکارە کۆمۆنیـــستەکان ، لـــە پێنـــاو چارەســـەرکردنی ئـــەو کێـــشەیەی کـــە بەکۆنترین کێـشە لـە وولاتەکـە دادەنرێـت ... هـەردوو لایـەنی حکوومـەت و

بەرهەڵستکارەکان کە لە شاری ئۆسلۆی پایتەختی نەرویژ ئەنجام دەدرا و هەردوو لا گەشبین بوون لەم گفتووگۆیەدا .

ئەمەش لە دوای لە دەسەلات لابردنی سەرۆکی فلیپین - جۆزێف ئەسترادا - هات لە ٢٠٠١/١/٢٠ ، بە وەرگرتنی دەسەلاتی حکوومەتی فلیپین لەلایەن خاتوو - گلۆریا ئارو - بوو لە وولاتەکەدا .

لە بەر ئەوەی وولاتی فلیپین بە کێشەیەکی دژواردا تێدە پەری . ئەویش لەخۆپیشاندان و دەربرینی نارەزایی لە وولاتەکەدا .

ئەم گفتووگۆیەش دەست نیشان کرا تاکوو مانگی ٢٠٠٢/١٠/ بە ئامانجی گەیشتن بەرێکەووتن لەگەڵ بەرەی نەتەوەیی دیموکراتی رووەو بیری کۆمۆنیسیەت ... ئەمەش لە دوای هەڵوێستی گلۆریا هات ، بەچارەسەرکردنی کێشە هەڵواسراوەکان لەم وولاتەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا بەرەی نەتەوەیی و دیموکراتی چەندین پێشنیارو داواکاری پێشکەش بەحکوومەتی فلیپین کرد ، لە بوارەکانی کۆمەلایەتی و ئابووری و گۆرین لە رامیاریەتی حکوومەت و دەستووری وولات .

کە مەرجی سەرەکی گفتووگۆکان بوون لە کۆتایی پێهێنانی لە گەڵ بەرەی نەتەوەیی کە هەڵگری بیری ماویەکانەو ئەم جولانەوەیە زیاتر لە ٣٢ ساڵە خەبات دەکات لە پێناو هێنانە کایەوەی رژێمێکی دیموکراتی دژ بە ئەمەریکا... لە بەر ئەوەی حکوومەتەکانی فلیپین لایەنگیری ئەمەریکا بوونە ، جگە لە جۆزیف ئەسترادا ، کە رامیاریەتی دوو لایەنەی گرتبووە بەر لە وولاتەکەدا .

لەگەڵ ئەوەشدا باری کشتووکاڵ و دابەشکردنی زەوی بە سەر جووتیاران یەکەم بەندەکانی گفتووگۆکان بوون . هەروا بەرەی نەتەوەیی دیموکراتی داوای لەحکوومەتی فلیپین کرد . کە هەموو پەیوەندیە سەربازیەکانی لەگەڵ ئەمەریکا ببرێ .

بەلام لەلایەکی دیکە ئامانجی سەرەکی سەرۆکی فلیپین ئەوە بوو ، کە دەسەلاتی هەبێ لە سەر هەموو خاکی فلیپین . ئەوەی کە لە ژێر دەستی بەرەی ماویەکان بوون ... کە سووپای بەرەی نەتەوەیی دیموکراتی بەناوی سووپای گەل پێکهاتبوو کە ژمارەیان لە ١١ هەزار چەکدار زیاترە ... کە سەرۆکی حکوومەتی فلیپین یەك لەداواکانی ئەوە بوو ، کە بەرەی نەتەوەی

چەك و تەقەمەنی بداتەوە دەست حكوومەت و سووپای فەرمی دەسەڵاتی هەبێ لە سەر هەموو خاكی ئەم وولاتەدا .



٢٠٠١/٥/١ حكوومەتی فلپین باری نا ئاسایی راگەیاند بە هــۆی گــەمارۆدانی كۆشكی سـەرۆكایەتی حكوومــەتی فلــپین . ئەمەش لە ئاكامی خۆ پێــشاندانی هــەزارا كــەس لەلایــەنگرانی سـەرۆكی پێـشووی فلــپین – جۆزێـف ئەسـترادا – لەدەسەڵات لە شاری مانێلای پایتەختی وولاتەكە . ئەم خۆپێشاندانەش لە پێناو لادانی سـەرۆكی وولاتەكە خاتوو – گلۆریا – بوو ... لە وكاتەشـدا حكوومــەتی فلــپین بریــاری دەسـتگیركردنی ســەركردەكانی حكوومــەتی پێشووی دابوو بە سەركردایەتی ئەسترادا.

كە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە سەرۆكی فلپین خاتوو گلۆریا دەسـەڵاتی حكوومەت زیاتر بكات و دەستكرا بە دەستگیركردنی چەندین سەكردەی حكوومەتی ئیسترادا . لە ئاكام سـێ هاووڵاتی كـوژران و چـەندین دیكـە زامداربوون ... ئەو خۆ پێشاندانەش لە پێناو ئازادكردنی جۆزێف ئیسترادا بوو ، كە بە ناوی گەندەڵی خرابووە بەندیخانە لە وولاتەكەدا.



٢٠٠١/٥/١٥ یــــاخی بــــووە چــــەكدارەكان لــــە جووڵانــــەوەی دادی دیموكراتی لە وولاتـی تشاد لە گردۆڵكەكانی بــاكووری تــشاد ، هەڵوێــستی خۆیــان نیشاندا بەدەست پێكردنی گفتووگۆ لەگەڵ حكوومەتی تشاد ، بەمەرجێ

سەرۆکی تشاد – ئیدریس دوبی – خۆی نە پاڵێوریۆیّ بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە تشاد ، کە بڕیارە لە ڕۆژی یەك شەممەی داهاتوو ئەنجام بدرێت ... ئەمەش لە سەر زاری ووتەبێژی فەرمی جووڵانەوەی دادی دیموکراتی – گەیلان ئەحمەد توبر – هات و گووتی :–

جووڵانەوە ئامادەیە گفتووگۆ لەگەڵ هەر شەش پاڵێوراوەکەدا بکات کە هەر یەکێکیان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆمار لە ووڵاتەکەدا ... لە بەر ئەوە جووڵانەوەی دادی دیموکراتی تشادی لە سەر هەڵوێستەکانی خۆی بەردەوامە لە هەموو بوارەکان ...لە هەمان کات لەو بارودۆخەی ناوخۆی تشادو دراوسێکانی شەڕو پێکدادان لە نێوو هێزەکانی سووپای تشادو جووڵانەوەکە بەردەوام بووە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە حکوومەتی سوودان بە سەرکردایەتی عومەر حەسەن بەشید یارمەتی دەری جووڵانەوەکەیە و ، حکوومەتی تشادیش یارمەتی دەری بەرهەڵستکارانی حکوومەتی سوودانە ، جگە لە ووڵاتەکانی دیکەی ئەفەریکیا لەکێشووەرەکەدا.

٢٠٠١/٥/٣٠



لە ئاکامی شەڕی نێوان هێزەکانی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامیەکانی لە کوردستان و دەست بە سەراگرتنی بە سەر شاری هەڵەبجەی شەهید بە دەرپەراندنی ئەم بزووتنەوانە لە شارەکەداو هەڵاتنیان بۆ سەرسنوورەکانی نێوان باشووری کوردستان و ئێران .

ئەم بزووتنەوانەش کە لە لایەن پارتی دادو گەشە پێدانی تورکیا و ڕژێمی بەناو ئیسلامی لە ئێران و سعوودیەو چەندین ووڵاتی دیکەی ئیسلامی عەرەبی یارمەتیان دەدرا ، لە پێناو شێواندنی باری کورد لە باشووری کوردستان ، بە لە باربردنی ئەو بارودۆخەی کە بە هەوڵ و تواناو خوێن

ڕشتنی گەنجی کورد و یارمەتی دۆستانی کورد لە ناوچەو هەرێم و جیهان بۆی بەردەوام بوو لەم هەرێمەدا .

٢٠٠١/٦/٧ لە هەڵبژاردنەکانی بەریتانیا لە نێوان پارتی کرێکاران و پارتی پارێزگاران .
پارتی کرێکارانی بەریتانیا گەورەترین سەرکەوتنی بە دەست هێناو دووبارە سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر پۆستی سەرەك وەزیرانی بەریتانیای گرتەوە دەست بۆ ماوەی چوار ساڵی دیکە لە بەریتانیا.

٢٠٠١/٦/٩ لە دوای لێك جیا کردنەوەی دەنگی دەنگدەران لە لایەن لیژنەی تایبەت بۆ هەڵبژاردنەکان ، وەزارەتی ناوخۆی ئێران سەرکەوتنی سەروکی ئێران محەمەد خاتمی ڕاگەیاند لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئێران ، کە لە ٨٥٪ دەنگی بەدەست هێنا بۆ پۆستی دووەم جار لە سەرۆکایەتی کردنی ئێران .

٢٠٠١/٥/٢٦ وێستگەی دەنگی میزۆبۆتامیا ، ئەم رادیۆیەش زمانحاڵی پارتی کارگەرێن کوردستانە و ، کە بۆ یەکەم جار دەستی کرد بە پەخش کردنی بەرنامەکانی و دوای ماوەك پەخشەکەی بوو بە ٢٤ کاتژمێر ، بەڵام ئێستا ڕۆژانە ١٢ کاتژمێر پەخشی خۆی بلاودەکاتەوە بە سەر وولاتەکانی جیهان.

٢٠٠١/٦/٢٣ خاتوو میگاواتی سوکارتۆ سوویندی یاسایی دەستووری بەرامبەر

پەرلەمانی ئەندۆنوسیا خوارد ، ئەویش بەوەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وولاتەکە ، کە گەورەترین دەووڵەتی ئیسلامیەو – ٢٠٧– ملیۆن کەسی تێدا دەژیو کە لە چەندین نەتەوەو مەزهەب ئایینی تیانیشتەجێیە .

٢٠٠١/٧/٧ سەرەك وەزیرانی کرواتیا – ئیڤیتشاراکان – لە راگەیاندنێکیدا رایگەیاند و گووتی :- حکوومەتی کرواتیا رازیە لە سەر دەستگیرکردنی



تاوانبارانی کروات کە بە کاری تاوانی جەنگ هەڵساون و بیانداتە دەست دادگای نێوو دەووڵەتی لە شاری لاهای پایتەختی هۆڵەندا .
ئەمەش لە دوای گەیشتنی سەرۆکی دەستەی داواکار لەدادگای تاوانەکانی جەنگ – کارلا دیل بۆنتی – بۆشاری زەگربی کرواتی .
ئەمەش لە دوای کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرەك وەزیرانی کرواتیا هات و پاڵپەستۆی خستە سەر حکوومەتی کرواتیا ، لە پێناو بەدەستەوەدانی تاوانبارانی جەنگ لەکرواتیا . کە لە ساڵی ١٩٩٥ ئەنجامیان دابوو لە ناوچەکانی سلامۆنیای رۆژهەلات و کراتژینا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠١/٧/٨ ســــــەرەك وەزیرانـــــــی تـــەیمووری رۆژهـــەلات – زانانا گۆسماو – لە دوای دەســـت کێـشانەوەی لـــە پۆسـتی سـەرەك وەزیـران لـە تـەیمووری رۆژهـەلات لـە لێدوانێکیـدا رایگەیانـد کـە – خۆسـیبیا رامـۆس هۆرتـا – کـە خـاوەنی خـەلاتی نـۆبلی پـیێ بەخـشراوە بـۆ ئاشـتی بـە سـەرەك وەزیرانـی تـەیمووری رۆژهەلات دەست نیشان کرا – ئیلاو داسینا – بە جێگیری یەکەمی سەرەك وەزیران دەست نیشانکرا لە سەر وولاتەکەدا

جێگەی باسکردنە کە هەرێمی تەیمووری رۆژهـەلات لـە دوای خـەباتێکی بیێ ووچـان تـوانی لـە سـالی ١٩٩٩ سـەربەخۆیی خـۆی بـە جیابوونـەی لـە ئەندۆنووسـیا راگەیـەنیێ وەك وولاتێکـی سـەربەخۆی نێوودەوولـەتی لـە ناوچەکەدا ... سەرەرای بەردەوام بوونی کێشەکان لەو هەرێمەدا بە تایبەتی لە نێوان هەردوو بەشی رۆژئاواو رۆژهەلات .

ئەویش بە بوونی بەرهەلستکاری دەسەلاتی ناوەندی تـەیمووری رۆژهـەلات بە سەرکردایەتی – ئەلفرید رینـادۆ – لـە گـەڵ ئەوەشـدا هێزەکـانی سـووپای ئاشتی پارێزی ئوسترالیا بەردەوام بوو لـە راگـرتنی ئارامی لـە وولاتەکـەدا و بەرەو باشبردنی لـە هـەموو بوارەکـانی رامیاری و ئابووری و بازرگـانی ، بـە بووژاندنـــەوەی ژێرخـــانی ئـــابووری و گەراندنـــەوەی هاوســـەنگی و هاوکێشەکانی پەیوەندی کۆمەلایەتی لە وولاتەکەدا .



٢٠٠١/٧/١٨ پـــارتی موونتـــەدای دیمــــــوکراتی و گەشــــــەپێدانی بەرهەلــــــستکاری دەســـەلاتی تـــشیلۆبا ســـەرکەوتنیان لـــە هەلبژاردنـــــەکانی

تەواوکەری بەدەست هێنا ، ئەمەش لە دوای شەڕو پێکدادان هات لە نێوان لایەنگرانی حکوومەت و بەرهەڵستکاران لە پارتی ناوبراو لە زامبیا ... ئەمەش لە پێناو بەدەست هێنانی سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی لە زامبیا ... ئەمەش لەو کاتەدا هات کە لایەنگرانی حکوومەت و لێژنەی سەر پەرشتیاری سندووقەکانی هەڵبژاردن، سەر لە زوو سندوقەکانی هەڵبژاردنیان داخست و بردیان بۆ جێگەی مەبەست بەجیاکردنەوەی دەنگەکان .

سەرەرای ئەوەش جووڵانەوەی دیموکراتی فرەلایەنی یەکەم تاقی کردنەوەی بوو لە بەزینی لەو هەڵبژاردنەو . لە دوای کەرت بوونی ئەو پارتە بە هۆی خۆ هەڵبژاردنەوەی سەرۆکی زامبیا تشیلۆبا بۆخوولی سێیەم لە سەرۆکایەتی کردنی وولاتەکەدا .

٢٠٠١/٧/٢٢ هەردوو حکوومەتی ئەمەریکاو بەریتانیا پرۆژەیەکی هاوبەشیان ئاراستەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەووڵەتی کرد ، بە دانانی- سزای زیرەکانە - لە سەر ڕژێمی بەعس لە ئێراق ، ئەویش بە هەڵگرتنی هەموو گەمارۆیەك لە سەر بازرگانی مەدەنی و چاودێری کردنی زیاتر بۆسەر ئەو کەلوپەلانەی کە گومانی سەربازیان لێدەکرێت . لە رێگەی بازرگانی لە هەناردەو هاتوودا بۆ ئێراق .



٢٠٠١/٨/٦ کۆچی دوایی نووسەرو رۆماننووسی بە ناوبانگی جیهان و بەرازیلی - جۆرج ئەمادۆ - لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا لە بەرازیل ... شایانی باسە ئەم نووسەرو رۆماننووسە لە ١٩١٢/٨/١٠ لە یەکێك لە کێلگەکانی کاکاوی باشووری وویلایەتی باهیای ناوەراستی رۆژهەلاتی وولاتی بەرازیل کە مەڵبەندی بازرگانی کردن بوو بە کۆیلەی ئەفەریکیەکان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... نووسینەکانی بەشداری کردن بوو لە پێکهێنانی هۆشی

جیهانی دەرەوە لە سەر وولاتەکەیدا .

هەروا ئەمادۆ لە هەموو رۆماننووسەکانی دیکەی بەرازیل زیاتر بایەخی بە کێشە هاوچەرخەکانی خۆی دەداو بەهرەی داهێنانی لە زمان و هونەرو دیاریدەی تاڵی ژیانی نەتەوەکەی وەر دەگرت . بۆیە لە ناو خوێنەرانی بەرازیل بە چاکترین و خۆشەویسترین رۆماننووس دادەنرێت .

ئەم نووسەرە کارەکانی بۆ ٤٨ زمان وەرگێردرابوو لە هەمان کات کتێبەکانی کەچاپکرابوون گەیشتنە ٢٠ ملیۆن دانە ... کە سلڤادۆریش وولاتی یەکەمی بوو بۆ نووسینەکانی ... چەندین جار ئەمادۆ پاڵێوراوبوو بۆ پاداشتی نۆبڵ ...لە ساڵی ١٩٣١ یەکەم رۆمانی بەناوی – خاکی کەرنەڤاڵ – بلاوکردەووە و دووەم رۆمانی لە ساڵی ١٩٣٤ بە ناوی – کاکانۆ --- بلاو دەکاتەوە .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٥ دەچێتە ریزی بزووتنەوەی جەماوەری لە وولاتەکەیدا لە پێناو بەرگری کردن لە مافەکانی گەلەکەی . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٩ خەلاتی ستالینی لە مۆسکۆ پێدەدرێت .

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٠ تاکوو ١٩٥٢ لە وولاتەکەی دوورخرابووەوە بە هۆی بوونی بە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی بەرازیلی ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٢ گەرایەوە بەرازیل ، کە لە پاریس و براگ ژیانی بەسەر بردووە .

لە ساڵی ١٩٩٥ پاداشتی نۆبڵی پێ بەخشرا – جۆرج ئەمادۆ – ژنەکەی – زیلیا – کە ٥٦ ساڵ تەمەنی بوو خاوەن کچ و کورێك بوو ، ئەویش نووسەرو رۆماننووس بوو ... کە ئەم خێزانە ببوونە جێگەی سەرسوورمانی گەلانی بەرازیل و ئەو وولاتانەی کە تیای ژیابوون . نەك هەر لە بەر ئەوەی نووسینەکانیان جێگەی سەرنج راکێشان بوون ، بەڵکوو بە هۆی پەیوەندیان لەگەڵ دانیشتووانەکەدا .

٢٠٠١/٨/٦ کۆچی دوایی کەسایەتی ناودارو سەرکردەی نەتەوەیی و نیشتمانی سالح حەیدەری لە شاری هەولێر... شایانی باسە سالح حەیدەری رۆشنبیرو روناکبیرێکی بەهرەدارو لێهاتوو بووە ، نووسینەکانی شایەتی ئەوە دەدەن ... سالح حەیدەری لە ساڵی ١٩٢٢ لە شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیرو شۆرشگێر چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠١/٨/٣١ لە شاری ڕۆیانی باشووری ئەفریکیا کۆنگرەی نێوو دەووڵەتی گرێدرا لە لایەن ڕێکخراوە نا حکوومیەکانی دژ بە داگیر کردنو ڕەگەز پەرستی ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەمەریکا دژی کۆنگرەکە وەستاو لایەنگیری ئیسرائیلی کرد لە ناوەندی کۆنگرەکەدا.

٢٠٠١/٩/٦ بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بە ناو شۆڕشی ڕژێمی بەعس لە ئێراق بە ژمارە/١٩٩ دەڵێ... هەموو ئێراقیەك تەمەن – ١٨ – ساڵ بۆی هەیە داوا بکات نەژادەکەی خۆی بکاتە بە عەرەب.
بەڵام لە راستیدا مەبەست ئەوە بوو کە نەژادی کوردو ناسنامەی کورد بسرێتەوە لە باشوری کوردستان ، شان بە شانی وولاتانی داگیرکەری کوردستان ، بە تایبەتی لە پارێزگاکانی مووسڵ و ، دیالە بە تایبەتی پارێزگای کەرکوك لە هەرێمی باشوری کوردستان .

٢٠٠١/٩/١٠ لێکۆڵینەوە نوێیەکان لەوویلایەتـــــــــە یـــــــەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەرکەوتن کە زیـــاتر لـــە ٤٠٠,٠٠٠ هەزار منداڵی ئەمەریکی دەکەونـــــە بـــــەر چەوسانەوەی رەگەزی – سکسی – لە ساڵێکدا ... یەکێك لەو لێکۆڵنەرانە – ریتشارد ئیستیسی – بوو ، کە هەڵسا بەو لێکۆڵینەوەو دەرخستنی راستیەکانی ژیانی هەژاران و ناچار بوونیان بە پەیداکردنی قووتی ژیان ... کە هەرچەند دەسەڵاتداران نایانەوێ ئەو راستیانە دەربخەن و خۆیان لەگێلی بدەن و میدیای دەسەڵات پروپاگندەی ئەوە دەکەن ، کە ئەمەریکا رزگارکەری مرۆڤایەتی و بەرگری کەری ماڤ مرۆڤە .
بەڵام لە راستیدا رژێمی سەرمایەدار لە ماوەی سەدا ساڵ ئەوەی سەلماندووە کە سەرچاوەی بوونی برسیەتی و کارە نامرۆڤایەتیەکانە لە سەر گۆی زەوی بە پێی ئامارە جۆراو جۆرەکان ... ئەم کارە سکسیانەو لە شفرۆشیەش لە ریزی قوتابیان دەرکەوتووە .

ئەویش لە پێناو پەیداکردنی خەرجیەکانی قوتابخانە و قووتی رۆژانەی ژیان بۆخۆیان و خێزانەکانیان لەم وولاتەدا بە هۆی گرانی شمەکەکان و کالاکان و پێداویستیەکانی ژیان بە تایبەت خۆراکی ژیانی رۆژانەیان .
ئەم لێکۆلینەوەیەش لە بارەی ناچارکردنی منداڵ لە کاری سکسیدا لە هەردوو وولاتی کەنەداو مەکسیکە ، لە دوای ئەوە ئەمەریکاو دوایی وولاتانی دیکەی سەرمایەدارو هەندێ لە وولاتانی ئیسلامی و عەرەبی ... بەلام بە شێوەیەکی فەرمی ئاشکرا نەکراووە بە هۆی شاردنەوەی راستیەکان لەم وولاتانەو چەواشەکردنی مرۆڤایەتی لە جیهاندا .

٢٠٠١/٩/١١ لە کارێکی تیرۆریستی چوار فرۆکەی نەفەرهەلگری ئەمەریکا فرێندران لە لایەن تیرۆریستانی سەر بەرێکخراوی قاعدە ، کە دوان لەو فرۆکانە خۆیان دا بە باڵەخانەی بازرگانی جیهانی لە شاری نیویۆرك ، یەکێك لەو فرۆکانە خۆی بە باڵەخانەی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا – پنتاگۆن – و چوارەم فرۆکەش خرایە خوارەوە لە خواروی شاری بەنسلفینیا.



شایانی باسە لەم رۆژەدا ئیدارەی ئەمریکا بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر بێ سەرۆك مایەوە ، بە خۆشاردنەوەی جۆرج بۆش ، کە بووە هۆی هەژاندنی ئیدارەی ئەمەریکاو وولاتانی دیکەی زلهێزی لە جیهان ، کە لە هەشت وولات پێك دێت .



٢٠٠١/٩/١٢ لـــه كۆبوونـــەوەى ئاســـايى خـــۆى ئەنجوومـــــەنى ئاسايـــشى نێـــوو دەوڵەتى مافى بەكار هێنـــانى هێـــزى ســـەربازىو چـــەكى گرانـــى بـــە ئەمـــەريكا بەخشى ، بۆ لە ناو بردنى بنكەكانى تيرۆريستان لە جيهان ، بە تايبەتى لە ئەفگانـستانو ، ئێـراق و ، سـووريـاو ، ئێـران ، لـە گـەڵ چـەندين پـارتو رێكخراو گروپى ئيسلامى ديكە ، لە وولاتە جياجياكانى جيهان .

٢٠٠١/١١/١٥ كۆمپانياى تەكنەلۆژياى شانەى پێشكەوتوو لە ئەمەريكا لە راگەياندنێكيدا بلاّوى كردەووە ، كە بۆ يەكە مجار مەلۆتكەيەكى مرۆڤ كۆپى كرا لە جيهان ... كە ئەمەش بووە هۆى پێشكەوتنێكى بێ وێنە لە سەردەمى تەكنەلۆژياى سەردەمى .

ئەمەش نەك لە پێناو كۆپى كردنى شانەكانى مرۆڤ بەڵكوو بۆ سەرچاوە سەرەكيەكانى شانە بنەرەتيەكان .

ئەم كۆمپانيايە هيواى خواست كە ئەم شانانە هۆكارى چارەسەركردنى نەخۆشيە تەشـەنەدارەكان بێـت ، كـە مـرۆڤ تووشـى دەبێـت . بـەڵام ئـەم كۆمپانيايە كە بارەگاى لە — ورستر بماساستس — ە دووپاتى كردەووە ، كە ئامانج لەو تاقيكردنەوەيە بۆ كۆپى كردنى مرۆڤ نيە ، بەڵكوو بۆ ئەو شانە بنەرەتيانەن كە نەخۆشيەكانى مرۆڤ چارەسەردەكەن .

هەروا ئەو شانە سەرەكيانە بۆ بەكارهێنانى بە هێزكردن و نشوونماكردنى شانە لاوازەكانى مرۆڤە ، كە دەبێتە هۆكارى تووشبوونى بە نەخۆشيە هەمە لاينەكانە .

هـەروا بەرپرسـانى كۆمپانياكـە كـە لـە زانـاو تووێژەنـەرەكان پێـك هـاتوون ئـەوەيان دووپـاتكردەووە كـە مەبەسـت لـەوكارە گەيـشتنە بـۆ رزگـاركردنى ژيانى مرۆڤ نەك دروستكردنى مرۆڤ ، كە ئەمەش لەگەڵ داب و نـەريتى هـيچ كۆمەڵگايەك ناگونجێت لە سەر رووى زەوى لەجيهاندا

٢٠٠١/٩/٢١ وەزیری دارایی فەرەنسا لە ڕاگەیاندنێکی گووتی:- جیهانگەری چەکێکە لە دەست وولاتانی گەوورە بۆ دزینی بەرو بوومی وولاتانی تازە پێگەیشت و و هەژارەکان و ژێردەستەکان ، لە پێناو بەهێز کردنی یەکیەتی نێوان وولاتانی سەرمایەدارو فراوانکردنی چەوساندنەوەی میللەتان ، لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی هاوبەشی خۆیان ، لە هەموو بوارەکانی ڕامیاری و ئابووری و سەربازی لە جیهاندا .

٢٠٠١/٩/٢٢ سەرکرادایەتی یەکیەتی ئەوروپا لە کۆتایی لوتکە نا ئاساییەکەی پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ نەخشەکانی ئەمەریکا ڕاگەیاند ، دژی تیرۆر لە جیهان ، بە تایبەتی لە ئەفگانستان و ، ئێراق و ، ئێران و سووریا .لە ناوچەو کێشووەرەکەدا .



٢٠٠١/٩/٢٤ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش سامانی زیاتر لە ٢٧ پارت و ڕێکخراوی گومان لێکراوی بە پەیوەندی لە گەڵ ئوسامە بن لادن و تاڵیبان بلۆك کرد لە جیهانی ئیسلامی ، لەوانە پارتی کریکارانی کوردستان لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا ، کە تاکە پارتە بەرگری بە ڕەسمی و بە خەباتی نەتەوایەتی و نیشتمانی لە باکوور بە بەرگری کردن لە گەڵ و نیشتمانی داگیرکراوی لەلایەن رژێمی تورکیادا .

٢٠٠١/٩/٢٥ شانشینی سعوودیە شا فەهد عەبدول عەزیز هەموو جۆرە پەیوەندیەکی لە گەڵ دەسەڵاتی ئیسلامی توونـد ڕەوی تاڵەبان لە ئەفگانستان پچڕاند ، گەرچی سعوودیەو چەندان لە وولاتی دیکەی عەرەبی سەرچاوەی پارمەتیان بوون ، بە ئامۆژگاری ئەمەریکاو هاوپەیمانانی ، بۆ دژایەتی کردنی یەکیەتی سۆڤیەت و جوولانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەلایەتی ، لە هەمان کات هاوکاری ڕژێمی بەعسی سەدام

حوسێن بوون لە مامەلە کردن لە گەڵ گەلانی ئێراق بەئاگرو ئاسن ، بە تایبەتی گەلی کورد لە کوردستان بەگشتی لە هەموو بوارە جیاجیاکان.

٢٠٠١/٩/٢٧ ئەنجوومەنی گشتی ئاسایشی نێوو دەووڵەتی لە سەر داوای ئەمەریکا بڕیاری ژمارە/ ١٣٧٣ی دەرکرد ، بە پێی ئەو بڕیارە ئەمەریکا چۆنی بوێت لە ئامانجەکانی جێبەجێی دەکات بەرامبەر هەر پارت و ڕێکخراوەیەك لەناوچەو وولاتە جیاجیاکان لەجیهان ، ئەوەی لە هێلی ڕامیاریەتی ئەمەریکاو هاوپەیمانان لابدات .




٢٠٠١/١٠/٧ کاتژمێر ٧٫٤٥ دەقیقەی ئیوارە فڕۆکە جەنگیەکانی هێزەکانی سوپای ئەمەریکاو بەریتانیا دەستیان کرد بە بۆردومان کردنی شارەکانی کابووڵ و قەندەهارو مەزار شەریف لە ئەفگانستان ، لە ئەنجام دا کۆتایی بە دەسەلاتی ئیسلامی مەلا محەمەد عومەر – تالەبان – و ئوسامە بن لادن هێنرا لە ئەفگانستان .

٢٠٠١/١٠/١٧ کۆنگرێسی ئەمەریکا بۆ یەکەم جار لە مێژوی دەسەلاتی ئەمەریکا بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر دەرگاکانی داخرا بە هۆی مەترسی کردن بە تێدانی میکرۆبی – ئەنتراکس – لە دوای هێرشەکەی ١١ی ئەیلول .لە ساڵی / ٢٠٠١دا لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .



٢٠٠١/١٠/٢٦ زاناکانی ئاژەڵناسی لە هەولێکی بێ ووچان ، ئەویش بە دۆزینەوەی ئێسقانی جەستەی تیمساحێکیان ڕاگەیاند ، کە تەمەنی بۆ ١١٠ ملیۆن ساڵ پێش ئەو مێژووە دەگەڕێتەوە ، کە ژیاوەو کێشەکەی بە هەشت تەن

مەزەنـدە دەكـرا ، بـە پێـی لێكۆلینـەوەكانی هەمـەجۆری زانسـتی لـە سـەر پاشماوەكەیدا .

٢٠٠١/١١/٦ بۆ یەكەم جار لە مێژووی ئەڵمانیا لە دوای جەنگی یەكەمی جیهان بڕیاریدا بە ٣٩٠ سەرباز بەشداری شالاوی بە ناو دژ بە تیرۆر بكات لە ئەفگانستان شان بەشـانی هێزەكـانی سـووپای هاوپـەیمانان . لـە پـەیمانی ئەتلەسـی – ناتۆ – لە جیهان .

٢٠٠١/١٢/١ لــە دوای كۆبوونــەوە چــڕە یــەك لــە دوای یەكــەكانی حكوومــەتی كــاتی ئەفگانستان ، لە شاری بۆنی پایتەختی ئەڵمانیا ڕاگەیاندرا بە سەرۆكایەتی حامـد كـارازای ، كـە حكوومـەتێكی فیـدرال بـوو لـە پێـك هاتـەكانی گـەلانی ئەفگانسـتان ، لـە دوای ڕووخانـدنی دەسـەڵاتی تاڵیبـان و ئوسـامە بـن لادن ، كە دژ بە مـافی مـرۆڤ و مرۆڤایەتی و دیمـوكراتی و هـەموو بـوارە جیاجیاكـان بوون لە ئەفگانستان .

٢٠٠١/١٢/١٣ كۆمەڵێك چەكداری تیرۆریست پەلاماری پەرلـەمانی هندسـتانیاندا لـە شـاری نیـوودەلهی پایتـەختی هندسـتان ، كـە بـووە هـۆی تەنگەژیـەكی نـا لـە بـار لـە نێوان هندسـتان و پاكسـتان ، بـە هەڕەشـە لـە یـەكتری كـردن بـە بـەكارهێنانی چەكی ئەتۆمی و لە سـەر كێشـەی كشمیری داگیر كـراو دابەشـكراو لـە نێـوان هەردوو وولاتدا .

٢٠٠١/١٢/١٧ لە شاری – نامبۆڤای – ڕووسیای یەكگرتوو كەسایەتی ناوداری ڕووسـیا ، جەمال شامۆیان كە كوردێكی ڕووسیە بۆ یەكەم جار لە مێژووی كوردەكانی یـەكێتی سـۆڤیەت لـە ڕووسـیای یـەكگرتوو لـە هەلبـژاردەكانی پەرلـەمانی ڕووسـیا ، بـە ئەنـدامی پەرلـەمانی ڕووسـیا – دۆمـا – هەلبـژێردرێت ، كـە كۆمۆنیستەكان سەركردایەتیان دەكرد لە وولاتەكەدا .



٢٠٠١/١٢/٢٢ سەرۆکی کاتی ئەفگانستان حامد کارازای سوویندی یاسایی خوارد لە دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی ، کە ژمارەی ئەندامانی حکوومەتەکەی ٢٩ وەزیر بوون ، هەر لەو کاتیشدا بورهانەدین ڕەبانی ئەفگانستانی جێ هێشت و بەرەو کۆماری ئیسلامی ئێران ، کە لە کاتی دەسەڵاتەکانیان پشتگیریان لێدەکردن .

٢٠٠١/١٢/٢٤ گۆڤاری – الزمان الجدید – بلاوی کردەوە ، کە لە ئەفگانستان زیاتر لە ٣٥٠٠٠٠ هەزار کوردی تیا نیشتەجێن و داوای مافی نەتەوایەتیان دەکەن ، کە لە کاتی خۆی بە خۆرستانی کورد ناسراوبووە ، هەروا لە پاکستانیش کورد هەن و کە زۆربەی زۆری لە ناوچەی کوێتەن و لە ئەفگانستان لە شارەکانی– لاهورو کەرای و قەندەهار – نیشتەجێن .

## ٢٠٠٢



٢٠٠٢/١/٢ سەرۆکی نوێ سویسرا – کاسیر فیلیگر – داوای لە گەلی سویسرا کرد ، کە ڕەزامەندی بکات لە سەر چوونە ڕیزی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ... ئەم داوایەی سەرۆکی سویسرا بە بۆنەی ساڵی نوێ بوو ... ئەویش بە بە دەست پێکردنی گفتووگۆ لە مبارەیەوە ، کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان . یەکەم ڕێکخراوە بتووانێ کێشە نێوو دەووڵەتیەکان چارەسەر بکات لە جیهان.

هەوا واش بریارە کە لە مانگی ٢٠٠٢/٣/ گەلانی سویسرا ئەنجامی

راپرسـی بـدەن لـە رێگـەی سـندوقەکانی دەنگـدان بـۆ چـوونە رێـزی ئـەم رێکخـراوە نێـوو دەوڵەتیـە بـە نـا یـان بـەڵێ لـە دەنگدانەکـەدا... جێگـەی باسـکردنە کـە گـەلانی سویـسرا بـەر لـە ١٥ سـاڵ لـە رێگـەی سـندوقەکانی دەنگدان رەزامەندیان لە سەر چوونە رێزی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نەکرد .

ئەمەش بە هۆی دوورکەوتنەوەی سویسرا بوو لە بێلایەنیەکەی لە کێشە هەمەلایەنەکانی نێوو دەوڵەتی و دەست تێوەر نە دان لە کاروباری وولاتان لە رێگەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان .

سویسرا یەکەم دەوڵەتە لە جیهان تاکوو ئێستا نەیوویستووە بچێتە رێـزی نەتـەوە یـەکگرتووەکان . بـەڵام لـە دوای رووداوەکـەی ٩/١١ لـە ئەمـەریکا رێکخـراوە جۆراوجۆرەکـان لـە سویـسرا داوایـان لەحکوومـەت و گـەلی سویسرا کرد کە بچنە رێزی ئەم رێکخراوە جیهانیەدا .

٢٠٠٢/١/٤ دەستووری نوێی ئەفگانستان بە راپرسیەکی گەلانی ئەفگانستان بڕیاری لەسەر درا ، کە لە چەندین هـۆزو تـیرە پێك هـاتوون بـە پەسـەند کردنـی و بە دامەزراندنی حکوومەتێکی سەرۆکایەتی لە دوای هەلبژاردن .

٢٠٠٢/١/١٠ ڕوناکبیرو دیموکراتیخوازی کورد حوسێن جەمیل کۆچی دوای کرد ، کە ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە دارشتنی دەستووری کاتی ئێراق ، بۆ یەکەم جار کە تیایدا هاتبوو لە برگەی/ ٣ی دەستوورەکە ، بە هاوبەشی کوردو عەرەب لە خاکی ئێراق .

**تێبینـی :– لە بارەی بەندەکانی پـەیوەندن بە مـافی کورد دەتوانی بگەرێیتەوە بۆ بەرگی سێیەم کە باس لەو ماددەو خاڵانە کراوە .**

٢٠٠٢/١/١١ دامەزراندنی گرتووخانەی گوانتانامۆ لـە لایـەن ئیـدارەی ئەمـەریکاو هێزەکـانی سووپای ئەمەریکا . جێگـەی روونکردنەوەیـە



کە گرتووخانەی گوانتانامۆ دەکەوێتە بنەکەیەکی دەریاوانی ئەمەریکی لە کەنداوی کووبا ... کە ئێستا وەکوو سومبوولی زیادە ڕۆییەکانی شەڕی دژە تیرۆر لێی دەرواندرێت ، کە ئیدارەی ئەمەریکا بە سەرکردایەتی جۆرج بۆش بەرێوەوە دەچێت ... پێش دامەزراندنی ئەم گرتووخانەیە ، بنکە سەربازیەکە تەنها ٥٠٠ سەربازی لەخۆ دەگرت ... بەڵام ئەمڕۆ هەزاران سەربازو فەرمانبەری ئەمەریکی تیا کاردەکات.

گوانتانامۆ دەکەوێتە بنکەیەکی دەریاوانی ئەمەریکیەوە لە کەنداوی کووبا کە لە ساڵی ١٩٠٣ کووبا دەستی لێ هەڵگرتووە بۆ ئەمەریکا وەکوو سوپاسگوزاریەك و لەو هاوکاریەی کە لە شەڕی دژ بە ئیسپانیادا ئەمەریکا پێشکەشی کردن .

هەروا گوانتانامۆ ئێستا ٨٠٠ بەندکراوی تیایە کە هێشتا ٢٧٠ یان چەند ساڵێکە لەو گرتووخانەیە ماونەتەوە ، بەبێ ئەوەی تۆمەتیان ئاراستە بکرێت . هەروا لە ساڵی ١٩٣٤ ڕێکەوتنامەیەکی نوێ هاتە کایەوە بەوەی کە کووبا ساڵانە ٥٠٠٠ هەزار دۆلار لە ئەمەریکا وەردەگرێت وەك کرێ ، بەمەرجێك هیچ لایەنێك بۆی نەبێت ئەو ڕێکەوتنامەیە هەڵوەشێنێتەوە .

کە لە ساڵی ١٩٦٠ کووبا کرێی ئەم دورگەیە وەردەگرێت ... لە گەڵ ئەوەشدا وڵاتانی جیهان بە تایبەتی وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی داوای داخستنی گرتووخانەی گوانتانامۆ دەکەن بەهۆی بوونی خەڵکی ئەو وڵاتانە لەو گرتوو خانەیەداو هەوڵەکان بەردەوامن لە وڵاتە جیاجیاکان لە جیهان.



٢٠٠٢/١/١٢ دەرچوونی بڕیاری هەلووەشاندنەوەی لە سێدارەدانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی باکووری کوردستان – p.k.k – عەبدوڵڵا ئۆجەلان بۆ زیندانی درێژخایەن ، بەهۆی پاڵە پەستۆی دەسەلاتی نێوودەووڵەتی بە تایبەتی ڕێکخراوی ماف

مرۆڤو یەكیەتی ئەوروپا و كەسایەتی دیكەی نێودەوولەتی لە هەرێمە جیا جیاكانی جیهان .

٢٠٠٢/١/١٢ ڕۆژنامەنووسی ناوداری توركی – محەمەد عەلی پیران – لە ڕۆژنامەی – توركیش دیلی نیووز – دا گووتی:– پارتی كرێكاران لە باكووری كوردستان لەناوبراو ، بەلام گەلی كوردی باشوور لە بیر كران و بۆچی داواو نیازی گەلی كورد بە پێی بەلێنەكان جێبەجێ ناكرێت ، كە سوودمەندی بۆ دوا ڕۆژی توركیا هەیە لە هەرێمەكدا .

٢٠٠٢/١/١٤ دەسەلاتی ناوەندی ڕژێمـ بەعسی لە ئێراق ، داوای ل ڕژێمی توركیا كرد ، ك یارمەتی ئەمەریكا نەدات ل هەر هێرشێك بۆ سەر ئێراق لەو كاتەش سەرەك وەزیران توركیا بلند ئەجەوید سەردانی ئەمەریكای كردو باسی لە كێشەی ئێراق و بوونی ناوچەیەكی ئازاد لە باشووری كوردستانی كرد ، بە مەترسی لە بوونی دەوولەتێكی دوا ڕۆژی كوردو كاردانەوەی بۆ سەر ڕژێمی تورك و وولاتانی دیكە لە هەرێم و ناوچەكەدا .



٢٠٠٢/١/٢٤ سەرەرای گومانی لێكردن لە دەستووری نوێی كۆنگۆ بەرازافیل و ڕەزامەندی لە لایەن گەلی كۆنگۆی لە سەركرا كە لە ٨٤,٢٦٪ دەنگدەران دەنگیان بۆ دەستوورەكەدا لە راپرسیەكدا كە رۆژی یەكشەممەی رابردوو ئەنجامدرا . بەلام لە ١١,٢٩٪ دەستوورەكەیان ڕەتكردەوە ، دوای ئەوە حكوومەتی

کۆنگۆ بەرازافیل لەراگەیاندنێکیدا رایگەیاند ، کە بەشێوەیەکی گشتی ٧٨٪ی دەنگدەران بەشداریان لەو راپرسیەدا کرد بۆ دەنگدان بە رەزامەندیان لە سەر ئەم دەستوورە کە ژمارەی دانیشتوانی ١,٦٠٠,٠٠٠ هەزار کەسە سەرەرای بوونی دەیا پارت و رێکخراو بەداواکردنیان بە بەشداری نەکردن لەو راپرسیەدا .

بەلاّم راپرسیەکە ئەنجامدراو سەرکەووتنی بەدەست هێنا ... کە ئەم دەستوورەش ماوە بە دەسەلاّتی سەرۆکی کۆنگۆ – دینیس ساسۆ – دەدات دەستووری نوێی کۆنگۆ بەرازافیل ماوەی دەسەلاّتی سەرۆکی وولاّت لە پێنج ساڵ بۆ حەوت ساڵ درێژکردەووە .

هەروا دەسەلاّتی سەرۆکی وولاّتەکە دەتوانیٚ پلەی سەرەك وەزیران هەڵووەشێنێتەوەو سەرەك وەزیران دەربکات و دابمەزرێنێت .

هەروا دەسەلاّتی سەرەك کۆمار بە پێی دەستووری نویٚ دەتوانیٚ پەرلەمان هەڵبووەشێنێتەوەو پەرلەمانێکی نویٚ لە گەڵ ئەنجوومەنی پیران دابمەزرێنێت ... هەروا لە دەستووری نوێی وولاّتەکەدا هاتووە کە پەرلەمان ناتوانیٚ سەرەك کۆمار دەربکات و دابمەزرێنێت .

٢٠٠٢/١/١٦ سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان بە ناوی ئەنجوومەنی کوردستان بانگەوازێکی ئاراستەی پەرلەمانتاران‌و رێکخراوو ئەنجوومەنە جیهانیەکان کرد ، لە بارەی هێرشە ڕاگەیاندنەکانی ڕژێمی تورکیا لە سەر ئەو بارو دۆخەو ئەو ئەزمونەی کە لە باشووری کوردستان هەیەو مەترسیدارە بۆ دوا ڕۆژی ئەو وولاّتانەی کوردیان پیٚ لکێنراوە بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٣/٢٤. مۆرکراو لە لایەن وولاّتانی هاوپەیمان بە سەر کردایەتی بەریتانیا .




٢٠/١/٢٨ ســەرۆكی ئەمــەریكا لــە بــەردەم كۆنگرێــسی ئەمــەریكا– جـۆرج بـۆش – گــووتی:– ئەمــەریكا بــە دوای ئــازادیو دادپــەروەری هــەموو ناوچــە جیاجیاكـانی جیهانـدا دەگـەڕێو هـیچ دەووڵـەتێك مـافی ئـەوەی نیـە مـافی نەتەوەكانی دیكە زەوت بكات... ئەی كورد...!.

٢٠٠٢/٢/١٨ مۆركردنی رێكەوتننامەی نێوان یەكیەتی نیشتیمانی كوردستان و كۆمەڵی ئیسلامی لە هەرێمی باشووری كوردستـان ، لـە پێنـاو هاوكـاری و یارمـەتی دانی یەكتری و بەلاوەنانی كێشەكان .

ئــەم رێكەوتنــەش لــە ٢٠٠٢/٢/١٨ مــۆركرا لــە دوای زنجیرەیــەك لــە كۆبوونەوەو چاوپێكەوتن ... بە پابەندبوونی هەردوو لا بە رێكەوتنامەكەی تارانی پایتەختی ئێران لە ١٩٩٧/٤/٣٠ ، لە لایەن یەكیـەتی نیشتیمانی

کوردستان و لە گەڵ کۆمەڵ و بزووتنەوەی ئیسلامی لە باشووری کوردستان . کە ئەم ڕێکەوتنەش لە ١٤ خاڵ پێکهاتبوو لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە هەرێمەکەدا .

تێبینی :- بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ هەردوو ڕێکەوتنامەکە .

٢٠٠٢/٢/١٨



سەرەك کۆماری سیرالیۆن - ئەحمەد تیجان کەیا - ووتارێکی بەبۆنەی کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆی وولاتەکەی لە دەرەوەی پایتەختی سیرالیۆن - فریتاون - بەرامبەر بە دەیا هەزار کەس خوێندەوە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە شەڕی ناوخۆی سیرالیۆن بەدژوارترین شەڕ دادەنرێت لەم وولاتە لە کێشووەری ئەفەریکیا .

هەروا لەم ووتەی سەرۆکی سیرالیۆن دا بەشێوەیەکی فەرمی بە کۆتایی هاتنی شەری ناوخۆی ڕاگەیاند ...لەم ئاهەنگەشدا هەردوو لایەن - سەرۆکی سیرالیۆن و سەرکردەی بەرەی شۆڕشگێری یەکگرتووی سیرالیۆن پیرۆزباییان پێشکەش بەیەکترو گەلی سیرالیۆن کرد بەم بۆنەیە ... هەروا حکوومەتی سیرالیۆن و بەرەی شۆرشگێر بەڵێنی ئەوەیاندا . کە لە دوای ڕۆیشتنی هێزی نێوو دەووڵەتی لەم وولاتەدا هاوکاری و کاری هاوبەش زیاتر بکەن لە بەرەو پێشبردنی وولاتەکە لە هەموو بوارەکاندا .

لە دوای کۆتایی پێ هاتنی شەڕی ناوخۆو دەست پێکردنی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی لە ٢٠٠٢/٥/١٥ ئەنجامدراو سەرۆکی سیرالیۆن ئەحمەد تیجان بە پلەی یەکەم دەنگەکانی بە دەست هێنا و بە پلەی دووەمیش باڵێوراوی پارتی مللی گشتی - ئیرنست کروما - و پلەی سێیەم پارتی شۆرشگێری سیرالیۆن ... ئەم هەڵبژاردنەش لە بارو دۆخ و کەشێکی لە بار ئەنجامدرا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٢/٢/٢٢ نووسـراوی پارێزگـای مووسـڵ بـه ژمـاره/٨٠٣ ، کـه ئاراسـتەی یەکـەکانی کـارگێری کـردووەو تیایـدا دووپـاتی ئـەوە دەکاتـەوە بـۆ زیـاتر کردنـی ئـەم ناحیانەی خوارەوە ئەوانیش:
فاروق- ئەلقوش- زمار- رەبیعە- مەرجی ئەم بەڵگەنامەش بۆ جوتیاران ئەوەیـە ، کـه پەیوەسـت بـن بەگواسـتنەوەی تۆمارگاکانیـان و بـاری شارستانی و پسولەی خۆراك ، ئەم زەویە کشتووکاڵیانەش به هیچ جۆرێك نەدەن بەکوردی ناحیەکان له ناوچەکەدا .



٢٠٠٢/٢/٢٥ حکوومـەتی ئـەنگۆلا لـه راگەیاندنێکیـدا کـوژرانی سەرکردەی شۆرشگێری - یۆنیتـا - جۆنـاس سـافیمبی - راگەیاند ، له لوانـدای پایتـەخت ، بـه هـۆی شـەڕی نێـوان هێزەکانی سووپای ئەنگۆلاو شۆرشگێرانی بەرەی رزگاری ئەنگۆلا ... بەڵام له لایەکی دیکه وتەبێژی فەرمی جووڵانەوەکە کوژرانی سەرکردەی بەرەی بە درۆخستەوە .
جێگـەی ئامـاژە پێکردنـه کـه - جۆنـاس سـافیمبی - یـەکێك بـوو لـه سـەرکردەکانی ئـەم وولاتـەو هـەوڵ و خـەباتی لـه پێنـاو بەدەسـت هێنـانی دەسـەڵات بـوو لـه ئـەنگۆلا لـەدوای کۆتـایی هـاتنی دەسـەڵاتی داگیرکـەری پرتوگاڵی له سەر ئەم وولاتەدا له ساڵی ١٩٧٥ .
سـەرەرای هـەرەس هێنـانی کـاری سـەربازی بەرامبـەر بـه هێـزی سـووپای ئـەنگۆلا و بـه بـروا پێکردنـی گـەلانی ئـەنگۆلا بـه دەنـگ پێـدانی لـه رێگـەی سندوقەکانی دەنگدان که سافیمبی کۆسپ بووه لـه بەردەم هەموو هەوڵـه خێرخوازیەکانی ناوخۆی ئەنگۆلاو دەرەوەی ئەنگۆلا ... که کێشەی نێوان جووڵانەوەی یۆنیتاو حکوومەتی ناوەندی بووه هۆکاری گیان له دەستدانی زیاتر له نیوو ملیۆن کەس بەر له ٢٥ ساڵ تاکوو ئێستا لەم وولاتەدا .

٢٠٠٢/٣/٩ وەزیری بەرگری مەدەغەشقەر – ژەنەراڵ مارسیل رانگیڤا – دەستی لە کار کێشایەوە بە هۆی دەست بە سەراگرتنی باڵەخانەی وەزارەتەکە لە لایەن ئیدارەی نوێ ، کە – مارك رافالۆماناتا – لە راگەیاندنێکیدا بەخۆکردنە سەرۆکی مەدەغەشقەر – هەروا سەرۆکی وولاتەکە – دیدی راتسیراکا – رایگەیاند کە حکوومەت لەو وولاتەدا رۆڵی نەماوەو ئەو ئیدارە توانای خۆی لەدەست داوە لە سەر وولاتەکەدا .

لەو کاتەشدا باران و زریانێکی گەورە لە وولاتەکە نزیك دەبێتەوە بە شێوەیەکی زاکزیکی – حلزونی – کەمەرەیی لە دوورگەی مەدەغەشقەر کە دەکەوێتە زەریای هیندی ... هەروا لەوکاتەشدا دەسەلاتەکەی سەرۆکی وولات – راتسیرکا – دەسەلاتی لە سەر وولات نەما ... جێگەی باسکردنە کە دەست بەسەراگرتنی باڵەخانەکە لەلایەن جێگری وەزیری بەرگر – ژەنەراڵ جۆلی مامبزارا – بوو لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٢/٣/١٤ مۆرکردنی رێکەوتنامە لە نێوان هەردوو کۆماری سربیا و چیای رەش – جبل الاسود – کە ئەم دوو کۆمارە یەکیەتی یۆگسلافیا پێك دێنن ، ئێستا کە هەردوو دەوڵەت نیمچە سەربەخۆن لە گەڵ یەکترو هەر یەك لەو دوو کۆمارە کاروباری ناوخۆو دەرەووەو دەبەن بەرێووە لە بواری ئابووریدا .

ئەم رێکەوتنەش بووە هۆکاری ئەوەی کە ناوی وولاتی یۆگسلافیا تەنیا لە لاپەرەی مێژوو تۆمارکراو و ناوی نوێ بووە یەکیەتی نوێی سربیا و جەبەل

ئەسـوەد . بـەڵام هاوبەشـن لـە هەنـدێ دام و دەزگـای سـەرۆکایەتی وەك سەرۆکی یۆگسلافیاو وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی دەرەوە .

ئـەم ڕێکەوتنـەش بەبـڕیووانی ئـەوروپا بـوو کـە لـە سـەرۆکی یۆگسلافیا – فویـــسلاڤ کۆشنۆنیتـــسا – و ســـەرۆکی جەبـــەل ئەســـوەد – میلـــۆ دیووکانۆفیتش – و سەرەك وەزیرانی سربیا – زووران دینـدیتش – لەگـەڵ ڕێکخەری کاروباری دەرەوەی یەکیەتی ئەوروپا – خافێز سۆلانە – مۆرکرا . هـەر چەند ئەو ڕێکەووتنە بە ڕێکەووتنێکی مێـژوویی ناوزەنـدکرا ، کە جەبەل ئەسوەد ماڤی خۆی پارێزراو بوو لە بە ئەنجامدانی ڕاپرسی لە بارەی سەربەخۆیی ، دوای سێ سـاڵ لە وولاتەکەداو جیابوونـەوەی لـە دەوولـەتی یۆگسلافیا بـە شـێوەیەکی فـەرمی و بـوونی بـە دەوولـەتێکی سـەربەخۆ لـە ناوچەی بەلکان .

سەرەرای ئەوەش وولاتانی رۆژئاوا لە گەڵ جیابوونـەوەی جەبەل ئەسـوەد نەبوونـە لـە سـربیا بـە هـۆی ئـەوەی کـە هـەنگاوێك بێـت بـۆ ئەلبانیـەکان لـە هەردوو هەرێمی مەکدۆنیا و کۆسـۆڤۆ و سـربەکان لـە بۆسـنەدا ، لـە هـەمان کـات دەتـوانرێ سـەر لـە نـوێ هێڵـی سـنووری دابرێـژرێت لـە نێـوان ئـەو هەرێمانەدا .

جێگـــەی ئامـــاژە پێکردنـــە کـــە کۆمـــاری یۆگـــسلافیا لـــە دوای مردنـــی دامەزرێنـەری ئـەم وولاتـە – جۆزێـف تیتـۆ – لـە سـاڵی ١٩٨٠ کـەرت بـوونی بـەخۆوە بینی کـە چـوار کۆمـارە لـە نـاو سـنووری یۆگسلافیا سـەربەخۆیی خۆیان راگەیاند .ئەوانیش :– کرواتیا و ، سلوڤینیاو ، بۆسنەو ، مەکدۆنیا بوو لەو وولاتەدا ... کە جیابوونەوەی مەکدۆنیا و سلۆڤینیا بەشێووەیەکی ئاشتیانە بـوو ، بـەڵام جیابوونـەوەی کرواتیـاو بۆسـنە بـووە هۆکـاری شـەڕی ناوخۆیی لـە دوو قۆنـاخ لـە بـەلکان و تاوانـەکانی جـەنگی دژ بـە مرۆڤایـەتی لێکەووتەوە ، کە بێ وێنە بوو لە دوای جەنگی دووەمی جیهاندا .

٢٠٠٢/٣/٢٥ ڕوودانی گومە لەرزە بە هێزی /٦ پلە بە پێوەری ڕیختەر لە ناوچەی دووزێ لە چیاکانی کۆشی هند ، لە ئەنجام بووە هـۆی کوشـتنی ١٠٠٠ هـاووڵاتی و برینـدار کردنـی بـە دەیـا هـاووڵاتی و وێرانکردنـی چـەندین گونـدو دارو دارستان و کێڵگەی کشتووکاڵی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٢/٣/٢٩ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر پێشوازی لە شێخی ئەزهەر محەمەد سید قەرەزاوی کرد لە بارەگای تایبەتی خۆی لە شاری لندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لە پێناو بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ئیسلام و مەسیحیەکان لە جیهاندا .



٢٠٠٢/٤/٣ هەلبژاردنی پەرویز مشەرەف بۆ پۆستی سەرەك کۆماری پاکستان لە دوای ڕاپرسی بە مانەوەی لە دەسەلات ، کە خۆی لە ڕێگەی کودەتای سەربازی دەسەلاتی گرتە دەستو نەواز شەریفی لە دەسەلات لابردو بە پەنابەر ڕەوانەی شانشینی سعوودیە کرا .



٢٠٠٢/٤/٣ بالوێزی ئێراقو سووریای پێشوو ، نووسەری بەناو بانگ ولیەم ئیکلتن ، کە خاوەنی کتێبە بە ناوبانگەکەی – کۆماری مەهاباد– و دۆستی کورد لە گەڵ – چارلس ئەی فۆرێست – سەردانی باشووری کوردستانیان کردو لە گەڵ بەرپرسانی هەرێمی کوردستان کۆبونەوەیان ئەنجامدا .لە شاری هەولێری پایتەخت .

٢٠٠٢/٤/٤ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی شەڕ وەستان لە نێوان حکوومەتی ئەنگۆلاو بەرەی رزگاری ئەنگۆلا – یۆنیتا – ئەمەش بەکۆتایی پیٚ هێنانی شەڕی ناوخۆ لە نێوان هەردوو لایەن کە ماوەی ٣٠ ساڵی خایاند ...ئەم ڕێکەوتنەش لە دوای کوژرانی سەرکردەی جوڵانەوەکە – جۆناس سافیمبی – دەبێت ، کە سیٚ هەفتە بەر لەو مێژووە کوژرانی راگەیاندرا لە لایەن حکوومەتی ئەنگۆلا لە لواندای پایتەخت .

هەروا هەردوو لایەنی مۆرکەر لە سەر ڕێکەوتنەکە بەندێك دەست گیربوونیان پابەند دەکات بە ٩٤ بەندەکەی دیکە ، کە بەر لەو ڕێکەوتنە ڕێکەوتنەکانی دیکە هەرەسیان هێنابوو سەرەرای مۆرکردنی لە نێوان حکوومەتی ئەنگۆلاو جووڵانەوەی یۆنیتا .

هــەروا لــە ڕێــوو ڕەسمــی مـۆرکردنی ڕێکەوتننامەکـە چـەندین نووێنـەری وولاتــانی دراوســێی کۆمــاری ئـەنگۆلاو نووێنــەری ڕێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان ئامــادەی بــوون ... یــەکێك لــە بەنــدەکانی ڕێکەوتنەکــە هێزەکانی سووپای یۆنیتا کە ٥٠ هەزار سـەرباز لـەخۆ دەگرێ بچێتە ڕیـزی سووپا و پۆلیس و ئاسایشی ئەم وولاتە.

٢٠٠٢/٤/١٧ ســــــەرۆکی نــــــوێی هەڵبــژێراوی تــەیمووری ڕۆژهــــەلات – زنانــــا جۆسمــاو – لـە وتەیەکیدا بــە بۆنــەی ســەرکەوتنی وگووتی:–



به هەموو توانایـەك هـەوڵی سەرکەوتنی پرۆگرامەکانم دەدەم لە ماوەی پێنج ساڵی داهاتوودا لە هـەموو بوارەکــان ... جێگــەی ئامــاژە پێکردنــە کــە ئەمــە یەکــەم هەڵبــژاردنی ســـەرۆکایەتیە لـــە تـــەیمووری ڕۆژهـــەلات ئـــەنجام دەدرێـــت لـــە دوای جیابوونــەوەی لــە ئەندۆنیــسیا ، کــە جۆسمــاو تیایــدا ســەرکەوتنی لــێ بەدەست هێنا .

تــەیموری ڕۆژهــەلات هــەژارترین دەووڵــەتی نوێیــە لــە ئاســیا ، لــە دوای ڕاگەیانــدنی ســەربەخۆیی ... ئـەم هەڵبژاردنــەو ســەرکەوتنی جۆسمــاو لــە نــاووەوەو دەرەووەی تــەیمووری ڕۆژهــەلات پێــشوازی گــەرمی لێکــرا .لەوانەش ئوستراليا .

کــە ئوســترالیا وولاتێکــی پــارێزەری تــەیمووری ڕۆژهــەلات بــوو بــە هۆکارەکانی تووندو تیژی لەم وولاتـە نوێیـەدا . لـەم هەڵبژاردنـەی جۆسمـاو کــە لــە ٨٣٪ دەنگــی بەدەســت هێنــا بەرامبــەر بــە بەرهەڵــستکارەکەی فرانسیـــسکۆ زافــیر بــە ١٧٪ ی دەنگـــەکان کـــە ڕێکخـــراوی نەتـــەوە یەکگرتووەکان کاروبارەکـانی تـەیمووری ڕۆژهـەلاتی گرتـە دەسـت تـاکوو ڕاگەیاندنی تەواوی سەربەخۆیی لە ٢٠٠٢/٥/٢٠ لەم کێشوورەدا .

٢٠٠٢/٤/٢٢ مـــۆرکردنی ڕێکـــەوتنی هـــەردوو ســــەرۆکی مەدەغەشـــقەر – مـــارك رافالۆمانانـــا – ســـەرۆکی بەرهەڵـستکارو ســـەرۆکی کودەتـــای ئاشـــتی لـــەم



وولاتـەو – دیـدیر راتـسیراکا – سـەرەك کۆمـاری مەدەغەشـقەر، لـە پێنـاو بەرەو ئاشتبوونەوەی گشتی . کە سەرۆك مارك رەزامەندی خۆی بۆ دیدیر نیـشاندا کـە واز لـە سـەرۆکایەتی وولاتەکـە بهـێنێ لـەدوای خـۆکردن بـە سەرۆکی وولاتەکە ، کە بەچەند مەرجێکی هاوبەش لە نێوانیاندا .

کە ئەمەش لە دوای شەڕو پێکدادان هات کە لە ئاکامدا زیاتر لە ٣٥ کـەس گیانیـان لەدەسـتداو بـەدەیا کەسـیش زامـداربوون لـە – ئـەنتاناناریڤۆ –ی پایتەختی مەدەغەشقەر ... هەروا رەزامەندی سەرۆك دیدیر بە دووبارە لێك جیاکردنـــەوەی دەنگـــەکانی هەڵبـــژاردنی مـــانگی/١٢/٢٠٠١ ... هـــەروا گەراندنەوەی بارودۆخەکە وەك باری پێشوو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٢/٥/٤ بەرپرســـانی – خـــاکی سـۆماڵ – کـە یـەك لایەنـە لـەو هەرێمـەدا کۆمـارێکی ســـەربەخۆییان لـــە نـــاو چوارچـێووەی سـنووری وولاتی سۆماڵ راگەیانـد و تـاهر ریـال کیهانیـان بـە ســـــەرۆکی نـــــوێی




کۆمارەکەیان دامەزراند ، لە دوای مردنی سەرۆکی دامەزرێنـەری کۆمارەکـە – محەمەد ئیبراهیم ئیگال – کە تاهیر جێگری سـەرۆك کۆمـاری کۆچکـردوو بوو . ئەمەش لە دوای کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی بەرپرسانی ئەم هەرێمـەدا بەپێی دەستوورەکەیان .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کـە محەمـەد ئیبراهیم بە سـەرۆکی سـەربەخۆیی و

جیاكەرەوەی هەرێمەكە لە ساڵی ١٩٩٣ هەڵبژێردرا ... گەرچی وولاتانی جیهان دانیان بەو كۆمارە نەنا لە ناو خاكی سۆماڵ ... هەڵژاردنی ئیگال لە لایەن ئەنجوومەنی ئەعیان بوو ، كە لە كەسایەتیە سەرەك هۆزو تیرەكانی هەرێمكە پێك هاتبوون .

لەوكاتەی كە سۆماڵ دابەش بوو بۆ ٢٠ پارچە و هەر پارچەیەكیش سەركردایەتی جەنگی سەركردایەتی دەكردو زانیاریان نەبوو لە هیچ بوارێك لە بوارەكانی هەڵسووراندنی كاروبارە جۆراو جۆرەكان . تەنیا شەڕكردن نەبێت لەم وولاتەدا .

٢٠٠٢/٦/٥



لە ئاكامی لێكۆڵینەوەیەكی تیروو تەسەل لە سەر بازرگانی كردن بە مرۆڤ ، كە وویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ئەوەی ئاشكرا كرد ، كە لە ماوەی ساڵی ٢٠٠١ زیاتر لە ٤,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن مرۆڤ بازرگانی پێوە كراوە بەكرین و فرۆشتن ...بەم هۆیەش ١٩ وولات تاوانبار كران كە هەڵنەستاون بەرێگەگرتن لەم كارە نا مرۆییە لە جیهاندا .

لە هەمان كات وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریكا لە راپۆرتی ساڵانەی خۆیدا لە سەر بازرگانی كردن بە مرۆڤ ، كە ئەم وولاتانەش ، ئەفگانستان – ئەرمینیا – قرغیزستان – كە لە لیستی رەش ناویان تۆماركراون . هەروا راپۆرتەكەش ئەوەی ئاشكراكرد كە لە ماوەی ساڵی رابردوو زیاتر لە ٧٠٠ هەزار كەس لە ژن و پیاو و منداڵ فرۆشراون و كراون .

ئەم بازرگانی پێوەكردنەش لە پێناو بەكارهێنانیان بووە بۆ كاری سكسی و كاری خراپەكاری لە باروودۆخێكی نادیار و لە دام و دەزگا گەشت و گوزاریەكان كاریان پێوە دەكەن .

ئەویش لە پێناو بەدەست هێنانی قازانج و هەروا لە بوارەكانی دیكەی بیناسازی و كشتووكاڵ بەرامبەر بە رۆژانەیەكی زۆر كەم ، كە تەنیا بەشی

ئەوەیان بکات کە نەمرن ... ئەم وولاتانەی کە بەم کارانە هەڵدەستن بۆ سێ کۆمەڵ دابەشکراون ئەوانیش ... ئەفگانستان و ، ئەرمینیا و ، بەحرێن و ، رووسیای سپی و ، بۆسنەو ، میانمار و ، کەمبۆدیاو ، یۆنان و ، ئەندۆنیسیا و ، ئێران و ، قرغیزستان و ، لبنان و ، قەتەرو ، رووسیا و ، سعوودیەو ، سوودان و ، تاجاکستان و ، تورکیا و ، ئیماراتی عەرەبی ... بەڵام ئەو وولاتانەی کە دەست گیرن بە یاسای قەدەخەکردنی بازرگانی کردن بە مرۆڤ ئەمانەن :- فەرەنساو ، بەلژیکا و ، ئەلمانیا و ، سویسرا و ، کۆریای باشوور و ، کۆلۆمبیا.

٢٠٠٢/٦/٨ کۆنفرانسی کورد - کورد کلیلی سەقامگیری ئێراقە - کە لە مەڵبەندی مستەفا بارزانی لە زانکۆی ئەمەریکا بە رێووە چوو. لە پێناو ئاسانکاری کردن لە چارە سەر کردنی کێشەکان لە ئێراقدا .

٢٠٠٢/٦/٨ لە دوای زیاتر لە مانگێك لە پشکنینی بەردەوام لە گردی وەستا عارەب لە باکووری رۆژئاوای شاری هەولێر لە باشووری کوردستان ، توانرا کەلوپەلی شووێنەواری بەر لە ٦٠٠٠ هەزار ساڵ بدۆزرێتەوەوئەو کەلوپەلانەش لە مۆزەخانەی شارستانی هەولێر پاراستراوە ، کە هۆکاری بەهێز بوونی کەلەپووری کوردەواریە لە کوردستان .

٢٠٠٢/٦/٩ کۆچی دوایی نووسەرو فۆلکلۆر پەروەری کورد مامۆستا - محەمەد کەریم شەریف - شایانی باسە ئەم نووسەرە لە ساڵی ١٩٤٦ لە گوندی گاینجی سەر بەناحیەی خەبات سەر بەقەزای دەشتی هەولێری سەر بە پارێزگای هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان چاوی بەجیهان هەڵهێناوە ... لە ساڵی ١٩٥٤ باوکی ماڵی لە گوند بار دەکات و دێتە شاری هەولێر و لێی نیشتەجێ دەبێت لە گەرەکی تەیراوە .

لە ساڵی ١٩٥٦ دەچێتە قوتابخانەو لە ساڵی ١٩٦٩ کۆتایی بە قۆناخەکانی خوێندن دێنێ و دەبێتە مامۆستاو بۆ یەکەم جار لە گوندی بیشەی بناری چیای حەسەن بەگ لە دە قەری سۆران بە مامۆستا دادەمەزرێ ... پێنووسەکەی بۆ یەکەم جار دەست دەکات بە کۆکردنەووەو تۆمارکردنی گەلێك دەقی چیرۆك و شیعری فۆلکلۆری کوردی و بەچاپیان دەگەیەنێ ... کە بەرهەمەکانی یەکەم فۆلکلۆری یاریەکانی کوردەواری لە

سالّی ١٩٧١ بە چاپدەگەیەنیّ . دووەم بەرهەمی فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری لە سالّی ١٩٧٤ بەچاپدەگەیەنیّ ... سیّ یەم بەرهەمی سوارچاکی لە لاوکی کوردەواری دا لە سالّی ١٩٧٨ بەچاپدەگەیەنیّ لە گەلّ چەندین بەرهەمی دیکە .

لە دوای دامەزراندنی یەکیەتی نووسەرانی کورد لە ١٩٧٠/٢/١٠ و بەستنی یەکەم کۆنگرە لە ٢٣-١٩٧٠/٦/٢٤ ، بە بوونی بە ئەندامی ئەو یەکیەتیە و لە کۆنگرەو کۆنفرانسەکان بەشداری کردووە و رۆلّی بالاّی هەبووە لە بوارەکانی نووسینی فۆلکلۆری کوردی لە کوردستان .

٢٠٠٢/٧/١١ تابلۆی قەسابخانەی بیّ تاوانەکان لە فرۆشتنێکی ئاشکرا گەیشتە ٤٩,٥ ملیۆن جوونەی ئیستەرلینی – ئەم تابلۆیەش کە لە لایەن هونەرمەندی ناوداری جیهان – روبنز – کێشرا بوو لە مەزادی ئاشکرا لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لە – سزبی – فرۆشرا

ئەم تابلۆیەش تووانی سەرکەوتنی بیّ وێنە بەدەست بێنیّ نەك لە بەریتانیا بەلّکوو لە هەموو جیهان ، سەرەرای ئەوەی کە ناوی کریاری ئەم تابلۆیانەشیان ئاشکرا نەرکرد .

ئەم تابلۆیەش لە نێووان سالّەکانی ١٦٠٩ – ١٦٦١ وێنەکەی کێشرابوو ... کە بەگرنگترین و نایابترین تابلۆ ژمێردرا لە جیهان ... کە ئەمەش یەکەم تابلۆی هونەرمەند – روبنز – بوو کە لەو ماوەیە دەفرۆشێت لە ماوەی بیست سالّی رابردوودا لە جیهان .

٢٠٠٢/٧/١٢ خۆپیشاندان و نارەزایی دەربرین لە ژێر دەستەی – چیای تارق – رۆژ بە رۆژ بەرەو توندو تیژتر هەنگاو دەنێ بە هۆی ئاشکراکردنی نیازەکانی بەریتانیا بەدابەشکردنی سەربەخۆیی ئەو هەرێمە لە نێوان بەریتانیاو ئەسپانیا ... ئەم ئاشکراکردنەش لە لایەن دادووەری بەریتانیا بوو لە – چیای تارق – دیڤید دووری – هات لە ڤیستیڤاڵێکی سەربازی ئەویش بە خوێندنەوەی ووتەکەی بەرامبەر بە هێزەکانی سەربازی بەریتانیا لەم هەرێمەدا .




لەو کاتەش حکوومەتی چیای تارق دەیەوێ کێشەی هەرێمەکە بەرای گشتی جیهان رابگەیەنێ .



ئەویش لە دیاریکردنی داهاتووی ئەو هەرێمە لە رێگەی راپرسی مللی لە ماوەی چەند مانگی داهاتوو و دەربرینی نارەزایی دانیشتووانی هەرێمەکە دژی دابەشی ئەو هەرێمە لە نێوان بەریتانیاو ئسپانیا.

لە بەر ئەوەی وەزیری دەرەوەی شانشینی بەریتانیا جاکسترۆ لە راگەیاندنێکیدا گووتی :- بەریتانیا رازییە لە سەر دابەشکردنی سەربەخۆیی هەرێمەکە لە ئەسپانیا ... ئەمەش بۆ یەکەم جارە بە شێووەیەکی ئاشکرا رابگەیەنرێ بە دابەشکردنی سەربەخۆیی هەرێمی چیای تارق لە نێوان ئەسپانیاو بەریتانیا . هەر لەکاتی ووتەکەیدا ، جاکسترۆ بەرامبەر پەرلەمانی بەریتانیا لە لەندەنی پایتەخت رایگەیاند ، کە لە لەندەن و مەدرید لە سەر ئەمە رێکەوتوون و داوا لە دانیشتووانی

چیای تارق دەکات کە پێشنیاری هەر ڕێکەووتنێك بکەن و هەروا هەر ڕێکەوتنێك بۆ داهاتووی چیای تارق بێت دەبێ هەمیشەیی و هەمەلایەن بێت ئەویش لە پێناو سەقامگیری و بووژانەوەی ئەو هەرێمە ژێر دەستەیە بێت .

هەروا جاکسترۆ گوتی :– دەمانەوێ هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە بنکەکانی خۆیان جێگیربن لە ژێر سایەی بەریتانیا .

جێگەی باسکردنە کە چیای تارق ژێر دەستەی بەریتانیایە بەر لە ٣٠٠ ساڵ تاکوو ئێستا لە ناوچەکەدا . لەو کاتەشدا سەرۆکی حکوومەتی – چیای تارق – بیتر کاروانا – گووتی :– مەبەست لەو ڕاپرسیە دووپاتکردنەوە یە بۆ دانیشتووانی چیای تارق بەرەتکردنەوەی هەر ڕێکەوتن و دابەشکردنێك کە ئەنجام دەدرێت لە نێوان بەریتانیاو ئەسپانیا .

هەروا گووتی :– هەر ڕێکەوتنێك لە نێوان ئەو دوو وولاتەدا دژی تاوان و ئامانجەکانی گەلی چیای تارقە ... لەوکاتەشدا وەزیری کاروباری ئەورووپی بەریتانیا لە ڕاگەیاندنێکیدا گووتی :– دان بە هەر ڕاپرسیەك نانرێت کە لەچیای تارق ئەنجام بدرێت .

چیای تارق دەکەوێتە باشووری ئەسپانیا و کە ناوچەیەکی بچووکی رووبەر کەمەو ژمارەی دانیشتوانی ٣٠,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا لە ساڵی ١٨٣٠ بەریتانیا دەستی بە سەر ئەو هەرێمە بچوکەدا گرت و لە ساڵی ١٩٦٩ ماوەی پێدا کە حکوومەتێکی تایبەتی بۆخۆیان دابمەزرێنن کە سەر بە حکوومەتی بەیتانیا بێت .

٢٠٠٢/٧/٢٠ کۆچی دوایی گۆرانی بێژی ناوداری کورد عیسا بەرواری لە شاری دهۆك لە هەرێمی باشووری کوردستان و تەرمەکەی لە گۆرستانی شاری دهۆك بە خاك سپێردراوە لە شارەکەدا .

٢٠٠٢/٧/٢١ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لە نێوان حکوومەتی سوودان و جوولانەوەی ڕزگاری باشووری سوودان ، بە پێك هێنانی حکوومەتێکی فیدراڵی و جیاکردنەوەی ئاین لە دەووڵەت و دابەشکردنی دەسەلات و سامان ، بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لە نێوان باشوورو باکوورو گەلانی دیکەی

پێك هاتەكانی سوودان .

تێبینی:– دانەنانی وێنە لە گەڵ هەر مێژوویەك ، لە بەر ئەوەی لە جێگەی دیكە دانراوە . لە گەڵ ڕێزدا .

٢٠٠٢/٨/٢ پەرلەمانی توركیاو ڕژێمی توركیا لە بڕیارێكیدا یاسای لە سێدارەدانی هەڵووەشاندەوە ، تەنیا لە كاتی جەنگ نەبێت ، واتە – دیزە بەدەرخۆنەیە – چونكە ڕژێمی توركیا هەردەم لە جەنگە لە گەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كوردو ئەرمەن لە باكووری كوردستانی داگیر كراوی ژێر دەسەڵاتی توركیای بێ وێنە لە جیهان ، لە ئازاردان و ئەشكەنجەدانی گەلانی توركیا . بە تایبەتی ئەرمەن و كوردو ئەوەی لە نژاد تورك نین لە و وولاتەدا .

٢٠٠٢/٨/٣ پەرلەمانی توركیا لە دوای گەیشتن بەڕاستیەكان و بوونی نەتەوەیەكی زیاتر لە ٢٠ ملیۆن كورد گەلی دیكە بڕیاری دان پێنان بە خوێندنی زمانی كوردی وبلاوكردنەوەی پەخشەكانی هەردوو بەشی وێستگەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن بەكوردی لە دوای سەدان ساڵ لە كاری قركردنی كوردو كوردستان.



٢٠٠٢/٨/٢٨ دەست پێكردن بەجێ بەجێكردنی پرۆگرامی لە ناوبردنی مین لە وولاتی تشیلی كە زیاتر لە نیوو ملیۆن مین چێنراوبوو ، كە دژ بە مرۆڤ بوون لەو ناوچە سەر سنوورییانەی كە كەوتوونەتە سەر سنووری نێوان تشیلی و ئەرژەنتین و ، پۆلۆنیاو ، پیرۆ ، كە لە ساڵەكانی ١٩٧٠ چێنراوبوون ... بەم بۆنە سەرۆكی تشیلی – ریكاردۆلیگۆس لە ئاهەنگی تەقاندنەوەی زیاتر لە ٧٠ هەزار مین بەشداری كرد لە وولاتەكە دا .

جێگەی ئاماژە پێكردنە كە سەرۆكی پێشووی تشیلی دكتاتۆر – ئۆگستۆ

بینۆشیه – ئەو مینانەی چێنراو کرد بوو لە ترسی هێرش کردنە سەر حکوومەتەکەی لە سەر سنووری ئەو وولاتانە ... بە هۆی زۆری چێنراوی مینەکان کە ماوەی ١٠ ساڵی دەویَ بۆ ئەوەی ئەو مینانە بە تەواوی خاوێن بکرێنەوەو جێگەی مەترسیدار نەبن بەرامبەر بە هاو وڵاتیان و خەرجیەکانی هەڵگرتنن و تەقاندنەوەی ئەو ژمارە زۆرەی مینانە کە بەدەیا ملیار دۆلار خەرجی دەوێت .

هەروا حکوومەتی تشیلی بە سەرۆکایەتی لیگۆس ئاواتە خوازە وولاتەکەی پەیوەندی دراووسێیەتی لە سەر بنکەکانی ئاشتی بە یەکەوە ژیان بێت .

ئەمەش لە دوای بەرەو باش چوونی پەیوەندی تشیلی لە گەڵ حکوومەتەکانی ئەرژەنتین و ، بۆلۆنیا و ، پیرۆ دێت ، کە بەرەو باشی هەنگاو دەنیَ لە ناوچەکەدا ، سەرەرای بوونی کێشەی سنووری لە نێوان تشیلی و ، پۆلۆنیا و ، پیرۆ و هەوڵەکان بەردەوامن لە پێناو کەمکردنەوەی ئەو بارە گرژییەی کە لە نێوان ئەو وولاتانە لە هەموو بوارەکاندا بە تایبەتی لە لایەن سنووریدا .

٢٠٠٢/٨/٢٩ لە راگەیاندنێکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هێزەکانی سووپای روندا و ، ئۆگەندا . دەستیان کرد بە



کشانەوە لە کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی ...هەروا ووتەبێژ بە ناوی نەتەوە یەکگرتووەکان گووتی :– ئەو دوو وولاتە پشتگیری شەرکەرە هەمەلایەنەکانی ناوخۆی ئەو وولاتەیان دەکرد ... کە رواندا و ، ئۆگەندا لە ساڵی ١٩٩٨ بە دەیا سەربازیان رەوانەی ناو خاکی کۆنگۆی دیموکرات کرد بۆ پشتیووانی کردنی بەرهەڵستکارانی دژ بەحکوومەتی لۆرانت کابیلا لەو وولاتەدا .

هێزەکانی سووپای رەوانەکراو بۆ کۆنگۆی دیموکراتی زیاتر لە ١٥٠٠ هەزار سەرباز دەبوو بۆ پشتیووانی کردنی هەردوو لایەنی حکوومی و بەرهەڵستکار لەو وولاتەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە شەڕی ناوخۆی کۆنگۆی دیموکرات زیاتر لە ٢,٥ ملیۆن و نیوو کەس گیانیان لە دەستدا لە ئەنجامی ئەم شەڕە درێژخایەنە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٢/٩/٤ گرێدانی کۆبوونەوەی تایبەتی پەرلەمانی ئەورووپا لە شاری ستراسبۆرگ , یەك لە خاڵەکانی لە سەر باری کورد بوو لە باشووری کوردستانی لکێنراو



بەرژێمی ئێراق ، کە ژمارەی دەرکراو راگواستراوەکانی کوردستان لە لایەن رژێمی بەعس بە ٨٠٠,٠٠٠ هەشت سەد هەزار کورد مەزەندەکراو داوای لە رژێمی ئێراق کرد ، کە دەستبەرداری ئەو رامیاریەتە بێت لە بە عەرەبکردن وراگواستن و حکوومەتی ئێراقیش بەردەوام بوو لە کارەکانی بە عەرەبکردن وراگواستن و دەرکردنی خێزانەکان لە سەر ماڵ و ماڵی خۆیان لە هەرێمی باشووری کوردستان.

٢٠٠٢/٩/٨ مۆرکردنی رێکەوتننامەی ئاشتی بنەڕەتی لە هاوینە هەواری سەلاحەدین لە نێوان بەڕێزان مەسعوود بارزانی و



جەلال تاڵەبانی ، لە پێناو کۆتایی هێنان بە هەموو جۆرە ناکۆکیەك و گیروگرفتێك لە پەیوەندی هەردوو پارت لە هەرێمی باشووری کوردستان ، و دلخۆشکەری پارت و رێکخراوەکانی کوردستان و بەرەو پێش بردنی بارودۆخەکە ، لە بەرژەوەندی باڵای کوردو کوردستان .

بەڵام بە داخەوە تا تەواو بوونی ئەو مێژوونامە کێشەی نێوانیان بەردەوام بوو دوور لە خواست و ویستی بەرزی گەلی کوردو کوردستان . ئەویش بە

پاوانكردنی پارەو سامان و دەسەڵات ...؟...!.




٢٠٠٢/٩/١١ وولاتـی سویسرا بووە ئەندامی ١٩٠ لە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان ... بەم بۆنەش ئاهەنگی خۆشی لە بارەگای ڕێكخراوەكە لە شاری نیوۆركی ئەمەریكا گێردرا ...بەڵام وولاتی سویسرا و گەلانی سویسرا رووخساری ئاهەنگ گێرانیان پێووە دیارنەبوو ... ئەمەش لە دوای ٥٠ ساڵ هات ، كە وولاتـی سویسراو گەلانی سویسرا و دەسەڵاتە یەك لە دوای یەكەكانی سویسرا بوونی بە ئەندامی نەتەوە یەكگرتووەكانی رەتدەكردەووەو مانەوەی لەدەرەوەی ئەم ڕێكخراوەیەدا .

چەندین جار گەلانی سویسرا لە راپرسی بۆ چوونە ناو نەتەوە یەكگرتووەكانیانی رەتكردۆتەوە تا راپرسی سەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ لە دوای هەوڵ و كۆششكێكی زۆر بوونی بە ئەندامی نەتەوە یەكگرتووەكان راگەیاند ... دوای ئەوە گەلانی سویسرا لە راپرسی رۆژی ٢٠٠٤/٩/٢٦ یاسای سوككردنی نیشتەجێ بوونیان رەتكردەوە ... بەر لەوەش سویسرا لە ٢٠٠٠/١١/٢٢ باڵیۆزخانەی خۆی لە ئێراق كردەوە ، كە بە هۆی شەڕی كەنداوی یەكەم و دووەم باڵیۆزخانەی لە ئێراق داخستبوو ، وەك دەربرینی نارەزایی دژی شەڕەكانی كەنداو لەناوچەكەدا .

ئاشكرایە كە رژێمی سویسرا رژێمێكی زانستی فرەلایەن و فرە پارتیە و رژێمێكی دیموكراتیە و لە هەمان كات ڕێكخراوە جیهانیەكان بارەگا سەرەكیەكانی لەم وولاتانەو دراوی زۆربەی زۆری وولاتانی جیهانی لێ بە چاپدەگەیەنرێ ، ئەویش بە هۆی بوونی بەهایەكی باڵاو جێگەی بروا پێكردن ... وولاتی سویسرا بەدرێژایی مێژوو خۆی بێ لایەن گرتووە لە هەموو كێشەو شەڕە جیاجیاكانی وولاتانی جیهان .

٢٠٠٢/٩/١٣ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە پەراوێزی کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی/١٠ دە وولات



لە ناوەندو رۆژئاوای ئەفەریکیا ئەنجامدا ... ئامانج لەم کۆبونەوەیەش گرێدانی چەندین رێکەوتن لەگەڵ ئەو دەووڵەتانە لە سەر کرینی نەوت و پەرەپێدان و بازرگانی بوولە نێوانیاندا .

ئەویش لە پێناو دابینکردنی یەدەگی نەوت لەم کێشووەرە لە جیاتی وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست ، ئەویش بە هۆی ئەگەری لێدانی گورزێکی سەربازی لە رژێمی بەعسی لە ئێراق و بوونی کێشە لە رۆژهەلاتی ناوەراست ... ئەو دەووڵەتانەی کە سەرۆکی ئەمەریکا کۆبوونەوەی لە گەڵ ئەنجامدان زۆربەیان بەرهەمهێنەری نەوتن ، یاخوود بەرو بەرهەم هێنانی نەوت هەنگاو دەنێن .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە زۆربەی بەرهەمی دەرهێنراوی نەوت زۆربەی هەرە زۆری لە رۆژهەلاتی ناوەراستە بە تایبەتی کێڵگە نەوتیەکانی کەنداو رۆژهەلاتی ناوەراستە ... لە ساڵەکانی ئەم دواییە ئەمەریکا نەوتی لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفەریکیا دەکری بە تایبەتی لە هەردوو وولاتی نیجیریا و ئەنگۆلا ... کە رۆژانەی ئەمەریکا زیاتر لە ٨,٥ ملیۆن بەرمیل نەوت دەکرێ لە پێناو دابینکردنی پێداویستیەکانی وولاتەکە ئەم نەوت کرینەش٣/٤ ی لە سعوودیەیە لەگەڵ فنزویلا مەکسیك و کەنەدا ...

هەروا لە وولاتانی دیکەی وەك کوێت و جەزائیر و نەرویژو و بەریتانیا ... لە بەر ئەوەی زۆربەی وولاتانی بەرهەم هێنەری نەوت لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفەریکیا ئەندام نین لە رێکخراوی – ئۆپێك – پەرەسەندنەکەشیان پەلەی بەخۆوە بینیووە لەم دوواییانە بە هۆی گەرانی بە دوای دۆزینەوەی چاوگە نەوتیەکان لە لایەن کۆمپانیە بیانیەکان بە

تایبەتی ئەمەریکا .
ئەم وولاتانەش هاوکاری دەکرێن لەلایەن بانکی دراوی جیهانی لە پێناو بووژاندنەوەی کەرتی نەوتی و بوونی بە یەدەگێك بۆ داهاتووی ئەمەریکا و وولاتانی دیکەی پێویست بەم زێرە رەشە لە جیهاندا .



٢٠٠٢/٩/١٦ میدیاکانی چینی مللی بلاویان کردەوە ، کە هێزەکانی پۆلیسی ئەم وولاتە لە کارێکی فراوانیدا دژی بازرگانی کردن بە مرۆڤ توانی ١٢٣ هەزار کەس لە مندال و ئافرەت رزگار بکات لە جێگەی نادیار کە حەشار درابوون لە پێناو بەکارهێنان و کار پێکردنیان لە هەردوو لایەنی سێکسی و کاری بە زۆر بەبێ بەرامبەر ، یاخوود فرۆشتنی بۆ ئەو کەسانەی کە منداڵیان نابێت ، یاخوود بۆ دەرەوەی ئەو وولاتە ...ئەم بازرگانی کردنەش بەمندال و ئافرەت لە زۆربەی لادێکانی وولاتی چینە .
هەروا رۆژنامەی – تشاینادیلی – چینی بلاوی کردەوە کە لە ئەنجامی ئەو پشکنینەی هێزەکانی پۆلیس توانراوە ١١٠ هەزار ئافرەت و ١٣ هەزار مندال بدۆزنەوە کە لە مالەکانیان شاردرابوونەوە ... هەروا هێزەکانی پۆلیس توانیان یاخیبووەکان لە شاری زوونی لە باشووری رۆژئاوای ئەم وولاتە دەستگیر بکەن ، کە زیاتر لە ٨٤ ئافرەت و مندال بشارنەوە و دەست درێژیان بکەنە سەر .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە کارەکانی بازرگانی کردن بە مرۆڤ پەرەی سەندووە لەم سالانەی دوایی بە هۆی باری گرانی ژیان و پێداویستیەکانی ژیان زۆربەی زۆری وولاتانی جیهان ، بە تایبەتی وولاتانی سەرمایەدار لە ئەوروپا و وولاتانی عەرەبی لە رۆژهەلاتی ناوەراست .

٢٠٠٢/٩/٢٧ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاگەیاندنێکیدا ڕەزامەندی خۆی لە سەر بە ئەندام بوونی تەیمووری ڕۆژهەڵاتدا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەویش دەبێتە ئەندامی ١٩١ لەڕێکخراوەکەدا .



جێگەی ئاماژە پێکردنە کە تەیمووری ڕۆژهەلات لە ٢٠٠٢/٥/٢٠ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و لە ٢٠٠٢/٤/٢٧ بووە ئەندام لە بانکی نێوو دەووڵەتی .

ئەم دوورگەیەش لە ماوەی ٣٠ ساڵ لە شەڕو پێکدادان و ئاژاوە و ململانێی دژواردا دەخوولایەوە ... ئەم هەنگاوەشی لە بوونی بە ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەستکەوتێکی مێژوویی دادەنرێت بە جیابوونەوەی لە وولاتی ئەندۆنوسیا .

لەم ئاهەنگەش جگە لە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆفی ئەنان و سەرۆکی ئەنجومەنی ڕۆژهەلات جۆسماو سەرۆك وەزیرانی ماری کاتیری و وەزیری دەرەوەی خۆزیەرامۆس بەشداریان تێدا کرد لە گەڵ نوێنەری وولاتی دیکەی جیهان .

ئەمەش لەدوای ڕاپرسی گەلی تەیمور بۆ سەربەخۆیی هەرێمە لە ١٩٩٩ ئەنجامدرا و کەوتە ژێر پارێزگاری و ئامۆژگاری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ... تەیمووری ڕۆژهەلات لە دوای جێهێشتنی لەلایەن پرتووگال ئەنۆنوسیا دەستی بەسەردا گرت ... ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەنگاوی بەرەو باشبردنی باری ئەم وولاتە نوێیە جیهانیە دەدات لە هەموو بوارە جیاجیاکاند

٢٠٠٢/١٠/٢ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بەڕێز مەسعوود بارزانی سەردانی مام جەلال تاڵەبانی لە شارۆچکەی دوکان کرد ، لە پێناو ئاشتبوونەوەی یەك جارەکی و یەکگرتنەوەی ماڵی کوردی ، کە لە دوای چەندین ساڵی نائارامی هەمە جۆری دژایەتی کردنی یەکتری لە سەر بەرژەوەندی گەل و

نیشتمان...!.

٢٠٠٢/١٠/٢ سـزای لـە سـێدارەدانی عەبدوللا ئۆجەلانی دامەزرێنـەرو سـەرۆكی پـارتی كرێكـارانی كوردسـتان p.k.k هەلووەشـێندرایەوەو مانـەوەی بـە بـە سـزای زیندانی هەتا هەتایە .

٢٠٠٢/١٠/٤ دوای زیـاتر لـە هەشـت ساڵ ناكۆكی و دژایەتی كردنی یەكتری لە نێوان پـــارتی دیمـــوكراتی كوردســـتان و یەكیـەتی نیشتمانی كوردستان ، لـە گـەورە تـرین ڕووداوی دلخۆشـكەر ، پەرلـەمانی كوردسـتان یـەكیان گرتـەوە بـە كۆبوونـەوەی هـەردوو لایـەن ، كـە مـام جـەلال و كـاك مەسعوود بارزانی و عەزیز محەمەدو چەندین كەسایەتی دیكەی كورد بەشداریان تێدا كرد لە ئاهەنگی ئەم ڕووداوزەدا .

لـە هـەمان كـات خـاتوو دانیـال مـیتران هاوسـەری سـەرۆكی فەرەنـسای پێـشووی كۆچـكردو فرانـسوا مـیتران بەشـداری تێـدا كـرد ، بـە وتارێـك بەرامبـەر بـە ئەنـدامانی پەرلـەمان ، كـە بـە دایكـی كـورد نـاوزەد دەكـرێ لـە باشووری كوردستان .

٢٠٠٢/١٠/٥ شـاندێكی ٩/ نـۆ ئەنـدامی لـە كۆنگریـسی ئەمـەریكی ولـە هـەردوو پـارتی دیمـوكراتی و پـارتی كۆمـاری بروسـكەی پیرۆزبـایی ئاشـتبوونەوەیان ئاراسـتەی كۆبوونـەوەی پەرلـەمانی كوردسـتان لـە هـەرێمی باشـووری كوردستان كـردو هیوای چارەی كێشە هەڵواسراوەكانیان لەهـەردوو لایـەن كرد لە هەرێمەكەدا .

٢٠٠٢/١٠/١٦ لـە دوای ڕاپەڕینـە مەزنەكـەی بەهاری/ ١٩٩١ . تـاكو ئـەم مێـژووە: ١٤٧٣٠ خانـەوادەی كوردە پەناهەنـدەكانی كـوردی باشـووری كوردسـتان لـە ئێـران گەڕانـەوە باشـووری كوردسـتان ، بـەهۆی دەربـەدەر بونیـان لەلایـەن ڕژێمـی بەعسی لە ئێراق ، لە دوای نسكۆی شۆڕشـی ئەیلولی مەزن ، كە ژمارەیـان لە ٧٨٠٠٠ هاوولاتی كوردی دانیشتووی باشووری كوردستان دەدا .

٢٠٠٢/١٠/١٨ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاکسترۆ لە نامەیەکدا ، کە ئاراستەی بەڕێزان مام جەلال و مەسعوود بارزانی و پەرلەمانی کوردستانی کردبوو دەڵی:- کۆبوونەوەی پەرلەمانی کوردستان دەسکەوتێکی گرنگە لەناوچەو هەرێمەکە بەرەو گۆڕانکاری دیموکراسی هەنگاو دەنێ لە ئێراق .

٢٠٠٢/١٠/١٨ وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا - یوسف بولوژ - لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند ، کە بە هیچ جۆرێك بارو دۆخی باکووری ئێراق ، واتە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق مەترسی نیە لە سەر ڕژێمی تورکیا لە ناوچەکەدا..

٢٠٠٢/١٠/١٩ نووسەرو ڕۆژنامە نووسی ناوداری تورکی - محەمەد عەلی پیران - پرسیار دەکاو دەڵێ :- بۆچی تورکیا لە دژی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە باکووری ئێراق ، واتە هەرێمی باشووری کوردستان ڕادەوەستێت و دڵگرانە .

٢٠٠٢/١٠/٢٢ سیناتۆری فەرەنسی- مۆن تسکۆ - و سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی پیرانی فەرەنسی گووتی:- کورد بە خەبات و تێکۆشانی خۆی و بێ یارمەتی گەورەی کۆمەڵگای نێوودەووڵەتی بۆتە نمونەیەکی سەرکەوتووی دروستکەر، کە مافی ئەوەی هەیە ببێتە نمونە لە جیهاندا .

٢٠٠٢/١١/٦ دەسەلاتی ئەمەریکا دانی نا بە کۆماری مەکدۆنیای دیموکراتی فرە نەژادی ، لە دوای ئەشکەنجەدانی بێ وێنە لە شەڕو ئاوارەو دەربەدەری و کێشەی نەژادی و ڕەگەزی و ئایینی لەووڵاتەکەدا .

٢٠٠٢/١١/٧ پێك هاتەی گەلانی کۆماری مەکدۆنیا ڕاپرسی دوا ڕۆژی ووڵاتەکەیان ئەنجامدا ، بۆ بەرەو پێش بردنی ووڵاتەکەیان لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

٢٠٠٢/١١/٢٩ لە شاری برۆکسلی پایتەختی بەلژیکا - خافێر سۆلانا - ی ڕێکخەری کاروباری دەرەوەی یەکیەتی ئەوروپا پێشوازی لە بەڕێزان مام جەلاڵ و مەسعوود بارزانی کردو باس لە ئەزمەنی داهاتووی کورد لەناوچەو هەرێمەکە کرا .

٢٠٠٢/١١/٢٩ لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کۆنفرانسی نێوو دەووڵەتی گرێدرا

لـە هـۆڵی – ڤیکتـۆر هۆگـۆ – لـە سـەر بـارودۆخی داهـاتووی باشـووری کوردستانی لکێنـراو بەئێراق ، کە بەڕێزان مام جەلال و مەسعوود بارزانی بەشـداریان تێدا کـرد . لـەو کۆنفرانسـەدا بەڕێز مەسـعوود بـارزانی بـەجلی کـوردی و بـە زمـانی کـوردی وتارەکـەی خـۆی پێشکەش بـە کۆنفرانسـوانان کرد .

٢٠٠٢/١٢/٥ شـاندێکی ئەنجوومـەنی پیرانـی ئەمـەریکا گەیـشتنە هـەرێمی باشـووری کوردستانی لکێنراو بەئێراق ، کە پێك هاتبوون لـە – جۆزێـف ئاریایـدن و ، چـل هێگــل – و بــۆ ڕۆژی دوایــی بەشــداری کۆبونــەوەی پەرلــەمانی کوردســتانیان کــرد ، لــە هــەمان کـات ســەردانی ئاوارەکـانی کــەرکوکیان بەسـەرکردەوە لـە کۆمـەڵگای بنەسـلاوە کـە لـە بـارو دۆخێکـی نـاهـەموار دا دەژیان .

٢٠٠٢/١٢/٩ بالوێزی ڕووسیا – فلادیمێر تیئۆ – لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق – ئــەلکس ســـوورلۆمان – ڕاوێـــژکاری ڕامیـــاری ســـەردانی باشـــووری کوردسـتانیان کـردو لە لایـەن بەڕێز سەرۆکی حکوومـەتی هـەرێم نێـچیرڤان بارزانی پێشوازی لێکران ، دوای ئەوە دەست کرا بە گفتووگۆو شاندەکەش پشتگیری خۆیان بۆ ئـەو ئەزمونـەی ئێستای کوردستان دوپاتکردەوە ، لە بوارەکـانی ڕامیـاری و ئـابووری و بـارودۆخی داهـاتووی کـورد لەناوچـەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٢/١٢/١٦ کۆنگرەی لەندەنی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراق دەستی پێکرد ، بە ئامادە بوونی هەموو لایەنە ڕامیاری و نەتەوەیی و ئایینی و دیموکراتی و بە ئامادە بوونی نوێنـەری ئەمـەریکاو ، بـەریتانیا و ، تورکیـا و ، کوێـت و وولاّتـانی دیکـەی جیهانی ، کە ئەو بەشداربوونەش ، لە پێناو ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق بوو ، لە پێنـاو دامەزرانـدنی ڕژێمێکـی دیمـوکراتی فیـدراڵی یـەکگرتوو لە چوار چێوەی سنووری ئێراقدا .

٢٠٠٢/١٢/٢٦ کۆچـی دوایـی کەسـایەتی نـاوداری ئـاینی گەلەکـەمان – شـێخ کاکـە شـێخ عەبدولکـەریم شێخ مستەفا – داره خورمـای لـە شـاری هـەولێر لـە هـەرێمی باشووری کوردستان .



٢٠٠٢/١٢/٣٠ سەرۆکی نوێی کینیا – مواى کیباکی – سووێندی یاسایی خوارد ... ئەمەش لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سەرۆکی بەرهەڵستکار مواى لە ٢٠٠٢/١٢/٢٧ دا بوو لە وولاتەکەدا .

جێگەی ئاماژەیە کە سەرۆکی کینیا – دانیال ئاراب – لە راگەیاندنێکیدا دانی بە هەلاتنەکە و سەرکەوتنی کرد و کورەکەی دانیال – ئاوهوراو کینیاتا – ش سەرکەوتنی لەو بازنە هەڵبژاردنە کرد لە ١٢/٢٧ .

ئەمەش بۆ یەکەم جارە کە گەلانی کینیا بتوانن لە بارێکی دیموکراتی سەرۆك هەڵبژێرن و بە زمانی دایك ئاهەنگ بگێرن لە وولاتەکەیا ... ئەم وولاتە کە ژمارەی دانیشتوانی لە -- ٣٠ – ی ملیۆن کەس پێك دێت و لە بارێکی نا لە باردا ژیان دەبەنە سەر ، کە نیوەی دانیشتووانی ئەم وولاتە بژێوی ژیانی رۆژانەیان لە یەك دۆلاری ئەمەریکی تێپەر ناکات .

سەرۆکی نوێی کینیا پەیمانی بە گەلی ئەم وولاتەدا ، کە باری ژیانی دانیشتووان بەرەو باشی ببات و دژی گەندەلی و هاوکاری و باشکردنی ژێرخانی ئابووری بێت لە وولاتەکەدا .

## ٢٠٠٣



٢٠٠٣/١/٣ ســـــەرۆکی کۆمـــــاری قـــووبرس – گلافکـــۆس کلیریـــــــدی – لـــــه راگەیاندنێکیدا گووتی:- خـــۆ بـــۆ هەڵبـــژاردنی ســــــــــەرۆکایەتی دەپاڵێومەوە ، کە بریارە لە ٢٠٠٣/١/١٦ ئەنجام بدرێت .

هەروا گووتی بۆ ماوەی ١٦ مانگ ئەو ئەرکەی لە سەر شانمە هەمووی لە پێناو یەکگرتنەوەی هەردوو کەرتی لێك دابراو تەرخان دەکەم ، بۆ ئەوەی دوا رۆژی ئـەم دوورگەیـە بـەرەو پێـشەوە هـەنگاو بـنێ لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکان .

هەروا بریارە کە قووبرس لە ساڵی ٢٠٠٤ بچێتە ریزی یەکیەتی ئەوروپا سەرەرای ئەوەی کە لە گەڵ ئەو بەشەی کە پێی دەگوترێ کۆماری قووبرسی تورکی لە ئەنجامی گفتوگۆی نێوانیان هەنگاوی باشنراوە بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو قووبرس بە سەر پەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان .

جێگەی ئاماژەپێکردنە کە دوورگەی قووبرس لە ساڵی ١٩٧٤ بۆتە دووبەش کـە لەوکاتـەی رژێمـی تورکیـا بـەهێزی سـەربازی دەسـتی بـە سـەر سێیەکی دوورگەکـەدا گـرت ، کـە لـە بـاکووری وولاتەکـەدا لـە دوای هەوڵـە جـۆراو جۆرەکـانی کودەتـا لـە نیقۆسـیا کـە یۆنـان پـشتگیری لێـدەکرد لـە پێنـاو یەکگرتنەوەی دوورگەکە .

هەر بەم بۆنەش ئەمینداری نەتەوە یەکگرتووەکان – کۆفی ئەنان – پلانێکی فراوانی لە مانگی/١١ ی بۆ ئامادەکردن لە پێناو بەگەیشتن لەنێوان هەردوو لایـەنی قـووبرس دژی هەنـدێ برگـەی پلانەکـە وەسـتان کـە دەووڵـەتێکی فیدراڵی لەو دوو دەووڵەتە پێك بهێنرێت لە سەر شێوازی وولاتـی سویسرە ... لەو کاتـە سـەرەك وەزیرانـی تورکیـا ئۆردەگان لـە ١/٢ داوای لـە سـەرۆکی قووبرسی تورکی – رەئووف دەلکتاش – کرد کە هەوڵـەکانی بخاتـە گـەر لـە پێناو چوونە رێزی یەکیەتی ئەوروپا .

تێبینی :- دەتوانی لە بەرگی سێ وێنەی نەخشەی هەردوو قووبرسی دابەشکراو ببینی .

٢٠٠٣/١/٦ پالێوراوی سەرۆکایەتی کۆماری – لیتوانیا – رولاندس باکساس – سەرکەوتنێکی ناکاوی بەدەست هێنا بە رێژەی ٥٤,٩ ٪ بەرامبەر سەرۆکی



لیتوانیا – فالداس ئەدماکۆس – کە لە ٤٥٪ ی دەنگی بەدەست هێنا و لە هەمان کات دانی بە سەرکەوتنەکەی هێنا بەرامبەر سەرۆکی سەرکەوتوو و دەنگدەرانی لیتوانیا ، سەرەرای بەشدارنەبوونی تەواوی گەلی لیتوانیا بە هۆی کەش و هەوای سارد کە لە ٥١٪ بەشداریان لە دەنگدان کرد .
جێگەی ئامارە پێکردنە کە سەرۆکی هەڵبژێردراو تەمەن /٧٦ ساڵ هاووڵاتیەکی ئەمەریکی پێشوو بووە ، کە لە خوولی یەکەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە لە مانگی /٢٠٠٢/١٢ ئەنجامدرابوو ... دوای ئەوەش گەلانی کۆماری لیتوانیا لە دوای هەوڵ و ماندو بوونێکی زۆر توانیان لە ٢٠٠٣/٥/١١ لە راپرسیەکدا رەزامەندی خۆیان لە سەر چوونە ناو یەکیەتی ئەوروپا بدەن لە وولاتەکەیاندا .
کە کۆماری لیتوانیا کۆمارێك بوو لە کۆمارەکانی پێك هاتەی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران لە ئەورووپای رۆژهەلات ... سەرۆکی نوێی هەڵبژێردراو فرۆکەوانێکی بە توانا و لێهاتوو بووە ولە هەمان کات سەرەك وەزیرانی لیتوانیا بوو بەر لە هەڵبژاردنی بە سەرۆکی لیتوانیا .

٢٠٠٣/١/٦ وەزیری دەرەوەی تورکیا – یاشار پاکیش – لە لێدوانێکیدا گووتی :– کە خۆبەرای یاسای راسپاردووە لە ئەرشیفدا بە دوای دۆکۆمێنت و قەواڵەدا بگەرێن ، کە داخوا دەکارن دەعوای یاسایی بۆ گەراندنەوەی کەرکوك و مووسڵ قەید بکەن ، کە پێشتر سەر بە دەووڵەتی عوسمانی بوون و لە ساڵی بیستەکاندا خراونەتە سەر ئێراق .
کە ئەو دەمە هەندێ لە کۆمێنتران گوتیان کە ئەو ئاخاوتنە بۆ ئەوەیە تا تورکیا سەفقەیەکی پێ لە گەڵ ئەمەریکا مۆربکا ... بە مەرجێ بەشێکی

نـەوتی پـێ بـدرێ و كوردسـتان نـەبێ بـە دەوڵـەتێكی سـەربەخۆ ... واتـە ئەمەریكا بەڵێن بدا یەكیەتی خاكی ئێراق بپارێزرێ ... هەر لە سەرییەنی ئەم دڵنابوونـەی توركیـا لـە ئەجینـدای ئەمـەریكا لـە ناوچـەكەدا ، بـە تایبـەتی بەرامبەر بە كورد و خاكی كوردستان .

هـەروا سـەركردایەتی حكوومـەتی توركیـا دژی شـەڕی رزگـاركردنی ئێـراق بوون و پەرلەمانی توركیاش لە ٢٠٠٣/٣/١ دا رێگەی بە ئەمەریكا نەدا لەناو خاكی توركیا وە پەلاماری ئێراق بدا .

لـە بـەر ئـەوەی دەیـانزانی كـە ئـەو پرۆسـە جـێ پێگـەی كـورد لـە هـەرێمی باشووری كوردستان بەهێز دەكات و ئەمەش دەبێتە هۆكاری گیانی جیـاخوازی لـە نـاو كوردەكـانی باشـووری رۆژهـەڵاتی توریكـا كـە بـاكووری كوردستانە .

٢٠٠٣/١/٢٠ بەرەی پۆلیساریۆ پێشنیاری نوێنـەری رێكخـراوی نەتـەوە یـەكگرتووەكان – جێمس پێكەر – ی رەتكردەوە بەو كێشەی كە لە نێوان بەرەی پۆلیساریۆ و حكوومەتی شانشینی مەغرب هەیە لە سەر بیابانی رۆژئاوا ، كە حكوومـەتی مەغرب ئەو بیابانە بە پارچەیەك لە خاكی مەغرب دەزانێ .

راگەیاندنی ئەو پێشنیارەش بۆ ماوەی دوو مانگ لە ژێر لێكۆلینـەوە دەبێت بە دەربرینی بیروو بۆچوون و رەزامەنـدی كـردن لـە سـەری لەلایـەن هـەردوو لایـەن ، بـەڵام بـەرەی پۆلیـساریۆ ئـەو پێـشنیارەی رەتكـردەوە ... ئـەو پێشنیارەش دان نانە بە پێدانی خوودموختـاری بـە بیابان بۆ مـاوەی چوار ساڵ و دوای ئەوە لە رێگەی راپرسی داهـاتووی بیابانەكە دیاریـدەكرێت ... بەرەی پۆلیساریۆش ئەو پێشنیارەی رەتكردەوە بە هـۆی دیارینـەكردنی دوا رۆژی بیابانەكەدا

بـەهۆی كێـشەی نێـوان وولاتـی مـەغرب و بـەرەی پۆلیـساریۆ زیـاتر لـە ١٠٠ هەزار كەس پەرگەندە بوونە بۆ وولاتانی دراوسێ و جیهان ، لە دوای ئـەوەی كـە مـەغرب لـە سـاڵی ١٩٧٥ ئەو بیابانـەی خـستە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی لـە دوای جێهێشتنی لە لایـەن ئەسـپانیا كـە ژێـر دەستـەیەكی خـۆی بـوو لـە دێـر زەمانەوە ... لە گـەڵ ئەوەشـدا بـەرەی پۆلیـساریۆ زیـاتر لـە ١٠٠ هـەزار دیلـی مـەغرب لـە ژێـر دەسـتی دەسـەڵاتی بیابانەكـە دایـە ، كـە هـەموو لـە خێوەتگـا

ژیان بە سەر دەبەن
شایانی باسکردنە کە جیمس بێکر پێشوو وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بووە و بژیوانی بووە لە نێوان سەرۆکی رژێمی بەعس لە ئێراق – سەدام حوسێن – و شای ئێران – محەمەد رەزا شا – بە ئەنجام گەیاندنی رێکەوتنامەی جەزائر لە ١٩٧٥/٣/٦ لە جەزائیری پایتەختی جەزائر و نەخشە کێشی ئەو رێکەوتنە بووە ، بە هاوکاری حکوومەتی جەزائری ئەو کات . لە پێناو هەرەس پێهێنانی شۆرشی ئەیلولی مەزن لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق بەسەرکردایەتی بارزانی مستەفا لە هەرێمەکەدا .
دوای ئەوەش جێمس بێکەر لە ٢٠٠٤/٦/١٢ دەستی لە نوێنەرایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان کێشاوە بە هۆی نەتوانینی بە چارەسەرکردنی کێشەی بیابانی رۆژئاوا لە نێوان بەرەی پۆلیساریۆ و حکوومەتی شانشینی مەغرب ... هەروا بەرەی پۆلیساریۆ لە ٢٠٠٣/٨/١٥ زیاتر لە ٢٤٣ دیلی مەغربی ئازاد کرد ، کە لە ئاکامی شەڕی نێوانیان بەدیل گیرابوون لە بیابانەکەدا .

٢٣/ ٢٠٠٣/١ گرێدانی کۆنگرەی شەش لایەنەکەی نێوان وولاتەکانی ، سعوودیەو ، میسرو ، ئوردنو ، سووریاو ، ئیرانو ، تورکیا ، لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا ، لە بارەی باری ئێراق . ئەویش بە راگەیاندنی کۆتایی کۆبوونەوەکەو بەڵێندان بە یەکگرتوویی خاکی ئێراقو گەڕانەوەی ئۆپۆزسیۆنی ئێراق ، دژ بە رژێمی ئێراق بۆ کوردستانو چارەسەرکردنی بارۆدۆخەکە ، لە گەڵ رژێمی بەعسو باس نەکردنی کێشەوماف کورد ، کە لە بنەڕەتا دژی مافەرەواکانی گەلی کوردن لە سەر خاکی کوردستان.

٢٠٠٣/١/٢٥ چەند دەووڵەتێکی هاورێی وولاتی فەنزویللا کە ژمارەیان لە شەش وولات پێک هاتبووە ئەویش – بەرازیل – شیلی – مەکسیک – پوورتگال – ئەسپانیا – رەزامەندیان لە سەر ئەو بریارە کرد کە شاندێکی بالای رەوانەی فەنزویللا بکەن ، ئەویش

لـە پێنـاو كۆتـایی هێنـانی ئـەو كێشە رامیاریـەی كـە لـە نێـوان حكوومـەتی فـەنزویللا بەسـەركردایەتی هۆگـۆ شـافێز و ئۆپۆزسـیۆن بەردەوامـە لـەو وولاتەدا .

جێگـەی ئامـاژە پێكردنـە كـە فـەنزویللا پێنجـەم وولاتـی جیهانـە لـە بەرهـەم هێنـانی نـەوت ... لـەو كاتەشـدا سـەرۆكی فـەنزویللا هۆگـۆ راگەیانـد ، بـە پێویستی هەڵبژاردنی بە پەلە لەو وولاتە و ، یاخوود ئەجامدانی راپرسـی لـە سـەر هەڵبـژاردنی سـەرۆكایەتی فـەنزویللا ، ئـەویش بـە هـۆی ئـەو كێـشە رامیاریـە و بـەردەوام بـوونی خـۆ پێـشاندان و رێپێـوان لەلایـەن هێـزی ئۆپۆزسیۆن . كە ئەمەریكا پشتگیری دەكات دژی دەسەڵاتی شافێز ، كـە لـە لایـەنگر و یارمـەتی دەری چینی هـەژارە لـە وولاتەكـەدا دژی سـەرمایەدار و خاوەن كۆمپانیاكان و خاوەن موڵكەكان .

ئەم كارەش لەدوای گفتوگۆی نێوان سەرۆكی ئەم شەشـە وولاتـە و وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریكا كـۆلن پـاوەل هـات ... هـەروا لـە لایـەكی دیكـە هێـزی ئۆپۆزسـیۆن داوای لـە سـەرۆكی فـەنزویللا شـافێز دەكـات بـە دەسـت كێشانەوەی لە سەرۆكایەتی لە سەر وولاتەكە .

ئـەم پێـشنیارەش كـە لـە مـانگی/١٠/٢٠٠٢ لـە لایـەن سـەرۆكی ئەمـەریكای پێـشوو جیمـی كارتـەر كرابـوو ، لـە پێنـاو كۆتـایی پێهێنـانی ئـەو كێـشە رامیاریە و بەردەوام بوونی ناردنە دەرەوەی نـەوت كـە لـە ١٣٪ ئەمـەریكا ئـەو نەوتەی بۆ پێداویستی وولاتەكەی لە فەنزویللا دەكری لەو ناوچەیەدا.



٢٠٠٣/١/٢٧ لـــە ژێـــر چـــاودێری - ئـــەدمیرال ریـــچارد - كۆنفرانـسی دەزگـای pusi بـەڕێووە چـوو لـە شـاری لەنـــدەنی پایتـــەختی بـەریتانیا ، لـە سـەر دۆزی هەمـە لایەنـەی كـورد ، كـە یـــەكێك لـــە كـــۆنترین

دەزگاکانی جیهانیە کە بایەخ بە کاروباری بەرگری کردن لە ئاسایشی نیشتیمانی نێوەدەوڵەتی دەدات ، کە زیاتر لە ۲۳ وولاتی جیهان و عەرەبی بەشداریان تێدا کرد ، لە گەڵ نوێنەری گەلی کورد لە پارچە دابەشکراو داگیرکراو و بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کرودستانی لکێندراو بە ئێراق.

۲۰۰۳/۲/۱ تێك شكانی كەشتی ئاسمانی ئەمریكا – كۆلۆمبیا – لە سەر ئاسمانی ناوچەی تیكساسی وولایەتی فلۆریدا ، لە كاتی گەڕانەوەی بەرەو زەوی لە ئەنجامی بوونی چەند كەمو كورپیەكی هونەری و كارەبایی لە ناو كەشتیەكەدا.




۲۰۰۳/۲/۳ پارتی سۆشیالیستی دیموكراتی بە سەركردایەتی راوێژكاری ئەلمانیا – گیرهارد شرۆدەر – دوو هەلاتنی بەخۆوە بینی ، ئەویش لە یەكەم هەلبژاردنی هەرێمایەتی ، ئەمەش لە دوای پێنج مانگ لە هەلبژاردنەوەی شرۆدەر بۆ سەركردایەتی كردنی ئەلمانیا .

ئەویش لە هەردوو وویلایەتی – هیسی و ، سكسۆنیا – كە سكسۆنیا ئەو هەرێمەیە كە راوێژكاری ئەلمانیا – شرۆردەر – لێی لە دایك بووە ... ئەمەش لە دوای هەلبژاردنەوەی بۆ جاری دووەم و دەركەوتنی هەستی نا ئومێدی بە بەرزبوونەوەی بێكاری و بەرزبوونەوەی نرخی پێداویستیەكانی ژیان و ، بەتایبەتی وەستان دژی لێدانی رژێمی بەعسی لە ئێراق بەسەركردایەتی – سەدام حوسێن – و پشتگیری كردن لە هەلوێستی رووسیا و فەرەنسا دژی هەلوێستی ئەمەریكا .

ئەم هۆكارانە بووە هۆی ئەوەی كە ئەلمانیا لە كۆمەلەی نێوو دەوولەتی دووركەوێتەوە ... لە لایەكی دیكە سەرۆكی پارتی دیموكراتی مەسیحی – ئەنگیلا میركیل – خۆشحالی خۆی دەربری بەرامبەر بەو ئامانجەی كە پارتەكەی لە هەلبژاردنەكان بە دەستی هێنا بوو لە وویلایەتەكان ... دوای ئەو سەرنەكەوتنەو نەرم بوونەوەی باری دەسەلاتی راوێژكاری ئەلمانیا وا

بریــاردرا کــه لــه ٢٠٠٥/٩/١٨ هەڵبــژاردن ئــەنجام بــدرێت بــه دەســت نیشانکردنی راوێژکاری نوێ بۆ ئەلمانیا ... چاودێران وای بۆ دەچن کە پارتی دیموکراتی مەسیحی سەرکەوتن بە دەست بێنێ و خاتوو میرکیل سەرۆکایەتی ئەلمانیا بگرێتە دەست لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٣/٢/٤ پەرلـــــــەمانی یۆگــــــــسلافیا کۆبوونەوەیـــەکی گرێـــدا بـــۆ گفتووگۆکردن لە سەر هەموارکردنی دەســتووری وولاتەکـە ، کـە دەبێتـە کۆتــایی پــێ هێنــانی یەکیــەتی یۆگسلافیا و مانەوەی لە یەکیەتیەکی بێ چارەنووس لە نێوان سربیا و چیای رەش .



جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هەردوو پەرلەمانی ناوخۆیی هەرێمەکانی سربیا و چــیای رەش هـــەموارکردنی دەســـتورەکانیان بریـــاردا و پەرلـــەمانی یۆگسلافیاش رەزامەندی لە سەر ئەو هەموارکردنە دەکات و دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە سربیا و کۆماری چیای رەش لە چوارچێوەیەکی لاواز دەمێنێتەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ و دوای ئەوە دەتوانن هەڵبژاردن ، یاخوود راپرسی لەسەر جیابوونەوەیان ئەنجام بدەن و کۆتایی بە یەکیەتی یۆگسلافیا بێنن و هەر یەك لە سربیا و چیای رەش ببنە وولاتی سەربەخۆی سنورداری نێوو دەووڵەتی ... کە سربیا و چیای رەش لە ناو یەکیەتی یۆگسلافیا ماونەتەوە لـە دوای جیـا بوونـەوەی سـلۆڤینیا و کرواتیـا و مەکـدۆنیا و بۆسـنە لـە ساڵەکانی ١٩٩٠ لە یەکیەتی یۆگسلافیا .

جێگـەی باسـکردنە کـە یۆگسلافیای یـەکگرتوو لەلایـەن ژەنـەراڵی سـەربازی جۆزێف پرۆس تیتۆ دامەزرابوو لە ساڵی ١٩٢٩ و لە جەنگی دووەمی جیهان دووبارە لەلایەن ئەلمانیا داگیربکرێتەوە ، بەڵام ژەنەراڵ تیتۆ توانی لـە دوای جەنگی دووەم ، ئەم وولاتانە ببەزێنێ و یەکیەتی یۆگسلافیا بەهێز بکات و چارەسەری کێشە ناوخۆیەکان چارەسەر بکات لـە هـەموو بوارە جیاجیاکان بـە تایبـەتی لـە بـواری نەتـەوەیی و نیـشتیمانی و رامیـاری و ئـاییني و کۆمەڵایەتی و ژیانی هاوبەشی سەرکەوتوو بخات ناو خۆ لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٣ /٢/١٤ هانیس بلیکس ئەمینداری گشتی ووزەی ئەتۆمی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و محەمەد بەرادعی دوا راپۆرتیان پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد ، لە بارەی چەکی ئەتۆمی لە ئێراق و بەردەوام بوون لە پشکنین ، کە لەو کاتە فەرەنساو ئەلمانیاو رووسیاو بەلژیکا دژی لێدانی ئێراق وەستان ، لە بەر ئەوەی ئەمەریکا یەك جەمسەری دەست وزلهێزی یەکەمە لەجیهان ، کە هەموو شتێکی لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی و رزگار کردنی گەلانی ئێراق بوو ، بە تایبەتی هاوکاری کردن لەگەڵ دەسەلاتی کورد لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق .

٢٠٠٣ /٢/١٥ لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمی جیهان ، یەکەم خۆپیشاندانی بێ وێنە ئەنجامدرا لە شارە گەورەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا ، لە دژی پەلاماردانی رژێمی ئێراق ، نەك بە هۆی خراپی رژێمەکە ، بەڵکوو بە هۆی زیاتر وێرانکردنی ژێر خانی ئابووری و لەناو چوونی گەلانی ئێراق و مەترسی دوا رۆژ لە ناوچەکەدا .



٢٠٠٣/٢/٢٥ د . زاڵمای خەلیل زاد بەرەچەڵەك ئەفگانی و نوێنەری سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش گەیشتە هاوینە هەواری سەلاحەدین لە باشووری کرودستان ، دوای گەیشتنی لە لایەن بەرێزان مەسعوود بارزانی و مام جەلال پێشوازی لێکراو چەندین کۆبوونەوەیان ئەنجامدا لە بارەی بارودۆخی دوای رووخانی رژێمی بەعس و سەدام لە ئێراق .

٢٠٠٣/٢/٢٦ سەرۆکی ئەمەرکا جۆرج بۆش گتوویەتی :- وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هیچ نیەتێکی نیە بۆ ئەوەی بە شێووەیەکی ورد شێووەی حکوومەتی تازەی ئێراق دیاری بکات ، ئەم دەست نیشانکردنە دەگەرێتەوە بۆ گەلی ئێراق .

بەلام ئێمە تائکید دەکەینەوە کە دکتاتۆرێکی زۆردار بە دیکتاتۆرێکی دیکە

ناگۆڕین ، دەبێ هەموو ئێراقیەكان لە حكوومەتی تازەدا رای خۆیان هەبێت ، دەبێ سەرجەم هاولاتیانیش مافەكانیان پارێزراو بێت لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٣/٢/٢٦ دەست نیشانكردنی كۆبوونەوەی ئۆپۆزسیۆنی كوردو لایەنە ئێراقیەكان لە هاوینەهەواری سەلاحەدین لە هەرێمی باشووری كوردستان و لە شاری هەولێری پایتەخت ، بە ئامادەبوونی نوێنەری سەرۆكی ئەمەریكا زەلمای خەلیكزاد ، لە پێناو دارشتنی نەخشەیەكی هاوبەشی كوردیو لایەنە ئێراقیەكان ، لە دوای رووخانی رژێمی سەدامو لە ناوچەو هەرێمەكەدا .

٢٠٠٣/٢/٢٧ ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریكا پەسندی یاسای قەدەخەكردنی كۆپی لە سەر مرۆڤدا ... ئەویش بە بەندكردنی ١٠ ساڵە و سزای ١٠٠,٠٠٠ سەد ملیۆن دۆلار ئەوەی سەرپێچی ئەو یاسایە بكات ... ئەو پرۆژە یاسایەش بەكۆی دەنگی ٢٤١ بەرامبەر ١٥٥ دەنگ ، كە ئەو یاسایانەی رەتكردەووە بەهەندێ كۆپی كە توویژەرەكان پێی هەڵدەستن لە پێناو چارەسەركردن و دۆزینەوەی نەخۆشیەكانی وەك – زەهایمز و شەلەل و رعاش و باركنسۆن و شەركرە – سەرەرای هەندێ بەرهەڵستكاری كردنی لەلایەن ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریكا و هەر وەك چۆن لە مانگی ٢٠٠١/٧/ بریاری بۆ درابوو .

بەلام ئەنجوومەنی پیران بریارەكەی رەتكردەووە ... هەروا ئەم یاسایە هەردوو پارتی كۆماری و دیمەكراتی و ئیدارەی جۆرج بۆش رەزامەندی لەسەر كرد ... ئەمەش بەهۆی كۆپی كردنی یەكەم مندالْ لەلایەن كۆمپانیای – كلوند – لە ئەمەریكا ... ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی دوو بیروو بۆچوون :–

یەكەمیان :– قەدەخەكردنی كۆپی لەسەر جۆرەكانی گیانەوەر دەبێتە هۆی كۆسپ خستنە پێش پەرەسەندن و گەشەكردن و توێژینەوەكانی زانستی لە جیهاندا .

دووەمیان :– كۆپی كردنی مرۆڤ تاوانێكی درندانەیە لەگەڵ هەموو ئەو گیان لەبەرانەو دوور لە ئابرووی مرۆڤایەتی و بوونی مرۆڤ لە سەر گۆی زەویدا .

٢٠٠٣/٢/٢٨ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆفی ئەنان بەراوێژکردن لەگەڵ ئەمەریکا و بەریتانیاو یەکێتی ئەوروپا پرۆژەی یەکلاکردنەوەی کێشەی قووبرسی خستەرو، کە ئەو پرۆژەیە ناوبانگێکی بەرچاوی هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان قووبرس و تورکیا ولەلایەن دانیشتووانی هەردوو هەرێم ، کە دیاری بکرێت لە رێگەی ئەنجامدانی ریفرۆندۆم لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٣/٣/٢ لە شاری هەولێری پایتەختی باشووری کوردستان ، گەورەترین خۆپیشاندان ئەنجامدرا دژی بڕیارەکانی رژێمی تورك بە هەڕەشە کردن بۆ هاتنە ناوەوەی هێزەکانی سووپا بۆ سەر سنووری باشووری کوردستان و دەست تێوەردانی لە کاروباری هەرێمەکە ، کە زیاتر لە ٥٠٠ هەزار هاووڵاتی لە چین و توێژەکانی گەل بەشداریان تێدا کرد .



٢٠٠٣/٣/٢ سەرکردایەتی باڵای کوردستان لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێك هات ، کە بەرێزان جەلال تاڵبانی و مەسعوود بارزانی سەرکردایەتیان دەکرد ، بێ ئەوەی هیچ لایەنێك و پارتێکی کوردستان بەشدار تێدا بکەن..؟..!.



٢٠٠٣/٣/١٠ کۆچی دوایی کەسایەتی کورد مامۆستا – محەمەد فەقێ خدر جۆڵە کۆیی – ناسراو بە – حەمەی ئازاد و ، حەمەی تاپۆ – لە تەمەنی ٨٨ساڵیدا لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق ، گۆرەکەی لە گۆڕستانی – بێرکۆت – ی باکووری ناوەندی شاری هەولێر نێژراوە .

جێگـەی ئاماژە پێکردنە کە مامۆستا حەمـەی ئـازادی لـە سـاڵی ١٩١٥ لـە شارۆچـکەی کۆیـسنجەق چـاوی بـە جیهـــان هـــەڵهێناوە ... خوێنـــدنی سـەرەتایی پـۆلی سـێی ناوەنـدی لـە شارۆچـــکەی کۆیـــە و هـــەولێر لـــە ســـــــــاڵەکانی ١٩٢٣ – ١٩٣٥ تەواوکردووە ... لە پشووی هاوینەی سـاڵی ١٩٣٤ بـە هاوکـاری شـاعیری ناوداری شارۆچکەی کۆیە – مامۆستا رۆستەم – خوولێکی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریان بۆ کۆمەڵێك لە خەڵکی ناشارەکە لە کاسبکار و دووکاندار و هەژاران کردۆتەوە و لە نە خوێندەواری رزگاریان کردوون .

لەو سەردەمەدا مامۆستا حەمەی ئازادی لە ١٩٣٦/٤/٢٩ بە نووسەری تاپۆ لە شاری سلێمانی بە فەرمانبـەر دامـەزراوە ... لـە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٧ – ١٩٤٤ ئەنـدامی دەسـتەی دامەزرێنـەری کۆمـەڵی برایـی بـووە ، لەگـەڵ خوالێخـۆش بـوو – شـێخ لـەتیف شـێخ مـەحمودی حەفید و مـەلا ئەسعەدی مـەحوی و سـەدیق شـاوەیس ... هـەروا لـە ١٩٤١/٧/١٩ لەگەڵ ژمارەیـەك لـە سەرکردەو ئەندامانی کۆمەڵی برایی لـە شارەکانی بەغدا و بەسـرە و عیمـارە بەنـدکراون . دوای ئـەوە بـۆ مـاوەی دوو سـاڵیش لـەکاری فەرمانبەریـەتی دوورخراوەتەوە بە هۆی باری رامیاری ئەم کەسایەتیە لە بەرگری کردنـی لە مافە رەواکانی گەلی کوردستان و نیشتیمانە داگیرکراوەکەیدا .

لـە سـاڵی ١٩٤٢ کتێبخانـەی ئـازادی لـە شـاری سـلێمانی کردۆتـەوە بـە هاوکـاری خوالێخـۆش بـوو مامۆسـتا – مـەحمود ئەحمـەد – و شـاعیری گـەورەی گەلەکـەمان مامۆسـتا – گـۆران – دوای تـەوواوکردنی مـاوەی دوور خستنەوەی لـەکاری فەرمانبەریـەتی بـۆ مـاوەی دوو سـاڵ گەراوەتـەوە سـەر کارەکەی پێشووی . لە فەرمانگەی تاپۆ و دادگای سلێمانی .

لە ڕەشبگیریەکەی ساڵی ١٩٦٣ لە شاری سلێمانی دەستگیر دەکرێت لەگەڵ چـەندین کەسـایەتی دیکـەی لـە هەڤاڵـەکانی و دوای ماوەیـەکی کـەم ئـازاد

دەکرێن ... دوای ئەوە لە سەر داوای خۆی لە ١٩٧٤/٥/١٤ خانەنشین دەکرێت ، دوای ئەوە بە یەکجاری دەگەڕێتەوە بۆ شاری هەولێر و لە گەڕەکی راپەرین – حەوتی نیسانی پێشوو – نیشتەجێ دەبێ ، دوای ئەوە لە ململانێیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشیە کووشندەکەی لە شاری هەولێر ماڵئاوایی لە بنە ماڵە و گەل و نیشتیمانەکەی دەکات ، لە گەڵ ئەوەشدا دوای خۆی چەندین دەست نووس بەجێ دێڵێ و لەبەر دەستدایە بۆ بە چاپگەیاندن .

٢٠٠٣ /٣/١٦ لە دوورگەی ئەرخەبیلو لە شاری – ئەزۆیسی – ئەسپانیا کۆبوونەوەی سێ قۆڵی لە نێوان سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆشو ، سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێرو ، سەر ەك وەزیرانی ئەسپانیا خۆسی مارتی ، ئەنجامدرا ، دوور لە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان . بە وەرگرتنی بڕیاری لێدانی رژێمی ئێراقیان داو بڕیارەکە لە کاتژمێر شەشی بەیانی رۆژی ٢٠٠٣/٣/٢٠ جێبەجێکرا ، لە پێناو رووخاندنی رژێمی بەعس بە سەرکردایەتی سەدام لە ئێراق .

٢٠٠٣/٣/١٧ رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کۆبوونەوەی تایبەتی گرێدا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی نێوان ئێراقو ئەمەریکا ، لە لایەكو لە نێوان ئەمەریکاو نەتەوەیەکگرتووەکانو هەرەس هێنانی بە هۆی هەرەسی رامیاری ئەمەریکاو کەرت بوونی فەرەنساو ئەڵمانیاو ڕووسیا ، کە دژی رامیاریەتی ئەمەریکا وەستان ، لە دژی لێدانی رژێمی بەعسی لە ئێراق کە چی زۆرینەی دەنگیشی بە دەست هێنا...!.

٢٠٠٣/٣/١٩ کۆبوونەوەی سێ قۆڵی لە نێوان کورد بە نوێنەرایەتی کردنی جەلال تاڵبانیو نێچیرفان بارزانیو بەرپرسە سەربازیەکانی رژێمی تورکیاو نوێنەری ئەمەریکا زەڵمای خەلیل زاد ، بە بەلێن دان بە پێدانی تورکمانەکانی دانیشتووانی ئێراق ، وەك کورد تەماشا بکرێت ، کەچی زیاتر لە ٢٠ ملیۆن کورد لە تورکیا هەن بەر لە سەرهەڵدان بوونی تورکو کەچی تاکوو ئێستا ناتوانن بە زمانی دایك ، کە زمانی کوردیە ئاخاوتن بکەن لە باکووری کوردستان .

٢٠٠٣/ ٣/٢٠ ئیتاڵیا هاوکاری تەواوی کرد بە پێی توانا بە هێزی سەربازی لە رووخاندنی

ڕژێمی بەعس لە ئێراق لە گەڵ هاوپەیمانانیدا .

٢٠٠٣/٣/٢٠ لە هێرشێکی هێزەکانی ئاسمانی سووپای ئەمەریکاو هاوپەیمانان لە کاتژمێر ٦,١٥ دەقیقەی سەر لە بەیانی لە پاش وتەکەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆچ ، شەڕی دژی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ڕاگەیاند ، کە لەو شەوەدا – ٣٥ – وولات پشتگیریان لە ئەمەریکا کرد ، بۆ لێدانی ڕژێمی سەدام و کۆتایی پێ هێنان بەو ڕژێمە لە ئێراق .

٢٠٠٣/٣/٢٢ ڕژێمی تورکیا بۆ لێدانی ڕژێمی بەعس لە ئێراق ، بەرامبەر چەند ملیۆن دۆلارێك و نیازی هاتنە ناو خاکی باشووری کرودستان و چاوبرین لە نەوتی کەرکوك و داگیر کردنی کوردستان ، لە سەر بنەمای کۆنی وولایەتی مووسڵ ، بەڵام سەرکردایەتی ئەمەریکا ئەو داوایەی ڕەتکردەوەو دووپاتی کردەوە ، کە سووپای تورکیا نابێ بچێتە ناو سنووری باشووری کوردستانی لکێنرداو بە ئێراق .



٢٠٠٣/٤/٩ لە دوای بۆردومان و پەلاماردان لە ماوەی ٢١ڕۆژ لە شالآوی هەمە جوری هێزی سووپای هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی ئەمەریکا ، بۆ سەر ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، بە ڕۆژانی کەتن و هەرەس پێ هێنانی ڕژێمی بەعسی و سەدامی دا دەنرێت ، بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق .

ئەویش لە دوای ٤٠ ساڵ لە دەسەڵاتی دکتاتووری و فاشی لە کوشتن و وێرانکردن و ئەنفالکردن و کیمیاباران و زیندە بەچاڵکردن ، بەرامبەر بەگەلانی ئێراق , بە تایبەتی گەلی کورد لە سەر خاکی باشووری کوردستان .

٢٠٠٣/٤/١٠ پارێزگای کەرکوك لە لایەن هێزی پێشکەرگەی کوردستان بە پشتیووانی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا ڕزگار کرا ، بە دەرپەڕاندنی هەموو دام و

دەزگاكانی رژێمی بەعسی لە شارەكەو سەربازگە هەمە جۆرەكان .

٢٠٠٣/٤/١١ خۆ بە دەستەوەدانی هێزەكانی سووپای ئێراق ، لە باشووری كوردستان ، بە هێزی پێشمەرگەو هێزەكانی ئەمەریكاو دوای ئەوە بووە هۆی رزگار كردنی هەردوو پارێزگای كەركوكو ، مووسڵ و شارو شارۆچكەكان لە باشووری كوردستان لە هەرێمەكەدا .

٢٠٠٣/٤/١١ بە پێی سەركەوتنی سێ قوڵی كوردیو توركیو ئەمەریكا ، لە دوای هەرەس پێ هێنانی رژێمی بەعس ، هێزەكانی پێشمەرگە لە شاری كەركوك كشانەوە ، لە دوای دوو رۆژ لە رزگار كردنی بە راگەیاندنێك لە لایەن سەركردایەتی یەكێتی نیشتمانی كوردستان و پارتی دیموكراتی كوردستان .

كە ئەمەش ئەنجامی زۆر خراپی كردە سەر دوا رۆژی مافەكانی كوردو كوردستانیەتی پارێزگای كەركوكو ناوچە دابڕاوەكانی دیكە لە خاكی كوردستان ...؟...!.



٢٠٠٣/٤/١٢ دوای كەوتنی رژێمی بەعس لە ئێراق ، بە تایبەتی یەكەم جار لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ... مۆزەخانەی نیشتیمانی ئێراق لە لایەن هێزەكانی فرە رەگەز و بازرگانە رەشەكان و چەندین بەر پرسانی ناووخۆی هەمەلایەنەی ئێراقی مۆزەخانەكە تالانكرا .

كە لە نێوو مۆزەخانەكە – قیسارەیەكی ئاڵتوونی سۆمەری لەو مۆزەخانەیەدا هەبوو ، كە مێژووی دروستكردنی بۆ ٤٠٠٠ هەزار ساڵ بەر لە زایین دەگەرایەوە ... لە هەمان پەیكەری – دودو – وەزیری یەكەم لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین ... لە گەڵ چەندین پارچە شوووێنەواری هەمە جۆری دیكەی ناو مۆزەخانەكە ، كە هەر هەمووی دزران و بە تالان رفاندیان

... لەوانەش ئەفسانەی – گلگامێش – و چەندین شتی دیکەی ماتماتیك كە مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٥٠٠ ساڵ بەر لە زایین ، یاخوود – فیساگۆرس – هەروا پەیكەری خوای جوانی و خوای فەری رۆژهەلات ... كە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ ٥٨٠٠ هەزار ساڵ بەر لە زایین ... هەروا گالیسكەیەك كە لە – ئۆرك – لە دوو هەزار ساڵ بەر لە زایین دروستكراون .

لە دوای گەران و پشكنین دەركەوت ، كە ژمارەی كەل و پەلە دزراوەكان دەگاتە ١٥٠٠٠ هەزار پارچە ... كە تاكوو كۆتایی ساڵی ٢٠٠٨ –– ٥٥٠٠ هەزار پارچەیان بۆ مۆزەخانەكە گەراندووتەوە .

ئەم پەیكەرو ئاسەوار و شووێنەوارانە لە ئەنجامی خەبات و تێكۆشانی گەلانی ژێر دەسەلاتی سۆمەری و میدیا و بابل و ، بەر لەوانیش حامووڕابی ... لەوانەش شووێنەوارو ئاسەواری گەلی كوردستانیشی تیابووە ... بەهۆی دۆزینەوەی لە سەر خاكی كوردستان ، لە دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیا لە وولاتی نێوان دوو زێدا – میزۆبۆتامیا – لە ناوچەكەدا

٢٠٠٣/٤/١٦ قۆناخی یەكەمی شەڕی رزگار كردن و داگیر كردنی ئێراق راگەیەندرا بە لە ناو بردنی دسەلاتی بەعسی لە ئێراق و دەستپێكردنی قۆناخی دووەمی دامەزراندنی دەسەلاتی دیموكراسی فیدراڵی نویێ لە ئێراق بە پێی پێك هاتەكانی گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی لە نێوان دوو نەتەوەی سەرەكی ، كە لە كوردو عەرەب پێك هاتووە لە ئێراقدا .

٢٠٠٣/٤/١٧ كۆماری ماڵتە لەدوای هەولێكی زۆر لە یەكیەتی ئەورۆپا بە ئەندامی دەسلاتی وەرگیرا ، لە گەڵ چەند وولاتی دیكەی سەربەخۆ لە دوای هەرەس هێنانی یەكێتی سۆڤیەت .

٢٠٠٣/٤/٢١ نوێنەری ئیدارەی ئەمەریكا بۆ هەڵسووراندنی كاروباری كارگێری لە ئێراقی نوێی دوای رووخاندنی رژێمی سەدام – جی. گارنەر – بۆ یەكەم جار گەیشتە شاری بەغداو چەندین گەرەكی بەغدای بە سەر كردەوە ، لە پێناو شارەزایی بوون و چۆنیەتی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ دام و دەزگاو هاوولاتیان لە شارەكەدا .



٢٠٠٣/٤/٢٢ نوێنەری ئەمەریکا بۆ هەڵسووراندنی کارو باری کارگێری ئێراق – ج. گارنەر – گەیشتە شاری سلێمانی و لە گەڵ بەرێز مام جەلال و بەرێز مەسعوود بارزانی لە شارۆچکەی دوکان کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا لە پێناو کۆك بوون لە سەر بیروو بۆچوونەکان لە سەر داهاتووی چۆنیەتی دەسەلآت لە ئێراق .

٢٠٠٣/٤/٢٧ لە قەزای فەلوجەی رۆژئاوی پارێزگای بەغدا زیاتر لە ١٨ هاولآتی کوژران و ٨٥ کەس زامداربوون ، ئەویش لە ئەنجامی گوڵە باران کردنیان لە لایەن هێزەکانی سووپای ئەمەریکا ، کە زۆربەیان قوتابی قۆناخی ناوەندی بوون لە شارەکەدا .

٢٠٠٣/٤/٢٨ بۆ یەکەم جار لە دوای رووخاندنی رژێمی بەعس لە ئێراق ، کۆبوونەوەی یەکەمی پێکهاتەی لایەنە رامیاری و نەتەوەیی و ئایینی و دیموکراسی ئەنجامدرا ، بەسەرپەرشتی – جی. گارنەر – دادەوەری گشتی لە ئێراق ، کە زیاتر لە ٤٠٠ نوێنەر بەشداریان تێدا کرد ، بۆ دامەزراندنی حکوومەتی کاتی لە ئێراق و داهاتووی لە ئاوەدانکردنەوەو چەسپاندنی ئارامی و دیموکراسیەت لە ئێراقدا .

٢٠٠٣/٤/٣٠ لە دوای رووخاندنی رژێمی بەعس بۆ یەکەم جار لە شاری بەغدا لێژنەی هەماهەنگی و پێداچوونەوە ، کۆبوونەوەیەکیان ئەنجام دا . کە لە ٦٥ ئەندام پێك هاتبوون و نوێنەری ٥٥ پارت و رێکخراو گروپ و لایەنی رامیاری لە پێك هاتەی گەلانی ئێراق ، لە پێناو تاوتۆکردنی پێشنیارەکانیان بەرەو پێك هێنانی حکوومەتی دیموکراتی فیدڕالی لە ئێراق ، بە سەرپەرشتی هاوپەیمانان بە سەر کردایەتی ئەمەریکا لە وولآتەکەدا .

٢٠٠٣/٥/٢ لێژنەی هەماهەنگی وپێداچوونەوە ، کە لە کۆنگرەی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا هەڵبژێردرابوون ، لە بەغدا دەستی بە کۆبوونەوەکانی خۆی کرد بە سەرپەرشتی هاوپەیمانان بە نوێنەرایەتی زەلمای خەلیل زادو جی. گارنەر ، بۆ پێك هێنانی حکوومەتی گواستنەوەی ئێراق لە ماوەی یەك مانگ لە

وولاتەکەدا .

٢٠٠٣/٥/٥ بە سەرپەرشتنی ژەنەرال – دیڤید پاتریولیس– ی نوێنەری ئەمەریکا لە پارێزگای مووسڵو لە مێژووی بوونی پارێزگای مووسڵ ، بۆ یەکەم جار هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شارەوانی لە هەموو چینو توێژەکانی نەتەوەیی هەلبژێردرا . کە عەرەب بە ٩ نوێنەرو ، کورد بە ٥ نوێنەرو، ئاشوری بە ٢ نوێنەرو ، تورکمان بە ١ نوێنەر ، کە غانم ئەیعەسۆ بە پارێزگاری مووسڵو خەسرۆ گۆران بەجێگری پارێزگا و سەرۆکی ئەنجوومەنی شارەوانی مووسڵ هەڵبژێردرا.

شایانی باسە رێژەی کورد لە ساڵەکانی ١٩١٨– ١٩٢٠ لە ٨٠٪ ی دانیشتووانی پارێزگای مووسڵ کورد بوون .



٢٠٠٣/٥/٦ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆشو وەزیری بەرگری ئەمەریکا رامسفیلدو دادوەری گشتی حکوومەتی ئەمەریکا لە ئێراق ، پۆل بریمەریان ، بە دادوەری تەواوی ئێراق دامەزراندو، جی. گارنەر ، بە یاریدەدەری لە پێناو باشتر هەڵسووراندنی کارو باری هەمەلایەنەی ئێراق .

٢٠٠٣/٥/١٦ سەرۆکی هێزەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانان – ژەنەرال تومی فرانکس– گەیشتە شاری بەغدایٰ پایتەختی ئێراق بۆ راگەیاندنی کۆتایی هاتن بە شەرو دەست پێکردنی قۆناخی چوارەم بە ئاسایی کردنەوەی بەغداو دەوروو بەرو شارەکانی دیکەی ئێراق .

٢٠٠٣/٥/١٩ رێکخراوی لێبووردنی نێوو دەوڵەتی داوای لە سەرۆکی ئەریتیریا – ئاسیاس ئەفروکی – کرد ، بە ئازادکردنی دەیا بەنکراوی رامیاری لەو وولاتە بە بۆنەی یادکردنەوەی دەیەمین ساڵیادی سەربەخۆیی وولاتەکە . کە نزیکەی ٦٠٠ بەندکراوی رامیاری دەبێت و بیٰ ئەوەی بدرێنە دادگا ... کە بریارە رۆژی ٥/٢٣ ئەم یادە بکرێتەوە .

کە زۆر لەو بەنکراوانە کەسایەتی ناوداری ئەو وولاتەنە و خەبات و

تێکۆشانیان لە پێناو سەربەخۆیی ئەریتیریا کردووە ، کە ئێستا لە بەندیخانەکان لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا دەناڵێنن ... کە لە نێوان ئەو بەندکراوانە پانزە ئەندامی پەرلەمان و دە رۆژنامەنووسی تیایە و لەگەڵ ئەو مەسیحیانەی کە چوونە ریزی سووپایان رەتکردۆتەوە ، کە زۆربەشیان زیاتر لە هەشت ساڵە لە بەندیخانە ژیان بەسەر دەبەن لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٣/٥/٢٢ لە بڕیارێکی ناکاوی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ژمارە/ ١٤٨٣ بە هەڵگرتنی سزاکانی ئابووریو بازرگانی لە سەر ئێراق ، بە دەنگ دانی ١٤ ئەندام بۆ بڕیارەکەی ئەمەریکاو بەریتانیاو ئەسپانیا ، جگە لە سووریا ، کە نوێنەرایەتی هەموو وولاتانی عەرەبی دەکرد لەو رێکخراوەدا .

٢٠٠٣/٥/٢٣ بەرێوەبەری گشتی کارگێری ئیدارەی ئەمەریکا لە ئێراق - پۆل بریمەر- لە بەیاننامەیەکیدا دامو دەزگا سەربازیو سیخووری لە هەموو لایەنێکەوە لە ئێراق هەڵووەشاندەوە ، کە بە درندەترین دامو دەزگا دەژمێردرێت لە جیهانو گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی بەرامبەر بە گەلی کوردو خاکی کوردستان .

٢٠٠٣/٥/٢٤ بۆ یەکەم جار لە مێژووی پارێزگای کەرکوك ئەنجوومەنی شارەوانی هەلبژێردا ، بۆ هەر نەتەوەیەك ٦ ئەندامو بێ لایەنەکانیش ٥ ئەندام ، کە کوردبوون ، ئەویش بە سەرپەرشتیو چاودێری ژەنەرال- وای مۆنی - کە لە هەمان کات سەرپەرشتی لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی پارێزگای مووسڵ کردبوولە شارەکەدا .

٢٠٠٣/٥/٢٨ لە دوای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شارەوانی پارێزگای کەرکوك بۆ یەکەم جار - عەبدولرەحمان موستەفا - بە پارێزگاری کەرکوكو دووجێگری لە تورکو عەرەب هەڵبژێردران .

٢٠٠٣/٥/٢٨ بەرێوەبەری ئیدارەی مەدەنی لە ئێراق - پۆل بریمەر - سەردانی باشوری کرودستانی کردو لە فرۆکەخانەی هەولێری نێوودەووڵەتی لە لایەن بەرێز مەسعوود بارزانی پێشوازی لێکردا .

٢٠٠٣/٥/٢٩ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر لە گەشتێکی ناکاوی گەیشتە شاری بەسەرەو دوای بۆ شاری بەغدا ، کە هەنگاوێکی باش بوو بۆ داهاتووی گەلانی ئێراقو ، بە تایبەت لە چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکان .

٢٠٠٣/٦/٢ هەڵبـژاردنی ٤٤ ئەنجوومـەنی شـارەوانی لـە شـاری بەغـدا ، لـە گەڕەکـە جیـا جیاکـان ، بـە سەرپەرشـتی و چـاودێری ئیـدارەی مـەدەنی ئەمـەریکا ، کـە لـە زانکـۆی موستەنسریە بەڕێوەچـوو ، کـە ئەمـەش دەبێتـە هـۆی هەڵبـژاردنی پارێزگـاری بەغـداو بەڕێوەبەرایـەتی شـارەوانی و سەرپەرشـتیارانی قـەزاو ناحیەکان ، بەڵام لەو ئەنجوومەنانە ڕۆڵی کورد بەرچاو نەبوو ، گەرچی زیاتر لە ١,٣٥٠,٠٠٠ ملیۆن هاووڵاتی کورد دانیشتووی شاری بەغدان .

٢٠٠٣/٦/١٩ یەکـەم ئـافرەت کـە پۆسـتی سەرەك وەزیران لە فنلەندە بگرێتـە دەسـت ئـەویش خــــاتوو – ئـــــەنیلی گیتینمـایکی – یـەو ، لـە دوای ٦٣ ڕۆژ لــــــــــە



پۆستەکەی دەستی لە کاری حکوومەتەکەی کێشایەوە ... بە هـۆی ئاژاوەی رامیاری سەبارەت بە بەڵگەنامەی حکوومـەتی دزراو ، کە پەیوەند بووە بە شـەڕی دژ بـە ئێـراق و ڕژێمـی بەعسی لـە ئێـراق بـە سـەرکردایەتی – سـەدام حوسێن لە وولاتەکەدا .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە گیتینمایکی لـە ٦/١٨/ یاداشتنامەی دەست لـە کارکێشانەوەی خۆی پێکەش بە پەرلەمان کرد ، بە هـۆی ئـەوەی کـە سـەرەك وزیرانـی ڕاستگۆ نـەبووە لـە ووتەکەیدا بەرامبـەر بـە پەرلـەمانی فنلەنـدە بـە بـەکارهێنانی ئـەو بەڵگەنامـەی حکوومـەت ، کـە نهێنی بوونـەو ئـەو بـە دزە پێکردنی دەست کەسانی دیکە کەوتوون .

ئەمـــەش کـــە ســـەرەك وەزیرانـــی پێـــشوو فنلەنـــدە – بـــافۆ لییـــۆنن – کـــە بەرهەڵـستکاری گیتینمـایکی بـووە و پەیوەنـدی بـە هێـزی لەگـەڵ ئەمـەریکا هەبووە – وولاتی فنلەندە کە یەکەم وولاتە لە جیهان ، کە سەرۆکی وولاتەکە و سـەرەك وەزیرانەکـەی ئافرەت حووکمرانی فنلەنـدە بکـەن ... کـە سـەرۆکی فنلەندە – تاریاهالونن – دەست لە کارکێشانەوەی سەرەك وەزیرانـی قبوول کرد و لە هەمان کات داوای لێکرد بە هەڵسووراندنی کاروباری وولاتەکە تا پێك هێنانی حکوومەتێکی نوێ لە وولاتەکە دا.

٢٠٠٣/٦/٢٤ فرۆشتنی تابلۆی وێنەکێشی نەمساوی – ئیگۆن شیل – بە ١١,٣٠٠ ملیۆن جوونەی ئیستەرلینی لە مەزادخانەی – سووتبی –



لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لە ٦/٢٣/ لە گەڵ تابلۆیەکی دیکەی وێنەکێش – پۆل گوگان – کە بە ٦,٠٠٠ ملیۆن جوونەی ئیستەرلینی فرۆشرا لەو کێبرکێیەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە تابلۆی – ئیگۆن –لە ساڵی ١٩١٦ وێنەی کێشرابوو ، کە خۆی لە وێنەیەکی سروشتی دەگرت ... ئەم تابلۆیانەش لە لایەن پیاوێکی نادیار کراوون ، کە بە پەیوەندی تەلەفۆنی تابلۆکانی کری و ناوی ئەو کریارە ئاشکرا نەکرا .

لەم رۆژەدا بایی ٣٧ ملیۆن جوونەی ئیستەرلینی تابلۆی هونەرمەندانی وێنەکێشی شێووەکار فرۆشراوە ، یەك لەوانە تابلۆی بابلۆ بیکاسۆ بە ٢,٥٥ ملیۆن جوونەی ئیستەرلینی ... هەروا تابلۆی ئیگۆن کە هێزەکانی سووپای نازی لە ساڵی ١٩٣٨ دزیبوویان و گەراندبویانەوە بۆ خێزانە جوولەکەکە لە ساڵی ٢٠٠٢ ... ئەم تابلۆیەش وێنەی ئەو شارۆچکەیە بووە کە ناوی – کروماو – ە کە وێنەکێش لەو شارۆچکەیە لە دایك بووە ، کە دەکەوێتە سەر کەناری زێی مولداو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٣/٧/١ کردنەوەی فرۆکەخانەی هەولێری نێوودەوڵەتی بە بەرزکردنەوەی ئالای کوردستان و ئەمەریکاو ئالای کۆماری ئێراقی کاتی عەبدولکەریم قاسم




کە ئالای کوردستان لە ناوەراست بوو ، کە بەرپرسانی ئەمەریکا بەشداریان تێدا کردوو نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار بۆ تەواو کردنی فرۆکەخانەکە تەرخان کرابوو لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٣/٧/٢ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاك سترۆ گەیشتە شاری بەغداو لە لێدوانێکی رۆژنامەوانی گووتی:- سووپای بەریتانیاو ئەمەریکا لە ئێراق دەمێننیّ و هەنگاوی یەکەمیش دابین کردنی ئارامی و خزمەتگوزاری گەلانی ئێراق دەبێت لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

٢٠٠٣/٧/٤ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان رایگەیاند ، کە شاری ئاشوور لە ئێراقی ئێستا و کەندی یامیانی ئەفگانی و



هەردوو پەیکەرە مەزنەکەی بووزا ، کە رژێمی بە ناو ئیسلامی تالیبان لە ئەفگانستان کۆری کردەووە و رووخاندی لە جێگە شوێنەوارە کۆنەکانی جیهانن .

ئەم دوو شوێنەش لە نێوان ٢٤ جێگەی دیکەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانن بۆ فێرکردنی زانست و رۆشنبیری رێکخراوی یۆنسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ... کە بالێکی رۆشنبیری نەتەوە یەکگرتووەکانە و چووە ناو لیستی سالأنەی رێکخراوەکە.

کە سالأنە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەسێت بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە سەر ئەو شوێنەوارانەی کە جێگەی شایستەی ئەوەبن . کە بخرێنە ناو ئەو لیستە ، بە تایبەتی ئەوانەی بەر لە مێژوو لە سەرەتای مێژوو دروستکراون لە لایەن گەلانی ئەو کیشووەرانە ، یاخوود ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان لەسەر گۆی زەویدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە جێگەی دیکەی ئامادەکرا و بۆ یەکەم جار لە گامبیا و کازاخستان و مەنگۆلیا و سودان ، لە نێوو ئەو شووێنەوارانە دیاریکراون ، لەلایەن رێکخراوی یۆنسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ... ئێستاش یۆنسکۆ لیستێکی بە ٧٥٤ شوێن تۆمارکردووە کە هەموویان بەهایەکی بەرزیان لە جیهاندا هەیە ..

هەروا شووێنەکانی دیکە خراونەتە ناو لیستەکە لە ئێراق و ئەفگانستان ، کە تووشی رووخاندن و کۆرکردنەوە هاتوون . لە ئەنجامی شەری ناوخۆو

بیری تەسکی ئیسلامی ، بە حەرام کردنی پەیکەر و شوێنەوارە گرنگەکان و مەترسی کردن لە وێرانکردنی زیاتر لە لایەن پارت و ڕێکخراو و گروپە توندڕەوە ئیسلامیەکان .

ئەویش بە پاراستنی لەم کارە درندانەیەدا ، بەتایبەتی لە وڵاتانی ئیسلامی و عەربی لە کێشوەری ئاسیا و ئاسیای بچووك و ناوەراست و لە ئەفەریکیا ... هەروا ئەو شوێنانەی کە ڕێکخراوی یۆنسکۆی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دیاریکردوون ئەمانەن :-

١- پارکی نیشتیمانی لە بۆرنۆلولو ، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئوستralیا . کە رووبەری ٢٥٠ هەزار هکتار دەگرێتە خۆ و پێکهاتووە لە بەردی لمی دروستکراو لە سەر شێوەی شانەی هەنگوین و پێکهاتووە لە سەر بازنەی ٢٠ ملیۆن ساڵ لەم کێشوەرەدا .

٢- هەر سێ زێی هاوکێش کە دەکەوێتە ناوچەی یۆنان ، کە پارێزراویەکی سرووشتی چینیە ... رووبەرەکەی دەگاتە ١,٧٠٠ ملیۆن هکتار زەوی و پێکهاتووە لە بەشەکانی هەر سێ زێی مەزن لە ئاسیا ئەویش :-

- زێی بانگتسی و زێی میکۆنگ و هەروا زێی سالووین ... ئەم سێ زێیەش بە هێلێکی هاوکێش دێنە خوارێ بە کەندەکانی شۆربووەوە لە سەر بەرزایی ٣٠٠٠ هەزار مەتر و ٦٠٠٠ هەزار مەتر لە هەرێمەکەدا .

٣- چیای مۆنتی سان گیورگیۆ لە سویسرا . ئەویش چیایەکی هەرەمیە و پێك هاتووە لە سەر چەندین هەلگەندراوی دەریایی ، کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ٢٥٠ ملیۆن ساڵ بەر لە ئێستا .

٤- گۆمی یوڤ ئس نوور لە مەنگۆلیا :- کە رووبەرەکەی دەگاتە ١,٠٠٠,٠٠٠ میلۆن هکتار زەوی و پێکهاتەی لە سەر جۆرەها باڵندە ، سەرەرای ئەوەش جێگەی حەوانەوەی گیان لەبەری - گربیل - ە کە بەرەو نەمان دەچێت لە ناوچەکەدا .

٥- پارکی فوونگ بهاکی نیشتیمانی لە ڤیتنام :- ئەویش پێکهاتووە لە زەویەکی بەرز وچەندین ئەشکەووت لەخۆ دەگرێ ، کە لە ژێر ئاوو زەویەو لە دارستانێکی کەمەرەیی دای پۆشیووە لەو وڵاتەدا .

٦- کەندی بامیان لە ئەفگانستان :- ئەم کەندەی لە پێش هەردوو پەیکەرە

مەزنەکەی بووزەدا بوون و جێگەیەکی سەرەنج راکێشە نەك هەر لە ئەفگانستان بەڵکوو لە جیهان . کە ئەو دوو پەیکەرەی بوزاش لە لایەن هێزەکانی تاڵیبان لە مانگی ٢٠٠١/١/ وێراکران و بووە هۆی نارەزایی توونـد لـە لایـەن وولاتـانی جیهـان و رێکخـراوی یۆنـسکۆ و نەتـەوە یەکگرتووەکان و ، بەتایبەتی هەڵگری بروای بوزیەکان .

٧- رێگای کیبرادادی هۆماهواکا لە ئەرژەنتین :- ئەم رێگایەش رێگایەکی بازرگانی سەرەکی بووە ، بەر لە ١٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا و تاکوو ئێستاش ... کە شووێنەوارێکی ئیمپراتـۆری – ئـەنکا – بـووە ، لـە ماوەی سەدەی پانزە و شانزەدا ... لەو ماوەی کە ناو زەندبوو بە خەبات لە پێناو بەدەست هێنانی سەربەخۆیی ئەرژەنتین لە سەدەی نۆزدەو سەدەی بیست لەم وولاتەدا .

٨- گـەرەکی فالیارایسۆی مێـژوویی کـەناری لـە تـشیلی :- ئـەم گەرەکـەش نموونـەی سـەرنج راکـێش بـووە ، لـە پەرەپێـدان و ئـاوەدان کردنـەوەی بیناسازی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم لە ئەمەریکای لاتینیدا .

٩- گـەرەکی ، جوولەکە و ، گـەرەکی ئـس تـی بروکووبیوس باسـیلیکا ، لـە تریبك لە کۆماری تشیك :- ئەم دوو گەرەکە هەڵگری نامەی بەیەکەوە ژیـانی ئاشـتیانە بـووە ، لـە نێـوان هـەڵگری هـەردوو ئـاینی جوولەکـەو مەسـیحیدا ، لـە سـەدەکانی ناوەراسـتدا تـاکوو سـەدەی بیـست ... گەرەکی جوولەکە بیرخەرەوەیـەکی کۆمـەڵگا بـووە بۆ رابردوو ، هـەروا گـەرەکی ئـس تـی بروکووبیـوس باسـیلیکاش کـە لـە سـەدەی سـیانزە دروستکراوەو بۆتە نموونەیەکی زیندوو لە هونەری بیناسازی ئەورووپی لە هەرێمەکەدا لەم وولاتەدا .

١٠- دورگـــەی گـــیمس و جێگـــەی گەیـــشتن لـــە گامبیـــا :- ئەمـــەش بیرخەرەوەیـەکی گـرنگ بـووە لـە پەیوەندیـەکانی سـەردەمی دەسـت پێکردنی بازرگانی بە کۆیلەکان و سەردەمی کۆتـایی پـێ هێنـانی ئـەم جۆرە بازرگانیـە ، کە دەرگای یەکەم بووە بۆ چوونە ناو کیشووەری ئەفەریکیا .

١١- ژێر زەمینەکانی رۆك ، کە سەر بە هەرێمی لبیهمبیتکایە لە هندستان :- ئـەم ژێـر زەمینـەش دەکەوێتە چیاکانی فینـدیهیان لەسـەر لێـواری

باشووری ، لە گردۆلکەی هندی سەرەکی ... پێك هاتووە لە پێنج کۆمەڵگای ژێر زەمینی بەردی سروشتی ، کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بەر لە مێژوو لەو هەرێمەدا لە هندستان .

١٢- شووێنی کورسیەکەی سلیمان پێغەمبەری شووێنەوار ، کە دەکەووێتە رۆژئاوای ئێران :- ئەمەش میحرانی سەرەکی ئاینی زەردەشتیەکانە ، کە بەشێووەیەك دروستکراوە لە مادەی خاند :- مەگۆلەکان - لە سەدەی سیانزەدا - سەرەرای ئەوە لە سەر پەرستگایەکە ، کە لە ماوەی دەسەڵاتی ساسانیەکان دروستکراوە لە سەدەی شەش و حەوتی زاینی . ئەویش بۆ پەرستنی خواوەند - ئانا هیتا - بوو لەم هەرێمەدا لە رۆژئاوای ئێران ,



١٣- ئاشوور - قەلای ئەلتەسریڤان - لە ئێراق :- ئاشوور شارێکی کۆنە لە ئێراق و مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زایین ... لە سەدەی چواردە تاکوو سەدەی نۆی بەر لە زایین ، شاری ئاشوور یەکەم پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریەکان بووە و لە لایەن دەسەڵاتی فارسیەکان لە سەدەی یەکەم و دووەمی زاینی دروستکراووەتەوە لەناوچەکەدا .

١٤- شاری تەل ئەبیبی سپی لە ئیسرائیل :- ئەم شارە لە ماوەی ساڵەکانی سی دروستکراوە تاکوو لە ساڵی ١٩٤٨ دەستکراوە بە نەخشەی بیناسازی شارەکە لەلایەن ئەندازیارە بیناسازیەکان کە بۆتە شارێکی سەرنج راکێش لە هەرێمەکەدا لە ئسرائیل .

جێگەی باسکردنە کە رێکخراوی یۆنسکۆی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان ٧٥٤ شووێن و جێگەی شووێنەواری گەلانی جیهانی خستۆتە لیستێکی دیاریکراو و چاکردنەوەو پاراستن و دروستکردنەوەی خستۆتە ئەستۆی خۆی لە جیهان . هەروا ٢٤ جێگە و شووێنی دیکەی لە شووێنەوارە

گرنگەکانی خستۆتە ناو ئەو لیستە لە وولاتە جیاجیاکان لە جیهاندا .


قلعة كركوك

بەڵام بەداخەوە لەوەش شۆڤێنی و بەرچاوتەنگی بەر لە چاو دەکەوێت کە تەنیا لە باشووری کوردستان قەڵای هەولێر زیاتر لە ٤٠٠٠ هەزار ساڵ بەر لە زاین دروستکراوە و قەڵای کەرکوك زیاتر لە ٢٠٠٠ دوو هەزار ساڵ بەر لە زاین دروستکراوە و شووێنەوارەکانی دیکەی وەك ، بابەگورگوڕ و شانەدەر و هەزار مێردوو قەڵای شێروانە لە هەرێمەکەدا .

ئەم شووێنەوارانە بە هاوبەرزی و مێژوویەکەیان کەمتر نین لەو شووێنەوارانەی کە خراونەتە ناو لیستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ... ئەمە و جگە لە شوێنەوارەکانی دیکەی سەر خاکی کوردستان .

ئەمەش نامەیەکە بۆ کورد و سەرکردایەتی کورد چ لە رابردوو چ لە داهاتوو ، بۆ ئەوەی کورد لە خۆی بگات کە جێگەو شووێنی لەسەر نەخشەی رامیاری و جوگرافی کەووتۆتە کام شوێن و گرنگی پێنەدان بە کورد و خاکی کوردستان .

هەروا شووێنەوارەکانی کە هەر نەتەوەیەك و دەسەڵاتێك ئاستی رۆشنبیری ئەو نەتەوە لە شووێنەوارەکاندا هەڵدەقوولێ . کە سەرچاوەی پەرەسەندن و پێشکەوتن و گەشەکردنن لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا ، لە نێوو وولاتان و گەلانی دیکەی جیهان ... منیش چەندین نموونەیەکم هێناوە بۆ ئەوەی کورد و سەرکردایەتی کورد ئەو نامەیە بە هەند وەربگرن بۆ داهاتووی گەل و نیشتیمان .

٢٠٠٣/٧/٤ لە رێوو رەسمێکی قەشەنگدا بە بۆنەی یادکردنەوەی سەربەخۆیی ئەمەریکا ، لە هاوینە هەواری دوکان سەر بە پارێزگای سلێمانی بەرێووەچوو ، بە ئامادەبوونی بەرپرسانی ئیدارەی مەدەنی پۆل بریمەرو کەسایەتی دیکەو ئاڵای کوردستان و ئێراق و ئەمەریکا بەرزکرایەوە ، کە ئاڵای کوردستان لە ناوەڕاستی هەردوو ئاڵاکان بوو لە گۆرەپانی ئاهەنگەکەدا .

٢٠٠٣/٧/٦ لە مێژووی جیهان و جیهانی ئاژەڵ گەورەترین ئەختەبووت لە وڵاتی تشیلی دۆزرایەوە ، لە لایەن زانایانی ئاژەلناس و پسپۆران لەو بوارەدا کە کێشەکەی ١٣ تەن و درێژیەکەی ٤١ مەتر بوو ، ئەویش لە کەناری شارۆچکەی – لۆس مۆبرەس – بوو ، کە کاردانەوەی سەرسوورمانی نواند لە نێوان زانایان لە جیهاندا .

٢٠٠٣/٧/٧ لە مێژووی زانستی پزیشکی جیهان نوژداری بۆ دوکچە ئێرانیەکە – لالەو لادن – لە تەمەنی ٢٩ ساڵ ئەنجامدرا ، کە جوومجمەی سەریان بەیەکەوە نوسابوون ، پێك هاتبوو کە کە گروپی پزیشکەکان لە ٦ پسپۆری جیهانی و ١٨ پسپۆری سەنگافورا لە نەخۆشخانەی زانکۆی سەنگافورا ئەنجامدراو نەشتەرگەریەکە هەرەسی هێنا بە هۆی سەختی کارو کارە زانستیەکان ...؟...!.

٢٠٠٣/٧/٨ بەڕێوەبەری گشتی کارگێری و مەدەنی ئەمەریکاو هاوپەیمانان پۆل بریمەر دراوی نوێ ئێراقی راگەیاند ، کە یەك دیناری نوێ بەرامبەر یەك دیناری کۆپی ئێراقی سەدامی و یەك دیناری چاپی سویسری بەرامبەر ١٥٠ دیناری چاپی نوێ ، ئەویش لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بوو ، ١٠٠ دۆلاری ئەمەریکی بەرامبەر ١٥٠,٠٠٠ هەزار دیناری نوێی ئێراقی بە ناوی پارەی پۆل بریمەر لە وڵاتەکەدا . هەروا کاریگەری خۆی نواند لە سەر پەیوەندی ئابووری لە ناوخۆی ئێراق و کوردستان ، و بە بوونی بەهای نزمی دراوی ئێراقی بەرامبەر بە دراوی وڵاتانی دراوسێ و وڵاتانی جیهان .

٢٠٠٣/٧/١٦ بەرپابوونی کوودەتای سەربازی بە رووخاندنی حکوومەتی ساوتوومی وبرینسیب بە سەرۆکایەتی – فرادیك دب مینبزیس – کە یەکەم ئافرەتە ئەو پۆستە بگرێتە دەست لەو وڵاتە بچووکە دا کە وڵاتێکی دوورگەییە لە رۆژئاوای ئەفەریکیا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم وولاتە داهاتی سەرەکی لە سەر هەناردەی کاکاوەو نەوتیشی لە ناو ئاو لە دەریای هەرێمایەتی لە سەر وولاتەکەدایە ... لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کودەتایەش سەرەك وەزیران ماریا داس نیفیس و چەندین لە وەزیرانی حکوومەتەکەی دەست بەسەرکراون ... هەروا لەکاتی کودەتایەکە سەرۆکی وولاتەکە – فرادیك – بە سەردانێکی لە وولاتی نیجیریا بوو لە گەڵ شاندێکی باڵای وولاتەکەی ، لە پێناو هاوکاری دوو لایەنە بەسەرکردایەتی – میجوور فرنانـدۆ بیربیرا – بووە کە کۆلێژێکی سەربازی دەبرد بەرێووە لە ریزی سووپای ئەم وولاتەدا .

٢٠٠٣/٧/٢٠ جێگری وەزیری بەرگری ئەمەریکا – بۆو وڵفرجیۆی – سەردانی هەرێمی باشووری کوردستانی کرد ، لە لایەن سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە هاوینەهەورای سەلاحەدین پێشوازی لێکرا .



٢٠٠٣/٧/٢١ تاوانبارو ئامۆزای سەدام حوسین ، عەلی حەسەن مەجید ناسراو بە عەلی کیمیاوی لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانان دەستگیری کرا ، لە شارۆچکەی سامەرای سەر بە پارێزگای تکریت – سلاحەدین – ، کە ئەنجامدەری ئەنفال و کیمیا بارانە بەدناوەکەی شاری هەڵەبجەی شەهید بوو ، لە گەڵ ئەنجامدانی بە سەدان کاروکردەوەی دیکەی نامرۆڤایەتی بەرامبەر بە گەلانی ئێراق ، ب ەتایبەتی گەلی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان .



٢٠٠٣/٧/٢٢ دوو کورە لە گورك چووەکەی سەدام حوسێن – عودەو ، قوسەی – لە لایەن هێزەکانی سووپای ئەمەریکا ، لە کاتژمێر شەشی بەیانی تاکوو دووی پاش نیوەڕۆ لە ئەنجامی شەڕکردنیان لە گەڵ هێزەکانی سووپای ئەمەریکا ، کوژران کە خۆیان لە ماڵی ئامۆزای باوکیان حەشاردابوو لە شاری مووسڵ .

٢٠٠٣/٧/٢٩ پێك هێنانی ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتی لە ئێراق بە ڕێکەوتن لێژنەی سەرکردایەتیان دانا ، لە ٩ ئەندام ، کە /٥ ئەندام لە شیعەو ٢ /دوو ئەندام لە سوونەو مام جەلال و کاك مەسعوود لە کورد ، پەیرەوی ناوخۆی ئەنجوومەنی دەسەڵات پەسەند کرا ، کە ئەمەش تارادەیەك هەنگاوی باش بوو بۆ ئەنجامدانی کارەکانی دیکە بە دیاریکردنی داهاتووی ئێراقی نوێ بەرەو دامەزراندنی حکوومەتێکی فیدراڵی دیموکراتی یەکگرتووی فرەلایەن لە ئێراق.



٢٠٠٣/٨/١٥ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشنیاری ئەمەریکاو بەریتانیای پەسەند

کرد ، بە داننان بە ئەنجوومەنی دەسەڵاتی گواستنەوەی ئێراق ، کە تەنها سووریا دەنگی بەو بریارە دانەنا ، کە نوێنەرایەتی وولاتانی عەرەبی لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکرد لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە ئێراق .



٢٠٠٣/٨/١٩ جێگری سەرۆکی ڕژێمی بەعس لە ئێراق تەها یاسین ڕەمەزان بە نەژاد کورد ، ناسراو بە تەها جەزراوی ، کە خوێن مژی گەلانی ئێراق بە تایبەتی گەلی کورد لە کوردستان بوو ، لە شاری مووسڵ لە گەرەکی – الوحدە – لە لایەن هێزەکانی پێشمەرگەی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان دەستگیر کرا . ئەویش بەجلی عەرەبی و درا دەست هێزەکانی سووپاو ئیداری مەدەنی ئەمەریکا لە ئێراق .

٢٠٠٣/٨/٢٣ کێشەی نێوان کوردو تورکمان بە هاندانی بەرەی تورکمانی لە شاری خورماتووی دابراو لە پارێزگای کەرکوک و لکاندنی بە پارێزگای سلاحەدین ، لە ئاکامی ئەو دەست تێوەردانە ، بووە هۆی شەڕ کردن ، کە لە ئەنجام هەشت تورکمان کوژران لەگەڵ سێ کوردو پانزە زامدارو دوای ئەوە ئەو کێشەیە بەرەو شاری کەرکوک هەنگاوی نا بە ئامۆژگاری ڕژێمی تور کیا لە ڕێگەی دارو دەستەکانی و بەکرێ گیراوەکان لە بەرەی تورکمانی لە پارێزگادا .



٢٠٠٣/٨/٢٨ ژمارەیەکی زۆر ڕێکەوتنامەی نێوودەووڵەتی گرێدراون ، بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەو مافانەی کە لەڕێکەوتنامەی ڤیەنا هاتوون و بە لابردنی ئەو

ئەگەرانەی تێیدان... گرنگترینیان بەرنامەی كاری - ئەلماتی - یەكە لە كۆنگرەی دەوڵەتانی تازە پێشكەیشتووی داخراو وولاتانی ترانزێتو دەزگا دارایی و گەشە پێدەرە نێودەوڵەتیەكانی پەیوەندیدار بوو لە بواری گواستنەوە .

كە لە شاری ئەلماتی لە كازاخستان بەسترا... داڕێژراو بڕیاری لە سەر درا ، هەروا كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان لە بڕیاری ژمارە/٢٤٥/٥٩ لە ٢٠٠٥/٣/٣ ، جارێكی دیكە جەختی كردەوە كە دەوڵەتە داخراوەكان ، كە واتە ئەوانەی سنووری وولاتەكانیان ناكەوێتە سەر هیچ دەریایەكە مافیان هەیە خاكو مەڵبەندەكانی گواستنەوەی دەوڵەتانی ترانزێت بەكار بێنن ، بۆ هاتوو چۆو گواستنەوەو پەرینەوە بەرەو دەریاو گەرانەوە ، بە پێی بنەماكانی یاسای نێودەوڵەتی ، كە كوردستانیش بە پێی ئەو بڕیارە ماف خۆی هەیە وەك وولاتانی دیكە لە جیهان .



٢٠٠٣ /٨/٢٩ لە دوای نوێژنكردنی نیوەڕۆی هەینی لە شاری نەجەف رۆژئاوای باشووری بەغدا - محەمەد باقر حەكیم - سەرۆكی ئەنجوومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی لە ئێراق ، تیرۆر كرا لە گەڵ / ٨٢ لە نوێژكەرانو زامداربوونی ٢٣٠ هاو وڵاتیش ، ئەمەش لە دوای ٢٣ ساڵ گەڕانەوەی لە ئاوەرەیی لە ئێران .

٢٠٠٣/ ٩/٣ یەكەم كابینەی حكوومەتی گواستنەوەی حكوومەتی كاتی لە ئێراق لە لایەن ئەنجوومەنی حووكمەتی كاتی ئێراق راگەیاندرا ، كە لە ٢٥ وەزیر پێك هاتبوو ، كە عەربی شیعەو سوونە ١٣ وەزیرو ، كورد ٤ وەزیرو ، وەزێكی توركمانو ، وزێرێكی ئاشووری ، لە پێناو ئارام كردنەوەی بارو دۆخی وولاتەكە .

٢٠٠٣/٩/١٤ وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا كوڵن باوڵ بۆ یەكەم جار سەردانی ئێراقی كرد لە دوای رووخاندنی رژێمی بەعس بە سەركردایەتی سەدامو دەسەڵاتەكەی

، کە ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە ڕووخاندنی ڕژێمی بە عسی دیکتاتۆر لە ئێراق .



٢٠٠٣/٩/١٥ وەزیـری دەرەوەی ئەمـــەریکا – کـۆڵن بـاوڵ – و پـۆل بریمـــەر – دادوەری گشتی مەدەنی ئەمەریکا لـە ئێراق ، سـەردانی شـاری هەڵەبجەی شـەهیدیان کـرد لـە هـەرێمی باشـوری کوردسـتان ، کـە لـە لایـەن بـەڕیزان مـام جـەلال و مەسـعوود بـارزانی و جـەماوەرێکی بەرچـاوی شـاری هەڵەبەبجـە پێشـوازیان لێکرا .

سەردانەکەی کۆڵن پاوڵ کاردانەوەی بێ وێنەی بۆ داهـاتووی کـورد نواند ، لە گەڵ سـەردانی شـاری کـەرکوک و ، بووە هۆی بەرچاوتەنگی دراوسـێکانی ئێـراق ، بـە تایبـەتی گـەلی کـورد کـە نامەیـەکی کـراوە بـوو لـە پێنـاو مامەڵـە کردن لە گەڵ دەسەڵاتی کوردو هەموو لایەنەکان .

٢٠٠٣/٩/١٥ سـەرۆکی ئـەرکانی سـوپای گینیـا بیـسا و ، ژەنــەراڵ – فیریــسیمۆ کریبیـا سـیابر – ڕایگەیانــد ، بــە خــۆکردن بــە سەرۆکی وڵاتەکە لە ئەنجامی کوودەتایـەکی سـەربازی ، کـە هێـزی سـووپای گینیابیـساو



پـشتگیری لێکـردوو لـە هـەمان کـات کوربیـا لـە ڕایگەیاندنەکەیدا دووپـاتی کردەووە . کـە لـە سـەرۆکایەتی وڵاتەکـە بـەردەوام دەبـێ تـاکوو ئەنجامـدانی هەڵبـــژاردن ... هـــەروا هێزەکـــانی ســـووپا ڕایانگەیانـــد ، بـــە دامەزرانـــدنی

حكوومەتێكی گوواستنەوەی نیشتیمانی كە لە هەموو لاینە رامیاریەكان رامیاریەكی نیشتیمانی دەگرێتە بەر ... هەر لەو كاتەشدا سەرۆكی لابراو — كمبایالا — دەست بەسەركرا سەرەرای بەڵێندان بە ئازادكردنی .
جێگەی ئاماژە پێكردنە كە سەرەك كۆماری گینیابیساو كمبایالا لە مانگی ٢٠٠٢/١١/ حكوومەتەكەی هەڵووەشاندەوەو بەڵێنی دابوو كە لە رێگەی هەڵبژاردن باری وولاتەكەی بەرەو ئارامی و ئاوەدان كردنەوەو گەشەپێدان ببات ... لە كاتی كوودەتا سەربازیەكە سەرەك وەزیران — ماریۆبیزر — كە لە باشووری وولاتەكە بوو ، نەیتووانی بگەرێتەوە پایتەخت بەهۆی گومان كردنی بەدەست گیركردنی لەلایەن سەركردەكانی كوودەتا سەربازیەكە ...
گینیابیسا و هەژارترین وولاتە لە جیهان و ، بە هۆی هەژاری و كەمی خۆراك دەناڵێنیٚ . هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە ئەم كوودەتایە لەلایەن هێزی سووپا ئەنجام بدرێت بەهۆی نەتووانینی سەرۆكی وولاتەكە بە چارەسەر نەكردنی كێشەكان ، بە تایبەتی كێشەی هەژاری و كەمی خۆراك و كێشە رامیاری و ئابووری و كۆمەڵایەتیەكان لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٣/٩/١٥ زاناكان بۆ یەكەمجار هەڵسان بە كۆپی كردنی مشك لە جیهاندا . ئەویش بە چوونە ناو لیستی كۆپی كردنی ئاژەڵ بە كۆپی كردنی دوو مشك لە شانەیەكی گرنگی ئەم ئاژەڵە



بچكۆڵەیەدا ، ئەو لیستەش بە كۆپی كردنی — مەڕ و مشك و بەراز و پشیلە و بزن و ئێستر و ئەسپدا .
بەڵام كۆپی كردنی مشك لە شانەیەكی گران بووە بە هۆی دواكەتن لە كۆپی كردنەكەیدا ، بە هۆی نشوونماكردنی هێلكەكانی لە كاتەكانی سەرەتای یەكەم لەكاری كۆپیەكەدا . ئەم ئاژەڵەش لە تاقیكردنەوەی بەردەوامی لەسەر بووە . لە پێناو دۆزینەوەی نەخۆشیە تایبەتمەندەكانی وەك بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن و نەخۆشی شەكرەو باری دیكەی نەخۆشیەكان .
سەرچاوە :- BBC.arabic

٢٠٠٣/٩/٢٥ پارکی سامی عەبدولرحەمان لە شــاری هــەولێر لــە هــەرێمی باشووری کوردستان لـە لایـەن سـەرۆکی حکوومـەتی هـەرێمی کوردستان نێچیرڤان بـارزانی کرایــەوە ، بــە تــەواوکردنی



بەشی یەکـەمی لـە سـەر رووبـەری — ٤٠٠ — دۆنمو بـە یـەکێك لـە پارکـە نێوودەوڵەتیەکان دەژمێردرێت لە دروستکردنی کەش و هەوای گوزاری بۆ هاوولاتیان .

٢٠٠٣/٩/٢٧ هەڵـدانی مـانگی دەسـتکرد دژی رووداوە سروشــتیەکانی مرۆڤایــــەتی لەلایـــــەن رێکخراوەکـان ، لـە تورکیـا و نێجیریـاو بـەریتانیا لەســەر پشتی مووشـەکی کۆزمۆس لـە



کاتژمێر دەو دوانزە چرکەدا ... هـەروا هەڵدانی مـانگی دەسـتکردی نێجیری کە یەکەم مانگی دەستکردە کە لەلایەن نێجیریا بەرەو گەردوون هەڵدەدرێت . ئەم مانگە دەستکردەش پارچەیەکە لە پێکهاتەی تۆری مـانگی دەسـتکرد بـە نـاوی — تـاوەری چـاودێری کارەسـاتەکان — دی ئـیم سـی —ئـەویش بــە ئاگادارکردنەوەی ئاژانسەکانی یارمەتیە مرۆیەکان لە سەر زەویدا بەنوێترین زانیاری ... ئەم تاوەرە چاودێریە کاراساتەیە لەلایـەن حـەوت رێکخراو پێك هاتووە ئەویش :—

جەزائر و چینی مللی و نیجیریا و تورکیا و تایلاند و ڤێتنام و بەریتانیا ... کە ئەم کارەش لە لایـەن کۆمپانیـای — سیری — بـەریتانیا ئەنجام دراوە لە پێناو بەدەست هێنـانی قـازانجێکی بێ وێنـە ، کـە سـەر بەزانکۆی سیریە لە جیلفۆرد لە بەریتانیا .

ئەو مانگە دەستکردانەش ئاگادارکەرەوەی بە پەلەی یارمەتیـە خێرایەکانـە لە بارەکانی وشکانی و گومەلەرزەو گرکان و هەڵگیرسانی لە هەر وولاتێك لـە

وولاتەکانی جیهان و هەروا چاودێری کردنی هەموو خاڵێکە لە سەر گۆی زەوی بۆ هەر جارێك لە ماوەی دوو رۆژدا .

٢٠٠٣/١٠/٧ پەرلەمانی رژێمی تورکیا رەزامەندی لە سەر پێشنیاری ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیا کرد ، بە رەوانە کردنی هێزی سەربازی بۆ باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق ، سەرەرای نارەزایی گەلانی ئێراق بە تایبەتی گەلی کورد ، کە دوا رۆژێکی ترسناکی هەمەلایەنەی لە داهاتوو لە باشووری کوردستان وئێراق دەبێت .



٢٠٠٣/١٠/١٤ دەست پێکردنی گفتووگۆی مێژوویی لە شاری ڤیێنای پایتەختی نەمسا بۆ یەکەم جار لە سەر ئاستێکی بەرز لە نێوان بەرپرسانی سرب لەگەڵ نوێنەرانی ئەلبانیە کۆسۆڤیەکان ... ئەم گفتووگۆیەش لەدوای جەنگی ناوخۆیی دێت کە لە هەرێمەکەدا لە ساڵی ١٩٩١ بەرپاکرا ، لە نێوان دژایەتکارانی نەتەوەیی و ئاینیەکان .

لەلایەن سربەکان ، سەرەك وەزیران – زۆران زیفکۆسفیتش – و نوێنەری ئەلبان کۆسۆڤۆ سەرۆك – ئیبراهیم دگۆڤا – بەڵام لە لایەکی دیکە سەرەك وەزیرانی – کۆسۆڤۆ – باگرام رەجەبی – دەستگیر بوو بە بریارەکەی خۆی بە ئامادە نەبوونی لە دانیشتنەکانی ئەم گفتووگۆیەدا .

ئەمەو راوێژکاری نەمسا – لفگانگ شۆسیل – ئەم گفتووگۆیەی کردەووە بە شێووەیەکی فەرمی لە پێناو گەیشتن بە رێگە چارەیەکی گوونجا و بۆ کێشەکان لەو هەرێمەدا ، کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك پارێزگاریکردن لە هەرێمەکەدا .

کە لە ساڵی ١٩٩٩ هێزەکان پەرش و بڵاوبوون لەو هەرێمەدا ، لەدوای کۆتایی هاتنی شەری ناوخۆی نێوان پێکهاتەکانی هەرێمەکە . ئەم گفتووگۆیانەش لەسەر چوار تەوەر بوون ئەویش :-

١ – گەراندنەوەی ئاوارەکان . ٢– هەڵدانەوەی دۆسیەی بزربووەکان .٣ – گواستنەوە . ٤ – گەیاندن و ووزە .

لـه گـەڵ چـەندین لایـەنی دیکـه کـه زیـاتر لـه ۳۷۰۰ کـەس بزربـوون و سـەرو شـووێنیان دیارنیـه ، کـه زۆربـەیان لـه ئەلبانـەکانن و ئـاوارەبوونی زیـاتر لـه ۱۰۰,۰۰۰ هــەزار سـرب ... ئەمــەش لـه ئاکـامی کـەرت بـوونی سـربەکان و کۆسـۆڤیەکان بـوو بـەهۆی هــەرێمی کۆسـۆڤۆ ... هــەروا لــەم گفتووگۆیــەدا نووێنەری یەکیەتی ئەوروپا – خافێز سۆلانه و کریس باین – و سکرتێری گـشتی نـاتۆ بەشـداریان تێـدا کـرد لـه پێنـاو چارەسـەری کێـشەکان لـه هەرێمەکەدا.

۲۰۰۳/۱۰/۱۵ چاپی نوێی دراوی ئێراق له دوای رووخانـــدنی رژێمـــی بەعس کەوتە بازار ، کە لە لایـــــــەن دەســـــەڵاتی هاوپــەیمانان ، لــە لایــەن دادوەری گـشتی ئەمــەریکا لـه ئێـراق – پـۆل بریمـەر– راگەیـەنراو لـە لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا بەچاپگەیندرابوو بۆ ئێراق .



۲۰۰۳/۱۰/۱۸ دوای ســـــێ رۆژ لـــــە وەرگـــرتنی دەســـەڵات – کـارلۆس میـسا – لە دوای دەسـت لـە کارکێشانەوەی سـەرۆکی پۆلیڤیـا – لـۆزاد – لیـستی ۱۵ کەسـی لـه ئەندامانی حکوومەتەکەی ئاشکرا کرد ، کە ئەمەش لە ئاهەنگێکی قەشەنگ لـه هـۆڵی پەرلـەمان لـه – لاباز – ی پایتـەختی پۆلیڤیا ئەنجامدرا... هـەروا دوای وەرگرتنی دەسەڵات لە یەکەم رۆژیدا بریاریدا بە کشانەوەی هێزەکانی سوویا لە شەقامەکانی پایتەخت .

ئەویش بەهۆی خـۆ پێشاندان و نارەزایی گـەلی پۆلیڤیا دژی حکوومـەتی هەڵووەشـاوە ، بـەهۆی گرتنـە بـەری رامیاریـەتی ناراسـت لـە بوارەکـانی رامیاری و کۆمەڵایەتی و سەربازی بە تایبەتی لە بواری ئابووریدا .

ئەمەش لەدوای ئـەوە هـات کـە سـەرۆکی دەسـت لـە کار کێشاوە رامیاریـەتی

پێچەوانەی وولاتەکەی گرتبووە بەر . بە هۆی رەوانەکردنی گازی سروشتی بۆ وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و مەکسیك و ، کە بووە هۆی ئەوەی کە زیاتر لە ۷۰ هاوولاتی گیان لەدەست بدات و بە دەیانیش زامداربن دژی حکوومەتی هەلووەشاوە بەسەرکردایەتی - گۆنزالو سانشیز دی لۆزادا - ... دوای وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن کارلۆس میسا گەلی پۆلیڤیا ئاهەنگی رزگاربوونیان لە شەقامەکانی لاباز ئەنجامدا و دژی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی وەستان لەم وولاتەدا ، کە رامیاریەتی سەرۆکی رابردوو هاوپەیمانی ئەمەریکا بوو لەگەڵ چەندین پارت و رێکخراو .

بەلام پاڵە پەستۆی گەلی پۆلیڤی لە رێگەی پارت و رێکخراوەکان توانیان ئەم حکوومەتە برووخێنن و حکوومەتێکی نوێ لە وولاتەکە دابمەزرێنن لە پێناو بووژاندنەوەی ژێر خانی ئابووری وولات و گۆرینی رامیاریەتی کۆن و پەیوەندیە ناوخۆیی و نێوو دەوولەتیەکان .

۲۰۰۳/۱۰/۲۷گرێدانی دووەم کۆنگرەی سۆسیالیست- ئینتەرناسیۆناڵ لە شاری ساوپاولۆی بەرازیل ، کە ۱٤۹ پارتو رێکخراوی رامیاری بەسیفەتی ئەندامو ئەندامی چاودێرو ئەندامی راوێژکار لە خۆدەگرێت . بە ئامادەبوونی هەموو ئەو پارتو رێکخراوانە ، کە بەشدارن لەم رێکخراوەیەدا

.

کە باوەریان بە ماف چارەنووسی گەلان هەیەو تێدەکۆشن بۆ چەسپاندنی دیموکراسیو ئازادیو پاراستنی مافەکانی مرۆڤو ئافرەتانو رێز لە یاسا دەگرنودادپەروەری کۆمەلایەتی پەیرەو دەکەن ، هەولی بە مەدەنی کردنی کۆمەلگاکان دەدەن ، خۆیان سازدەدەن بۆ ئابووریەکی ئازادو بازارێکی کراوە بۆخزمەت کردنی کۆمەلگاکان لە وولاتە جیاجیاکانی جیهاندا .

**تێبینی:-** دەتوانی بگرێیتەوە بۆ بەرگی دووەمی ئەم کتێبە لەسەرەتای سالی پەنجاکان بە شێوەیەکی روون باس لە چۆنیەتی ئەم رێکخراوەیە کراوە .

۲۰۰۳/۱۱/۱٥بە هۆی تەقینەوەی ئۆتۆمبیلێکی مین رێژکراو لە شاری ئەستەمبۆلی تورکی لە پێناو تەقاندنەوەی هەردوو مەزراگەی جوولەکەکان ئەویش مەزارگەی - نیفە شالۆم - لەناوچەی - بیوگلوو - هەروا مەزارگەیەکی دیکەی نزیك لەو ، کە لە ئەنجام بووە هۆی رووخاندن و شکاندنی شووشەکانی پەنجەرە و کوژرانی زیاتر لە ۲۰ هاولاتی .

کـه ئەمــەش لەلایــەن ئیــسلامە توونــدرەوەکان ئەنجامــدرا بــەناوی — فورسانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی گەورە — کە بەرپرسیاریەتی خۆیان بۆ ئەم کارە لە تورکیا راگەیاند .

٢٠٠٣/١١/٢٩ بـۆ یەکـەم جـار لـە مێـژووی پارێزگـای سـلێمانی فرۆکەخانـەی سـلێمانی نێودەوڵـەتی کرایـەوە ، کـە رۆڵـی گرنگـی دوا رۆژی ژێرخـانی ئـابووری و پەیوەنـدی نێودەوڵـەتی دەبیٚ لـە بوارەکـانی بازرگـانی و گواسـتنەوە لـە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٣/١٢/٤ لە راگەیاندێکیدا ووتەبێژ بــــەناوی ئوســـــزا بــــە رەزامەنـدکردنی لـە رژێمـی بــــەرگری مووشـــــەکی — قــەلغان — ی ئەمــەریکی ، کـە ئەمــەریکا زیـاتر لـە ٩ ملیـار دۆلاری دیـاریکرد لـە پێنـاو پەرەپێدانی رژێمـی بەرگری مووشـەکی . هەروا وەزیری دەرەوەی ئوستترالیا — ئەلکسەندەر دۆنر — لە راگەیاندنێکیدا گووتی :—

بەشداری کردنی ئوسترالیا لەم کارە خزمەتی ئامانجەکانی سوبرا دەکات و هــیچ بــیروو بۆچــوونێك نیــە بــۆ دامەزرانــدنی ئــەو بنکـە مووشــەکیە لــە وولاتەکەیدا . لەو کاتەشدا پەرلەمانی ئوسترالیا ناوی حکوومەتە نوێیەکەی ئاشـکراکرد کـە لــە هەڵبژاردنـەکانی ١٠/٢٠ ئەنجامـدرابوو بەسـەرکەوتنی پارتی گەلی راسترەوی ئوسترالیا.

لــە لایــەکی دیکـە ئەمــەریکا هــەموو هەوڵــەکانی خــستە گــەر لــە پێنــاو دروستکردنی هێڵێکی بەرگری کردن لەخۆ . دژی کۆریای باکوور و ئێران و رووســیای یــەکگرتوو ، ئــەویش بــەهۆی توانــای کۆریــای بــاکوور لــە دروسـتکردنی چەکی ئـەتۆمی و ئـەم جۆرە مووشـەکانە لە نیمچە دوورگـەی کۆریا لە داهاتوودا.



٢٠٠٣/١٢/١٣ دەستگیر کردنی سـەرۆکی رژێمی بەعس لە ئێراق سەدام حوسێن لـە لایـــەن هێزەکـــانی ســـووپای ئەمـەریکا لـە شارۆچـکەی دۆرەی سەر بە پارێزگای تکریت و لە ژێر زەمینێکـی حـەوت مـەتر قوڵدا لـە نـاو چـەند مـالێکی جووتیـاری کـشتووکاڵ هەسـت پێنـەکراو لـە دەڤەرەکەدا .

٢٠٠٣/١٢/١٧ ڕۆژنامـەی – الرایـة – ی قەتـەری لـە ڕۆژی چوارشـەمە لـە هەواڵێکیـدا ڕایگەیاند ، کە سـەرەك وەزیرانـی ئیسرائیل شـارۆن لـە سـەردانێکی ناکاوی گەیشتە شاری بەغدا ، بەنهێنی لە ڕۆژی یەك شـەمەی رابردوو چاوی کـەوت بە سـەدام ، بە یاوەری پۆل بریمـەر دادوەری گشتی مـەدەنی لـە ئێـراق ، لـە هەمان کات ڕاپۆرتەکەی پۆل بریمـەر لـە دوای تـەواو بوونی چاوپێکەوتنەکە لە گەڵ سەدام لە گەڵ خۆی بردی ... ئەو ڕۆژنامەیە لە زاری ناسر مـەحمود وەری گرتووە ، کە کەسایەتیەکی سیاسی ئێراقیە ، کە نزیکترین کەس بووە لە ئەنجوومەنی کاتی حوکمی ئێراق .

٢٠٠٣/١٢/٢٦ شـاندێکی کۆمکـاری عـەرەبی بـە سـەرۆکایەتی ئەحمـەد عـەلی سـەردانی هـەرێمی کوردسـتانی کـرد ، کـە ئەمـەش بـۆ یەکـەمجارە لـە مێـژووی کـوردو کۆمکاری وولاتانی عەرەب ، کە لـە لایـەن سـەرکردایەتی پارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و یـەکێتی نیشتیمانی کوردستان پێشوازی لێکـران و لـە هـەمان کـات سـەردانی شـاری هەڵەبجـەی شـەهیدیان کـرد بـە تێگەیـشتنیان لـە تاوانەکانی رژێمی بەعس لە ئێراق بە سەرکردایەتی سەدام و یاریدەدەرکانی لە هەموو لایەنێك لە وولاتەکەدا .

## ٢٠٠٤



٢٠٠٤/١/٧ بــەدەیان هــەزار هــاووڵاتی كەمبۆدی لە شاری – بنۆبنە – ی پایتــــەختی كــــەمبۆدیا كۆبوونەوە بۆ زیندووكردنەوەی یــادی ٢٥ ســاڵەی رووخانــدنی رژێمــی – خـەمیری حومر – لە ووڵاتەكەدا .
جێگـەی باسـكردنە كـە لـەم رۆژەدا و لـە سـاڵی ١٩٧٩ هێزەكـانی سـووپای ڤێتنـام توانیـان ووڵاتـی كـەمبۆدیا داگیربكـەن و كۆتـایی بـە رژێمـی پـۆل بـۆت بێـنن كـە رژێمێكـی دراندانـەی بـیٚ وێنـە بـوو لـەو سـەردەمەداو لـە مـاوەی دەسـەڵاتی پـۆل بـۆت لەسـاڵی ١٩٧٥ – ١٩٧٩ ، كـە زیـاتر لـە ١,٧٠٠,٠٠٠ ملیـۆن هـاوڵاتی كـەمبۆدیا گیانیـان لەدەسـتدا ، بـەهۆی رژێمـە شـۆڤینی و بەرچاوتەنگەكەی و درندانەییەكەی لەم ووڵاتەدا .
ئەمەش بەدانانان بەم كارە نا مرۆڤانەی كە لە لایەن سـەركردەكانی خـەمیری حـومر ئەنجامـدرابوو و یـەك لەوانـە – خیووسـامگان – ئەمـەش لـە ئاكـامی رێكـەووتنی نێـوان سـەرۆكی كـەمبۆدیا – تـشی سـم – پـارتی دەسـەڵات لـەم ووڵاتـەدا و رێكخـراوی نەتـەوە یـەكگرتووەكان بۆ دادگـایی كردنـی شـەش لـە بەرپرسانی رژێمی خەمیری حومر بەسەركردایەتی پۆل بۆت و گەراندنـەوەی دادپەروەری بۆ كەمبۆدیا



٢٠٠٤/١/١١ رێكخـــــراوی نەتـــــەوە یـــەكگرتووەكان بریاریـــدا بـــەكردنی ســـاڵی ٢٠٠٤ بـــە ساڵێكی نێوو دەووڵەتی ، بە ئاهــەنگێران دژی دیــاردەی كۆیلایــەتی لــە جیهانــدا ... ئـەم ئاهەنگـەش لـە شـاری –

کیب کۆست – ی کەناری لە وولاتی گانا ئەنجامدرا بە ئامادەبوونی – کویتیشر و ماتسورا – سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەروەردەو رۆشنبیری و زانست – یۆنسکۆ – کە ئەم شارە مەڵبەدی بازرگانی کردن بوو لە کیشووەری ئەفەریکیا بە مرۆڤ بە تایبەتی مرۆڤی تەمەن ١٠ ساڵی تا ١٨ ساڵیدا

لە ووتارێکیدا ماتسورا ئەوەی روونکردەوە ، کە دیاردەی کۆیلەیی تاکوو ئێستاش باوە لە زۆربەی وولاتانی جیهان ، بە تایبەتی لە وولاتانی سەرمایەدا رووەو ئیمپریالیزمی . کە بازرگانی بە مرۆڤ دەکرێ ، لە پێناو بەدەست هێنانی سەرمایە جا لەکارپێکردنی مرۆڤ بێت لە کێڵگەو کارگەو پرۆژە جۆراو جۆرەکان و کاری ناو ماڵ و کاری سکسی و چەندین کاری دیکە لە وولاتە جیاجیاکانی جیهان .

ئەمەش لەلایەن ئەم وولاتە هەژارانەی کە توانای دابینکردنی بژێووی ژیانی گەلەکەیان نین بەتایبەتی لە کیشووەری ئەفەریکیا و چەندین وولاتی دیکە لە جیهان .

٢٠٠٤/١/١٤ گەرانەوەی سەرەك وەزیرانی پێشووی حکوومەتی ڤیێتنامی باشوور – نگووین کاوکی – کە ئەمەریکا پشتگیری لێدەکرد بۆ ڤیێتنام و بۆ یەکەم جار دوای ٢٩ ساڵ لەهەلاتنی لە ڤیێتنام لە ساڵی ١٩٧٥ ... ئەمەش لە دوای رەزامەندی حکوومەتی ڤیێتنام بوو بە گەرانەوەی بۆ شاری – هۆتشی منە – کە پێشوو پێیان دوگووت – سایگۆن – و بەسەرکردایەتی بنەماڵەکەی و بەشداری کردنی لە ئاهەنگی ساڵانەی مانگی نوێ .

لەدوای کودەتای سەربازی لە ساڵی ١٩٦٥ نگووین کاوکی بووە سەرەك وەزیرانی ڤیێتنام و ، دوای ئەوەش بووە جێگری سەرۆکی ڤیێتنام بۆ ماوەی

چوار ساڵ ... نگووین یەکێك بووە لە نێوان ٢٠٠ هەزار ڤێتنامی کە روویان لە وولاتانی دیکەی جیهان کرد ، بەهۆی رووخاندنی رژێمی سەر بە ئەمەریکا لە ڤێتنامی باشوور و یەکگرتنەوەی هەردوو کەرتی ڤێتنامی باکوور و باشوور بوونی بە دەووڵەتی ڤێتنام .

هەر چەندە گەلی ڤێتنام دڵخۆشکەر نەبوو بە گەرانەوەی نگووین بۆ ڤێتنام ، لەگەڵ چەندین بەرپرسانی دیکەی مەدەنی و سەربازی لە حکوومەتی ڤێتنامی دروستکەری ئەمەریکا ... بەلام حکوومەتی ڤێتنامی کۆمۆنیستی دەرگای گەرانەوەی بۆ ئەو کەسانە کردەوە کە خوازیاری گەرانەوەن بۆ وولاتەکە دوای ٣٠ ساڵ لە کۆتایی هاتنی شەری ناوخۆی دژ بە یەکتری لەم وولاتەدا

٢٠٠٤/١/١٨ دەست پێکردنی خۆپێشاندان و دەربرینی نارەزایی لەلایەن ئیسلامەکانی دانیشتووی فەرەنساو چەندین وولاتی دیکەی وەك - بەریتانیا و تورکیا و لوبنان و عومان



و سوودان و کوێت و سووریا و بەحرێن و چەندین وولاتی دیکەی ئەورووپی ، کە دانیشتووانی موسلمانی تێدایە ... ئەم خۆ پێشاندانەی فەرەنساش زیاتر لە ١٥٠٠٠ هەزار موسلمان دەبوو دژی بریاری قەدەخەکردنی سەرپۆشی لەم وولاتە و جێ بەجێکردنی یاساکان و رێنمایەکانی علمانیەت .

ئەم خۆ پێشاندانانەش بەسەرپەرشتی و ئامۆژگاری ئیسلامە توندرەوەکان و گروپ و پارتە ئیسلامیەکان بوو ... لەو کاتەشدا شێخی زانکۆی ئەزهەر پشتگیری لە یاسای فەرەنسای کرد ، کە جیاوازی لە نێوان پۆشتن ناکات کە ئەرکێکی ئاینیە لەگەڵ درووشمە ئاینیەکانی دیکەی جیهان .

ئەمەش لەدوای ئەوە هات کە سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك پشتگیری خۆی بۆ بریاری قەدەخەکردنی پۆشین دەربری ، کە لە قوتابخانە و زانکۆ و

پەیمانگاکان قەدەخەکرا . ئەم بریارەش نەك دژی پۆشینی ئیسلامەکان بوو بەڵکوو دژی هەر جۆرە پۆشینێك بوو لەم وولاتەدا ، کە دژ بە یاساکانی علمانیەت و رژێمی دیموکراتی بێ لە فەرەنسا .

کە فەرەنسا وولاتێکە لە وولاتە فرە بیروبۆچوون و فرە نەتەوەو فرە ئایین و رژێمی بەیەکەوە ژیانی دیموکراتیانەی تیا مسۆگەرکراوە لە هەموو بوارەکان ، کە لە ٧٠٪ ی دانیشتووانی فەرەنسا پشتگیریان لە بریاری سەرۆکی فەرەنسا کردبوو ... لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی بنەرەتی ئاین و دەووڵەت لەم وولاتە لێك جیایە و سەربەخۆیی بیروورا لە فەرەنسا و وولاتانی دیکەی ئەورووپای علمانی بەرقرارە لە هەموو بوارەکاندا .

٢٠٠٤/١/٢٨ کۆچی دوای خانمە رۆشنبیری ئەمەریکی سوزان یوننناك لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا ، کە ئافرەتێکی بەهرەدار بوو لە نووسینە جۆراو جۆرەکانیو لە بوارەکانی نووسینیو ژیان .



٢٠٠٤/٢/١ دوو تیرۆرست لە رۆژی جەژن توانیان لە مەڵبەندی -٣- ی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو لقی -٢- ی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانی لکێنراو بە ئێراق خۆیان بخزێننە ناو هەردوو بارەگاو خۆیان بتەقێنەوە ، کە لە ئەنجام بووە هۆی شەهید بوونی -١٠٧- بەرپرسو کادیرو ئەندامانو هاووڵاتی هەردوو پارتو زامداربوونی -١٥٠- هاووڵاتی ، کە بە گەورەترین کرداری نامرۆڤانەو کارەساتی هەردوو پارتو گەل دادەنرێت لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٤/٢/١ نووســەرو شـاعیر و رەخنــەگری کــورد شـــەهید – مەهــدی خۆشــناو- بــە کارەســاتێکی دڵ تــەزێن لــە هــۆڵی بارەگـای لقـی/٢ ی پـارتی دیمـوکراتی کوردســـتان بـــەکارێکی چـــەپەڵی تیرۆرســـتی لەگـــەڵ دەســـتەیەك لەسەرکردەو کادیرانی ئەم پارتە و لـە هەمان رۆژ لە بارەگای مەڵبەندی /٣ ی یەکیـەتی نیشتیمانی کۆمـەڵێك سـەرکردەو کـادیرو کەسـانی دیکـە بەهـەمان شێوەە شەهید کران ...

شایانی باسە شەهید مەهدی خۆشناو لە ساڵی ١٩٥٣ لە گەرەکی تەیراوەی شاری هەولێر چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە هەرێمی باشووری کوردستان . ئـەم نووسـەرە لـەماوەی ژیانیـدا بـەردەوام بـووە لەخـەباتی کوردایـەتی و نووسینەکانی ، تا دوای راپەرین کە بۆتە قائمقامی قەزای شەقلاوە و دوایی بووەتە قائمقامی قەزای ناوەندی هەولێر و دوایی بووە بە جێگری پارێزگا . هـەروا لـە ١٩٩٧/٨/١٢ لـە کۆنفرانسـی لقـی هـەولێری یەکیـەتی نووسـەرانی کـورد بـە سـەرۆکی یەکیـەتی نووسـران هەڵبـژێردرا و بەردەوام بـوو تـاکوو ماڵئاوایی لـە نووسـەران و گـەل و نیشتیمانەکەی کـرد لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان .



٢٠٠٤/٢/٤ دوای ســـیٚ رۆژ لـــە کۆبوونـــەوەوگفتووگۆی ٢٧ وولاتـــی ئەنـــدامی ئەنجوومـــەنی ئاسایـــشی نێوودەوڵـەتی لـە شـاری ڤیـــەنا ، ســـەبارەت بـــە ناردنی دۆسیەی چالاکیە ئەتۆمیـەکانی ئێـران بـۆ ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نێوودەوڵـەتی کـە ٢٤ دەووڵــەت بڕیاریانــدا دۆســیەی چــالاکیە ئەتۆمیــەکانی ئێــران رەوانــەی

ئەنجوومەنی ئاسایش بکرێت ، تەنیا وولأتانی فەنزویلاو ، سووریا و ، کوبا ، نەبێت دژی ئەوبڕیارەی ئەنجوومەن وەستان .

کە رۆژ لە دوای رۆژ کێشەی ئەو دۆسیە لە نێوان ئێران و وولاًتان بەرەو ئالۆزو دژوارتر هەنگاو دەنێ و ئاکامی خراپی لێ دەکەوێتەوە لە بوارەکانی ئابووری و رامیاری و بازرگانی و سەربازی ، لە ناوچەو هەرێمەکە و جیهاندا.

٢٠٠٤/٢/٢٠ ڕووسیای یەکگرتوو لە ڕاگەیاندنێکیدا ئاشکرای کرد ، کە مووشەکی بالیستی نوێی دروستکردووە و لە هەمان کات بەرەو پێشخستنێکی گەورەی بۆ ئەنجام دراوە . کە رووبەرووی هەر هێرشێکی بەرگی ببێتەوە



...ئەمەش لە زاری بەرپرسێکی بالاًی سەربازی ڕووسیا هات ، کە ئەو مووشەکە تووانای بێ وێنەی هەیە لەبەرگری کردن .

دوای ئەوەش ژەنەراڵ – یووری بالۆیفسکی – ئەم ڕاگەیاندنەی پشتراستکردەووە لە مانۆرێکی سەربازیدا . سەرەرای ئەوەی کە ڕووسیا و ئەمەریکا لەکاتی شەڕی سارد رێکەووتبوون لە سەر ئەوەی کە چەکی بەرگری و مووشەکی بالیستی دروست نەکەن بەشێووەیەکی بەرفراوان

بەلاًم ئەمەش لەدوای ئەوە هات کە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە ساڵی ٢٠٠٢ لەو رێکەووتنە کشایەوە ... لە هەمان کات سەرۆکی ڕووسیا – ڤلادمێر پۆتین – لە ووتەیەکیدا رایگەیاند ، کە ڕووسیا تووانای بەرهەم هێنانی چەکی ستراتیژی هەیە و تووانای بوارەکانی سەربازی بەرەو بەهێزبوون و پێشکەوتن هەنگاو دەنێ لە وولاًتەکەدا .



٢٠٠٤/٢/٢٩ بەهۆی بەرزبوونەوەی کێشەی نێوان سەرۆکی هایتی – جان برتــــران ئەریـــــستید – و بەرهەڵستکارانی لە وڵاتەکەو کار لێکردنی لە پەیوەندیە نـــــاوخۆیی و نێـــــوو دەوڵەتیەکان ، کە ئەویش بووە هۆی ئەوەی کە سەرۆکی هایتی ئەریستید دەست لەکاربکێشێتەوە ، ئەویش لەدواگفتووگۆی چری لەگەڵ نوێنەرانی ئەمەریکاو فەرەنسا و گابۆن . دوای دەست لەکارکێشانەوەی جان برتران لە ٣/١ ی هەمان ساڵ بەرەو ئەفەریکیای ناوەند لەگەڵ هاوسەرەکەی و چەندین کەسایەتی لەبەرپرسانی حکومەتەکەی کۆچیان کرد و لەلایەن حکوومەتی باشووری ئەفەریکیا پێشووازایان لێکرا .

دوای گەیشتنیان بۆ ئەفەریکیای ناوەند لەلایەن سەرۆکی ئەم وڵاتە – ژەنەراڵ فرنسوا بوزیز – پێشووازی کران ، کە ئەویش لە رێگەی کوودەتای سەربازی دەسەڵاتی گرتبووە دەست . بەلابردنی سەرۆکی هەڵبژێردراوی ئەفەریکیای ناوەند و بە هەمان شێووەی دەسەڵاتەکانی هایتی لەم وڵاتە دووبارە دەبووەوە .

کە ئەمەش وای لە گەلانی ئەم وڵاتانە کردووە ، کە ماوەی ژیانیان لە دڵە راوکێ بەردەوام بێت و بواری ژیان و ژێرخانی ئابووری ئەم وڵاتانە بکەوێتە مەترسی و بڵاوبوونەوەی برسیەتی و هەژاری و گەندەڵی و وێران بوون لەم کێشووەرەدا .




٢٠٠٤/٣/٨ مۆرکردنی یاسای ئیدارەی دەووڵەتی ئێراق لە لایەن ئەنجوومەنی گواستنەوە ، کە دان بە رژێمی پەرلەمانی فیدراڵی دیموکراتی بۆ کوردو دەسەڵاتی فرەلایەنی نا ، لە

پێنـاو بـەرەو پێـشبردن و بـە مـەدەنی کردنــی گـەلانی ئێـراق ، لـە هـەموو بوارەکـانی نەتـەوەیی و رامیـاری و ئـابووری و کـەلتوورو زمـان و مێـژووو شووێنەوارو داب و نەریت و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٤/٣/١٠ تلـسکۆبی گـەردوونی – هابــل – تـــووانی قـــووڵترین ئەســـتێرە وێنـــە بگرێـــت لـــە دورتـــــرین خــــاڵی گەردوون ، کـە ئەویش



چـوار ئەسـتێرە بـوون . کـە زاناکـانی گـەردوون بەچـاوی خـۆیـان دیتیـان لـە رێگەی وێنەی رەوانەکراو لە رێگەی تلسکۆبی هابل بۆ سەر زەوی . ئەم وێنـە گرتنـەش لـەدوای هـەوڵ و مانـدووبوونێکی بـەردەوام بـوو لـە مـاوەی چـوار مانگدا ، ئەویش لە پارچەیەکی بچووکی ئاسمان .

ئەو وێنانەش نزیك بوون لە وێنە مێژوویـیەکان ، کە زانایـانی گـەردووونناس لەوە گەیشتن کە ئەم ئەستێرانە لە ئەنجامی تەقینـەوەی مـەزن دروسـت بوونـە کـە ناوزەنـد بـوون بـە سـەردەمە تاریکـەکان ... ئـەم کـارەش لـە ٢٠٠٣/٩/٢٤ تـاکوو ٢٠٠٤/١/١٦ لە لایەن تلسکۆبی هابل ئەنجامدراوە .

هـەروا ئـەم وێنـە گرتنـەی ئـەو ئەسـتێرانە نزیکـەی یـەك ملیـۆن چـرکەی خایاندووە و یەکەم ئەستێرەیە ، کە لە دوای تەقینەوەی مەزن پێك هـاتووە و بـە ماوەی مێـژووی گـەردوون بـووە ، کـە لەوکاتـە ئەسـتێرە یەکەمـەکان ، کـە تووانیان گەرمی گەردوون بگەرێنەوە بۆ بارێکی سارد و تاریك .

هـەر لـەو کاتـەش بەرێووەبـەری پـەیمانگای زانسـتی بـۆ تـلسکۆب – سـتیفن بیکۆبز – رایگەیاند :– کە ئەمە یەکەم جارە شـتی وا ببیـنین و بـەر لـە ئێـستا نـەبینراوە ... ئـەم وێنـە گرتنـەش نزیکـەی ١٠,٠٠٠ دە هـەزار ئەسـتێرەی لـەخۆ گرتـووە ... ئـەم هەوڵانـەش لـە ئـەنجامی تاقیکردنـەوە و توێژینـەوە زانستیەکانی گەردوون بوون لە پێناو بەرەو پەرەسەندن و پێشکەوتن دەبات لە هەموو بورەکان .



٢٠٠٤/٣/١٢ رژێمی بەعسی لە سووریا بە سیخوورو پۆلیسەكانی كەوتە گیانی گەلی كوردی رۆژئاوای كوردستانی لكێنراو بە سووریا لە شارەكانی حەماو حەسەكە ، بە تایبەتی قامشلی و دەوروبەری كە لەوكاتەی گەلی كورد بەرگری لە بوون و ناسنامەی نەتەوەیی دەكرد ، كە بووە هۆی شەهید بوونی ١٤ هاولاتی كوردو زامداربوونی بەدەیان هاوولاتی و بەندكردنی بەسەدان هاوولاتی و ئاوارە بوونی سەدان خێزانی كورد بەرەو ناوچەكانی پارێزگای دهۆك لە هەرێمی باشووری كوردستان .



٢٠٠٤/٣/١٥ دوای دوو كاتژمێر لە دەست پێكردنی هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی لە ئەسپانیا ئەنجامی سەركەوتنی پارتی سۆشیالیستی ئەسپانیا راگەیاندرا بەسەركردایەتی – خۆسیە بلانكۆ – ئەمینداری گشتی پارتەكە و گەرانەوەی پارتی سۆشیالیست بۆ وەرگرتنەوەی دەسەلات لەدوای هەشت سالٚ لە دەسەلاتی پارتی گەل كە راسترەوی ناوەندی لە خۆ دەگرت .

جێگەی ئامـاژە پێكردنە ، كە پارتی سۆشیالیست رێژەی ٤٢٪ ی دەنگەكانی بەدەست هێنا بەرامبەر ٣٨٪ . بۆ پارتی گەل بەسەركردایەتی خۆسییە ماریا ... ئەم هەڵبژاردنەش لە دوای رووداوەكەی ٣/١٣ هات كە بووە هۆی كوژرانی زیاتر لە ٢٠١ كەس و زامداربوونی زیاتر لە ١٥٠٠ كەس ... كە سەرۆكی حكوومەت خۆسییە ماریا رێكخراوی ئیتای تاوانبار .

هەروا ئەم رێكخراوە بەردەوام لە تێكۆشانە لە پێناو بەدەست هێنانی ماف سەربەخۆیی لە هەرێمی باسك ... بەر لەوەش سەرۆكی حكوومەتی ئەسپانیا خۆسییە ماریا بە سێ لایەن لێدانی ئێراقیان بریاردا لەگەڵ سەرەك وەزیرانی

بەریتانیا تۆنی بلێر و سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش .

دوای سەرکەوتنی پارتی سۆشیالیستی سەرۆکی پارتەکە خۆسییە بلانکۆ بریاری کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەسپانی دا لە ئێراق . کە زیاتر لە ١٣٠٠ سەربازی ئەسپانی بەشداری لێدانی ئێراقیان کردبوو ... لەهەمان کات سەرۆکی پارتی سەرکەوتوو لە راگەیاندنێکیدا گووتی :-

لێدانی ئێراق و کووشتنی گەلی ئێراق ، تاوانە و نابێ قبوول بکرێت ، بەر لەوەش سەرۆکی ئەمەریکا و سەرەك وەزیرانی بەریتانیا پیرۆزباییان لە خۆسییە بلانکۆ کرد بە بۆنەی سەرکەوتنی پارتەکەی و داوای هەموو هاوکاریەکیان لەگەڵدا کرد ، دژی کردەوە و کارە تیرۆرستیەکان لە وولاتەکە و لە جیهان .

٢٠٠٤/٣/٢٢ سەرکەوتنی پارتی ئارینای راستڕە و لە سلفادۆر بەسەرکردایەتی -- تۆنی سەقا --جێگەی ئاماژە پێکردنە کە پارتی ئارینا ماوەی چواردە ساڵە دەسەڵاتداریەتی سلڤادۆر دەکات ... بەلام شەفیق حەنزەل پالێووراوی چەپرەوەکان لە ٢٠٪ ی دەنگەکانی بە دەست هێنا ... شەفیق تەمەن ٧٣ ساڵ و سەرکردەی میلیشای پێشووی کۆمۆنیستەکان بووە ... هەردوو سەرکردەی – تۆنی سەقاو شەفیق حەنزەل – لە رەچەڵەك خەڵکی فەلەستینن ... لە دوای راگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە لەلایەن هێزی چەپرەو رەتکرایەوە



دوای ئەوەش تۆنی سەقا فانیلەیەکی سێ رەنگی – سوور– سپی– شین – ی لەبەر کردوو خۆی بەسەرۆکی سلڤادۆر راگەیاند و پیرۆزبایی لەسەرۆکی ئەمەریکای ناوەند کرد ... لەگەڵ ئەوەشدا ئێشوو ئازارەکانی شەڕی ناوخۆی سلڤادۆر لە هەستی دەنگدەران رەنگی دەدایەوە و سەرەرای ئەوەش پارتی راستڕەو سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٤/٣/٢٧ تـەواو بـوونی کـاری بەرهـەم هێنـانی نموونـەی یەکـەم فرۆکـــەی ســـەردەمی و ســەرکەوت ، کــە خێرایــی حــەوت جـار زیـاتر بـوو لـە خێرایــی دەنــگ و لــە لایـەن



کۆمپانیایەکی دروستکەری فرۆکە لـە ئەمـەریکا بەرهـەم هێنرابوو . لـە پێنـاو خزمەتکردنی ئامانجەکانیان .

٢٠٠٤/٤/١ لـە دوای رووخانـدنی دەسـەلاتی سـلۆڤۆدان میلۆسـۆڤێك خـۆی بـە دەسـت دەسەلاتی نوێی یوگسلاڤیا داو رەوانـەی دادگای نێوو دەوڵـەتی لـە شـاری لاهـای پایتـەختی هولـندی کـراو دادگـایی کردنـی بەردەوامـە تـاکوو کۆتـایی نووسینی ئەم کتێبە .

٢٠٠٤/٤/٣ ١- گـــــــــرنگترین رووداوەکانی کەووتنە خووارەوەی فرۆکـە لـە جیهانـــــدا ... کـــــە رووداوەکـــــــانی کەووتنــــەخووارەوەی فرۆکــــــە بـــــاڵ



هەڵگرەوەکان ... واتە نەفەر هەڵگرەکان بەرەو زیادبوون دەچێ بەهۆی پەککەوتنی ئامێر ، یاخوود تەزووی کارەبا ، یـاخوود هـەر هۆکـارێکی دیکەی کە تووشی فرۆکەکان دەبنەوەو بۆتە هـۆی گیـان لەدەسـتدانی بەهـەزارا هـاولاتی نـاو فرۆکـەکان لەئـەنجامی کەووتنـە خووارەوەیـان و تێك شکانیان لە سـەر خـاکی وولاتـە جیاجیاکـان لـە جیهـان ، کە ئـەم رووداوانەی خوارەوە دیاریدەکەین :-

٢- لـە ١٩٩٦/١/٨ کەووتنـە خووارەوەی فرۆکـەی بـاڵ هـەڵگر لـە جـۆری — ئـەنتۆنۆف /٣٢ لـە بـازارێکی جـەنجاڵ لەنـاوەراسـتی شـاری کنشاسـای پایتـەختی کۆنگۆی دیموکراتی — زائری پێشوو — کە بووە هـۆی گیـان

لەدەستدانی ۳٥۰ هاووڵاتی ناو فرۆکەکەو کەسانی سەر شەقامەکان لە شارەکەدا .

۳- لە ۱۹۹٦/۲/٦ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی بۆینگ ، کە سەر بە کۆمپانیای فرۆکەوانی دۆمینیکان بووە لە کەنارەکانی کۆماری دۆمینیکان ، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی ۱۹۸ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە لە ئاکامی تێك شکانی لەسەر زەویدا .

٤- لە ۱۹۹٦/۲/۲۹ لە ئاکامی خۆ لە شاخ دانی فرۆکەی بۆینگ ، کە سەر بەکۆمپانیای فرۆکەوانی پیرۆ بوو لەکاتی خۆ ئامادەکردنی بۆ نیشتنەوەی لە فرۆکەخانەی – ئەریکوبیا – کە کەووتۆتە دووری ۱۰۰۰ کیلۆمەتر لە باشووری شاری لیمای پایتەخت و بووە هۆی گیان لەدەستدانی ۲۳ کەس لە ناوچەکەدا .

٥- ۱۹۹٦/٥/۱۱ لەئاکامی کەووتنە خووارەوەی فرۆکە لەجۆری – دی سی /۰ – ی سەر بە کۆمپانیای فالۆگت لە نزیك فرۆکەخانەی مەیامی لە ئەمەریکا ، کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی ۱۲۰ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٦- لە ۱۹۹٦/٥/۱۷ لە ئەنجامی تەقینەوەی فرۆکەی سەر بە کۆمپانیای – تی دبلیوو ئەیە – ی ئەمەریکی لە سەر زەریای ئەتلەسی لەکاتی فرینی لە فرۆکەخانەی کینیدی لە شاری نیورۆکی ئەمەریکی کە بەرەو شاری پاریس دەرۆیشت و بووە هۆی گیان لەدەستدانی ۲۳۰ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

۷- لە ۱۹۹٦/۸/۲۹ لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی فرۆکە لە جۆری – توبولفی /۱٥٤ ، کە لە لایەن کۆمپانیای ئاسنی ڕووسی بەکری گیرابوو ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ۱٤۱ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە ئەویش لەرێگەی گەرانەوەی بۆ دوورگەی – سبیتزابرگن – لە وولاتەکەدا .

۸- لە ۱۹۹٦/۱۱/۷ لە ئەنجامی کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی بۆینگی نیجیری ، کە لەوکاتەی لە بورت هارکوت دەگەراوە بۆ لاگۆس کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ۱٥۱ هاولاتی ناو فرۆکەکە .

٩- له ١٩٩٦/١١/١٢ به هۆی لێکدانی هەردوو فڕۆکەی جامبۆی سعوودی لەگەڵ فڕۆکەی کازاخستانی لە ئاسمانی هندستان ، کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی ٣٤٩ هاووڵاتی ناو فڕۆکەکان کە ئەمە بەکارەساترین کەوتنە خووارەوەی فڕۆکە دادەنرێت لە جیهان .

١٠- له ١٩٩٦/١١/٢٣ کەووتنە خووارەوەی فڕۆکەی بۆینگی ئەسیوبی کە تیرۆر کرابوو لە ئاوی نزیک کەناری دورگەی قەمەر وبووە هۆی گیان لە دەستدانی ١٢٥ هاووڵاتی و رزگاربوونی ٥٠ هاووڵاتی لە مردن لە ناو فڕۆکەکەدا .

١١- له ١٩٩٧/٨/٦ کەووتنە خووارەوەی فڕۆکەی سەر بە هێڵی ئاسمانی کۆریا لە ناوچە شاخاویەکانی نزیک فڕۆکەخانەی – گرام – و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەستدانی ١٢٨ هاووڵاتی و رزگاربوونی ٢٦ هاووڵاتی لە مردن لە ناو فڕۆکەکەدا .

١٢- لە ١٩٩٧/٩/٢٦ کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەی ئەندۆنوسی لەجۆری – ئەبریاس – لە ناوچە شاخاویەکان لە باکووری هەرێمی سوومەترە کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ٢٣٥ هاووڵاتی ناو فڕۆکەکە لە ناوچەکەدا.

١٣- له ١٩٩٧/١٢/١٩ کەووتنە خووارەوەی فڕۆکەی سەنگافورە لە جۆری بۆینگ لە نزیک شاری – بالیمبانگ – ی ئەندۆنسی کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەستدانی ١٤٠ هاووڵاتی ناو فڕۆکەکە .

١٤- لە ١٩٩٨/١/٨ کەووتنە خووارەوەی فڕۆکەی کۆمپانیای – سیبۆ ئەبراس – لە ناوچەی شاخاوی لە رۆژهەڵاتی فڕۆکەخانەی کاجیان دورو لە فلپین ، کە بووە هۆی گیان لەدەستدانی ١٠٤ هاووڵاتی ناو فڕۆکەکە .

١٥- له ١٩٩٨/٢/١٦ کەووتنە خووارەوەی فڕۆکەی جۆری ئەبریاسی چینی مللی ، ئەویش لە رێگەی گەڕانەوەی بۆ دوورگەی بالی ئەندۆنوسی لە فڕۆکەخانەی – تایبەتی نێوو دەووڵەتی – لە تایوان و بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٩٥ هاووڵاتی و کوشتنی نۆ کەسی دیکە کە لە سەر زەوی بوون و لە ناوباندا پارێزگاری بانکی تایوانی ناوەندی

تیابوو .

١٦- لە ١٩٩٨/٩/٢ لە ئەنجامی ناچار بوونی فرۆکەی سویسری لە نزیک کەناری نوڤاسکونیا بەهاتنەخووارەوەی و تێك شکانی و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢٢٩ هاوولاتی ناو فرۆکەکە ... کە لەوکاتەی فرۆکەکە لە شاری نیورۆکی ئەمەریکی بەرەو شاری ژنێف دەگەرایەوە.

١٧- لە ١٩٩٨/١٢/١١ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی تایلەندی لەکاتی نزیک بوونەوەی لە فرۆکەخانەی – سورات تانی – لە باکووری تایلاند لە کۆتایی گەشتەکەی لە بانکۆکەوە دەگەرایەوە و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٠١ هاوولاتی و رزگاربوونی ٤٥ هاوولاتی لە مردن لە ناو فرۆکەکەدا .

١٨- لە ١٩٩٩/٢/٢٤ لە ئەنجامی تەقینەوەی فرۆکەیەکی چینی مللی لە ناوەراستی وولاتەکە لە ئەنجامدا بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٦١ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

١٩- لە ١٩٩٩/١٠/٣١ لە ئاکامی کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی جۆری بۆینگ ، کە سەر بە فرۆکەخانەی میسری بوو لە نزیک کەناری – ماساتشوستس – ی ئەمەریکی لەدوای یەك کاتژمێر لە فرینەکەیدا کەلە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢١٧ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢٠- لە ٢٠٠٠/١/٣٠ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی ئەبراسی کینی لە ناو ئاودا لە دوای هەڵسان لە ماوەیەکی کەمدا لە – ئەبیدجان – لە کەنارەکانی ساحل عاج ، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی گیان لەدەست دانی ٢٧٩ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢١- لە ٢٠٠٠/٤/١٩ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی فلیپینی لە جۆری بۆینگ لە نزیک شاری داڤاو لە باشووری وولاتەکە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٣١ هاوولاتی ناو فرۆکەکە.

٢٢- لە ٢٠٠٠/٥/٢٥ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی فەرەنسی لە جۆری کۆنکۆرد ، کە کۆمپانیایەکی گەشت و گوزاری ئەڵمانی بە کرێی

گرتبوو ، ئەویش لەکاتی فرینی بەرەو ئاسمان لە فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆڵ ، کە بەرەو شاری نیورۆکی ئەمەریکی دەرۆیشتن ، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٠٩ هاوولاتی ، کە هەمووی گروپی تایبەتی فرۆکەکە بوون و هەروا لەسەر زەویش ٩ کەسی دیکەی کوشت لەکاتی کەووتنی بەسەر زەویدا .

٢٣- لە ٢٠٠٠/٨/٢٣ کەو تنە خو ارەوەی فرۆکەیەکی کۆمپانیای فرۆکەوانی کەنداو لە فرۆکەخانەی بەحرێن ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٤٣ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢٤- لە ٢٠٠٠/١٠/٣٠ کەوتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی سەنگافورە ، کە لەوکاتەی لە فرۆکەخانەی – تایبیە – ی تایوانی دەگەرایەوە بەرەو شاری لۆس ئەنجلۆسی ئەمەریکی ، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٧٩ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢٥- لە٢٠٠١/٧/٣ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی ڕووسی لە جۆری – توویۆلف – لە کاتی گەرانەوەی بەرەو فرۆکەخانەی فلادیفستۆك لە ڕووسیاو لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٤٣ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢٦- لە ٢٠٠١/١٠/٤ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی توویۆلفی ڕووسی لە سەر دەریای رەش ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٧٨ هاوولاتی ناو فرۆکەکە , کەلەو کاتەی لە شاری تەل ئەبیبی ئیسرائیلی دەگەرایەوە بەرو سیبیریای ڕووسی .

٢٧- لە ٢٠٠١/١٠/٨ کەوتنە خوارەوەی فرۆکەیەکی سەر بە هێڵی ئاسمانی ئەسکەندەنافیە لە دوای خۆدانی بە فرۆکەیەکی بچووك بە هۆی باری کەش و هەوا لە فرۆکەخانەی میلانی ئیتالیا ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١١٨ هاوولاتی ناو فرۆکەکە.

٢٨- لە ٢٠٠١/١١/١٨ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی سەر بە ئەمەریکان – ئیرلاینز – لە سەر یەکێك لە گەرەکەکانی لاینز لە شاری نیورۆك ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢٦٠ هاوولاتی ناو فرۆکەکە ، کە لەوکاتە لە ئەمەریکا بەرەو کۆماری دۆمە نیکان دەگەرایەوە

وولاتەکە.

٢٩- لە ٢٠٠٢/١/٢٩ کەووتنە خووارەوەی فرۆکە لەجۆری بۆینگ /٧٢٧ لە سەر چیای کۆلۆمبیا ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٩٢ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣٠- لە ٢٠٠٢/٢/١٢ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ئێران لەجۆری تۆبۆلفی ڕووسی لە ناوچە شاخاویەکانی رۆژئاوای ئێران کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لەدەست دانی ١١٧ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣١- لە ٢٠٠٢/٤/١٥ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی سەر بەهێڵی ئاسمانی چینی مللی لە کاتی گەرانەوەی لە کۆریای باشوور بۆ بۆسان ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٦٠ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣٢- لە ٢٠٠٢/٥/٤ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی نیجیری لە شاری کانۆی نیجیری ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٤٨ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣٣- ٢٠٠٢/٥/٧ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی میسری ، کە سەر بە کۆمپانیای فرۆکەوانی میسری بوو لە توونس ، لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٥٥ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە ... لە هەمان رۆژدا فرۆکەیەکی چینی مللی کەووتە خووارەوە لە سەر دەریا لە رۆژهەڵاتی چین و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١١٢ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣٤- لە ٢٠٠٢/٥/٢٥ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی سەر بەهێڵی ئاسمانی تایوان لەدوای کەووتنی لە نزیك کەنارەکانی تایوان و لەجۆری بۆینگ /٧٤٧ و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢٢٥ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٣٥- لە ٢٠٠٢/٧/١ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەی ڕووسی لەجۆری توو بۆلف ، کە منداڵانی هەڵگرتبوو بۆ گەشتی گەشت و گوزار بەرەو ئەسپانیا ، هەروا بە فرۆکەی بۆینگ/٧٤٧ لە سەر ئاسمانی ئەڵمانیا ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٧١ هاووڵاتی کە

زۆربەیان منداڵ بوون .

٣٦- لە ٢٠٠٢/٧/٢٧ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی سەربازی لەکاتی مەشق کردنی لە سەر ئاسمانی شاری لفیف لە ئۆکرانیا و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٨٣ هاووڵاتی لە گۆڕەپانەکەدا .

٣٧- لە ٢٠٠٢/١٢/٢٣ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی ئێرانی لە ناوچەی ناوەراستی ئێران ، کە ئەم فرۆکەیە شارەزایانی فرۆکەی هەڵگرتبوو لە ئاکامدا بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٤٦ شارەزا لە فرۆکەو فرۆکەوانەکانیدا .

٣٨- لە ٢٠٠٣/١/٨کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی تورکی لە ناوچەی پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەستدانی ٧٦ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە ... لە هەمان رۆژدا کەووتنی فرۆکەیەکی بچووك لە دوای فرینی بەرەو ئاسمان لە فرۆکەخانەی – شاروت – لە ویلایەتی نورت کارۆلینای ئەمەریکی کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەستدانی ٢١ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە

٣٩- لە ٢٠٠٣/٢/١٩ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی سەربازی و لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢٧٦ سەربازی ناو فرۆکەکە .

٤٠- لە ٢٠٠٣/٣/٦ کەووتنە خووارەوەی فرۆکە لە جۆری بۆینگ /٧٣٧ ی سەر بەهێڵی ئاسمانی جەزائری ، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی گیان لە دەستدانی ١٠٢ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٤١- لە ٢٠٠٣/٥/٢٦ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی ئۆکرانی کە نووێنەری شاندی ئاشتی پارێزی ئەسپانی هەڵگرتبوو بەرەو ئەفگانستان دەگەرانەوە و لە ئەنجامدا بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٧٤ کەس لە شاندەکەو هاووڵاتیانی دیکەدا .

٤٢- لە ٢٠٠٣/٧/٨ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی سوودانی لە دوای هەڵسانی بە ماوەیەکی کەم لە فرۆکەخانەی سوودانی ، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی گیان لەدەست دانی ١١٥ هاووڵاتی ناو فرۆکەکە .

٤٣- لە ٢٠٠٣/١٢/٢٥ کەووتنە خووارەوەی فرۆکە لەجۆری بۆینگ/٧٢٧ لەوکاتەی کە لە کەنارەکانی کۆماری بەنین بەرەو کرماری لوبنان

دەگەرایەوە ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٣٥ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٤٤- لە ٢٠٠٤/١/٣ کەووتنە خووارەوەی فرۆکەیەکی میسری ، کە گەشتیارانی فەرەنسی هەڵگرتبوو ، کە لە شاری شەرمشێخی میسری بەرەو قاهیرەی پایتەخت دەگەرایەوە ، کە لەئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٤٨ هاوولاتی ناو فرۆکەکە.

٤٥- جێگەی باسکردنە کە لە ٤٥ رووداوی کەووتنە خووارەوەی فرۆکە ٥,٩٥٥ هاوولاتی لە هەموو رەگەزو نەتەوەیەکدا گیانی لە دەست داوە ... کە ئەمەش لە ئەنجامی گووێنەدانە بەراست و دروستی فرۆکەکە بەر لە هەڵسانی و ئەنجام نەدانی پشکنینێکی وورد و چاو دێریەکی تەوواو ... لە بەر ئەوەی فرۆکە ئامرازێکی گرنگی سەردەمیانەی گوواستنەوەیە لە نێوان وولاتانی جیهان

٤٦- ئەمەو جگە لە رووداوە تیرۆریستیەکان کە بە فرۆکە ئەنجام دەدرێت لە هەموو بوارەکان ... ئەمەو چەند رووداوێکی دڵتەزێن کە لە مێژوونامەکە تۆمارکراووەو جگە لە مێژووی دیکەی رووداوی کەووتنە خووارەوەی فرۆکە بەر لەو مێژووەو دوای ئەو مێژووەش بە هەمان شێووە تۆمارکراون .

٢٠٠٤/٤/٣ بە پێی راپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سوودان و لە ناوچەی دارفۆر و دەووروبەری هێزە چەکدارەکانی سەر بەحکوومەتی سوودان ، بە تایبەتی چەکدارەکانی جەنجەوید ، کە بە ناشیرینترین شێووەو کرداری هەمەلایەنە ئازاری هاوولاتیانی ناوچەکەیان دەدا ، کە بووە هۆی دەربەدەر بوونی زیاتر لە ملیۆنێك هاوولاتی لە هەرێمەکەدا لە سوودان .

٢٠٠٤/٤/٧ هەردوو سەرکردەی قووبرسیە یۆنانیەکان – تاسۆس بابادویۆلوس و قووبرسی تورکی – رەئوف دنکتاش – هۆشداریان دا دەنگداران لە سەر راپرسی



یەکگرتنەووەی هەردوو کەرتی قووبرسی یۆنانی و قووبرسی تورکی لە سەر ئەو پلانەی کە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاراستەی هەردوو حکوومەتی دژ بە یەکتری کردبوو لەهەفتەی رابردوودا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هێزەکانی سووپای تورکیا کەرتی قووبرسی تورکی ، کە زۆربەی زۆریان تورکن داگیری کردوو حکوومەتێکی تورکی لە ساڵی ١٩٧٤ لێدامەزراند و هیچ ووڵاتێك لە ووڵاتەکانی جیهان دانی بەو حکوومەتە نەناو تەنیا تورکیا نەبێت تاکوئێستا .

ئەمەش لە دوای شەڕێکی دژوار لە نێوان دانیشتووانە تورکەکان و قووبرسیە یۆنانیەکاندا هات ... ئەم راپرسیەش گەرچی ئەنجامی سەرکەوتن نەبوو لە هەر لایەنێك لەو دوو لایەنە ، کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشی یۆنان دەچێتە ناو یەکیەتی ئەوروپا و کاردانەوەی خراپی لە سەر باری بەشی تورکی و تورکیا دەبێت

سەرەرای ئەوەش سەرۆکی قووبرسی یۆنانی دژی ئەو پلانەی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو بەهاوشانی تورکەکان ... لە بەر ئەوەی یەکگرتنەوەی ئەو دوو بەشە لێك دابراوە بە هێزی سەربازی تورکیا دەبێتە هۆی ل ەناوچوونی دەسەڵاتی تورکی لە بەشی قووبرسی تورکی لە ناو زۆرینەی قووبرسی یۆنانی لەناوچەکەدا .

٢٠٠٤/٤/٢٥ ئەنجامدانی پرۆسەی ریفرۆندام لە رێگەی سندوقی دەنگەکان بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی قووبرس ، بە گوێرەی داتای رۆژنامەی رەسمی ژمارە/ ٢٧٧ ی بەشداری هەڵبژاردن کە لە هەمان رۆژ راگەیاندرا نزیکەی ٩١٪٦٤ لای تورکی دوورگە ، کە دەنگیان بۆیەکگرتنەوەو نزیکەی ٩٣ ٧٥, ٪ ی یوانیەکانی دوورگەکە دەنگیان بۆ ئەو جودایەی هەردووقووبرسدا لە هەرێمە .

٢٠٠٤/٥/٥ حکوومەتی نەمسا گۆرەپانێکی گەوورەو جوانی لە سەر شێوازی نوێی سەردەمی لە سەر بنەماکانی ئەندازەیی بە ناوی سەرکردەی بەناوبانگی جوولەکە – تیوودۆر هرتزل – کردەوە لە شاری ڤێنای پایتەختی نەمسا ... کە ئەمەش بووە هۆی دەربرینی نارەزایی لەلایەن ووڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی و بە تایبەتی کۆماری عەرەبی لە جیهاندا .

سەرچاوە:- www.arabic.com

٢٠٠٤/٥/٦ فرۆشتنی تابلۆیەکی وێنەکێشی بەناوبانگی جیهانی - بابلۆ بیکاسۆ - بە ١٠٤ ملیۆن دۆلار ، کە مێژووی وێنەکێشانەکەی بۆ ساڵی ١٩٠٥ دەگەڕێتەوە ... کە ئەمەش یەکەم تابلۆیە کە بەم نرخە بەرزە بفرۆشرێت لەجیهان ... ئەم وێنەیەش کە لە لایەن بیکاسۆ وێنەی کێشرابوو کە تەمەنی بیکاسۆ ٢٤ ساڵ بووە ... کە وێنەی منداڵێکی باریسیا بوو کە بزمارێکی لەدەستی چەپ و دەسکە گوڵێکی لە سەر سەرابوو .



جێگەی باسکردنە کە نرخی لە تابلۆی دکتۆر - جاشیە - زیارتر بوو کە بە ٨٢,٥ ملیۆن لە ساڵی ١٩٩٠ فرۆشا ... تابلۆکانی بیکاسۆ جێگەی گرنگی پێدانە لە لایەن کەسایەتی و ناودارو وێنەکێشانی رابردوو و ئێستای جیهان و رۆژ لە دوای رۆژ بەهای ئەو تابلۆیانە بەرەو بەرزی هەنگاو دەنێن ، لە بەر ئەوەی تابلۆکانی بیکاسۆ لە مەزادە ئاشکراکان جێگەی خۆی کردۆتەوە لەم بوارەدا و زیاتر لە تابلۆی وێنەکێشانی دیکەی جیهان .

٢٠٠٤/٥/١٩ سەرۆکی هندستان - زەین عابدین عەبدولکەریم - مانموهان سینگ - ی راسپارد بە پێک هێنانی حکوومەتی نوێی هندستان لە دوای هەڵبژاردنەکان ، کە پارتی کۆنگرەی هندستان بەسەرکردایەتی - سۆنیاگاندی - سەرکەوتنی بەدەست هێنا ... سەرۆکی حکوومەتی هندستان لە ئایین سیخیەو بۆ یەکەم جارە لە مێژووی هندستان کەسایەتیەکی سیخی سەرۆکایەتی حکوومەتی هندستان بکات لەم کێشووەرەدا .



جێگەی باسكردنە كە نوێنەرانی پەرلەمانی هندستان ئەوانەی سەر بە پارتی كـۆنگرەن وەزیـری دارایـی پێـشوو – سـینگیان – دەسـت نیـشان كـرد بـە سەركردەی حكوومەت لە دوای بەردەوام بوونی سونیا گاندی بەوەرنـەگرتنی پۆسـتی سـەرۆكی حكوومـەتی هندسـتان ، كـە خـۆی لـە هەڵبژاردنـەكان سەركەوتنی بەدەست هێناو سینگی پاڵێوراو بۆ ئەم پۆستە لەجێگـەی خۆی سـەرەرای دەربـڕینی نـارەزایی لەلایـەك پارتەكـەی و نوێنـەری پارتەكـەی لـە پەرلـەمان و بـەم هۆیـەش چـەندین ئەنـدام پەرلـەمان دەسـتیان لـە كـاری ئەندامیەتی پەرلەمان كێشاوە و داوایان لە سۆنیا كرد ، كەخۆی بۆ پۆسـتی سەرۆكایەتی حكوومەتەكەی بگرێتە دەست لە وولاتەكەدا

سۆنیا گانـدی هاوسـەری راگیـف گانـدی بـووەو بـەهۆی تیرۆركردنـی دایكـی راگیـف گانـدی – ئەنـدیرا گانـدی و راگیـف گانـدی – نـەی ویـستووە خـۆی تووشی هەرەشە لێكردن بكات لەلایەن توندرەوە دژایەتیەكانی لە وولاتەكەدا ... هەروا سۆنیا گاندی لە رەچەڵەك ئیتاڵیە ... ئەمەش لـە دوای سـەركەوتنی پـارتی كـۆنگرە و بەزانـدنی پـارتی بـەهاراتیاجاناتای دەسـەڵاتدار لـە هەڵبژاردنەكان لە وولاتەكەدا.

٢٠٠٤/٥/٢١ یەكیـەتی نێـوو دەووڵـەتی تـۆپی پـێ بـە بۆنـەی دامەزرانـدنی ئـەم یەكیەتیـە ئاهـەنگێكی نێـوو دەووڵـەتی بە سەر تێپـەربوونی ١٠٠ بە دامەزرانـدنی یەكیەتیەكـەدا گێرا .



جێگـەی رونكردنەوەیـە كـە لـە ١٩٠٤/٥/٢١ دامەزرانـدین یەكیـەتی نێوودەووڵەتی – فیفا – لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا رایگەیاند ... بارەگـای سـەرەكی لـە شـاری – زیوریخـە – لـە سـاڵی ١٩٣٢ وە ... جێگـەی ئامـاژە پێكردنـە كە وەرزشـی تـۆپی پـێ ، یاخوود یاریـەكانی تـۆپی پـێ لـە سـاڵی ١٨٤٨ لـە یاریـەكانی دیكـەی وەرزشـی جیاكرایـەوە لـە زانكـۆی –

کمبریدیـژ – و دوای ئـەو رایەڵـەی تـۆپی پـێ لـە ١٨٦٣/١٠/٢٦ لـە شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا دامـەزرا ... ئـەو وولاتانـەی کـە میوانـداری کۆتایەکانی جامی جیهانیان لە تۆپی پێ ردووە ئەمانەن :–

یەکەمیان :– ئۆرگوای لە ساڵی ١٩٣٠ و ، ئیتالیا – لە ساڵەکانی ١٩٣٤ – ١٩٩٠ , فەرەنسا لـە سـاڵی ١٩٣٨ , بـەرازیل ١٩٥٠ , سویسرا لـە سـاڵی ١٩٥٤ , سووید لە ساڵی ١٩٥٨ , تشیلی لە ساڵی ١٩٦٢ , ئینگلترا لـە سـاڵی ١٩٦٦ , مەکسیك لـە سـاڵی ١٩٠٧٠ , ئـەلمانیای رۆژئاوا لـە سـاڵی ١٩٧٤ , ئەرژەنتین لە ساڵی ١٩٧٨ و ، ئەسپانیا لە ساڵی ١٩٨٢ , مەکسیك لـە سـاڵی ١٩٨٦ و ، ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٩٤ , فەرەنسا لـە سـاڵی ١٩٩٨ و ، کۆریـای باشوور و یابان لە ساڵی ٢٠٠٢ ، ئەلمانیا لە ساڵی ٢٠٠٦ .

هـەروا ئـەو وولاتانـەی کـە سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـا لـە بردنـەوەی جـامی جیهانی ئەویش :–

وولاتی بەرازیل /٥ جار ... ئەلمانیا /٣ جار... ئەرژەنتین / ٢ جار... ئورگوای /٢ جار... ئینگلتەرا /١ جار.

دوای ئەوەش باشووری ئەفەریکیا میووانداری جامی جیهانی ساڵی ٢٠١٠ دەکات . بەرپرسان لە سەرەتای سەدەی بیست هەڵسان بەرێکخستنی یاری تۆپی پێ و لە سەرەوەی هەموویان – رۆبیرگیران – کە فەرەنسی بوو و هـەروا هۆڵەنـدی – هیرشمـان – بـە دامەزرانـدنی کاروبـاری یـاری تـۆپی پـێ بـە ئامادەبوونی /٧ دەووڵەت ئەویش :–

فەرەنسا – بەلژیکا – هۆڵەندا – دانیمارك – ئەسپانیا – سووید – سویسرا . بـەم هۆکـارەش ئـەوروپا تـوانی زاڵبـوونی خـۆی مـسۆگەر بکـات لـەکاتی دامەزراندنیـەوە ، کـە سـەرۆکی ئـەم یەکیەتیـە بۆ مـاوەی حـەوت جار لـە بـری هەشـت جـار پۆسـتی سـەرۆکایەتی فیفـا بکـات ، کـە دووایيـان جۆزێـف بلاتـر بوو ... ئەوانەی کە پۆستی سەرۆکایەتی فیفایان گرتە دەست ئەمانەن :–

جۆلی ریمیە – کە فەرەنسی بوو – کە یەکەم جامی جیهانی بـە نـاوی ئـەوکرا کە لە ساڵی ١٩٢١ ئـەم پۆسـتەی گرتـە دەسـت تـاکو سـاڵی ١٩٥٤ ، کـە ریمیـە رۆڵێکـی بـاڵای هـەبوو لـە بـەرەو پێشبردن و گەشـە پێـدانی ئـەم یاریـە نێـوو دەووڵەتیە .

دوای ئـەو – سیرسـتانكی راوس – كـە بـەریتانی بـوو لـە سـاڵی ١٩٦١ تـاكو ساڵی ١٩٧٤ ئـەو پۆسـتەی گرتبـووە دەسـت ... هـەروا دوای ئـەویش یاریزانێكی بەرازیلی بوو بە ناوی – گواوهافیلانگ – كە لە ساڵی ١٩٧٤تاكو ساڵی ١٩٩٨ ئەم پۆستەی گرتبووە دەست .

هەروا ٦٨ وولات بەشداری لە كۆتایەكانی جامی جیهانی تۆپی پیێ كردووە لە یەكەم یاری تا دوا یاری لە ساڵی ٢٠٠٢ ... لە گەڵ چەندین كاری دیكەی یاری تۆپی پیێ لە جیهاندا .

٢٠٠٤/٦/١ كاتـژمێر ٤,١٥ دقیقـە كابینـەی یەكـەمی حكوومـەتی گواسـتنەوەی ئێـراق راگەیەنردا ، بە دامەزراندنی غازی عجیل یاوەر بە سەرۆك كۆماری ئێراق و ، ئەیاد عەلاوی بە سەرۆك وەزیرانی حكوومەتی ئێراق‌و ، بە دامەزراندنی ٣١ وەزیر ، لەوانە ٦ شەش وەزیر ئافرەت بوون . كە لە مێژووی رژێمە یەك لە دوای یەكـەكانی ئێـراق ، بـەو رێژەیـە ئـافرەت بـە شـداری لـە كابینـەكانی حكوومەتی ئێراق نەكردبوو لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٤/٦/١ هێزەكانی سووپای هاوپەیمانان بە سەكردایەتی ئەمەریكا بە ناوی – هێـزی فرەرەگـەزی – لـە ئێـراق بەرپرسـیاری نەتـەوە یـەكگرتووەكان‌و مانـەوەو رووبـەرووی شـەڕی تیرۆرسـتانی ئیسلامیە توونـدەڕەوەكان بوونـەوەو تـاكو تـەواو بـوونی ئـەو مێژوونامـەو كـارە تیرۆرسـتیەكان بـەردەوام بـووە لـە باشووری ناوەندی ئێراق .

٢٠٠٤/٦/٨ لـە رێـوو رەسمێكـی شـكۆدار پارێزگـاری كـەركوك مـستەفا عەبـدولرەحمان وێـستگەی تەلـەفزیۆنی ئـازادی – كـەناڵی كـەركوك – ی كـردەوەو پەخـشی ئاسایی خۆی بڵاو كردەوە ، كە زمانی حاڵی پارتی كۆمۆنیستی كوردستانە لە پارێزگاكەدا .

٢٠٠٤/٦/٢



لە ئەنجامی پشکنینی گەردوونی ئامێری کامێرای تلیسکۆبی -هابڵ- تووانی زیاتر لە ١٠٠ ئەستێرەی نوێ دیاریبکات . کە ئەم ئەستێرانەی لە دەووری ئەستێرەکانمان دەسوورێنەوە، ئەمەش لە دوای ئەوە هات ، کە کامێرای تلیسکۆبی هابڵ تووانی وێنەی هەزارا ئەستێرەو رۆژ وێنە بگرێت لە دەووری هێڵی ئەستێرەیی – ریگای کا – درب ئەلتەبانە – دەسوورێنەوە ... ئەو ئەستێرانەی کە لە دەووروبەری رێگای کا دەسوورێنەوە زیاترن لە ٢٣٠ رۆژو ئەستێرەیە ... کە ئەم کارەش بەکارێکی گەورەی بێ وێنە دادەنرێت لە بوواری دۆزینەوە لە گەردوندا ...

سەرچاوە :- BBC.ARABIC

٢٠٠٤/٦/٧




دادگای قەزائی لە روندا بریاری بەندکردنی ١٥ ساڵی بە سەر سەرۆکی رواندا دا – باستوور بیزیمنگۆ – دەرکرد ... ئەمەش لە دوای راگەیاندنی بریاری دادگا هات کە سەرۆکی رواندا – بیزیمنگۆ – ی بە تاوانبار زانی ، ئەویش بەنانەوەی ئاژاوە و کاری گێرە شێووێنی مەزهەبی و نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەیی .

بەتایبەتی لەنێوان هەردوو نەتەوەی دژ بە یەکتر – هۆتۆو ، توتسی – لە وولاتەکەدا ... کە سەرۆکی رواندا بیزیمنگۆ ، لە هۆزی هۆتۆ بوو ، سەرەرای ئەوەی کە ئەو کەسایەتیە لەم هۆزەدا بە کەسایەتیەکی ئاشتیخواز و ئاشتەوایی نیشتیمان دادەنرا . لە نێووان هەردوو هۆزی توتسی و هۆتۆ .

هەروا سەرۆکی رواندا بیزیمنگۆ لە ساڵی ٢٠٠٠ دەستی لە پۆستی

سـەرۆکی وولاتەکـە کێـشابووەوە ، ئـەویش بـە هـۆی سـەرهەڵدانی کێـشەی هەمەلایەنەی نێووان ئەم دوو هۆزە لە وولاتەکەدا .

هەروا وەزیری گوواستنەوە و شەش لە وەزیرەکانی دیکـە بـە هـەمان شێووە تاوانبارکرابوون ، بە تایبەتی بە پێك هێنانی چەکداری میلیشیا و هاندانی یاخی بوونی مەدەنی لە وولاتەکەدا .

هەروا داواکاری گشتی داوای کردبوو کـە سـەرۆکی روانـدا بـە بەندکردنەکـەی هەتا هەتایە بێت .

بەڵام بە هۆی پاڵە پەستۆی رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ بەندکردنەکەی کرا بـە ١٥ ساڵ ... سەرۆکی رواندا یـەکێك بوو لـە هۆتۆیـەکان ، کـە چووبووە رێـزی جووڵانـــەوەی شۆرشـــگێری ، کــە ئــەم جووڵانەوەیـــەش تووتـــسیەکانی لـــە هەندەران لە وولاتی ئۆگەندا دایانمەزراندبوو ... ئەم جووڵانەوەیـەش ناسـراو بوو بە – بەرەی نیشتیمانی رواندی – کە دەسـەلاتداریەتی روانـدی لـە سـاڵی ١٩٩٤وە بەدەستەوە گرتبوو لە وولاتەکەدا .

ئەم بەرەیـەش دژی بەکارهێنانی کاری توونـدوتیـژ بـوو ، کـە لەلایـەن هـۆزی هۆتۆیـــەکان دژی تووتیـــسیەکان ئـــەنجام دەدرا ... بـــەڵام دوای دەســـت لـــە کارکێشانەوەی سەرۆکی رواندا بیژیمنگۆ . لە پۆستەکەی بووە دوژمنی ئـەم بەرەیە ... سـەرەرای ئەوەی کە ئەم بەرەیـە توانی ئارامی و ئاسـایش بخاتـە نـاو وولاتەکـەدا و بـاری وولات و دەسـەلات لـە رامیاریـەتی فـرە پـارتی لـەو وولاتە بەربووە دەبردرا .



٢٠٠٤/٦/٧ زانـــای گـــەردوونناس و شـــوێنەوارناس – دکتـــۆر راینرکـۆیهن – لـە زانکـۆی – ئۆبرتـــال – ی ئـــەڵمانیا رایگەیاند کـە دوورگـەی – ئـــەتلانتس – لـــە بەشـــی کـــــەناری باشـــــووری ئەســـــپانیا – تووشـــــی وێرانکردن هات ، لە ئەنجامی لافاوێکی گەوورە لە نێووان ساڵەکانی ٥٠٠ – ٨٠٠ ی بـەر لـە زایـین ... ئەمـەش دوای ئـەوە هـات کـە ووێنـەکانی مـانگی

دەست کرد .

کە ووێنەی ئەو دوورگەیەی گرتبوو و شوێنەواری ئەم شارەی تیادەرکەوتبوو ... گرنگی ئەم ووێنانەش لە باشووری ئەسپانیا روو لە زەوی ووێنەکانی کێشرابوو ... کە ووێنەی شووێنەکە لە گەڵ نووسینەکانی ئەفلاتوون چووت بوونە ، کە ئەفلاتوون لە دایك بووی ئەم شارەبووە .

هەروا – ماریزمادووهینۆخس – ل ەنزیك شاری – کادیز – بەشێووەیەکی لاکێش دەرکەوتووە ، کە چەندین بەشی ئەم شارە ماوە ، کە لەخشت و قوور درووستکرابوون ، هەروا دکتۆر – راینر – دەڵێ :–



ئەفلاتوون ئەو ناوچەیەی لە نووسینەکاندا دیاریکردبوو ... لە سەر دوورگەکەو دەووروبەری . کە باڵەخانەی بازنەیی تیادروستکراوە ... کە هەندێکیان لە قوور بوون و هەندێکیان لە ئاو ، کە ئەمەش لەگەڵ دیاریکراوەکانی ئەفلاتوون جووتن ... هەروا دکتۆر راینر دەڵێ :–

ئەو باڵەخانە لاکێشیانە لەوانەیە پاشماوەی پەرستگای – زیووی – بێت ، کە بۆ خواکانی دەریای – بووسیدوون – یاخوود پەرستگای – زێرینی – کە تەرخان کرابوو بۆ – لیووسیدوون و کیلینۆ – دروستکرابن ... هەروەك لە نووسینەکانی ئەفلاتوون هاتووە ، هەروا دەڵێ :

یەکەم :– ئەفلاتوون قەبارەی ئەتلانتسی کەم کردووە .

دووەم :– یەکەی پێووەری ، کە لەوکات بەکارهێنراوە گەوورەتر بووە . کە ٢٠٪ بووە لە گەڵ پێووەری ئێستا .

هەروا دکتۆر راینر دەڵێ :– ئەگەر خاڵی دووەم راست بێ ، کە یەکێك لە لاکێشەکانی دیار لە دوورگەکە . ئەوە لە گەڵ پێووەرەکە جووتە ، کە ئەفلاتوون دەست نیشانی کردبوو لە نووسینەکانی لە پەرستگای بووسیدوونە لە ساڵی / ١٢ بەر لە زایین روویان داوە .

هەروا دوو پاتی ئەوە دەکاتەوە ، کە ئەو شارە بوونی هەبووە لە سەردەمی

ئاســنین و ســەردەمی برۆنــزی ... هــەروا دکتــۆ راینــز ، داوا لــە شوێنەوارناســان دەکــات بــە پــشکنین و لێکۆڵینــەوە لــە ســەر ئــەو جێگایــە ســەرەرای بــوونی کێــشە و نــەبوونی توانــای دارایــی پێویــست نــەك بــۆ ئەتلەنتس بەڵکوو بۆ دەیا جێگەی دیکەی شوێنەوار ، کە لەئەنجامی شەڕو لافاو ئاسەوارییان نەماوە لە جیهاندا .

٢٠٠٤/٦/٩ بۆ یەکەم جار لە مێژووی باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاّتی تورکیا ، رژێمی تورك ماوەی بە بلاّوکردنەوەی پەخشی تەلەفزیۆنی بە زمانی کوردی بدات ، هەرچەندە ماوەی چەند کاتژمێرێك بوو، لە هەمان کات ئازاد کردنی پەرلەمانتارە کوردە زیندانی کراوەکان یەك لەوان خاتوو لەیلا زانای تێکۆشەر.

٢٠٠٤/٦/٩ کاتژمێر یەکی بەیانی بەکاتی کوردستان بڕیاری ژمارە/١٥٤٦.ی رێکخراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان لــە لایــەن ئەنجوومــەنی ئاسایــشی نێوودەوڵــەتی دەرچــوو ، بــە دیاری کردنــی دەســەلاّتی داهــاتووی ئێــراق ، بــە حکوومــەتی دیمــوکراتی فیــدڕاڵی یــەکگرتوو . بــە پــشت گــوێ خــستنی یاســای ئیــدارەی دەووڵەت و دیارینەکردنی ماف کورد لەم بڕیارەدا بۆ ئێراق .

ئەویش بەخواست و ویستی عەرەبەو لە سەر داوای عەلی سیستانی بوو ، کە پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان و یەکیــەتی نیــشتیمانی کوردســتان لێــی بەرپرسیارن ، لە هەموو لایەنێك لە داهاتووی کورد لە کوردستان و باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق .

٢٠٠٤/٦/١٠ لە دادگایی تایبەتی رژێمی بەعسی لە سووریا ٧٥ هاولاّتی کورد دادگایی کران ، لە ئەنجامی رووداوەکانی ئادار لە شاری قامشلو ، کە لە بەندیخانەی - سید نای - گواسترانەوە بۆ بەندیخانەی سەربازی لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریاو دادگایی کردنیان بە یاسای سەربازی رژێمی بەعس لە سووریا .

٢٠٠٤/٦/٢٨ لە ئاهەنگێکی خنجیلانە دادوەری گشتی مەدەنی ئەمەریکا لە ئێراق پۆل بریمەر بەڵگەنامەکانی دەسەڵاتی هاوپەیمانانی دا بەدەست سەرۆکی



حکوومەتی کاتی ئێراق بە سەرکردایەتی ئەیادی عەلاوی .

٢٠٠٤/٦/٢٩ نێگرۆپۆنتی بە یەکەم باڵوێزی ئەمەریکا لە ئێراق دانرا ، کە لە بنەڕەتا جێگەی پۆل بریمەری گرتەوەو گەورەترین باڵوێزبوو لە جیهان ، کە زیاتر لە ٣٠٠٠ هەزار فەرمانبەری لەخۆ دەگرت ، لە هەموو دامو دەزگاکانی حکوومەتی ئێراقی دوای رووخاندنی رژێمی بەعسی لە ئێراق ، راوێژگاری تایبەتی سەربەخۆی لە هەموو دامو دەزگاکانی حکوومەتی نوێ ئێراق دانابوو، بە سەرپەرشتی کردنی کاروبارە هەمەلایەنەکان .

**تێبینی** :- داوای لێبووردن دەکەین گەر نەمان توانیبێ وێنەکان بە پێی پێویست لە گەڵ رووداوەکان دابنێین ، لە بەر ئەوەی نەمان ویستووە وێنەکان دووبارە ببنەوە چ،،ونکە وێنەکان زۆریان دووبارەن ، یاخوود وێنەمان دەست نەکەوتووە بە پێی پێویست.

٢٠٠٤/٧/١ سەدام حوسەینی سەرەك کۆماری رووخێنراوی ئێراقو تاوانبار بەرامبەر گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی گەلی کوردو نیشتیمانەکەی خرایە بەردەمی



دادگای تایبەتی لە ئێراق ، بە خۆیی و ١١ تاوانبار لە دارو دەستەکەی بۆ پیادەکردنی تاوانەکانیان بەرامبەر گەلانی ئێراق ، کە لە ماوەی ٤٠ ساڵ لە دەسەڵاتیان ئەنجامیان دابوو ، لە هەموو بوارەکان . بە تایبەتی ئەنفال و

كیمیاباران و وێرانكردنـی شارو شارۆچكەو گوندەكانی هەرێمی باشووری كوردستان .



٢٠٠٤/٧/١٠ كۆچـــی دوایـــی ســەرۆكی نەمسا – تۆماس كلیستا – لە شــاری ڤیێننــای پایتــەختی نەمسا لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا ... جێگــەی باســكردنە كــە سـەرۆكی نەمسا كلیستا لە ســـاڵی ١٩٩٢ دەســـەڵاتی نەمسای گرتۆتە دەست و دوو رۆژ بەر لە تەواو بوونی ماوەی دەسەڵاتی بەهۆی نەخۆشـی دڵ كۆچـی دوایـی كـردوو نوێنـەرانی وولاتـانی جیهـان بەشـداریان لـە رێـورەسمی بەخاك سپاردنی سـەرۆكی نەمسا كـرد لـە – كاتدرانیـەی پـیرۆز لـە قـەدیس ستیڤان – ی پایتـەختی نەمسا ... هـەروا سـەرۆكی پێـشووی نەمسا و ئەمینـداری گـشتی نەتـەوە یـەكگرتووەكان – كۆرت ڤالدهایم – بەشداری لە رێورەسمی بەخاك سپاردنی سەرۆكی نەمسا – كلیستا – كرد .

سەرۆكی نەمسا توانی باری وولات بەرەو پێش ببات لە هەموو بوارەكان بە تایبـەتی گرنگـی دان بـە رۆڵـی ئافرەت ، كـە بـەر لـە دەسـەڵاتی ئـەو كـۆرت ڤالـدهایم دەسـەڵاتی نەمـسای گرتبـووە دەســت و دوای لێكۆڵینـەوە ، لـە رابردووی فالدهایم دەركەووت . كە لەگەڵ یەكەیەكی سەربازی ئەلمانی كاری كردووە لە جەنگی دووەمی جیهان و زیانی بە وولاتەكە گەیاندووە لە هەموو بوارە جیاجیاكان .



٢٠٠٤/٧/١٤ لــە دوای ٤١ ســاڵ لــە تیرۆركردنی عەبدولكەریم قاســم یەكــەم ســەرۆك كۆمــاری ئێــراق و لــە گۆڕنــــانی رژێمــــی شانــشینی لــە نــاو باڵەخانــەی وێــستگەی

رادیۆو تەلەفزیۆنی بەغدا لە لایەن ئەحمەد حەسن بەکرو سەدام حوسین ، تەرمەکەی و هەڤاڵەکانی دۆزرانەوە لە لایەن مرۆڤێکی خاوەن ویژدان بە پارستن و ئاگالێبوون لە گۆڕەکەی لە شاری بەغدا.

٢٠٠٤/٧/٢١ وەزیرەکانی دەرەوەی ئیران و سووریاو تورکیاو کوێت و سعوودیەو ئوردن ، لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر کۆبوونەوە بە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسر ، کە – ئەخزەر ئیبراهیمی – نوێنەری ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و – خافیر سولانە – نوێنەری یەکێتی ئەوروپا بەشداریان تێدا کردو بنچینەی کۆبوونەوەکە دژی مافەکانی کوردو دابەشنەکردنی خاکی ئێراق بوو لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٤/٧/٢٢ وەزیری دەرەوەی شانشنی ئوردن بەشداری لە کۆبوونەوەی وەزیرەکانی دەرەوەی وولاتانی دراوسێی ئێراق کرد ، لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر.



٢٠٠٤/٧/٢٨ سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردوگان – سەردانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی کرد ، بە هۆی نەخۆشیە خوداریە بەردەوامیەکانیان بەرامبەر بە کوردو داگیرکردنی کوردستان بە بەردەوام بونیان لە هەڵوێستی هاوبەش و رەفتاری نامرۆڤایەتیان بەرامبەر بەکوردو خاکی کوردستان ، لە لایەن چوار دەوڵەتی دروستکراو لە لایەن بەریتانیاو هاوپەیمانان.

٢٠٠٤/٨/٣ تیرۆرستە ئیسلامیەکانی کۆماری شیشانی ڕووسیای یەکگرتوو توانیا گەمارۆی دوو قوتابخانەی منداڵان بدەن لە ئۆسینای باکوور لە شاری باسلان ، لە ئەنجام بووە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە ٥٠٠ منداڵ و زامدار بوونی زیاتر لە ٧٠٠ منداڵ و کوژرانی چەند کەسێك لە تیرۆرستەکان .

٢٠٠٤/٨/٧ کردنـــــەوەی کارەکـــــانی موونتـــەدای ژمـــارە /٣٥ لـــە شـــــاری – ئبیـــــا – ی پایتـــەختی – ســـاموا – لـــە لایـــەن دوورگـــەکانی زەریـــای هـێمن ، کـە بـە بچووکترین وولات دەناسرێت لەجیهاندا



، کـە ژمـارەی دوورگـەکان ١٤ دوورگـەی بـچووکەو لـەو کۆبوونەوەیـەش ئوستراليا و نیوزیلەندا بەشداریان لەو مووونتەدایە کرد .

ئـەویش لـە پێنـاو هاوکاری و باشـکردنی بـاری ئـابووری و رامیـاری و ئـەو کۆبوونەوەیەش لە پێناو چارەسەرکردنێکی نوێی تووشبووانی نەخۆشی – ئایدز – ە کە ڤایرۆسـی – ئێتش ئای مـن – یـە ... هـەروا لـەو کۆبوونەوەیـەی وولاتانی – ناورو – داوای یارمەتی بە پەلە دەکات ، بە هـۆی بـەرەو هـەرەس هێنانی لە بواری ئابووری و کەووتنی ئەم وولاتە .

هەروا سەرەك وەزیرانی دوورگەی – کۆك – داوای کرد کە دوورگەی نـاوروٚ رووبـەرووی کێـشەیەکی گـەورە بـووە ، بـە هـۆی گەنـدەڵی و بـەکارهێنانی کاروبـاری وولاتەکـە لـە بـوواری ئـابووری بـە شـێووەیەکی نـا دروسـت و دابەزینی نرخی بەشداربوون لە بەرهەم هێنانی فۆسفات ، کە سەرچاوەیەکی ئابووری سەرەکیە لە رووی هەناردە لە وولاتەکەدا .

هەروا باس لە هێزی سەربازی ئوستراليا کرا ، کە لە دوورگەی سۆلۆمۆنە بۆ پاراستنی ئارامی لەو وولاتەدا بەهۆی بوونی کێشەو کاری توونـد و تیژی و هەرەس هێنانی باری ئابووری لە وولاتەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە وولاتانی دوورگەی زەریای هێمن لە بارێکی ناهـەموار ژیـان دەبەنـە سـەر بـەهۆی نەخۆشـی و رمـانی ژێرخـانی ئـابووری وبـوونی کێشەی کۆمەلایەتی و کاری توونـد و تیـژی و لێنەوەشـانەوەی دەسـەلاتداران لەبەرێووەبردنی کاروباری وولاتـەکانیان لـەپێناو پەرەپێـدان و پەرەسـەندن و گەشە پێدان لە دوورگەکەدا .

٢٠٠٤/٨/١٣ کردنەوەی پێشبرکێی یاریەکانی جامی جیهانی– ئۆلۆمپیات – لە ئەسینای

پایتەختی یۆنان بۆ ماوەی ١٦ رۆژ بەردەوام بوو. لە نێوان یانە وەرزشیەکانی وولآتانی بەشدار بوو لە جیهاندا .




٢٠٠٤/٨/١٤ کۆچی دووایی نووسەر و شاعیری بەناوبانگی پۆلەندی و وولآتانی بەلکان – تشیسلاف میلۆش – لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا ... میلۆش لە ساڵی ١٩٨٠ پاداشتی نۆبلی لە ئاداب پێ بەخشرا ، کە لەو کاتەی جووڵانەوەی هاوکاری کرێکارانی پۆلەندا دژی دەسەڵاتی کۆمۆنیستی لە پۆلەندا خۆ پێشاندان و نارەزاییان دەربری .

شاعیری ناوداری پۆلەندا ماوەی ٣٠ ساڵ لە پەناهەندەیی لە فەرەنسا و ئەمەریکا ژیانی بردەسەر لە نێووان ساڵەکانی ١٩٦٠ – ١٩٨٩ ، کە دوای ئەوە گەرایەوە پۆلەندا ... ماوەی ٢٠ ساڵ میلۆش مامۆستای زمان و ئەدەبی سلاڤ بووە لە زانکۆی – بیرکلی – لە کالیفۆرنیا ... میلۆش لە ماڵەکەی خۆی لە شاری – کراکۆ – لە پۆلەندا کۆچی دوایی کردوو ماڵئاوایی لە گەل و نیشتیمان و جیهانی شیعر و ئەدەب و نووسین کرد ... کەجێگەی شانازی و سەربەرزی گەلی پۆلەندا و ناوچەکە بوو لە بەلکان.

٢٠٠٤/٨/١٥ گرێدانی کونگرەی نشتیمانی ئێراقی بە ئامادەبوونی ١٢٠٠ کەسایەتی لە پێکهاتەی گەلآنی ئێراق ، کە نوێنەرایەتی پارێزگاکانی ئێراق و کوردیان دەکرد .

لە ئەنجام ٨١ ئەندام هەڵبژێردران لە گەڵ ١٩ ئەندام لە ئەنجوومەنی کاتی گواستنەوەی ئێراق بۆ تەواوکردنی ١٠٠ ئەندامو فۆئاد مەعسوم بە سەرۆکی پەرلەمان هەڵبژێردرا .



٢٠٠٤/٨/١٥ لـه دوای هەڵبژاردنـەوەی بـۆ جـاری دووەمـی سـەرۆکایەتی فنـزویلا شـافیز سەرکەوتنی بەدەست هێنا ، بەلام بە هۆی کارتێکردنی رامیاریەتی دەرەوەی فـەنزویلا ، بـە تایبـەتی لـە لایـەن ئەمـەرکاو لـە ئـەنجامی کێـشەو ململانێـی تووندو تیـژی نێـوان لایەنگرانی ئەمەریکاو لایـەنگرانی سـەرۆکی فـەنزویلا ، گەیـــشتە قۆنــاخی ئەنجامــدانی راپرســی گــشتی لــە نێــوان شــافێزو بەرهەڵستکارانی ، کـە بـەر لـەوەش بـە ئامـادە بـوونی چاودێران و سـەرۆکی ئەمـەریکای پێـشوو جیمـی کارتـەر، ئەنجامەکـەی بـووە هـۆی سـەرکەوتنی شـافیز لـە دوا راپرسـی بـە هـۆی خزمـەتکردی چینی هـەژاروبێ دەرامـەت لەوولاتەکەدا .

٢٠٠٤/٨/١٦ لـە دوای سـەردانەکەی سـەرۆك کۆمـاری ئێـراق غـازی عجیـل بـۆ تورکیـا لـە کونگەریـەکی رۆژنامەوانی هاوبەش لە گەڵ سەرەك وەزیرانـی تورکیـا رەجەب تەیب ئۆردۆگان ، سەرەك کۆماری کاتـی ئێـراق بـە راشـکاوی بـەرگری لـە مـاف نەتەوەو باردۆخی ئێراقی کرد بە ئاشکرا .

بـەلام وتـە نهێنیـەکانی نێوانیـان هـەر خۆیـان دەزانن لـە دارشـتنی نەخـشەی داهاتووی پەیوەندیەکانی نێوانیان .



٢٠٠٤/٨/٣١ تیرۆستانی ئیسلامی شیشان توانیان زیاتر لە ٢٠٠ مندال لە قوتابخانەکانی باشووری ڕووسیا گەمارۆ بدەن ، کە بووە هۆی نا لە باری شەقامی ڕووسیا ، ئەویش بە داوا کردنی سەربەخۆی بۆ هەرێمی شیشان , لە پێناو دروستکردنی دەووڵەتێکی ئسلامی و لە ٢٠٠٤/٩/٣ کێشەکە چارەسەر کرا . لە ئۆسیتای باکوور لە شاری بسلان لە هەرێمەکەو وولاتەکەدا .

٢٠٠٤/٩/٢ بڕیاری ژمارە/ ١٥٥٩ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاگەیاندرا کە تایبەت بوو بە باری رۆژهەلاتی ناوەڕاستو لە هەمان کات داواکردن لە رژێمی بەعسی لە سووریا بە کشانەوەی هێزەکانی سەربازیو دەزگا سیخووڕییەکانی لە کۆماری لوبنان .

٢٠٠٤/٩/٢ دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی نووێنەری سەرۆکی سلۆفینیا لەلایەن حکوومەتی سوودان ... شایانی باسە کە نووێنەری حکوومەتی سلۆفینیا لە ٢٠٠٤/٨/١٤ دەستگیرکرا و رەوانەی زیندان کرا ، کە بێ ئەوەی مۆڵەتی چوونە ناو سوودانی بەدەستەوە بێت .
ئەمەش بە پێی یاسای نێوو دەووڵەتی کە هەموو وولاتێك لە وولاتانی جیهان قەدەخەیە و بەکاری سیخووری لە قەڵەم دەدرێت جا لە هەر بووارێك لە بوارەکانی بێت لەم وولاتانەی جیهان .

٢٠٠٤/٩/٣ پەرلەمانی لوبنان بە ئامۆژگاری رژێمی بەعسی لە سووریا بڕیاری درێژکردنەوەی ماوەی دەسەلاتی سەرەك کۆماری لوبنانیدا بە گوڕینی چەند بڕگەیەك لە دەستووری لوبنان بە درێژکردنەوەی ماوەی دەسەلاتی سەرۆکی لوبنان ، لە چوار ساڵ بۆ حەوت ساڵ بە دەسەلاتی سەرۆك کۆمار، لە بڕگەی/ ٤٥٧ لە ماددەی/ ٤٩ ی دەستوور، کە ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی کێشەی زیاتر لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٤/٩/٦ ڕوودانــی لافــاو زریــانی بــــا و بـــاران لـــــه دوورگەکانی کاریبی ... لەوکاتـــەدا بەرپرســانی ئەمــەریکا رایانگەیانــد کە لافاوی – ئیڤان – بە خێرایــــــــــی ٢٠٠ کیلۆمــەترە لــە کاتــژمێرێکا ، کــە بــەرەو دوورگــەکانی بابــادۆیس و ســانت فنسینت و سانت لووشا و تریندداد وتۆباگۆ و گۆینـادا و مارتینیك دەروات . لە هەمان کات بەرپرسانی نـاوخۆیی ئـەم دوورگانـە کۆبونـەوەی بـەردەوامیان ئەنجامــدا ، لــە پێنــاو ڕێگــەگرتنی دوورگــەکان لــەو لافــاوە کــە دوورگــەکان دەگەڕێتەوە و دەبێتە هۆی زیانی گیانی و مادی .

کـە لافاوەکـە فرانسیـسی لـە ویلایـەتی فلۆریـدای ئەمـەریکی گرتبـووەوە . سـەرەرای ئـەوەی کـە لافـاوی ئیڤان ٧٠٠ کیلۆمـەتر دووربـووە لـە باشـووری ڕۆژهــەلات لــە دورگــەکانی بربــادۆس ... لــە هــەمان کــات دەســەلاتدارانی وولاتـەکانی دوورگەکـە هۆشـداریان دا بـە دانیـشتووان لـە خۆپاراسـتنیان لـەم لافاوە ، کە زۆربەی دانیشتووانی دوورگەکان لە خانووی لـە دار دروسـتکرا و نیـشتەجێن و خـۆ لەبـەر ڕووخـان و وێرانکردنـی ناگرێـت ... لـە بـەر ئـەوەی لافـاو و زریانەکـەی فرانـسیس بـووە هـۆی ئـەوەی کـە زیـاتر لـە سـێ ملیـۆن ئەمەریکی لە ویلایەتی فلۆریدا جێگـەو شـووێن و مالـەکانیان جـێ بهێلن بـۆ ناوچەی ئارامتر لە ویلایەتەکە دا .

٢٠٠٤/٩/١٦ هـەلگری بـڕوای ئـاینی ئیـسلام لـە چینی مللی بــــــــەرەو لاوازی و دوورکەوتنـــەوە هـــەنگاو دەنــــێ ... جێگــــەی باسکردنە کە هەرێمی – شـــــــــینگیانگ –

ناوچەرگەی هەڵگری بڕوای ئاینی ئیسلامە و زیاتر لە یەك ملیۆن ئیسلام لەو هەرێمەدا نیشتەجێن و رابەرەکەیان – هۆنگ یانگە – لە گەڵ ئەوەشدا نارەزایی هەیە بەرامبەر بە رامیاریەتی رژێمی کۆمۆنیستی لە چینی مللی کە چین دەووڵەتێکی عەلمانیە سەرەرای ئەوەی کە دەستووری چینی مللی ماوەی بە بیروورا ئازادیەکان داوە ، بە تایبەتی ئاینە جیاجیاکان لەوانەش ئاینی ئیسلام .

لەچوار چێوەی دەستوور ، کە سەرکردایەتی پارت و دەووڵەت خوازیارە کە کاروباری ئاینی لەگەڵ کاروباری دەووڵەت بەیەکەوە ببەستێتەوە لە پێناو لانەدان لە هێڵی نەخشەو پلانی ئەو دەووڵەتە ... گەرچی لە چینی مللی ئاین لە دەسەڵات جیاکراوەتەوە بە پێی دەستووری وولاتەکە .

هەروا رابەری ئاینی ئیسلامی – هۆنگ بانگ – راوێژکارە لە رژێمی کۆمۆنیستی ... لەلایەکی دیکە هۆنگ بانگ ئاواتە خوازە کە تەنیا رابەرایەتی ئاینەکە بکات ، بەڵام دەڵێ ئەوە حکوومەتی چینیەو لە هەمان کات دەیەوێ هاوسەنگ و هاوکێشەکانی نێوان ئیسلام حکوومەتی عەلمانی چینی رابگرێ و نوێنەر بێت ، کە بۆ هەردوو لایەنی دەووڵەت سوودمەندە ... لەگەڵ ئەوەشدا لەو هەرێمەدا دادوەری ئافرەت هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان ، کە ئەمەش بۆتە سەرە گوریسێك بۆ نووسەرو رۆژنامە نووسان و بەرپرسانی ئەمەریکا لە پێناو نانەوەی ئاژاوە و دروستکردنی دووبەرەکی لە بوارەکانی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و ئابووری و ماف مرۆڤ ... گەرچی چینی مللی باشترین رژێمە لەجیهان بۆ رێکخستن و باشبوونی پەیوەندی کۆمەڵگای چینی ، کە ژمارەی ١,٥٠٠ ملیار کەسە لە کێشوورەکەدا .

٢٠٠٤/٩/٢٠ بۆ یەکەم جار لە مێژووی کۆماری ئەندۆنیسا بە شێووەیەکی دیموکراتی لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی وولاتەکە – بۆدویۆنۆ – کە ژەنەڕاڵی خانەنشین بوو ، بە سەرەك کۆماری ئەندۆنیسیا هەلبژادرا لە لایەن گەلانی ئەم وولاتەدا .

٢٠٠٤/٩/ ٢٠ وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل سلیڤان شالۆمو سەرەك وەزیرانی ئێراق ئەیاد عەلاوی لە تەك یەك دانیشتن لە کۆبوونەوەی سالانەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەككگرتووەکان .

٢٠٠٤/٩/٢١ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە وتارەکەی بەرامبەر رێکخراوی نەتەوە

یەکگرتووەکان پـرۆژەی – ڕۆژهـەڵاتی گـەورەی– ڕاگەیانـد ، لـە هـەوڵی ئامانجەکانی هەرێمایەتی ئەمەریکا ، بە بڵاو کردنەوەو سەقامگیری ئازادی و دیموکراتی، لە هەمان کات لە بە ناوبردنی تیرۆر ، کە ئێراق و ئەفگانستان نموونەی شاڵاوەکە بووەو هەنگاودەنێ بەرەو وڵاتانی دیکە لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٤/٩/٢٢ تیپی زەیتوونی هێزی سووپای کۆریای باشوور گەیشتە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق ، لە پێناو یارمەتی دانی گەلی کوردستان ، لە هەموو بوارەکانی تایبەتمەند بە یارمەتی دان لەهەرێمی باشووری کورستان .

٢٠٠٤/٩/٢٦ لەم ڕۆژە – ٣٣ – پارت و گروپ و ڕێکخراوی ئێراقی و کوردستانی بە ناوی یەکێتی هێزی کۆمەڵەی دیموکراتی کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا ، لە پێناو چوونە ناو هەڵبژاردنی گشتی لە ئێراق .

٢٠٠٤/٩/٢٨ گرێدانی کۆنگرەی پارتی کرێکارانی بەریتانیا و سەرك وەزیران تۆنی بلێر ، وتاری کردنەوەی کۆنگرەکەی خوێندەوەو بەرگری لە ڕامیاریەتی حکوومەتەکەی کرد ، بۆ ڕووخاندندی ڕژێمی سەدام و ڕامیاریەتی ڕاستی نیوودەوڵەتی و هاوپەیمانیەتی لە گەڵ ئەمەریکاو وڵاتە هاوپەیمانەکان لە جیهاندا .

٢٠٠٤/٩/٢٩ لە دوای زیاتر لە ٢٠ ساڵ بە دەرچوونی حکوومەتی ئەمەریکا لە ڕێکخراوی یۆنیسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ، دووبارەئەمەریکا گەراوە ناو ڕێکخراوەکە ، کە لە خزمەتی گەلانی هەژارو بێ دەرامەتە لە بوارەکانی ئابووری و پەروەردەو زانست هەوڵ دەدات لە جیهاندا .

٢٠٠٤/١٠/٢ ڕێپێوانێکی مەزن لە شارەکانی کوردستان ئەنجام درا ، بە تایبەتی لە شاری سلێمانی بە سەرپەرشتی لێژنەی ریفراندۆمی کوردستان ، بریاردان بۆ داهاتووی کوردو گەڕانەوەی شارە ئازادکرداوەکان ، دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام و یەك گرتنەوەی هەردوو ئیدارەکەو ئەنجام دانی هەڵبژاردن بۆ دیاری کردنی چارەنووسی کورد ، دوای لە هەمان کات بەیاننامەی داواکاریان پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرۆکی ئێراق و ڕێکخراوەکانی دیکەی جیهان کرد ، بەڵام بەداخەوە سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی ڕای میللەتەکەیان وەر ناگرن....؟..!.

٢٠٠٤/١٠/٣ ئەمیری قەتەر شێخ زاید کۆچی دوایی کرد و کوڕە گەورەکەی خەلیفە زاید

جێگەی گرتەوە بە ئەمیری قەتەر ، کە بە هەڵبژاردن بڕیاری بۆ درا بە هۆی خەمخۆریان بۆ گەلو وولاتەکەیان لە هەموو بوارەکان .

٢٠٠٤/١٠/٣ سەرەك وەزیرانی دەرەوەی بەریتانیا جاك سترۆ سەردانی پارێزگای سلێمانی کردو لە لایەن بەرێز مام جەلال پێشوازی لیّ کرا ، بۆ رۆژی دوایی سەردانی پارێزگای هەولێری کردو لە لایەن بەرێز مەسعوود بارزانی پێشوازی لێکرا ، ئاشکرایە کە بەریتانیا رۆلی بنەڕەتی و سەرەکی هەبوو لە دابەشکردنی کوردستان و دامەزراندنی ئەو چوار دەوڵەت و نیووەی خاکی کوردستانی پیّ لکێنراوە ، بە زۆری زۆردار لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٤/١٠/٤ لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە کۆمەڵیّ زانا ئەنجامیانداو لە گۆڤاری نیتشی بەریتانی بلاّویان کردۆتەوە ، ئەو زانایانە تەمەنی ژیانیان لە سەر گۆی زەوی بە زیاتر لە ٤ ملیارو ٣٣٠ ساڵ خەملاندووە . کە هەردوو زانا – مایکل تایسن ، لاندل – لە زانکۆی ستانفۆرد ئەم لێکۆلینەوەیان هەڵسەنگاندوەو گووتوویانە ، ئەم لێکۆڵینەوەیە سنوورێك بۆ ئەو مشتوومڕە دادەنێت ، کە دەربارەی مێژووی سەرهەڵدانی ژیان لە سەر ئەستێرەی زەوی دا دەکرێت .

٢٠٠٤/١٠/٤ لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەندۆنسییا ئەفسەری خانەنیشین سۆسیلۆ یۆدۆ لە خوولی دووەمی هەڵبژاردن سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە گرتنە دەستی پۆستی سەرۆکایەتی ئەندۆنیسیا.

٢٠٠٤/١٠/٥ زیاتر لە ٢٦ کەسایەتی ناوداری ئایینی لە سعوودیە پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ تیرۆرستان لە ئێراق دووپات کردەوە ، بە ناوی بەرگری نیشتیمانی بە ئامۆژگاری دەسەلاتدارانی رژێمی شانشینی سعوودی .

٢٠٠٤/١٠/٦ کوری شانشینی کەمبۆدیا – نۆردۆم دانارید – لە راگەیاندێکیدا لە بەردەم کۆمەڵەی نیشتیمانیدا گووتی :- باوکم شانشینی کەمبۆدیا نۆردوم سیهانۆك دەستی لەسەر کورسی شانشینی کەمبۆدیا کێشاوە ... هەروا کوری شانشین سیهانۆل گووتی :- کە باوکم تەمەنی ٨١ ساڵە و دوای ئەویش سەرۆکی ئەنجوومەنی پیران – تشیاسیم – وەك سەرۆکێکی کاتی جێگەی دەگرێتەوە لە سەر وولاتەکە داو لە هەمان کات داوای لە باوکی کرد لەو بریارەدا پەشیمان بێتەوە .

جێگەی ئامارژە پێکردنە کە رژێمی شانشینی لە کەمبۆدیا میراتی نیە ... لە بەر ئەوە ئەنجوومەنی تایبەت کۆدەبێتەوە بۆ بریاردان بە دانانی شانشین لە

سەر وولاتەکەدا ... ئەم بریارەی شانشین سیهانوك لە ئەنجامی بارودۆخی نا لە باری رامیاری و کێشەو گرفتی وولاتەکە بووە ، کە چەندین جار بەر لەو بریارە هەرەشەی دەست لە کارکێشانەوەی کردووە ، ئەمەش لە ئەنجامی راگەیاندنێك هات کە لە دەرەوەی وولات بریاری بۆ دابوو ، کە لەو کاتە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی بەردەوام بوو .

ئەمەش لەوکاتەدا هات کە سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن – سام رینسی – لە وتارێکیدا کە خۆ پێشاندانێکی توندوتیژ چاوەروانی گەرانەوەی شانشین سیهانۆك دەکات ، ئەویش بەدەست لە کێشانەوەی لە سەر کورسی شانشینی و پارتەکەش دەبێ خۆی هەڵوەشێنێتەوە .

لەلایەکی دیکە بریارەکەی سیهانۆك وولاتی کەمبۆدیای خستە تەنگو چەڵەمەیەکی دەستووری و ، ئەمەش لە سەر ئەنجوومەنی کورسیەکە لە ٩ ئەندام پێك هاتبوون بەدەست نیشان کردنی جێگری سیهانۆك لە نێوان پاڵێوراوان لە بنەماڵەی شانشین ، لە بەر ئەوەی کەمبۆدیا شانشینێکی میراتی نیە .

بەڵام ئەمەش پێچەوانەی رێنمایەکانە لە بەر ئەوە دەبێ شانشین تاکو مردن لە دەسەڵاتدا بێت ... کە کەمبۆدیا بە ململانێی رامیاری دەسەڵاتدا تێدەپەرێ لە مێژووی بوونی ئەم وولاتە .

دوای ئەو رووداوەش سەرۆکی چینی مللی جیان زمین بۆ یەکەم جار لە دوای ٣٠ ساڵ لە ٢٠٠٠/١١/١٣ سەردانی کەمبۆدیای کرد ، لە پێناو بەرەو باشبردنی پەیوەندی نێوان هەردوو حکوومەتی چین و کەمبۆدیا و مۆرکردنی چەندین رێکەوتنامەی ئابووری بازرگانی و رامیاری و کۆمەلایەتی و چەندین بواری دیکە .

٢٠٠٤/١٠/٨ فەیلەسوف ناوداری فەرەنسی – ژال دریر – لە تەمەنی ٧٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

٢٠٠٤/١٠/٩ بۆ یەکەم جار لە مێژووی بوونی دەووڵەتی ئەفگانستان هەڵبژاردنی دیموکراسی فرە لایەنی ئەنجامدرا ، کە حامد کارازی بە سەرەککۆماری ئەفگانستان هەڵبژرادرا ، لە دوای سێ ساڵ لە سەرۆکایەتی کۆماری کاتی دوای رووخاندنی رژێمی تاڵیبانی ئایینی توندرەو و دوور لە هەموو کارو کردارێکی مرۆڤایەتی لە پێشکەوتن و گەشەکردندا .

٢٠٠٤/١٠/٩ لە هەڵبژاردنەكانی ئۆستوڕالیا پارتی دەسەڵاتدار دووبارە توانی سەركەوتن بە دەست بێنیٚ و جۆن هاواردی بە سەرك وەزیران هەڵبژاردرێتەوە ، شایانی باسە كە ئوستوڕاڵیا شێوازێكی بەرچاوی هەیە لە رژێمی دیموركراتی ، لە گەڵ ئەوەشدا بە شداری هێزی هاوپەیمانانی كردووە لە رزگاركردنی گەلانی ئێراق لە رووخاندنی رژێمی سەدام حوسێن لە ئێراق.




٢٠٠٤/١٠/١١ سەرۆكی رێكخراوی رزگاری خوازی فەلەستن یاسر عەرەفات لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا كۆچی دوایی كرد ، لە ئەنجامی نەخۆشیەكی كوشندە ، كە مرۆڤێكی لێهاتوو بوو لە دامەزراندنی رێكخاوی رزگاری خوازی فەلەستین و گەلی فەلەستینی گەیاندە دوا قۆناخی سەركەوتن لە هەرێمەكەدا.



٢٠٠٤/١٠/١٣ كۆچی دوایی نووسەرو شاعیر و رەخنەگر مامۆستا – حەمید فقیٚ حەسەن – ناسراو بە – حەمید رێبوار – لە شاری سلێمانی لە باشووری كوردستان .

جێگەی ئاماژە پێكردنە كە مامۆستا حەمید رێبوار لە ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی – گەورەدیٚ – ی سەر بەناحیەی ئاغجەلەری سەر بە پارێزگای كەركوك چاوی بەجیهان هەڵهێناوە ... قۆناخی سەرەتایی و ناوەندی لە قوتابخانەكانی شاری كەركوك تەواوكردووە .

دوای ئەوە قۆناخی ئامادەیی بەشی ئەدەبی لە شاری هەولێر تەواوكردووە ... ساڵی ١٩٧٩ – ١٩٨٠ لە زانكۆی موستەنسرییە بروانامەی بەكالۆریۆسی

لە شەریەعەتی ئیسلامی وەرگرتووە ... لە نووسین و بەرهەمەکانی مامۆستا حەمید رێبوار پەرتوێکی بە ناوی رەخنەی شانۆیی بەرهەم هێناوە و ژمارەیەك وتارو شیعر و رەخنەی شانۆیی بە زمانی کوردی و عەرەبی لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا بلاوکردۆتەوە تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی دەکات و ماڵئاوایی لە گەل و نیشتیمانەکەی دەکات لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٤/١٠/١٣ گرێدانی کۆنفرانسی جینۆساید بەرامبەر بە کورد لە تەلاری پەرلەمانی کوردستان لە شاری هەولێر ، بە بەشداری وەزیرەکانی ماق مرۆڤی ئێراقی فیدراڵ و ئیدرای هەولێرو سلێمانی لە گەڵ چەندین کەسایەتی دیکەی شارەزا لەو بوارەدا لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٤/١٠/١٤ لە داوی کیشەو ململانێ و شەڕو پێك دادان لە نێوان پێك هاتەکانی گەلانی سۆماڵ بە هاوکاری و هەماهەنگی و یارمەتی دانی سۆماڵ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و چەندین ووڵاتی دیکەی جیهانی و عەربی و ئەفەریکی - عەبدوللا یوسف ئەحمەد - بە سەرەك کۆماری سۆماڵ هەڵبژاردرا لە سەر ووڵاتەکەدا .



٢٠٠٤/١٠/١٧ کۆچی دوایی شاعیرو نووسەرو رۆژنامەنووسی کورد مامۆستا - پیربال مەحمود - لە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان .

شایانی باسە ئەم نەمرە لە ساڵی ١٩٣٤ لە گەڕەکی سێتاقانی شاری هەولێر چاوی بە جیهان هەلهێناوە ، لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد لە ١٩٧٠/٢/١٠ بوەتە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری لقی هەولێری یەکێتی نووسەرانی کورد و بەشداری تەواوی کۆڕو کۆبونەوەو کۆنفراسەکانی کردووە و ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە لە بواری ڕۆشەنبیرکردنی گەلی کوردستان .

٢٠٠٤/١٠/٢٢ لە دوای هەڵبژاردنەکانی خولی دووەمی سەرۆکایەتی کۆماری ئۆکرانیا

ڤیکتۆر یانکوفیتش سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە شۆڕشی پرتوقاڵی ، کە ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی گیروگرفت ، نەك هەر لە ناوەوەی ئۆکرانیان ، بەڵکو کەوتە ناو رامیاریەتی نێوو دەووڵەتی بە هۆی پشتگیری ئەمەریکا لە دەسەلاتی نوێی ئۆکرانیا ، سەرەڕای دووبارە کردنەوەی هەڵبژاردن و هەر یانکوفیتش سەرکەوتنی بە دەست هێناو وولات بەرەو تەنگەژەی ئابووری هەنگاو دەنێ لە وولاتەکە.



٢٠٠٤/١٠/٢٢ خاتوو لەیلا زانای تێکۆشەری ناوداری کورد و جیهان لە باکووری کوردستان لە کۆنفرانسێکیدا لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا پارتێکی رامیاری کوردی راگەیاند لە دوای دادگایی کردنی بۆ سێیەم جار لە لایەن دادگای رژێمی تورکیا.

٢٠٠٤/١٠/٢٢ شاندێکی ریفراندۆم لە باشووری کوردستان لە کاتژمێر ١١،٣٠ دەقیقە بەکاتی ئەمەریکا سەردانی بارەگای رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی کرد لە شاری نیۆیۆرك کە ١،٧٣٢،٥٢٥ میلۆن مۆریان لە مۆرکراوانی خەڵکی کوردستان پێشکەش بە نوێنەری رێکخراوەکە کرد ، کە لە لایەن خاتوو کارینان برێلیێ لیست و سیدیەکان وەرگیرا ، کە لە ١٠ سیدی تۆمار کراو پێك هاتبوو.

٢٠٠٤/١٠/٢٤ لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و سەرۆك کۆماری تونس زەین عابدین بۆ جاری چوارەم بە سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرایەوە هەرچەندە بەرهەڵستکارانی بەو هەڵبژرادنە رازی نەبوون .

٢٠٠٤/١٠/٢٤ ژنە شۆخ و شەونگ و سەرکردەو شۆرشگێری کورد لە باکوری کوردستان خاتوو لەیلا زانا خەلاتی مافی مرۆڤی بۆ ئاشتی نێوودەووڵەتی – ساخارۆف – پێ بەخشرا ، لەدانیشتنێکی تایبەتی ئەنجوومەنی گشتی پەرلەمانی ئەوروپا ، لە لایەن یەکێتی ئەوروپا لەوکاتەی کە خاتوو لەیلا زانا لە زیندانەکانی رژێمی تورك بوو و هاوسەرەکەی مەهدی زانا خەلاتەکەی لەجیاتی هاوسەرەکەی وەرگرت .

٢٠٠٤/١٠/٢٨ نیوەوەی دانیشتووانی خڕۆکەی زەوی لە ئەوروپای رۆژئاوای ئەفریکیا و ئەمەریکای ناوەندو باشووری بە شێك لە ئەمەریکای باکوور تەماشای مانگ گیرانیان دەکردەوەو سێ مانگ گیران تۆمار کرا ، ئەویش یەکەم لە ١٦/ ٢٠٠٣/٥ و ، دووەم لە ٨ ، ٩ /١١/ ٢٠٠٣ و ، سێیەم لە مانگی/ ٢٠٠٤/٥ و لە ٢٠٠٧/٣/٤ روودەداتەوە لە جیهان .



٢٠٠٤/١٠/٢٩ لە رۆمای پایتەختی ئیتالیا دەستووری یەکیەتی ئەوروپا مۆرکرا ، بە ئامادەبوونی ٢٥ وولاتی ئەندام ، کە سەرکەوتنێکی گەورەرە بوو بۆ یەکێیەتی ئەوروپا ، لە دوای مشتومرێکی زور گەیشتنە ئەنجام ، کە کاردانەوەی باشی هەیە بۆ سەر جیهان و بە تایبەتی داهاتووی کورد بە پاڵەپەستۆکردنیان لە سەر رژێمی تورکیا .

٢٠٠٤/١١/٢ لە دوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکا لە ئەنجامی پرۆپاگەندەی نێوان جۆرج بۆش و هەڵبژاردراوی پارتی دیموکراتی کیری و ململانێی کۆماری ، لە ئەنجام جۆرج بۆش بۆ جاری دووەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا بە بەردەوام بوونی لە پۆستی سەرۆکایەتی ئەمەریکاو جیهان ، لە بەربەرەکانی کردنی گورپە هەمە لایەنەکانی تیرۆرو جێ بەجێکردنی رامیاریەتی نەخشەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورەو ئەفریکیا .

٢٠٠٤/١١/١١ رێکخراوی ئیتا هەڵسا بەکارێکی تیرۆرستانە بە تەقاندنەوەی شەمەندەفەرێکی گواستنەوە لە شاری مەدریدی پایتەختی ئەسپانیا کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ١٩١ هاووڵاتی و زامداربوونی زیاتر لە ٢٠٠٠ هاووڵاتی ، کە بەشەمەندەفەرەکانی مردن ناونران ، هەر لەوکاتە رێکخراوی ئیتا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە توندو تیژی رێکخراوەکە نایاگەیەنەتە هیچ ئامانجێك و ئاگربەستی ڕاگەیاندو دەستیان کرد بەگفتووگۆ لە گەڵ دەسەڵاتی ئیسپانیا .

/١١/٢٢ گریدانی کۆبوونەوەی – ٢٢ – وولات لە جیهان ، کە وولاتانی دراوسێی

٢٠٠٤ ئێراق بە شداریان تێدا کرد ، بە سەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی میسر لە شاری قاهیرە پایتەختی میسر ، کە ٤ ڕێکخراوی نێوو دەوولەتیو هەشت دەووڵەتی پیشەسازی ، ناسراو بە کۆمەڵەی – G – وولات ئامادە بوون ، بە پێك هێنانی لێژنەیەك بۆ بە دواداچوونەوەی ...بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە ، کە ١٨ خاڵی لەخۆ گرتبوو ، بۆ یارمەتی دانی ئێراق لە هەموو بوارە جیا جیاکان بە تیابەتی بە پاراستنی یەك پارچەیی خاکی ئێراقی دروستکراو لە سەر خاکی کوردستاو دابەش نەکردنی لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٤/١١/٣٠ لە ئاکامی کۆبوونەوەی بەردەوامی سەرکردایەتی کورد پارتی دیموکراتی کوردستانو یەکێـەتی نیشتیمانی کوردستانو پارتە کوردستانەیەکان بڕیاری بەرزکردنەوەی یەك لیسی هاوبەشی هاوپەیمانیاندا ، لە پێناو بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵەی نیشتیمانی ئێراق ، لە پێناو دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراتی فیدڕاڵی یەکگرتوو و نووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی ئێراق .



٢٠٠٤/١١/٣٠ وەزیرەکانی دەرەوەو ناوخۆی دراوسێکانی ئێراق لە تارانی پایتەختی ئێران کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا بۆ تاو تۆ کردنی بارو دۆخی ناوچەو هەرێمەکەو پاراستنی سنووری نێوانیان ، بە هۆی هاتنە ناوەوەی تیرۆرستان بۆ ناو خاکی ئێراقو مەترسیان لەو بارودۆخەی ئێراق ، بە تایبەتی لە بوونی دەستەڵاتی کوردی لە ئێستاو داهاتووی ناوچەو هەرێمەکەدا .

شایانی باسە سنوورەکانی نێوان ڕژێمەکانی ئێراقو ئیرانو تورکیاو سووریا هەمووی لە سەر خاكو لە ناو خاکی داگیرکراوی کوردستانە ، ئەویش بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٢٤ بە زۆری زۆردار بێ خواستو ویستی گەلی کوردستان .

٢٠٠٤/١٢/٢ بریکاری وەزیر ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان بارزانی مەلا خالید بە پەیوەندی تەلەفۆنی ئاگاداری بەراوگەی گەیلانی کرد ، بۆ ڕاگرتنو

نەفرۆشتنی ساڵنامەی کوردستان بۆ ساڵی/ ٢٠٠٥ ، کە لە لایەن دانەری ئەو مێژوونامەدا دانراو ، بە هۆی بوونی مێژووی رووداوی ٣١/ ئابی/ ١٩٩٦. لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان ، کەچی بە کارێکی رێك چارەکرا .

٢٠٠٤/١٢/٥ کۆمەڵێك لە پێشمەرگەی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان لە شاری مووسڵ شەهید کران ، لە ئەنجامی تەقینەوەی ئۆتۆمبێلێکی مالیبۆی مینکراو ، کە ئەمەش بە یەکێك لەجی بەجێکردنی خواستەکانی دوژمنانی کوردو خاکی کوردستان دادەنرێ .

٢٠٠٤/١٢/٦ گرێدانی کۆنگرەیەکی فراوان لە پارێزگای نەجەف لە باشووری ئێراق کە ٦٠٠ کەسایەتی نوێنەرایەتی پارێزگاکانی فوراتی ناوەڕاست – نەجەف ، کەربەلا ، حیلە ، قادسیە ، موسنەنا – یان دەکرد بەرێوەچوو بە مەبەستی پێك هێنانی ئەنجوومەنێکی یەکگرتوو وەك سەرەتایەك ، لە پێناو دامەزراندنی ناوچەیەکی فیدراڵ لە چوار چێوەی سنووری ئێراق بە هەمان شێووەو شێوازی . هەرێمی کوردستان .

٢٠٠٤/١٢/٦ سەرۆکی ڕووسیای یەکگرتوو- فلادیمر بۆتن – سەردانی تورکیای کردو یادەوەری و رێکەوتنامەکانی کۆنی نێوانیان هەڵسەنگاندەوەوو رێکەوتنامەی نوێیان مۆر کرد . لە پێناو پاراستنی کێشەی وولاتەکانیان و گۆڕینەوەی ، زانیاری سخووری لە بارەی جم و جوڵی شیشانیەکان و کوردو چەسپاندنی ئارامی لە ناوچەکەدا ، لە قەوقازو سنوورەکانیان .


پوتين

ئاشکرایە سەرەڕای دژایەتی کردنی تورکیا ، بەلام چ یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو چ ڕووسیای یەکگرتووی ئێستا یارمەتی دەری دەسەلاتی تورك زیاتر بووە بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی تورك و لێدانی چەندین داستان و شۆڕشەکانی کورد لە رۆژ هەلات و باکووری کوردستان .

٢٠٠٤/١٢/٨ سەرۆکی کۆریایی باشوور بە یاوەری وەزیری دەرەوەی کۆریای باشوور

سەردانی باشووری کوردستانیان بۆ بە سەرکردنەوەی هێزەکانی سووپای کۆریای باشوور لە کوردستان کرد ، لە پێناو خزمەتکردن و یارمەتی دانی گەلی کوردستان .

٢٠٠٤/١٢/١١ گرێدانی کونگرەی هاوبەشی نێوان یاساناسانی ئێراق و کوردستان لە هەولێری پایتەختی باشووری کوردستان ئەنجامدار ، کە کاردانەوەی باشی نواند بۆ کوردو دەسەلاتی کوردی لە ئێراق لە بواری یاساییەوە لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٤/١٢/٢١ لە گەشتێکی ناکاوی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر بۆ ئێراق گەیشتە شاری بەغداو لە گەلٚ سەرەك وەزیرانی کاتی ئەیاد عەلاوی گونگریەکی رۆژنامەوانیان ئەنجامدا ، لە بارەی باروودۆخی ئێراق و هەلٚبژاردن و یەك پارچەی خاکی ئێراق و باری ئابووری و بازرگانی لە دهاتووی ئێراق .

٢٠٠٤/١٢/١٣ رێکەوتنی دابەشکردن و بەکارهێنانی ئاو لە نێوان وولاتەکانی – میسر – ئۆگەندا – سوودان – بۆرەندی – رواندا – کۆنگۆ – ئەسیوبیا – ئەریتیریا – مۆرکرا لە سەر زێی نیل ... کە ئەم زێیە زیاتر لە ١٦٠ ملیۆن کەس ژیانیان لەسەر ئەم زێیەیە ... بەهۆی بوونی کێشە لە نێوان ئەم وولاتانە رێکەوتن لە نێوانیان لە ٢/١٣ ی هەمان ساڵ مۆرکرابوو ، بەلام بەشێوەیەکی فەرمی دەست بە جێ بەجێکردن نەکرابوو ، ئەویش بەهۆی بوونی کێشە لە سەر خەرجکردنی ئاو لە بوارەکانی کشتووکاڵ و کارەبا و بوارەکانی دیکەی پێویست لە کێشوەرەکەدا .



٢٠٠٤/١٢/٢٠ مۆرکردنی رێکەوتنامەی ئاشتبوونە وە لە نێوان حکوومەتی ئۆگەندا و یاخی بووەکانی دژ بەو حکوومەتە . جێگەی ئاماژە پێکردنە کە سەرۆکی ئۆگەندا – یوری مۆسیفنی – لە ٢٠٠٤/١١/١٤ بریاری شەڕ وەستانی لە گەلٚ شۆرشگێرە ئۆگەندیەکان کە سووپایەکی بەهێزیان هەیە بەناوی – جیش الرب – و ماوەی ١٦ سالە شەڕی ناوخۆ لەم وولاتەدا بەردەوامە و لە ئەنجامی ئەم

شەڕەدا زیاتر لە ٢٠ هەزار منداڵ رفێنرابوو لەگەڵ زیاتر لە ١,٥ ملیۆن کەس لەم وولاتەدا دەربەدەربوون ... جگە لە کوژرا و زامداربوون

بەر لەوەش لە ٢٠٠٣/٣/٣ ئەم شۆڕشگێڕانەی بەناوی سووپای خوا ، کە لە باکووری ئۆگەندا بارەگا و بنگەکانیان تیایدا جێگیر بوو ، وەستانی شەڕیان ڕاگەیاند و حکوومەتی ئۆگەنداش خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بەو بریارە دەربری ، بەڵام بەهۆی نەگەیشتن بە ڕێکەوتن دووبارە شەڕی نێوانیان دەستی پێکردلە وولاتەکەدا .

هەر لەو نێوانەدا هێزەکانی سووپای حکوومەتی ئۆگەندا بەردەوام بوون لە هێرشکردنە سەر شۆڕشگێڕەکان لە باشووری سوودان ئەمەش بەپێی ڕێکەوتنی نێوان هەردوو حکوومەتی سوودان و ئۆگەندا بوو .

ئەم شەڕەش لە ساڵی ١٩٨٧ وە بەردەوامە دژی حکوومەتی ئۆگەندا ، کە داوای گۆڕین و هەمواركردنی دەستووری وولاتەکە دەکەن ... لە لایەکی دیکە سووپای خوا – جیش الرب – لەو منداڵە رفێنراوانە پێك هاتبوون کە لەلایەن شۆڕشگێڕەکان فرێنرابوون ، لە پێناو پەروەردە کردنیان و بە چەککردنیان دژی حکوومەتی ئۆگەندا ... ئەم ڕێکەوتنە هەنگاوێکی باش بوو بۆ پێشەوە لە پێناو گەیشتن بە ڕێکەوتنی تەواو و بەرەو پێشبردن و بوژانەوەی ژێرخانی ئەم وولاتەو گەرانەوەی ئاوارەکان .




٢٠٠٤/١٢/٢٤ لە ئەنجامی کشانی دەریا بووە هۆی گۆمەڵەرزەیەکی بە هێزی زەوی و ژێر دەریا روویدا ، بەر لە ٤٤ ساڵ پێش ئێستا بە هەمان شێوە وولاتی تیشکیی گرتەوە... ئەمجارەش وولاتەکانی ، سریلانکاو ، هندو ، تایلاندو ، ئەندۆنوسیاو ، مەڵدیڤو ، میانمارو ، مالیزیای گرتەوە ، کە زیاتر وولاتی ئەندۆنوسیا تووشی زیان هات ، لە بواری ئابووری و گیان لە دەستدانی هاوولاتی ، کە بووە هۆی کوژارنی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کەس و دەربەدەر بوونی بە ملیۆنا کەس ، کە بە گەورەترین کارەساتی لافاوی دادەنرێت لە سەر رووی زەوی

لە مێژوودا لە جیهان .



٢٠٠٤/١٢/٢٥ دووبارە هەڵبژاردنەکانی ئۆکرانیا دەستی پێکرد لە ژێر چاودێریەکی زۆر توند ، لە نێوان سەرەك وەزیران فکتۆریانتیش و ، فکتۆریۆشینکا ، لە دوای هەڵوەشاندنەوەی لە لایەن دادگای باڵای ئۆکرانیا ، لە ئەنجام فکتۆر یۆشینگۆ سەرکەوتنی بە دەست هێنا بە ڕێژەی ٥٦٪ و بوونی بە سەرۆکی ئۆکرانیا.



٢٠٠٤/١٢/٣١ پرۆتۆکۆڵی جێ بەجێکردنی ڕێکەوتنامەکان مۆرکرا لە نێوان سەرۆك کۆماری سوودان عومەر حەسەن بەشیرو سەرۆکی بزووتنەوەی باشوور جۆن گەرەنگ ، ئەویش بۆ ئەنجامدانی ڕێکەوتنەکانی ٢٠٠٤/٧/٢٠، ٢٠٠٣/٩/٢٥، ٢٠٠٤/٥/٢١، ٢٠٠٤/١٢/٥، ٢٠٠٤/٣/٢٦. ئەمەش بە کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆی سوودان ، کە لە ساڵی١٩٨٣ بەردەوام بووە تاکو ئەو ڕێکەوتنانە لە ماوەی ٢١ ساڵ لە وولاتەکەدا .

## ٢٠٠٥



٢٠٠٥/١/١ جێگــری وەزیــری بــەرگری ئەمــــەریکا – ئــــەرمیتاج – ســـــەردانی باشـــــووری کوردســانی کــردو لــە لایــەن بــەرێز مەســعوود بــارزانی پێــــــشوازی لێکـــــــراو گفتووگۆیــەکانیان لــە ســەر بارودۆخی ئێراق و ، بە تایبەتی لە سەر داهاتووی کورد و هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵــەی نیشتیمانی ئێــراق و پەرلــەمانی کوردســـتان و ئەنجوومـــەنی پارێزگاکان بوو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/١/٢ ڕاپۆرتەکـەی بەڕێوەبـەری گـشتی ئاژانـسی نێوودەوولـەتی وزەی ئـەتۆمی محەمەد بەرادعی ئەوەی دووپات کردەوە ، کە ئێران لە وێستگەی ئەتۆمی لـە شاری ئەسفەهان دەستی بە پیتاندنی مادەی یۆرانیۆم کردۆتەوە لە وولاتەکەیدا .



٢٠٠٥/١/٢ لــە مێــژووی بزووتنـــەوەی رزگــاریخوازی کــورد ، بــۆ یەکـــەم جـــار پەرلـــەمانی کوردســــــتان و کۆمەڵـــــەی نیشتیمانی ئێراق لە تـەلاری پەرلـــەمانی کوردســـتان لـــە شاری هـەولێری پایتـەخت ، بـە یەکـەوە کۆبوونـەوەو خاڵـەکانی برگـەی/ ٥٨ی ئیدارەی دەووڵەت و کۆچبەران و موڵکداریەتی هەڵسەنگێرنراو لە گـەڵ چەندین بابەتی دیکە لە بنیاتنانەوەی ئێراقی فێدرال لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٥/١/٤ وەزیری دەرەوەی تورکیا – عەبدوللا گولْ – سەردانی وولاتی ئیسرائیلی کرد ، ئەویش لە پێناو نویْ کردنەوەی ڕێکەوتنامەکانی ڕابردوویان بە پارستنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان لە ئێراق و ناوچەکە و بەتایبەتی لە باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق و سووریاو ئێران .

٢٠٠٥/١/٥ گروپێك لە فرۆکە جەنگیەکانی ئەمەریکا پەلاماری ناو شاری هەولێریاندا لە باشووری کوردستان ، بەبیْ ئاگاداری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان ، لە کاتژمێر یەکی بەیانی بە کاتی کوردستان ، ئەویش بە بۆردمانکردنی بەشی ناوخۆی قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین ، کە بووە هۆی بەرپاکردنی نائارامی دانیشتووان لە شارەکەدا .

٢٠٠٥/١/٦ وەزیرەکانی دەرەوەی ئێراق و ، تورکیاو ، سووریاو ، ئوردن و ، کوێت و ، سعوودیە ، لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردن کۆبوونەوە لە سەر بارودۆخی ئێراق و ناوچەکە ، بە تایبەتی دەسەلاتی کوردی و ئەزمونی باشووری کوردستان ، کە وەزیری دەرەوەی میسر ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو .

الأخ العزيز مسعود البارزاني المحترم
الأخ العزيز جلال الطالباني المحترم

الموضوع: انتخابات محافظة كركوك

تحية أخوية طيبة وبعد

لا بد من أنكم تطمئنون إلى النتائج الكارثي الناتج حول انتخابات مجلس محافظة كركوك، وتعلمون الأسباب السياسية والتاريخية للمشاكل القائمة في هذه المحافظة، وعن ما يستوجب من الجميع العمل معا لحل هذه المشكلة.

إن الحكومة العراقية ملتزمة بتطبيق المادة (٥٨) من قانون إدارة الدولة للمرحلة الانتقالية، ولتلافي التعقيدات الأمنية الخطيرة التي تواجهنا جراء الأداء الحكومي في العديد من المجالات، وبالرغم من ذلك فقد بدأنا بتحقيق الخطوات الأولية لتطبيق المادة (٥٨) من القانون، وذلك بإلغاء قرار ٢ المتعلق بقضايا الملكية في كركوك وكذلك إلغاء كافة التوجيهات والتعليمات والأوامر الصادرة في ظل النظام السابق بخصوص النقل القسري للمواطنين، وإعطاء الحق لهم بنقل قيودهم إلى موطن سكناهم الأصلية في المحافظة التي نقلوا منها.




٢٠٠٥/١/٨ ســـەرەك وەزیرانـــی ئێــراق ئـەیاد عـەلاوی لـە نامەیـەکی رەسمـی پـشتگیری تـەواوی خـۆی بـۆ مـام جـەلال و کـاك مەسـعوود دووپـاتکردەوە ، لـەجیٚ بـەجێکردنی یاسـای ئیدارەی دەوڵـەتی ئێراق ، بـە تایبـەتی مـاددەی / ٥٨، و چارەســەکردنی کێـشەی کـــەرکوك لـــە هـــەرێمی باشــووری کوردســتان ، بـە ئاسـایکردنەوەی پارێزگاکـە . بـەڵام نـە مـاددەی ٥٨/ لـە یاسـای ئیـدارەی دەوڵـەتی ئێراقیو نە ماددەی/١٤٠ لە دەســـتووری هەمیـــشەیی ئێــراق ، جێبــەجێکران کــە زیــاتر لـــە ٦٣٪ . گـــەلانی ئێراق دەنگی بۆدان ...؟!.

٢٠٠٥/١/٩ سەرۆك کۆماری سوودان عومەر حەسەن بەشیرو ، سـەرۆکی سـووپای مللـی باشــوور ، جـۆن گـەرنگ ، لـە نـایرۆبی پایتــەختی کینیـا بـە ئامـادەبوونی کۆمـەڵگای نێوودەوڵـەتی ریکەوتنامـەی ئاشـتیان مـۆرکرد ، بـە کۆتـایی هێنانی شەڕی دووژمنکاری نێوان دەسەڵاتی سوودان و سووپای میللی لە ماوەی/ ٢٣ ساڵی رابردوودا .

٢٠٠٥/١/١٥ بالۆیزی ئەمەریکا لە بەغدا – جۆن نگروپۆنـت – لـە نامەیەکیدا بۆ کاك مەســعوودبارزانی و مــام جــەلال تاڵــەبانی پــشتگیری خــۆی لــە پێنــاو جێبـەجێکردنی یاسـای ئیـدارەی دەووڵـەت ، بـە تایبـەتی مـاددەی /٥٨

دووپات کردەوە بۆ هەرێمی باشووری کوردستان ...؟...!. <u>بەڵام خۆمان فێڵ لە خۆمان دەکەین . راستیەکان لە لاپەڕەی مێژوو تۆمار کراوەو راستیەکان دەسەلمێنێ کە کێ بەرپرسیارە لە رابردوو لە ئێستاو لە</u> داهاتوودا ...!. <u>کوووووووووورد ...؟.</u>



EMBASSY OF THE
UNITED STATES OF AMERICA

Baghdad, Iraq
January 1[illegible], 2005

[illegible]cellency:

Pursuant to our discussions on January 1[illegible] regarding Prime Minister Allawi's January [illegible] letter to you about the status of Kirkuk, let me reiterate United States support for the full implementation of the Transitional Administrative Law. As Deputy Secretary Armitage assured you and stated publicly, the U.S. supports the full implementation of the Transitional Administrative Law, in particular all paragraphs of Article 58, and believes its full implementation is essential. The United States Government is, therefore, in agreement with the Prime Minister's letter.

Moreover, the United States Government is ready to do its part to facilitate the implementation of Article 58 by assisting institutions responsible for measures outlined in Article 58 (A).

Sincerely,

John D. Negroponte

His Excellency,
Jalal Talabani,
President,
Patriotic Union of Kurdistan,
Iraq.

---

British Embassy
Baghdad

1[illegible] January 200[illegible]

Mam Jalal Talabani
Head of the Patriotic Union of Kurdistan

Dear Mam Jalal,

When we met on 12 December, together with US Ambassador Negroponte and Deputy Prime Minister Saleh, I emphasised the importance which the United Kingdom attaches to the full implementation of the Transitional Administrative Law. It is the position of the United Kingdom that all aspects of the law, including all the provisions of Article 58, should be implemented and we stand ready to assist in this regard.

The Foreign [illegible] [illegible] [illegible] [illegible] forthcoming [illegible] national and provincial [illegible]

Yours sincerely,

Edward Chaplin
HM Ambassador

٢٠٠٥/١/١٦ جوولانەوەی ئیتای ئیسپانی کە داوای سەربەخۆیی هەرێمی باسك دەکات ، داوای گفتوگۆی لە گەڵ دەسەلاَتی ئیسپانیا کرد لە جێگەی کارە توندو تیژەکانی کە لە ئەنجامی چەکداری دێتە کایەوە ... بەڵام حکوومەتی ئیسپانیا ئەو پێشنیارەی جوولانەوەی ئیتای رەتکردەوە ... هەروا پارتی باتاسووناش بە هەمان پێشنیار رازیبوو ، کە ئەویش لە لایەنێکی هاوکارە لەگەڵ جوولانەوەی ئیتا ، بەڵام پارتە سەرەکیەکانی ئەسپانیا و سەرەك وەزیران – خۆسیە لویس – ئەو پێشنیارەی جوولانەوەکەی رەتکردەوە بە هۆی نەبوونی پێشبینی راستەوخۆ لە وەستاندنی شەڕ لەلایەن جوولانەوەی ئیتا .

هەروا جوولانەوەی ئیتا دانی بەوە نا کە بەرپرسیارە لە ٢٣ هێرشکردن لە ئیسپانیا لە مانگی ٢٠٠٥/٩/ .

جێگەی باسکردنە کە ئەم رێکخراوەیە لە ساڵەکانی ١٩٦٠ بەردەوامە لە شەڕی چەکداری ، یاخوود پارتیزانی دژی حکوومەتی ئیسپانیا لە پێناو بەدەست هێنانی سەربەخۆیی بۆ هەرێمی باسك ، کە لە ئەنجامی ئەو شەڕانە زیاتر لە ٨٠٠ کەس گیانیان لەدەست داوە لە هەرێمەکەدا لە نێوان هەردوو لایەنی دژ بەیەکتری لەو وولاتەدا .



٢٠٠٥/١/١٦ بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٤٠٠ساڵ بەسەر لە دایك بوونی یەکەم رۆمان لە ئەسپانیا – دوون کیشووت – کە لەلایەن دانەرەکەی – میگیل دوو ئیربانتس – نووسراوە .

جێگەی باسکردنە کە ئەم رۆمانە بۆ یەکەم جار لە ١٦١٢/١/١٦ لەلایەن میگیل نووسراوە و بەباشترین رۆمان دادەنرێت و یەکەم رۆمانە بە ژمارەیەکی بێ ژماردن بفرۆشێت لە ئەسپانیا و وولاتانی دیکەی جیهان .

هەر بەم بۆنەوە لە ئەکادیمیەکانی ئەسپانیا لە شاری مەدرید هەڵسان بە پێك هێنانی گروپێك ، کە مامۆستایان پەیوەندیەکانی نێوو دەووڵەتی و جووگرافیا و مێژوو و ماتماتیك و زانست و شیٌ کردنەوەی زانستی زمان ... کە ماوەی دوو ساڵ




بەردەوام بوون بۆ گەیشتن بە راستیەکانی ئەم رۆمان نووسە کە لە گوندێکی بچووك بە ناوی – فیلانیوفادی لۆس ئینفانتی – کە ٢٢٥ کیلۆمەتر لە شاری مەدریدی پایتەختی ئەسپانیا دوورە .

هەروا ئەم گوندە کرا بەگوندێکی گەشتیاری بۆ سەردانی گەشتیاران لە هەموو وولاتانی جیهان بۆ ئەم گوندە ... بۆ یەکەم جار ئەم رۆمانە لە ساڵی ١٦١٢ بە زمانی ئینگلیزی بلاوکرایەوە و دوای دوو ساڵیش بە زمانی

فەرەنسی بڵاوکرایەوە ... هەر بەم بۆنە لە ئەسپانیا و مەکسیك لە ٣٥٠٠ مەڵبەندی ناوخۆیی ئەم ڕۆمانە دەفرۆشێت بەرەو وولاتانی دیکەی جیهان .

٢٠٠٥/١/٢٧ سەرکردەکانی جیهان یادی ڕزگارکردنی سەربازگەی لە سێدارەدان و کوشتنی بە کۆمەڵ بە ناوی – ئۆشفیتز – دەکەنەوە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لە کاتەکانی جەنگی دووەمی جیهان ڕژێمی فاشی ئەلمانیا بە سەرکردایەتی – هتلەر – ئەم سەربازگەیەش کە سەربازگەیەکی ئەلمانیای نازی بوو زیاتر لە یەك ملیۆن لە جوولەکە و ڕووسی و بۆڵەندی و فەرەکان بە هەموو جۆرێك گیانیان پیٔ لە دەست دراوە



... جا بە گازی ژەهراوی بێت ، یاخوود بە هێزی وزەی کارەبا بێت ، یاخوود بە لە سێدارەدان بێت ، یاخوود بە توانەوەی لەناو تیزاب بێت.

کە بەشی هەرە زۆری ئەم سەربازگەیە لە جوولەکە بوو بە لە ناوبردنیان . سەربازگەی ئۆشفیتز گەورەترین سەربازگەی لە سێدارەدانی ئەلمانیای نازی بووە لەجیهان ، کە لەلایەن هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت لە ١٩٤٥/١/٢٧ ڕزگار کرا .

لەم بارەش سەرۆکی ڕووسیا – فلادمیر بۆتین – و – سەرۆکی ئیسرائیل – مۆشیە کاتساف – لەگەڵ چەندین سەرۆکی دیکەی جیهان و لە ناویشیان سەرۆکی ئەلمانیا – هۆرست کۆهلەر – بیٔ دەنگ لەم یادکردنەوەیە وەستان ... کە ئەم یادکردنەوەیەش بە – محرقە الیهود – ناوزەند کرا لە جیهان . ئەم یادکردنەوەیەش لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەلمانیا گێردرا ... لە هەمان ڕۆژ پەرلەمانی ئەلمانیا کۆبونەوەیەکی لە یناکاوی گرێدا و یەکێك لە ڕزگاربووەکانی سەربازگەی ئۆشفینز ووتارێکی خوێندەوە لە بارەی چۆنیەتی و بوونی ئەم سەربازگەیە و لە ئەنجامی کارە نامرۆڤەکانی کە بەرامبەر مرۆڤ کراوە ، بەتایبەتی جوولەکە و ئافرەت و منداڵ بە تواندنەوەیان لە ڕێگەی هەمە جۆری ئەشکەنجەدان .

بەلآم لێرەدا شتێکی زۆر سەیر هەیە ئەویش دووبارە کردنەوەی ئەم کارە نا مرۆڤایەتیە لەلایەن رژێمە جۆراو جۆرەکان :-
وەك کە لەلایەن رژێمی بەعسی لە ئێراق ئەنجامدرا دژی کورد لە کیمیاباران و ئەنفال – هەروا لە دارفووری سوودان – هەروا لە سربیا و ئەفگانستان ... و چەندین جێگەی دیکە ... کە دەسەلآت سەرچاوەی دروستکردن و بوونی تیرۆر و تیرۆرستان لە جیهان .

٢٠٠٥/١/٣٠ بۆ یەکەم جار لە مێژووی دورستکردنی دەوولەتی ئێراق لە سەر خاکی گەلانی وولآتی نێوان دوو زێو بە تایبەتی لە سەر خاکی کودرستان ، لە لایەن بەریتانیاو هاوپەیمانان



هەلبژاردنی کۆمەلەی نیشتیمانی ئێراقی فیدراڵ ئەنجامدرا ، لە گەڵ هەلبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و ئەنجوومەنی پارێزگاکان ، لە گەڵ ئەوەشدا راپرسی گەلی کورد لە لایەن ئەنجوومەنی ریفراندۆم ئەنجامدار بۆ داهاتووی کورد کە لە ٩٨ ٪ی گەلی کورد لە گەڵ سەربەخۆیی کورسدتان بوون نەك مانەوەیان لە گەڵ ئێراقدا .

٢٠٠٥/١/٣٠ لە مەزادخانەی – شانگ – کە لە شاری هۆنگ کۆنگ – چینی میللی- ئەنجامدرا ، بە یەکێك لە گەورەترین مەزادخانەکانی جیهان دادەنرێت ، کە وێنەی یەکەم ژنی جەنگیزخانی مەگۆلی بە ٣٥٠ ملیۆن دۆلار بەیەکێك لە وەزیرەکانی وولآتی چین مللی فرۆشا لە مەزاد خانەکەدا .

٢٠٠٥/٢/٣ لە ئەنجامی کۆبوونەوەی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە هاوینە هەورای سەلاحەدین مام جەلال تالەبانی پالێورا بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرەك کۆماری ئێراق و بەرەو یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەو دام و دەزگاکانی هەولێرو سلێمانی ، بەلآم هەولەکان سەرنەکەوتن بەهۆی بوونی کێشەو ململانێ و بەرژەوەندی تایبەتی نێوانیان لەلایەنی یەگرتنەوە لە هەرێمی باشووری کوردستان.

٢٠٠٥/٢/٥ گرێدانی کونگرەی نێووەدەوولەتی لە ریازی پایتەختی سعوودیە بە

سەرپەرشتی رژێمی شانشینی سعوودیە ، کە ٥٠ وولاتی جیهانی بەشداریان تێدا کرد لە بارەی تیرۆرو رێگە لێگرتنی ، بەلاّم لە راستیدا شانشینی سعوودیە خۆی وولاتێکی یاریدەدەری ئیسلامی توندڕەو هەروا کوێتو ، ئیرانو ، تورکیاو ، سووریا ، سەرچاوەی یارمەتی دەری تیرۆرو داگیرکردنن ، بە تایبەتی خاکی کوردستان . کە ئاشکرایە بە پێی مێژووی رووداوەکان .

٢٠٠٥/٢/١٠ کۆماری کۆریای باکووری کۆمۆنیستی بوونی چەکی ئەتۆمی خۆی راگەیاند ، سەرەرای کێشەو ململانێی لە گەلْ ئیدارەی ئەمەریکاو هاوپەیمانانو سەرنەکەوتنی گفتووگۆی نێوانیان لەم بوارەدا.

٢٠٠٥/٢/١٣ راگەیاندنی ئەنجامی هەلْبژاردنی کۆمەلْەی نشتیمانی ئێراق بە ٤٨٪ بۆ شیعەو ٢٥٪ بۆ کوردو ١٣,٨ ٪ بۆ لیستی ئێراقیە .



٢٠٠٥/٢/١٤ تیرۆرکردنی سەرەك وەزیرانی پێشووی لوبنانو دۆستی کورد رەفیق حەریری لە شاری بەیروتی پایتەختی لوبنان ، لە لایەن کەسانی هاندەر ، وەك سووریاو وولاتانی دیکەی عەرەبی ، کە بووە هۆی دروست بوونی کێشەو ململانێی ناو خۆی لوبنان و ناوچەکە ، بە تایبەتی لە نێوان لوبنانو کاردانەوەی لە سەر سووریاو ناوچەکەدا .

٢٠٠٥/٢/١٥ بە هۆی تەقینەوەی مەنجەمێکی خەلْوزی بەردی لە چینی مللی کە ئەنجامی بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٢٠٣ کرێکار لە قولاّیی ٢٤٢ مەتر لە ژێر زەوی ... ئەمەش لەدوای گومەلەرزەی زەوی هات لە شاری مۆکست لە هەرێمی لیاوبنگ ... کە ئەم تەقینەوەیە بە گەورەترین تەقینەوەی مەنجەمی دادەنرێت.

روودانی تەقینەوەی مەنجەم لە چین زۆرن کە لە سالْی ٢٠٠٤ زیاتر لە ٦

مەنجەم تەقیوەتەوە ئەویش .

لە ٢٠٠٤/٦/٣ تەقینەوەی مەنجەمی خەڵوز لە هەرێمی – هیبی – کە بووە هـۆی گیـان لــە دەســت دانــی ١٤ کرێکـاری مەنجەمەکـە ... هــەروا لــە ٢٠٠٤/١٠/٢٠ تەقینـەوەی مەنجـەمی خـەڵوز بەهۆی بۆری غـاز لـە هـەرێمی حینان کە بووە هۆی گیان لەدەست دانی ١٤٨ کرێکاری مەنجەمەکە .

هەروا لـە ٢٠٠٤/١١/٢٠ گرگرتنی ئاگر لـە مەنجـەمی ئیرۆن ئـرو لـە هـەرێمی هـیبی ، کە بـووە هـۆی گیـان لەدەسـت دانـی ٦٨ کرێکـاری مەنجەمەکـە ...

هــەروا لـە ٢٠٠٤/١١/٢٨ تەقینــەوە لـە مەنجـەمی تـشیجیاشان لـە هـەرێمی سانکس کە بووە هۆی گیان لە دەست دانـی ١٦٦ کرێکاری مەنجەمەکـە ...

هـەروا لـە ٢٠٠٤/١٢/١ تەقینـەوەی مەنجـەم لـە هـەرێمی گـویز ، کـە ئـەویش بووە هۆی گیان لە دەست دانی ١٨ کرێکاری مەنجەمەکە ، هـەروا لـە ١٢/١٩ ی هەمان ساڵ تەقینەوەی مەنجەم لە هەرێمی سیتشوان کە بووە هـۆی گیـان لەدەست دانی ١٤ کرێکاری مەنجەمەکە .

سەرچاوە :- BBC.arabic

٢٠٠٥/٢/٢٢ گۆمەلەرزەیەکی بەهێز لە پارێزگاری کرمانشانی ئێران روویدا کە بووە هۆی شـەهید کردنـی زیـاتر لـە ٤٥٠ چوار سـەدو پـەنجا هـاووڵاتی و زامـدارکردنی زیاتر لە ٥٠٠٠ پێنج هەزار هـاووڵاتی و وێرانکردنـی چـەندین گونـدو خـانوو کێڵگەی کشتووکاڵی و کارگەی هەمەجۆری پیشەسازی لە پارێزگاکەدا .

٢٠٠٥/٢/٢٧ پەرلــەمانی کوردســـان خــۆی هەڵووەشـــاندەوە بــۆ ئــەوەی پەرلـــەمانی هەڵبژێردراو کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی ئەنجام بدات لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان .

٢٠٠٥/٣/١١ بۆ یەکـەم جـار فرۆکەیـەکی گواسـتنەوەی نەفـەر هـەڵگر لــە شــاری – تیــانگین – لــە باکووری چینی مللی بەرەو شــاری – تــشانگا – بفرێــت ... کە ئەمـەش یەکـەم کـاری ئەنجامـدەرە لەلایـەن کۆمپانیـای – ئـۆکی ئیرلاینـز – لـەدوای مـاوە پێـدانی



لەلایەن دەسەلاتی کۆمۆنیستی لە چین بە کەرتی تایبەت لە وولاتەکەدا .
بەر لەوەش کەرتی تایبەت توانای ئەم جۆرە کارانەی نەبوو لە بەرهەم هێنانی فرۆکەو چەندین کاری دیکەی پیشەسازی لە وولاتەکەدا ... کە ئەمەش کارێکی گونجاو و لە باربوو بۆ دەسەلاتی چینی مللی و بەرەو پێشبردنی بواری فرۆکەوانی نەك هەر لەناو خۆی چین بەڵکو بۆ دەرەوەی چینیش ... کە چینی مللی ئێستا رۆڵی بالا و گرنگی هەیە لە بوارەکانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی لە جیهاندا .



٢٠٠٥/٣/١٦ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئێراق لە دوای هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نشتیمانی کۆبوونەوەی پرۆتۆکۆڵی خۆی ئەنجامداو بە وتار خوێندنەوە ، کە ٧٥ ئەندامی کوردی هەلبژێردراو بەشداری تێدا کرد لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٥/٣/١٧ لە مێژووی کوردو ئەمەریکا بۆ یەکەمجار سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش جەژنی نەورۆزی لەگەلی کورد پیرۆز کرد لە بەیاننامەیەکی سەرۆکایەتی رەسمیدا لە شاری واشنتۆنی پایتەختی وئەمەریکا.




٢٠٠٥/٣/٢٣ دوای ١٥ ساڵ لە دەسەلات و سەرکردە و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی کۆماری نامیبیا – سام نگوما – دەسەلاتی جێ هێشت و دایە دەست هاو خەبات و سەرکردەی وولاتەکە – هیفوکۆیوانیە بۆهامبا – کە تەمەنی ٦٩ ساڵە و ماوەی ٤٠ ساڵ زیاتر لە گەڵ سام نگوما خەباتی هاوبەش دەکەن و هاورێی یەکترن لە هەموو بوارەکانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری وپەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان .
هەر بەم بۆنە زیاتر لە ٢٠ هەزار هاوولاتی وولاتەکە بەشداریان لە

سووێندخواردن بۆ هامبا کرد ، بە بوونی بە سەرۆکی نوێی وولاتەکە لە دوای سەرکەوتنی پارتەکەی پارتی – سوابۆ – لە هەڵبژاردنی پەرلەمان . ئەو ڕێو ڕەسم وەستان و داوای دووبارە لێك جیاکردنەوەی دەنگەکانیان کرد بەڵام پارتی سوابۆ و پەرلەمان بۆ هامیایانی بە سەرۆکی نامبیا هەڵبژارد . لە هەمان کات بە ڕاگەیاندنی پرۆگرامی داهاتووی حکوومەتەکەی بڵاوکردەوە ، لە پێناو بەرەو باشبردنی وولات لە هەموو بوارە جیاجیاکانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و بازاری ئازاد و کشتووکاڵ و پیشەسازی و کۆمەڵایەتی و ، هەروا پەیوەندیەکانی ناوخۆ و دەرەوەی وولات بەرەو جیهان .

٢٠٠٥/٣/٢٤ سەرۆك کۆماری قرغیزستان عەسکر باکاییف دەستی لە دەسەڵاتی پۆستی سەرەك کۆماری کێشاوە ، بەهۆی خۆپیشاندان و نارەزایی گەلانی قرغیزیا .

٢٠٠٥/٤/٣ پاپای فاتیکان پاپا یۆحنای دووەم بەر لە بەیانی کۆچی دوایی کرد ، کە لە دایك بوویی وولاتی پۆلەندا بوو ، رۆڵی بەرچاوی هەبوو لە بەرگری کردن لە گەلانی ماف زەوت لێکراو ، بە تایبەتی گەلی کوردستان .

٢٠٠٥/٤/٦ لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو وولاتانی خاکی کوردیان پێ لکێنراوەو لە مێژووی ئێراق سەرکردەیەکی کورد لە لایەن گەلی کوردو کۆمەڵەی نشتیمانی ئێراق مام جەلال بە سەرەك کۆماری ئێراقی فیدڕال هەڵبژێردرا .

٢٠٠٥/٤/٦ ئەمیری سێیەمی مۆناکۆ – ئەمیر دیتیە – کۆچی دوایی کردو کرەکەی ئەمیر – ئەبیر– جێگەی گرتەوە بە ئەمیری وولاتی مۆناکۆ ، ئەو بنەماڵەیە زیاتر لە ٧٠٠ ساڵ دەسەڵاتداریەتی مۆناکۆ دەکەن لە سەر ئەو ناوچە بچووکە ، کە رووبەری ٤٦٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیەو ژمارەی دانیشتوانی وولاتەکە بە گشتی ٥٠,٠٠٠ هەزار کەسە .

٢٠٠٥/٤/٧ دەرچوونی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی بە ژمارە/ ١٥٥٩ بە پێك هێنانی لێژنەی لێکۆڵینەوەی سەر بە خۆی نێوودەوڵەتی لە بارەی باری تیرۆرکردنی سەرەك وەزیرانی پێشووی لوبنان رەفیق حەریری ، لە پێناو یارمەتی دانی دەسەڵاتی لوبنان لە بارەی هەموو لایەنەکانی شاڵاوە تیرۆرەکەی ٢٠٠٥/٢/١٤ لە لوبنان .



٢٠٠٥/٤/١٢ وەزیــــری بــەرگری ئەمـــەریکا – رامـسفیلد – بـۆ یەکـەم جـار لـە مێــــژووی کـــوردو باشــــووری کوردســــتان ، بگاتـــە هاوینـــە هەواری سەلاحەدین ، کە لە لایەن بەرێز مەسعوود بارزانی پێشوازی لێکـراو لە هـەمان کـات لـە لایـەن سـەرەك کۆمـاری ئێـراق بـەرێز مـام جـەلال پێشوازی لێکرا ، ئەویش بە گۆڕینەوەی بیروبۆچوون لە بارەی باری ئێراق ، لــە کوردســتان و ناوچــەکەو حکوومــەت و کۆمەڵــەی نـشتیمانی ئێــراق و داهاتووی بەرەو ئارامی و بەرەو پێشەوە بردنی بارودۆخەکە لە ئێراق .



٢٠٠٥/٤/١٣ ســـــەرەك کۆمـــــاری تورکیـــــا – ئەحمــــەد نـــــەژدەت ســــیزار– سەردانی کۆماری سووریای کـرد ، بــە هــۆی بــارودۆخی ناوچــەو هــەرێم و جیهــان ، لــە داهــاتووی ڕژێمــەکانیان ، کــە لــە بنــەڕەتا دوژمـنی یـەکترین لـە هـەموو بوارێـك ، تـەنیا لـە سـەر بـاری کـودو کێـشەی داهاتووی کورد کۆکن لە کوردستان .

٢٠٠٥/٤/١٩ لـە دوای کۆچـی دوایـی پاپـای فاتیکـان یۆحـەنا پۆلیـسی دووەم– جۆزیـف راترزنگـەر – بـە نـژاد ئـەڵمانی و لـە دایـك بـووی ئـەڵمانیا بـە پاپـای فاتیکـان هەڵبـژاردرا بـەناوی – پاپا بنـدتکتی شـانزەهەم – کـە لـە لاباڵی پـارێزەرانی کاسۆلێکی ئایینی مەسیحە لەجیهان .



٢٠٠٥/٤/٢٣ پــــــاڵێوراوە ئیــــــسلامیەکان ســــەرکەوتنێکی گــەورەیان لـــە کۆتاییــــــەکانی هەڵبــــــژاردنی ئەنجوومەنـــــەکانی نـــــاوخۆیی بەدەســـت هێنـــا کـــە لـــە ٤/٢١ ئەنجامدرابوو لە وولاتەکەدا .

جێگــەی ئامــاژە پێکردنــە کــە پاڵێوراوەکــانی ئیــسلامی بــە پــشتگیری پارێزگاران پیاوانی ئاینی سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لەشارەکانی وولاتی سـعوودیە ... کـە حـەوت کورسـیان لـە شـاری جـدە گرتـە دەسـت ، کـە پایتەختی بازرگانی وولاتەکەیە ... هەروا لە شارەکانی مەککە و مەدینە و دەمام و حیجازیش کورسیەکانی ئەنجومەنی ناوخۆیان بەدەست گرت .

بـەڵام لـەو هەڵبژاردنانـە مـاوە بەرەگـەزی ئـافرەت نـەدرا بەشـداری لـە هەڵبژاردنـەکان بکـەن چ بـە خۆپـالاوتن ، یـاخوود بـە دەنگـدان ... هـەروا دەرچوونی ئیسلامیە مام ناودەندیەکان کە لە لاباڵی وەهابینە لە وولاتەکەدا ... کـە کـۆی کورسـیەکان ٢٤٤ کورسـیە و لـە ٢٤٤ کورسـیە ئیـسلامیەکان توانیان ١٧٨ کورسی بەدەست بێنن لـە هـەموو پارێزگاکـانی وولاتەکەدا ... کــە نیــوەوی کورســیەکانی دیکــە رژێمــی شانــشین دایاندەمــەزرێنێ بــۆ تەواوکردنی پێك هاتەی ئەنجوومەنە ناوخۆییەکانی وولاتی سعوودیە .

٢٠٠٥/٤/٢٥ دوا سـەربازی هێزەکـانی سـووپای کۆمـاری سـووریا لـە وولاتـی لوبنـان لـە شارۆچکەی– عەنجەرە – کشانەوە ، کە لە دوای ٣٠ ساڵ بە ناوی سووپای پـارێزی وولاتـی لوبنـان ، بـەڵام لـە راسـتیدا بـە شـێوەی داگیرکـردن و جـێ بـەجێکردنی خواسـتەکانی رژێمـی بەعـسی لـە سـووریا بـوو لـە هـەموو لایەنێکەوە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٤/٤/٢٧ سـەرۆکی رووسـیا – فلادیمـر پـۆتین – بـۆ یەکـەم جـار سـەردانی کۆمـاری ئیسرائیلی کرد ، لە دوای شۆڕشـی بەلـشەفیەکان لـە سـاڵی ١٩١٧ تـاکو ئـەم سەردانە ، ئەویش لە دوای دامەزراندنی دەووڵەتی ئیسرائل لە ساڵی ١٩٤٨ لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٥/٤/٣٠ گرێـدانی کۆبوونـەوەی وەزیرەکـانی دەرەوەی دراوسـێی ئێـراق ، لـە پێنـاو تـاوتۆکردنی بـارودۆخی ئێـراق و ناچـەو هەرێمەکـەدا ، بـە تایبـەتی بـە دوپاترکدنـەوەی یـەك پارچـەیی خـاکی ئێـراق ، ئـەویش بـە گـرژ کردنـەوەی داخوازیـەکانی کـورد لـە دەسـەڵاتی نـوێ لـە داهـاتووی ئێـراق و دەسـتوورە هەمیـشیەکەی گـەلانی ئێـراق ، بە تایبـەتی گـەلی کـورد لەهـەرێمی باشـووری کوردستان .

٢٠٠٥/٥/١ سەرەك وەزیرانی کۆماری تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردوغان – سەردانی کۆماری ئیسرائیلی کرد ، لە پێناوی نوێ کردنەوەی رێکەوتنە رابردەویەکانیان ، بە تایبەتی لە بواری زانیاری سخووڕی و سەربازی ، لە پێناو بەرەنگاربوونەوەی جمووجۆڵی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستان ، بە تایبەتی بە چاودێری کردنی پارتی کرێکارانی کوردستان P.K.K لە باکووری کوردستان .



٢٠٠٥/٥/٤ دادگای دەستووری لە تۆگۆ دووپاتی سەرکەوتنی – فووی گناسینگبی – لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کردەوە ، کە مانگی ٢٠٠٥/٤/ لە لایەن گەلی تۆگۆ دەنگی بۆ درابوو ... ئەم هەڵبژاردنەش لە دوای کۆچی دوایی باوکی فووری بوو – گناسینگیی ئەبادیما – کە لە هەمان رۆژی راگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە فووری سوێندنی یاسایی خوارد بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی تۆگۆ .

سەرەرای بوونی کێشە و ململانێ لە نێوان فووری و بەرهەڵستکاران لە وولاتەکە بەتایبەتی سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن – جیلکر ئایست – بەهۆی بەشداری نەکردنی پارتەکەی لەو هەڵبژاردنە ... هەروا لەلایەکی دیکە بە هەزارا هاوولاتی تۆگۆ بە هۆی باری توند و تیژی روویان لە وولاتەکانی بەنین و گانا کرد ... بەهۆی باری نا لە باری رامیاری لە وولاتەکە لەکاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە تۆگۆ لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٥/٥/٤ لە ئەنجامی تەقینەوەی مرۆڤێکی خۆ مین کراو لە ناوچەی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوجەرگەی شاری هەولێر ، کە بووە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە ٦٠ هاولاتی و زامدار بوونی زیاتر لە ١٠٠ هاولاتی ، بە هۆی وەرگرتنی رەزامەندی دامەزراندن لە رێزی هێزی ناوخۆی پارێزگای

هەولێر لە باشووری کوردستان.

٢٠٠٥/٥/٥ هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا ئەنجامدرا بە سەرکەوتنی پارتی کرێکارانی بەریتانیا ، بە سەرکردایەتی سەرەك وەزیران تۆنی بلێرو سەرۆکی پارتی ناوبراو لە بەریتانیا.

٢٠٠٥/٥/٩ بەبۆنەی سەرکەوتنی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو لە جەنگی دووەمی جیهانی بە سەر فاشیەتی هتلەری ئەلمانیا ، لە مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای یەکگرتوو گەورەترین ئاهەنگی نێوودەووڵەتی ئەنجامدار کە ٦٠ دەووڵەتی جۆراو جۆر بەشداریان تێدا کرد ، لەوانە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش و چەندین سەرۆك و سەرەك دەووڵەت و کەسایەتی دیکەی ناوداری نێوودەووڵەتی لە جیهاندا .

٢٠٠٥/٥/١٠ لە بەریتانیا پیلاوێك دۆزراوەتەوە کە تەمەنی بۆ ٣٠٠ ساڵ بەر لە مێژوی زاینی بووەو درێژی پیلاوەکە ٣٠ سەنتیمەتر بوو.

٢٠٠٥/٥/١٠ گرێدانی لوتکەی عەرەبی و ئەمەریکای باشوور لە شاری بەرازیلیای پایتەختی وولاتی بەرازیل ، کە مام جەلال تاڵەبانی سەرەك کۆماری ئێراقی فیدڕاڵ بەشداری لەوکۆنگرەیە کرد ، بە وتارێکی بە پێز لە بارەی باری ئێراق و کوردو ناوچەکەو هەرێم و جیهاندا .



٢٠٠٥/٥/١٣ لە راگەیاندنێکی دەزگای پۆلیس لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ... ئەویش بە بزربوونی سەدا قووتابی ئەفەریکیەکان لە قوتابخانەکانی شاری لەندەن ...لەم بارەیەوە – سکۆتلاندیلرد – داوای لە دەستەکانی فێرکردن کرد ... لە بارەی چۆنیەتی بزربوونی ئەو ژمارە زۆرەی رەش پێستە ئەفەریکیەکان ، کە تەمەنیان لە نێوان چوار ساڵ

تا حەوت ساڵدایە لە قوتابخانەکاندا .

ئەمەش لە روونکردنەوەیەکی دیار کە لە ماوەی مانگی /٧ تا مانگی /٢٠٠١/٩ زیاتر لە ٣٠٠ منداڵ بزربوونە و ترسیش هەیە کە بەهەزارا منداڵ لەماوەی ساڵێکا بزر بکرێن ، کە ئەمەش کارێکی نامرۆڤانە و دژ بە مرۆڤایەتیە ... لە بەر ئەوەی ئەو منداڵانە لە ئەفەریکیاو هەرێمی کاریبی روویان لە بەریتانیا کردووە .

هەروا دەزگاکانی پۆلیس لە ئاکامی پشکنینی بەردەوام توانی تەرمی دوو منداڵ بدۆزێتەوە بە کوژراوی ... بەڵام تاکو ئێستاش ئەوانی دیکە نەدۆزراونەتەوە کە ژمارەیان ٢٩٨ منداڵە لە وولاتەکەدا ... کە ئەم خێزانانە ئەفەریکیە پێست رەشانە بە هۆی هەژاری روویان لە بەریتانیا و وولاتی دیکەی ئەوروپا کردووە ، لە پێناو دابینکردنی بژێوی ژیان لەم وولاتانەدا .

٢٠٠٥/٥/١٥ کامیرای توێژینەوە کە لە سەر پشتی تلسکۆبی گەردوونی هابڵ قایم کرابوو- advanced -camera for surveys بە دەست نیشان کردنی دوو مانگی نوێ بۆ یەکەم جار لە مێژووی گەردوونی بەناوی -شارۆن - کە لە دەوری ئەستێرەی بلۆتۆ دەسوورێتەوە بە ناوی p1-2005/5-2, p2-2005/5 کە قەبارەیان لە نێوان ٤٥-١٦٠ کیلۆمەتر دەبێت و بە بەراورد لەگەڵ مانگی شارۆن کە قەبارەی لە نێوان ١٢٠٠کیلۆمەترە ، بەڵام ئەم دوومانگە لە مانگی شارۆن ، کە دووریەکەی بە ٤٩ هەزار کیلۆمەتر مەزندە دەکرێت ، ئەوە مانگی p2، بەڵام مانگی p1، دووریەکەی بە ٦٥هەزار کیلۆمەتر دەژمێردرێت .

هەروا دواجار تلسکۆبی هابڵ دووبارە وێنەکانی گرتیە لە ٢٠٠٦/٢/١٥ ، کە بە هەمان شێووە بە ئاسایی خۆیی دەسورێتەوە وەك کۆمەڵەی رۆژ لە دەوری مانگی بلتۆدا.

٢٠٠٥/٥/١٥ وەزیـــری دەرەوەی ئەمـــەریکا – کۆنـدالیزا رایـس– سـەردانێکی ناکـاوی بـۆ هـەرێمی باشـووری کوردسـتانی لکێنـدراو بـە ئێراق ئەنجامــداو لــە لایــەن بــەرێز مەســعوود بــارزانی پێــشوازی لێکراو کاردانەوەی باشـی هـەبوو بۆ دوارۆژی کـوردو کاردانـەوەی لـە سـەر وولاتانی دراوسێ کوردی پێلکێندراو لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

٢٠٠٥/٥/١٦ پەرلـەمانی ئۆمـەی کوێـت لـە ئـەنجامی کێـشەو ململانێـی نێـوان دەسـەلاتو بەرهەڵستکاران ، بووە هۆی هەموار کردنی بەندێکی دەستووری کوێت ، لـە بارەی مـافی ئـافرەتو بڕیاردار بە مـاف هەڵبـژاردنی و خۆپالاوتنی ئـافرەتی کوێـت ، کـە ئەمـەش هـەنگاوێکی گـرنگ بـوو لـە رامیـاری نـاوخۆو دەرەوەی کوێت بەرەو بە دیموکراتی کردنی دەسەلاتەکەیان لە ناوچەکەدا.



٢٠٠٥/٥/٢٠ سەرەك وەزیرانی ئێراق ئیبراهیم جەعفـەری ئەمینـــداری گــشتی پـارتی دەعـوەی شیعەی ئێراقـی سـەردانی تورکیـای کـرد ، بـە کرنەوەی پەیوەنـدی نوێی نێـوان ئێــراقو تورکیــا و کردنــەوەی دۆســـــیەکانی ســــوودمەندی هاوبەشـیان ، بــە تایبــەتی لــە بـارەی بـاری کـوردو پارێزگـاری کـەرکوكو کردنـەوەی دۆسـیەی دیکـە ، بـە پەرینــەوە بـۆ داهـاتوی نێـوان هــەردوو وولات ، کــە کاردانــەوەی ناهــەموار دەکاتــە ســەر بــاری کــورد لــە کوردستان بەگشتیو باشووری کوردستان بە تایبەتی لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٥/٥/٢٠ گرێدانی گـۆنگرەی مونتـەدای ئـابووری نێـوو دەوولـەتی لـە شـاری عەقەبـەی ئـوردن ، کـە ١١٠٠ زانـاو بیرمەنـدی رامـاریو ئـابووری لـە وولاتـانی جیهـان بەشداریان تێداکرد لەو کۆنگرەدا.



٢٠٠٥/٥/٢٧ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری مانگانەی مێرگ لە لایەن دەزگای ڕۆشنبیری وەزارەتی ڕۆشنبیری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان لە شاری هەولێر ، بە سەر نوسەری گۆڤارەکە مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی... گۆڤاری مێرگ گۆڤارێکی هەمەڕەنگو هەمەلایەنە باس لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیان دەکات لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/٥/٢٧ گرێدانی کۆنگەری میهرەجانی جیهانی کنیسەکان لە شاری هانوفردی وولاتی ئەڵمانیای یەکگرتوو لە کێشووەرەکەدا .



٢٠٠٥/٩/٢٨ پەرلەمانی ئەوروپا داوای لە رژێمی تورکیا کرد ، کە دان بە قەسابخانەکەی کۆمەڵ کوژی ئەرمەنو کوردو گەلانی دیکە دابنێ ، کە لە ١٩١٥/٤/١٥ ئەنجامدرا بوو لە باکووری کوردستان لە لایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەو کاتدا.

٢٠٠٥/٥/٢٩ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی لوبنان دەستی پێکردو لە خوڵی دووەمو کۆتایی حزب اللەو حزبی ئەمەل سەرکەوتنیان بە دەست هێنا لە ٦/٥ ی هەمان ساڵدا ، ئەمەش لە دوای خۆپیشاندانو کێشەو ململانێی نێوان پێکهاتەکانی گەلانی لوبنانو مەزهەبە ئایینیەکانی نێوان مەسیحیو ئیسلام بوو ، لە دوای تیرۆر کردنی سەرەك وەزیرانی لوبنانی پێشوو ڕەفیق حەریری لە شاری بەیروت لە لوبنان .

٢٠٠٥/٥/٢٩ بە نووساروی ژمارە/ ٩٠٠/٨ی ئەنجوومەنی وەزیرانی ناوخۆی ئێراقی

کاتی بە ژمارە/ ق /٢٦٨٧ لە ٢٠٠٥/٥/٨ ، کە لە و بڕیاردا هاتووە ، ئەویش بـە دەرکردنـی ٢٥٠٠ ئەفسەرو پۆلیسی کـوردو تورکمـان ، لـە پارێزگـاری کەرکوك بە بیانوی ئەوەی کە راژەیان لـە سلێمانی و هـەولێر گواستراوەتەوە بۆ شـاری کـەرکوك ، بـەڵام ئەو بڕیـارە جیٚ بـەجیٚ نـەکرا ، ئـەویش بـەهۆی نیازی بۆگەنی بە عەرەب کردن لە پارێزگاکەدا .

٢٠٠٥/٦/١ لـــە دوای پێـــنج مـــانگ لـــە هەڵبـــژاردنی پەرلـــەمانی کوردســـتان لـــە هـــەرێمی باشـــووری کوردســـتان ، کۆبوونـــەوەی خـــوولی دووەمی پەرلەمان ئەنجامدرا ، بـەئامادە بـوونی بـەڕێزان



مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی و سـەرۆکی کۆمەڵـەی نیشتمانی ئێراقی حاچم ئەلحەسەنی و چەندین کەسایەتی دیکـەی ئێراقی و کوردی و جیهـانی بە شداریان تێداکرد لە کۆبوونەوەکەدا .

٢٠٠٥/٦/١ لـە راپرسـیەکی فەرمیدا لـە وولاتـی هۆڵەنـدا لـە سـەر چوونە ناو یەکیەتی ئـەوروپا و رازی بـوون بەدسـتووری یەکیـەتی ئـەوروپا ... بـەڵام لـــەو راپرســـیەی گـــەلانی هۆڵەنـــدی لـــە ٦٣٪ ی




دەنگدەرانی دەستووری یەکیەتی ئەوروپایان رەتکردەوە ... کە لـە ٣٧٪ ی دەنگدەران دەنگیان بۆ دەستوورەکەدا .

ئەمـەش مـاوەی بـۆ پەرلـەمانی هۆڵەنـدی نەهێـشتەوەو پەرلـەمانیش دەنگدەرانی ناچار نەکردبوو کە بەشێوەیەکی فـەرمی دەنگـدەران روویـان لـە سندوقەکانی دەنگدان بکەن لـە وولاتەکـەدا ... دوای ئـەوە پەرلـەمان بڕیـاری کۆبونەوەیدا لـە ٦/٢ بـۆ بڕیـاردان لـە سـەر راپرسـی فـەرمی گشتی لـە سـەر

دەستووری یەکیەتی ئەوروپا بەدەنگی – بەلێ – یان – نا – جا بەهەر شێوەیەك بێت پەرلەمان و حکوومەتی هۆڵەندا بریاری گەل رەتناکاتەوە لە وولاتەکەدا.

هەروا گەلانی فەرەنساش دەستووری یەکیەتی ئەوروپیان بە ٥٥٪ رەتکردەوە بەرامبەر رەزامەندی ٤٥٪ . کە ئەمەش گورزێکی کوشندە بوو لە یەکیەتی ئەوروپا ... سەرەرای ئەوەش کە ژمارەی وولاتی رێژەی یەکیەتی ئەوروپا /٢٥ وولاتەو /٩ وولات دەنگی لە سەر دەستوورەکەدا ، ئەوانیش : – نەمسا – ئەلمانیا – یۆنانا – مەژەر – ئیتالیا – لیتوانیا – سلۆفاکیا – سلۆڤینیا – ئەسپانیا – کە یەکیەتی ئەوروپا رۆڵی بالای هەیە لە جیهان لە هەموو بوارەکاندا .

٢٠٠٥/٦/٢ تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێلی رۆژنامە نووسی لوبنانی سەمیر قەسیر لە کاتی بە ئەنجامگەیاندنی کارەکانی ، کە تێکۆشەرو ئازاترین رۆژنامەنوس بووەو کە هەردەم رەخنەی لە دەسەلاتی رژێمی بەعسی لە سووریاو هاوپەیمانەکانی گرتووە ، بە هۆی تاکرەوو توونـد رەوی رژێمی بەعس لە سووریا ، لە داگیرکردن و دەست تێوەردانی لە کاروباری لوبنان و ناوچەکەو لە هەمان کات بە بەردەوامی لە ئازاردانی گەلانی سووریا .

٢٠٠٥/٦/٦ کۆنگرەی دەیەمی پارتی بەعسی لە سووریا گرێدرا ، کە لا باڵێکی پارتی بەعسی لە ئێراق بووەو دامەزرێنەرەکەی میشێل عەفلەقە...پارتی بەعسی لە سووریا و ئێراق جیاوازیان نەبووە لە هەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان ، لە نێوان دەسەلاتی بەعسی لە ئێراق و سووریا بەرامبەر بەکورد ، تەنیا لە شێووەو شێواز نەبێت ، بەپێی بەرژەوەندی تایبەتی ئومەی عەرەبی و خواستەکانیان نەبێت لە ناوچەو هەرێمەکەدا.

٢٠٠٥/٦/٧ دەست پێکردنی کارەکانی کــۆنگرەی نیــشتیمانی دووەم – بــۆ نەخۆشــی ئایــدز – لــە باشــووری ئەفەریکیا لە ناوەندەکانی مــشتومرو گفتوگــۆدا لــە



پێناو دۆزینەوەی باشترین رێگا لە چارەسەکردنی ئەم نەخۆشیە ترسناکە لــە ئــەنجامی تووشــبوونی مــرۆڤ بــە ڤیرۆســی – ئیــتش ئــای – ... بــە شداربوونی کۆنگرەکە کە زیاتر لە ٣٠٠٠ توێـژەر و شـارەزا و کەسایەتی رامیـاری لـەجیهان لـەم کۆنگرەیـەدا بەشـداربوون لەشـاری – دیریـان – لـە کـەنارەکانی باشـوور و کـۆنگرە بـۆ مـاوەی چـوار رۆژ بـەردەوام دەبێـت ... رێژەی تووشبوان بەم نەخۆشیە دەگاتە /٥ پێنج ملیۆن کەس .
بەتایبـەتی لە نێـوو منـداڵ و هـەردوو رەگـەزی نێـرو مێـی بە سالاچـوو لـەو وولاتەدا و وولاتانی دیکە لە جیهان .
جێگـەی باسـکردنە کـە رۆژانــە و مانگانــە و سـالانە بەسـەدا ملیـار دۆلار لەکارەکانی سیخوری و شەرِو پێکداادان و داگیرکـردن و دروسـتکردنی چەك و عـەمبارکردنی چـەك لــە پێنـاو قـازانج لەلایـەن وولاتـانی سـەرمایەدار و توانـاداری ئـابووری خــەرج دەکرێــت ... کەچــی ئــەو بــرە پارەیــە بــۆ خزمـەتکردی مـرۆڤ لـە بوارەکـانی ژیان و تەندروسـتی و ئـازوەدان کردنـەوە خـەرج بکرێـت کێشەی هەمـە لایـەن و دژوارەکـانیش چارەدەکرێت دەبێتـە رێگەگر لە پێش مەرگەسات و کارەساتی مرۆڤایەتی لە جیهاندا .

٢٠٠٥/٦/١٢ گرێــدانی کۆبوونــەوەی پەرلـەمانی کوردستان بە ئامـادەبوونی کەسایەتی کــــوردی و ئێـــــراق و پارچـــەکانی دیکـــەی کوردستان وناوچــــەو هــــەرێم و جیهــــان و

نوێنــەرانی ئەمــەریکاو بــەریتانیاو کۆریــاو یەکێیــەتی ئــەوروپاو بــالوێزی نەتەوە یەکگرتووەکان ، کە لە وکۆبوونەوە مێژوویە بەرێز مەسعوود بارزانی بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردرا لە باشووری کوردستان .
بەلاّم نەك هەڵبژاردنی لە لایەن گەلی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بەلکوو بە رێگەی رێکەتن لە نێوان یەکیەتی و پارتی ، ئەویش بە دابەش کردنی دەسەلاّت و سامان و پارە لە سەر بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردستان ...؟...!.

٢٠٠٥/٦/١٧ هەڵبژاردنەکانی خولی یەکەمی سەرۆکایەتی کۆماری ئێران ئەنجام درا لە نێوان بیروبۆچوونی پارێزەران و چاکسازەکان ، کە دوو لابالی ئایینی و دەسەلاّتی ئسلامی و ئێران پێك دیێنیّ و دوور لە چارەسەری کێشەکان ، بە تایبەتی کێشەی کورد لە رۆژ هەلاّتی کوردستان .

٢٠٠٥/٦/١٩ بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردو دەسەلاّتە یەك لە دوای یەکانی ئێراق بەرێز مەسعوود بارزانی وتەیەکی بە نرخی بەرامبەر بە ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانی ئێراقی فیدرال خوێندەوەو کاردانەوەی بیّ وێنەی کردووەو دەکات، لە داهاتووی کوردو کوردستان و دەسەلاّتە داگیر کەرەکان و ناوچەو هەرێم و جیهاندا .

٢٠٠٥/٦/٢٠ ئۆتۆمبێلێکی مینکراو لە گۆرەپانی مشقی فێرکردنی پۆلیسی هاتووچۆ لە گۆرەپانی بەرێوەبەرایەتی هاتوو چۆی هەولێر خۆی خستە ناو جەنجاڵی دامەزرینەری پۆلیسی هاتووچۆ ، لە ئەجام بووە هۆی شەهید بوونی ٣٠ هاوولاّتی و زامدار بوونی ٦٠ هاوولاّتی زیاتر لە هاوولاّتی پارێزگاکە لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٥/٦/٢١ تیرۆر کردنی سکرتێری پێشووی پارتی کۆمۆنیستی لوبنان جۆرج حاوی لە بەیروتی پایتەختی لوبنان ، کە مرڤێکی نیشتمان پەروەری لوبنان و ناوچەو هەرێم و دۆست و لایەنگرانی ماڤ زەوت لێکراوبوو لە وولاّتەکەدا .

٢٠٠٥/٦/٢٤ لـه هەڵبژاردنەکانی خولی دووەمی سـەرۆکایەتی ئێـران – محەمـەد ئەحمەد نـەژادی – سـەرکەوتنی بە دەسـت هێنـان بـۆ پۆسـتی سـەرۆکایەتی ئیران ، کـە مرۆڤێکی توونـدڕەوی نەتـەوەیی و مەزهـەب شـیعەو دژ بەگـەلانی ئێـران ، بـە تایبـەتی گـەلی کورد لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردستان بوو... شایانی باسە ئەم مرۆڤـه توونـدڕەوە بکـوژی سـکرتێری پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات د. قـاسملو بـوو لـە شـاری ڤیـنا. هـەروا ئەنجامـدەری چەندین کـاری دیکـەی لـە هـەمان شێووە بووە لە ناوەوەو دەرەوەی ئێران .

تێبینی:– خوێنەری بەرێز نامەوێ وێنەکان دووبارە ببنەوە لـەبەر ئەوە لە گەڵ هەر مێژوویەك وێنە دانەنراوە.

٢٠٠٥/٧/٣ لە هەڵبژاردنەکانی پەرلـەمانی ئـەلبانیا پارتی دیموکراتی بە سـەرکردایەتی سـالح بریـشا سـەرکەوتنی بـە دەسـت هێنـا ، ئـەویش بـە پێـك هێنـانی حکوومەت لە ١٩ وەزیر ، کە ١٤ وەزیر لە پارتەکـەی بوو... سالح بریشا لـە دایك بووی شاری نزوبایایە لە ڕووی باکووری ئەلبانیا ، لە سەر کێشەی لـە گەڵ کۆسۆڤۆ بـە هـۆی خۆپیشاندان و مانگرتن لـە ساڵی ١٩٩٧ دەستی لـە کاری سەرۆکایەتی هەڵگرتبوو ، کە زۆرینـەی ئەندامانی پارتەکـەی لـە ٦٥٪ موسـڵمانەکانی بـاکووری ئـەڵبانیا بـوون ، کـە لـە باشـوور ٣٥٪ی دانیشتووانەکەی مەسیحین ، کە سەرچاوەی پارتی سۆشیالیستە و هەردەم کێشەوململانێی ئایینی ونەتەوەیی تیا بەردەوامە لە وڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/٧/٧ لە کاتی کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵەی وڵاتـانی زلهێـز لـە شـاری لەندەنی پایتـەختی بـەریتانیا ، چـەند تەقینـەوەیك ئەنجامـدرا لـە لایـەن تیرۆرسـتانی ئیسلامی توندڕەوی سەر بە ڕێکخراوی قاعیدە ، کە بووە هـۆی کوشـتنی زیاتر لە ٥٠ هاووڵاتی و زامدار بوونی زیاتر لە ٧٦ هاووڵاتی لە شارەکەدا .

٢٠٠٥/٧/٩ هێزەكانی سووپای ڕژێمی بەناو ئیسلامی ئێران ، لە ڕێگەی دامو دەزگای سیخووڕیو ئەمنی لە ناو شاری مەهاباد پەلاماری هاووڵاتی كورد شوانە سەید قادریانداو لە ئەنجام



بە ناشیرینترین شێووە شەهیدیان كرد ، دوایی لاشەكەیان لە ئۆتۆمبیل خستو بە ناو شار دەیانسووڕاندەوە ، كە بووە هۆكارێكی گرنگ لە هەستی نەتەوەییو نیشتمانی دانیشتووانو بەرپابوونی خۆپیشاندانو ڕاپەڕین لە شارەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستانی داگیركراوی ژێر دەسەڵاتی ئیران دژی ڕژێمی ئیرانو دامو دەزگاكانی مەلاكانو بەردەوام بوونی لە شارەكانی دیەكەی كوردستان .

٢٠٠٥/٧/١٠ هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی قرغیزیا ئەنجامدراو باكایف بە سەرەك كۆماری قرغیزیا هەلبژاردرا ، سەرەڕای تەزویر بە هۆی لایەنگیری ئەمەریكاو داوای كشانەوەی ١٠٠٠ سەربازی ئەمەریكای كرد ، كە لە خاكی وولاتەكەی بوو ، لە پێناو هێوركردنەوەی بارودۆخی وولاتو بەرهەڵستكاران لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٥/٧/١٦ سەرەك وەزیرانی ئێراق ئیبراهیم جەعفەری سەردانی كۆماری ئیسلامی ئێرانی كرد ، لە پێناو تاوتۆكردنی پەیوەندی دبلۆماسیو دراوسێیەتیو ئاگاداربوون لە ئاسایشی سنووری نێوان ئێراقو ئیران كە كەوتۆتە سەر زۆربەی خاكی باشوورو ڕۆژهەڵاتی كوردستان .

۲۰۰۵/۷/۱۸ کۆچی دوایی هونەرمەندی ناسراوی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان و مۆزیکاژەن – موژتەبای میرزادە – بە مالئاوایی کردن لە بواری مۆزیکا و هونەردۆستان و گەل و نیشتیمانەکەیدا .



جێگەی رونکردنەوەیە کە میرزادە لە سالی ۱۹٤٥ لە شاری کرماشان چاوی بەجیهان هەلهێناوە , هەر لە تەمەنی مندالیەوە لە گەل ئامێری مۆزیك ئاشنا بووە , ئەمەش بە هۆی گوێ گرتنی لە رادیۆ بووە , کە لە رێگەی ئەو گوێ گرتنە لە رادیۆ و گوێ لە ڤیزلۆنی هورنەمەندان مامۆستا خالید و پەروێزیاحەقی دەگرن .

لە سەرەتای دەست پێکردنی بە ئامێری نای بووەو دوایش بە ئامێری سەنتوور , دوای ئەوە بەهۆی کارلێکردنی ئاشنای مامۆستا حەسەن کامکاری باوکی کامکارەکان , میرزادە دوای گەرانەوەی لە شاری سنە لە گەلْ هونەرمەندی گەورەی کورد مامۆستا حەسەن زیرەك و مەزهەری خالقی و ئیبراهیمی خۆشناو مورتەزا توندرەو هاشمی رەبیعی ... بەلام دوای ئاشنابوون دەستی بە تۆمارکردنی چەندین بەرهەمی کوردس کرد , کە ئێستاش هونەری کوردس لە ئاستێکی بەرزدا دەینرخێنێ و وەك شانازیەکی نەمر لە میرزادەوە بۆ کورد گۆرانی و میوزیکی کوردی دەمێنێتەوە . میرزادە لە سالی ۱۹٦۷ چووە شاری تارانی پایتەختی ئێران و کتێبێکی نۆت خوێنی لە نووسینی – زیا موختاری – دەست کەوت ... بەم هۆکارە بەشێوەی سەرەتایی لەگەلْ نۆت ئاشنا بووە .

دوا بە دوای ئەمە و لە درێژەی هەولْ و تێکۆشانی زیاتر و وەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی مۆزیك ... بەردەوام نامەیەکی بە ناوی مۆزیکی ئێرانی دەخوێندەوە ، کە لە هەر هەفتەیەك نۆتەیەکی گۆرانی بلاودەکردەوە و ئیدی بەم شێوەیە مامۆستا موژتەبای میرزادە ئاوازی گۆرانیەکەی لە بەردەکر و

لەگەڵ نۆتەدا رادەهات ... بەو دەنگە بەرەبەرە خۆی فێری خودێندنەوەی نۆتەکرد .

مامۆستا میرزادە لە ماوەی ژیانیدا لەگەڵ ئامێرەکانی مۆزیك بەردەوام بوو بەسەرکەتووانە لە ئاهەنگە گۆرانیەکانی ئۆرکسترا و چەندین لایەنی دیکە بەردەوام بوو تاکو ماڵئاوایی لەبواری مۆزیك و هونەمەندان و گەل و نیشتیمان کرد لە رۆژهەڵاتی کوردستان .

سەرچاوە :- www.mojtaba-mirzade-tk

٢٠٠٥/٧/٢٠ لە ئەنجامی بەرزکردنەوەی نرخی سووتەمەنی لە کۆماری یەمەن ئەنجامەکەی بووە هۆی نارەزایی گەلانی یەمەن و بووە هۆی شەرو پێکدادان لە نێوان پارتە بەرهەڵستکارەکان و جەماوەرو هێزی چەکداری دەسەلات ، لە ئاکام بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٢٥ کەس و زامداربوونی بە دەیان کەسی دیکە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/٧/٢٣ لە ئەنجامی تەقینەوەی ئۆتۆمبیلێکی مینکراو لە هاوینە هەواری شەرمشێخی وولاتی میسر، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی زیاتر لە ٩٠ هاوولاتی و زامداربوونی بەدەیان هاوولاتی دیکە .

٢٠٠٥/٧/٢٨ کەشتی ئاسمانی ئەمەریکی دیسکەڤەری بە کەشتی ئاسمانی نێوودەوڵەتی لکێنرا ، لە پێناو ئەنجامدانی کارە زانستیەکانی لەگەردووندا .




٢٠٠٥/٨/١ شانشینی سعوودیە شانشین - فەهد عەبدول عەزیز - کۆچی دوایی کرد ، کە لە ماوەی دەسەڵاتی رامیاریەتی شۆڤینی نەتەوەیی توندرەوی عەرەب و مەزهەبی وەهابی ئایینی پەیرەو دەکرد .

دوای خۆی ئەمیر عەبدوللا جێگەی گرتەوە ، بە شانشینی سعوودیە ، کە جێگری شانشینی فەهد بوو بەر

لە مردنی لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/٨/١ ســەرۆکی بزووتنــەوی باشــووری ســوودان جــۆن گــەرەنگ لــە ئــەنجامی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە تایبەتیەکەی گیانی لە دەستدا ، لە دوای ئەوەی کە لە ٢٠٠٥/٧/٩ بووە جێگری یەکەمی سەرەك کۆماری سوودان عومەر حەسەن بەشیر.

٢٠٠٥/٨/١ دەســەلاتدارانی پۆلەنــدا هەلسان بەیادکردنەوەی / ٦٠ ساڵەی راپەرینەکەی گــەلی پۆلەنــدا دژی داگیرکــەرانی ئــەلمانیای فاشی لە وولاتەکەیاندا ... کــە ئــەو راپەرینــە لــە ١٩٤٤/٨/١ دەســتی پێکــردوو بــۆ مــاوەی /٦٣ رۆژ بــەردەوام بــوو دژی هێزەکــانی ســوویا و دەسەلاتدارانی ئەلمانیای نازی لە سەر پۆلەندا .



هەروا راوێژکاری ئەلمانیا – گیرهارد شرۆردەر – بۆ یەکەم جار بەشداری لەو رێو رەسمەدا کرد ... هەروا لە هەمان کات بەردی بناخەی نوێ کردنەوەی ئەو سەربازگەیە درا کە ئەو جێگایە بوو راپەرینەکەی بێ ئەنجامدرا لە ٨/١ ... هەروا سەرۆك و نوێنەری وولاتانی دۆست و جیهان بەشداریان لەو ئاهەنگە کرد ... لەوانە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا – کۆلن باول – و – جێگری سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – ژۆن برسکون ... دوای ئەوەش لە ٢٠٠٥/١١/٢٥ حکوومەتی پۆلەندا نهێنیەکانی پەیمانی وارشۆری بە پەلاماردان و لە ناوبردنی ئەوروپای بەچەکی ئەتۆمی ئاشکرا کرد ... کە سۆڤیەت سەرکردایەتی پەیمانی وارشۆی دەکرد لە پێك هاتووی وولاتانی سۆشیالیست لە جیهان .

٢٠٠٥/٨/١ خەلاتی باشترین رۆژنامەوانی لە جیهان رایگەیاندا ، کە وێنەیەکی دایكو منداڵەکەی بوو لە یەکێك لە بنکەکانی خێرخوازی لە وولاتی نیجیر ، کە

لەلایەن رۆیتەرز گیرابوو ، کە خەڵاتی باشترین وێنەی ساڵی ٢٠٠٥ بەدەست هێنا ، کە ئەم وێنەیە لە لایەن وێنەگری کەنەدی - ڤبنیا نۆریل — لە باکووری رۆژئاوای وڵاتەکە گیرا کە منداڵێك تەمەن یەك ساڵ بوو ، لە برسان بە پەنجە لاوازەکانی دایکی بە لێوەکانی دەگوشێت ، واتە دەی خوارد لە برسان .

٢٠٠٥/٨/٣ خۆپیشاندانێکی گەورە لە شاری سەقزی رۆژهەڵاتی کوردستانی لکێنراو بە ئێران ئەنجامدرا ، بۆ پشتیووانی لێکردنی جەماوەری شاری مەهاباد ، کە لە ئەنجام بووە هۆی شەهید بوونی ٥ هاووڵاتی کورد لە لایەن هێزە ئەمنیەکانی رژێمی بە ناو ئیسلامی ئێران و بە سەدا هاووڵاتی دەستگیر کران ، بەهۆی تیرۆرکردنی شوانە سەید قادر لە شاری مهاباد ، لە لایەن سیخوورەکانی رژێمی ئێران .

٢٠٠٥/٨/٣ مەحمودی ئەحمەد نەژاد بە سەرۆکی کۆماری ئێران هەڵبژێردرا بە خواردنی سووێندنی یاسایی کە مرۆڤێکی توندرەوی نەتەوەیی و ئاینی بوو لە وڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/٨/٦ وەزیری دەرەوەی پێشووی بەریتانیا -رۆبن کۆك - کۆچی دوایی کرد کە بەرهەڵستکاری تۆنی بلێر بوو بۆ لێدانی رژێمی بەعس لە ئێراق.

٢٠٠٥/٨/٧ کەشتی ئاسمانی ئەمەریکی دیسکەڤەری لە دوای ئەنجامدانی کارەکانی لە وێستگەی نێوودەووڵەتی جیابووەوە بە مەبەستی گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی لە گەردووندا .

٢٠٠٥/٨/٨ مەکوکی ئاسمانی ئەمەریکی دیسکەڤەری بەرەو زەوی هاتە خوارێ کە ماوەی سیانزە رۆژ لە گەردوون کارەکانی ئەنجامدا .

٢٠٠٥/٨/١١ ســەرۆکی رێکخــراوی شۆرشــی بــاڵای ئیسلامی لە ئێراق عەبدولعەزیز حەکیم لــە ووتەیــەکی بــە بۆنــەی یادکردنــەوەی شــەهید بــوونی براکــەی محەمــەد بــاقر حــەکیم ، داوای دامەزرانــدنی هــەرێمی فیدڕاڵی لە باشوورو ناوەندی ئێراق کرد ، هــەروا داوای کــرد کــە ئــایینی ئیسلام دەبــیٚ سەرچــاوەی ســەرەکی یاســاو رێنمایــەکانی دەســتووری هەمیــشەیی ئێراق بێت .



٢٠٠٥/٨/١٢ سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تــەیب ئۆردگـــان – ســـەردانی پارێزگــاری دیاربــەکری کــردو لــە ووتەیەکیدا بەرامبەر بە جەماوەری شــارەکە رایگەیانــد ، بــە بــوونی کێشەی نەتەوەیــەکی داگیر کــراوی کــورد لــە بــاکووری کوردســتان ، گــووتی: کە کێشەکە بەندە بە رژێمــی تورکیا و چارەســەرکردن ، کــە ئەمــە یەکــەم جــارە لــە مێــژووی دەســەڵاتدارانی تورکیــان دان بــە بــوونی کــوردو کوردستان و کێشەکە بێنن لە پایتــەختی باکووری کوردســتانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا .



٢٠٠٥/٨/١٤ لــــە راگەیانـــــدنێکی ســــەرۆکی پێـــشووی جووڵانەوەی هاوکاری لە پۆڵەنــدا – لــیخ فالیسا – پـــشتگیری خـــۆی بـــۆ بــەرپابوونی شۆرشــێکی بــــــــــــەردەوام و

سەرکەووتوانە کرد لە ڕووسیای سپی کە دراوسێی پۆڵەندایە ... ئەمەش لە چاوپێکەوتنێك لـە گـەڵ کـەناڵی ئاسمانی بی بی سی بوو بە بۆنـەی ٢١/ ساڵەی دامەزراندنی جووڵانەوەکە هات .

هـەروا گـووتی:- ڕووسیای سپی پشتگیری وولاتـانی رۆژئـاوای پێویـست نیـە بـەڵکوو دەبـیٚ گـەلانی ڕووسـیای سـپی لـە خـەبات بـەردەوام بـن بـۆ گەیانـدنیان بـەم ئاواتـە ... هـەروا جووڵانـەوەی هاوکـاری و یـەکگرتن لـە پۆڵەنـدا بەسـەرکردایەتیلیخ ڤالیسا تـووانی یەکـەم رژێمـی کۆمۆنیـستی لـە سـاڵی ١٩٨٩ هەڵووەشـێنێتەوە ، کـە یەکـەم وولاتـی کۆمۆنیـستی بـوو لـە ئەورووپای رۆژهەلاتدا.

ئـەویش بـەر لـە رووخانـدنی پـەرژینی نێـوان هـەردوو بـەرلینی رۆژئـاواو بـەریلینی رۆژهـەلات ... ئەمـەش وای کـرد کـە ڤالیسا ببێتـە سـەرکردەیەکی لێهاتوو لە جیهان ... هەر بەم بۆنە لـە سـاڵی ١٩٩٣ پاداشتی نۆبڵی ئاشتی پـیٚ بەخشرا ... دوای ئـەوە لـیخ ڤالیسا بـووە سـەرۆکی پۆڵەنـدا و بـەردەوام بوو لە دەسەلاتەکەی تا ساڵی ١٩٩٥ لە سەر وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/٨/١٤ گـەورەترین خۆپیـشاندان لـە شاروشارۆچـکەکانی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ئەنجامـدار بـە سەرپەرشـتی رێکخـراوی ریفرانـدۆم ، لـە پێنـاو پـشتگیری کردنـی سـەرکردایەتی کـورد لـە شـاری بەغـدا ، لـە پێنـاو چەسپاندنی داواکاریەکانی کورد لـە دەستنووسـی دەستووری هەمیشەیی ئێراقی فیدراڵ لە ئێراقدا .

٢٠٠٥/٨/١٤ لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی فرۆکەیـەکی قووبرسـی لە ناوچەی قرتابای رۆژهـەلاتی ئەسـینا ، کـە بـووە هـۆی مردنـی ١٢٠ کـەس لەوانـەی لـە نـاو فرۆکەکە بوون لەگەڵ تێکشانی فرۆکەکە .

٢٠٠٥/٨/١٥ لە دوای داگیر کردنی کەرتی غەزەی فەڵەستین لە ماوەی/ ٣٨ ساڵ لـە لایـەن رژێمـی ئیـسرائیل ، لـە دوای هـەوڵو مانـدبوونو قوربانیـدانو شـەڕو پێکدادانو بە بژێوانی رێکخراوی نێوودەووڵەتی .

بـە تایبـەتی ئەمـەریکا ، کـە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هێزەکـانی سـووپای ئیسرائیل لە کەرتی غەزە بکشێنەوە بەچۆڵ کردنـی کـەرتی غـەزە ، بەلام لە لایەکی دیکە ئیسرائیل هـەر کـاتیٚ بیـەوی دەتـوانیٚ وەك جـاران بگەڕێتـە وە جێگەی خۆی لە شارەکەدا .

٢٠٠٥/٨/١٥ کاتـژمێر /١١ی شـەو کۆمەڵـەی نیـشتیمانی کۆبوونـەوەی ٥٥ی تایبـەتی ئەنجامدا ، بە هـۆی تـەواوبوونی مۆڵـەتی بەردەوامی دەسـەڵاتی کۆمەڵـە بە پێی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی ئێراق و نەگەیشتن بە ئـەنجامی رێکـەوتن لـە سـەر رەشنووسـی دەسـتووری هەمیـشەیی، ئـەویش بـە گـۆڕینی بڕگـەی دەسـەڵاتی کۆمەڵـە لـە مـاوەی ١٥ بـۆ ٢٢ رۆژ ، لـە پێنـاو تـەواوکردنی دەستووری هەمیشەیی بۆ وولاتەکە .

٢٠٠٥/٨/١٦ لە ئـەنجامی کەوتنـە خـوارەوەی فڕۆکەیـەکی کۆڵـۆمبی لـە دووری باکووری رۆژئاوای فەنزویلاو لە وولایەتی – زولیا – کە بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ١٥٢ هاووڵاتی ناوفڕۆکەکە.

٢٠٠٥/٨/١٦ پـەردە لـە سـەر ئـەو سـەفینەیە هـەڵگیرا ، کـە بـە ١٥ ملیـۆن داروچـەکەی ئێـسکریم دورسـت کرابـوو لـە لایـەن – رۆبـەرت باکدۆناڵـدا – لـە شـاری ئەمستردام لە ماوەی دوو ساڵ کە درێژی سەفینەکە ١٥ مەتر بوو.

٢٠٠٥/٨/١٨ گەورەترین پێشبڕکێ – مانۆر – هێـزی سـەربازی ڕووسـیاو چینی میللی ئەنجامدار ، کە لە مێژووی هەردوو وولات بێ وێنە بوو ، کە بۆ یەکـەم جار بەم شێووەیە ئەنجام بدرێت ، کە ١٠ دە هـەزار سـەرباز لـە هەرسێ لایـەنی پیـادەو دەریـایی و ئاسمـانی سـەربازی بـەڕێووە ببرێـت بـە نـاوی ئاشـتی ٢٠٠٥/.

٢٠٠٥/٨/٢٢ کاتـژمێر ١١,٥٥ دەقیقە لایەنـە نەتـەوەیی و رامیـاری و ئـایینی و مەزهـەبی و زانـستی ، رەشنووسـی دەسـتووری هەمیـشەییان پێـشکەش بـە کۆمەڵـەی نیشتیمانی ئێـراق کـرد ، سـەرەڕای چـەندین کـەم و کـوڕی لـە وردەکـاری لـە چـەند مـاددەو بڕگەیـەك وخاڵ ، لـە بەنـدە بنەڕەتیـەکانی دەسـتوورەکە ، بـە تایبەتی لە بارەی سێ لایەنی گرنگ ، ئەویش فیدراڵی و داهـات و ناسـنامەی ئێراقی فیدراڵی داهاتوو لە هەرێمدا .

٢٠٠٥/٨/٢٣ لـە کۆدەتایـەکی سـەربازی لـە مۆریتانیـا دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت و لێژنـەی سەربازییان پێك هێنان ، لە پێناو بەڕێوەبردنی کاروباری وولات ، بۆ ماوەی دوو ساڵ بەلابردنی معاویە ولی ، کە لـە سـاڵی ١٩٨٤ تـاکو رۆژی کودەتاکە دەسـەلاتدار بـوو، کـە ئـەویش لـە رێگـەی کودەتـای سـەربازی دەسـەڵاتی گرتبووە دەست لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٥/٨/٢٤ ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی ئێراقی فیدراڵی لە لایەن پەرلەمانی کوردستان پەسەند کرا ، لە دوای چەند تێبینیەکی پەرلەمان لە سەر دەستوورەکەو وەردەکاریەکان .

٢٠٠٥/٨/٢٥ زانای ئەمەریکی لە زانکۆی واشنتۆنی پایتەخت – ئۆبك ترینکۆس – لە لێدوانێکیدا لەدوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر لە پەرەسەندن و گەشەکردن و پێشکەووتنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، ئەویش بە لە بەرکردنی – پێڵاو – لە نێوان ساڵەکانی ٢٦ هەزار ساڵ و ٤٠ هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ... کە ئەم زانایە توویژینەری زانستیەکانی مرۆڤایەتی گووتی :–

لە ماوەیەکی دووروو درێژی رابردوو پەنجەو پێیەکانی مرۆڤ لاواز بوونە بە هۆی بروابوونی بە هۆکارە دەرەکیەکان لە سەر باری دەروونی ئەو کات و پەرەسەندنی ئێسقانە جۆراوجۆرەکانی جەستەی مرۆڤ بەرەو بەهێزبوون و پتەوبوون هەنگاوی دەنا لەگەڵ پەرەسەندنی کارە پێویستیەکانی ژیان .

مرۆڤی سەرەتایی هەستی دروستکردنی پێڵاویان نەبووە بەڵکوو قاچ و پەنجەکانیان بە پەلکەدار دادەپۆشی بۆ ئەوەی لە ساردی و گەرمی ئازار نەخوات ، لەگەڵ پێستی ئاژەڵ ، کە ئەو پێ داپۆشینەش بەتایبەتی بە پێستی ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتەکەیان دەخوارد لە شێووەی پێڵاو بەر لە ٥٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا بەکاریان دەهێنا.

هەروا زانای بەناوبانگ – ترینکۆس – بۆ یەکەم جار مرۆڤایەتی پێڵاوی کردۆتە بەر بەر لە ٩٠٠٠ هەزار ساڵ بووە ، بەڵام ئەم پەرەسەندنەش سەرەتای دەگەرێتەوە بۆ ٣٠,٠٠٠ هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ... ئەم کارەش بۆتە بازدانێك لە هەستی رۆشنبیری مرۆڤایەتی بەر لە ٣٥ هەزار ساڵ بە پەرەسەندن و گەشە کردنی جەستە و دروستکردنی جل و بەرگ و کشتووکاڵ و خانوو چەکی بەرگری کردن لەخۆو بازرگانی بە تایبەتی لە سەر خاکی کوردستان

٢٠٠٥/٨/٢٥ ئەمینداری گشتی کۆمکاری عەرەبی– عەمروو موسا –و سەرۆکی ئەنجوومەنی هاوکاری کەنداو بە ناوی عەرەبی دژی ماددەکانی ناسنامەو ئایین و ئیسلامی ئێراق وەستان و بە دوا رۆژی مەترسیداریان دانا بۆ ئێراق

٢٠٠٥/٨/٢٨ کۆتایی بە نووسینەوەی دەستنووسی ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی

ئێراقـی فیـدراڵ هێنـدرا ، بـه مـۆركردنی لـه لایـه‌ن لیژنــه‌ی نووسـینه‌وه‌ی ده‌ستوورو بێ ده‌نگی له سه‌ر هه‌ندێ مادده‌و بڕگـه‌و خـاڵ ، به ئاماده‌كردنی بۆ ده‌نگدان له سه‌ری له ٢٠٠٥/١٢/١٥ له لایه‌ن گه‌لانی ئێراق .

٢٠٠٥/٨/٢٩ مامۆســـــتای نووســـــه‌رو ڕۆنـــــاكبیرو كه‌ســـــایه‌تی نـــاوداری كـــوردو ئـــایینی مامۆســـتا – عه‌بدولكـــه‌ریم موده‌ڕس– لـه شاری به‌غدا كۆچـی دوایـی كـرد ، كـه لـه سـه‌ر ته‌ریقـه‌تی قادریـه بـوو ، لـه مه‌زارگـه‌ی شـێخ عه‌بـدولقادری گـه‌یلانی لـه شاری به‌غدا .



مامۆستا مـه‌لا عه‌بدولكـه‌یم لـه مـاوه‌ی ژیانیـدا توانیوویـه‌تی خزمـه‌تی زمـانی كـوردی بكـات لـه نووسـینه‌كانیدا لـه بـواری دانـان و وه‌رگێـران . هـه‌روا لـه بواری ئه‌ده‌ب و زانست و زانستی ئاینیدا .

٢٠٠٥/٨/٢٩ گه‌وره‌ترین لافاوو زریانی بـاو بـاران لــه ناوچــه‌ی كاترینـــای ئه‌مـــه‌ریكی روویـــدا ، كــه بــه یه‌كــه‌م كاره‌ســـاتی زریـــان لـــه مێـــــژووی ئه‌مـــــه‌ریكا داده‌نرێت ، كه بووه هـۆی كـوژرانی بـه سـه‌دان هـاوولاتی و ده‌ربـه‌ده‌ر بـوونی بـه سـه‌دان هـه‌زارو گــه‌مارۆدانی ئــاوی و ژێــر كــه‌وتنی ســامانێكی زۆر لــه نــه‌وت ســامانی هاوولاتیان ، له خانوبه‌ره‌و كێڵگه‌ی كشتووكاڵ و پیشه‌سازی و بازرگانی و به سه‌دان پرۆژه‌و كۆمپانیاو كارگه‌ی هه‌مه‌جۆر له هه‌رێمه‌كه‌دا .



٢٠٠٥/٨/٣١ گرێـدانی یه‌كـه‌م كۆبوونـه‌وه‌ی په‌رلـه‌مانی سـوودان لـه‌دوای كۆتـایی هـاتن



بەشەڕی ناووخۆی سوودان .
لـە نێـوان حکوومـەتی سـوودان و جووڵانـەوەی مللـی لـە باشـووری سـوودان ... لـەو کۆبوونەوەیـەدا ئەنـدامانی پـارتی کـۆنگرەی نیـشتیمانی دەسـەڵاتدار پۆسـتی سەرەك ئەنجوومەنی سوودانیان هەڵبژارد .
هـەروا ئەنـدامانی پەرلـەمان کـە پێـك هـاتووە لـە ٤٥٠ ئەنـدام و جێگـری سەرۆکی پەرلەمانیان لە جووڵانەوەی مللی بۆ بازرگانی سوودان هەڵبژارد .
ئەمەش بە پێی ڕێنمایەکانی هاوبەشی لەدەسەڵات ، کە لە ڕێکەووتننامـەی ئاشـتی لـە نێـوان باکوور و باشـوور مۆرکرابوو ... سـەرەرای ئـەوەش پارتـە رامیاریـە بەرهەڵـستکارەکان دەسـەڵاتی سـوودانیان پـشتگووێ خـراوون بـە کۆتایی هاتنی باری نا لە بار لە سوودان .
دوای ئەوە حکوومەتی هاووپەیمان و هاووبەشیان پێك هێنا لە ٣٠ وەزیرو ٣٤ وەزیری دەووڵەت .
هەروا ئەو کێشەی لە سەر وەزیری ووزە و ئاسن هـەبوو چارەسـەرکرا ، کە هەر ئەمەش ببووە هۆی دواکەووتن لە ڕاگەیاندنی کابینەی حکوومەتەکە لـە سوودان .
ئەمەش لەدوای کووشتاری زیـاتر لـە ٣٠ هـەزار کـەس هـات کـە سـەرکردەی جووڵانەوەکـە – سـالفاکیر – پۆسـستی جێگـری سـەرۆکی سـوودانی گرتـە دەست و بەڵێنی دا بەچارەسەرکردنی کێشەکان بە جیٚ بـەجێکردنی مـادە و برگەکانی ڕێکەووتنەکە و ووڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/٨/٣١ لە ئـەنجامی رووخـان و تەقینـەوەی پـردی – ئەلئەئیمـە– لـە شـاری بەغـدا لـە گـەرەکی کازمیـە لـە لایـەن تیرۆرسـتانی ئیـسلامی تونـدرە ، کـە بووە هـۆی شـەهید بـوونی زیـاتر لـە ١١٥٠ هـاووڵاتی لـە ژن و منـداڵ و گـەنج و پـیرو زامداربوونی زیاتر لە ٣٠٠ ، ئەویش لەکاتی سـەردانی مـەزاری ئیمـام کـازم بە بۆنەی شەهید بوونی.

٢٠٠٥/٩/٤ کـوردە دانیـشتووانەکانی پارێزگـای ئەسـتەنبوڵ تورکیـا خۆپیـشاندانێکی

گەورەیان ئەنجامدا ، دژی ڕژێمی تورکی داگیرکەر بە لایەنگیری کردنیان لە پارتی کریکانی کوردستانی لکێنراو بە تورکیا PKK لە باکووری کوردستان.

٢٠٠٥/٩/٥ لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی فرۆکەیەکی مەدەنی ئەندەنۆسی لە ناوچەیەکی پڕ لە دانیشتووان لە میدانی باکووری سوومەتری کە بووە هۆی کوژرانی ١٤٧ هاوولاتی ناو فرۆکەکە .

٢٠٠٥/٩/٧ بۆ یەکەم جار لە مێژووی میسر هەڵبژاردنی دیموکراتی فرەلایەنی پەرلەمانی میسری ئەنجامدرا ، لە نێوان پارت و ڕێکخراوو گروپە زانستی و کۆمەلایەتی و ئایینەکان ، بە تایبەتی لە نێوان پارتی سەرەك کۆماری میسری محەمەد حوسنی موبارەك وپارتی وەفدی میسر لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٥/٩/٨ لە دوای گەیشتنی سەرۆك کۆماری لە ئیراق مام جەلال بۆ ئەمەریکا لە ڕۆژنامەوانیەکی هاوبەشی لەگەڵ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش چەندین لایەن باس کرا ، لە سەر بارودۆخی ئێراق و ناوچەو هەرێم و جیهان و هەڵسەنگاندنی ، کە لەوکاتە رادیۆی کوردی دەنگی ئەمەریکا بە کوردی پرسیاری لە مام جەلال کرد ، بەرامبەر جۆرج بۆش و پەیامنێران و شاشەکانی تەلەفزیۆن و جیهان و بە زمانی کوردی وەلامی پرسیارەکانی رادیۆی دەنگی ئەمەریکای دایەوە لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانیەکەدا.

٢٠٠٥/٩/١١ هەڵبژاردنی پەرلەمانی یابان ئەنجامدرا لە نێوان پارتی دەسەلاتدار بە سەرکردایەتی جۆنیشیرو کۆیزۆمی و پاراتی دیموکراتی یابان بە سەرکردایەتی کاتیسۆیا ئۆکارا... لە ئەنجام سەرەك وەزیرانی یابان کۆیزۆمی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

شایانی باسە سەرەك وەزیران لە ٨/٨ هەمان ساڵدا پەرلەمانی یابانی هەڵووەشاندەوە ، لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی پرۆگرامی باشتر لە بەرەو پێشبردنی باری وولاتەکەی ، بەتایبەتی لە بواری ئابووری و بەهێز کردنی

ژێرخانی ئابووری یابان .

٢٠٠٥/٩/١٤ تەقاندنەوەی ئۆتۆمبیلێكی مین كراو لە شاری بەغدا لە گەرەكی كازمیە ، كە بووە هۆی كوژرانی زیاتر لە ١٥٠ كەس و زامداربوونی زیاتر لە ٧٥ كەس و وێرانكردنی دەیان ئۆتۆمبێل و دوكان و خانوو كەلوپەلی دیكە ، جگە لە كارە تیرۆرستیەكانی دیكە لەناوچە جیا جیاكانی ناوەندی شاری ئێراق .

٢٠٠٥/٩/١٤ كردنەوەی دانیشتنی یەكەمی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٦٠ ساڵ بە سەر دامەزراندنی ، كە ١٧٠ سەرۆك وولات و حكوومەت لە جیهان بەشداریان تێدا كرد ، لەوانە مام جەلال سەرەك كۆماری ئێراقی فیدراڵ ، ئەویش لە پێناوی دانانی لێژنەیەكی ئاشتی لە پێناو چارەسەركردنی كێشەی نەتەوەیی و رامیاری و ئابووری و فراوانكردنی ژمارەی ئەندامانی هەمیشەی رێكخراوكە ، بریاری قەدەخەكردنی كردن بە بلاّبوونەوەی چەكی ئەتۆمی راگەیاندرا بە هەموو جۆرەكانی ، بەربەرەكانی و گەمارۆدانی تیرۆرستان بە هەموو توانایەك لەجیهاندا.

٢٠٠٥/٩/١٥ سەرۆك كۆماری ئێران مەحمودی ئەحمەدی نەژادی لە شاری نیویۆركی ئەمەریكا گووتی: ئێران ئامادەیە زانستی ئەتۆمی بەدەوڵەتە ئیسلامیەكانی دیكە بدات... دوای دوو ڕۆژ لەو لێدوانەی بە نەتەوە یەكگرتووەكانی ڕاگەیاند ، كە ئێران بە هیچ جۆرێك دەست بەرداری پرۆسەی پیتاندنی یۆرانیۆم نابێت و دەووڵەتانی دیكەی بانگ كرد ، كە ببنە هاوبەشی بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆمی ئێران .

٢٠٠٥/٩/١٥ بــۆ یەکــەم جــار لــە مێــژووی کوردســتان و پارێزگــای هــەولێری پایتــەختی باشــووری کوردســتان ، لــە لایــەن بەرێز مەسعوود بارزانی پیــشانگای بازرگــانی هــەولێری نێوودەوڵــەتی کرایــەوە ، کــە زیــاتر لــە ٧٠ کۆمپانیــای ئێراقــی و جیهانی و بیانی بەشداریان تێدا کردوو لە هەمان کاتدا کۆنگرەیەك لە لایەن بەشــداربوانی پیــشانگاکە گرێــدرا بــە ئامــادەبوونی شــارەزاو زانایــان لــەو بوارەدا .

٢٠٠٥/٩/١٥ لــە کۆبوونــەوەی ئەنجوومــەنی گــشتی نەتــەوە یــەکگرتووەکان مــام جــەلال سەرەك کۆماری ئێراق وتەیەکی لە کۆبوونەوەکە خوێندەوە بۆ یەکەمجار لـە مێژووی کوردو نەتەوە یەکگرتووەکان بە زمانی کوردی وتـە بخوێندرێتـەوە کـە رۆڵ و کاردانـەوەی باشـی کـردە سـەر وولاتـانی جیهـان و بـەرەو باشـتری داهاتووی گەلی کوردستان.



٢٠٠٥/٩/١٨ کاتــژمێر ١١ی ســـەر لـــە بـــەیانی هونەرمەندی ئافرەتی دیارو بەتوانای کــورد خــاتوو مەرزیــە فــەریقی بــە نەخۆشــیەکی کوشــندە لــە دوای نەشتەرگەری لە وولاتی سووید دڵە بە سۆزەکەی لـە کـار وەسـتاو ماڵئـاوایی لەگەڵ و نیشتیمان کرد ، تەرمەکەی بە ئەمانـەت لـە شـاری سـلیمانی بەخاك سپێردرا ، بەهۆی ناله باری باردۆخی رۆژهــەلاتی کوردســتان ، چــونکە هونەرمەنــد لــە دایــك بــووی شــاری مەریوانی رۆژهەلاتە .

٢٠٠٥/٩/١٨ هەڵبژاردنەکانی نا ئاسایی پەرلەمانی ئەڵمانیای یەکگرتوو دەستی پێکرد ،

لە نێوان راوێژکاری ئەڵمانیا گرهایدەر شرۆیدەرو باڵێوراوی پارتی دیموکراتی مەسیحی ئەنگیل ماریکل ، بە هۆی نالە باری بارودۆخی ئابووری‌و چەندین کێشەی دیکە لە ناوەندەکانی دەسەڵاتی ئەڵمانیا.

٢٠٠٥/٩/١٨ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کۆماری ئیسلامی ئەفگانستان ئەنجامدرا لە دوای ٣٦ ساڵ ، کە بە هەڵبژاردنێکی دیموکراتی دادەنرێت لە نێوان پێکهاتەی گەلانی ئەفگانستان.

٢٠٠٥/٩/١٨ سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆردۆگان لە سەردانێکی گەیشتە وولاتی سعوودیەو لەلایەن شانشین عەبدوللا پێشوازی لێکراو دوای دەستکرا بەگۆڕینەوەی بیروربۆچوونیان ، لە بارەی بارودۆخی ئێراق‌و ناوچەو هەرێمەکە ، بە تایبەتی باری ئێراق ونیمچە دەسەڵاتی کوردی ، لەو کاتەی کە بۆتە مەترسیەکی گەووەرە سەر دەسەڵاتیان‌و شەڵەژاندنی ناوچەکە بەرەو دابەش بوون‌و گۆرانکاری نەخشەی رۆژهەڵاتی ناوەراستی گەوورەو ئەفەریکیا .

٢٠٠٥/٩/١٩ پەرلەمانی تورکیا کۆبوونەوەی نا ئاسایی گریدا ، شایانی باسە دوای دانپێدانانی رەجەب تەیب ئۆردۆگان بە بوونی کێشەی کورد ، کە ئێستا دۆسیەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە باکووری کوردستان بەراشکاوانەتر لە سەر ئاستی تورکیا لە لایەنە پەیوەندارەکان وتووێژی لە سەر دەکرێت‌و لە هەمان کات بۆتە کێشەی نێوودەووڵەتی ، بە تایبەتی لە لایەن یەکیەتی ئەورۆپادا .

٢٠٠٥/٩/١٩ کۆبوونەوە شەش قۆڵیەکەی هەردوو کۆریا ، چین ، ئەمەریکا ، یابان ، رووسیا،. هەر لە دوای رێکەوتن لەو کۆبوونەوەیە گەیشتنە دەرگایەکی داخراو... هەوڵدانی بیونگ یانگیش بۆ رازیبوون لە سەر



ڕێككـەوتن داواكاریـەكانی زیـادكرد ، هـەر بۆیـە ئەمەریكیـەكان ناچاربوون ڕەتی بكەنەوە .

ڕژێمی كۆریای باكووریش سوورە بوو لە سەر ڕەتكردنەوەی درێژە پێدانی ووتوو وێژ هەتا ئەوكاتەی ئەمەریكا گەمارۆكانی لە سەر هەڵدەگرێت ... كە ئـەم گەمارۆیانـەی ئەمـەریكاش پێویـستی بـە ڕەزامەنـدی ئەنجوومـەنی ئاسایشی نێوودەووڵەتی نیە.

شایانی باسە ئەم كێشەیە بەردەوام بووە تا كۆتایی٢٠٠٦، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵـەكان بـەردەوامن ، لـە پێنـاو گەیشتن بـە چارەسـەركردنی ئـەو كێـشە دژوارە لـە هـەموو لایەنـەكانی ، بـە تایبـەتی لەلایەنـە پەیوەنـددارەكان بـە پشتیووانی ڕێكخراوی نەتەوەیەككرتووەكان .

٢٠٠٥:/٩/١٩ لە شاری برۆكسلی پایتەختی بەلژیكا كۆنگرەكە بە ناونیشانی یەكیـەتی ئەوروپاو توركیاو كورد لە كوردستانو بە تایبـەتی لـە باكووری كوردسـتان گرێـدرا ، كـە لـە كۆنگرەكـە نوێنـەری حكوومـەتی هـەرێمی كوردسـتان بەشداری تێدا كردو پشتگیری خۆی بۆ بە ئەندام بوونی توركیا لە یەكیـەتی ئەوروپا ڕاگەیاند .



٢٠٠٥/٩/٢٠ وەزیـــری دەرەوەی شانـــشینی سعوودییە – ئەمیر سعوود فەیسەڵ – لـــە لێـــدوانێكی بەرامبـــەر ئەنجوومەنی پەیوەندیەكانی دەرەوە لــە شــاری نیۆیــۆركی ئەمــەریكی گووتی:-

ئێستا ئێراق بە قۆناخێكی ناسكو گرنگـــدا تێدەپـــەڕێو ئەگـــەری هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆیی هەیە ، بە تایبەتی لە نێوان هـەردوو مەزهـەب شیعەو سوونە ، لە لایەكو لە نێوان كوردو عەرەب لەلایـەكی دیكە ، ئەمـەش كە دەبێتـە هـۆی دەسـت تێـوەردانی دەووڵـەتی توركیـاو عـەرەبیش دەست بەردار نابێت لەو كاتەی كورد بیەوێ دەووڵەتی سەربەخۆ ڕابگەیەنێ .

گەرچی شانشینی سعوودیەو وولاتانی دیكەی عەرەبی سەرچاوەی یارمەتی دانی تیرۆرستانی ئیسلامی توندرەوی عەرەبن بە پارەو كەل وپەل ... بەلام بەرامبەر بە ئیسرائیلیش زیاتر لە نیوو سەدەیە هیچیان پیّ نەكراوە لە هەریّم و ناوچەكەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٠ یەكەم فرۆكەی گەشتی ئاسمانی گواستنەوە لە فرۆكەخانەی هامبۆرگی نیّوو دەوولەتی ئەلمانیا لە فرۆكەخانەی هەولیّری نیّوودەوولەتی لە هەریّمی باشووری كوردستان نیشتەوەو گەشتەكانی بەردەوامە لە نیّوان هەولیّرو ئەلمانیادا .



٢٠٠٥/٩/٢٠ دەسەلاتی كۆریای باكوور بریاری راگرتنی بەرهەم هیّنانی چەكی ئەتۆمی راگەیاند ، بەهەلّوەشاندنەوەی دروستكراوەكانی چەكی ئەتۆمی بە مەرجیّ پەلاماری وولاتەكەی نەدریّت لە لایەن ئیدارەی ئەمەریكاو یارمەتی بدریّت لە نەوت و پیّداویستیەكانی كۆریا ، لە هەمان كات پیّدانی پیّویستەكانی شلەی ئەتۆمی ئاشتی ، ئەوەش چینی میللی رۆلّی هەبوو لە لایەنگیری كۆریاو دلّنیا كردنەوەی ئەمەریكا لە دوورگەكەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٠ لە كۆنگرەی دووەمی نیّوودەوولەتی لە بارەی توركیاو یەكیەتی ئەوروپاو كورد - میگلان سكۆبە -ی جیّگری سەرۆكی پەرلەمانی ئەوروپا لە وتەكەیدا رەخنەی لە رامیاریەتی توركیا گرت ، كە بەرامبەر بە كورد لە باكووری كوردستان و گەلانی دیكە لە توركیا دەیكات.

٢٠٠٥/٩/٢٠ لە شاری خەرتومی پایتەختی سوودان و لە دوای زیاتر لە ٢١ سالّ لە شەرو پیّكدادان و ویّرانكردنی ژیّرخانی ئابووری و لیّكترازانی پەیوەندی كۆمەلایەتی و رامیاری نەتەوەیی ، هەلّسان بە راگەیاندنی یەكەم حكوومەتی نیشتیمانی لە دوای ئاشتبوونەوە لە نیّوان دەسەلاتی ناوەندی سوودان و جوولانەوەی میللی لە باشووری سوودان بەسەركردایەتی جۆن گەرەنگ لە باشووردا.

تێبینی:- وێنەکان دانەنراون لەبەر دووبارە بوونەوەیاندا .

٢٠٠٥/٩/٢٢ فیستڤالی رۆشنبیری لە شاری دهۆك لە هەرێمی باشووری کوردستان گرێدرا ، بە ئامادەبوونی نوێەرایەتی کوردی هەر چوار پارچەو چەندی کەسایەتی دیکە لە رۆشنبیرانی ناوچەوهەرێمەکەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٣ لە ویلایەتی تکساسی ئەمەریکا تۆفانی ریتا رویدا ، کە لە کەنداوی مەکسیك رووەو شاری نیۆکیورنیز کردو بووە هۆی وێرانکردنی شارەکە ، بە هەموو خانوودامو دەزگاو پرۆژە کشتووکاڵی و کارگە پیشەسازییەکان ، کە بەر لەوە لە شاری پۆستن و دوایی لە باشووری تکسان لە شاری گارستن روویدا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٦ لە شاری عەمانی پایتەخی ئوردن کۆنفرانسی گەورە بە کۆمەڵەکان لە ئێراق و بە تایبەتی لە کوردستان دەستی پێکرد ، کە چەندین دەزگای ناوخۆیی کوردستان و دەزگاکانی ئێراق و وەزیری ماف مرۆڤی ئوردن و کەناڵە ئاسمانیەکانی دەزگا راگەیاندنەکانی نێوو دەوولەتی و ناوخۆیش ئامادەبوون لە کۆنفرانسەکەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٦ دەزگای هەواڵگەری سەربازی سووریا لە شاری قامشلی رۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بە سووریا -حەسەن سالمی- سکرتێری لێژنەی ناوەندی پارتی یەکیەتی کوردی دەستگیر کرد لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٥/٩/٢٦ راگەیاندنی دانانی چەکی هەمە جۆر لە لایەن سووپای ئێرلەندەی باکووری بەرهەڵستکاری بەریتانیا ، لە دوای دە ساڵ لە کێشەو ململانیٚ لە لایەن - جۆن رۆشن-سەرۆکی لێژنەی سەربازی لە سووپای لە ژێر دەسەڵاتی شانشینی بەریتانیا ئیرلەندە .

٢٠٠٥/٩/٢٦ لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و سەرۆکایەتی هۆڵەندا پارتی راستڕەو سەرکەوتنی بە دەست هێنا بەرامبەر چەپڕەواکانی دەسەڵاتدار.

٢٠٠٥/٩/٢٦ سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆردۆگان چاوپێکەوتنی لە گەڵ رۆشنبیران و نووسەران ئەنجامدا ، لە سەر رەوشی تورکیا بە تایبەتی باری کورد لە باکووری کوردستان لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا .

٢٠٠٥/٩/٢٧ سەرۆکی رووسیای یەکگرتوو - فلادیمر پوتن - لە راگەیاندنێکی رۆژنامەوانی رایگەیاند ، کە پەرەسەندنی رژێمی مووشەکی بێ وێنە دەکات و گرنگی بە هێزی سەربازی دەدات لە هەموو بوارەکانی چەك و تەقەمەنی ، ئەمەش لە پێناو دووبارە هاتنەوە سەر گۆڕەپانی نێوو

دەوولەتی لەجیهاندا .

٢٠٠٥/٩/٢٩ کەرتی دەزگای سینەمای هۆلەندی گەووەترین و گرینگرتین دەرهێنەری خۆی لە دەست دا ، بە کوچی دوایی - پەك هایزن - کە رۆلی گرنگی هەبوو لە بواری دەرهێنەری فلیمی سینەمایی جۆراو جۆرەکان لەوولاتەکەو جیهاندا.



٢٠٠٥/٩/٢٩ حکوومەتی بەلژیکا بریاری دەستگیرکردنی سەرەك کۆماری پێشووی تشاد - حوسین صبری - دەرکرد ... بەوەشی تاوانبار کرد ، کە لە ماوەی دەسەلاتی حوسین سەبری لە نێوان سالەکانی ١٩٨٢ - ١٩٩٠ تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی کردووە بە کووشتن و ئەشکەنجەدان وزیندانی کردن لە ولاتەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەمەریکا لە ١٩٨٢/٦/٧ زیاتر لە ١٠ ملیار دۆلاری خەرج کرد ، لە پێناو هێنانە سەر دەسەلاتی حوسین صبری بەرەو دکتاتۆریە هەنگاوبنێ بە پشتیووانی ئەمەریکا . کە حوسین صبری لە دەسەلات بەردەوام بوو تاکوو لەلایەن سەرۆکی تشاد - ئیدریس دبی - لە دەسەلات لادرا ... هەروا رێکخراوەکانی ماق مرۆڤ لەجیهان حوسین صبریان تاوانبارکرد کە زیاتر لە ٤٠ هەزار مرۆڤی لەژێر ئازار و ئەشکەنجە و زیندانەکاندا کووشتتووە ، هەروا بەلژیکا داوای ئەوەی کرد کە حوسین صبری بدرێتە دەست بۆ دادگایی کردنی لە وولاتی بەلژیکا .

٢٠٠٥/٩/٢٩ لە مێژووی کورد بۆ یەکەم جار تیپی وەرزشی کوردستان لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق ، شاندێکی وەرزشی لە سەر داوای کۆریای باشوور بەرەو ئەو وولاتە بەرێ کەوت ، بە مەبەستی ئەنجامدانی یاریەکانی وەرزشی دیاریکراوو هەمە جۆر بۆ ماوەی دە رۆژ لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٥/٩/٢٩ پێــك هاتــەی گــەلانی کۆماری جەزائیر بەرەو سـندوقەکانی دەنگـدان بەرێکـەوتن ، لـە پێنـاو سەرخـستنی بەڵگـەی ئاشـــتی و ئاشـــت بوونـەوەی نیـشتیمانی ، بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشە هەمەلایەنـەکان بـە – میساق ئەلسلم ومسالحەی وەتـەنی– و راپرسیەکە سـەرکەوتنی بە دەست هێنا لە ناو کێشەی هەمەلایەنەکان لە وڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/٩/٣٠ چەند وێنەیەکی کاریکاتێری کە سووکایەتی بە پێغەمبەری ئیسلام دەکات ، لـە چاپە مەنیـەکی دانیمارکیـدا بە نـاوی – Jyllahda Posiens– یولانـدس پۆستن ، دەرکەوت و دوایی دوو هەفتـە لەچاپەمەنیەکی دیکەی دانیمارکی بڵاو کرایەوەو ئەم وێنانە وەك تۆپە بەفر غلۆل بوونەوە بۆ وڵاتی ، نەرویژو ، فەرەنساو ، ئەڵمانیا وئیسپانیاو ، سویسرا و ، ئیتالیا و ، بەلژیکا و، ، نەمسا و ، نیوزلەنداو ، دوایی بووە هۆکاری نارەزایی وڵاتانی ئیسلامی ، بە تایبەتی عەرەب لە سەرەتای ساڵی /٢٠٠٦ لە جیهاندا .

٢٠٠٥/١٠/١ لە مێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو دەسەڵاتی کوردی بۆ یەکەم جار نەتـەوە یەکگرتووەکان بەروون و ئاشـکراو راسـتەخۆ مامەڵـەی لـە گـەڵ بەرپرسانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان کرد لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٥/١٠/٢ کۆبوونەوەی پارێزگاری دیاربەکر لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسـەڵاتی تورکیا ، لـە پێنـاو بـەرەو بە ئەنـدام بـوونی تورکیا لـە یـەکێتی ئەوروپا .

٢٠٠٥/١٠/٢ بەرپابوونی خۆپیشاندان و شەڕو پێك دادان لـە نێوان هێزی ئـەمنی رژێمی ئەسـیوبیاو بەرهەڵـستکاران ، بـە هـۆی نارەزاییـان لـە بـاری چـۆنیەتی هەڵبژاردنەکانی زیناوی بۆ پۆستی سەرۆکی ئەسیوبیا بۆ جاری دووەم و بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە ، کە بووە هۆی کوژرانی زیاتر لـە ٥٠ هاووڵاتی و بەردەوام بوونی شەڕو پێکدادانە ، کە بۆ ماوەی چەند رۆژێك لـە وڵاتەکەدا

٢٠٠٥/١٠/٣ لە دوای گفتووگۆی چڕی نێوان یەکیەتی ئەوروپاو ڕژێمی تورکیا ، یەکیەتی ئەوروپا ڕەزامەندی کرد لە سەر دەستپێکردنی گفتوو گۆی لە گەڵ تورکیا ، لە پێناو ئەوەی کە تورکیا بچێتە ریزی یەکیەتی ئەوروپا ، لە دوای جێ بەجێکردنی ئەو مەرجانەی کە بۆ ڕژێمی تورکیا دەست نیشان کرا ، بە چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆیەکانی تورکیا بە تایبەتی کێشەی کورد لە باکووری کوردستان .

٢٠٠٥/١٠/٣ ڕۆژ گیران لە سەر وولاتی توونس و دەوروبەری دەستی پێکرد ، کە لە ٩٠٪ی بەرمانگ کەوت ، کە کەتۆتە نێوان ڕۆژو زەوی لە ناوچەکەو کێشووەرکەدا .

٢٠٠٥/١٠/٤ ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕەخنەی توندی ئاراستەی کۆمەڵەی نشتیمانی ئێراق کرد ، بە دەستکاری کردنی لە چەند برگەیەکی دەستووری ، بە تایبەتی لە برگەی /٦١ ی تایبەت بە یاسای ڕاپرسی ، کە ئەم دەستکاریانەش لە بەژەوەندی گەلانی ئێراق نیەو لە بەرژەوەندی چەند کەسایەتی و خواستی تایبەتیانەیە ، کە بووە هۆی نارەزایی چەند لایەنێکی نەتەوەیی و رامیاری ، بە تایبەتی لایەنی کوردی ... شایانی ئامارژە پێکردنە کە دوای ڕۆژێك کۆمەڵەی نیشتیمانی ئێراق لە یاسای هەلبژرادن پاشگەزبووەوە.

٢٠٠٥/١٠/٨ گەورەترین گومەلەرزەی زەوی روویدا بە ڕێژەی ٧,٦ پلە بە پێی دیاریکردنی پێوەری ڕێختەر لە کەشمیرو هندستان ، بەڵام کارەساتی گەوورە لە پاکستان بوو ، کە بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٩٠ هەزار هاولاتی و دەربەدەر بوونی ملیۆنەها کەس و وێران بوونی ژێرخانی تەواوی ناوچەکەو کاردانەوەی لە سەرباری هەرێمەکەدا .

٢٠٠٥/١٠/٩ زیاتر لە ٣٠ ملیۆن دەنگدەر بەشداری هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی پۆڵەندای کرد بۆ دەست نیشان کردنی سەرۆکی نوێی وولاتەکە ، کە ئەویش دۆناڵد تۆسك ، بوو کە ٤٨ کۆرسی لە پەرلەمان بە دەست هێنا لە جیاتی ئەلکسەندەر کفاجینیفسکی ، کە بۆ خوولی دووەم ئەنجامەکەی دیار دەکرێت ، کە لە ٢٠٠٥/١٠/٢٣ ئەنجام دەدرێت لە وولاتەکەدا .




٢٠٠٥/١٠/١٥ گـەلانی ئێـراق روویـان کـردە ســـندوقەکانی دەنگـــدان بـــۆ پەســـەند کردنـــی رەشنووســی دەستووری هەمیشەیی ئێراق ، کە بە بەڵێ یان نا ئەنجامدرا ، کـە زیـاتر لـە ٦٣ ٪ . دەنگـی پێدرا ، لە لایەن گەلی ئێراق بە تایبـەتی لـە باکوورو باشووری ئێراقی نوێی دوای رووخاندنی رژێمـی سـەدام ، رەشنووسـەکە پەسـەندکراو بـووە دەســتووری هەمیـشەیی گـەلانی ئێراقـی یـەکگرتووی فیـدراڵی فـرە لایەنی دیموکراتی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٥/١٠/١٧ دوای زیـاتر لـە دوانـزە سـاڵ لـە ئـەنفالکردنی ٨٠٠٠ بـارزانی و دۆزینـەوەی گۆرە بە کۆمەڵەکەیان و هێنانەوەیان بۆ خاکی کوردستان لە رێورەسمێکدا ٥١٢ تـەرمی بـارزانی لـە خـاکی کوردسـتان بـە خـاك سـپێردران لـە دەڤـەری بارزان لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٥/١٠/١٨ جـەماوەری شارۆچکەی ئـاکرێ سـەر بە پارێزگـای دهـۆك خۆپیـشاندانێکی بـــەرفراوانیان ئەنجامـــدا دژی گەنـــدەڵی ئیـــدارەو جێبەجێنـــەکردنی خواستەکانی ، کە لە ئەنجام بووە هۆی شەڕ لە نێوان هێزەکـانی ئاسـایش و پـۆلیس و جـەماوەر لـە ئـەنجام دوو بەنزینخانـەو چـەندان تانکـەری تـورکی سووتێندران .

٢٠٠٥/١٠/١٩ دەست پێکردنی دادگایی کردنی سەدام و دارو دەستەکەی بە شێووەیەکی رەسمی، کە بووە هۆی دڵخۆشکەری دوژمنانی سەدام و دڵگیری لایـەنگرانی سـەدام و رژێمەکـەی و ... نەخشە لـە هـەموو سـەرکردەیەك بـێ کـە هـاوبیری سـەدام دەکـەن ، کـار بەرامبـەر گەلەکـەیان و وێرانکردنـی نیـشتیمانەکەیان ئەنجام دەدەن.

٢٠٠٥/١٠/٢٠ لە سەردانێکی ئەمینداری گشتی کۆمکاری عـەرەبی عـەمروو موسا گەیـشتە شاری بەغدا ، لە پێناو بەشداری کردنی لە کۆنگەری نیشتیمانی لە پێنـاوی ئاشتبوونەوەی چەند لایەنێك لە پێك هاتەی ئێراق ، نیازو خواستی عـەمرۆ

مۆسا پاراستنی یەکپارچەیی خاکی ئێراقەو ناسنامەی ئێراق... چونکە عەرەب داگیرکردن و بە عەرەبکردن بەهیمای ئازایەتی و پیاوەتی دەزانن، لە دوای دەرچوونیان لە باری حوشترە وانی و بە هەمان عەقلیەت بیردەکەنەوە لە وولاتانی دیکەی جیهان .

٢٠٠٥/١٠/٢٢ سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان لە بەیاننامەکیدا جیاکردنەوەی خۆی لە لیستی هاوپەیمانی کوردستان راگەیاند بۆ چونە ناو هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتیمانی ئێراقی فیدراڵ لە ١٢/١٥و کاردانەوەی ناهەمواری کردە سەر باری کوردو داهاتووی بڕیاری کوردو یەك هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد ، کە لەو کاتە تەمەنی دامەزراندنی یەکگرتووی ئیسلامی لە ١٠ ساڵ تێنەدەپەڕی لە هەرێمی باشووری کوردستان .



٢٠٠٥/١٠/٢٢ بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردو ئێراق و کۆمکاری عەرەبی ئەمیندداری گشتی کۆمکاری عەرەبی عەمرۆ مۆسا گەیشتە باشووری کوردستان و لە شاری هەولێر لە لایەن بەرێزان مام جەلال تاڵەبانی و بەرێز مەسعوود بارزانی پێشوازی لێکراو بیروو بۆچوونی جیاواز ئاڵ و گۆڕ کرا ، لە بارەی باری بارودۆخی ئێراق و کوردو داهاتووی ئێراقێکی یەکگرتووی ئارەزوومەندای دیموکراتی ، لە هەمان کات لەگەڵ شاندنی یاوەری بەشداری کۆبوونەوەی پەرلەمانی کوردستانی کرد لە هەرێمی باشووری کوردستان .



٢٠٠٥/١٠/٢٥ بۆیەکەم جار لەمێژووی کـــوردو حکوومـــەتی ئەمەریکاو لـە سـەر داوای حکوومـــەتی ئەمـــەریکا ســـــەرۆکی هـــــەرێمی باشـــووری کوردســـتان مەســـعوود بـــارزانی و شـــاندێکی یـــاوەری گەیشتنە ئەمەریکاو لە واشنتون لە گەڵ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش چاویان بە یەك کەوت و بیووربۆچوونی خۆیان ئاڵو گۆڕکرد ، لە بارەی کوردستان و ئێراق ، لە هەموو بوارە جیا جیاکان و داهاتووی ئێراقی نویّ ، کە بەرێز مەسعوود بارزانی بەجلی کوردەواری و بە زمانی کوردی چاوپێکەوتنەکەی بەرێوەبرد لە کۆشکی سپی لە ئەمەریکا .

٢٠٠٥/١٠/٢٥ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی راپۆرتی میلیسی هەڵسەنگاند بە تاوانبار کردنی رژێمی بەعسی لە سووریا و لە لایەنگرەکانی لە لوبنان ، بە هۆی تیرۆرکردنی سەرەك وەزیرانی پێشووی لوبنان رەفیق حەریری و بوارە جیا جیاکانی دیکە ، بە تایبەتی سەربازی و سیخووری ، کە رژێمی بەعسی لە سووریا لە نێوو رامیاریەتی رۆژئاوا بە رژێمێکی تیرۆریست لە قەڵەم دراوە لە جیهاندا .

٢٠٠٥/١٠/٢٦ وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوللا گولْ دڵگرانی سەردانەکەی سەرۆکی هەرێمی باشووری کوردستانی بۆ ئەمەریکا راگەیاندو بووە هۆی ئەوەی ، کە باگهێشتی جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا– مارك بنك – لە باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە ئەنکەری پایتەخت بکات بە دەربرینی نارەزایی دژی ئەو سەردانەو دابەزاندنی ئالای کوردستان لە بازگەی ئیبراهیم خەلیل ، بەلام هەوڵەکانی وەزیری دەرەوەی تورکیا پوچەڵ کرایەوە لە سەر شەقامی تورکیا.



٢٠٠٥/١٠/٢٧ دوای هـــــــــەوڵ و مانـــدووبونێکی زۆر لـــە پێنـاو هەڵـدانی مـانگێکی دەسـتکرد لەلایـەن ئێـران بەیارمـــەتی ڕووســـیای یـەکگرتوو ... لـە ئـەنجام ئێران توواني یەکەم مانگی دەستکرد بەناوی – سینا/ ١ – بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵبدا لە سەر پشتی مووشەکی کۆزمۆس /٣ ئێم – ی ڕووسی ... ئەم مانگە دەستکردە کۆی خەرجی ١٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بووە ... ئەویش بۆ چاودێری کارەساتە سرۆشتیەکان .
جێگەی باسکردنە کە ئەو مانگە دەستکردە لەلایەن کۆمپانیای – بۆلیووت – ی ڕووسی لە شاری – ئۆمسك – لە ناوچەی سیبیریا ، کە بارەگاکەی لەوێ بە ئەنجامگەیاندراوە ... هەروا ئێرانیش چووە ناو یانەی گەردوونی ، کە ئێران بووە ٤٣ یەمین وولات کە مانگی دەستکردی هەبێ .
هـەر بـەم بۆنەیـەش وەزیـری بەرگری ئێـران بـوونی پرۆگرامـی ئـەتۆمی لـە وولاتەکەی لـە سـاڵی ١٩٩٨ ە وە ڕاگەیاند بەرامبەر بە وولاتـانی جیهـان ... کە ئەمەش بووە هۆی کاردانـەوەی کاریگـەر لـە سـەر پەیووەندیـەکانی ئێران لەگـــەڵ وولاتـــانی دیکـــەی جیهـــان بەتایبـــەتی لـــە گـــەڵ ئەمـــەریکا و هاوپەیمانەکانی لە جیهاندا .

٢٠٠٥/١٠/٢٨ لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا خۆپیشاندان و شەڕ بەرپابوو بە تایبەتی لە باکووری شاری پاریس ، بە هۆی کوشتنی گەنجێکی عەربی توونـدڕەو ، کە بووە هۆی کێشە لە نێوان سەرۆکی حکوومـەت و وەزیـری نـاوخۆی فەرەنسا ، لە دوو بیرووبۆچوونی جیاواز، کە گەنجە عەرەبەکان دانیشتووی فەرنسا ئەنجامیاندا ، کە زیاتر لە ١٧ ڕۆژ ئەو کارە بەردەوام بوو ، کە بـووە هـۆی سـووتاندنی هـەزاران ئۆتۆمبیـل و دوکـان و دام و دەزگـای خزمـەتگوزاری لە شاری پاریس فەرەنسا .

٢٠٠٥/١٠/٢٩ وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەڵمانیا یۆشکا فیشەر پێنجەم ژنی گواستەوە ، کـە کـچێکی ئیرانـی بـووە بـە نـاوی – لارا – ئـەویش لـە ڕۆمـای پایتـەختی

ئیتاڵیاو لە هەمان کات راوێژکاری وولاتەکەی شرۆیدەر چوار ژنی هێناوە لە ژیانیدا .

٢٠٠٥/١٠/٣١ تا ئەو مێژووە ژمارەی هەتیووەکانی ئەسیوبیا گەیشتە ٤,٥ میلۆن مرۆڤ ، بە هۆی کێشەو ململانێو برسیەتی و وشکانی و جێ بەجێ نەکردنی مافەکانی مرۆڤ ، بەرامبەر بە گەلانی وولاتەکە لە لایەن دەسەڵاتدارە کۆنەپەرستەکان .

٢٠٠٥/١٠/٣١ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی بڕیاری ژمارەی/ ١٦٣٦ی دەرکرد ، بە مامەلە کردنی لە گەڵ رژێمی بەعسی لە سووریا لە گەڵ دەستەی لێکۆڵینەوەی میلیس ، لە بارەی تیرۆرکردنی سەرەك وزیرانی پێشووی لوبنان رەفیق حەریری و چەندین بواری دیکە لەدەرەوەوناوەوەی سووریا .

٢٠٠٥/١٠/٣١ لە سەر داوەتی حکوومەتی بەریتانیا ، سەرۆکی هەرێمی باشووری کوردستان بەرێز مەسعوود بارزانی و شاندە یاوەرەکەی گەیشتنە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لە دوای گفتووگۆی نێوان شاندی هەرێمی کوردستان و سەرکردایەتی سەرۆکی هەرێم و سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر ، کۆنگەرەی رۆژنامەوانی هاوبەشیان ئەنجامدا لە بارەی باری ئێراق و کوردستان و داهاتووی ناوچەکەو هەرێمەکە لە باشووری کوردستان ئێراقی فیدراڵ و پەیوەندی نێوان کورد و ئەمەریکا و بەریتانیا لە داهاتووی جیهان .

٢٠٠٥/١١/١ بۆیەکەم جار لە مێژووی باشووری کوردستان و پارێزگای سلێمانی لە دوای تەواو بوونی فرۆکەخانەی سلێمانی نێوودەوولەتی ، گەشتی ئاسمانی فرۆکە دەستی پێکرد ، بۆ سلێمانی و بۆ دەرەوەی سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٥/١١/٤ سەرەك کۆماری پیرۆ – ئەلیخاندرۆ تۆلیدۆ – یاسای گەراندنەوەی سنووری دەریایی لەگەڵ تشیلی مۆرکرد ... کە ئەمەش بووە

هۆی سەرهەڵدانی جیاوازی و کێشە لەنێوان هەردوو وولاتی دراوسێدا ...
بەر لەوەش لە ١١/٣ پەرلەمانی پیرۆ بریاریدا بە خاوەنداریەتی ٣٨ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە لە ئاوی راووکردنی ماسی لە زەریای هێمن ... بەلام لەگەڵ ئەوەشدا تشیلی دەسەلاتی تەوواوی لە رووبەرە ئاویەکەدا هەیە بۆ راووکردنی ماسی لە زەریایەکەدا .
رێکەووتنەکانی نێوو دەوولەتی ناوزەند کرد ، کە لە ساڵەکانی ١٩٥٠ ی سەردەی بیستەم مۆرکراوە ، لەم بارەیەوە لە جیهان و ناوچەکان و هەرێمەکاندا ... هەر بەم بۆنەش حکوومەتی تشیلی شالاوێکی بەرفرەوانی راگەیاندنی دژ بەو یاسایە دەست پێکرد ... هەر لەو کاتەدا هەندێ لە پەرلەمانتارانی پیرۆ رایانگەیاند . کە ئەو یاسایە ماوەی گفتووگۆ خۆشدەکات لەسەر سنووری دەریایی نوێ ... هەر دوای دەرکردنی یاساکە سەرۆکی تشیلی – ریکاردۆ لاگوس – لە راگەیاندنێکیدا گووتی :– ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر کارەکانمان وبە سەر بەخۆیمان لەسەر ئەو ناوچەیە لەزەریای هێمندا
جێگەی باسکردنە کە هەردوو وولاتی پیرۆ و تشیلی کێشەی دووروو درێژیان هەیە بەر لە سەردەی نۆزدەم تاکوو ئێستاش ، کە تشیلی چەندین شەڕی کردووە دژی پیرۆ و پۆلیڤیا لە نێوان ساڵەکانی ١٨٧٩ – ١٨٨٣ لە پێناو بەدەست هێنانی رووبەرێك لە زەریای هێمن بە وەرگرتنی لە پیرۆ و پۆلیڤیا لە هەرێمەکەدا

٢٠٠٥/١١/٦ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئازربایجان ئەنجامدرا ، لە نێوان پارتی دەسەلاتدارو بەرهەڵستکاران ، لە ئەنجام پارتی دەسەلاتدار توانی زۆرینەی کورسیەکان بە دەست بهێنێ و بووە هۆی دەربرینی نارەزایی لە لایەن بەرهەڵستکاران و بەرپابوونی گەوورترین رێپێوان و خۆپیشاندان دژی پارتی دەسەلاتدار ، ب ەناوی ئەوی کە تەزویریان لە هەڵبژاردنی پەرلەمان کردووە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/١١/٧ سەرەك کۆماری ئێراق مام جەلال تاڵەبانی گەیشتە شاری رۆمای پایتەختی ئیتاڵیا ، لە سەردانێکی فەرمی بە چاوپێکەوتن و دیدارو رۆژنامەوانی ئەنجامدان ، لە بوارە جیا جیاکان لە بارەی باری ئێراق و ناوچەو جیهان ، کە کاردانەوەی گرنگی هەبوو بۆ داهاتووی ئێراق و بە تایبەتی کورد لە

کوردســتان بــە تایبــەتی لــە باشــووری کوردســتان لــە هــەمان کــات لــە سەردانەکەی چاوی کەوت بە پاپای فاتیکان لە بارەگای فاتیکان لە رۆمای پایتەختی ئیتاڵیا.

٢٠٠٥/١١/٩ بۆ یەکەم جار هەڵبژادرنی پەرلەمان لە ووڵاتی میسر ئەنجامدرا لە نێوان پارتی نیشتیمان و دیموکراتی دەسەڵاتدارو پارتە بەرهەڵستکارەکانی وەك ، پارتی غەدو ، پارتی ئیخوان مسلمین و ، بەرەی دیموکراتی لە ووڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/١١/٩ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاك سترۆ لــە چــاوپێکەوتنی لــە گــەڵ کــەناڵی تەلەفزیۆنی جەزیرە ، لە پرۆگرامی – لقاءالیوم – و لە ناوەندی ووتەکانی گــووتی:– شــتێك نیــە بــە نــاوی کوردستان و ماوە بە دەووڵەتی کوردی نادرێت ، کە پێی بڵێن کوردستان ، چونکە کار لە بارودۆخی ، ئێران و ، تورکیاو، سووریا دەکات ، لە لهەرێمەکان و ناوچەکەدا .



٢٠٠٥/١١/٩ لە عەمانی پایتەختی ئوردن سێ تەقینەوە ئەنجامدرا لە لایــــەن ئیــــسلامیە توونــدرەوەکان ، کــە بــووە هۆی شەهید کردنی زیاتر لە ٦٠ هــاووڵاتی و زامــدار بــوونی زیــاتر لــە ٧٥ هاووڵاتی ، کە یەکەم جارە لە مێژووی ئوردن بەو شێووەیە تەقینەوە ئەنجام بدرێت ، کە لە کاتی ئاهەنگی بووك گواستنەوەش بوو ، لە هوتێلێکی گەشتیاری لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردن .

٢٠٠٥/١١/١٠ لە دوای سەردانەکەی سەرەك کۆماری ئێراق مام جەلال سەردانی پاپای فاتیکانی کرد ، یەکەم وەك سەرەك کۆماری ئێراق و، دووەم وەك سەرکردەی کوردێکی تێکۆشەر ، رۆڵی گرنگی هەبووە لە کاردانەوەی بۆ سەر ناوچەو هەرێم و جیهان ، بە تایبەتی برامەسیحیەکان ، کە کورد بە دۆستی

راستەقینەی خۆیان دەزانن .

٢٠٠٥/١١/١١ لە دوای بەخشینی خەڵاتی ئاشتی بە رۆمان نووسی تورکی – ئۆرهان یاموك – لە لایەن حکوومەتی ئەڵمانیا ، لە سەر تاسەری جیهان دەنگی دایەوە نەك لە بەر ئەوەی خەڵاتەکەی پێ بەخشرا ، بەڵکو لە بەر ئەوە بوو کە حکوومەتی تورکیای تاوانبار کردبوو بە لەناو بردنی زیاتر لە ١,٥ ملیۆن ئەرمەن و زیاتر لە ٣٠ هەزار کورد ، کە بەو هۆیە ئەو رۆمان نووسە درایە داگا شۆڤینیەکەی تورکیا .

٢٠٠٥/١١/١١ کۆچی دوایی دەرهێنەری سینەمایی و ناوداری جیهانی مستەفا حەقاد ، کە لە دایك بووی شاری حەڵەبی سووری و دەرهێنەری فلیمی سەرکردەی کوردی موسڵمان سەلاحەدین ئەیوبی بوو ، بە هۆی تەقینەوەکەی شاری عەمانی پایتەختی ئوردن ، کە ئەم هونەرمەندەو دەرهێنەرە کوردە لە رۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بە سووریا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە شارەکەدا .

٢٠٠٥/١١/١١ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کۆنداليزا رایس گەیشتە ئێراق و دوایی سەردانی پارێزگای مووسڵی کرد ، بە هۆی گیروگرفتی ئێراق و کونگەری قاهیرەی پایتەختی میسر ، لە نێوان پێك هاتەکانی گەلانی ئێراق و بە بەشداری دراوسێکانی ئێراق و نەتەوە یەکگرتووەکان و بە تایبەتی یەکیەتی ئەوروپا .



٢٠٠٥/١١/١٢ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆفی ئەنان لە سەردانێکی ناکاو گەیشتە شاری بەغداو لە گەڵ سەرەك وەزیران ئیبراهیم جەعفەری کۆبووەو لە بارەی بارودۆخی ئێراق و هەڵبژاردن و کۆنگەری قاهیرەی نێوان پێکهاتەکانی ئێراق ، لە پێناو ئاشتبوونەوەی نیشتیمانی ، کە دراوسێکانی ئێراق و نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا بەشداریان لە کۆنگرەکە کرد .

٢٠٠٥/١١/١٣ زیاتر له ١٠٠٠٠ هەزار هاووڵاتی كورد له پارێزگای دیار بەكری باكووری كوردستانی داگیركراوی ژێر دەسەڵاتی توركیا خۆپیشاندانێكی گەورەیان ئەنجامدا ، بەهۆی توندو تیژی له شارۆچكەی شەمزینانی سەر سنووری باشووری كوردستانی ئێستا ، كه بووه هۆی شەهید بوونی دووهاووڵاتی كورد ، له لایەن جەندرمەكانی رژێمی تورك ، كه بەر له دوو رۆژ بەردەوام بوونی له شارەكانی دیكەی باكووری كوردستان ، بە كاردانەوەی له سەر دەسەڵاتی توركیا و بەرزبوونەوەی كێشەكه بەرەو ئاستێكی راشكاوانەی نێوو دەسەڵاتی توركیا .

٢٠٠٥/١١/١٤ حكوومەتی فەرەنسا ماوەی یاسایی فریاكەوتنی بۆ ماوەی سێ مانگ درێژ كردەوه ، به هۆی كاره تێكدرەكان له فەرەنسا ، له باكووری شاری پاریس ، كه زیاتر له ١٨ رۆژ بەردەوام بوو، كه بووه هۆی سووتاندنی به هەزاران ئۆتۆمبیل‌و سووتاندنی چەندین دام‌و دەزگای خزمەت گوزاری‌و بازاری بازرگانی‌و شێواندنی بارودۆخی فەرەنسا‌و ناهەمواری ، كه له لایەن ئاواره عەرەبە ئیسلامیەكان ئەنجامدرا بوو سەرەرای خزمەكردنیان‌و یارمەتی دانیان له وڵاتەكەدا .



٢٠٠٥/١١/١٤ له دوای سەردانەكەی بۆ ئیتاڵیا سەرۆكی هەرێمی باشووری كوردستان بەرێز مەسعوود بارزانی ، له لایەن پاپا – بیندكتی شازدەهەمی– پاپای فاتیكان له شاری رۆمای پایتەختی ئیتاڵیا پێشوازی لێكرا وەك سەركردیەكی كورد لەو وڵاتەدا .

٢٠٠٥/١١/١٥ هێزەكانی سووپای ئەمەریكا‌و ئیدارەی جۆرج بۆش دانیان نا بەوەی كه مادەی كیمیاوی سپیان له هێرشەكانیان بۆ سەر شاری فەلوجە‌و قائم بەكارهێناوه ، به ناوی جەنگی دژ به تیرۆر ، كه به پێی یاسای نێوودەووڵەتی قەدەخەكراو نیه .

٢٠٠٥/١١/١٥ له پارێزگای تەرابلسی لوبنان دەستەی بەرگری كردن له هێزه تیرۆرستەكانی ئێراق ، به ناوه جۆراو جۆرەكان به ناوی– مقاومەی ئێراق

– کە زۆربەی ئەو دەستەیە لە پیاوە ئایینیەکان و سەربەخۆی شاری تەرابلۆس پێك هاتبوون ، بە ناو بەرگری کردن لە ئێراقی عەرەبی ، کەچی لەو کاتەی عەرەبی ئێراقی بە پێی کەمە نەتەواتیەکانی نەتەوەی کەمیینەن و ، هەروەها لە سووریاو ، لوبنان چەندین نەتەوەی جیا جیا پێك هاتوون ، لەوانە نەتەوەی کورد لە ناو خاکی داگیرکراویدا .

٢٠٠٥/١١/١٥ بەرپرسی ئاسایشی نەتەوەیی ڕووسیا ئیگۆر ئیڤانۆڤ سوورانەوەیەکی بە ئێران و ، ئێراق و ، سووریا و، تورکیا دەست پێکرد ، لە پێناو، یەکەم پاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی ڕووسیاو ، دووەم کەم کردنەوەی ئەو گیرو گرفتانەی لە ناوچەکە بەرزبۆتەوە لە بارەی باری ئێراق و ، ئێران و ، سووریا و ، لوبنان لە چەندان لایەنی رامیاری و سەربازی و ئابووری و پەیوەندی نێوودەوڵەتی ، بە تایبەتی لە نێوان ئەو وولاتانەو ڕووسیاو جیهان و بەرگری کردن لە نەگۆڕینی نەخشەی ناوچەکە ، لە رامیارییەتی رۆژهەلاتی ناوەراستی گەووەرەو ئەفەریکیا .

٢٠٠٥/١١/١٥ کۆنگەری لوتکەی زانیاریەکانی ئەنتەرنێت لە شاری توونسی پایتەختی توونس گرێدرا ، بە ئامادە بوونی کۆفی ئەنانی ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان و نوێنەری ١٧٠ وولات لە جیهان ، لە پێناو بە ئازادکردن و سەربەخۆیی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت ، بە تایبەتی لە وولاتانی عەرەبی بە هۆی دوا کەوتوییان .

٢٠٠٥/١١/١٦ شانشینی مەغریب محەمەدی شەشەم لێبوردنی گشتی بۆ ١٠ هەزار زیندانی راگەیاند ، بە بۆنەی راگەیاندنی سەربەخۆیی مەغریب بە ئازادکردنی ٥٠٠٠ هەزار کەس و کەم کردنەوەی ماوەی بەندکردنی ٥٠٠٠ بەندکراوی دیکە ، لە دوای شەش ساڵ لە دەسەلاتەکەیدا .

٢٠٠٥/١١/١٦ گۆرانی بێژی بە ناوبانگی باکووری کوردستان و تورکیا و جیهان – ئیبراهیم تاتلی ساز– بۆ یەکەم جار گەیشتە شاری هەولێر ، بۆ پێشکەش کردنی چەند کۆنسێرتێکی گۆرانی لە شارەکانی هەولێرو سلێمانی و دهۆك ، بەلام هەوڵ و ئاواتەکانی سەر کەوتوو نەبوو لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٥/١١/١٦ سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆردۆگان لە پرۆگرامی تەلەفزیۆنی



جەزیرە – بلا حدود – لە دوای ووتە پڕشنگدارەكانی لە سەر توركیاو دراوسێكانی و پەیوەندی نەتەوەیی و مەزهەبی و كۆمەلایەتی و پەیوەندی نێوودەوولەتی و ماف و ماف مرۆڤو یەكسانی و دادپەروەری گووتی:–

ماوە نادەین ، باری دیموگراف كەركوك بگۆڕدرێ و ماوە بە دابەشكردنی ئێراق نادەین ، كەچی زیاتر لە ۰۰۰ر۰۰۰ر۲۰ ملیۆن كوردو زیاتر لە ۲۱۲ هەزار كلیۆمەتر چوارگۆشەی لە خاكی كوردستانیان داگیركردووەو بە ئاگرو ئاسن مامەلەی لە گەلٚ دەكەن لە سەر خاكی خۆیان ، ئەمە ئیسلام و پارتی ئیسلامییە لە رەفتارو كردەوكانی دژ بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی و ماف پێدانی نەتەوەو خاكە داگیركراوەكانی باكووری كوردستانی ژێر دەسەلاتی عەسكەرتاریەتی رژێمی توركیا .

۲۰۰۵/۱۱/۱۸ دوو تیرۆرستی دژ بە مرۆڤایەتی لە عەرەبی سووننەكانی بەعس و سوونە ئیسلامەیەكان لە كاتی نوێژی هەینی نیوەڕۆ خۆیان لە دوو مزگەوت تەقاندەوە لە شاری خانەقین لە باشووری كوردستان ، كە بووە هۆی شەهید بوونی ۸۵ هاووڵاتی و زامداربوونی زیاتر لە ۲۰۰ هاووڵاتی ، كە زۆرەبەی هەرەزۆریان كورد بوون لە شارەكەدا .

۲۰۰۵ /۱۱/۱۸ جێگری سەرەك كۆمارەی پێشووی میسر جەمال عەبدول ناسرو ئەنورسادات – حسن شافعی– كۆچی دوایی كرد ، كە یەكێك بوو لە شۆڕشگێرەكانی شۆرشی/ ۱۹۵۲ و یەكێك بوو لە ئەفسەر ئازادەكان و هاوڕێ و سەرۆكی مێژوویی پارتی كۆمكاری چەپی میسر خالد محی الدین بوو لە وولاتەكەدا.

۲۰۰۵/۱۱/۲۳ سەرۆكی پارتی دیموكراتی مەسحی– ئەنگیلا میركل– كە ئافرەتێكی ئەلمانیای رۆژهەلاتی پێشوو بوو ، بۆ یەكەم جار لە مێژووی ئەلمانیا ئافرەتێك خۆی بخاتە ناو مێژوو بۆ پۆستی راوێژكاری ئەلمانیا لە دوای

سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئەڵمانیا بە سەرکەوتنی بە سەر راوێژکاری پێشوو ئەڵمانیای یەکگرتوو گریهایدەر شرۆیدەر لە وولاتەکەدا

.




٢٠٠٥/١١/٢٩ هەردوو سەرەك کۆماری فنزویللا – هۆگۆ شافیز – و نووێنەری سەرۆکی ئەسپانیا – وەزیری بەرگری ئەسپانیا – خۆسیەبوونوو – لە ئاهەنگێکی قەشەنگدا رێکەووتنی هاوکاری سەربازیان مۆرکرد بەبری یەك ملیار دۆلارلە نێوانیاندا .

جێگەی باسکردنە کە بە پێی رێکەووتنەکە ئەسپانیا هەڵدەستێ بە فرۆشتنی /٨ کەشتی جەنگی لەگەڵ ١٢ فرۆکەی گوواستنەوەی سەربازی بۆ فنزویللا ... سەرەرای ئەوەی کە ئیدارەی ئەمەریکا هەوڵیدا کۆسپ بخاتە پێش ئەو رێکەووتنە بە بیانووی ئەوەی کە رژێمی فنزویللا بە سەرکردایەتی شافیز هەرەشەی تێك چوونی باری ئاشتی لەناوچەکە دەکات

.

بەڵام هەوڵەکانی ئیدارەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش سەرکەوتوو نەبوو لە نێوان هەردوو وولاتدا .

هەر لەو کاتەشدا باڵوێزی ئەمەریکا لە شاری مەدریدی پایتەختی ئەسپانیا – ئەدوار ئەگیری – داوای لە ئەسپانیا کرد , کە ئەو رێکەووتنە هەڵبووەشتێنێتەوە ... کە ئەسپانیا هێزەکانی سووپای وولاتەکەی بە چەك و تەقەمەنی ئەمەریکا بەهێزدەکات و مۆڵەتی بە ئەسپانیا نەداوە چەك بە هیچ وولاتێك بفرۆشێت .

سەرەرای ئەوەی کە ئەسپانیا سەربەخۆیە لە بریاردان لە کاروباری وولاتەکەی لەهەموو بووارە جیاجیاکان ... بەر لەوەش حکوومەتی فەنزویللا چەکی سەربازی و فرۆکەی لە بەرازیل و رووسیا کریبوو ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پەیووەندیەکانی نێوان ئەمەریکا و فەنزویللا

بەرەو ئاڵۆزی و دژایەتی کردنی یەکتری هەنگاودەنێ لە کێشووەرەکاندا

٢٠٠٥/١١/٢٩ یەکـەم بـیری نـەوت لـە شارۆچـکەی زاخـۆ هەڵکەنـدرا لـە لایـەن کۆمپانیـای نەرویـژی و چـینی، کـە یەکـەم جـارە لـە مێـژووی کـورد لـەژێر دەسـەڵاتی کوردی لە باشووری کرودستان ئەنجام بدرێت کە کاردانەوەی گرنگی دەبێ بـۆ ژێرخـانی ئـابووریو بـژێوی گـەلی کـوردو دراوسـێکانی کوردسـتان بەتایبەتی وڵاتانی داگیر کەری کوردستان.

٢٠٠٥/١١/٣٠ ئافرەتی تێکۆشـەرو خـەباتگێر- ناهیدە شـێخ سـەلام – لـە شـاری سلێمانی کۆچی دوای کرد ، کە کچی شاعری ناوداری کورد شێخ سـەلام و دایکـی د. رۆژ جێگری سەرەك وەزیرانی ئێراق بوو.

٢٠٠٥/١٢/١ خۆپیشانداندنو پێك دادان لە مەنامەی پایتەختی بەحرین ئەنجامدار بە هـۆی نادروسـتی رامیاریـەتی دەسـەڵات و وڵات ، لـە پێنـاو هـەوڵی بـەرەو گورانکـاری کـردن لـە بـارودۆخی ئێـستاو داهـاتووی وڵاتەکـە ، کـە ببرێـت بـەرەو دیموکراتییـەتو دادپـەروەری کۆمەڵایـەتی لـە کـارو لـە ژیـان لـە وڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/١٢/١ لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا کۆنگەریـەکی نێـوو دەوڵـەتی لـە بـارەی کێشەی کـورد بەسـترا ، لـە تـەلاری پەرلـەمانی فەرەنـساو ، فەرەنـساش ئـەم کۆنگریەی لە ئامێز گرت ، کە ئەمەش کاردانەوەی کاریگەری خۆی هەیە بە پێـی پەرەسـەندنو پێـشکەوتنو گۆڕانکارییـەکانی بـارودۆخی ناوچـەو هەرێمو جیهان .

٢٠٠٥/١٢/١ لــە خــولی سـێیەمو کۆتـایی هەڵبژاردنـەکانی پەرلـەمانی میـسرو لـە بـارودۆخێکی پـر لـە گیرووگرفـتو شـەڕ لـە نێـوان هێزەکـانی پۆلیـسی میسریو بەرهەڵستکارانی بە تایبەت ئیخوانی مسلیمنو پارتی نیشتیمانی میـسری دەسـەڵاتدار، کـە بـووە هـۆی کـوژرانی ١١ کـەسو زامـداربوونی ١٨ کەسـی دیکـە ، کـە پـارتی دەسـەڵاتدار لـە هەڵبژاردنـەکان سـەرکەوتنی بـە دەسـت هێنـاو پارتـەکانی دیکـەش بـەپێی رێـژەی دەنگـەکان ، کـە ئیخـوان دووەم کورسـی لـە کورسـیەکانی پەرلـەمانی میـسری بـە دەسـت هێنـا ، سـەرەرای قەدەخـەی جمووجـۆڵی ئـەو پارتـە ئیـسلامیە توونـدرەوە لـە وڵاتەکەدا .

٢٠٠٥/١٢/٥ لە ناوەندی کۆبوونەوەی قوتابیانی زانکۆو جەماوەرێکی زۆر لە شاری سلێمانی د . بەرهەم سالح ، لە ناوەندی وتەکانی گووتی:- هەندێ لە پارت و رێکخراوو گروپە عەرەبیەکان دەیانەوێ بارەگا لە شارەکانی کوردستان بکەنەوەو دووبارە دەست لە کاروباری کوردستان وەربدەن ، بەڵام ئەمە مەحاڵەو بۆیان نیە جارێکی دیکە بتوانن دەست لەکارو باری کوردستان و باری کوردستان وەربدەن .

٢٠٠٥/١٢/٥ لە سەر داوای دادگای نێودەوڵەتی لە شاری لاهای پایتەختی هۆڵەندای ١٥ هاوولاتی کورد لە ئیران و ، ئێراق و ، سووریا بانگ هێشت کران ، بۆ چۆنیەتی بە کارهێنانی کیمیا باران لە شاری هەڵەبجە ، لە سەر هۆڵەندی- فرانز ڤان ئنرات - کە دادگایی دەکرێت بە هۆی پێدانی مادە ژەهراویە هەمە جۆرەکان ، بە رژێمی بەعس لە ئێراق لە ساڵی ١٩٨٤ و بەکارهێنانی لە شەڕی کەنداوی یەکەم و لە سەر گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی گەلی کورد لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .

٢٠٠٥/١٢/٥ دادگای کردنی خولی سێیەمی سەدام حوسین و حەوت لە پیاوەکانی بەرامبەر دادگایی تایبەتی ئێراق ، بە سەرکردایەتی دادوەر رزگار حەمدئەمین ئامادەکران ، کە شایەتەکانی دژ بە سەدام ئامادە بوون لە شارۆچەکەی دوجەیل و دەوورووبەری و ، لە هەمان دانیشتن وەزیری پێشووی ئەمریکا - رامزی کلار- و وەزیری دادی قەترەی ئامادە بوون ، بۆ بەرگری کردن لە سەدام و دەسەڵاتەکەی و یارمەتی دەری تیرۆرستان لە ناو ئێراق و وولاتانی دیکەی جیهان ، لە لایەن ئیسلامە عەرەبە توندڕەوەکان .

٢٠٠٥/١٢/٥ جەماوەری شاری دهۆك پەلاماری بارەگای یەکگرتووی ئیسلامیان دا بە هۆی هەڵوێستی یەکگرتوی ئیسلامی و چونەدەر لە ئامانجە بەرزەکانی گەل و نیشتیمان و لیستی هاوپەیمانی کوردستان ، بە سەر کردایەتی ، سەلاحەدین بەهائەدین ، ، بە هاوکاریکردنی لە گەڵ پارت و رێکخراوە ئیسلامیەکانی عەرەبی ئێراق ، کە لە ئەنجام بووە شەڕو پێك دادان لە نێوان جەماوەرو لایەنگرانی یەکگرتووی ئیسلامی، لە ئەنجام بووە هۆی سووتاندنی بارەگاکەیان و زامداربوونی زیاتر لە ٢٥ هاوولاتی و کوژرانی ٤

بەرپرس و لایەنگرانی یەکگرتوو ئیسلامی لە کوردستان .



٢٠٠٥/١٢/٦ بارەگاکـانی یـەکگرتووی ئیـسلامی کوردسـتان لـە پارێزگـای دهـۆك و زاخـوو ، ئـاکرێ و ، ئامێـدی و ، بەدەردەش ، کەوتنە بەر هێرشی گێرە شـێوێن و پـلان ، لـە پێنـاو دروسـتکردنی بـارودخێکی دوور لـە هەسـتی نەتـەوەیی ونیـشتمانی ، بـە پێـی رێنمایـەکانی ئیخوان موسلمین و پارتە ئیسلامیە عەرەبەکان لـە ئێراق و ، بـە تایبـەتی سـعوودیەو ، ئیمـارات و پارتـە ئیـسلامیەکانی تورکیـای داگیرکەری خاکی کوردستان .

٢٠٠٥/١٢/٦ کەوتنەخوارەوەی فرۆکەیەکی نەفەر هـەڵگری ئێران لەگەڕەکێکی باشووری تارانی پایتـەختی ئێران کە بـوە هـۆی گیـان لەدەست دانـی زیـاتر لـە ١٠٠ هاولاتی و تێکدانی چەندین خانوو و ئوتۆمبیل.

٢٠٠٥/١٢/٧ گرێدانی سێەمین کۆنگرەی نا ئاسایی رێکخـراوی کۆنگرەی ئیسلامی لە شاری مەککەی وولاتی سعوودیە ئەنجامدرا ، بە بەشداری هـەر ٥٧ وولاتـی ئەندام لە کۆشکی سەفا .

بەلام بەر لـە گرێـدانی کۆنگرەکە شانشینی سعوودیە شانشینی عەبدوڵڵا پەردەی لە سەر تەلاری نوێی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی کە لە ناوچەی خوزام لە باشووری شاری جدەی سعوودی دروست دەکرێت هەڵدایەوە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٥/١٢/٨ هـەروا لـەم ڕۆژەدا کـۆنگرەی لوتکـەی رێکخـراوی کـۆنگرەی ئیـسلامی لـە شـاری مەکـەی پـیرۆزی سـعوودی لـە لایـەن شانـشین عەبدوللا کرایـەوە بـە بەشداری ٥٧ وولات لە وولاتانی عەرەب و ئیسلامی و جیهان .

شـایانی باسـە رژێمـەکانی عـەرەب کـە خۆیـان بـە دامەزرێنـەری ئیـسلارم دەزانـن و لـە هـەمان کاتـدا خۆیـان بـە دامەزرێنـەری پـارت و رێکخـراوە تیرۆرسـیتەکانی ئیـسلامی لـە پێنـاو بەرزکردنـەوەی جیهانگەریـەتی ئیمپرتۆریەتی ئیسلامی دژی ماف هەموو مرۆڤ و میللـەتێکی ماف خوراو ،

بە تایبەتی گەلی کورد ، لە وولاتە ئیسلامیەکان وەك ، تورکیاو ، ئێرانو ، ئێراقو ، سووریاو ، دروشمی بەرزیان – رێکەوتن لە پێناو رێك نەکەوتن .
لە کۆنگرەی شاری مەککەی وولاتی سعوویە ... بە رەسمی دانندرا بە سەرجەم مەزهەبە جیاجیاکان لە ئاینی ئیسلام ... بەلام ئەم دانپێدانانە تاکوو ئێستاش نەبووەتە هۆی سرینەوەی سنوورەکانی ئەو پارچە پارچەییەی کە لە نێوو بریاری رامیاری وولاتە ئیسلامیەکاندا هەیە .
کە کۆنگرەی مەککە نەیتووانیووە تا ئەم چرکە ساتە لە رووی رامیاریەوە کاریگەری خۆی لە سەر باری ناووخۆیی و دەرەکی وولاتە موسلمانەکان دەبنێت و رۆژ لە دوای رۆژ کێشەو ململانیٚ لە نێوان ئەو مەزهەبە جیاجیانەی ناو ئاینی ئیسلام پەرە دەسەنیٚ ، بە تایبەتی لەنێوان مەزهەبی شیعە و سووننە و وەهابی و کاردانەوەی نا لە باری کردۆتە سەر پەیووەندی کۆمەلایەتی و رۆشنبیری لە نێوان ئەو وولاتانەی کە بەتایبەتی ئەو دوو مەزهەبەی تیایدا هەنە .

٢٠٠٥/١٢/٨ ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان سەلاحەدین بەهائەدین بە هۆی رووداووەکانی شاری دهۆك لە راگەیاندنێك داوای لە کۆمۆسیۆنی بالای هەلبژاردنەکان کرد .
ئەویش بە راگرتنی هەلبژاردن لە پارێزگای دهۆكو ئارامکردنەوەی باری پارێزگای دهۆك ، بە هۆی ئەم رووداوە لە هەرێمەکەدا .
بەلام باری دهۆك بەرەو بەرزتر هەنگاوی نا لە هەلبژاردنو بە هێزی هۆشمەندی نەتەوایەتیو ریسواکردنی هەلوویستەکانی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانو رامیاریەتیەکەی ، کە لە پێناو خزمەتکردنی دووژمنانی گەلو نیشتیمان ، بە پالپشتی لایەنە پارتو رێکخراو گروپی عەرەبو ئیسلامیەکانی دژ بەکوردو خاکی کوردستان بە تایبەتی باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .

٢٠٠٥/١٢/٨ سەرۆکی هەلبژێردراوی ئیران ئەحمەدی نژاد لە دووەم راگەیاندنی لە لوتکەی رێکخراوی کۆنگەری ئیسلامی لە وولاتی سعوودیە ، دوپاتی کردەوە ، کە پێویستە ئیسرائیل لە جێگایەکی دیکە دەوولەتی بۆ دروست

بکرێت و له سه‌ر ڕووی زه‌وی ڕه‌ش بکرێته‌وه ، له هه‌مان کات گووتی:-
له جه‌نگی دووه‌می جیهان ئه‌ڵمانیای هتله‌ری نزیکه‌ی ٦ ملیۆن جووله‌که‌ی کوشتیه له نێوان ساڵه‌کانی ١٩٣٩ - ١٩٤٥ , که بووه هۆی ڕه‌تکردنه‌وه‌ی ئه‌ولێدوانه له لایه‌ن ڕاوێژکاری ئه‌ڵمانیا میرکل و ئه‌مه‌ریکاو ، به‌ریتانیا و ، ئیسرئیل ، ئه‌حمه‌د نژادو ده‌سه‌ڵاته‌که‌ی داگیرکه‌ری خاکی ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستانه له هه‌موو بواره جیاجیاکان به تایبه‌تی له بواری نه‌ته‌وه‌یی و نیشتمانیدا .

٢٠٠٥/١٢/١٢ تیرۆرکردنی سه‌رنووسه‌ری ڕۆژنامه‌ی - النهار - ی لوبنانی جیران تووینی له شاری بیروتی پایته‌ختی لوبنان ، که یه‌کێك بوو له ڕه‌خنه لێگره‌کانی ڕژێمی به‌عسی له سووریاو لایه‌نگره‌کانی له ناوچه‌که‌دا .

٢٠٠٥/١٢/١٣ حکوومه‌تی لوبنان به ڕه‌سمی داوای له ڕێکخراوی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان کرد ، به دامه‌زراندنی دادگایه‌کی دادپه‌روه‌رانه‌ی بێ لایه‌نی نێوده‌وڵه‌تی به دادگایی کردنی تاوانبارانی تیرۆکه‌ری سه‌ره‌ك وه‌زیرانی پێشووی لوبنان ڕه‌فیق حه‌ریری و هه‌ڤاڵه‌کانی و دوای ئه‌و له ئه‌ندامانی په‌رله‌مان و که‌سایه‌تی زۆر له ڕۆژنامه‌نووسانی لوبنان .

٢٠٠٥/١٢/١٤ له لێداونێکی سه‌رۆکی ئه‌مه‌ریکا جۆرج بۆش ، که بۆ یه‌که‌م جار دان به هه‌ڵه‌ی پێگه‌یاندنی ئیستخباراتی ئه‌مه‌ریکا ده‌کات و به‌رپرسیه‌تی لێدانی ئێراق و ڕووخاندنی سه‌دامی خسته ئه‌ستۆی خۆی و گووتی:- لێدانی ئێراق له به‌ر داگیرکردنی نه‌وت نیه‌و ده‌بوایه سه‌دام له ناوبچێت به هۆی هه‌بوونی مه‌ترسی داهاتووی له سه‌ر ناوچه‌که‌و هه‌رێم و جیهان ، له دوا ڕۆژدا له ناوچه‌که‌دا .

٢٠٠٥/١٢/١٥ له کاتی دیایکراو پرۆسه‌ی هه‌ڵبژاردنه‌کانی کۆمه‌ڵه‌ی نشتیمانی ئێراق ، له لایه‌ن پێکهاته‌کانی گه‌لانی ئێراق ئه‌نجامدار ، به تایبه‌تی له هه‌رێمی باشووری کوردستان و به‌شه‌کانی



دیکەی ئێراق ، لە پێشبڕکێیەکی بە هێزانە ، لە نێوان پارت و ڕیکخراوو گروپەکانی ڕامیاری و نەتەوەیی و مەزهەبی و زانستی و کۆمەڵایەتی بەپێی هاوپەیمانیەتی و لیستە جۆراو جۆرەکان لە ئێراقدا .

٢٠٠٥/١٢/١٧ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە مەرسومێکی یاسایی بە پێی دەستووری ئەمەرکیای مۆرکرد ، لە بەخۆگرتن لەو کەسانەی پەیوەندیان هەیە ، یاخوود دەبەستن بە ڕێکخراوی قاعیدە لە ئەمەریکایەکان و غەیرە ئەمەریکی بۆ لە ناوبردن و پەلاماردانیان .

٢٠٠٥/١٢/١٨ جێگری سەرۆکی ئەمەریکا دیك چینی بۆ یەکەم جار سەردانی ئێراقی کردو لە بەغدای پایتەخت لە لایەن سەرەك کۆمار مام جەلال و سەرەك وەزیران ئیبراهیم جەعفەری پێشوازی لێکراو گفتووگۆی نێوانیان لە بارەی باری ئێراق و هەڵبژاردن و کۆمەڵەی نیشتیمانی و حکوومەتی هەمیشەیی و داهاتووی ئێراقی فیدراڵ و یەکگرتووی فرە لایەنی ئالووگۆر کرا .

٢٠٠٥/١٢/١٨ نازناوی مێگەل لێرەدا بە تەواوی بەسەر هزرڤانە تازەکان خۆیان دەسەپێنن , نەوەك بەسەر ئەو جەماوەرەی کە گوتارە میکری و کلتووریەکانیان ئاراستە دەکەن ... هەروا سکاڵایەکی گشتیش لە ئەگەری وون بوونی ڕەسەنایەتی و تاکرەوی لەداهاێنان لەلای نەوەی تازەی هزرڤانندا هەیە ، کە دەیانەوێ بابەتە گەرم و گوورو خێزانەکان زۆر بە پەلەو خاکیانە چارەسەر بکەن .

کە هەوڵەکانیان زیاتر لە داخوازیەکانی نووسینی ڕۆژنامەگەری و پەخش کردنی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی و شێوازەکانی دیکە لە میدیا تازەکان دەکات و بەکارهێنانی چەکی -- مێگەل -- یش لە درێژەی ئەو وتارانەدا هات ، کە -- بۆون هاریش -- ی نووسەر لە ڕۆژنامەی -- نیووداڵاس مۆرنینگ -- لە بارەی هزرڤانە تازەکان بڵاوی کردەوە و تیایدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە هزرڤانە تازەکان دوو جۆرن :-

یەکەم :- ئەو هزرڤانەی کە ناتووانن لە مەسەلە گشتیەکان حالی بن و ڕووبەڕووی ببنەوە بۆیە زۆر جار بەشێوازێکی هەڵە و نارێك باسیان لێوەوە دەکەن ...

دووەم :- هزرڤانی دیکە هەن شانازی بە بیرۆکە تازەکانیانەوە دەکەن و

دەبنــە دیــل و کۆیلــەی ئــەو هزرانــە بــەبێ تێگەیــشتن و لێکۆڵینــەوە و شــیکردنەوە و قبووڵیــان دەکــەن و لــە لێــدوان و نووســینەکانیان وەکــوو مۆدەیەکی تازە دەیلێنەوە ... کە دەبێ خەڵك شووێنیان بکەوێ و ملکەچی ووشەو برگەکانیان بن .

٢٠٠٥/١٢/١٨ بە هۆی بەرزکردنەوەی نرخی سووتەمەنیەکانی بەنزین‌و ، نەوت‌و ، غازو ، گازو ، رۆن ، بە بڕیاری حکوومەتی ئیبراهیم جەعفەری لە سەر داوای بانکی دراوی نێوودەووڵەتی بە رێژەی خەیاڵی ، کە بە نزین لە ٥٣ دینار بۆ ٢٥٠ دینارو ، بەرهەمەکانی دیکەی سووتەمەنی بە هەمان شێووە ، هەر یەك بە رێژەیەك ، کە بووە هۆی خۆپیشاندان‌و نارەزایی گەلانی تێکرای ئێراق‌و حکوومــــەتی هــــەرێمی کوردســــتان‌و ســــەرنەکەوتنی بڕیارەکــــەو هەڵووەشاندنەوەی لە پاش دوو رۆژدا .

٢٠٠٥/١٢/١٩ بە ئامۆژگاری جۆرج بۆش هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق هەشت لە تاوانبارانی پاریــدەدەری ســەرۆکی رژێمــی بەعــسی رووخێنــدراو ســەدام حوسێن ئازاد کرا ، کە دوانیان ئافرەتە تاوانبارە کە بوون بە بەرهەمهێنانی چەکی بایلۆژی‌و کۆکردنەوەکانیان لە گەڵدا بوو ئەوانیش – هودا مەهدی عەماش ناسراو بەخاتوو ئەنتراکس– و – ریحاب تەها ناسراو بەخاتوو مکرۆب – لە راستیدا ئەمانە ٢٤ کەس بوون نەك ٨ کەس لە زیندانی کراوەکان .

٢٠٠٥/١٢/٢٢ دادگاییەك لە ئەستەنبۆڵ دادگایی نووسەری تورك زویکۆڤلیسی کرد... لە ســەر ئــەو کێــشەی کــە دەربــارەی کێــشەی خوێنــاوی نێــوان هێزەکــانی ئاسایــشی تــورك‌و چــەکدارنی کــورد بــڵاوی کردبــووەوە ، کــە گوایــە تیایــدا سوکایەتی بە نەتەوەی تورك کردووە ، لە بەر ئەوە بە بری ١٨٦٠ هەزار دۆلاری ئەمەریکی سزای درا .

٢٠٠٥/١٢/٢٣ دادگای لاهای نێوودەوڵەتی لە وڵاتی هۆڵوندا دادگای زیندانی خستە سەر فرانز ڤان ، بۆ ماوەی ١٥ ساڵ . ئەویش بە دان نانی بە فرۆشتنی مادەی ژەهراوی بە رژێمی سەدامو بەکارهێنانی دژی گەلی کورد لە باشوور کوردستان .




٢٠٠٥/١٢/٢٣ بە هۆی هەڵوویستە تیرۆرو ئازاردانەکانی گەلی ئێراق و زیندانی کردنو ئازاردانو بەند کراوەکانی سووپای ئێراق ، لە سەر داوای هێزەکانی سووپای ئەمەریکا بە ئامۆژگاری سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە رێگەی بالوێزی ئەمەریکا خەلیلزاد وەزیری ناوخۆی ئێراق بەیان جەبر دەستگیر کرا... بەڵام دوای چەند رۆژێك ئازاد کرا .

٢٠٠٥/١٢/٢٤ دادگایی کردنی دامەزرێنەرو سکرتێری پارتی غەدی میسری ئەیمەن نور بۆ ماوەی پێنج ساڵ ، بە هۆی دۆزینەوەی چەندین بیاونۆی فێل کردن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی میسر زیندانی کرا ، بەڵام لە بەر ئەوەی ناوبراو رۆلی کاریگەری لە گۆڕەپانی رامیاریو کۆمەڵایەتی میسر هەبوو ، کە دووەم پارت بوو کە ژمارەی کورسی بە دەست بێنێ لە دوای پارتی نیشتیمانی دەسەلاتدار بە سەرکردایەتی محەمەد حوسنی موبارەك ، کە زیاتر لە حەوت خول بە زۆر خۆی هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی کۆمارو دەسەڵاتە جۆراو جۆرەکانی لە سەر وڵاتی میسر .



٢٠٠٥/١٢/٢٥ شاندێکی تەوافقی ئێراق بە سەرۆکایەتی عەدنان دلێمیو ئەیاد عەلاوی لە پایتەختی ئوردن کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامداو گەیشتنە ئەوەی ، کە

هەڵبــژاردن لــه شــارەکانی ، دیالــەو ، بەغــداو ، بەســراو, کــەرکوك ، هەڵبووەشێنێتەوەو دووبارە بکرێتەوە.

بەڵام بەربەستەکەش هەبوو بە بڕیاریاندانی چەندین کاری ناکاوی دیکە بە هــۆی نەهاتنــە دی ئاواتــەکانیان لــە دەســەڵاتو پەرلــەمانی ئێــراق و دامو دەزگاکانیدا .

٢٠٠٥/١٢/٢٧ لە ئەنجامی گفتووگۆی چڕو هەڵسەنگاندنی کیشە جۆراوجۆرەکانی نێوان وولاتــانی عــەرەب ، یەکــەم کۆبوونــەوەی پەرلــەمانتارانی عــەرەب لــە شــاری قاهیرەی پایتــەختی میسر ئەنجامدرا ، بە ســەرکردایەتی جاسم ســەخوور ، کــە بــە تێکــڕای دەنگــی ئەنــدامانی پەرلــەمان دیــاری کــرا بــە ســەرۆکی هەڵبژێردراو ، لە پێنــاو چارەســەرکردنی کێشەی پەرلەمانەکانی وولاتــانی عەرەب و هاوسەنگی پەرلەمانەکان وەك پەرلەمانی ، ئەورووپی و ، ئەفریکی و ، پەرلەمانی دیکە لە جیهاندا .

٢٠٠٥ /١٢/٣٠ جێگری سەرۆك کۆماری پێشووی ڕژێمی بەعسی لە سووریا عەبدولحــەلیم خــەدام ، دەســتی لــە کــاری جێگــری ســەرۆك کۆمــار کێشاوەو هــەموو تاوانــه جۆارو جۆرەکانی خستە ئەستۆی سەرەك کۆمــاری سووریا بەشــار ئەســەد ، لــە تیرۆرکردنــی ســەرەك وەزیرانــی پێشووی لوبنــان رەفیــق حــەریری و ، بــە ســەدان کــاری تیرۆرســتی نامرۆڤانــەی دژ بەگــەلانی ســووریا لــە دەرەوەو ناوەوەی وولات ، کە بە ئــەنجامی گەیاندوه ، بە تایبــەتی بەرامبــەر بە گــەلی کوردو خاکی رۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە سووریا لە ناوچەکەدا .

## ٢٠٠٦

٢٠٠٦/١/١ ســــەرەك وەزیرانــــی ئێراقــــی فیــــدڕاڵ کــــاتی ئیــــبراهیم جەعفــەری و ســەرۆکی پــارتی دەعــوەی ئیــسلامی ئێــراق ، بــــەیاوەری شــــاندێکی حکوومــــەتی ئێــــراق ، دوای هەڵبــــژاردنی کۆمەڵــــەی



هەمیشەی لە سەردانێکی گەیشتە هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان و لەلایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەڕێز مەسعوود بارزانی پێشوازی لێکرا .

دوایی ئەوە دەستیانکرد بە گفتووگۆی نێوانیان لە ئالوگۆڕی بیروو بۆچوون و هەڵوویست ، لە بارەی باری ئێراقی فیدراڵی ڕامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و ئابووری و ئاسایش و ئاوەدانکردنەوەو پەیوەندیەکانی نێوان حکوومەتی هەرێم و سەرکردایەتی کورد لە گەڵ دەسەڵاتی ناوەندی ئێراقی فیدراڵ . بە جێبەجێکردنی مافەکانی گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی ماف کورد ، ئەویش بەجێ بەجێکردنی ماددەی/٥٨ لە یاساکانی ئیدارەی دەووڵەتی ئێراق.

شایانی باسە جەعفەری هۆکاری سەرەکی بوو لە دروستکردنی کۆسپ و تەگەر لە بوارەکانی ئاسایش و بنیاتنانەوەی ئێراق بە تایبەتی لە جێبەجێنەکردنی ماددەی/٥٨ سەرەڕای دروست بوونی لیژنەی ئاسایی کردنەوەی شاری کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بە سەرکردایەتی سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئێراق و ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی ئێراق حەمید مەجید موسا.

بە هەمان بیروو بۆچوونی سەدام و دام و دەزگاکانی مامەڵەی لە گەڵ مافەکانی کورد دەکردو هۆکاری بەرپابوونی شەڕی ناڕاستەوخۆی ناوخۆی نێوان هەردوو مەزهەبی دژ بەیەکتری شیعەو سوونە بووە جگە لە بە دەیان کێشەو گرفتی دیکە لە ئێراقدا .

٢٠٠٦/١/١ جەماوەری دانیشتووانی گەرەکی ڕەحیماوەی شاری کەرکوکی کوردستان خۆپیشاندانێکیان ئەنجامدا، لە پێناو چارەسەرکردنی کێشە جۆراوجۆرەکانی گەڕەکەکە ، لە ئەنجام بووە هۆی شەهید بوونی دوو هاوولاتی کوردو زامدار بوونی چەندین هاوولاتی ، کە بووە هۆی بەردەوامبوونی خۆپیشاندانەکە لە گەڕەکەکانی شۆڕیجەو قۆریە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە شاری کەرکوك .

٢٠٠٦/١/١ کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی ، ڕۆژهەلات TV – پەخشی بە پرۆگرامی – تێست – بە کوردستان و جیهان بلاوکردەوە ، کە لە لایەن بەرەی کوردستانی ، ئەویش بە سەرپەرشتی ڕێکخراوی کۆمەڵەی کوردستان لە

ڕۆژهەلأتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلأتی ئێران .

٢٠٠٦/١/١ سەرکردایەتی ڕژێمی بەعس و پارتی بەعس لە سووریا لە ئەنجامدا بڕیارێکی ڕایگەیاند ، بە دەرکردنی جێگری سەرەك کۆماری ڕژێمی بەعسی لە سووریا - عەبدولحەلیم خەدام - لە دەسەلات و پارتی بەعس و تاونبارکردنی بە تاوانی دژ بە نیشتمان و پارتەکە ، کە ناوبراو ماوەی ٣٠ ساڵ زیاتر خزمەتی بەعس و ڕژێمەکەی کرد ، دژی گەلانی سووریا . بە تایبەتی گەلی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بەسووریا .

ئەویش لە ئەنجامی چاوپێکەوتنێك لە گەڵ تەلەفزیۆنی کەناڵی ئەلعەڕەبیەو تاوانبارکردنی سەرۆك کۆمارو ئەمینداری گشتی پارتی بەعسی لە سووریا - حافز ئەسەد - و - بەشار ئەسەد - و داروودەستەکەی لەو گیروگرفت و کێشە هەمەلایەنەکانی سووریا بە دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی لوبنان و تیرۆرکردنی سەرەك وەزیرانی لوبنان ڕەفیق حەریری.

هۆکاری ناوزەند بوونی سووریا بە پاڵپشتی کردنی تیرۆر لە ناوچەو هەرێم و جیهان ... شایانی باسە عەبدولحەلیم خەدام جیاوازی نیە لە گەڵ بەشار ئەسەدو دارو دەستەکەی لە بەرپرسیاریەتیان لە بەردەوام بوونی ئێش و ئازارو ئەشکەنجەدانی گەلانی سووریا ، بە تایبەتی گەلی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان .



٢٠٠٦/١/٢ ئەندامی پەڕلەمانی پێشووی ئێران - بەهائەدین ئەدب - یەکێ بوو لە پەڕلەمانتارانی گرووپی کوردی و دامەزراندنی بەرەیەکی یەکگرتووی کوردی لە ڕۆژهەلأتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلأتی ئێران ، ڕاگەیاند لە پارت و ڕێکخراوە کوردستانیەکان لە پێناو داکۆکی کردن لە مافی دووەم نەتەوە لە ئێران ، کە کوردەو پشت گوێ خراوە لە لایەن کۆماری بە ناو ئیسلامی ئێران ،

ئەویش بە تێکۆشان لە چوارچێوەی دژ بە توونـدو تیژیو چەوسانەوەی نەتەوەییو نیشتمان .

٢٠٠٦/١/٣ ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز لە زاری پارێزەرێکی سەرۆکی ڕژێمی بەعسی ڕووخێنـدراو لـە ئێـراق – سـەدام حوسـێن – بڵاویکـردەوە ، کـە سـەدام حوسێن گوللە بارانی زۆرلاخۆشترە لە جیاتی لە سێدارەدانی گەرهاتوو دادگای دادگایکردنی سەدام بە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەربکات ، بە تاوانبـارکردنی بـە تاوانـەکانی جـەنگو کۆمـەڵکوژیو زینـد بەچـاڵو کیمیابـارانی گـەلانی ئێـراق ، بـە تایبـەتی گـەلی کـورد لـە باشـووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .



٢٠٠٦/١/٤ سـەرەك وەزیرانـی ئیـسرائیل – ئێرێـل شـارۆن – بـە هـۆی نەخۆشیە کوشندەکانی کەوتە ژێر چـاودێری پـشکنینو لێکۆڵینـەوە پزیشکیەکانو چونە نەخۆشخانە . تـاکوو تـەواو بـوونی ئـەو مێژوونامەیە هەر لە نەخۆشخانە مایـەوە ، کـە دامەزرێنـەری پـارتی ئـەکادیمیای ئیـسرائیل بـوو، لـە دوای ئـەو ئۆلمرت بـە سـەرەك وەزیـران لـە ئیـسرائیل دامـەزرا ، لـە پێنـاو هەڵسووڕاندنی کاروباری حکوومـەت کە بە پێی یاسای ئیسرائیل هـەر سـەرۆکێك لـە گـەر مـاوەی ١٠٠ ڕۆژ نـەیتوانی کارەکـانی دەسـەڵاتی حکوومەت ببات بەڕێوەوە ئەوا لە دەسەڵات لادەبرێ لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١/٤ لە بڕیارێکی ڕژێمی بە ناو کۆماری ئیسلامی لـە ئێران ، زمـانی کـوردی لـە فێرگـەو دامو دەزگاکـانی حکوومـەتی ئیسلامی لە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان قەدەخەکرد.

شـایانی باسـە بە پێـی مـاددەی/ ١٥ لـە دەسـتووری ئێـران ، کـە هـەموو نەتەوەیەك بۆی هەیە بە زمانی– دایك – ی خۆی ئاخاوتن بکـاتو فێـری ببیٚ لە هەموو بوارەکانی فێربوونو ڕۆشنبیریدا .

٢٠٠٦/١/٥ کۆنگرەیـەکی پـارتو ڕێکخـراوە کوردسـتانیەکانی بـاکوری کوردسـتانی

لکێندراو بەتورکیا ئەنجامدراو لە ڕاگەیاندنێکی دژی ڕەفتارو هەڵوێستی شــۆڤینی ڕژێمــی تــورك، کــە بەرامبــەر ســکرتێرو دامەزرێنــەری پــارتی کرێکارانی کوردستان عەبدبولاّ ئۆجەلان و گەلێ کوردی خۆڕاگر ئەنجامی دەدات لەهەموو بوارە جیاجیاکان لەباکوری کوردستان.

٢٠٠٦/١/٥ لــە ئــەنجامی خۆتەقاندنــەوەی تیرۆرســتێکی خــۆمینکراو لــە بەر دەگــای مەرقــەدی ئیمــامی حەســەن و عــەلی ئــەلهادی لــە شــاری ســامەڕا ، کــە ١٠٠ هاوولاّتی گیانیان لە دەستداو



زیاتر لە ٤٩ هــاوولاّتیش زامداربوون ، لــە گــەڵ یــەك ســەربازی ئەمــەریکا و وێرانکردنی چەند ئۆتۆمبێل و خانوو دوکان لە شارەکەدا .

٢٠٠٦/١/٥ لە ئەنجامی ڕووخانی هــوتێلێکی ئامــادەکراو بۆنیــشتە جێکردنــی حاجیــانی مــاڵی خــوا لــە شــاری مەککــە لــە ســعوودیە ، کــە بــووە هــۆی گیــان لــە دەســتدانی ٧٦ حــاجی و زامــداربوونی زیــاتر لــە ٦٠ حــاجی کــە لــەو حاجیانــە



حاجی کوردیشی تیا بوو ، کە هەندێکیان خەڵکی شاری هــەولێر بوون لــە باشــووری کوردســتان و پارێزگاکــانی دیکــەی کوردســتان بــوون لــە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١/٥ لە سەر داوای ئیدارەی حکومەتی ئەمەریکا سەرۆکی شارەوانی پارێزگای ئامەد – دیاربەکر- ئۆسمان بایدەمیر بەرەو ئەمەریکا بەڕێکەوت ، کە ڕژێمی تورکیای شۆڤینی زۆر دڵگران بوو بەو داوەتە بە یاوەری شاندێکی ڕێکخراوە مەدەنیەکانی پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان .



٢٠٠٦/١/٦ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاکسترۆ لە سەردانێکی گەیشتە ئێراق لە پارێزگای بەسرە هاتە خوارەوەو چاوی کەوت بە بەرپرس و سەربازانی بەریتانیا و دوایی لە بەغدا کۆبوونەوەی لە گەڵ بەرپرسانی ئێراق لە بەغدا کرد ، ئەویش چاوپێکەوتنی بە سەرەك کۆمار مام جەلال و سەرەك وەزیرانی ئێراقی فیدڕاڵ ئەنجامدا .

٢٠٠٦/١/٧ سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەڕێز مەسعوود بارزانی لە وتەیەکیدا ڕایگەیاند ، بە گەیشتن بە ڕێکەوتنی یەککگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی سلێمانی و هەولێر ، کە ئیدارەی سلێمانی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان دەسەڵاتداریەتی تیا دەرکردو ، ئیدارەی هەولێریش پارتی دیموکراتی کوردستان دەسەڵاتداریەتی تیا دەرکرد .



ئەویش بە بە لاوەنانی چەندین کێشەی نێوانیان ، داوای لە سەرۆك وەزیرانی ئیدارەی هەولێر نێچیرڤان بارزانی کرد ، بەپێکهێنانی حکوومەتێکی هەمە لایەنەی یەککگرتوو لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کە پەرلەمانی کوردستان ڕەزامەندی لە سەر بکات ... بەڵام دوای چی

و... بۆ چی ...؟...!. له پێناو گەل و نیشتیمان . یا ...؟.

٢٠٠٦/١/٧ جێگری سەرۆك كۆماری ڕژێمی بەعسی له سووریای پێشوو عەبدولحەلیم خەدام له بڕۆكسلی پایتەختی بەلژیكا كۆبوونەوەی لە گەلْ نوێنەری چەندێن لایەنی ڕامیاری و نەتەوەی و كۆمەلاًیەتی له ئۆپۆزسیۆنی سووریا ئەنجامدا ، بە تایبەتی چاودێری سەركردایەتی ئیخوان مسلمین بەرەو پێكهێنانی بەرەیەكی دیموكراتی و ڕاگەیاندنی بەیاننامەیەكی هاوبەش ، بە ناوی ڕاگەیاندنی دیمەشق ... بیْ ئەوەی باس له كورد و كێشەی كورد له كوردستانی لكێندراو بە سووریا بكرێت .

كە زیاتر لە ٠٠٠ر٥٠٠ر٢ ملیۆن كورد دانیشتووی بەر لە عەرەبن لەو وولاْتەو زیاتر له ١٧٠٠٠ هەزار كیلۆمەتر چوارگۆشەی لەخاكی ڕۆژئاوای كوردستانی پێلكێندراوە... ئەنجامدان و بە ئاوات گەیشتنی دەسەلاْت لە دەستی ڕاست بۆ دەستی چەپ ، كە بە هیچ جۆرێك گۆڕانكاری نە لە باری كورد و كێشە ڕەواكەی ناكرێت و له سەر هەمان ڕامیاریەت بەردەوام دەبن لە شێوازێكی دیكە هەر وەك دەلْێن - گورگەو لە پێستی مەڕدا - ...!.

٢٠٠٦/١/٨ لە نێوان شارۆچكەی بەرتلەو گوندی خازر كاروانێكی هێزی سووپای ئەمەریكا ، بیْ ئەوەی هیچ ئاگاداریەك بدات دەسترێژێكی گوللە بارانی كردە سەر ئۆتۆمبێلی شاندێكی یەكیەتی زانایانی ئایینی ئیسلامی لقی دهۆك .

كە لە ئاكامدا مامۆستا مەلا محەمەد عوسمان مزوری گیانی لە دەستدا ، دوای چەند ڕۆژێك بەرپرسانی ئەمەریكا لە پارێزگای مووسلْ داوای لێبووردنیان لە سەرۆكی هەرێمی كوردستان و بنەمالْەو یەكیەتی مامۆستایانی ئاینی كرد له هەریمی باشووری كوردستان.



٢٠٠٦/١/١٠ سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنیدا ووتی:- ئێران و کۆریای باکوور مافی خۆیانە کە ماددەی ئەتۆمی ئاشتی پەرەپێبدەن لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی ئابووری ، بەڵام پێویستە لە چوارچێوەی ڕێکەوتنامەکانی بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی دەرنەچێت ، کە لە سەر ئەو ڕێکەوتنامەیە مۆریانکردووە .

٢٠٠٦/١/١٠ وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵا گول لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنیدا ڕایگەیاند ، کە حکوومەتی تورکیا زاڵە بە سەر نەخۆشی ئەنفلەوەنزای باڵندە... شایانی باسە ئەو نەخۆشیە لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا بڵاو بۆتەوە ، کە ئەمەش بە هۆی گرینگی نەدان بە باکووری کوردستان لەلایەن ڕژێمی تورکیا ، لە هەموو بوارەکان ، کە بۆتە هۆی بڵاو بوونەوەی هەژاری و بێکاری و نەبوونی بژێوی ژیانی کورد ، بە تایبەتی لەگوندو شارۆچکەکان و هۆی دووەمیش بوونی نژادی کوردایەتیان لە ناو سنووری ئەو وولاتەدا .



٢٠٠٦/١/١٠ لە پرۆگرامی - ماوراءالخبر - لە تەلەفزیۆنی جەزیرە ، کە چاو پێکەوتنی لە گەڵ دکتۆرە - ئەمانی قەندیل - ووتە بێژی یاسایی ڕێکخراوی ئافرەتان و بەرگری کەری مافی مرۆڤ لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسرو ، دکتۆر- زەخەر ئیسلام خان - سەرنووسەری ڕۆژنامەی مللی جازیتی هیندی لە شاری نێودلهی پایتەختی هیندستان کرد. کە لە هیند لە ماوەی ٢٠ساڵی ڕابردوو ١٫٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن ئافرەت کوژراون بە هۆی نەویستی ڕەگەزی ئافرەت لە لایەن گەلانی هیندو مەزهەبی

ئاینیو ئاینەکان ، بە تایبەتی هیندۆسەکان کە ڕقیان لە ڕەگەزی ئافرەتە...
دوای ئەوەی بە هۆی ئامێری کۆمپیوتەر ، ئەویش بە دیارکردنی منداڵ لە سکی دایك بە نێر ، یاخوود بە مێ، کە دەزانێ ڕەگەزی مێیە بە پەلە لە باری دەبەنو نایەڵن ئەو منداڵە ڕەگەز مێیە لە دایك ببێ.
ئەمەش ساڵانە زیاتر لە ٥٠٠,٠٠٠ هەزار مەلۆتکە ، لە ناوسکی دایکی بە هۆی دەرکەوتنی بە مێینە لە ڕێگەی کۆمپیوتەر لە بار دەبرێنو بەڵکو دەگاتە ٥٠٠٠٠٠٠ر٥ ملیۆن ، هەروا لە بەریتانیا ساڵانە زیاتر لە ٦٠٠ر٠٠٠هەزار مەلۆتکەو ، لە ئەمەریکا زیاتر لە٥٠٠ر٠٠٠ هەزار مەلۆتکە .
ئەویش بە هۆی ڕگەزی مێینەیان لە بار دەبرێنو ، هەروا لە چینی میللیو باشووری ئاسیا بەگشتی ، هەتا لە وولاتانی عەرەبیو ئیسلامی ، بە هۆی دیایکردنی لە لایەن ئەو ئامێرە ، کە ئەمەش کارێکی تیرۆریستیانەی بێ وێنەیە لە ویژدانی مرۆڤایەتی لە سەر زەوی لە جیهاندا .

٢٠٠٦/١/١٠ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە کۆنگرەی - شەڕکەرە کۆنەکانی شەڕی بێگانەکان - کە لە واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا بەستراو لەو کۆنگرەیە وتارێکی خوێندەوەو بۆش گووتی:- ڕەگەزە ئاسایشو ڕامیاریو ئابووریو ستراتیژی سەرکەوتنیان لە ئێراق بە دەست هێناوە... بەڵام...!.

٢٠٠٦/١/١٠ ڕژێمی کۆماری ئیسلامی لە ئێران ، دەستی کرد بە پیتاندنی یۆرانیۆم لە ناوچەی کەرەجی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، لە پێناو دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی، لە هەمان



کات بە کارهێنانی وزەی گەردیلە و بەکارهێنانی بۆ وێستگەی ئەتۆمی کارەبای ئاشتی . بەڵام لە ئاکامی پاڵە پەستۆی نێودەووڵەتی ، بە تایبەتی ، ئەڵمانیاو ، فەرەنساو ، بەریتانیاو ، ئەمەریکا ، کە هەرچی پارەی لە بانکەکانی نێودەووڵەتی دیاریکراو هەیە ، بۆ ئاسانکاری بلۆك کردنی ئەو بڕە پارەیە لە لایەن ئەمەریکاو بانکی نێودەووڵەتی بگواسترێتەوە ئەو

بانکانەی کە دەسەڵاتیان بەسەردا ناشکێ لە وولاَتە جیاجیاکانی جیهاندا .



٢٠٠٦/١/١٢ بـە هـۆی جـەنجالیو پاڵەپەستۆی حاجیان لە کـاتی ڕووجـومکردنی شـەیتانی نـەفرەت لێکراو لـە شاری مەککە لـە لایـەن حاجیـانو جێبـەجێکردنی ئـەو ئەرکـە ، کـە یەکێکـە لـە ئەرکـەکانی مەڕاسـیمی تەواوکردنی حەج لە و وولاَتەدا . لە ئەنجام زیاتر لە ٣٦٢ حاجی گیانیان لە دەستدا بە هۆی بەربوونەوەو کەوتنە ژێر پێیان لەو شووێنەدا ، کە زۆربەی زۆریان حاجیانی وولاَتی میسر بوونو لە هەمان کات حاجیانی کوردی باشووری کوردستانی تێدابوو لە ڕێو ڕەسمەکەدا.

٢٠٠٦/٦/١٣ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆشو ڕاوێژکاری ئەڵمانیا خاتوو – میرکل– لە لێدوانێکی هاوبەشی ڕۆژنامەوانیدا بەرامبەر ڕۆژنامە نوسانو ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهانی ، داوایان لە ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران کرد ، بە دەست هەڵگرتنی لە کارەکانی ئەتۆمی، لە هەمان کات داوایان کرد ، کە دۆسیەی ئەتۆمی ئێران ڕەوانەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی بکرێت ، لە پێناو چارەسەری کێشەکە بەشێوەیەکی ئاشتیانە .

لە هەمان کات ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان کۆفی ئەنان ماوەی ٤٠ دەقیقە گفتووگۆی لە گەڵ باڵوێزی ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان عەلی لاریجانی ئەنجامدا ، لە پێناو هێورکردنەوەی کێشەکە ، بە ڕێگەی گفتووگۆی ئاشتیانەو دەستگیربوون بە یاساو ڕێنمایەکانی نێوودەوڵەتی لە جیهاندا .

٢٠٠٦/١/١٤ وەزارەتەکانی کشتووکاڵو تەندروستی ئێراقو حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەروازەی سنووری ئیبراهیم خەلیلی نێوان هەرێمی کوردستانو

تورکیایــان داخــست لــه ڕووی هاتنــه ژوورەوەی گۆشــتی پەلــەوەر بــەرو کوردستان و ئێراق ، بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەنفلەوەنزای باڵندەو نەگواســتنەوەی نەخۆشــیەکە ، کــە تــاکو ئێــستا لــە هــەرێمی باشــووری کوردستان و ئێراق ، هیچ دیاریدەی ئەو نەخۆشیە بەدی ناکرێ .

٢٠٠٦/١/١٥ کۆچی دوایی ئەمیری کوێت - شێخ جابر ئەحمەد جابر ئال سەباح- لە دوای ٢٧ ساڵ لە حکوومڕانی وولاتی کوێت ، لە دوای ئەو سەباح ئەحمەد سالح ئەلسەباح جێگەی ئەمیری کوێتی کۆچکردوی گرتەوەو بوو بە ئەمیری کوێت لە ٢٠٠٦/١/٢٤ دەست بە کاربوو لە سەر دەسەلاتی کوێت .

٢٠٠٦/١/١٥ لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری تشیلی و لە خۆلی دووەم خاتوو - تارجاها لونین - سەرکەوتنی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی تشیلی بە دەست هێنا ، لە پێناو بەرو باشبردنی باری وولاتەکە .

٢٠٠٦/١/١٥ ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران بە هەزاران کێڵگەی پەلەوەری لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاتی ڕژێمەکەی داخست و دوایی سووتاندی ، کە کەوتبووە سەر سنووری نێوان ڕژێمی ئێران و ڕژێمی تورکیا ، لە سەرخاکی کوردستانی لە تکراو بە هۆی قەدەخەکردن ، بە بڵاو نەبوونەوەی ڤایرۆسی ئەنفلەوەنزای باڵندە لە وولاتەکەدا .

هەروا لە ڕۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بەسووریاو بە تایبەتیش لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی تورکیا ، کە هەمووی هەر لە سەر خاکی کوردستان و بووە بە هۆی پشت گوێ خستنی هەرێمەکانی کوردستانی ژێر دەسەلاتەکانیان لە ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنان و پاکوخاوێن کردن و باش نەکردنی باری ژیانی گەلی کورد .

لە پێناو ناچارکردنیان بەکۆچکردن بەرەو هەندەران و دەربەدەر بوونی کورد لە سەر نیشتمانی دایک .



٢٠٠٦/١/١٥ بە بۆنەی کۆچبەرانی جیهان ، کەنیسەی پاپای ڤاتیکان ئاهەنگی گێڕاو پاپا – بندکتی– شازدەهەمی پاپای ڤاتیکان . پاش نوێژی بەشارە ڕایگەیاند ، کە کۆچبەران بونەتە دیاردەی سەردەمو داوایکرد ، کە هەموو هەوڵەکان بخرێنە گەڕ ، لە پێناو نەهێشتنی جیاوازیو چەوسانەوە ، لەو وولاّتانەی کە کۆچبەران ڕوویان تێکردووەو تێدەکەن . هەروا گووتی:–

ڕەنگە کۆچو پەنا بەری بە ئارەزوو ، یاخوود بە زۆرەملیّو شەرعیو ، یاخوود نهێنیو قاچاغ بێت ، پێویستە ڕێز لەیەکتر بگیرێتو جیاوازی نەمێنێت ، بە تایبەتی ڕێزگرتن لە ئافرەت چونکە بازرگانی پێوە دەکرێت بەقەدەخەکردنو بنبڕکردنی بازرگانی کردن بە ئافرەتو منداڵو کەسانی بێتوانا لەو وولاّتانەی ڕوویان تێدەکەن لە جیهاندا .

٢٠٠٦/١/١٦ بە هۆی کێشەو ناکۆکی ناوخۆی سەرکردایەتی پارتی یەکودی ئیسرائیلی ، لە ئاکام ئەو پارتە کەرت بوو بۆ دووپارتی لێك جیا ئەو لابالّی لایەنگرانی ئیریل شارۆن بوون .

کە بووە هۆی دامەزراندنی پارتی ئەکادیمە ، بە سەرکردایەتی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل ئیریل شارۆن ، دوایی شارۆن بە هۆی نەخۆشیە دژوارەکەی کەوتە نەخۆشخانەو جێگرتنەوەی لە لایەن – ئیهود ئیلمرت – بە سەرەك وەزیرانی کاتی ئیسرائیل .

٢٠٠٦/١/١٦ بۆ یەکەم جار لە ئەفریکیا لە دوای هەڵبژردنەکانی سەرۆکایەتی خاتوو – ئالین جۆنسۆن سیریف– پۆستی سەرۆکایەتی لیبیریای نوێی بگرتە دەستو سووێندی یاسایی بەرامبەر پەرلەمانی وولاّتەکە خوارد ، لە پێناو خزمەتکردنو بەرەوپێش بردنی وولاّتەکە ، لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

٢٠٠٦/١/١٧ گرێدانی کۆنگرەی نێوودەووڵەتی لە شاری پەکینی پایتەختی چینی میللی ئەنجامدرا ، لە پێناو چارەسەرکردنی ئەنفلەوەنزای باڵندە بە سەرپەرشتی

لیژنەی تەندروستی جیهان ، لە پێناو بەرگریکردن لەو نەخۆشیە لێگرەوەیە .

ئـەویش بـە تـەرخانکردنی بـڕی پـارەی گونجـاو و یارمـەتی دانـی ئـەو وولاتانەی کە توشی بوونەو دەبن بە تایبەتی وولاتانی هەژار لە جیهاندا .

٢٠٠٦/١/١٧ کۆچی دوایی هونەرمەند – جەلیل مستەفا عەبدولا – لە شاری هەولێر لە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان بـە نەخۆشـیەکی کتـوپڕ ...کـە مامۆسـتای پـەروەردەیی بـووەو دەسـتی لـە مۆمیـاکردن و پەیکەرتاشـی هـەبووەو ڕۆڵـی بالای هەبووە لەو دووبوارەدا .

٢٠٠٦/١/١٨ ڕێکخـراوی – هیـۆمن دایـتس ووتـش– ی بـەرگری کـەر لـە مـافی مـرۆڤ لـە راپـۆرتێکی سـالانەی/ ١٦ی ، بەرامبـەر ڕامیـاری ئەمـەریکا و هەنـدێ لـە وولاتانی هاوپـەیمان ، بـە پشتگوێ خستن و پێشێلکردنی مافی مـرۆڤ بەبێ ڕێزلێگرتنی .

ئـەم ڕاپۆرتـەش کـە لـە ٥٠٠ لاپـەڕە پێکهـاتبوو لـە بارەی باری مـرۆڤو مافی مـرۆڤ لـە ٦٨ وولاتـدا ، ئـەویش بـە دیـاریکردنی چـەند لایـەنێك لـە وتـاری سـەرۆکی ئەمـەریکا جۆرج بۆش بە نانەوەی دووڕوویی و چاندنی دژایـەتی کردنـی ڕێکخراوەکە کە بارەگـای لـە شـاری نیۆیۆرکە ، لـە لایەنـەکانی مـافی مرۆڤو داهاتووی لە ژیان .

هەروا بەریتانیاو ، کەنەداو ، ئوسـترالیا بە دەرکردنـی یاسـای ئاسـانکاری و دەستگیربوون پێی ، بە تایبەتی لە بوارەکانی مافی مرۆڤ لە وولاتەکانیاندا .

٢٠٠٦/١/١٩ سـەرۆکی ڕێکخـراوی توونـدڕەوی ئیـسلامی ئوسـامە بن لادن لـە وتـارێکی تۆمارکراو لە سەر سیدی و بلاوکردنـەوەی لە سـەر شاشـەی تەلەفزیۆنـەکانی جیهان ، بە تایبەتی لە تەلەفزیۆنی ئەلعەرەبیەو جەزیرە ، بە هەڕەشـەکردنی لە سەر ئەمەریکاو هاوپەیمانانی بە دەست بەکاربوونیان .



لە پێناو پەلاماردانی دام و دەزگاکانی ئیدارەی ئەمەریکاو هاوپەیمانانی ئەمەریکاو لە ئێراق و ئەفگانستان و وولاتانی دیکەی عەرەبی و ئیسلامی لە جیهان ، گەر ئەمەریکاو هاوپەیمانان هێزەکانی سوپایان لە ئەفگانستان و ئێراق و هەندێ وولاتی دیکەی عەرەبی و ئیسلامی نەکشێنێتەوە.

شایانی باسە چەندین جاری دیکە بەرلەو مێژووە دوورنیە دوای ئەومێژووەش ، هەرەشە لە هێزەکانی سوپاو دام و دەزگاکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانانی و لایەنگرانی بکات ... ئوسامە بن لادن و ڕێکخراوەکەی و ڕێکخراوی دیکە هاوبەشی ئوسامەو لایەنگرانی و دۆستەکانیان ، گەر شۆڕشگێڕن با خەبات و تێکۆشانیان بخەنەوە ناو وولاتەکانیان ، بەرزگارکردنی گەلەکەیان لە ژێر دەستی ڕژێمە داپلۆماسێنەرو چەوسێنەری وولاتەکەیان .

٢٠٠٦/١/١٩ لە دوای بەرزبوونەوەی فڕۆکەیەکی بارهەڵگری بازرگانی و گواستنەوەی هاوولاتیان لە سەر ئاسمانی شاری تارانی پایتەختی ئێران ، بە هۆی چەند هەڵەیەکی تەکنیکی و کارەبایی کەوتە خوارەوەو لە ئەنجام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٤٢ هاوولاتی ناو فڕۆکەکە .

٢٠٠٦/١/١٩ سەرۆك کۆماری بە ناو ئیسلامی ئێران – مەحمودی ئەحمەدی نەژاد – سەردانی کۆماری سووریای کرد ، کە لەو کات و ساتەش هەردوو ڕژێمی شۆڤێنی و بەر چاوتەنگی توندڕەوو دپلۆسێنەرو داگیرکەری ماف و خاکی گەلانی وولاتەکانیان ، بە تایبەتی گەلی کوردو خاکی کوردستان ، کەوتنە بەر شالاوی ڕاگەیاندن بە هۆی هەڵوێستی لێك جیاواز ، ئێران بە هۆی بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانی ئەتۆمی و سووریاش بە هۆی دەست تێوەردانی

لـه کاروبـاری نـاوخۆی لوبنـان و تیرۆرکردنـی سـەرەك وەزیرانـی پێـشووی لوبنـان ڕەفیـق حـەیری ، کـه هـەردوو وولاّت بـەردەوامن بـه دەسـت تێـوەردان لــەکاروباری نـوێی نـاوخۆی ئێـراق ودژایـەتی کردنـی ئیـسرائیل ، بـه یارمەتیـدانی پـارت و گرووپـه ئیـسلامیه توندڕەوەکانی سـووریاو لوبنـان و فەڵەسـتین و ناوچـەو هەرێمەکـه ، بـه تایبـەتی شـێواندنی بـاری بـەرەو پێشچوونی ئێراق له لایەن هەردوو ڕژێمی دژ به مافی مرۆڤو دیموکراتیـەت و چارەسەری کێشه هەڵواسراوەکان .

٢٠٠٦/١/٢٠ کۆمـسیۆنی بـالاّی هەلبژردنـەکانی نوێنـەرانی هەمیـشەیی ئێـراق ئـەنجامی ڕێژەی کورسیەکانی پارت و ڕێکخراو وگرووپـەکانی عـەرەب و کوردو شیعەو سووننەی ڕاگەیاند .

کـه لیـستی ئیتلافـی شـیعه ١٢٨ کورسـی بـه دەسـت هێنـا ، لیـستی هاوپـەیمانی کوردسـتان ٥٣ کورسـی بـه دەسـتهێنا ، بـەرەی تـەوافقی ئێراقی ٤٥ کورسی بەدەسـت هێنا ، لیـستی ئێراقیـه ٢٥ کورسـی بـه دەسـت هێنـا ، حیواری نیشتمانی ١٤ کورسـی بەدەسـت هێنـا ، ئـەوانی دیکـەش هەریـەکەو کورسیەکی به دەست هێنا له هەڵبژاردنەکەدا .

٢٠٠٦/١/٢٠ سـەرۆکی فەڕەنـسا جـاك شـیڕاك لــه لێـدوانێکی تەلــەفزیۆنی ڕەسمـی ڕایگەیانـدگوونی:- ئـەویش بـه بـەکارهێنانی چـەکی ئـەتۆمی بەرامبـەر بـەو وولاّت و ڕێکخـراوو گرووپانـەی ، کـه کـاری تیرۆرسـتی لـه فەڕەنـساو بەرامبـەر بەفەڕەنسا ئەنجام دەدەن ، له هەمان کـات دوپـاتی کـردەوە ، بـه داواکـردن لـه ڕژێمی ئێران به دەسـت هـەڵگرتنی لـه کـاری دروسـتکردنی چـەکی ئـەتۆمی و مـل کەچـی بـۆ داواکـانی کۆمـەڵگای نێوودەوڵـەتی ، بـه تایبـەتی یەکیـەتی ئەوروپاو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان .

٢٠٠٦/١/٢٠ یاریەکانی جامی میللەتانی کیشووەری ئەفریکیای تۆپی پێ دەسـتی پێکـرد ، له شاری قاهیرەی پایتەختی میسرو له کۆتایی یاریـەکان یاریزانـانی تـۆپی پێی میسر سەرکەوتنیان به دەستهێنا له بردنەوەی یاریەکان .

٢٠٠٦/١/٢١ لـه ئاکـامی بـارینی بـەفرو بـارانێکی زۆر لـه مۆسـکۆی پایتـەختی ڕووسـیاو دەووروبەری و تەم و مژی ساردی ، کـه پلـەی سـاردی گەیـشته ٢٣پلـەی ژێـر سفر ، له ئەنجام ٣٥ هاووڵاتی گیانیان له دەستدا ، له هەمان کات بووە هۆی وەستاندنی هاتوچۆو گەیاندن و به دەیا ئامێری کارپێکردن له وولاّتەکەدا .

٢٠٠٦/١/٢١ گرێـدانی کۆبوونـەوەی نـا ئاسـایی پەرلـەمانی کوردسـتان ، لـە پێنـاو یەکخـستنەوەی هـەردوو ئیـدارەی هـەولێرو سـلێمانی لـە یـەك حکوومـەتی هەرێمی یەکگرتووی فرە لایەن .

کە بەڕێزان مام جەلال و مەسعوود بارزانی ئامادەی بوون لە گەڵ ئامادە بوونی باڵوێزی ئەمەریکا لە ئێراق زەڵمای خەلیل زادو ، باڵوێزی بەریتانیاو ڕووسیاو ، ئێرانو ، چینی میللی و ، لە گەڵ چەندین کەسایەتی دیکەی ئێراقی و کوردی لە دەرەوەو ناوەوەی هەرێم.

ئـەویش بەخوێندنـەوەی ڕێکـەوتنی ڕێکخـستنەوەی هـەردوو ئیـدارەو دیاریکردنی سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و جێگرەکەی لە پێناو دامەزراندنی کابینەی پێنجەمی بەرفراوان لە لایەن پەرلەمانی کوردستان پەسندکرا...!.

٢٠٠٦/١/٢١ سەرۆکی کۆسۆڤۆ – ئیبراهیم ڕۆگۆڤا – لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد ، کە لە ماوەی ژیانی بەردەوام بووە لە خەبات و تێکۆشان لە پێناو بەدی هێنانی سەربەخۆیی کۆسۆڤۆ ، کە بووە هۆی دروستکردنی بارودۆخێکی لە بارو گونجاو لە ناوچەکە ، بە هۆی ڕۆڵی کاریگەری لە سەر بە دەستهێنانی ماف لە ڕێگەی ئاشتی و بەیەکەوە ژیانی لە گەڵ گەلانی دیکەی ناوچەکە بە ناوی –گاندی هەرێمی بەلکان .

٢٠٠٦/١/٢٢ بۆ یەکـەمجار لـە مێـژووی پەیوەندیـەکانی نێـوان شانـشینی سـعوودیەو کۆماری چینی میللی ، بە تایبەتی و جیهان بە گشتی ، شانـشین عەبـدولا شانـشینی سـعوودیە لـە



سـەردانێکی ڕەسمـی گەیـشتە پـەکینی پایتـەختی چـین ، لـە پێنـاو بـە هێزکردنـی پەیوەندیـەکانی ڕامیـاری و ئـابووری و ڕۆشـنبری ، بـە تایبـەتی ئـابووری ، کـە چـینی میللـی ڕۆژانـە ٥٠٠,٠٠٠ هـەزار بـەرمیل نـەوت لـە سعوودیە دەکڕێ . شایانی باسە چینی میللی ڕۆڵی گرنگی لە ڕامیاریەتی نێوودەوڵەتی هەیە بە تایبەتی لە بواری ئابووری و بازرگانی لە جیهاندا .



٢٠٠٦/١/٢٣ لە دوای دەستکێشانەوەی دادوەر ڕزگار محەمەد ئەمین لە دادگای تایبەتی بە دادگایکردنی سەرۆکی ڕژێمی بەعسی ڕووخێندراو لە ئێراق و دارو دەستەکەی ، بە هۆی دەست تێوەردانی لایەنە ڕامیاری و مەزهەبە ئاینیەکان لەحکوومەتی ئێراق ، لە کاروباری دادگایکردن ، کە ڕەئوف ڕەشید عەبدولرەحمان بە داوەری دادگایکردنی سەدام حوسێن و نۆ لە دارو دەستەکەی دانرا کە خەڵکی هەڵەبجەی شەهیدە لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/١/٢٣ دەست پێکردنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی گشتی و سەرەك وەزیران لە کەنەداو، لە ئاکامی هەڵبژاردنەکان و بە ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن ، کە پارتی پارێزگاران سەرکەوتنیان بە دەستهێنا بە وەرگرتنی دەسەڵات لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٦/١/٢٤ چوار دبلۆماتکار لە باڵوێزخانەی بەریتانیا لە مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای یەکگرتوو بە هۆی شارەزاییان لە کاروباری حکوومەت و پەیوەندی کۆمەڵایەتی ، لە ئەنجام هەڵسان بە سیخووڕی کردن لە سەر دام و دەزگا گشتیەکانی ڕووسیا ، لە ڕێگەی وێنەگرتن بە ئامێری دروستکراوی تایبەت بەچاندنی لە سەر ڕۆخی شەقامەکان و گۆڕەپانە تایبەتیەکان .

لە ئەنجامی ئەوکارەو ئاشکرابوونی بووە هۆی دروست بوونی تەنگەژەی نێوان حکوومەتی ڕووسیاو شانشینی بەریتانیا بە سەرهەڵدانەوەی شەڕی سارد ، لە پەیوەندیەکانی نێوان ڕووسیاو وولاتانی ڕۆژئاواو ، لە هەمان

کات باڵوێزی بەریتانیا لە مۆسکۆ یارمەتی ڕێکخراوە ناحکوومیەکانی دەدا ، بە پارە لە پێناو جێبەجێکردنی مەرامەکان ، کە بووە هۆکارێکی نا لە باری شەقامی ڕووسیاو پەرلەمانی ڕووسیا – دۆما – و دەسەڵاتی باڵای ڕووسیا لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .



٢٠٠٦/١/٢٥ لە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی یاسادانانو حکوومەتی فەڵەستینو لە دوای تەواوبوونی لێک جیاکردنەوەی دەنگی دەنگدەران ، لە نێوان جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامیو ڕێکخراوی فەتح ، ئەویش لە بارو دۆخێکی دژواردا چ لە پەیوەندی نێوان ئەو دوو جووڵانەوەیەو چ لە پەویوەندی هەریەکیان لە گەڵ حکوومەتی ئیسرائیل ، لە ئەنجام جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی لە هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنی بەدست هێنا ، کە بووە هۆی دروست بوونی بارێکی نا لە بارو نگرانیووڵاتانی ناوچەو هەرێمو جیهان بە تایبەتی ئەمەریکاو بەریتانیاو یەکیەتی ئەوروپا ، جگە لە ئیسرائیلیش ، کە کاردانەوەی کاریگەری خراپی کردەسەر دوا ڕۆژی گەلی فەلەستینو پەیوەندیەکان دەکات لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەوەییو نیشتمانو دەسەڵات لە داهاتووی دامەزراندنی دەووڵەتی فەلەستین.

٢٠٠٦/١/٢٩ کۆبونەوەی لیژنەی چوارلایەنەو لە هەمان کات سەردانی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا – میکل – بۆ ئیسرائیلو دوایی سەردانی سەرۆکی فەڵەستین مەحمود عەباس لە شاری ڕامەللای کرد ، لە هەمان کات هەڕەشەی ئەمەریکا بە بڕینی ٢٢ ملیۆن دۆلاری یارمەتیەکانی بۆ دەسەڵاتی فەڵەستین ، بە هۆی

سەرکەوتنی جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی لە هەڵبژاردنەکان .

لە هەمان کات یەکیەتی ئەوروپا مانگانە ٥٠٠ ملیۆن یۆرۆی یارمەتی بۆ دەسەڵاتی فەڵەستین دابین دەکرد ، لە هەمان کات بڕینی یارمەتی ئیسرائیل کە مانگانە ٠٠٠ر٠٠٠ر٣ملیۆن دۆلار دابین دەکرا بۆ فەلەستین و چەندین ملیۆن دۆلاری دیکە لەوڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی دابین دەکرا بۆ فەڵەستین ، کە هەر یەك بەپێی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان .

ئەمەش بە هۆی سەرکەوتنی جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی کە ئەو جووڵانەوەیە لە لیستی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانی جیهان تۆمارکراوە ، کە هەوڵەکانی لە ناوبردنی ئەو جووڵانەوەیە بەردەوامە ، بە تایبەتی لە بواری دەسەڵات و سەربەخۆیی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٦/١/٢٩ بە هۆی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی دانیمارکی بە چەندین وێنەی کاریکاتێری – پێغەمبەری ئیسلام – کە بووە هۆی نارەزایی وولاتانی ئیسلامی ، بە تایبەتی وولاتانی عەرەبی و هەوڵی پچڕانی پەیوەندی دبلۆماسی و بازرگانی لە گەڵ وولاتی دانیمارك درا بە تایبەتی خۆراك ، بەو هۆکارە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی سەر بە یەکیەتی ئەوروپا دژی وولاتانی ئیسلامی و بە تایبەتی وولاتانی عەرەبی وەستاو ڕایگەیاند ، بەوەی کە پچڕانی پەیوەندی ئابووری لە گەڵ دانیمارك پچڕانی پەیوەندیە لە گەڵ یەکیەتی ئەوروپا ، دوای ئەوە هەرەشەی پچڕانی پەیوەندی بازرگانی و ئابووری لە گەڵ وولاتانی ئیسلامی بە تایبەتی وولاتانی عەرەبی کرد.

شایانی باسە شانشینی دانیمارك وولاتێکی دیموکراتی سەرەکیە کە ڕۆژنامەو ڕاگەیاندن ئازادەو سانسۆری لە سەر نیە لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١/٣٠ بەرپرسانی کورد لە پارت و دەسەڵات بەیاننامەیەکیان ئاراستەی حکوومەتی ئێراق و پارێزگاری مووسڵ کرد ، بە هۆی کوشتن و تیرۆرکردن و دەربەدەرکردنی خێزانی کورد لە پارێزگای مووسڵ لە ماوەی ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٤/٩ تاکوو کۆتایی ساڵی٢٠٠٥ کە زیاتر لە ٦٠٠ هاووڵاتی کورد تیرۆرکراون و بە سەدان خێزان دەربەدەرکراون لە پارێزگاکەو ، لە هەمان کات ئەو کارە بەرامبەر بە مەسیحیەکانیش ئەنجامدراوە لە سنووری

پارێزگای مووسڵدا .

٢٠٠٦/١/٣١ لە دوای مشتومڕێکی چڕو دوورو درێژو بەردەوام لە نێوان وڵاتانی ئەندامی هەمیشەیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیا ، لە ئاکام گەیشتنە ئەو هەڵوێستەی ، کە دۆسیەی ئەتۆمی ئێران ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن لە پێناو پشکنین و لێکۆڵینەوەو گەیشتن بە یەك هەڵوێستی هاوبەش لە لایەن ، ڕووسیاو ، فەرەنساو ، چینی میللی و ، بەریتانیاو ، ئەمەریکاو ئەڵمانیا... شایانی باسە سەرەتای بڕیاری لێدانی سەربازی ئاراستەی ئێران دەکرێت ، لە دوایی هێور بوونەوەی بارودۆخی ئێراق . لەناوچەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/٢/٣ بارانێکی بێ وێنە لە هەموو شارو شارۆچکەو گوندەکانی باشووری کوردستان باری ، بە تایبەتی لە پارێزگای هەولێرو سلێمانی ، کە ٣٥ کاتژمێر بەبێ پچڕان بارانەکە بەردەوام بوو.... کە بووە هۆی ڕوودانی لافاوو وێرانکردنی سەدان خانوو ڕووخان و زیانێکی مادی و گیانی لێکەوتەوە ، بە تایبەتی لە پارێزگای هەولێرو سلێمانی ، کە ماوەی زیاتر لە ٦٠ ساڵ بەر لە ئێستا ئەو جۆرە بارانە لە باشووری کوردستان نەباریووە .

٢٠٠٦/٢/٣ باخیرەیەکی گواستنەوی مرۆڤ و بازرگانی ، کە لە بەندەرەکانی وڵاتی سعوودیە بەرەو بەندەرەکانی وڵاتی میسر بە ڕێکەوت کە زیاتر لە ١٤٠٠ هاووڵاتی لە هەموو نژادەکانی وڵاتانی جیهانی هەڵگرتبوو ، لە ئەنجامی نقومبوونی لە دەریا بووە هۆی گیان لە دەست دانی زیاتر لە ١٠٠٠ هاووڵاتی ، جگە لە زیانی باخیرەکەو کەلوپەلی هاووڵاتیانی ناو باخیرەکەو خۆراك ، کە باخیرەکە خاوەنداریەتیەکەی هی وڵاتی میسر بوو .

٢٠٠٦/٢/٤ گیان لە دەستدانی زیاتر لە ٨٨ هاووڵاتی هاندەر لە یەکێك لە یاریگاکانی شاری مانێلاو بە دەیا زامدار .
ئەویش لە ئەنجامی دژایەتی نێوان لایەنگیرانی گروپە یاریکەرەکانی وەرزشی لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٢/٤ سووتاندنی هەردوو باڵوێزخانەی دانیمارك و، نەرویژ لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا ، لە لایەن خۆپیشاندەرانی دژ بە هەردوو شانشینی دانیمارك و ، نەرویژ ، بە تایبەتی دانیمارك لە لایەن ئیسلامە توندڕەوەکان ،

بـــه هـــۆی بڵاوكردنـــەوەی وێنـــەی پێغەمبـــەری ئیـــسلام محەمـــەد – د.خ – بەشێوەی كاریكاتێر له ڕۆژنامەیەكی دانیماركیدا .

٢٠٠٦/٢/٤ له كۆبوونەوەی ناكاوی ئەنجوومەنی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی له شاری ڤیێناو بڕیاری ئاڕاستەكردنی دۆسیەی ئەتۆمی ئێرانی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەكگرتووەكان بۆ درا ، بە تەواوی دەنگ تەنیا سووریاو ، ئێران و ، پێنج له وولآتانی ئیسلامی نەبێت دژی بڕیارەكه وەستان .

٢٠٠٦/٢/١٠ له دوای كۆچی دوایی سەرۆكی هەرێمی كۆسۆڤۆ ئیبراهیم ڕۆگۆڤا له ١/٢١ – فاتمیر سیدیۆ – له لایەن پەرلەمانی كۆسۆڤۆ ، كه ١٢٠ نوێنەرن بە سەرۆكی هەرێمی كۆسۆڤۆ هەڵبـژێردرا ، كـه مرۆڤێكی یاساناس و كەسایەتیەكی لێهاتووی ئەو هەرێمەیە.

شایانی باسه فاتمیرسیدیۆ پاڵیوڕاوی یەكەم بووه بۆ ئەو پۆستەو جێگری سەرۆكی ڕایەڵـەی كۆسۆڤۆی دیموكراتی بـووه ، كـه ئیبراهیم ڕۆگۆڤا سەركردایەتی دەكرد ، كه له ساڵی ١٩٨٩ دامەزرا بوو. سەرۆكی كارگێڕی نێودەوڵەتی كۆسۆڤۆ سوڕین یسین بیترسۆن له ڕاگەیاندنێكی خۆشحاڵی خۆی بۆئەوكاره دەربڕی له پایتەختی كۆسۆڤۆ ، كه بریشتینا گەشتەكەی دواخست بۆ شاری نیۆیۆرك له پێناو ئامەده بوونی دانیشتنی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی تایبەت به كۆسۆڤۆ.

٢٠٠٦/٢/١٠ دەست پێكردنی یاریەكانی بیستەمی ئۆڵۆمپیاتی زستانه ، كه تاكو ٢/٢٦ ی هەمان ساڵ بەردەوام بوو له شاری تۆرینۆی ئیتاڵیا له دوای پەنجا ساڵ ، كه له كورتینا ئەنجامدرا ، كه ٢٥٠٠ یاریزان له ٨٥ وولآتی جیهان به شداری تێدا كرد .

٢٠٠٦/٢/١٠ له هەرێمی ستاخرو بۆڵی له باشووری ڕووسیا شەڕو پیكدادان بەرپابوو ، له نێوان هێزەكانی ئاسایشی ڕووسیاو چەكداره توندڕەوەكانی ئیسلامی شیشان ، كه له ئاكام بووه هۆی گیان له دەستدانی زیاتر له ٢٠ چەكدار له هەردوولایەن .

ئەویش له دوای گەمارۆدانی حەشارگەیەكی یاخی بووەكانی شیشان له كۆماری قەوقاز ، كه ماوەی ٢٠ كاتژمێر شەڕەكه بەردەوام بوو... شایانی باسه كه ستاخروبۆڵی ٢٠٠ كیلۆمەتر له سنووری شیشان دوور بوو له

ناوچەكە دا .

٢٠٠٦/٢/١٢ لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سەركردايەتی ليستی هاوپەيمانی شيعە دووبارە سەرەك وەزيرانی ئێراق ئيبراهيم جەعفەری بۆ دوبارە وەرگرتنی پۆستی سەرەك وەزيرانی هەميشەيی ئێراق هەڵبژێردراوە كە سەرۆكی پارتی دەعوەی ئيسلامی ئێراقەو مرۆڤێكی شۆڤينی دژ بەكوردو خاكی كوردستانە .

شايانی باسە ناوبراو جياوازی نيە بە هيچ جۆرێك لە گەڵ سەرۆكی ڕژێمی بەعسی ڕووخاو سەدام حوسێن ، بەڵكو سەداميش باشتر لە هەموو سەركردەكان شيعە دوای ڕووخاندنی سەدامو سووننەكان ، دەسەڵاتێكی گەندەڵی و كۆسپ خستنە بەرەو پێشەوە بردنی باری ئێراق بوو ، بە تيرۆركردنی بيری ڕۆشنبيرو ڕوناكبيرە هەمەلايەنەكانو بە دەيا كاری ديكەی خزمەت گوزاریو ئاوەدانكردنەوە لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٦/٢/١٤ لە ڕاگەياندنێكی هاوبەشی نێوان سەرۆكی ڕووسيای يەكگرتوو فلاديمير پوتينو سەرەك وەزيرانی فەرەنسا دۆفيل دۆمينيپال بە دووپاتكردنەوە داوايان لە ئێران كرد ، بە ڕاگتنی كارەكانی پيتاندنی يۆرانيۆم ، لە پێناو وەبەرهێنانی چەكی ئەتۆمی لە ئيران بە ڕێزگرتن لە داواكاريەكانی نێوودەووڵەتی لە بواری كارەهەمەلايەنەكانی ئەتۆمی لە ئێراندا .

٢٠٠٦/٢/١٤ لە كوردستان بە گشتیو لە پارێزگای هەولێر بە تايبەتی خۆپيشاندانێكی بەرفراوان ئەنجامدرا ، لە لايەن پارتو ڕێكخراو وجەماوەرێكی زۆری ئيسلاميەكان ، بە سەركردايەتی زانايانی ئايينی ئيسلامی، بە ڕەزامەندی حكوومەتی هەرێمی كوردستان دژی ئەو وێنە كاريكاتيريانەی كە لە چەندين وولاتی ڕۆژئاوا بە تايبەتی لە وولاتی دانيمارك ، ئەويش بە سوكايەتی پێكردنی پێغەمبەری ئيسلام .



شایانی باسە ڕۆژێك لە ڕۆژان نە پارتو نە ڕێكخراوە ئیسلامیەكانو نە ئەنجوومەن ، یاخوود دەستەی زانایانی ئیسلام و نە لە هەموو كوردستانو نە لە باشووری كوردستان ، یاخوود لە یەكێك لە شارەكانی خۆپیشاندانیان دژی كردوەكانی ڕژێمەكانی ئێرانو ، توركیاو ، سووریاو ، بە تایبەتی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ئەنجام نەدا ، كە بەرامبەر بە هەڵەبجەی شەهیدو ئەنفالو وێرانكردنی بە هەزارەها مزگەوت لە گوندەكانی كوردستانو وێرانكردنی زیاتر لە ٤٥٠٠ گوندو شارۆچكەو زیندە بەچاڵو گۆڕەبەكۆمەڵەكان ، مەلا ئاینیەكان بێ دەنگ بونیان بە شێوەیەكی گشتی لە پێناو پارەو پارچە زەویو دەمانچەی ژێر عەباكەیانو دوعاكردن بۆ سەدام بە مانەوەی لە بە عەرەبكردنو وێرانكردنی كوردستانو تیرۆركردنی كوڕو كچو منداڵو ئافرەتی كوردو بەرگری نەكردنیان لە قورئانە سوتێنراوەكان .

شایانی ئاماژە پێكردنە ، كە ووتارەكانی ئاینی ڕۆژانی هەیینیان بەرگری كردن بوو لە سەدامو ڕژێمەكەی، تەنیا هەندێ مامۆستای شۆڕشگێڕو خۆڕاگری نەتەوەیو نیشتمانی گەلەكەمان نەبێت...؟...!.

٢٠٠٦/٢/١٥ لە كۆبونەوەی ئاسایی یەكیەتی ئەوڕوپا كە پشتگیری تەواوی خۆی بۆ دانیمارك ڕاگەیاند ، كە دانیمارك ئەندامێكی كاریگەری یەكیەتی ئەوڕوپایەو لە هەمان كات دژی دەستكاری كردنی یاساكانی بیروڕای ئازادن ، هەر لەو كۆبونەوەیە بەڕێزگرتن لە هەموو ئایینە جیاجیاكان لە جیهان ڕاگەیاندو پشتگیری خۆپیشاندانی ئاشتیانەی دوپاتكردەوە ، ئەمەش بە هۆی بڵاوكردنەوەی چەند كاریكاتێرێك لە سەر وێنەی دروستكراوی پێغەمبەری ئیسلام .

٢٠٠٦/٢/١٥ بە هۆی بڵاو بوونەوەی برسیەتیو ژیانی نا لە باری گەلانی سۆماڵ لە دوو هۆكاری سەرەكی ، یەكەمیان :- بە هۆی شەڕو پێكدادانی نێوان هێزە چەكدارە هۆزو تیرە جیاجیاكان ، دووەم :- وشكانی ووڵاتەكە بە هۆی نەبارینی باران .

سەرەك كۆماری سۆماڵ عەبدوللا یوسف ڕاگەیادنێكی داواكاری ئاراستەی ووڵاتانی جیهان كرد ، لە پێناو بە دەستهێنانی ٦٠ ملیۆن دۆلار لە پێناو ڕزگاركردنی ٨ر٠٠٠ر٠٠٠ ملیۆن مرۆڤ بەرزگاركردنیان لە مردنی بە مەرگەساتو لە برسان ، بە تایبەتی زیاتر لە ١ر٥٠٠ر٠٠٠ ملیۆن منداڵ ، كە

تەمەنیان لە پێنج ساڵ کەمترە .

هەروا لێدانی زەنگی جەنگ لە نێوان کۆماری ئەسیوبیاو ئەریتیریا و بە دەیا کێشەو گرفتی دیکەی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی تیرەو هۆزدا لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/٢/١٥ ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستی ئەمەریکا ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە بە ناوی ٣٠٠ هەزار تیرۆرست لەجیهانی ئیسلامی ، کە ئەو زانیاریانە لە لایەن ١٠ دەزگای سیخووڕی ئەمەریکا وەرگیراوە ، بە تایبەتی لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمەریکا و دەزگای سیخووڕی – ئای .سی.سی – سەربازی ، کە ڕاستیەکەی ئەو ژمارە خۆی لە ٢٠٠ هەزار تیرۆرست دەدات .

ئەویش لە ڕێگەی پیاوانی سیخووڕی ئەمەریکا ، کە لە وولاتان کۆکراوەتەوە ، بە تایبەتی لە پاکستان و ، ئەفگانستان و ، ئێراق و سووریاو ، لوبنان و ، جەزائیرو ، وولاتانی دیکەی عەرەبی و ئیسلامی ، بە تایبەتی وولاتانی عەرەبی لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٢/١٥ ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا یاسای دژ بە تیرۆری پەسندرکرد لە پێناو ڕێگە گرتنی لە هەموو بوارە جیاجیاکانی کاری تیرۆرستان ، کە بووە هۆی ناڕەزایی و دڵە ڕاوکێی گروپە ئیسلامی و ئیسلامە دانیشتووەکانی بەریتانیا .



ئەویش بە پێشێلکردنی مافەکانیان و ڕێگە گرتن لە جێبەجێکردنی مەرامەکانیان بە ناوی ئاینەوەو دوورخستنەوەیان لە بەریتانیا بەرەو وولاتەکانی خۆیان ، ئەو یاسایەش لە لایەن ئەنجوومەنی لۆرداتی بەریتانیا پەسەند کرا ، کە بەرزترین ئەنجوومەنە لە گەڵ دەستکاری پەسندکراو بووە یاسای بنەڕتی ، کارپێکردن بە شێوەیەکی هێمنانەو ڕاستەقینە لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٦/٢/١٦ فرۆکەیەکی مەدەنی گواستنەوەی ئەڵمانی کە لە فرۆکەخانەی باکووری

پایتــەختی ئازربایجـان بـەرەو فرۆکەخانــەی نێوودەوڵـەتی سـلیمانی بـە ەرێکـەوت ، پێـنج هـاوولاتی کـوردو بیـانی هــەڵگرتبوو لــە نێـوان گونـدی قەراجیان و بۆشین ، کە گوندێکی سەر بە قەزای دوکانی پارێزگای سلێمانیە ، ئـەویش شـاخی چـەوە سـپیە بـە بـەرزی ۱٦۰۰ مـەتر کەوتـە خـوارەوەو فرۆکەکـە تێـك شـکاو هاوولاتیـانی نـاو فرۆکەکـە گیانیـان لـە دەسـت دا لـە باشووری کوردستان.



٢٠٠٦/٢/١٦ شـاندێکی ڕێکخـراوی حەماسـی ئیـسلامی فەلەسـتین لــە دوای سـەرکەوتنی لـــە هەڵبـــژاردنی ئەنجوومـــەنی یاســـادانان بـــە سـەرکردایەتی سـەرۆکی مەکتـەبی سیاسـی جووڵانـەوەی حـەماس خالید مەشعەل سەردانی تورکیای کـرد ، بـەڵام لـە لایـەن حکوومـەتی تورکیا پێشوازی لێنەکرا . بـە تایبـەتی لـە لایـەن سـەرەك وەزیرانی تورکیا ئۆردگان و وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵا گول ، بەڵام بە نای حزب پێشوازی لێکرا ، لە لایەن عەبدوڵا گول بە هۆی کارتێکردنی پالە پەستۆی ڕامیاریەتی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان.

٢٠٠٦/٢/١٦ لە سەر بانگهێشتی – US I P – نوێنەری حکوومەتی هەرێمی‌باشووری کوردستان لـە ئیـدارەی هـەوڵێر بە شـداری لـە کۆبونەوەکـە ئەنجامـدرا ، کـە حکوومەتەکانی دراوسێی ئێراق بەشداربوون ، لە ئەسینای پایتەختی یۆنـان ، کە نوێنەری وولاتانی ئێراق و ، ئێران و ، تورکیاو ، سووریاو ، بە بەشداری چەندین پسپۆڕو شارەزاو زانا ئامادەی بوون لە سەر باری پرۆسـەی ئێسـتاو داهاتووی ئێراق .

٢٠٦/٢/١٧ گرێدان کۆنگرەی ئەنجوومەنی پارێزگاکانی ئێراقی فیدڕاڵ لـە شـاری بەغـدا ، بـە ئامـادە بـوونی ١٥ پارێزگـاو نوێنـەرانی ١٥ پارێزگـای ئێـراق ، جگـە لـە پارێزگاکانی کوردستان .

٢٠٠٦/٢/١٧ ئیدارەی ئەمەریکا لە ڕێگەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش ٥ ملیۆن دۆلاری بۆ ئۆپۆزسیۆنی سووریا بە سەرکردایەتی جێگری سەرەك کۆماری سووریا عەبدولحەلیم خەدام بەخشی ، لە پێناو لاوازکردن و ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لە سووریا .

٢٠٠٦/٢/١٧ لە فیستیڤاڵی بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ڤیستڤاڵی بەرلینی سینەمایی نمایشکرا ، کە فلیمێکی کوردی لە سەر شۆڕشی کورد بە ناوی – دەمێ نێرگز بێشکڤن – نمایشکرا ، کە بووە هۆی جێگەی سەرسورمان و لە ئاکام خەلاتی ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی بە دەستهێنا .

٢٠٠٦/٢/١٨ گرێدانی کۆبوونەوەی لیستەکانی هاوپەیمانی کوردستان و لیستی ئەلعراقیەو بەرەی تەوافقی نیشتمانی و پارتی ئیسلامی ئێراقی ئەنجامدرا ، بە ئامادە بوونی بەڕێزان سەرەك کۆماری ئێراق و سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق لە پێناو گەیشتن بە پێکهێنانی حکوومەتێکی فرەلایەن لە داهاتوی ئێراقی فیدڕاڵ .

٢٠٠٦/٢/١٨ سووتاندنی کونسلیەی ئیتاڵیا لە شاری بەنگازی لە کۆماری لیبیا بە هۆی بلاوکردنەوەی وێنە کاریکاتێریەکانی پێغەمبەری ئیسلام ، لە ئاکام بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە ١٠ هاووڵاتی توندڕەوی ئیسلامی و دروست بوونی کێشەی نێوان حکوومەتی لیبیاو ئیتاڵیا ، بە پێشێل کردنی یاسا نێوودەوڵەتیەکان .

٢٠٠٦/٢/١٨ بە هۆی ڕمانی زەوی لە ئاکامی بارانێکی زۆر لە وولاتی فلیپین ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە ٣٠٠٠ هەزار هاووڵاتی و وونبوونی زیاتر لە ١٤ گوندو ڕەش بوونەوەی لە سەر زەوی بە لێکەوتنەوەی زیانێکی زۆری گیانی و سامان ، بە تایبەتی هاوولاتیانی هەژاری بێدەرامەت لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٦/٢/١٩ شانشینی ئوردن شانشین عەبدولا حوسێن پێشوازی لە مێرد منداڵی نەزانی مەزهەبە شیعەکان لە ئێراق موقتەدا سەدر کرد ، لە ئاکامی گفتووگۆی نێوانیان و لە دیوانی شانشین ڕاگەیاندنێکی بلاوکردەوەو هەڵوێستە ناڕاستەکانی ناوبراوی بەڕاست و دروست لەقەڵەمدا .

شایانی باسە نەتەوەیەك نیە لە سەر زەوی لە نەتەوەی عەرەب دووڕو و گێرەشێوێن و تێکدەرو نەزان و گەمژە نەبن ، چونکە لە قورئان ئەوەی سەلماندوە ، کە دەفەرموێ – انا انزلنا قرانا عربیا لعلهم تعقلون – هەروا

دەفــەرموێ – ان اعــراب مــن اشــد الکفــارا –... چــونکە عەرەبــەکان کــاری فێڵکردن‌و درۆکردن بە ئازایەتی‌و سەربەرزی دەزانن دوور لە ڕێنمایەکانی ئایینی ئیسلام‌و ، هەروا باکیان نیە گەر باڵەخانەیەکی ١٠٠ نهۆمی وێران بکەن لە پێناو دووبلۆك ، یاخوود دوو کەرپوچ ، یاخوود پەنجەرەیەك‌و... لە ڕووی ئابڕۆو ئەخلاق هەرباسی مەکە...؟.

٢٠٠٦/٢/١٩ لــە ڕاگەیانــدنێکی ووتــە بێــژی وەزارەتــی نــەوتی ئێراقی – عاسم جیهاد– لە ئــــــەنجامی کـــــارە تیرۆرســــتیەکان‌و گێــــرە شــــێوێن‌و تێکــــدەران بــــە تێکــــشکاندنی پــــڕۆژەو



کارگــەکان‌و دەزگــا بۆڕیــەکانی نــەوت ، کــە زیــاتر لــە ٦٠بلیــۆن دۆلار زیــانی لێکەوتەوە ، بە هۆی ئەو کارانە بووە ، کە ئەویش ٤٠ ملیۆن دۆلار بە هۆی تەقاندنەوی بۆڕیە نەوتیەکان بووەو بەڕێکخەری ناردنە درەوە ٧١٠ ملیۆن دۆلار زیانی بووە، ئەمەو بە دەیا کاری دیکە بە ناو تیرۆریستی.

بــەڵام لــە ڕاســتیدا وانیــە بــەڵکو دەســەڵاتە کاتیــەکانی ئێــراق لــە دوای ڕووخاندنی دەسەڵاتی سەدام حوسێن ، بەدزین‌و هاوبەش بوونیان لە گەڵ تیرۆرســتان‌و گوێڕایــەڵی نــەکردنی یاســاکان هــەتا یاســاکانی ســەدام ، کــە چەندین بابەتی باش‌و لێهاتووی تیایە بەرگری لە موڵك‌و سامانی گەل‌و نیشتمان بکات .

٢٠٠٦/٢/٢٠ ڕژێمــی بــەعس لــە سووریا قوماشــی چوار ڕەنگــی ســەوزو ســوورو ســپی‌و زەردی قەدەخــەکرد‌و دەزگــا ســیخوورپەکانی ڕژێــم لــە شــاری قامــشلی خۆرئــاوای کوردســتانی لکێنــدراو بەســووریا دەســتیان بــە ســەر جۆرەهــا قومــاش داگــرت‌و ڕەنگــەکانی ســەرەوەیان تــالانکرد ، کــە ئەمــە ئامــاژەیــە بــۆ ئالای کوردستان.

شایانی باسە ڕژێمی بەعس لە سووریا بە نەخۆشیەکانی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، بە بوونی کۆتایی دێت لە هەموو ڕوویەکەوە ، جا دوور یا نزیك ، چونکە ئەو جۆرە نەخۆشیە ڕزگاربوونی بۆ نیە لە جیهاندا .



٢٠٠٦/٢/٢١ سـەرۆکی دەسـەڵاتی فەلەسـتین مەحمود عەباس بە ڕەسمی داوای لـە پـاڵێوراوی جووڵانـەوەی حەماسـی ئیسلامی بـۆ پۆستی سەرەك وەزیران ئیسماعیل هەنیە کرد ، بە پێکهێنانی حکوومەتی فەڵەستین ، ئـەویش بـە دوورکەوتنـەوەی جووڵانـەوەی فەتح لە گۆڕەپانەکەدا .

٢٠٠٦/٢/٢١ سەرەك کۆماری پاکستان پەروێز موشەرەف و سەرۆکی چینی میللی گیفگن تاو لە پەکینی پایتەختی چینی میللی/١٣ ڕێکەوتنیان لە بوارەکانی وزەو کشتووکاڵ و گەیاندن و هەماهەنگی و هاکاری سەربازی مۆرکرد ، چینی میللی بڕی ٣٠٠ ملیۆن دۆلاری وەك قەرز پێشکەش بە حکوومەتی پاکستانکرد ، ئەمەش لەچوارچێوەی بەرەوپێش بردنی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو وڵات لە ناوچەو هەرێم و جیهان .

٢٠٠٦/٢/٢٢ لە ئەنجامی کارێکی تیرۆری لە لایەن پیاوە بەکرێ گیراوەکانی مەزهەب شیعە ، بە تایبەتی سووپای مەهدی بە سەرکردایەتی موقتەدا سەدر، قوبەی گۆڕی ئیمامی عەلی هادی و ئیمام حەسەن لە قەزای سامەڕا تەقێندرایەوە ، لە گەڵ گوللە بارانکردنی بە دەیان مزگەوتی مەزهەب سوونەی ئیسلامی عەرەبەکان لە شاری بەغدا... بەم بۆنە حکوومەتی ئێراق ماتەمینی بۆماوەی سێ ڕۆژ ڕاگەیاندو هەروا حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕۆژی ٢/٢٣ی کردە ڕۆژی پشووی ماتەمینی لە هەموو کوردستان...؟.

شایانی باسە مەزهەب شیعەی عەرەب لە ئێراق بە پشتیووانی ڕژێمی بە ناو ئیسلامی ئێران بە نهێنی و ئاشکرا بەردەوامن لە بن بڕکردنی مەزارگە ئاینیەکانی سەر بە مەزهەب سوونە ، ئەمە لە لایەك و لەلایەکی دیکەش ، بەردوامن بە لە ناو بردنی توێژی ڕۆشنبیری لە دکتۆرو ، ڕوناکبیرو ، توێژینەرو ، نووسەرو ڕۆژنامەنووس و ، هونەرمەندو ، کەسایەتی لێوەشاوەی باشوورو ناوەڕاست لە ئێراقدا .

٢٠٠٦/٢/٢٢ ئەنجوومـەنی نیشتمانی کوردسـتان لـە کۆبوونەوەیـەکی نـا ئاسـایی خۆیـدا بـەکۆی دەنـگ پەسـەندی ڕێکەوتنی نێوان پارتی دیموکراتی کوردسـتان و یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتانی کـرد ، لەسـەر بـوونی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی بە سـەرەك ئەنجوومـەنی وەزیرانـی حکوومـەتی هەرێمی کوردسـتان . لە پێنـاو پێك هێنـانی کابینـەی پێنجـەمی حکوومـەتی هەرێمی باشووری کوردستان.



شـایانی باسـە لـە کابینـەی دووەمـی حکوومـەتی هـەرێی کوردسـتان لـە ١٩٩٤/٥/١ بـوو بـە دوو ئیـدارەی دژ بـە یـەکتری لـە پارێزگـای سـلێمانی و دەوروبەری و چەند ناوچەی دیکەو ، لە پارێزگای هەولێرو دهۆك لە نێوان ئەو دوو پارتـە سـەرەکیە لە هـەموو بوارەجیاجیاکـان ، بـە تایبـەتی لـە سـەر دەسـەلاّت و سـامان ، کـە تـەنیا لـە سـەر بـواری نەتـەوەیی و نیشتمانی کـۆك بـوون... بـەلاّم هـەر یـەك بـە شـێوازێکی تایبـەتی خـۆی لـە ڕامیارەیـەتی پارتەکەیدا لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/٢/٢٣ لـە گەشـتەکەی وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریکا گۆنـدا لیـزا ڕایـس بـۆ ئیمـاڕاتی عـەرەبی و سـعوودیەو گەیـشتنی بـە لوبنـان ، لـە گـەلّ بەرپرسـان و کەسـایەتیەکانی لوبنـان کۆبـووەوە ، بـەلاّم تـەنیا لـە گـەلّ سـەرەك کۆمـاری لوبنان ئەمین لەحود نەبێت ، ئەویش لە سەر داوای ئەمەریکا و داوای گـەلانی لوبنان .



٢٠٠٦/٢/٢٤ سەرۆكی ئەمەریكا جورج بۆش لە لێدوانێكیدا ڕایگەیاند ، كە ئێمە داوا ناكەین كە ئێران چەكی ئەتۆمی بەرهەم بێنێ ، لە بەر ئەوەی ئەمڕۆ هەموو وولاتان بە یەك زمان داواكانیان بەرزدەكەنەوە بە وازهێنانی ئێران لە بەرهەم هێنانی چەكی ناوبراو ، لە هەمان كات لە ڕاگەیاندنەكەی گووتی:- ئێران یەكەم دەسەلاتە پشتگیری لە تیرۆر دەكاتو بۆتە مەترسی لە سەر دراوسێكانیو ناوچەو هەرێمەكە بە فراوانكردنی ڕامیاریەتی لە هەموو بوارەكان ، بە تایبەتی خواستەكانی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو كیشوەری ئاسیادا .

٢٠٠٦/٢/٢٤ كۆمەلێك چەكداری توندڕەوی ئیسلامی لە سعوودیە پەلاماری دەزگاو پرۆژەی پالاوتنی نەوتیان دا لە ناوچەی - بەقیگ - لە ئەنجام پەلامار دراوەكان كوژرانو بووە هۆی كارلێكردن لە بەرزبوونەوەی نرخی نەوتو زێڕو كاری لە بازاڕی ئابووری جیهان كرد ، بە تایبەتی لە وولاتانی ڕۆژئاواو هەتا لە بواری گۆڕینەوەی دراوە جۆراوجۆرەكان لەجیهاندا .

٢٠٠٦/٢/٢٥ دەست پێكردنی كۆبوونەوەی نێوان هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلامی عەرەب لە شاری بەغدا ، لە پێناو دامركاندنەوەی تارمایی هەلگیرسانی شەڕی ناوخۆی نێوان شیعەو سوونە ، كە بەر لەو مێژووە چەندین شەڕوو پێكدادان لە گەڕەكەكانی بەغدا بەرپابوو ، لە نێوان هەردوو مەزهەب ، بە بلاوكردنەوەی ڕاگەیاندنێك ، كە لە ١٠ خالّ پێك هاتبوو ، لە نێوان هەردوو دەستەی زانایانی ئیسلامی سوونەو پارتی ئیسلامی ئێراق ، لە گەلّ سەكردایەتی پارتو گروپە شیعەكانو مەرجەعیەتی شیعە ، لە سەركردایەتی ڕامیاری لە پێكهاتەكانی گەلانی ئێراق ، كە كورد ڕۆلّی سەرەكی بەرچاوی لەو هەلوێستانە هەبوو لە هەموو لایەنەكان .



٢٠٠٦/٢/٢٥ ســـەرەك کۆمـــاری ســـوودان عومـــەر حەســـەن بەشـــیر لـــە کۆبوونەوەیـــەکی ڕەسمـــی ڕایگەیانـــد ، کـــە ناوچـــەی دارفور دەکەمە گۆڕستان گەر هێزەکانی یەکیەتی ئەفریکیا بگۆڕن بە هێزی نێوودوولەتی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان ، واتـە دەسـت تێوەردانـە لـە کاروباری ناوخۆی وولاتەکە ، بـەڵکو هـەوڵی چارەســەری کێشەکە دەدەین لە گەڵ لایەنە پەیوەنداره ناوخۆیەکان لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٢/٢٦ لە ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی شەهیدێکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری کوردستان لە شاری دیاربەکر ، بووە هۆی شەڕو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی سووپاو جەندرمەکانی ڕژێمی تورك‌و جەماوەری بە شداربووی خۆپیشاندانەکە ، لە ئاکام بووە هۆی زامدارکردنی بە دەیا هاوولاتی کوردی خۆپیشاندەران دژی ڕژێمی تورکی داگیرکەری باکووری کوردستان .

٢٠٠٦/٢/٢٦ کێشەی شارستانیەت- دژایەتی کردنی یەکتری یاخوود هاوکاری کردن- کۆنفرانسی ئایینە جیاجیاکان بە تایبەتی ئاینی ئیسلام‌و مەسیحی لە شاری سیدنی پایتەختی ئوستڕالیا گرێدرا ، بە ئامادەبوونی ١٢٠ نوێنەرو زانـای ئـایینی، بەشـداربوان لـە پێنـاو بـەرەو چارەسـەرکردنی کێـشە هەمەلایەنەکان لە بوارەکانی ئازادی بڕواو بیروو ڕای جیاواز ، لە پێناو خزمەتکردنی کۆمەڵگاکانی جیهان .

٢٠٠٦/٢/٢٦ لە ڤیێنای پایتەختی نەمسا ئۆپرای گەرموو گوڕی بەسەرکردنەوە بە بۆنەی تێپەڕبوونی ٢٥٠ ساڵ بە سەر کۆچی دوای مۆزیکاا ژەنی جیهانی - مۆزارت - ئەنجامدرا ، کە زیاتر لە ٤٦٠٠ کەسایەتی لە بواری مۆزیکاو گۆرانی‌و هونەرو هاوولاتیان‌و بەرپرسان بەشداریان تێداکرد .
لە سەرەروەی هەموویان سەرك کۆماری نەمسا .کە هەموو بەشداربوان بە جلوبەرگی سپییەوە ئاهەنگەکەیان برد بەڕێوە .

٢٠٠٦/٢/٢٧ سەرەك كۆماری توونس زەین عابدین عەلی لە بڕیارێكیدا ١٦٠٠ زیندانی رامیاری ئازادكرد ، لەوانە ٧٠ زیندانی ئەندامی بزووتنەوەی ئیسلامی بوونو ٦ زیندانیش بە تۆمەتی ئەنجامدانی كاری تیرۆری بەندكرابوون ، ئەمە جگە لە كەسایەتی دیكەی دیموكراتی خوازو كۆمۆنیستو كۆمەلأیەتی بە هۆی دژایەتی كردنی دەسەلاتی سەرەك كۆمارو تاكرەوی لە دەسەلاتەكەیدا .

٢٠٠٦/٢/٢٧ سەرۆكی ئێران مەحمودی ئەحمەدی نەژاد سەردانی وولاتی كوێتی كردو لە دوای پێشوازی لێكردن ، ئەنجامەكانی گفتووگۆی لە گەڵ بەرپرسانی بالأی كوێت لە ڕاگەیاندنێكیدا گووتی:- داوا دەكەین كە نەك ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست پاك بكرێتەوە لە چەكی ئەتۆمیو موشەكی دوورهاوێژ ، بەڵكو پێویستە هەموو جیهان لەو جۆرە چەكانە پاك بكرێتەوە .

٢٠٠٦/٢/٢٨ سەرەك كۆماری ئێراق مام جەلال لەڕاگەیاندنێكیدا دژی هەڵوێستەكانی سەرەك ئەنجوومەنی وەزیران ئیبراهیم جەعفەری وەستا ، كە بێ ئەوەی پرس وڕا بە سەرۆكایەتی كۆمەڵەی نیشتمانیو سەرۆكایەتی كۆمارو ئەنجوومەنی وەزیرانو ڕەزامەندی وەربگرێت ، سەردانی كۆماری توركیای دژ بە بارودۆخی ئێراقو كوردو ناوچەكە كرد ، ئەمەش كە خۆی لە خۆیدا نیازێكی تایبەتیو گشتی تیابوو ، ئەویش دژی بەرەوباش بردنی باری ئێراق و بە تایبەتی باری كورد لە سەر كێشەی پارێزگای كەركوكو دروستكردنی كێشەو ململانێی زیاتر لە سەر چارەسەرنەكردنی كێشەكان لەوولأتەكەدا .

٢٠٠٦/٣/١ دووبارە بوونەوەی كۆمۆنەی پاریس ، كە یەك ملیۆن هاوولأتی لە گەلانی فەڕەنسا ڕژانە سەر شەقامەكانی پاریسی پایتەختی فەڕەنسا دژی بڕیاری كارپێكردنی گەنجانی فەڕەنسا لە دوای تەواوكردنی قۆناخەكانی خوێندنو بێكاران لە كۆماری فەڕەنسا .

٢٠٠٦/٣/١ لە سەردانێكی ناكاوی سەرۆكی ئەمەریكا جۆرج بۆشو هاوسەرەكەی بۆ پاكستانو ئەفگانستانو دوای چەند كاتژمێرێك گەیشتنە شاری نیودلهی پایتەختی هندستان ، ئەویش لە پێناو گەیشتن بە ڕێكەوتنی یارمەتی هاوبەشیان لە بوارەكانی ڕامیاریو ئابووری ، بە تایبەتی لە بواری ئەتۆمی

مەدەنی لە هیندستان ، کە ئەم سەردانە هۆکاری کاردانەوەی خۆی لە سەر پەیوەندی هیندستان و چینی میللی و هندو پاکستان و بە پێچەوانەشی هەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە پەیوەندیەکانی ئابووری و رامیاری و بازرگانی و سەربازی و ئەتۆمی و نێوودەوڵەتی لە هەرێمەکان و جیهان.

٢٠٠٦/٣/٢ هاوپەیمانی کوردستان لە ڕاگەیاندنێکی لە سەر زاری مەحمود عوسمان بە دووبارە بوونەوەی سەرەك وەزیرانی کاتی ئێراق ئیبراهیم جەعفەری بۆ پۆستی سەرەك وەزیرانی هەمیشەیی دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٥/١٢/١٥ی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراقی ڕەتکردەوە ، لە گەڵ هەندێ لایەنی دیکەی سوونە بە هۆی هەڵوێستە شۆڤینی و بەرچاو تەنگی و دروستکردنی دوبەرەکی وکێشەو جێبەجێ نەکردنی مافەڕەواکانی کورد ، بە پێی مادەی ٥٨ لە یاسای ئیدارەی دەووڵەتی ئێراق و ڕێنمایەکان ، بە تایبەتی لە بارەی ئاسایی کردنەوەی باری کەرکوك و ناوچە دا لێبڕاوەکان .

٢٠٠٦/٣/٣ لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنی بەڕێز فواد مەعصوم ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی ئێراق و ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان گووتی:- سەردانەکەی سەرەك وەزیرانی کاتی ئێراق ئیبراهیم جەعفەری بۆ تورکیا ، مە بەستی دروستکردنی کێشەی نوێ و کۆسپ خستنە پێش چارەسەری گێشە هەڵواسراوەکانە ، بە تایبەتی لە سەر باری پارێزگای کەرکوك و فیدڕاڵی و دیموکراسی و مافی مرۆڤ لە وولاتەکەدا .

چونکە سەرەك وەزیرانی تورکیا ڕەجەب تەیب ئەردۆگان لە پەرلەمانی تورکیا باسی سەردانەکەی جەعفەری کردووەو چاوپێکەوتنی لە گەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدولا گول ئەنجامداوە ، کە ئەمانە دەبێ بە پێچەوانە بێت لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣ شاندێکی جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی لە فەلەستین بە سەکردایەتی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حەماس خالد مەشعەل لە سەر داوای سەرۆکی ڕووسیا فلادیمیر پوتین گەیشتە مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیا ، لە پێناو بەرەو باشبردنی بارو دۆخی پەیوەندی نێوان حەماس و ئیسرائیل لە دوای سەرکەوتنی حەماس لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی یاسادانان لە فەلەستین و، هەروا دەستگیربوون بەو ڕێکەوتننامە نێوودەوڵەتیەکان، ئەویش بە گۆڕینی رامیارەتی و دان نان بە دەوڵەتی ئیسرائیل.

سەرەڕای ئەوەی کە شاندەکە چەند مەرجێکی بنەڕتی دانا لە پەیوەندیەکانی لە گەڵ ئیسرائیل و هەڵووەشاندنەوەی پەرژینی دروستکراوو کشانەوەی بۆ سنووری ساڵی ١٩٦٧و چەندین داوای دیکە لە نێوان دەسەڵاتی ئیسرائیل و فەلەستین .

٢٠٠٦/٣/٣ تەقاندنەوەی کەنیسەی مەسیحیەکان لە شاری ناسرەی فەڵەستین لەلایەن جوولەکە توندڕەوەکانی ئیسرائیل ... شایانی باسە کە ئەم کەنیسەیە بە کۆنترین کەنیسە لە جیهان دادەنرێت لە شارەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣ دادگای ڕژێمی تورکیا شەش ڕۆژنامەنووسی دادگایکرد بە ناوی ئەوەی کە یارمەتی کوردی باکووری کوردستانی داوە لە خۆپیشاندانەکان و پەلاماردانی ئەو دواییانەی تورکیا و بەردەوام بوونی لە شارۆچکەو شارەکانی باکووری کوردستانی داگیرکراو لەلایەن ڕژێمی تورکیا .

٢٠٠٦/٣/٣ کۆنگرێسی ئەمەریکا لە بڕیارێکیدا داوای لە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش کرد ، بە پەلەکردن لە ناردنی هێزیکی پەیمانی ناتۆ بۆ سوودان و دیاریکردنی ناوچەیەکی پارێزراو بە قەدەخەکردنی ئاسمانی ناوچەکە ، لە پێناو پاراستن و ئارامکردنەوەی باشووری سوودان و لە گەلانی سوودان ، بە تایبەتی دانی هەرێمی دارفورو داوای کرد ، نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەزامەندی لە سەر ئەو بڕیارە بکات بۆ وولاتەکە .

شایانی باسە لە هەرێمی دارفور ناوچەیەکی بچوك هەیە کە دانیشتووانەکەی کوردن و ناوزەندە بە کوردڤان و بەر ئەو مەرگەساتە کەوتوون لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، بە تایبەتی لە تواندنەوەی نژادی و ڕەگەزی لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣ لە بڕیارێکی مێژووییدا پەرلەمانی هەرێمی مۆنتینیگرۆو بە ڕەزامەندی ٦٠ پەرلەمانتار ڕەزامەندی لە سەر ئەنجامدانی ڕاپرسی لە سەر ئایندەی وولاتەکەیان دەربڕی ،



ئەو راپرسیەش لە ٣/٢٣ هەمان ساڵ ئەنجامدەدرێت ، بە وەڵامی بەڵێ یان نا ، کە ئەمش دەبێتە هۆی خاوەن سەروەری و شەرعیەتی یاسایی و نێوودەوڵەتی بە دەست بێنێ.
شایانی باسە راپرسیەکە بە بەڵێ دەبێتە سەربەخۆیی مۆنتینیگرۆ وەك کۆمارەکانی دیکەی سلۆڤینیاو ، کرواتیاو ، بۆسنەو ، مەکدۆنیا ، کە لە وولاتی یۆگسلافیای پێشوو جیابۆتەوە ، ئەم هەرێمە ناسراوە بە – جەبەل ئەسوەد– لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣ هێزەکانی ئاسایشی رژێمی رووسیای سپی – بیلارووسیا – پاڵێوراوی ئۆپۆزسیۆن بۆ سەرۆکایەتی رووسیای سپی – ئەلکسەندەر گوزولین – دەستگیردەکات و دوای لێدان و ئەشکەنجەدان ، بە هۆی رکابەری سەرۆکی رووسیای سپی– ئەلسکەندەر لۆکا شینگویان – ، کە ئەو کارەش لە ناوەندی شاری مینسکی پایتەختی رووسیای سپی ئەنجامدراو بە دوای ئۆتۆمبێلێك پەلکێشکرا .
ئەمەش پێش هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بوو ، کە بڕیارە لە ماوەی ئەم مانگەدا بەڕێووە بچێت .
شایانی باسە ئیدارەی ئەمەریکاو سەرۆکی ئەمەریکا ، سەرۆکی رووسیای دووبارە پاڵێوراو بۆ سەرۆکایەتی رووسیای سپی تاوانبار کردووە بە پێشێل کردنی ئازادیە رامیاریەکان و مافی مرۆڤو بەندکردنی ئازادی رۆژنامەگەری لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣ بۆ یەکەم جار لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆی لوبنان لە بەیروتی پایتەخت و لە سەر بانگهێشتنی سەرۆکی پەرلەمانی لوبنان – نەبیل بەری– و بە بەشداری فراکسیۆن و لیستە رامیاریەکانی ناو پەرلەمان و هێزو قەوارە رامیاریەکان کۆنگرەی دیالۆگی لوبنانی دەستی بە کارەکانی بکات ، لە پێناو چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکان ، لە نێوان پێکهاتە نەتەوەیی وئایینی و رامیاری لە لوبنان ، لە هەموو بوارەکان بە تایبەتی لە بواری دەسەلاتی رامیاری لە لوبنان و پەیوەندی لە گەڵ دراوسێ و هەرێمەکاندا .

٢٠٠٦/٣/٤ سەرەك کۆماری ئێراق جەلال تاڵەبانی لە لێدوانێکی رۆژنامەوانیدا رایگەیاند ، کە مانەوەی سەرەك وەزیرانی ئێراق ئیبراهیم جەعفەری بۆ وەرگرتنی

پۆستی دووەم جاری بۆ سەرەك وەزیران مەترسی زۆری لە سەر یەکیەتی ئێراق هەیە لە داهاتوو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٥ سەرەك کۆماری فەڕەنسا جاك شیرال لە سەردانێکی بۆ شانشینی سعوودیەو لە دوای گفتووگۆی نێوان سەرۆکی فەرەنساو شانشین عەبدولاّ ، لە هەمان کات جاك شیراك وتارێکی بەرامبەر پەرلەمانی سعوودیە خوێندەوە ، لە بارەی باری ناوچەو هەرێمەکە ، بە تایبەتی ئێراق و پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو وولات لە بوارەکانی ئابووری و رامیاری و سەربازی لە جیهاندا .

٢٠٠٦/٣/٥ دکتۆر بەرهەم صالح بە نوێنەرایەتی هاوپەیمانی کوردستان سەردانی مەرجەعیەتی ئاینی مەزهەب شیعە ئایەتوللاّ عەلی سیستانی کرد لە شاری نەجەف ، لە هەمان کات چاوی کەوت بە موقتەدا سەدر لە پێناو هێورکردنەوەی بارو دۆخی ناوەڕاستی ئێراق ، بە تایبەتی لە شاری بەغداو کێشەی نێوان پێکهاتەکان .

٢٠٠٦/٣/٥ زیاتر لە یەك ملیۆن لە گەلانی ئیسلامی لە پاکستان خۆپیشاندانێکی گەورەیان ئەنجامدا دژی بلاّوکراوەی وێنەی کاریکاتێری پێغەمبەری ئیسلام محەمەد – د.خ – لە شاری کۆبنهاگنی پایتەختی دانیمارك و بەردەوامبوونی ، کە بووە هۆی کاردانەوەی نا لە بار لە سەر هەڵوێستی رامیاریەتی ناو خۆو دەرەوەی پاکستان .
ئەویش بە بەهێز بوونی ڕۆڵی جوولانەوەی ئیسلامی و ئیسلامە توندرەوەکان لە پاکستان و کاردانەوەی ناهەمواری دواڕۆژ لە ناوچەی کشمیرو ئەفگانستان و بەنگلادیش لە هەرێمە جیاجیاکان لە کێشوورەکەدا .



٢٠٠٦/٣/٦ بە پێی هەواڵێکی ئاژانسی ڕۆیتەر خۆپیشاندانەکان لە ڕۆژهەلاّتی کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاّتی ئێران بەردەوامەو تاکو ئێستا زیاتر لە ٢٥٠ هاوولاّتی کورد زامدارکراون لە لایەن هێزەکانی ڕژێمی ئێرانی بە ناو

ئیسلامی و زیاتر لە ٨٠٠ هاوولاتی زیندانی کراون ، خۆپیشاندانەکان لە شارەکانی ، مەهابادو ، نەغەدەو خانێ و ، مەریوان و ، سنەو ، کرمانشاو ، ورمێ و ، سۆماو ، ماکۆ بەردەوامە لە گەڵ ئەوەشدا چەندین هاوولاتی کورد شەهیدکراون لە ڕۆژهەلاتی کوردستان.

٢٠٠٦/٣/٦ لە ڕۆژنامەی خەبات لە ژمارە/ ٢٠٧٠ لە لاپەڕەی کورد لە مەیدانەکانی جیهاندا بلاویکردۆتەوە – کە ڕژێمی تورکیا مۆری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستانی لە سەر پاسەپۆرتی گەشتیاران قبوڵدەکات و لەمەو دواش ئەوانەی لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق بۆ تورکیا سەفەر دەکەن و تووشی کێشەو گرفت نابن .



٢٠٠٦/٣/٦ مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی هاوکاری و سەربازی و سیخووڕی لە نێوان ڕژێمی تورکیاو ئێران دژ بە کوردو کوردستان ، لە دوای دانیشتنەکەی ئەنجوومەنی بالای ئاسایشی ئێران و تورکیا ، کە هەردوولا ئامادەیی خۆیان بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکان لە بواری ئاسایشی سنووری و ڕاگەیاندن پتەوبکەن .
شایانی باسە بەرپرسانی ڕژێمی ئێران تاکوو ئێستا زیاتر لە ٧٠ چەکداری P.K.K یان لە باکووری کوردستان دایتەوە دەست ڕژێمی تورکیا و تورکیاش دانیان بەو کارە ناوە ... لە هەمان کات هەردوو ڕژێمی داگیرکەری باکوورو ڕۆژهەلاتی کوردستان دژی دروست بوونی هەر دەوڵەتێکی کوردین لە هەر کات و ساتێك ، گەر لە دەسەلات مابن لە هەرێمەکەدا.

٢٠٠٦/٣/٧ جێگری سەرەك کۆماری ئەمەریکا دیك چینی لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنی ڕایگەیاند ، کە ئەمەریکا بە هێچ شێوەیەك ماوە بە ئێران نادرێت بە بەرهەم هێنانی چەکی ئەتۆمی و ئێران چۆتە ڕیزی فاشیەت لە ناوچەکەدا .
ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکە وەزیری بەرگری ئێرانی بۆ ئێراق ڕوانە دەکات ، لە پێناو شێواندن و ئاڵۆزکردنی باری ئێراق ، لە هەمان کات

وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا گۆنـدا لیـزا ڕایـس بـە هـەمان شـێوە بـیروو بۆچوونی خۆی ڕاگەیاند بە ناوچەو جیهان .

٢٠٠٦/٣/٨ گواستنەوەی دۆسیەی ئێران بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی و لە هەمان کات یەکیەتی ئەوروپاو ئەمەریکا هۆشیاریاندا بە ئێران بە ڕاگرتنی ڕاستەوخۆی هەموو کارە هەمە جۆرەکانی ئەتۆمی لە ئێران ، لە هەمان کات ئاژانسی وزەی ئەتۆمی داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد ، کە بە هۆشمەندیەکی سارد مامەڵە لە گەڵ دۆسیەی ئەتۆمی ئێران بکات لەجیهان .

٢٠٠٦/٣/٨ وەزیری بەرگری دەسەڵاتی سوودان لە بەرامبەر خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەری لە خەرتومی پایتەختی سوودان ڕایگەیاند و گووتی:- ، گەر ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەتی و یەکیەتی ئەوروپا بڕیاری ئەوە بدەن ، کە هێزەکانی سووپای نەتەوە یەکگرتووەکان جێگەی هێزەکانی سووپای یەکیەتی ئەفریکیا بگرێتەوە لە هەرێمی دارفوڕو کوردڤان .

دەبێ ئەو هەرێمە ببێتە گۆڕستان بۆ داگیرکەران ، گەر بەرەزامەندی حکوومەتی سوودان نەبێت ... شایانی باسە زیاتر لە ٢٠ ساڵە سوودان لە شەڕی ناو خۆو کێشەو ململانێی چارەسەرنەکراوی بەردەوامە ، بە تایبەتی لە هەرێمی دارفور لە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی ئاشتیبوونەوە لە نێوان حکوومەتی ناوەندی لە باکوورو جووڵانەوەی میللی لە باشووری سوودان .

٢٠٠٦/٣/٨ بۆ یەکەم جارە لە دوای ڕاگەیاندنی ئەمەریکا بە دەستپێکردنی جەنگی دژ بە تیرۆرو تیرۆرستان ، سەرۆکی پاکستان پەروێز موشەڕەف داوا لە بەرپرس و دبلوماتی سەربازی ئەمەریکا ، ئەبوو زەید بکات ، لە پێناو یارمەتیدان و لە هەمان کات بۆ یەکەم جارە ئەبووزەید سەردانی پاکستان بکات بە هۆی لێکترازانی پەیوەندی نێوان پاکستان و ئەفگانستان و چەندین لایەنی دیکەی ڕامیاری و ئاینی و سەربازی و ئابووری لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٩ بە هۆی جمووجۆڵی جەماوەری کورد لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا لە شاری وان تەقینەوەیەك ڕوویدا ، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی سێ هاووڵاتی کوردو زامداربوونی ١٤ هاووڵاتی دیکەی کورد لە شارەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٩ ڕابەری ئایینی کۆماری ئیسلامی ئێران - عەلی خامەنائی- لە ڕاگەیاندنێکیدا گووتی:- ئێمە بەردەوام دەبین لە بە ئەنجام گەیاندنی

پرۆژەی ئەتۆمی هەتا توشی بە هێزترین پاڵە پەستۆو هێرش ببینەوە ، لە هەمان کات سەرۆکی ئێران ئەحمەدی نەژادی هەمان لێدوانی ڕگەیاندو گووتی:- گەر پەلاماری سەربازیش بدرێین ئێمە لە هەوڵەکانمان ناوەستین .

٢٠٠٦/٣/١٠ سەرۆکی ڕووسیای یەکگرتوو فلادیمیر پوتین سەردانی وولاتی جەزائیری کردو لە لایەن سەرۆکی جەزائیر عەبدولعەزیز بوتەفلیقە پێشوازی لێکرا ، کە بۆ یەکەم جارە سەرۆکی ڕووسیا سەردانی جەزائیر بکات ، لە ئەنجامی ئەو سەردانە چەندین ڕێکەوتنی ئابووریو رامیاریو ڕۆشنبیریو پەیوەندی مۆرکرا ، بە تایبەتی لە بواری سەربازیو فرۆشتنی فڕۆکەو چەكو تەقەمەنی ، لە پێناو گەڕاندنەوەی ڕۆڵی ڕووسیا ، لە گەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە تایبەتی جیهانی سێیەمو عەرەبی.


پوتین



دوای ئەوە سەرۆکی ڕووسیای یەکگرتوو بڕی٤٫٧٠٠ ملیار دۆلاری ئەمەریکی بەشێوەی قەرزدا بە دەسەلاتی جەزائیر... شایانی باسە یەکیەتی سۆڤیەت بە هاوکاریو ئامۆژگاری ئەمەریکاو هاوپەیمانیان ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لە هەرەس پێهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بەخانە خۆێیەتی جەزائیر بە هەردوو سەرۆکی جەزائیری ئەوکاتو سەرۆکی ئێستای جەزائیر عەبدولعەزیز بۆتەفلیقە...؟...!.

٢٠٠٦/٣/١٠ لە لێدوانێکی کاردنیلاندمارتینۆ لە بارەگای ڤاتیکان لە ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیاو ووتی:- دەتوانرێ ڕێنمایەکانی ئایینی ئیسلام لە قوتابخانەکانی ئیسلامی بخوێندرێ . ئەم لێدوانە لە پێناو هێورکردنەوەی تەنگەژەی نێوان وولاتانی ڕۆژئاواو جیهانی ئیسلامیو بە تایبەتی لە نێوان دانیمارکو

وولاَتانی ئیسلامی بوو بە هۆی بلاَوکردنەوەی وێنەی پێغەمبەری ئیسلام بەشێوەی کاریکاتێر ، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی لێکترازانی پەیوەندی هەندێ لە وولاَتانی عەرەبی و ئیسلامی لە گەڵ دانیمارك .

٢٠٠٦/٣/١٠ گرێدانی کۆنگرەی ڕایەڵەی ئیسلامی لە قاهیرەی پایتەختی میسر لە سەر بلاَوکردنەوەی وێنەی کاریکاتێری پێغەمبەر محەمەد– د.خ – لە پێناو هێور کردنەوەی پەیوەندی لێکترازاوی نێوان ئاینی مەسیحی و ئاینی ئیسلامی و ڕاگەیاندنەکان .

٢٠٠٦/٣/١٠ سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەڕێز مەسعوود بارزانی لە دوای گەڕانەوەی بۆ هەرێمی کوردستان لە شاری بەغدا ڕاگەیاندنێکیدا لە پێناو گفتووگۆو دانانی بەرنامەو میکانیزمی ڕوون داوەتی هەموو سەرکردە ڕامیاری و ئایینی کرد ، کە بێنە کوردستان لە دوای نەگەیشتن بە هیچ ئامانجێك لە دوای بە دەیا کۆڕو کۆبوونەوەو گفتووگۆو چاوپێکەوتن .

٢٠٠٦/٣/١١ کۆمەڵەی هاوولاَتیانی هیلسینکی و گروپی ئەمپیاتی لە زانکۆی Bilsi لە ئەستەمبوڵ دا بە ڕێگە چارەکانی کێشەی کورد لە تورکیا کۆنفراسی کورد ئەنجامدرا ، بە بەشداری ژمارەیەکی زۆر لە ئەکادیمی – ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدارانی کوردو تورك بەڕێوەچوو... شایانی باسە ماوەیەك بەر لە ئێستا هەر لەم زانکۆیەدا کۆنفرانسێك سەبارەت بەکێشەی ئەرمەن لە تورکیا سازکرابوو ، کە کێشەی زۆری لێکەوتەوە لە نێوان کۆنفرانسوانان و ڕژێمی تورکیا ، چونکە ڕژێمی عەسکەرتاریەتی تورکیا ماوە بە بوونی نەتەوەی دیکە نادات لە سەر خاکی تورکیا .

٢٠٠٦/٣/١١ وەزیری ناوخۆی ڕژێمی شۆڤینی تورکیا – عەبدولقادر ئاکۆ– گەشتێکی بە ٨١ پارێزگای پارێزگاکانی تورکیا کرد ، بە تایبەتی ٢٤ پارێزگا کوردیەکەی باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاَتی تورکیا ، ئەویش بەجێبەجێکەری پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤، لەو ڕاگەیاندنە گووتی:– نابێ لە جەژنی نەورۆزی ٢١ی ئادار جەژنی سەری ساڵی کوردی و نەتەوەیی ئالاَی هیچ لایەنێك بەرزبکرێتەوە تەنیا ئالاَی تورك نەبێت ، مەبەستیش بەرز نەکردنەوەی ئالاَی کوردستان بووە . لە جەژنی نەورۆز لە ژێر دەسەلاَتی تورکیا .

٢٠٠٦/٣/١١ کۆچی دوایی سەرۆکی پێشووی یوگسلافیا سلۆبۆدان میلۆڤیتیش لە

بەندیخانەی لاهای نێوودەوڵەتی ، کە تاوانبارکرابوو بە تاوانەکانی جەنگی دژ بە مرۆڤایەتی... شایانی باسە لە ٢٠٠٤/٤/١ ناوبراو خۆی دا بە دەست دەسەڵاتی نوێی یوگسلافیاو دوایی گواستراوە بۆ شاری لاهای پایتەختی هۆڵەند ، بە مەبەستی دادگایکردنی لە سەر تاوانەکانی جەنگ لە وولاتەکەیدا .

٢٠٠٦/٣/١٢ خۆپیشاندانێکی گەورە لە شاری قامیشلی ڕۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە سووریا ئەنجامدرا ، بە بۆنەی یادکردنەوەی ڕاپەڕینەکانی دووەمی شاری قامیشلی و دەورووبەری بە داواکردنی قەرەبوو کردنەوەی خێزانە زیان لێکەوتووەکان و چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکانی ماف کوردو ئازادکردنی زیندانە نەتەوەیی و ڕامیاریەکان .



٢٠٠٦/٣/١٢ گرێدانی کۆنگرەی کوردی ڕۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە سووریا لە شاری واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا بە ئامادەبوونی نوێنەری کوردو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن .

لە پێکهاتەکانی دیکەی گەلانی سووریاو لایەنە نەتەوەیی و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بە تایبەتی کورد ، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوامبوو ، لە هەمان کات کوبونەوەیەك لەو کۆنگرەیە لە هۆڵی کۆنگرێسی ئەمەریکا ئەنجامدرا بە پشتگیری لێکردنی چەندین لایەنی دیکە بە هۆی بارودۆخی سووریاو دەسەڵاتی شۆڤێنی ڕەگەز پەرستی ڕژێمی بەعسی لە سووریا وهاوبەش و هاوخەباتی ڕژێمی بە عسی لە ئێراق ، کە لە هەمان ڕامیاریەتی نەتەویی و شۆڤینی عەرەبی دەخولێتەوە سەرەڕایی



ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق لە ٢٠٠٣/٤/٩ لە لایەن وولاتانی هوپەیمان ...؟...!.

٢٠٠٦/٣/١٤ هێزەکانی سووپای ئیسرائیل بە چاودێری ئەمەریکاو بەریتانیا گەمارۆی بەندیخانەی ئەریحای فەلەستینی دا ، ئەو بەندیخانەیە بەرپرسانی دڵسۆزی بەرگری کردن لە فەلەستینی تیابووە ، کە لە لایەن دەسەڵاتی فەلەستین دەستگیرکرابوون ، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ، کە جووڵانەوەی حەماس لە سەر هەڵبژاردنەکان لە فەڵەستین سەرکەوتنی بە دەست هێناو لە هەمان کات لە پێناو پێکهێنانی حکوومەتی فەلەستین.

کە حکوومەتی ئەمەریکاو بەریتانیاو یەکیەتی ئەوروپا بەوە ڕازین کە جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی ببێتە خاوەن دەسەڵات بە تایبەتی ئیسرائیل بە مەرجێ جووڵانەوەی حەماس دان بە ئیسرائیل دابنێ و دەستگیربێ بە ڕێکەوتنەکانی بەر لە سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی فەلەستین ، ئەو بەندیخانەیە ، کە زیاتر لە ١٥٠ بەندو ١٧٠ پۆلیس و بەرپرسی فەلەستینی تیابووە ، یەك لەوانە ئەمینداری گشتی بەرەی میللی فەلەستین - ئەحمەد سەعادات - کە ئەم ڕێکخراوە ڕێکخراوێکی مارکسیە ، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا کە لە ٣/٨ ئاگاداری مەحمود عەباسی کردبوو ، لە بارەی جالیەکانی بەریتانیاو دەسەڵاتی فەلەستینی .

هەروا ئەمەریکاو بەریتانیا لە دوای دەستگیرکردنی بەندکراوەکان و پیاوانی ئاسایش... ئەوەتا حکوومەتی ئیسرائیل پیاوانی جووڵانەوەی حەماس و بەرەی میللی بەرامبەر ٢٢ وولاتی عەرەبی لە شاشەکانی تەلەفزیۆن ڕووت دەکاتەوەو ناتوانن ، یاخوود توانایان نیە بەرگری لە عەرەب و بوونی عەرەب بکەن ، تەنیا پاراستنی کورسی دەسەڵات و سامان نەبێت ، بەڵام بەرامبەر بە کورد لە سەر خاکی خۆی چۆن هەڵوێست دەنوێنن...؟...!.

٢٠٠٦/٣/١٤ لە سەر داوای کۆنگرێسی ئەمەریکا لیژنەیەك لە ١٠ کەسایەتی و بەرپرسی هەردوو پارتی کۆماری و دیموکراتی پێك هێنرا ، لە پێناو هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە . لە سەر ڕامیاریەتی ئەمەریکا لە ئێراق ، ئەمەش کە پەیمانگای ئەمەریکا بۆ ئاشتی ڕایگەیاند .

٢٠٠٦/٣/١٥ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە زۆرینەی دەنگ ڕەزامەندی لە سەر

دامەزرانـدنی ئەنجوومـەنی مـافی مـرۆڤ کـرد سـەرەڕایی نـاڕەزایی ئیـدارەی ئەمەریکا لە سەر ئەو ئەنجوومەنە.

٢٠٠٦/٣/١٥ دادگـایی تاوانبـارو حـەوت تاوانبـاری هاوکـاری دژ بـه مـرۆڤ و مرۆڤایـەتی سـەدام حوسێن لـه خـولی/ ١٦ی دا ، بەر لـەو خولـەو دوای ئـەو خولـەش بـه دادگایەکی مەهزەلە دادەنرێت و چەواشـەکردنی گـەلانی ئێراقـەو بـه تایبـەتی گەلی کوردو خاکی کوردستان .

٢٠٠٦/٣/١٥ گرێدانی کۆنگرەی نێوودەوڵـەتی لـه شاری ئەسـتەمبۆلی تورکیا لـه بـارەی کۆمەڵ کوژیەکەی ئەرمـەن ، لـه لایـەن دەسـەلاتی ئیپراتۆریـەتی عوسمـانی لـه سالی ١٩١٥... شایانی باسه دەسەلاتی عوسمانی هەلسا بە کوشـتنی زیـاتر لـه ١,٥ملیـۆن و نیوێك لـه ئەرمـەن و زیـاتر لـه٣٠٠٠ر٣٠سـی هـەزار کـورد ، لـه بـاکوری کوردسـتان و دەربـەدەرکردنیان و دەسـتگیرکردنی بـه سـەدا هـەزار هـاوولاتی لـه کـوردو ئەرمـەن ، تـاکو ئێـستاش ڕژێمـی تـورك بـه هـەمان ڕامیاریەتی شۆڤێنی و جینۆساید مامەلـه لـه گـەڵ کـورد بـه شێوازێکی دیکـه ئەنجامیدەدا لە باکووری کوردستان .




٢٠٠٦/٣/١٦ جـەماوەری شـاری هەڵەبجـەی شـەهێد خۆپیـشاندانێکیان ئەنجامـدا لـه پێنـاو یارمـەتی و کۆمـەك ، کـه لـه مـاوەی ١٨ سـاڵی ڕابـردوو هیـچیان بـۆ نـەکراوە بـه پێـی پێویست ، که دڵخۆشکەری خۆیان بێت لە بژێوی ژیان و ئاوەدانکردنـەوەی شـارە زامدارەکـەیان بێـت ، شـایانی باسـه خۆپیـشاندانەکه کـه ئاکـامی بـووە هـۆی خۆپیـشاندانێکی توونـدو تیـژ لـه گـەڵ هێـزی ئاسـایش ، لـه ئـەنجام هاوولاتیـەك شـەهیدکراو ١١ هـاوولاتیش لـه جـەماوەرو پـۆلیس زامدارکران و ئاکامی بووە هـۆی سووتاندنی مینـۆمێنی هێمـای شـاری هەڵەبجـه لـه لایـەن چەند گەنجێکی هاندەر جا بە هەر بیانوەیەك بێت... بەلام...؟...!.



٢٠٠٦/٣/١٦ ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێراقـــی فیـــدراڵی هەڵبــژێردراو بــە پێــی دەســتووری هەمیـشەیی ، یەکـــەم کۆبوونـــەوەی پرۆتۆکـــۆڵی خـــۆی ئەنجامـــدا لـــە دوای ٩٤ ڕۆژ لـە هەڵبـژاردنی لـە ١٥ /٢٠٠٥/١٢ ، لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی کێشە هەڵواسراوەکان ، بە تایبـەتی لە بارەی پێکهێنـانی حکوومـەت . کـە عـەدنان پاچەچی سەرکردایەتی کۆبونەوەکەی کرد ، بە هۆی گەورەیی تەمەنی .

لە هەمان کات بەڕێزان مەسعوود بارزانی و مام جەلال بەشداریان تێداکرد .

لـە هـەمان ڕۆژ هێزەکـانی سـووپای ئاسمـانی و پیـادەی ئەمـەریکا بـە هـەموو چـەکە جـۆراو جۆرەکـان لـە سانـسۆرێکی بـۆ سـەر قـەزای سـامەڕا بـە نـاوی دەسـتگیرکردنی چـەکدارە تیرۆریـستەکان ، کـە ٥٠ فڕۆکـەی هێلیکۆپتـەری جـەنگی بەشـداری تێـداکردو بـە دەیـا حەشـارگەی چـەك و تەقەمـەنی لێدۆزرایەوەو دەستگیرکرا.

٢٠٠٦/٣/١٦ خۆپیشاندانێکی گەورە لە لایەن جەماوەری فەرەنسا لە پاریسی پایتەختی فەرەنـسا ئەنجامـدرا ، بـە هـۆی دەرکردنـی یاسـای کـارپێکردنی نـوێی دەرچوانی قۆناغەکانی خوێندن و بێکاران لە فەرەنسا ، لە ئەنجام بووە هۆی زامدار بوونی زیاتر لە ١٠٠ پۆلیس و ئاگربەردان لە چەندین کارگەو پرۆژەو دام و دەزگاو سووتاندنی بە دەیا ئۆتۆمبێل .

خۆپیشاندانەکە کاردانەوەی توونـدی کـردە سـەر ڕامیاریـەتی فەرەنـسا ، لـە بوارەکـانی ڕامیـاری وئـابووری و کۆمەلایـەتی و پەرینـەوەی بـۆ وولاتـانی دیکەی ئەورووپا .

٢٠٠٦/٣/١٧ باڵوێزی ئەمەریکا لە شاری بەغدای پایتـەختی ئێراق ، زاڵمـای خـەلیلزاد لـە لێدوانێکیدا ڕایگەیاندو گووتی:– گفتووگۆی نێوان ڕژێمـی ئیسلامی ئێران و ئەمـەریکا لـە شـاری بەغـدا دەکرێـت ، لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی کێـشە هەڵواسراوەکان .

بە تایبەتی لە سـەر باری ئێستای ئێراق و لە نێوان پێك هاتـەکانی گـەلانی

ئێراق ، بە تایبەتی لە نێوان هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلامی لە ئێراق .

٢٠٠٦/٣/١٧ جێگری سەرەك كۆماری سووریای پێشوو – عەبدولحەلیم خەدام– لە دوای كۆبوونەوەی هاوبەشی بەرهەڵستكاران لە سووریا، بە تایبەتی لە نێوان عەبدولحەلیمو سەرۆكی ئیخوان مسلمین لە برۆكسلی پایتەختی بەلژیكا ، ئەویش بەراگەیاندنی بەرەی رزگاری نیشتمانی لە سووریا لە پێناو كەتاندنی رژێمی بەعس لە سووریا.

٢٠٠٦/٣/١٨ بۆ یەكەم جار لە باشووری كوردستان ، كۆنگرەی یەكەمی ژینگە لە هوتێلی ژیان لە شاری دهۆك بە سەرپەشتی حكوومەتی هەرێم ئەنجامدرا ، كە نوێنەرانی حكوومەتو ریكخراوە كوردستانیو ئێراقیو جیهانی بەشداریان تێداكرد ، لە بارەی باری ژینگە لە كوردستانو چارەسەری ئەو گیروگرفتانەی كە كەوتۆتە پێش چارەسەركردنی ، لە هەمان كات چەندین سمینارو كۆرو كۆبوونەوە لەم بارەیەوە ئەنجامدرا بە سەر كەوتوانە .

٢٠٠٦/٣/١٩ سەرۆكی حكوومەتی فەلەستینی دەستنیشانكراو – ئیسماعیل هەنیە – لە لایەن جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامیو داواكردنی لەلایەن سەرۆكی دەسەڵاتی فەڵەستینی مەحمود عەباس، كابینەی حكوومەتەكەی لە ٢٤ وەزیر پێك هاتبوو پێشكەشی بە مەحمود عەباس كرد ، لەوانە ئافرەتێكو یەك مەسیحی تیابوو بۆ پەسندكردنی لە لایەن سەرۆكی دەسەڵاتی فەلەستینو پێشكەشكردنی بە ئەنجوومەنی یاسادانانی فەلەستینی و رەزامەندی لەسەركرد .

لەلایەكی دیكەوە وتەبێژی رەسمی ئیسرائیل لە راگەیاندنێكیدا یارمەتیو هاوكاریو گفتووگۆی لە گەڵ حكوومەتی حەماس رتكردەوە بە هۆی بوونی رێكخراوی حەماس بە رێكخراوێكی تیرۆریست لە وڵاتەكەدا .

٢٠٠٦/٣/١٩ لە دوای مشتو مرو گفتووگۆی چری نێوان سەركردایەتی پێكهاتەكانی گەلانی ئێراق ، ئەویش بە دامەزراندنی دەستەیەكی سەرۆكایەتی لە دەستەی سەرۆكایەتی كۆمارو ئەنجوومەنی وەزیرانو ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق ، لە نوێنەرانی پارتە بەشداربووەكانی هەڵبژاردنی ٢٠٠٥/١٢/١٥و ، بوونی نوێنەریان بە پێی كورسیەكانی ئەنجوومەن .

لە پێناو كەمكردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆك ئەنجوومەنی وەزیران ئیبراهیم

جەعفەری لە دەسەلاتەكەیدا .

شایانی باسە ئەم مرۆڤە بەخواستو ویستو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیی و هاوكارانی لە مەزهەب شیعە كاری دەكرد ، بە تایبەتی لە بارەی جێبەجێكردنی ماددەی/ ٥٨ لە یاسای ئیدارەی دەوڵەت تایبەت بە پارێزگای كەركوك و ناوچە دابڕاوەكان .

٢٠٠٦/٣/٢٠ لە هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی بیلاڕووسیا – ڕووسیای سپی– كە لۆكاشینكا سەركەوتنی بە دەستهێنا بۆ دوبارە وەرگرتنەوەی پۆستی سەرۆكایەتی بیلا ڕووسیا... لە گەڵ ڕاگەیاندنی سەركەوتنی لۆكاشینكا لەهەڵبژاردنەكانی حكوومەتی ڕووسیای یەكگرتوو پیر ۆزبایی لێكردوو ئەمەریكاش ڕەخنەی لێگرت ، لە هەمان كات یەكیەتی ئەوروپا هەوڵی سزادانی ڕووسیای سپی دەركرد ، لەلایەكی دیكە لایەنەكانی بەهەڵستكاری لۆكاشینكا داوای هەڵبژاردنەوەی دوبارەیان كرد ، بە هۆی دەست تێوەردان لە كاروباری هەڵبژاردنەكە ، بەڵام هەوڵەكان بێ ئەنجام بوون لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٦/٣/٢٠ لە سەردانێكی شانشینی وولاتی مەغریب شانشین محەمەدی شەشەم ، گەیشتە هەرێمی پۆلیساریۆ ، كە بە ناو بانگە بە بیابانی ڕۆژئاوا ... شایانی باسە جوولانەوەی پۆلیساریۆ یەك لایەنە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، كە ئەو سەردانەش بە دەست پێشخەری دوژمنكاری دادەنرێت بۆ هەرێمەكە.

لەلایەكی دیكە شانشین محەمەد داوا دەكات كە پارتو ڕێكخراوەكانی هەرێمەكە لە ڕێگەی هەڵبژاردن مافی ئۆتۆنۆمی وەربگرن لە ژێر دەسەلاتی شانشینی مەغریب ، بەلام بەرەی پۆلیساریۆ ئەو پێشنیارەی ڕەتكردەوە سەرەڕای كێشەی نێوانیان ، گەرچی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان بەردەوامە لە چارەسەركردنی ئەو كێشە هەڵواسراوە لە هەرێمەكەدا.



٢٠٠٦/٣/٢٠ ســەرۆکی ئەنجوومــەنی بــاڵای شۆڕشــی ئیــسلامی لــە ئێــراق و سەرۆکی لیستی هاوپەیمانی شیعە عەبدولعــەزیز حــەکیم بــە بۆنــەی چلەی ئیمامی حسێن ووتــارێکی پێــشکەشکردو تیایــدا جــارێکی دیکــە پیرۆزی بــە یەکیــەتی خــاک و گــەلی ئێــراق دوپــات کــردەوەو لــە هــەمان کــات دوبــارە بانگەشــەی دامەزرانــدنی هــەرێمی فیــدراڵی ناوەڕاســت و باشــووری ئێراقــی کــرد لــە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٢٠ کرێدانی کۆنفرانسی ئایینی لە شاری ئەشبیلەی باشووری ئیسپانیا ، کە لەلایەن سەرکردە جوولەکەکان ئەنجامدرا ، لە پێناو پەروەردەی ئاشتی لە نێوان ئاینی ئیسلام و مەسیحی و جوولەکە بە ئامادەبونی ئەمینداری گشتی نەتــەوە یــەکگرتووەکان – کــۆفی ئــەنان– لــە پێنــاو ژیــانی بەیەکــەوەو دابــین کردن لە هەموو بوارە جیاجیاکان لەجیهاندا .

٢٠٠٦/٣/٢٢ ســەرۆکی ئەمــەریکا جــۆرج بــۆش پیرۆزبــایی جــەژنی نــەورۆزی لــە گــەلانی ئاهەنگێری ئەو جەژنەیە کرد ، لە کوردو فارس و ئەفگان و گەلانی دیکە ، کە ئەم جەژنە بۆتە جەژنێکی نەتەوەیی ونیشتمانی سەری ساڵی نوێ بوونەوە ، بە تایبەتی لەلایەن کوردودوایی فارس لە کێشووەری ئاسیا.

٢٠٠٦/٣/٢٢ بــــەرپابوونی شــــەڕو پێکــــدادان لــــە نێــــوان هێزەکــــانی حکوومەت وهێزەچــەکدارەکانی تیرەوهۆزەکــان لــە شــاری مەقادیــشۆی پایتــەختی سۆماڵ ، بــە هــۆی دامەزرانــدنی بەرەیــەکی چــەکداری ســەربازی ئیسلامی بە پاڵپشتی ڕێکخراوی قاعدە ، کە زیاتر لە٤٠ هاووڵاتی لە نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر کوژران و زیاتر لە١٠٠هاووڵاتیش زامدار بوون .

ئــەو بارودۆخــە دژوارە بەردەوامــە لــە هــەموو لایــەنێك بەتایبــەتی لەلایــەنی شــەڕو ســەربازی لــە نێوان پێکهاتــەکانی گــەلانی ســۆماڵ کــە وولاتێکە بــاری هۆزو تیرە باڵی بە سەر وولاتەکەدا کێشاوە .

٢٠٠٦/٣/٢٢ ئەنجوومــەنی یاســادانانی هۆڵەنــدا لــە بڕیارێکیــدا سەرپۆشــی بــۆ هــەموو

قوتابیانی خوێندنگاكان لە وولاتەكە قەدەخەكرد .

٢٠٠٦/٣/٢٢ بەرپابوونی خۆپیشاندانی گشتی لە هەموو فەرەنسا بە تایبەتی لەپاریسی پایتەخت ، كە بووە هۆی سووتاندنی بەهەزاران ئۆتۆمبێل لە گۆرەپانی گشتی– لیز – لەلایەن خۆپیشاندەران ، ئەوەش لەلایەن قوتابیانی زانكۆو پەیمانگە جۆراو جۆرەكان و گەنجە بێكارەكان ئەنجامدرا ، بەهۆی نەگونجانی یاسای كاری كارپێكردن لە دەرچوانی خوێندنگاكان لە فەرەنسادا .

٢٠٠٦/٣/٢٣ كۆچی دوایی خانمە هونەرمەندی ئۆپرای ئەمەریكا خاتوو– سارا كالروێل – لە سەنتەری مینی ئەمەریكا لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا بە هۆی نەخۆشی دڵ ، كە بە یەكەم خانمی ئۆپرای ئەمەریكا دادەنرێت لە هەموو وولایەتەكانی ئەمەریكا.

٢٠٠٦/٣/٢٤ شاندێكی كۆنگرێسی ئەمەریكا لە هەر دوو پارتی دیموكراتی و كۆماری سەردانی شاری بەغدای پایتەختی ئێراقیان كرد ، لەپێناو بەرەو باشبردنی باری ئێراق ، بۆ ئەم مەبەستەش چەند كۆبوونەوەو كۆنگرەی رۆژنامەوانی لەگەڵ سەرەك كۆماری ئێراق مام جەلال تاڵەبانی ودوایش سەرەك ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێراق ئیبراهیم جەعفەری ئەنجامدرا .

لە پێناو پێك هێنانی حكوومەتێكی دیموكراتی فیدراڵی یەكگرتووی نیشتمانی و بەرەو پێش بردنی دۆسیەی باری ئاسایشی ئێراق و بوارە جیاجیاكانی دیكە لە ئێراقدا .

٢٠٠٦/٣/٢٥ گرێدانی كۆبونەوەی وەزیرەكانی دەرەوەی وولاتانی عەرەبی لە قاهیرەی پایتەختی میسر ، لەپێناو دارشتنی پرۆگرامی ئامادەكراو بۆ لوتكەی كۆمكاری عەرەبی لەلایەن سەركردەكانی عەرەب لە سەرەك كۆمارو شانشین وئەمیرەكان ، لە بارەی باری ئێراق و دەست تێوەردانی رژێمی ئێران لە كاروباری ئێراق ، بە پشتگیری كردن لە مەزهەبی شیعەی ئیسلام لە باشووری ئێراق، هەروا بیری گفتووگۆی رژێمی ئێران و ئەمەریكا وچەندین لایەنی دیكە لە بارەی باری ناوچەو هەرێم وجیهان .

٢٠٠٦/٣/٢٦ دەست پێكردنی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی یاسادانان لە كۆماری ئۆكرانیا لە نێوان سێ پارتی سەرەكی لە وولاتەكەدا ، لە پێناو هەلبژاردنی ٤٥٠ ئەندام بۆ ئەنجوومەنی وولاتەكە .

٢٠٠٦/٣/٢٦ سـەرۆکی هـەرێمی کوردسـتان مەسـعوود بـارزانی لـە هاوینـە هـەواری سـەلاحەدین پێـشوازی لـە هـەردوو سـەرۆکی ئەنجوومـەنی وەزیرانـی حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان وجێگرەکەی کـرد ، داوای لێکـردن کـە لـە مـاوەی ٣٠ ڕۆژ حکوومـەتی یـەکگرتووی هـەرێمی کوردسـتان پێـك بێـنن لـە پارتە کوردستانیەکان .

دوایی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیان ئەنجامدا لە بارەی چۆنیەتی پێکهێنانی حکوومـەت و بـارودۆخی کوردسـتان وئێرق ... بـەلاّم دڵخۆشکـەری شـەقامی کوردی نەبوو، بە هـۆی دووبـارەو سێ بارەودەبارەی هـەمان کـاروکردار ، بە پێـی خواسـت و ویـستی دوو پارتـە سـەرەکیەکەی پـارتی و یەکیـەتی سـووڕانەوە لـە هـەمان بازنـەی پـاوانکردنی دەسـەلاّت و پـاوانکردنی موڵـك و سـامانی گـەل و نیشتمان داهـاتووش شـاهد دەبێ لـە ڕێگـەی چـەند یاسـاو ڕێنمایەکی هاوبەشی نێوانیان...؟..!!.

٢٠٠٦/٣/٢٧ بـەرپابوونی شـەڕو پێکـدادان لـە نێـوان هێزەکـانی ئاسایشی ڕژێمـی ئێـران و کورد لە ڕۆژهەلاّتی کوردسـتان لـە شـاری خـانێ- پیرانـشەهر- بـۆ دەربڕینـی نـاڕەزایی ، کـە ڕۆژانـە دەڕژانـە سـەر شـەقامەکان و لـە ئـەنجام ڕووبـەڕووی هێرشی هێزەکـانی سـووپای ئێران بوونەوە بە بەکارهێنانی چەك بۆ سـەرکوت کردنـی خۆپیـشاندەرەکان ، لـە ئـەنجام ژمارەیـەك لـە هـاوولاّتی کـورد شـەهیدکران و ژمارەیـەکی زۆریـش زامدارکران وبـەدەیان هـاوولاّتی کـورد دەسـتگیرکران لـە شـارەکانی مـەهابادو کرمانـشان و ئازربایجـانی ڕۆژئـاوای ئێران .

٢٠٠٦/٣/٢٧ لە پرۆگرامی - ماورء الاخیار- لە کـەناڵی ئاسمـانی تەلـەفزیۆنی جـەزیرە لـە شاری دوبەی ، کە پرۆگرامێك بوو لـە سـەر جێگری سـەرۆك کۆمـاری ڕژێمـی بەعسی لە ئێراق سەدام حوسێن - عزەت ئیبراهیم - ی بلاّوکردەوە .

ئـەوش بـە ئاراسـتە کردنـی نامەیـەکی عـزەت دووری بـۆ لوتکـەی کۆمکـاری عەرەبی ، کە لەو ڕۆژە لەخرتوومی پایتەختی سوودان گرێدرابوو ،کە داوای کـرد بـە پاڵپـشتی کردنـی لـە هێزەکـانی بـەرگری نیـشتمانی لـە ئێـراق دژی ئەمەریکاو تاوانبارانی دژ بەگەلی عەرەبی لە ئێراقدا .



سەرەڕای ئەوەی کە عزەت دووری لە لیستی مردووەکان ژمێردرابوو، کە ئەمڕۆش لە ناکاو لە ڕاگەیاندنێکی بەنامە ئاڕاستەکراوەکەی بۆ لوتکەی سەرۆکەکانی کۆمکاری عەرەبی هاتەوە گۆڕەپانی ڕامیاری لە ئێراق ، گەرچی بەر لەوەش حکوومەتی ئەمەریکا ١٠ ملیۆن دۆلاری تەخانکردبوو بۆ ئەو کەسەی کە عزەت دووری دەستگیر بکات .

٢٠٠٦/٣/٢٨ لە دوای ئەوەی کە سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل – ئێریل شارۆن– بە هۆی نەخۆشیەکی کوشندە کەوتە نەخۆشخانە – ئەیهود ئۆلمرت– جێگەی گرتەوە ، لە دەسەلاتی سەرەك وەزیران و پارتەکەی پارتی ئەکادیمیای ئیسرائیل ، کە لە هەلْبژاردنەکان توانی ٢٨ کورسی لە کۆی ١٢٠ کورسی لە ئەنجوومەنی کنێسەت بەدەست بێنی ، کە زۆرترین ژمارەی کورسیە تاکو ئێستا ، کە پارتێکی ئیسرائیلی تەمەن کورت بە دەستی هێنابێت .

٢٠٠٦/٣/٢٩ لە دوای بەخاك سپاردنی تەرمی ١٤پێشمەرگەی پارتی کرێکارانی کوردستان P.K.K لە باکووری کوردستان لە شاری دیاربەکر ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی پارێزگای دیاربەکرو ، سێرك و، ئەدەنە ، خۆپیشاندانیان سازکرد ... لە ئاکام بووە هۆی شەڕی نێوان خۆپیشاندەران و هێزەکانی جەندرمەی ڕژێمی تورك و خۆپیشاندان و پێکدادان لە شارەکان و شارۆچکەکان و گوندەکانی باکووری کوردستان بەردەوام بوو دژی داگیرکەری ڕژێمی تورکیا لە باکووری کوردستاندا .

٢٠٠٦/٣/٢٩ دەستپێکردنی کسوفی ڕۆژ واتە ڕۆژگیران لەباکورو ڕۆژئاواو باشووری کوردستان کە لە کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ دەستی پێکرد تاکو گەیشتە

شێوەی مانگی کەوانەیی روو لە ڕۆژئاوا، کەمانگ بە شێوەیەکی لارکەوتە بەر نێوان ڕۆژو زەوی، بەڵام لە هەندێ ناوچەی ولاٰتانی عەرەبی زیاتر بوو لە هەندێ ولاٰتانی دیکە کەمتر بوو.

٢٠٠٦/٣/٢٩ لە دوای هەڵبژاردنەکانی جوولانەوەکانی فەلەستین ، بە تایبەتی لە نێوان جوولاٰنەوەی حەماسی ئیسلامی و جوولانەوەی فەتح ، لە ئاکام جوولانەوەی حەماس سەرکەوتنی بە دەست هێناو دوای ئەوە ئیسماعیل هەنیە پرۆگرامی حکوومەتەکەو پرۆگرامی ئەندامانی حکوومەتەکەی پێشکەش بە سەرۆکی دەسەلاٰتی فەلەستن مەحموود عەباس کرد ، لە هەمان کات ڕەزامەندی لە سەرکراو سوویندی یاساییان خوارد ، لە دوای پەسندکردنی لە لایەن ئەنجوومەنی یاسادانانی فەلەستین لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٣/٣٠ ، دەسەلاٰتی حکوومەت دەستی بە کارەکانی خۆی کرد ، لە ناو کێشەو ململانێی توندوتیژ لە نێوان هەردوو جوولاٰنەوەی ، فەتح و ، حەماس و ، لە نێوان حکوومەتی نوێی فەلەستین و دەسەلاٰتی ئیسرائیل و ولاٰتانی دیکەی پەیوەندار ، بە تایبەتی لە نێوان دەسەلاٰتی نوێی فەلەستین و ئەمەریکاو ، بەریتانیاو ، یەکیەتی ئەوروپا ، کە دڵگران بوون بەو حکوومەتە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

٢٠٠٦/٣/٢٩ کۆبوونەوە لە نێوان وەزیری دەرەوەی ئێراق وشیار زێباری و سەرۆکی دەسەلاٰتی فەلەستین مەحمود عەباس ئەنجامدراو لە ئاکامی ئەو کۆبوونەوە گفتووگۆی نێوانیان لە سەر باری ناهەمواری فەلەستین و ئاوارەکانی کۆمەڵگای چادری ڕوێشدی سەرسنووری نێوان ئوردن و ئێراق بوو ، لە هەمان کات نوێنەری دەسەلاٰتی فەلەیستین لەگەڵ سەرەك کۆماری ئێراق جەلال تاڵەبانی کۆبۆوە لە بارەی هەمان کێشەو ئاوارە فەلەستینیەکانی شاری بەغداش ، کە لە بارودۆخێکی نا لە بار دەژین لە پێناو چارەی کێشەکانیان .

٢٠٠٦/٣/٢٩ لە دوای هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی هەمیشەیی ئەفگانستان لە نێوان پارت و ڕێکخراو گروپە نەتەوەیی و ئایینی و هۆزو تیرەکان بە پێی هەڵبژاردنەکە ، کە لە مانگی/ ٢٠٠٥/٩ ئەنجامدرابوو، حکوومەتی ئەفگانستان پێکهێنراو بڕوای پەرلەمانی پێدرا ، سەرەڕای چەندین کێشەو ململانێی نێوان نەتەوە جیاجیاکان و تیرەو هۆزەکان ، کە کوردیش بەشداره لەو پەرلەمانەو حکوومەتە بە پێی ژمارەی دانیشتووان ، کە زیاتر لە٣٨٠٫٠٠٠ هەزار کورد لە ئەفگانستان دەژین بە سەرۆکایەتی حامد کارازای .



٢٠٠٦/٣/٣٠ كۆبوونەوەی ئەندامانی هەمیشەیی ڕێكخراوی نەتەوەیەكگرتووەكان لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ئەنجامدرا ، لە بارەی باری بواری چەكی ئەتۆمی ئێران و پەیوەندی نێوودەوڵەتی، لە پێناو گەمارۆ خستنە سەر ئێران ، گەر داواو ڕێنمایەكانی كۆمەڵگای نێوودەووڵەتی جێبەجێ نەكات ، لە هەمان كات كۆبوونەوەی ڕێكخراوی نەتەوەیەكگرتووەكان لە شاری نیۆیۆركی ئەمەریكی بەردەوام بوو ، بۆ هەمان مەبەست و چەندین لایەنی دیكەی پەیوەندی و كێشەی نێوودەوڵەتی و هەنگاونان بەرەو چارەسەركردن و بەرەو پێش بردنی ، بە تایبەتی لە بارەی باری ئێراق و ، ئەفگانستان و ، سوودان و ، سۆماڵ و ، پرۆژەی چەكی ئەتۆمی ئێران و ، هەرێمی بەلكان لە كێشووەرەكان .

٢٠٠٦/٣/٣٠ نگرۆبوونتی كەشتی باڵ هەڵگری بازرگانی میسر ، كە لە دوورگەی محرەقی بەندەرەی سعوودیە بەرەو میسر بەڕێكەوت و بەر لەوەی بگاتە میسر لە ڕووداوێكی دەریایی نگرۆبوو ، لە ئاكام بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٤٧ هاوولاتی ناو گەشتیەكەو زامداربوونی ٣٥ هاوولاتی ، ڕزگاربوونی ٩٠ هاوولاتی و لە دەست چوونی كەشتیەكەو چەندین كەلوپەلی دیكەی هاوولاتیان.

٢٠٠٦/٣/٣٠ سەرهەڵدانی كێشەیەكی دژوار لە نێوان سەرەك كۆماری لوبنان و سەرەك ئەنجوومەنی وەزیران ، لە دوای گەڕانەوەیان لە كۆنگرەی لوتكەی كۆمكاری عەرەبی لەخەرتومی پایتەختی سوودان ، كە بووە هۆی ئەوەی دووبارە لێكترازانی بەرچاوی چارەسەرنەكراوی كێشە هەمە لایەنەكانی نێوان سەركردەكانی لوبنان ، كە سەرەك كۆماری لوبنان ئەمین لەحود شەرعیەتی دەسەلاتی سەرۆكایەتی نەماوە بە هۆی ڕەتكردنەوەی زۆرینەی دەنگدەران لە هەڵبژاردنی پەرلەمان و حكوومەتی لوبنان ، لە نێوان پێكهاتەكانی لوبنان و لایەنگرانی ڕژێمی سووریاو هەڵوێستی حیزب و لایەنی چەكدارو هەڕەشەكردن لە پارت و ڕێكخراوەكان و حكوومەتەكانی لوبنان .

٢٠٠٦/٣/٣١ لە ئاكامی شەڕی نێوان كوردو هێزەكانی ئەمنی ڕژێمی توركیا لە پارێزگای دیاربەكر لە باكووری كوردستان ، كە بووە هۆی شەهیدبوونی ٧ هاوولاتی

کوردو زامداربوونی زیاتر لە ١٠ هاووڵاتی و دەستگیرکردنی زیاتر لە ٢٧ هاووڵاتی ، ئەویش بە ئاڵۆز بوونی باری پارێزگاکەو لێکترازانی پەیوەندی جەماوەری کورد لە گەڵ ڕژێمی تورکیا ، بە تەشەنەدار بوونی باروو دۆخەکە بەرەو شارەکانی دیکەی باکووری کوردستان هەنگاوی دەنا .




تورکیا بە هەمان بیروو بۆ چوونە کۆنەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی رامیاریەتەکەی دەبا بەرێووە لە ناوچەکەدا ، چ بەرامبەر بە کورد لە تورکیاو دەست تێوەردانی لە کاروباری ناوخۆی ئێراق لە بوونی کەرکوکیەتی کوردستان و چ لە ئێران و سووریا .

بەڵام گەر کێشەی کورد لە ناو وولاتەکانی خۆیان چارە سەر نەکرێت بە رێگەی ئاشتیانە دوا رۆژیان بەرەو هەڵدێریە بە پێی تێپەر بوونی قۆناخەکان

...؟...!.

٢٠٠٦/٣/٣١ ئەنجامدانی فراکسیۆنێکی سەربازی فراوان لە لایەن هێزەکانی سووپای ئێران لە هەموو بوارەکانی سەربازی ئاسمانی ، بە تایبەتی دەریایی و پیادەیی ، کە لە کەنداوی عومان ١٧٠٠٠ هەزار سەربازوو ٥٠٠ قارب بەشداریان تێدا کرد ... لە هەمان کات بە تاقیکردنەوی موشەکێکی ژێر ئاو ، کە بەخێراترین موشەك لە جیهان دادەنرێت ، کە بووە هۆی نارەزایی وولاتانی رۆژئاوا بە تایبەتی ئەمەریکاو ، بەریتانیاو ، فەرەنسا ، کە فراکسیۆنە سەربازیەکەش بەردەوام بوو لە کارەکانی بە پێی پرۆگرامی دارێژراو لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٦/٣/٣١ روودانی گومە لەرزەی زەوی لە شاری هەمەدانی رۆژهەلاتی کوردستان و رۆژئاوای ئێران بە هێزی ٦ پلە ، بە پێی پێوەری ریختەر ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە ٧٠ هاوولاتی و زامدار بوونی ٢٣٦ هاوولاتی و وێران بوونی بە سەدا خانوو کێلگەی کشتووکالی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٦/٤/١ هێزەکانی پۆلیس و ئاسایشی میسر هەلسان بە دەستگیرکردنی – نەعمان جمعە – و لایەنگرانی لە دوای دەرچوونی بریاری دەستگیرکردنی ، لە ئەنجام بووە هۆی شەرو پێکدادان و ، لە ئاکام ١٧ هاوولاتی پارتی وەفدی میسری زامدار بوون لە پێش بارەگای پارتەکە ، کە لە سەر سەرۆکایەتی پارت و هەلبژاردنەکانی سەرۆکایەتی میسری بوو .

لە گەل ئەوەشدا هۆکاری شەرەکەی بەرپرسانی پارتی وەفد دەگەرێتەوە بۆ ٢٠٠٦/١/١٨ ، کە دەرگای بارەگاکە داخرا لە لایەن مەحمود ئەبازەو لایەنگرانی بە رووبەرو بونەوەیان لە گەل نەعمان جومعە بە سەرۆکایەتی حزب ، دوایی لە چەندین راگەیاندنی دژ بە ئەمەریکاو ، ئیسرائیل وەستا ، لە گەل ئەوەشدا ئەیمەن نور ، کە لایانێکی جیاکەروەی ئەو پارتە بوو بە هۆی جیاوازی بیروو بۆچون رۆلی گرنگی هەبوو لە گۆرەپانی رامیاری میسری و ئیدارەی ئەمەریکاش پشتگیری لێدەکات .

٢٠٠٦/٤/٢ پرۆسەی هەلبژاردن لە تایلەند بەرێوەچوو کە ٤٥,٢٠٠ ملیۆن و دووسەد هەزار هاوولاتی بەشداری تێداکرد ، کە زۆربەیان خەلکی ناوچە گوند نشینەکان بوون ، بێ بەشداری ئۆپۆزسیۆن کە چاودێران لە کاتی هەلبژاردنەکە چەندین کردەوەی توندو تیژی لە شوێنە جیاجیاکانی

وولاّتەكەدا بەدەی دەكرا ، كە لە لایەن بەرهەڵستكاران ئەنجامدرا .

كە بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە پێنج هاوولاّتی ، شایانی باسە ماوەی دووبەرەكی لەو هەڵبژاردنە نزیكەی ١٢٠٠ هاوولاّتی موسلمان گیانیان لە دەستداوە بە هۆی كێشەی هەمەلایەنەی نێوان پێكهاتەكانی وولاّتەكە ... كە سەرۆكی تایلاند - یەتاكسین شینا واتر - كە بە تاوانی گەندەڵی تاوانباركراوەو گووتی ئەگەر ٥٠٪ دەنگ بە دەست نەهێنی دەست لە كاری سەرۆكایەتی دەكێشێتەوە لە وولاّتەكەدا .

٢٠٠٦/٤/٢ هەردوو وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاك ستڕۆو ، وەزیری درەرەوەی ئەمەریكا گوندا لیزا ڕایس لە ناكاو گەیشتنە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق و چاوپێكەوتنیان لە گەڵ سەرۆك كۆمار جەلال تاڵەبانی و سەرەك وەزیرانی كاتی ئیبراهیم جەعفەری ئەنجامداو داوای پەلە كردنیان لە پێك هێنانی حكوومەتی ئێراق ، لە هەمان كات لیستی یەكگرتووی مەزهەب شیعەی ئیسلامیان تاوانباركرد لە دواخستن و دورستكردنی كێشەو چارەسەرنەكردنی كێشە هەڵواسراوەكان .

لە هەمان كات چاویان كەوت بە سەرۆكی ئەنجوومەنی بالاّی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراق عەبدولعەزیز حەكیم و باسكردنی كێشەی پارێزگای كەركوك و ناوچە دابڕاوەكان و چەندین لایەنی دیكە ، چاوپێكەوتنیان لە گەڵ چەندین كەسایەتی دیكەی ئێراقی ئەنجامدا لە وولاّتەكەدا .

٢٠٠٦/٤/٢ كەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی جەزیرەی ئازادو لە پرۆگرامی - حصاد الیوم - خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەكانی گەلی كوردی لە باكووری كوردستانی لكێندراو بە توركیا بلاّوكردەوە ، لە پارێزگاكانی دیاربەركرو ماردین و ئەدەنەو وان و چەندین شارۆچكە دژی ڕژێمی توركیا ، بە تایبەتی لە- كیزیلنب - كە ٩ هاوولاّتی گیانیان لە دەست داو بووە هۆی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی تەواو لە باكووری كوردستان بە سەركردایەتی پارتی كرێكاران p.k.k ، لە هەمان كات بووە هۆی كاردانەوەی نا لە بار لە سەر داهاتووی ڕامیاریەتی ڕژێمی توركیاو بەرەو شڵەژان و لێك جیابوونەوە لە هەڵوێستەكانی دژ بەیەكتر لە ژێر ڕەفتارەكانی ڕژێمی توركیا .

٢٠٠٦/٤/٢ بەردەوام بوونی خۆپیشاندانی قوتابیان و كرێكاران لە شاری پاریسی

پایتەختی فەرەنساو پەرینەوەی بۆ شاروچکەو فراوانبوونی خۆپیشاندانەکە ، بە بەرزکردنەوەی دروشمی شۆڕشگێری و هێنانەوە بیری حکوومەتی لیبرالی فەرەنسا بە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٦٨ی شاری پاریس.
شایانی باشە ئەو خۆپیشاندانە مەزنانە ئەوەندەی نەمابوو حکوومەتەکەی ئەوسای فەرەنسا بە سەرۆکایەتی ژەنەراڵ دیگۆڵ بروخێنێ و حکوومەتێکی دیموکراتی لەم وڵاتە دابمەزرێنێ ، کە بووە هۆی ئەوەی ، کە وڵاتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا پشتگیری لە حکوومەتەکەی دیگۆل بکەن .
شایانی باسە باری گەلانی فەرەنسا زۆر جیاوازی هەیە لە گەڵ باری وڵاتانی دیکەی سەرمایەداری ، کە فەرەنسا سەرچاوەی شۆڕش و مافی مرۆڤ و دابینکردنی ژیان بووەو بەردوامە لەو ڕاپەڕینە مەزانانە تاکو بە ئامانجەکانی دەگات بە دوبارە بوونەوەی کۆمۆنەی پاریس ، ئەمجارەیان لە کۆماری فەرەنسا.

٢٠٠٦/٤/٢ کەشتیەکی لە داردروستکراو ، کە ٣٧ هاووڵاتی ئەفەریکیای هەڵگرتبوو بە ڕێگەی قاچاخ لە کەنارەکانی باکووری مۆریتانیا لە تەك پایتەختی نواکشوّت نگرۆ بوو ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ٣٧ هاوولاتیەکەی ناو کەشتیەکە ، کە لە پێناو بژێوی ژیان و چیتر نا .
شایانی باسە بە هۆی نەبوونی دادوەری لە دەسەڵات و پاوان کردنی سامانی گەل ودابەشکردن و داگیر کردنی لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتەی کە گەلانیان لە برسان و نەبوونی ئارامی وجیاوازی لە نێوان دەسەڵات و گەل ، ئەم کارەساتانەی لێدەکەوێتەوە ، کە مانگانە زیاتر لە ٦٠٠ هاووڵاتی لەو هەرێمە گیان لە دەست دەدەن ، ئەوە جگە لە وڵاتانی دیکەی جیهان هەتا بگرە لە کوردستان .

٢٠٠٦/٤/٣ سەرۆکی ئەرکانی هێزەکانی سووپای ڕووسیا یۆری بالۆیۆلیسکی لە لێدوانێکیدا ڕایگەیاند ، کە ڕووسیا دەستگیرە بە بەڵێنەکانی بەرامبەر بە فرۆشتنی چەك بە ئێران بە پێی یاساکانی نێودەوڵەتی و ڕێکەوتنە مۆرکراوەکان ، لە بواری هەمە لایەنەی سەربازی لە جیهاندا .

٢٠٠٦/٤/٣ کۆماری چینی میللی و شانشینی ئوسترالیا ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی کە چینی میللی مادەی یۆرانیۆم بکڕێ و بفرۆشێتە ئوسترالیا بۆ بنکە ئەتۆمیەکان ، کە سەرەك وەزیرانی ئۆسترالیا مۆرکردنی ئەو ڕێکەوتنەی بە

ڕێکەوتنێکی باش نرخاندوو دوپاتی ڕاستگۆیی و دەستگیر بوونی چینی بە بڕیارەکانی نێوودەوڵەتی لە بارەی نەناردنە دەرەوەی پێداویستیەکانی بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی دوپاتکردەوە لە پەیوەندی نێوو دەوڵەتی لە جیهاندا .

٢٠٠٦/٤/٤ لە دوای مناوەراتی – مانۆر – هێزەکانی سووپای ئێران بە تاقیکردنەوەی چەندین چەك و موشەکی نوێ لە بواری بەرگری ئەمڕۆش فرۆکەیەکی جەنگی سەرئاوی تاقیکردەوە ، کە ڕادار هەستی پێناکات ، لەگەڵ موشەکێکی دیکەو کەشتی جەنگی ، کە تۆڕبۆنەکانی ڕادار هەستی پێناکات ، ئەمەش لەوکاتەی کە کێشەی نێوان ئەمەریکاو هاوپەیمانانی لە گەڵ ئێران ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو دژواری و تەشەنەدار هەنگاودەنێ لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٤/٤ بە هۆی لێکترازان و شەڕوپێکدادان و خۆپیشاندانی نێوان کوردو هێزەکانی ڕژێمی تورکیا لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاتی تورکیا ، سەرەك وەزیرانی تورکیا – ڕەجەب تەیب ئەردۆگان – لە کۆبوونەوەی پەرلەمانی تورکیا داوای لە پارتی جووڵانەوەی کۆمکاری دیموکراتی کورد کرد ، بە ڕونکردنەوەی هەڵوێستی بەرامبەر بە پارتی کرێکارانی کوردستان K.P.K, وناوزەندکردنی بە پارتێکی تیرۆریست گەر نا هەڵوێستمان دەگۆڕێ ، چونکە ڕووداوەکانی بەو دواییەی باکووری کوردستان بە سەرپەرشتی پارتی کرێکاران بووە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا .

٢٠٠٦/٤/٤ بۆ یەکەمجار لە مێژووی پەیوەندی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و لایەنە کوردستانیەکان کۆبوونەوەی هاوبەش ئەنجام بدرێت ، لە دوای سپاردنی سەرەك وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان نێچیرڤان بارزانی و جێگری سەرەك وەزیران عومەر فەتاح ، لە پێناو دامەزراندنی حکوومەتی فرەلایەنەی یەکگرتوو لە هەرێمی کوردستان .

ئەویش بە ئامادەبوونی نێچیرڤان بارزانی و ، کۆسرەت ڕەسول عەلی و ، نەوشیروان مستەفاو ، فازل میرانی و ، چەندین کەسایەتی و بەرپرسی دیکەی پەرلەمان ئامادەی بوون . ئەویش بەخوێندنەوەی چەندین ووتاری پڕشنگدارو بریقەدار .

بەڵام شەقامی کوردی وای بۆ دەچێ ، کە لە ڕووی کارو کردەوە بە پێچەوانەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، تەنیا بەرەو پێش بردن و پاراستن و پاوانکردنی سامانی گەلە لە هەموو لایەنێك لەلایەن پارتی و یەکیەتی... ئەویش بە ٤٢ وەزیرو چەندین جێگری وەزیرو بە دەیا بەڕێوەبەری گشتی و...هتد...!..؟.

٢٠٠٦/٤/٥ هێزەکانی سوپای ئەمریکاو هاوپەیمانان لەهەڵمەتێکی ناکاوی چەکە قورسەکانی لە ژێر دەستی مەڵبەندەکانی پۆلیسی شارەکانی ژێر دەسەڵاتی مەزهەب شیعە کشاندەوە، لە ترسی بەپابوونی شەڕی نێوان لایەنگرانی جەعفەری و ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی و لایەنەکانی دیکەو مەزهەب سونە بەتایبەتی لەشاری بەغدای پایتەخت کە زیاتر لە ٦ر٠٠٠ر٠٠٠ ملیۆن کەسی تیا دەژی.

٢٠٠٦/٤/٥ سەرۆکی دەستەی بە ناو زانایانی ئیسلامی سووننە حارس ئەلزاری لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنی لە ناو ستۆدیۆی کەناڵی جەزیرە لە قەتەر... ڕایگەیاندو گووتی :- لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣/٤/٩و ، لە بارودۆخی نا لە باری ئێراقی فیدراڵ ، لە وەتەی ئیبراهیم جەعفەری پۆستی سەرەك وەزیرانی لە ئێراق گرتۆتە دەست، زیاتر لە٤٠ر٠٠٠ هەزار سووننە کوژراون ، ئیمە دەستبەرداری نابین.

شایانی باسە حارس ئەلزاری بە بەردەوامی دژی پرۆسەی سیاسی بووە لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حوسێن و دارو دەستەکەی لە ئێراق .

٢٠٠٦/٤/٥ لە پێناو هێورکردنەوی ئەو بارودۆخە دژوارەی کە لە نێوان حکوومەتی ئەمەریکاو ڤنزوێلا بەردەوامە ، کە دیبلۆماتکارانی ڤەنزوێلاو ویلایەتە یەککگرتووەکان کۆبونەوەیەکی فراوانیان بە ئامانجی هێورکردنەوە دیبلۆماتکاران لە ماوەی دوو مانگی ڕابردوودا لەم لایەنەوە ئەنجامدرا ، لە دەرکردن و تۆمەتبارکردن بەسیخووڕی کارلێکردن لە پەیوەندی نێوان هەردوو وولاّت لە بارەی گرژیەکی بەردەوامدایە.

لەم بارەیەوە ماری بیلی هرنانویزی جێگری وەزیری دەرەوەی ڤەنزوێلا گووتی:- لە زۆر بواردا ناکۆکی گەورە لە نێوان هەردوولادا هەیەو گەیشتن بە ڕێکەوتن زۆر گرانە .

٢٠٠٦/٤/٦ بە هۆی کردارە نامرۆڤایەتیەکانی ڕژێمی تورکیا بەرامبەر بە کورد لە باکوری

كوردســتان و دژایــەتی كردنــی كــورد و پێــشێلكردنی مافــە ڕەواكــانی ٤٦ پەرلـەمانتاری یەكیـەتی ئـەوروپا نامەیـەكی بـە بـەهایان ئاراسـتەی سـەرەك وەزیرانی توركیا ئۆردۆگان و حكومەتی توركیاكرد، بەتاوانباركردنی ڕژێمی توركیا لـەبارەی لەبارچونی بارو دۆخی باكوری كوردستان لەهـەموو بواره جیاجیاكان بەتایبەتی لەبواری نەتەوەیی ونیشتمانی لە باكوری كوردستان.

٢٠٠٦/٤/٦ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێرو بێرتن نەهێرنی ئێرلەندی پەردەیان لــە ســەر نەخــشەی زیندوكردنــەوەی ڕێكــەوتنی پێكهێنــانی حكوومــەتی هەرێمی ئێرلەندای باكور لادرا.

لە دوای تاوانباركردنی یەكتری لە ڕامیاریـەتی ساڵی ٢٠٠٤ ، ڕاوەستاوه ، بەڵام ئەم هەوڵانە بە تیرۆركردنـی – دینیس دونالدسۆن –ی بەرپرسی شین فیستی لەم هەفتەدا بەرداهات ، كە ئەمەش پەردەی لـە سـەر ئـەوه هـەڵماڵی و ناوبراو كە سیخوڕێكی بەریتانیابوو لە وڵاتەكەدا .

٢٠٠٦/٤/٦ وەزیــری دەرەوەی ئەمــەریكا گۆنــدا لیــزا رایــس لــە دانیــشتنی پەرلــەمان گــووتی:– ویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئەمـەریكا بەردەوامـە لـە لێكۆڵینـەوه لـە لایـەن وەزاڕەتـی بـەرگری ئەمـەریكا لـە بارەی ئـەو زانیاریانـەی بـە ماوەیـەكی كورت بـەر لـە جووڵانـەوه سـەربازیەكانی ئەمەریكا بۆ داگیركردنـی ئێـراق لـە ساڵی ٢٠٠٣ لە لایەن حكوومەتی ڕووسیا بە ئێراق درابوو ، بەردەوامین لە لێكۆڵینـەوه تـا بزانین ئـەو زانیاریانـە تـا چـەند ڕاسـتن ، چـونكە مەترسـی لـە سەر هێزەكانی سووپای ئەمەریكا دروستكردووه .

٢٠٠٦/٤/٧ لــە كۆبوونــەوەی نێوودەوڵــەتی لــە ڕبــاتی پایتــەختی مــەغریب نوێنــەری پـەیمانی نـاتۆ لـە گـەڵ نوێنـەری وڵاتـانی ناوەنـد باسـی تـیرۆرو كۆچـڕەوی نهێنــی كــرا ، كــە نوێنــەری حكوومــەتی ئیــسرائیلیش لــەو كۆبوونەوەیــە بەشداربوو ، لە گەڵ چەندین تەوەری دیكە لە ناوەندەكانی كۆبوونەوەكەدا .

٢٠٠٦/٤/٧ بـە هـۆی تەقاندنـەوەی دوو تیرۆرسـت لـە مزگـەوتی شـیعەكان – یۆرافـا – لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـراق ، كـە بـووه هـۆی گیـان لـە دەسـتدانی ٧٩ نوێژكـەرو زامـداربوونی زیـاتر لـە ١٦٤ كەسـی دیكـە ، كە لەوكاتـەی ئەنـدامی پەرلەمانی ئێراقی جەلالەدین سوغەیر وتاری هەینی دەخوێندەوه .

ئەمەش لە ئاكامی كێشەی نێوان هەردوو مەزهـەبی سووننەو شیعەی دژ بـە یـەكتری ڕوویـداو ئـەم كارانـە بـەردەوام ، كـە ڕۆژانـە بـەلای كەمـەوه ٧٥ كـەس

گیان لە دەست دەدات لە ڕێگەی کوشتن و سەربڕین و تەقاندنەوەو ڕفاندن.

شایانی باسە کێشەی نێوان ئەو دوو مەزهەبە ئیسلامیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ٧٥٠ زاینی و تاکو ئێستاش بەدەوامەو کۆتایی نایەت لە جیهانی ئیسلامیدا .

٢٠٠٦/٤/٧ لە بڕیارێکی یەکیەتی ئەوروپا بەڕاگرتنی یارمەتیەکانی بۆ گەلی فەلەستین و لە هەمان کات ئەمەریکاش ئەو یارمەتیانەی ڕاگرت بە هۆی سەرکەوتنی جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی و بەرەو پێکهێنانی حکوومەت ، لە بیروو بۆچوونی وولاتانی ڕۆژئاوا جوولانەوەی جەماسی ئیسلام بە جووڵانەوەیەکی تیرۆریست دانراوە... بەڵام داوایانکرد کە یارمەتی دانیشتووانەکانی فەلەستین بدرێت لە ڕێگەی ڕێکخراوی نەتەوە یککگرتووەکان .

شایانی باسە لە دوای هەڵبژاردن و بەتایبەتی لە دوای پێکهێنانی حکوومەت و داواکاری نێوودەووڵەتی، جووڵانەوەی حەماس دروشمی لە ناوبردنی دەووڵەتی ئیسرئیلی هەڵگرتووەو دانی بەدەووڵەتی ئیسڕائیل نەناوەو نایەنێت... چونکە چ جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی و حزبوڵڵای لوبنانی هەڵوێست و ڕەفتارو کارەکانیان لە دەست ئێران و ، سووریاو ، سعوودیەو ، چەند وولاتێکی دیکەی عەرەبیدایە .

٢٠٠٦/٤/٨ لە دوای هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی بیلاڕووسیا – ڕوسیای سپی– کە سەرۆکی بیلا ڕووسیا ئەلکسەندەر لۆکاشینکا بۆجاری سێیەم بە سەرۆکی بیلا ڕووسیا هەڵبژێردراوەو بەرامبەر پەرلەمان سووێندی یاسایی خوارد ، سەرەڕای ئەوەی بەرهەڵستکاران و وولاتانی ڕۆژئاواو یەکیەتی ئەوروپا ئەو هەڵبژاردنەیان بەساختە لە قەڵەمدا.

لەڕێو ڕەسمی سووێند خواردنەکە زۆر لە وولاتانی بەرهەڵستکار بەشداریان لەو ڕێوڕەسمەدا نەکرد بە ناوی دوا ئیمپراتۆریەت لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا.

٢٠٠٦/٤/٩ حکوومەتی ئیسرائیل بە ڕەسمی ڕاگرتنی هەموو پەیوەندیەکانی لە گەڵ دەسەڵاتی نوێی فەلەستین ڕاگەیاند ، کە جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی سەرکردایەتی دەکات و تەنیا لە گەڵ سەرۆکی دەسەڵاتی فەلەستین مەحمود عەباس نەبێت... کە مەبەستەکەش دیارە لە هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکاندا .

٢٠٠٦/٤/٩ هاوپەیمانی کوردستان بە شێووەیەکی ڕەسمی بوونی ئیبراهیم جەعفەریان

بە سەرۆکی حکوومەتی چوار ساڵەی داهاتووی ئێراقیان ڕەتکردەوە ، بە ئاگادارکردنەوەی هاوپەیمانی یەکگرتووی شیعەو لایەنە پەیوەندارەکانی دیکەی ئێراق ، بە هۆی هەڵوێستە تێك دەرانەکەی ، بە تایبەتی لە بارەی باری مافەکانی کورد لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .

٢٠٠٦/٤/٩ دەست پێکردنی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و ئەنجوومەنی پیران لە ئیتاڵیا لە نێوان لایەنگرانی سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا برلسکۆنی و چەپی ناوەند بەسەرۆکایەتی ڕۆمانۆ بڕۆدۆ ، کە نزیکەی ٤٧ ملیۆن دەنگدەر لە ٦٠٠٠٠ هەزار مەڵبەندی هەڵبژاردن بەشداریان لەو هەڵبژاردنەکرد ، کە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو، ئەویش بەسەرکەوتنی ڕۆمانۆ بڕۆدۆ لە هەڵبژاردنەکان بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی ئیتاڵیای بگرێتە دەست .

شایانی باسە هەڵبژاردنە گشتیەکەی ئیتاڵیا لە نێوان چەپی ناوەند بە سەرۆکایەتی ڕۆمانۆ بڕۆدۆو ، ناوەندی ڕاست بە سەرۆکایەتی سیلڤیۆ برلسکۆنی ، لە بارودۆخێکی نا لە باروو بە پێی ئەنجامە فەرمیەکانی هاوپەیمانی چەپی ناوەند لە ٤٩,٨٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا لەپەرلەمان

بەڵام هەرچی هاوپەیمانی ڕاستی ناوەند بوو لە ٤٩,٧٪ی دەنگەکان بەدەستهێنا ، کە سەرەك وەزیرانی برلسکۆنیە ، کەواتە بەپێی ئەو ئەنجامە بڕۆدی ٣٤١ کورسی لە کۆی ٦٣٠ کورسی لەپەرلەمان بەدەست هێنا , بەڵام برلسکۆنی ٢٧٧ کورسی لە پەرلەمان بەدەستهێنا لە وولاتەکەدا .

بەڵام سەربارەت بە ئەنجوومەنی پیران هاوپەیمانی ناوەندی ڕاست ١٥٦ کورسی لە ئەنجوومەنی پیران بەدەستهێنا بەرامبەر بە ١٥٨ کورسی بۆ ڕۆمانۆ بڕۆدۆ لە ئەنجوومەنی پیران... کە ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە هاوپەیمانی چەپی ناوەند حکوومەت بەسەرکردایەتی ڕۆمانۆ بڕۆدۆ پێك بێنێ لە ئیتاڵیا.

٢٠٠٦/٤/١١ بە پێی یاسای دەووڵەتی ئیسرائیل ، کە هەر سەرۆکێکی حکوومەتی ئیسرائیل جا بەهەر هۆیەك بێت ، بە تایبەتی نەخۆشی و تەمەن بۆ ماوەیی ١٠٠ڕۆژ لە دەسەڵات لابراو کە جێگرەکەی دەسەڵاتی تەواو دەگرێتە دەست لەڕێگەی کەنێسەی ئیسرائیل ، ئەویش ئەیهود ئەلمرت بڕیاری بەردەوامی بۆ درا بەسەرەك وەزیرانی حکوومەتی ئیسرائیل .

٢٠٠٦/٤/١٢ نوێنەرانی ٢٤ ڕێکخراوی جەماوەری و پیشەیی و دیموکراتی و سەندیکاو سەنتەر، بۆ نارەزایی دەربڕین لە دژی هەڵس و کەوتی ڕژێمی تورکیا بەرامبەر بە کورد لە باکووری کوردستان ، لە بەردەم پەرلەمان خۆپیشاندانێکیان ئەنجامدا ، جێگری سەرۆکی پەرلەمان و ژمارەیەك لە پەرلەمانتارانی پەرلەمان کوردستان پێشوازیان لێکردن بە چەند وتەیەك لەم بارەیەوەو پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ خۆپیشاندانەکان دوپات کردەوە لە باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/٤/١٢ سەرەك کۆماری تورکیا ئەحمەد سیزار لە لێدوانێکی بەرامبەر کۆمەڵێك لە ئەفسەرە گەورەکانی سووپای تورکیا ڕایگەیاند ، کە پارتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی ئۆردۆگان هەڕەشە لە دەسەڵاتی عەلمانی لە تورکیا دەکات بە هۆی خزانەناو دام و دەزگاکانی دەووڵەت ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەحمەد سیزار ماوی ساڵێکی ماوە لە دەسەڵاتی سەرەك کۆماری تورکیا .
کە ئەمەش نامەیەکی بە هێزە ، یەکەم بۆ دەزگاکانی سەربازی دەسەلاتدارو ، دووەم پارتە ئیسلامیەکان... شایانی باسە لە تورکیا دەسەلات دەسەڵاتی عەسکەر تاریەتەو ماوە بە دەسەلاتی مەدەنی نادات تەنیا بە پێی دەستوورو یاسا بنەڕەتیەکانی تورکیا نەبێت لە هەموو بوارەجیا جیاکان لە وولاتەکەدا
.

٢٠٠٦/٤/١٣ لە شاری – پەنجالوری– ویلایەتی کارناکاتای باشووری هندستان ئەفسانەی سینەمایی – راج کۆمار– لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد ، کە ئەو مرۆڤە بە توانایە حکوومەتی هیندستان بۆ ماوەی دوو ڕۆژ پرسەو ماتەمینی گشتی ڕاگەیاند ، بە سازکردنی ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی... شایانی باسە ڕاج کۆمار لە ساڵی ١٩٢٩ لە دایك بووەو لە ماوەی ژیانی بە شداری زیاتر لە ٢٠٠ فیلمی سینەمایی کردووە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٤/١٣ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا گۆندا لیزا ڕایس ، لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنی ڕایگەیاند ، کە چاوەڕوانی ڕکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکات ، لە پێناو بە کارهێنانی هێزی سەربازی دژی ڕژێمی ئێران .
بە هۆی دەست پێکردنەوەی بە پیتاندنی یۆرانیۆم و هەنگاونان بەرەوە

دروستکردنی چەکی ئەتۆمی ، ئەویش بە پێی بەشی/ ٧ لە یاسای نێودەوڵەتی لە بەڵگەنامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ، نەك گەمارۆدانی ئابووری و چەکی هەمەجۆرو پەیوەندی نێودەوڵەتی... لە گەڵ ئەوەشدا ڕووسیاو ، چینی میللی ، لە گەڵ بە کارهێنانی هێزی سەربازی نین دژی ئێران ، بەڵکو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بە ڕێگەی دبلۆماسی چارەبکرێت لە جیهاندا .

٢٠٠٦/٤/١٣ بەر پابوونی شەڕی نێوان هێزەکای سووپای تشادو هێزە چەکدارە یاخی بووەکان بە نیازی کودەتای سەربازی بە پشتیووانی حکوومەتی سوودان ، بەلأم لە دوای شەڕوپێکداداناو بۆردمانکردنی دەووروبەری پایتەختی تشاد ، لە ئەنجام بووە هۆی ئەوەی کە سووپای تشاد دەست بالأبێت لە سەر تشاد ، بە تایبەتی پایتەختی بنجامینا . لە هەمان کات سەرۆکی تشاد ئیدریس دوبی توانی دەسەلأتی بەسەر تشاد دابسەلمێنێ و ، یەکیەتی ئەفریکیا داوای کۆبوونەوەی ناکاوی کرد ، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تشاد بە هۆی ئەو بارودۆخەی کە لێی کەوتۆتەوە .



٢٠٠٦/٤/١٣ سەرەك کۆماری پێشووی ئێران و سەرۆکی دیاریکردنی بەرژەوەندیەکانی ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران هاشمی ڕەفسەنجانی سەردانی سووریای کرد ، لە پێناو یەکخستنی یەك هەڵوێستیان ، ئەویش بە هۆی پاڵە پەستۆی نێوودەوڵەتی ، بە تایبەتی لەلایەن ئەمەریکاو ، بەریتانیاو ، یەکیەتی ئەوروپا ، لە هەمان کات لەو سەردانەی چاوی کەوت بە سەرۆکی حزبەللأی لوبنانی حەسەن نەسروللأ ، لە پێناو بەرەو پێش بردنی ئامانجەکانیان لە ناوچەو هەرێمەکاندا .

٢٠٠٦/٤/١٣ لە کارێکی نەشتەرگەری پزیشکی سەرکەوتوانە لە بەریتانیا لەلایەن دکتۆر مەجدی یەعقوب لە گەڵ کۆمەڵێك لە پسپۆڕانی نەشتەرگەری لە سەر منداڵێکی بەریتانی تەمەن ١٢ ساڵان ، کە ناوی هانا بوو، بەر لە ١٠ ساڵ

پێش ئەمڕۆ دڵێکی دەستکردی لە پاڵ دڵەکەی خۆی چەسپێنرا ، کە دڵە دەستکردەکە لە ٨٠٪ی کارەکانی ئەنجام دەدا لە پاڵ دڵەکەی خۆی ، کە ئەو لە ٢٠٪ی کارەکانی ئەنجام دەدا ، لەم ڕۆژە دڵە دەستکردەکەی هانا ، کە لە پاڵ دڵە ئاساییەکەی خۆی بوو دەرهێنراو دڵە سروشتیەکەی خۆی لە١٠٠٪ کارەکانی خۆی ئەنجامدەدا.

٢٠٠٦/٤/١٤ بە هۆی پەلاماردانی سێ کەنیسەی مەسیحیەکان لە شاری ئەسکەندەریەی میسری ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی مەسیحیەکی قبتیو زامداربوونی حەوتی دیکە .

شایانی باسە بەر لە پێنج مانگ هەمان ڕووداو بۆ سەر کەنیسەکان لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسرو شاری ئەسکەندەریە ئەنجامدرا بوو دژی دانیشتووانە قیبتیە مەسیحیەکان ... شایانی باسە دانیشتووانە ڕەسەنەکانی میسر قبتین و ئێستا ژمارەیان لە ٠٠٠ ر٠٠٠ر١٢ ملیۆن زیاترە ، ئەمەش بە بە ئیسلام کردن و بە عەرەبکردن بە درێژایی مێژووی بوونی ئاینی ئیسلام و دەسەلاتی شۆڤینی عەرەب گەیشتۆتە ئەم قۆناخە..!.

٢٠٠٦/٤/١٤ یەکەم شەری بەرەیی لە نێوان هێزەکانی سووپای حکوومەتی ئەفگانستانو هێزەچەکدارەکانی تاڵیبان دەستی پێکرد ، ئەویش لە دوای ڕووخاندنی حکوومەتی تاڵیبانو ئوسامە بن لادن لە ئەفگانستان.

٢٠٠٦/٤/١٤ لە دوای سەرهەڵدانی کێشەو ململانێی نێوان دسەلاتی نێپاڵو بوون گەلانی نێپاڵ ، کە دژی دەسەلاتی توندڕەوی شانشینو حکوومەتی نیپاڵ ، کە شانشین چاندرا دەسەلاتی تاکڕەوی لە وولاتەکە دەبات بەڕێوەو ، لە هەمان کات لە وتارەکەی شانشین بە هەڵبژاردن ، کە بووە هۆی زیاتر لە تووندو تیژیو بەرپابوونی خۆپیشاندانو نارەزایی دژی شانشینو حکوومەت لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٦/٤/١٥ ڕۆمان نوسی بە ناوبانگی بەریتانیا خاتوو – مۆریێل سپارك– لە نەخۆشخانەی شارۆچکەی – سیفیتیلا دیلا چینا – ی هەرێمی تۆسایناى ئیتاڵیا لە تەمەنی٨٨ساڵیدا کۆچی دواییکرد ، خاتوونی ڕۆشنبیرو ڕوناکبیری ناودار لە ساڵی ١٩١٨ لە شاری – ئەدەینەرەی– بەریتانیا لە دایك بووە ، شایانی باسە زیاتر لە ٢٠ ڕۆمانی نووسیووە سەرەڕای بە دەیا بەرهەمی دیکە .

٢٠٠٦/٤/١٥ لە دوای ڕاگەیاندنەکەی سەرۆك کۆماری ئێران مەحمودی ئەحمەدی نەژادی بە بوونی ئێران بە دەوڵەتێکی ئەتۆمی و دەبێ بەم جۆرەش مامەڵەی لە گەڵ پەیوەندە نێودەوڵەتیەکانی لە گەڵ وولاتانی جیهان و ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەنجامدەدات ، کە سەرۆکی دیاریکردنی بەرژەوەندیکانی ئێران ، ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی ، سەردانی وولاتی کوێتی کردو لە گەڵ ئەمیری کوێت سەباح سالم کۆبوونەوە ، بە یاوەری بەرپرسە بالآکانی دسەلآتی ئەمیری کوێت .

٢٠٠٦/٤/١٦ بۆ یەکەم جار لە مێژووی باشووری کوردستان لە ڕیگەی فڕۆکەخانەی هەولێری نێوودەوڵەتی پۆستەی کوردستان بگاتە دەرەوەی کوردستان... واتە ڕەوانەکردنی پۆستەی هاوولآتیان بۆ دەرەوەی کوردستان و بە پێچەوانەشەوە لە هەرێمەکەدا .



٢٠٠٦/٤/١٧ سەرەك وەزیرانی لوبنان – سەنیورە– لە سەردانێکی بۆ ئەمەریکاو چاوپێکەوتنی بە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش و وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا گۆندا لیزا ڕایس و بەرپرسانی بالآی کۆشکی سپی ، لە پێناو بەرەو پێشبردنی پەیوەندیەکانی نێوان لوبنان و ئەمەریکا ، کە ئەویش خۆی لە سێ خاڵ دەگرێت ، یەکەم:– کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئیسرائیل لە ناوچەی مەزار شەبعەو گەڕانەوەی بۆ ژێر دەسەلآتی لوبنان ، دووەم :– لە بارەی چەکدارانی چەکی حزب و للآو پەیوەندی لە گەڵ سووریا ، سێیەم:– دەست تێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی یەکتری لە وولآتەکانیان .

٢٠٠٦/٤/١٩ دەست پێکردنی پرۆسەی هەڵبژاردنە گشتیەکان لە وولآتی تایلاند بەڕێوەچوو ، لە پێناو هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێی ئەنجوومەنی پیران لە تایلاند .



٢٠٠٦/٤/٢٠ سەرۆکی چینی میللی - خۆگین تاو- سەردانی ئەمەریکای کردو لەلایەن سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش پێشوازی لێکرا ، کە ئەمە یەکەم سەردانی سەرۆکی چینی میللیە بۆ ئەمەریکا لە ماوەی ٤٠ ساڵ زیاتر... گفتووگۆی نێوانیان لە بارەی باری ئەتۆمی ئێران و کۆریای بارکوورو هەرێمی دارفور بوو لە سوودان... بە تایبەتی لە بارەی باری ئابووری ، کە چینی میللی سوودمەند بووە لە ساڵی ٢٠٠٥ بە ٢٠٠ ملیار دۆلار ، دوایی لە بارەی باری مافی مرۆڤ بووە لە چین ، کە ئەمەش جێگەی لوتکەکانی نێوان سۆڤیەتی پێشوو ئەمەریکای دوێنێ و لوتکەکانی نێوان ئەمەریکاو چینی میللی ئەمڕۆیە .

٢٠٠٦/٤/٢٠ هێزەکانی ئاسمانی سووپای ڕژێمی ئێران لە هێرشێکیاندا بۆسەر بنکەو بارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان P.K.K لە سەرسێگۆشەی سنووری نێوان هەرسێ وولاتی ، ئێران و ، تورکیاو، ئێراقی داگیرکەر ، لە سەر خاکی کوردستان بە هاوکاری ڕژێمی تورکیا ، کە بووە هۆی شەهیدکردنی بە دەیا لە گەریلاکانی - پێشمەرگە- پارتی کرێکاران و کوژرانی بە دەیا لە سەربازەکانی سووپای ئێران لەو کارە سەربازیەدا لەسەر خاکی کوردستان .

٢٠٠٦/٤/٢١ بارەگای - کەی. جی. بی- واتە موخابەراتی سۆڤیەتی پێشوو لە کۆماری لیتوانیا کرا بە مۆزەخانەی کۆماری لیتوانیا ، لە پێناو نەهێشتنی ئاسەواری مەڵبەندی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە وولاتەکە ، کە ناوزەند بوو بە کۆشکی سوور.
شایانی باسە ئەو باڵەخانەیە ببووە جێگەی ئازاردان و ئەشکەنجەدانی گەلانی کۆماری لیتوانیا ، کە زیاتر لە ٥٠٠٠ هەزار هاووڵاتی لیتوانیای تیا شەهیدکرا بوو ، بە هۆی بەرهەڵستکاری ڕامیاریەتی سۆڤیەت بەرامبەر بەول ووأتەدا .



٢٠٠٦/٤/٢١ لـه دوای كێـشەو ململانێـی دژواری نێـــوان ســـەركردەكانی پـــارتو رێكخـــراوو گروپـــەكانی عـــەرەبیو كـــوردی لـــە ســـەر پێكهێنـــانی حكوومـەتی هەمیشەیی لـە ئێـراق ، كـە سـەرەك ئەنجوومـەنی وەزیرانـی كـاتی ئێراقـی ئیبراهیم جەعفـەری هۆكـاری ســەرەكی ئــەو كێــشەو ململانێیـــە بـــووە لـــە جێبـــەجێ نـــەكردنی ئـــاواتو ئامانجـــەكانی گەلانی ئێراق بە تایبەتی گەلو نیشتمانە داگیركراوەكەی كورد لەجێبـەجێ نەكردنی ماددەی/ ٥٨ لە یاسای ئیدارەی دەوڵەتی ئێراق ، لە دوای دەسـت كێـشانەوەی لـە كاندیدكردنەكـەی بـۆ وەرگرتنـی پۆسـتی دووەم جـاری لـە داهاتووی حكوومـەتی چوار ساڵە ، لیستی هاوپـەیمانی یـەكگرتووی شیعە بـە دانـانی نـوری مـالكی بـە كانديـدكردنی بۆ وەرگرتنـی پۆسـتی سـەرۆكی حكوومەتی ئێراق .

كە جیاوازی بە هێچ شێوەیەك نیە لە گەڵ ئیبراهیم جەعفەریو كۆپی ئـەوەو خۆیان دروستكەری كێشەو ململانێو باری دژواری ئێراقن ، لە هەموو بوارە جیاجیاكـان ، بـە تایبـەتی لـە بـاری ئاسـایشو بـژێوی ژیـانی گـەڵو كۆسـپ خستنە پێش كێشە هەڵواسراوەكانو.. چۆن...؟...!.

٢٠٠٦/٤/٢٢ كردنەوەی میهرەجانی هەفتەی – دارالمدی– لـە شـاری هـەولێری پایتـەختی هەرێمی باشووری كوردستـان ، لە لایەن بـەڕێز سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان بـە وتـارێكی لـە بـارو گـونجـاو بـە پێـی بـارودۆخی نـاوخۆو ناوچـەو هـەرێمو جیهـان ، كـە زیـاتر لـە ٥٠٠ لـە ڕۆژنامـەنووسو نووسـەرو ڕونـاكبیرو پڕۆفیـسۆرو هونەرمەنـدانی كـوردو عـەرەبیو ئێراقـیو وولاتـانی دیكـە ، بەوتارخوێندنـەوە بەشـداریان تێداكردو ، لـە هـەمان كـات پێشانگای كتێبـی هـەموو دەزگاكـانی كـوردیو ئێراقیو وولاتـانی دیكـەی عـەرەبی بەشـداریان تێداكرد لە باشووری كوردستان .

٢٠٠٦/٤/٢٢ گرێـدانی کۆبوونـەوەی یەکـــەمی ڕەسمـــی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێراقی فیدراڵی لە پێناو هەڵبـژاردنی سـەرۆکی ئەنجوومـەن و هـەردوو جێگرەکـەی یەکـەم و دووەمـی ئەنجوومـەن هەڵبـژێردران ، کـە مـەحمود مەشـهەدانی بـە سـەرۆکی ئەنجوومـەن بـە ١٥٩ دەنـگ و هەڵبـژاردنی خالیـد عەتیە بە جێگری یەکەم و ، هەڵبژاردنی عارف تـەیفور بەجێگری دووەمـی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق .



ئـەویش بـە دەنگـدانی نهێنـی لـە نـاو ئەنـدامانی ئەنجوومـەن بـە پێـی دەستووری هەمیشەیی ، سەرەڕای چەندین کۆبوونەوە کە دوادەخرا بە هـۆی کێشەی نێوان پارتـە ڕامیاری و نەتـەوەیی و کوردی و عـەرەب و مەزهەبەکانی شیعەو سوونته ، بـە پەڕاندنـەوەی بۆقۆناخێکی نـوێ و لـە بارتر ، لـە پێنـاو چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکان لە وڵاتەکەدا .

لـە هـەمان کۆبوونـەوە هەڵسـان بـە هەڵبـژاردنی سـەرۆك کۆمـارو هـەردوو جێگرەکـەی ، ئـەویش کـە مـام جـەلال بـۆ جـاری دووەم بـە سـەرۆك کۆمـاری ئێراقـی فیـدراڵ هەڵبـژێردراوە ، لـە گـەڵ هـەردوو جێگرەکـەی ، عـادل عەبدولمەهدی و، تارق هاشمی .

لەو کۆبوونەوە سەرەك کۆمارو وەزیرەکان و سەرۆکی پارت و ڕێکخراوەکـانی عـەرەبی و کـوردی و شـیعەو سوونته بەشـداریان تێـداکرد ، لـە گـەڵ بـاڵوێزی ئەمـەریکاو ، بەریتانیاو ، چـەندین لایـەنی دیکـە لـەو ڕێوڕەسمـەدا لـە شـاری بەغدای پایتەختی ئێراق .

٢٠٠٦/٤/٢٢ بـەرپابوونی شـەڕو پێکـدادان لـە نێـوان هێزەکـانی ڕێکخـراوی حەماسـی ئیسلامی و ڕێکخراوی فەتح ، لە کەرتی غـەزەو ڕامـەڵڵای فەلەسـتین ، ئـەوەش لـە دوای سـەرکەوتنی حـەماس بـوو لـە هەڵبژاردنـەکان و دامەزرانـدنی حکوومـەتی ئیسلامی و دان نـەنان بـە دەووڵـەتی ئیسـرائیل و دان نـەنان بـە بڕیارو ڕێکەوتنەکانی بەر لـە هەڵبژاردنـەکان و پەیوەنـدی نێوودووڵـەتی ، بـە ڕامیاریەتی توونـدڕەوی دوور لە خواست و ویستەکانی هەردوولایـەن و گـەلی

فەلەستین .

٢٠٠٦/٤/٢٢ لـە سـەردانێكی دیارینـەكراوی سـەرۆك كۆمـاری ئێـراق و بـاڵوێزی ئەمـەریكا زەڵمـای خـەلیل زاد ، گەیشتنە هـەولێری هـەرێمی باشووری كوردستـان ، لە لایـەن بـەڕێز سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان لـە هاوینـە هـەواری سـەلاحەدین پێشوازی لێكران و لە هەمان كات دەستیان بەگفتووگۆی نێوانیـان كـرد ، لـە سـەرباری ئێـراق بەگـشتی و كوردسـتان بـە تایبـەتی ، ئـەویش لـە دوای هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماری ئێراق و سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنـەرانی ئێـراق ڕاستەوخۆ لە ئێراقدا .

٢٠٠٦/٤/٢٣ سەرەك كۆماری چینی میللی – خۆگین تاو– سەردان شانشینی سعوودیەی كرد و لە لایەن شانشین عەبدوللاّ پێشوازی لێكراو، ئەو سەردانەش لە پێنـاو بە هێزكردنی پەیوەندی ڕامیاری و ئابووری و ئاسایشی ناوچەكە بوو.
شایانی باسە چینی میللی یەكەم وولاّتە لە پەیوەندی ئابووری بە تایبـەتی كڕینی نـەوت لـە سعوودیە بـە زۆرتـرین قـەبارە لـە دوای ئـەوەی ، كـە چینـی میللـی لـە بـواری پەیوەنـدی ڕامیـاری و ئـابووری و بازرگـانی نێوودەوڵـەتی ڕۆڵـی گرنگـی هەیە ، بـە تایبـەتی لـە هـەردوو بـواری ئـابووری و بازرگـانی لـە جیهاندا .

٢٠٠٦/٤/٢٥ بـۆ یەكـەم جـار ئافرەتـە نـاوداری كوردو جیهان خاتوو لـەیلا زانـای تێكۆشـەرو سـەركردەی كـورد ، سـەردانی باشـووری كوردسـتان بكـات بـەم شـێوەیەو لەلایـەن بـەڕێز سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان پێـشوازی لێكـراو ، دوای ئـەوە بیروبۆچـوونی هاوبەشـی داهـاتووی كـوردو خـاكی كوردسـتان ئاڵووگۆڕ بكەن ، لە پێناو یەكخستنی یەك هەڵوێست لە كوردستان .



لـە ناوەنـدی گۆڕەپـانی ڕامیـاری ناوچـەو هـەرێم و جیهـان ، لـە هاوسـەنگی و هاوكێشە هەمەلایەنەكان بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی ونشتمانیدا .

٢٠٠٦/٤/٢٦ چـەكدارە تیرۆریـستەكانی شیعەی سـەر بەموقتـەدا سـەدر بـە نـاوی سـوپای مەهدی ڕوو لە شاری كەركوك دەكەن ، لە پێنـاو وەسـتان دژ بـە هەرهـەوڵێكی

کورد بۆ کۆنترۆڵکردنی پارێزگای کەرکوك و گەڕانەوەی پارێزگای کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بۆ باوەشی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان .

تۆماس وابز ڕاوێژکاری ڕامیاری باڵوێزی ئەمەریکا لە شاری کەرکوك گووتی :- موقتەدا سەدر کە سەرکردەی سووپای مەهدیە دوو گرووپی چەکداری بە ژمارە ١٢٠چەکدار ئامادەکردو بەرەو شاری کەرکوك ڕەوانەی کردون ، جگە لەملاو لەولاش چەکداری دیکەی ڕەوانە کردووە ، بۆ پارێزگاکە.

٢٠٠٦/٤/٢٦ هەردوو وەزیری بەرگری ئەمەریکا ڕامسفلدو وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا گۆندا لیزا ڕایس ، گەیشتنە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ، لە گەڵ سەرۆك ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێراق نوری مالکی کۆبونەوە ، لە پێناو دامەزراندنی حکوومەتێکی لێهاتووی چارەسەرکەری کێشە هەڵواسراوەکان ، دوور لە حکوومەتی مەزهەبی ، بەڵکو بەحکوومەتێکی دیموکراتی یەکگرتووی نیشتمانی لە هەموو پێکهاتەکانی گەلانی ئێراق .



٢٠٠٦/٤/٢٦ ڕابەری ئاینی و دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران ئایەتوڵڵا عەلی خامەنائی لە وتەیەکیدا ڕایگەیاند ، بە پەلاماردانی بەرژەوندیەکانی ئەمەریکا لە وولاتانی جیهان ، گەرهاتوو ئەمەریکا پەلاماری ئێران بدات ، لە هەمان کات سەرۆکی ئێران مەحمودی ئەحمەدی نەژادی لە لێدوانێکیدا ، ئەویش ڕایگەیاند بەوەی کە هەر بڕیارێکی لە کارخستنی کاری ئەتۆمی ئاشتی لە ئێران بڕیاربدات ، ئێمەش پشتگوێی دەخەین و لە کارەکانما بەردەوام دەبین لە وولاتەکەمان .

٢٠٠٦/٤/٢٧ ڕۆژنامــەی خــەبات لــە ژمـارە/ ٢١٢٦دا ، بلاوی کــــــردەوە کـــــــە دەسلاَتدارانی ئیسرائیل توانیویانــە مــانگێکی دەســتکرد بــە نــاوی -



ئیسرائیل-B - ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان بکەن ، کە ئەو مانگە دەستکردە توانای ئەوەی هەیە وێنەی هەموو جۆرە شتێك لـە سـەر زەوی بگرێـت ، هـەتا گەر قەبارەی ٧٠سم بێت ، ئەمـەش لـە پێنـاو چاودێری کردنـی جمووجۆڵی سەربازی ئاسمانی وولاّتانی ناوچەکە بە تایبـەتی ئێران‌و وولاّتـانی دیکـەی عەرەبی لە کیشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٤/٢٨ لە دوای تەواو بوونی مۆڵەت پێدراوی یەك مانگ بە ڕژێمی ئێران ، ئەمینـدای گشتی ئەنجوومـەنی ئاژانـسی وزەی ئـەتۆمی ئێـران ، کـە محەمـەد برادعـی ڕاپـۆرتێکی بە پێـزی لـە سـەر باری ئـەتۆمی ئێران پێشکەش بە ئەمینـداری گشتی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان‌و ڕێکخراوەکـە کـرد ، لـە پێنـاو هەڵسەنگاندن‌و بڕیـار لـە سـەردان چ لـە سـەر دەسـەلاّتی ئێـران‌و پەیوەندیـە نێوودەووڵەتیـەکان‌و دراوسـێکان‌و چ لـە بـارەی بـواری ئـەتۆمی‌و پیتانـدنی یۆرانیۆم .

لە پێناو دروست کردنی چەکی ئەتۆمی ، ئیدارەی ئەمـەریکا بەوەرەقەیـەکی بـەها بەخـشی نرخانـدو ئێـرانیش گـوێی بـە ڕاپۆرتەکـە نـەدا ، بـاڵوێزی ئەمەریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان جۆن بۆڵتن لە ڕاگەیاندنێکی گووتی:- بە پێـی بەنـدی/٧ لـە یاسـاکانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بڕیـاری لـە بـاری بـۆ وەردەگیرێت .

٢٠٠٦/٤/٣٠ لــە دوای چــەندین کێــشەو ململانێــی نێــوان پــارت‌و ڕێکخــراوو گروپــە نیشتمانی‌و ئیسلامی‌وکۆمەلاّیەتی لە سەر دەسەلاّت‌و مەزهەب‌و بژێوی ژیان ، لە کۆماری میسر شەڕوپێکداادان‌و کاری توونـدو تیـژی بـەردەوام بـوو ، کە بووە هۆی ئەوەی کە ئەنجوومەنی نوێنەرانی میسر ، بڕیاری نوێکردنـەوەی بـاری نـا ئاسـایی بۆمـاوەی دووسـاڵی دیکـە درێـژ بکاتــەوە ، سـەرەڕای بەرەوپێش چوونی باری دیموکراتی لە میسردا .

٢٠٠٦/٤/٣٠ حكوومەتی سوودان ڕەزامەندی لە سەر مۆر كردنی ئەو ڕێكەوتنامەی پێشنیاركراوی یەكیەتی ئەفریكیا كرد ، لە پێناو كۆتایی هێنان بەو كێشەو ململانێیە تەشەنەدارەكان لە هەرێمی دارفورو جوولانەوە یاخی بووەكان .
بەلام تاكو نووسینی لەم ڕۆژە جوولانەوە یاخی بووەكان ئەو ڕێكەوتنەیان ڕەتكردەوە ، بە هۆی ئالۆزی كێشەكان ، ئەویش كە كارەكانی بە دەست یەكیەتی ئەفریكیاو نەتەوە یەكگرتووەكانە . لە گەلٚ ئەوەشدا پرۆژەی یەكیەتی ئەفریكیا داواكانی حكوومەتی سوودان جێبەجێ ناكات ، لە هەمان كات بە هەزاران هاوولاتی خۆپیشاندانیان ئەنجامدا دژی كۆمەلكوژی لە هەرێمی دارفورو ناوچەی كودڤان ، كە چەندین ئەندامی كۆنگرێس و ڕێكخراوی هەمە لایەن بەشداریان تێداكرد لە ناوچەكەدا .

٢٠٠٦/٤/٣٠ نووسینگەی سەرەك كۆماری ئێراق جەلال تالەبانی لە ڕاگەیاندنێكی بلاوی كردەوە ، كە گفتوگۆی لە گەلٚ حەوت لە گروپە چەكدارەكانی بە ناوی بەرگری كردن لە ئێراق كردیە ، بە هلوكاری ئەمەریكا و دژی ڕاگەیاندنی زەرقاوی ... دوای ئەوە هێزەكانی سووپای توركیا و، ئێران ، بە هاوبەشی وهەماهەنگی بەردەوام بوون بە بۆردومان كردنی پێگەو بارەگاكانی پارتی كرێكارانی كوردستان P.K.K و هاتنە ناو خاكی باشووری كوردستان بە پانی پێنج كیلۆمەتر .
شایانی باسە بەردەوامی هێرشەكانی هاوبەشی هێزەكانی ڕژێمی توركیاو، ئێران ، بۆ سەر بنكەو بارەگاكانی پارتی كرێكارانی كوردستان ، لە سەر سێگۆشەی سەرسنووری نێوان ، ئێراق و، ئێران و ، توركیاو ، ناوچەی قەلادزێ ، بووە هۆی دەربە دەربوونی سەدان خێزانی كورد لە سەر جێگەو شووێنی نیشتەجێی خۆیان لە گوندەكانی خاكی باشووری كوردستان ، بەرەو گوندو شارۆچكەكانی شاری سلێمانی .
لە پێناو حەوانەوەیان و لە لایەكی دیكە كچی كورد بە چەكەكەی بەرگری لە كوردو خاكی كوردستان دەكات و بێ ئەوەی هەلوێستی ڕەسمی بەرچاوی هەردوو ئیدارەی سلێمانی وهەولێر هیچ ئاكامێكیان هەبێت...؟؟.

٢٠٠٦/٤/٣٠ دەســـەڵاتی چـــەپڕەوی پۆلیڤیـــــا هەڵـــــسا بـــــــــەخۆماڵكردنی مەنجەمـــەكان و كێڵگـــە كـــــشتووكاڵی وچەندین پـرۆژەو كارگـەی دیكـەی وولاتەكەی ڕاگەیاند ، لە پێنـــاو بوژاندنـــەوەی ئـــابووری و ژێرخـــانی ئابووری و دەرهێنانی لە




دەســـت ســـەرمایە دارەكـــانی كـــەرتی تایبـــەت... دوو ڕۆژ بـــەر لـــەوەش كۆمارەكـانی ، بۆلیڤیـا و، فنزویلاو، كووبا ، لـە هاڤانـای پایتـەختی كووبا ، پـەیمانی بازرگـانی هاوبەشـی نوێیـان مـۆركرد لەلایـەن هەرسـێ سـەركردەی وولاتەكـە- فیـدل كاسـترۆ-ئـەبومۆراس-هۆگـۆ چـاوس- دژی بازارەكـانی ئـازادی ژێـر دەسـەڵاتی ئەمـــــــــــــەریكاو هاوپەیمالەســـــــەركردەو چەپرەوەكان ڕێكەووتنی بازرگـانی و هاوكـار بـە یـــــەكتریان مـــــۆركرد . جێگـەی باسـكردنه كـە




لەو ماوەی دوایی چەندین وولات لە ئەمەریكای لاتینی هێزە چەپرەوەكان لە هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی وولاتـەكانیان سـەركەووتیان بەدەست هێنا بە مەبەسـتی هاوكـاری و هاوپـەیمانی لـە دەسـەڵاتەكیانیان و وەسـتان دژی ڕامیاریـەتی ئیـدارەی وویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئەمـەریكا ، كـە وولاتـانی ئەمەریكای لاتینی بە حەدیقەی دواوەی ناوزەندكردبوو ، لە پێناو بە ئـەنجام گەیاندنی مەبەستەكانی لەو هەرێمانەدا .

بەڵام لە دوای سەركەووتنی هێزی چەپرەو كاردانەوەی لـە سـەر ڕامیاریـەتی

ئەمەیکا و هاوپەیمانەکانی کاریگەر بوو ... ئەوە هەر سێ سەرۆکی کووبا و فنزویلا و پۆلیفیا ڕێکەوتننامەیەکی بازرگانیان مۆرکرد . بە مۆری سەرۆکی کووبای فیدراڵ کاسترۆ و سەرۆکی پۆلیفیا ئیفۆ مۆرالیس ... ڕێکەووتنەکەش بەناوی – ئەلبا – بوو ، کە جێگرێکی باری سۆشیالیستی بێت بۆ ئەو ناوچەی بارزگانی ئازاد لە هەردوو ئەمەریکا ... ڕێکەووتنەکەش لە چەند خاڵێك پێك هاتبوو ئەویش :-

١- هەڵگرتنی باجی دەرامەت لەکاڵاو شمەکەکانی بازرگانی لە نێوان هەر سێ وولاتدا .

٢- گرنگی دان بە کەمکردنەوەی بێکاری و دۆزینەوەو ڕێگا بۆ لە ناوبردنی بێکاری لە هەرسێ وولات ، لە پێناو بەرەو باشبردنی باری بژێوی هەژار و بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووری .

٣- هەوڵدان لە پێناو نەهێشتنی نەخووێندەواری لە نێوان کۆمەڵگای ئەو سێ وولاتەدا .

٤- هاوکاریکردنی یەکتری لەبوواری تەندروستی و بەربەرەکانی ئەو نەخۆشیە کووشندانەی کە تووشی مرۆڤ دەبن ، بە تایبەتی یارمەتیەکانی کووبا بۆ پۆلیفیا ... هەروا بە دامەزراندنی یەکەی ئابووری و رامیاری لە ئەمەریکای لاتینی بەبێ ئەوەی یارمەتیەکانی ئەمەریکای تیا بێت لە ناوچەو هەرێمەکاندا.

٢٠٠٦/٥/١ نووسینگەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ، لە ڕاگەیاندنێکی ناڕەزایی خۆی بەرامبەر هێرشە هاوبەش و هەماهەنگی نێوان ڕژێمی تورکیاو ڕژێمی ئێران بۆسەر باشووری کوردستان ، لە ناوچەی قەلادزێ و پشدەرو لۆلانەو حاجی ئۆمەران بلاوکردەوە ، کە لە ئاکامی ئەو هێرشە زیاتر لە ١٥ گوندی ناوچەکە بۆردمان کراو لە ئەنجامدا چەند هاوولاتی و گەریلاکان گیانیان لە دەست دا لە گەڵ کوژرانی زیاتر لە ١٥ پاسداری ئێران لە باشووری ئێراق .



٢٠٠٦/٥/١ پەرلــــەمانی نیپـــاڵ ڕەزامەنـدی لـە سـەر پێك هێنـــــانی لیژنــــەی نووســـــــــینەوەی ڕەشنووسـی دەسـتووری لـە وولاتەکەیـدا کـرد ... ئــــەویش لـــــەدوای وەرگــرتنی هەڵوویـستی شانـشینی نیپـال بـە دەسـت لـە کارکێـشانەوەی ڕاستەوخۆی لە سەر دەسەلاتی حکوومەت بە دامەزراندنی سەرەك وەزیرانـی نویٚ لە وولاتەکەیـدا ، لـە هـەمان کات ئەو دەسـتوورە داهـاتووی دەسـەلاتی شانـشین دیـار دەکـات ... ئـەم هەڵوێـستەش لـەدوای لێـك ترازانـی بـاری کۆمــەڵگاو ئـابووری و ڕامیاریـدا هـات بـەهۆی بـەردەوامی کێـشەو شـەڕو ناکۆکی لە نێوان حکوومەت و چەکدارە ماوەیەکان لە وولاتەکەدا .

دوای ئەم هەڵوێستەی شانشین چەکدارە ماوەیەکان لە ڕاگەیاندنێك ڕوونیان کردەوە بە ڕاگرتنی شەڕو کاری چەکداری بۆ ماوەی سیٚ مانگ ، ئەویش بە پێخۆشحال بوونی بە هەڵوێستی شانشین ... هەروا سەرکردەی ماویـەکان – بـابورام باتـاری – هەڵوێـستی خـۆی ئاشـکرا کـرد . بە بەشداری کردنـی لـە لێژنەی دەستووری و هەڵبژاردن کە لە وولاتەکە ئەنجام بدرێت .

چەکدارە ماوەیەکان چەندین ناوچەی فراوانیان لەو وولاتەدا لەبەر دەستدایە ... لەگەل ئەوەشدا یەك لە داواکاریەکانی چەکدارە ماوەیەکان نەمانی ڕژێمـی شانـشینیە لـە وولاتەکـە بـە دامەزرانـدنی ڕژێمێکـی کۆمـاری کـە دادپـەروەری لەنێوو کۆمەڵگا مسۆگەر بێت لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٥/٢ پەیمانگای لێکۆلینەوەی ئەتۆمی ، کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شاری مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای یەکگرتوو ئاگری گرتوو لە ئاکام پەیمانگاکە زیانێکی گەورەی بە بەڵگەنامەو نووسراوو دانراوی هەمە جۆر ، لـە هـەموو بوارەکانی ئەتۆمی لێکەوتەوە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٥/٤ لــە دوا هەڵبژاردنــەکانی ئیـسرائیل و ســەرکەوتنی پـارتی کادیمـا بــە ســەرکردایەتی ئـولمرت و دامەزرانـدنی حکوومــەتی ئیـسرائیل : ســەرەك

وەزیرانــی نــوێی ئیــسرائیل ئــولمرت ســووێندی یاســایی خــواردو بــە شێوەیەکی ڕەسمی دەسەلاتی وولاتەکەی گرتە دەست لە دوای تەواو بوونی کاتی یاسایی ، لە دەسەلاتی کاتی سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل .

٢٠٠٦/٥/٥ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر دەست لە کارکێشانەوەی هەرسێ وەزیری ناوەخۆو بەرگریو دەرەوەی حکوومەتەکەی پەسەندکردو ، خاتوو مارگرێت بیکێت ، بە وەزیری دەرەوە دانرا لە جێگەی وەزیری دەرەوەی لادراو ، جاك سترۆ، ئەمەش بە هۆی سەرنەکەوتنی پارتی کرێکاران بە سەرکردایەتی تۆنی بلێر لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانیو بە دەست نەهێنانی دەنگی پێویستی دەنگدەران لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٥/٥ لە دوای گفتووگۆیەکی درێژخایەن لە نێوان حکوومەتی سوودانوگەوورەترین گروپی هەرێمی دارفور ، لە و توویژکردن بە سەرکردایەتی منی مناویو لایەنی جوولانەوەی ڕزگاری سوودان لە دارفور ئەنجامدرا ، بە مۆرکردنی ڕێکەوتن لە سەر پرۆژەی یەکیەتی ئەفریکیا ، بە بژیوانی ئەمەریکاو ، فەرەنساو ، بەریتانیا و ، نەتەوەیەکگرتوەکان .

ئەویش بە گۆڕانکاری لە چەندین خاڵی ڕێکەوتنەکە ولە سەر هەمان پرۆژە بە بەجێهێشتنی دەرگای ڕەزامەندی لە سەر بوون لەلایەن گروپە بەرهەڵست کارەکانی دیکەی هەرێمی دارفور.

ئەویش بە هەڵووەشاندنەوەی چەکدارانی جەنجەویدو دابەش کردنی دەسەلاتو سامان ، بە هاوبەشی حکوومەتو بەرەی میللی سوودان لە باشووردا .



٢٠٠٦/٥/٥ کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی جەزیرە لە دوبەی کاسێتێکی لە وتەکانی تیرۆریست زەرقاوی بلاوکردەوەو لە ناوەڕۆکی کاسێتەکەدا هاتووە دەڵێ:- لە ماوەی سێ مانگی داهاتوو ئیماراتی ئیسلامی لە ئێراق دادەمەزرێنێو لە هەمان کاتدا کۆپی ئەو سیدیە بە دەستی

هێزەكـانی سـووپای ئەمـەریكا كـەوتووە لـە ناوچـەی یوسـفیەی باشـووری شاری بەغدا .

٢٠٠٦/٥/٦ لێژنەیەكی هاوبەش كە لە ئەندامانی یەكیەتی ئەوروپا و، نوێنـەرێكی ڕژێمی توركیا پێكهاتبوو ، سەردانی شاری دیاربكری باكووری كوردستانیان كرد ، بـۆ ئـەوەی لـە ڕەوتـی بەڕێوەچـوونی پرۆژەكـان بـە دەسـتەبەر كردنـی مافـە كۆمەلایەتەكانی كوردی ژێر دەسەلاتی ڕژێمی توركیا بكۆلێتەوە.

سەرۆكی كۆمیۆسیۆنی ئەنجوومەنی هاوبەشی یەكیـەتی ئـەوروپا . جاسـت لاجەندیكی و نوێنەری ڕژێمی توركیا چەند كۆبوونـەوەیان ئەنجامـدا لـە گـەڵ سەرۆكی شـارەوانی پارێزگـای دیـاربكر عوسـمان بایـدەمیرو ڕێكخـراوی مـاف مـرۆڤ لـە شـارەكە دا ، لـە بـارەی مێـژوو بـاری ڕەسـەنی خـەڵكی ڕەسـەنی ئـەم پارێزگایەو هەرێمەكە لە باكووری كوردستان .

٢٠٠٦/٥/٦ بـــەهۆی تووانـــاو بـــوونی پێداویـستیەكان لـەم وولاتـەدا ... بەرازیل چووە ڕێزی یانەی وولاتـانی تووانـادار لـە پـۆلین كردنی یۆرانیـــۆم لـــە پێنـــاو بەرهـــەم هێنـــانی ووزە ... كـــە حكوومـــەتی بـــەرازیل لـــەكاتی گفتووگـــۆی لەگـــەڵ ڕێكخراوی نێوو دەووڵەتی بۆ ووزەی گەردیلە ...بە كردنـەوەی مەڵبەنـدی – ریـــسیندا – لـــە وولاتەكەیـــدا لـــە پێنـــاو جـــێ بـــەجێكردنی پرۆگرامـــی پێشكەووتنی ووزە لە بەرازیل .

ئەم هەنگاوەی حكوومـەتی بەرازیل بـووە جێگـە نـارەزایی لەلایـەن وولاتـانی ئەمـەریكای باشـوور ... هـەر لـەو كاتەشـدا پۆلیفیـا لـە حەفتـەی ڕابـردوو بڕیاریدا بە خۆماڵی كردنی دام و دەزگا و كۆمپانیە نـەوتیی و گازیـەكان لـە وولاتەكەیدا ... كە بەرازیل گەورەیی كریاری گازە لە پۆلیفیا ... كـە ئەمـەش یارمەتی دەرە لە پێناو بەهێزكردنی بەرهـەمی ئەتۆمی و سـەرەتایەكە بۆ بـە ئەنجام گەیاندنی ئامانجەكانی لە وولاتەكەدا .

ئەمـەش لـە دوای ڕێكـەووتنی نێوان حكوومـەتی برازیـل و ئاژانـسی ووزەی

ئەتۆمی – گەردیلەیی – سەر بەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هات لە وولاّتەکەدا .

٢٠٠٦/٥/٧ سەرەك وەزیرانی ڕژێمی تورکیا – ڕەجەب تەیب ئۆردگان – لە لێدوانێکی تەلەڤزیۆنی و بەرامبەر بە جەماوەری گەلی کورد لە پارێزگای دیاربکرو جیا لە وتەکانی ڕابردووی ، ئەویش



بە بەلّێنی هەلّگرتنی جیاوازی لە نێوان پێکهاتەکانی گەلاّنی تورکیا لە بواری ئاوەدانکردنەوەو باری ئابووری و هەروا گووتی:–
هەموومان بە یەکەوە بەسترانینەوەو کێشەی ئێووە کێشەی ئێمەیە ، گەر ئێووە زەرەر بکەن ئێمەش زەرەر دەکەین – تۆبەی گورگ مەرگە هەرچەند نەترس بێت – ..؟؟...!.

٢٠٠٦/٥/٧ ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان کۆبوونەوەی نا ئاسایی خۆی گرێدا ، بە پەسەندکردنی کابینەی پێنجەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق ، بە سەرکردایەتی نێچیرڤان بارزانی وجێگرەکەی عومەر فەتاح و ٤٠ لە وەزیرەکان ، لە پێکهاتەی دانیشتووانی هەرێمی کوردستان لە سەر بنەماکانی ڕێککەوتن لە نێوان پارت و ڕێکخراوە کوردستانیەکان بە تایبەتی لە سەر بەرژەوەندیە تایبەتی و گشتیەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی کوردستان.
لە کۆبونەوەی کابینەی پێنجەم سووێندی یاساییان خوارد بەرامبەر بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان و بە ئامادە بوونی بالوێزی ئەمەریکا زەلمای خەلیلزاد لە ئێراق و ، سەرۆك پەرلەمانی ئێراق مەحمود مەشهەدانی و ، جێگری سەرەك کۆماری ئێراق عادل عەبدولمەهدی و ، نوێنەری کۆماری ئیسلامی ئێران و ، ڕووسیا و، چینی مللی و ، بەریتانیاو، چەندین کەسایەتی دیکەی کوردی و ئێراقی و وولاّتانی دیکە لە جیهاندا .
دوای ئەوە سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان پرۆگرامی داهاتووی حکوومەتەکەی خوێندەوە ، کە هەموو لایەنێکی لە بوارە جیاجیاکانی لە

خۆگرتبوو ، دوای ئەوانیش جێگری سەرەك كۆماری ئێراق و ، بالوێزی ئەمەریكاو ، سەرۆكی هەرێمی كوردستان ، هەر یەكە لەوانە وتارێكی پیرۆزبایی و ڕێنمایی لە داهاتووی هەرێمی كوردستان و ئێراق خوێندەوە .

لە پێناو بەرەو پێشبردنی باری كوردستان لە هەموو بوارە جیاجیاكانی نەتەوەیی و نیشتمانی و ڕامیاری و ئابووری و كۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری و ئاوەدانكردنەوەو بژێوی ژیان و چەندین لایەنی دیكە لەچارەسەركردن و بەرەو پێشبردن .

بۆ مێژوو...چینی مللی ملیارێك و ٣٥٠ ملیۆن كەسە حكوومەتەكەی پێكهاتووە لە٣٠ وەزیر... بەڵام حكوومەتی هەرێمی كوردستان لە سێ پارێزگادا ، كە هەمووشی لە بەر دەستانییە ٤٢ وەزیر بە سەرۆك و جێگرەكەی..؟؟..!. لە باشووری كوردستان .

٢٠٠٦/٥/٧ جێگری سەرۆكی ئەمەریكا دیك چینی لە گەشتێكی بۆ وولاتانی ئۆكرانیاو ، لیتوانیاو ، كازاخستان ، لە ڕاگەیاندنەكاندا داوای لە حكوومەتی ڕووسیای یەكگرتوو كرد ، كە هەنگاو بنێ بەرەو ڕژێمی دیموكراتی وماوە بە وولاتانی دراوسێی بدات ، بە لە پێناو چوونە ڕیزی پەیمانی ناتۆ.

شایانی باسە ئیدارەی ئەمەریكا بەردەوامە لە جێبەجێكردنی خواستە هەمەلایەنەكانی ، بە تایبەتی لە بواری ئابووری و دەسەڵات لە وولاتانی یەكیەتی سۆڤیەتی پێشوو بە لێكترازاندنی زیاتر ، لە هەمان كات بە هەڵووەشاندنەوەی ڕووسیای یەكگرتوو ، كە یەكەم وولاتە لە بواری چەكی ئەتۆمی وڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و بە ڕاگرتنی هاوكێشەوهاوسەنگەكان بە پێی بارودۆخی نێوودەوڵەتیدا .

لە هەمان كات پەیوەندی لە گەڵ چینی مللی و، سەرهەڵدانی شەڕی سارد لە بارێكی دیكەو لە گەڵ وولاتانی دژ بە ئەمەریكا ، وەك ئێران و وولاتانی ئەمەریكای لاتینی ، بە هۆی سەركەوتنی لایەنە چەپرەوەكان و بەرەو گەشە كردن ، بە تایبەتی لە دوای كارە سیخووریەكەی فەرمانبەرانی بالوێزی بەریتانیا لە مۆسكۆی پایتەختی ڕووسیادا .

٢٠٠٦/٥/٨ لە دوای شكستهێنانی هەوڵەكانی حكوومەتی ئیتاڵیای هەڵبژێردراو ئۆپۆزسیۆن بۆ ڕێككەوتن لە سەر ڕاوبۆچوونەكانیان لە بارەی پالێوراوی سەرۆكایەتی پەرلەمانی ئیتاڵیاو نوێنەرانی هەرێمەكان ، پرۆسەی دەنگدان

بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی نوێی ئیتاڵیا ئەنجامدا .

کە زیاتر لە ١٠٠٠ ئەندامی پەرلەمان و نوێنەری هەرێمەکان بەشداریان لە دەنگدانی هەڵبژردنی سەرۆکی نویٚ حکوومەتی ئیتاڵیا کردو لە جێی سەرۆکی ئێستا - کارلۆ نازیلۆ جامبی- کە کۆتایی بە ماوەی وویلایەتەکەی هاتووە .

ئەم هەڵبژاردنەش گرنگی زۆری دەبێت کە ناتوانیٚ پێش سەرۆکی نویٚ حکوومەت پێك بهێنیٚ .

٢٠٠٦/٥/٨ وەزیری دەرەوەی فەرەنسا - فلیپ دۆست پلازی- ئاکامی کۆبوونەوەی هەر پێنج ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیای ڕاگەیاند .

کە نەیانتوانیە بەرامبەر دۆسیەی ئەتۆمی ئێران لە سەر ستراتیژێکی هاوبەش لە دژی ئەم وولاتە ڕێککەوتن ، کە ئەم کۆبوونەوە لە سەر ئاستی وەزیرەکانی دەرەوەی وولاتەکان بووە لە گەڵ ڕێکخەری کاروباری دەرەوەی وولاتانی یەکیەتی ئەورووپا -خافێر سولانە - بەشداری تێداکردووە لە شاری نیویۆرك کۆبوونەوەکان بەڕێوەچوون .

٢٠٠٦/٥/٨ بۆ یەکەم جار لە مێژووی هەرێمی باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق ، پێشانگای جیهان بۆ کتێب لە هەولێری پایتەخت کرایەوە ، کە وولاتانی عەرەبی و جیهان لەو بوارەدا بەشداریان تێداکرد ، کە ڕۆڵیٚ بەرچاوی بۆ داهاتووی کوردستان دەبێت .

٢٠٠٦/٥/٨ سەرەك کۆماری ئیسلامی ئێران مەحمودی ئەحمەدی نژاد نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش کردووە لە بارەی باری پەیوەندی دەسەڵاتی نێوان ڕژێمی ئێران و ئیدارەی ئەمەریکا لە داهاتوو ، بە پێی خواستەکانی هەردوو دەسەڵات لە ناوچەو هەرێم و جیهان ، بە تایبەتی لە بواری چەکی ئەتۆمی و پیتاندنی یۆرانیۆم .

٢٠٠٦/٥/١١ دوای سەرکەووتنی خاتوو - میشیل باشیلیت - لە هەڵبژاردنەکانی تشیلی سووێندی یاسایی لە ئاهەنگێکی گەوورە خوارد بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی تشیلی ... کە زۆربەی سەرۆك و سەرەك وەزیران و نووێنەری وولاتانی جیهان بەشداریان لەو ئاهەنگەدا کرد.



جێگــەی ئامــاژە پێکردنــە کــە هاوکاری چەپرەوی ناوەند ماوەی ١٦ ســاڵە دەســەڵاتداریەتی ئــەم وولاتــە دەکــات ... لــەو کاتــەی تــشیلی بووژانــەوەی ئــابووری بەرچـاو بەخۆیـەوە دەبـینێ و لـە هــەمان کــات هەوڵــە یەکەمــەکانی خـاتوو باشـیلیت چارەسـەرکردنی کێــشەکانە لــە گــەڵ وولاتــانی دراوســـــێی بەشـــــێوەیەکی بنبرکـردن. باشـیلیت تەمـەن ٥٤ سـاڵ و بروانامـەی دکتۆریـای هەیـە و ئـەم خاتوونــەش چــەندین جــار رەوانــەی بەندیخانــە کــراوە لەلایــەن ســەربازە دەسەڵاتدارەکان لە وولاتەکەدا ، لەکاتی سووێند خواردنی و لـە ووتەیەکیـدا خاتوو سیلیت بەڵێنیدا بە دامەزراندنی دام و دەزگای نوێی کۆمەڵگاکە . لـە پێناو جێ بەجێکردنی دادپەروەری کۆمەلایەتی و گیانی لێك بوون وگرنگی دان بە ئافرەت و چارەسەری کێشە هەمە لایەنەکانیان و هەروا دروستکردنی پردێك لەنێوو دەووڵەمەند و هەژاردا .

بەڵام لە هەمان کات گووتی :- گۆرانکاری بنەرەتی لەبواری ئابووری ناکرێت بەهۆی باری باشی ئابووری تشیلی لەنێوو وولاتـانی ئەمـەریکای لاتینی ... کــە ئەمــەریکا چــاوەروان بــوو لایــەنگرانی لــە هەڵبژاردنــەکان ســەرکەوتن بەدەســت بێــنن و حەدیقەکــەی دواوەیــان بــە باشــی خزمــەت بکــەن لــە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٥/١٤ لـە دوای هـەوڵێکی چڕ لـە توێژینـەوەو پـشکنین وگەڕان لـە چـاوگەی نـەوت توانرا یەکـەم بیری نـەوت لـە پارێزگـای هـەولێر لە ناوچەی قـەزای کۆیـە لـە دەووروبــەری گونــدی شیواشــۆك دەســت بــە هەلکەنانــدنی بکرێـت ، لــە ژێردەسەلاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ، کە ڕۆڵی سەرەکی هەیە بۆ بە هێزکـردن و گەشـەپێدانی ژێرخـانی ئـابووری و بـژێوی ژیـانی گـەلی کـورد لـە کوردسـتاندا .

٢٠٠٦/٥/١٥ لە دوای گۆڕین لە ڕامیاریەتی و هەڵوێستی حکوومـەتی لیبیا بە سەرکردایەتی

موعەمەر قەزاف بە ڕاگرتنی چەکە ئەتۆمیەکانو بەردەوام بوونی گفتووگۆی نێوان ئیدارەی ئەمەریکاو حکوومەتی لیبیا ، لە ئاکام گەیشتنە ڕێکەوتن ، بە کردنەوەی باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە لیبیاو بە پێچەوانەو ، سڕینەوەی ڕژێمی لیبیا لە لیستی وولاتانی لایەنگیرو یارمەتی دەری تیرۆرو ڕێکخراو گروپە تیرۆستەکان لە شاری تەڕابلس لە لیبیا.

٢٠٠٦/٥/١٥ سەرەك وەزیرانی ڕاسپێردراوی ئیتاڵیا ڕۆمانۆ برودی ، بۆ دامەزراندنی حکوومەتی نوێی ناوەندی چەپی ئیتاڵیا لە دوای سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانو پێکهاتەی کابینەی حکوومەتەکەی ڕاگەیاند بە پێشکەشکردنی بە سەرۆك جۆرجیۆن بۆلیتانوی ، ئەویش ڕەزامەندی خۆی لە سەرحکوومەتەکەی کردو لە ٥/١٧ کابینەی حکوومەتەکەی سوویێندی یاسایی خوارد ، بە سەرۆکایەتی ڕۆمانۆ برۆدی ، لە دوای دانوساندنو گفتووگۆیەکی درێژخایەن ، لە گەڵ هاوپەیمانەکان لەلایەنە ناوەندەکانی چەپ لە سەر پۆستە وەزاریەکان .

شایانی باسە لایەنە چەپڕەو مارکسیەکان لە وولاتانی ئەمەریکای لاتینیو ئیتاڵیا ئێستا دەسەڵات دارنو بەرەو پەرەسەندنو پێشکەوتنو گەشەکردن هەنگاودەنێن ، بەهۆی کاردانەوەی رامیاری جیهانگەری تەواو لە سەر جیهان ، لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانەکان ، لە بڵاوبوونەوەی برسیەتی لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانوکارو داگیرکردنی وولاتو سامانو بەروبوومی گەلان لە جیهان ، بە تایبەتی لەجیهانی سێیەمدا .

٢٠٠٦/٥/١٨ لە ئەنجامی کێشەی نێوان بیری عەلمانیەتو بیری ئاینی لە ناو ڕژێمو گەلانی تورکیای عەسکەرتاری ، خۆپیشاندانێکی گەوورە زیاتر لە ١٠ هەزار تورك لە ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا ئەنجامدرا



دژی هەڵوویستی حکوومەتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی ڕەجەب تەیب ئۆردکان ، کە سەرکردایەتی پارتی دادو گەشەپێدان دەکات لە تورکیادا ، لە هەمان کات ، ئەم خۆپیشاندانەش بەپاڵپشتی سەرکردایەتی هێزی سوویا بوو ، لە پێناو پتەوکردنی ڕژێمی عەلمانیەتو بەلاوەنانانی ئۆردگان لە

دەســەلاتو دەرکردنــی لــە وولات بــەرەو ئێــرانو سەرپۆشــەکانیش بــەرەو شانـشینی سـعوودیە ، کـە ئـەم دوودروشـمـە دروشـمـی خۆپیـشاندەران بـوو. کێشەی نێوان ئەودوو بیروبۆچوونە بە شێوەیەکی بەرچاو سەری هەڵداوە لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان ، بـە تایبـەتی لـە ناوەنـدەکانی سـەرکردایەتی دەســەلاتو بەتایبــەتی لــە پەرلــەمانی تورکیــاو دادگــای بــالای تورکیــا،... ئەویش لە ئەنجامی کوشتنی چەند دادوەرو ئەندام پەرلـەمانو پارێزەر بـوو لە کۆبوونەوەکانی پەرلەماندا .

٢٠٠٦/٥/١٩ وولاتانی کەنداو بە تایبەتی شانشینی سعوودیەو ، کوێتو ، ئیماراتیعـەرەبی ، داوای هاوبەشیان ئاراستەی ئیدارەی ئەمەریکا بە سەرکردایەتی جۆرج بۆش کـرد ، لـە پێنـاو بەچـەك کردنـی هێزەکـانی سـووپای ئـەم وولاتانـە ، بـە هـۆی بەهێزی سووپای ئێرانو بوونی چەکی نوێی سـەردەمیو بەرەو بەرهـەمهێنانی چـەکی ئـەتۆمیو دەست تێـوەردانی لـەکاروباری ناوچـەکەدا ، بـە تایبـەتی لـە ئێـراقو ، لوبنـانو هاوکـاری تـەواوی نێـوان ڕژێمـی سـووریا وئێران . کـە بۆتـە مەترسی دوا ڕۆژیان لە دەسەلاتو جیاوازی مەزهەبی ئاینیو نەتەوەییو چەند لایەنی دیکە... کە هەمان شانۆگەریەکەی ڕژێمی بەعسی لـە ئێـراق بـەرەو ئێـران هەنگاو دەنێ لە داهاتوودا.

٢٠٠٦/٥/٢٠ لــــە هاوینـــــە هـــــەواری شـــــاری شەرمـــــشێخی وولاتـــــی میـــــسر مونتـــەدای ئـــابووری جیهـــان بـــە ئامادەبوونی زیـاتر لـە ١٥٠٠ لـە زانـــاو پـــسپۆڕو ڕوونـــاکبیرو مامۆسـتای ئـەکادیمیو ڕۆشـنبیر لە بواری ئابووریو چەندین لایەنی دیکە ، بە سەرپەرشـتی سـەرەك کۆمـاری میسر حوسنی موبارەك بەڕێوەچوو ،. لەو مونتەدا ئابووریە نێوو دەووڵەتیە جیهانیە ، هەردوو حکوومەتی ئیسرائیلو ئەمـەریکا بەشـداریان تێداکرد ... لــە پێنــاو بــەرەو چاکــسازیودیموکراتیو ئــاوەدان کردنــەوەو ئــابووریو پرۆژەی هەمە لایەن لە بوارە جیاجیاکانو ، مونتەداکـەش لـە لایـەن سـەرۆکی میسر محەمەدحوسنی موبارەك بە وتارێك کرایەوە .



٢٠٠٦/٥/٢٠ لـە دوای کـۆڕو کۆبوونـەوەو پـەیوەنـدیو گفتووگـۆی چـڕو درێژخایـەن لـە ماوەی پێـنج مانگـدا ، کـە لـە ٢٠٠٥/٢/١٥ تـاکو ئـەمڕۆ سـەرەك وەزیرانـی

ڕاسپێردراو نووری مالکی توانی کابینەی یەکەمی هەمیشەیی حکومەتەکەی بۆ چوار ساڵی داهاتوو لە ئێراق ، کە پێکهاتبوو لە ٣٨ وەزیر پێشکەش بە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق بکات .، ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراقی فیدراڵ ڕەزامەندی لە سەر حکوومەتەکە کردو لە هەمان کات سوێندی یاساییان خوارد ، بە بەڵێندان بەجێبەجێکردنی پڕۆگرامی حکوومەت لە داهاتوو ، کە لە ٣٠ خاڵ پێکهاتبوو .، جگە لە وەزیری بەرگری و ناوەخۆ .

لە گەڵ ئەوەشدا بەرەی تەوافق و ئەلعراقیە لە هۆڵی کۆبوونەوەی تایبەتی ئەنجوومەنی نوێنەران و کابینەکەی نوری مالکی کشانەوەو هۆڵەکەیان بەجێهێشت ، کە کوردیش بەڕێژەی پێویست بە شداری تێدانەکرد... بە هۆی ئەوەی کە ئەو حکوومەتە لە سەر بنەماکانی ڕێکەوتن و بەڕێکردن بوو ، نەك لە سەربنەماکانی هەڵبژاردن و پێکهاتەکانی گەلانی ئێراق .

٢٠٠٦/٥/٢٠ بەرپابوونی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای ئەفگانستان بە پاڵپشتی هێزەکانی سووپای ئەمەریکاو هاوپەیمانان و هێزەچەکدارەکانی سەرۆکی پێشووی ئیسلامی لە ئەفگانستان مەحەمەد مەلا عومەر لە باشووری ئەفگانستان لە ناوچەی هەلمەد ؛ کە ناوچەیەکی سەرەکی بنکەکانی تاڵیبانە لەدژی حکوومەت و بەردەوام بوونی شەڕی بەرەیی بە دووبارە بوونەوەی مێژوو ،. گەر بەر لە ڕووخانی ڕژێمی تاڵیبان دژی سۆڤیەت ویاوەرەکانی بوو بە پاڵپشتی ئەمەریکا ، ئەمرۆش دژی ئەمەریکاو هاوپەیمانیەتی لە جەنگکردن و کاردانەوەی کاریگەری هەیە لە سەر ناوچەو هەرێم و جیهان ... ئەمەیە کە دەڵێن – ئەوانەی بیر بۆ کەسانی دیکە لێبدەن بەخۆیان دەکەونە ناوی– .

٢٠٠٦/٥/٢١ دوای ڕەتکردنەوەی پلانی یەکگرتنەوەی هەردوو دوورگەی قووبرسی یۆنانی و تورکی ، کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە مانگی/ ٢٠٠١/٤ پێشنیاری کردبوو، نزیکەی ٥٠٠ هەزار قووبرسی یۆنانی لە یەکەم هەڵبژاردنی

پەرلەمانیـدا ڕوویـان لـە سـندوقەكانی دەنگـدان كـرد ، بـۆ هەڵبـژاردنی پەرلەمانی نوێی وولاتەكەیان ڕاپرسیەكیش كە لە ڕۆژی ٥/١٤ لەم بارەیەوە ئەنجام درابوو ئاماژە دەكات كە پارتی – تاسوس بابا دویدلوس دیكۆ – كە سـەرۆكایەتی هەڵمـەتی ڕەتكردنـەوەی پلانـی یەكگرتنـەوەی دوورگەكـەی دەكرد ، كە ژمارەی نوێنەرانی لە ٩ نوێنەر بۆ ١٢ نوێنەر زیادی كردووە لە وولاتەكەدا .

٢٠٠٦/٥/٢١ میری كوێت فەرمانێكی بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی كوێتی مۆركرد ، چـونكە مـیری كوێـت دەسـەلاتی هەڵوەشـاندنەوەو بانگـەوازكردنی هەڵبژاردنـەكانی پێـشووەختی پەرلـەمانی هەیـە لـە وولاتەكـەدا ، ئـەم تەنگەژەیـەش لـە ئاكامی بەرچاوخـستنی پڕۆژەی نـوێی هەڵبـژاردن سـەری هەڵدا ، كە لە لایەن بەرهەڵستكارانەوە ڕەتكرایەوە لە وولاتەكەدا .




٢٠٠٦/٥/٢٣ سـەرۆكی لێژنـەی ڕاپرسی تایبـەت بـە مـۆنتینیگرۆ – فرانتیـــسیك لبتیـــا – بەشـــێوەیەكی ڕەسمـــی ئەنجامـەكانی ڕاپرسیەكەی ڕاگەیانـــد كـــە نزیكـــەی ٥٦٪ی دانیـــــشتووانی هەرێمەكـــە دەنگیـــان بـــۆ سـەربەخۆیی وجیابوونەوەی هەرێمەكـە یانـدا لـە سڕبیا... لـە هـەمان كـات بەرپرسـی كاروبـاری دەرەوەو پەیوەندیـەكانی یەكیـەتی ئـەوروپا خـافیر سـۆلانە لێـدوانێكی سـەبارەت بـە ئـەنجامی ڕاپرسـیەكەدا بەرامبـەر بەحكوومەتی سڕبیاو ڕووسیاو گووتی:-

دەبێ هەموو لایەكمان ڕێز لە بڕیارو ئارەزوومەندانەی خەڵكی ئەم هەرێمە بگـرین... شـایانی باسـە هـەرێمی مـۆنتینیگرۆ لـە سـالّی/ ١٩٩٩ نیمـچە سـەربەخۆیی هەیـەو خـەڵكی ئـەم هەرێمـە لـە بـارێكی ئـارامی و ئـازادیو هـەنگاونانی بەرەو پێشەوەو مامەڵەنەكردن بە دراوی یوٚگسلافیای پێشوو نـەدەكرد ، بـە ڵكـو بـە دۆلارو یـۆرۆ دەكـرد... كـە موسـوڵمانەكان لـە٢٠ ٪ دانیشتووانی ئەو هەرێمەو وولاتە نوێیەن ، كە ئەو هەرێمە هەرێمێك بووە لە

یوگسلافیای یەکگرتوو... ژمارەی دانیشتوانی ٦٠٠ هەزار کەسەو لە ٤٢,٢ ٪ . خەڵکی ڕەسەنی هەرێمەکەن کە ٣٢٪ . سربی و ٧,٧٪ . بۆسنی و ١,٥٪ . ئەلبانی و ٤٪. خەلکی موسولمان و هی دیکەن لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٥/٢٤ فڕۆکەخانەی نێوودەوڵەتی ئەتاتورك کە لە بەشی ئەورووپای شاری ئەستەمبوڵە ئاگری گرت ، کە بەگەورەترین فڕۆکەخانە لە تورکیا دادەنرێت و بووە هۆی وەستانی گەشتە ئاسمانیەکان... شایانی باسە شاری ئەستەمبوڵ ژمارەی دانیشتووانی ١٢ملیۆن کەسە ، کە لەو ١٢ملیۆنە ٠٠٠ر٥٠٠ر٣ ملیۆن ونیوی دانیشتووانەکە کوردن..؟؟...!.

٢٠٠٦/٥/٢٧ وەزیری دەرەوەی ڕژێمی ئێران سەردانی بەغدای پایتەختی ئێراقی کردو لە گەڵ بەرپرسان گفتووگۆو کۆبوونەوەی ئەنجامدا ، دوایی لە ٥/٢٨ سەردانی مەرجەعیەتی ئاینی مەزهەب شیعە عەلی سیستانی لە شاری نەجەف پیرۆز کرد ، دوای ئەو لە گەڵ چەندین بەرپرس و لایەنی دیکەی مەزهەب شیعە گفتووگۆی کرد ، کە بووە هۆی نا ئارامی لایەنی مەزهەب سووننەی ئیسلامی عەرەب ، بەهۆی دەست تێوەردانی ڕژێمی ئێران لە کاروباری ناوەخۆیی ئێراق ، بە تایبەتی دروستکردنی دووبەرەکی لە نێوان شیعەو سووننە لە ناوەڕاست وباشووری ئێراق کە بە قۆناخێکی نا لە بار تێدەپەڕێ .

٢٠٠٦/٥/٢٨ ڕوودانی گوومەلەرزەیەکی گەوورە لە هەرێمی جاوای ئەندۆنۆسیا ، کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە٦٥٠٠ هەزار هاوولاتی و دەربە دەربوونی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار هاوولاتی و وێران کردنی بە دەیا هەزار دۆنم لە زەوی و کێڵگەو خانوو پڕۆژەی هەمەجۆر ، لە هەمان کات بەرپابوونی گڕکان لە لوتکەی شاخە بەرزەکانی هەرێمەکەو لە دوای ئەو گومەلەرزەیە زیاتر لە ٤٠٠ گومەلەرزە لە ئەندۆنوسیا لە هەرێمەکەو لە دەووروبەری ڕوویدا .

٢٠٠٦/٥/٣١ ئیدارەی ئەمەریکا بە سەرکردایەتی جۆرج بۆش ڕەزامەندی لە سەر ڕاگەیاندنی ڕژێمی ئێران بە دەست پێکردنی گفتووگۆی ڕاستەوخۆی کرد ، لە نێوان هەردوو وولاتی دژ بە یەکتری ، لە پێناو گەیشتن بەرێکەوتن لەبارەی پڕۆگرامی چەکی ئەتۆمی ئێران و دەست تێوەرنەدان لە کاروباری ئێراق ،.

هەتاچوونە ڕیز وولاتانی ترۆیکا ، کە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەووڵەتی پێکدێنن ، لە گەڵ ئەڵمانیا ، گەرنا پرس و ڕا بە هاوپەیمانانی دەکات ، لە پێناو سزاخستنە سەر ئێران ، لە ڕێکخراوی

نەتەوە یەکگرتووەکان بەرامەندی هەموو لایەنەپەیوەند دارەکان .

بەلام ئێران لە زۆر هەلوویستدا نەرمی دەنوێنیو لە زۆر هەلوێستیش توندی دەنوێنی ، لە پێناو درێژکردنەوەی ماوەی جێبەجێکردنی خواستە نەهێنیەکانی ، بە تایبەتی لە لایەنی خۆسەپاندنی لە سەرباشووری ئێراق ، بە رێنمایی کردنی مەزهەب شیعە بەگشتی و باری ئەتۆمی لە وولاتەکەی ، گەرچی هەوڵەکان لە باری چرۆپرو دژواردا دەخولێنەوەو بۆتە کێشەیەکی چەندین لایەنە لەجیهاندا .

٢٠٠٦/٥/٣١ شاندێکی کۆنگرێسی ئەمەریکا کە لەشەش ئەندام پێکهاتبوو بۆ یەکەم جاری بگاتە هەرێمی باشووری کوردستان و لە لایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان پێشوازی لێکران ، لە هەمان کات لەلایەن سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێشوازی لێکراو، باس لەباری ئاسایش و بەرپرسی پێشمەرگەو پەیوەندیەکانی هەرێم لەگەڵ دراوسێکان کرا لەگەڵ چەندین تەوەری گرنگدار لە بواری ئاوەدانکردنەوەو پەیوەندی و داهاتوی کورد لە کوردستان وئێراق و ناوچەوهەرێم بە تایبەتی باشووری کوردستان.

٢٠٠٦/٥/٣١ لە سەردانێکی ڕانەگەیەندراودا وەزیری دەرەوەی ڕووسیا – سێرگی لافرۆف– گەیشتە تورکیا سەبارەت بە تایبەتمەندیە رامیاری و بازرگانی و پەیوەندیە هەمەلایەنە جۆراوجۆرەکان لە ناوچەو هەرێم و جیهان .

هەروا لە بارەی پرۆژەی چەکی ئەتۆمی ئێران و باری ئێراق و، فەلەستین و ، لوبنان ، کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرەك کۆماری تورکیا ئەحمەد نژدەت سیزارو ، سەرەك وەزیرانی تورکیا ، ئۆردگان و ، سەرۆکی پەرلەمانی تورکیا ئەنجامدا لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٦/٦/٢, لە دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی بێ وێنە گەلی مۆنتینیگرۆ و لە پێناو دووبارە دەرچوونی لە ژێر یۆگسلافیا و دوایی جیابوونەوەی لە ناو سنووری کۆماری سربیا و بە ئاواتگەیشتنیان ، ئەویش بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئەم هەرێمە بچووکە

لە بەلکان و لە ئەنجام ئاواتەکەیان گەیشتە قۆناخی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و بوونی بە وولاتێکی سەربەخۆی نێوو دەوولەتی لە جیهان .

دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم دان بەو کۆمارە دانرا لەلایەن وولاتانی جیهان ، بە تایبەتی ئەمەریکاو بەریتانیاو یەکیەتی ئەورووپاو ، هەروا بوونی بە ئەندام لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان .

جێگەی ئامارژە پێکردنە کە – مۆنتینیگرۆ – جەبەل ئەسوەد ... لە دوای سەرکەوتنیان لە ڕاپرسیەکەی ٥/٢١ بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە سربیا بە ڕێژەی ٥٥,٥٪ ... لە دوای کۆبوونەوەی پەرلەمانی بووتگۆریتسا ، سەرەك وەزیرانی جەبەل ئەسوەد سەربەخۆیی هەرێمەکەی لە ٢٠٠٦/٦/٣ ڕاگەیاند بە جیابوونەوەی لە سربیا وەك وولاتێکی سەربەخۆیی نێوودەوولەتی خاوەن سنوور لە جیهاندا ... ئەمەش لە دوای ٩٠ سالٌ هات بە گەڕانەوەی سەربەخۆیی هەرێمەکە ، کە لە سالٌی ١٩١٨ ئەم سەربەخۆییەی لە دەست دابوو لە ناو یەکیەتی یۆگسلافیا لە ناوچەی بەلکان .

<u>تێبینی:–</u> نەخشە دانەنان بەهۆی دووبارە بوونەوەیە ، لە بەر ئەوەی لە بەر ئەوەی وێنەکان لە جێگەی دیکە دانراون – تکایە .

٢٠٠٦/٦/٧ ڕژێمی تورکیا میوانداری کۆبوونەوەیەکی کرد ، کە تێیدا هاوشانی دوو کۆنە جاشی وەك ئەرشەد زێباری و جەوهەر هەرکی و ژمارەیەك پەرلەمانتاری مەزهەب سوونەی عەرەبی ئێراقیش لەوانەی ئەو پەڕی سەرسەختی دژی خواستەکانی گەلی کورد پێشاندەدەن بەشداربوون ... ئەمەش لە پێناو لەتکردنی ڕیزەکانی گەلی کوردستان بوو بەدروستکردنی تابورێکی نوێی شان بەشانی بەرەی تورکمان و کۆنە بەعسیەکان کار بۆ مەرامەکانی ئەو بکات ... کە تورکیاش خوازیاری دواخستنی ماددە/١٤٠ بۆ دە سالٌ و شێواندن و پێشێل کردنی مافەکانی گەلی کوردستان .

٢٠٠٦/٦/١١ سەرۆکی ئەنجوومەنی بالاَی شۆرشی ئیسلامی لە ئێراق – عەبدولعەزیز حەکیم – لە شاری نەجەف لە میانەی کۆبوونەوەیەك لەگەلٌ ژمارەیەك کادیری ئەنجوومەنی شۆرشی بالاَی ئیسلامی و هەندێك لە ڕێکخستنەکانی دیکەی شیعەو ئەندامانی ڕێکخراوی بەدرو بزووتنەوەی حزبولّلا لە ئێراق گووتی :– هاوسەنگی لە ئێراق دروست نابێت ئەگەر ئێراق نەکرێتە سێ

هەرێمی فیدراڵ .

٢٠٠٦/٦/١٣ ڕۆژنامەی خەبات ... ڕاپۆرتێکی هەواڵگەری ئەڵمانیا ئەوەی ئاشکرا کردووە کە موقتەدا سەدر لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ لوبنان لە گەڵ حەسەن نەسروڵڵا ئەمینداری گشتی حزبوڵڵای لوبنانی ڕێکەوتنیان مۆرکردووە بە پێکهێنانی سووپایەکی هاوبەش ، کە ٥٠٠٠ هەزار چەکدار لە هەردوولا بە ناوی فەیلەقی - ئەلحوسێن - پێك بهێنن و لەکاتی تەنگەژە لە لوبنان و ئێراق بەکاربهێنن ... بەر لەوەش ٣٠٠ چەکداری هاوبەشی هەردوولا هەبووەو لە شارەکانی نەجەف کەربەلا مەشقی فێربوونیان هەیە .

٢٠٠٦/٦/١٣ ڕۆژنامەی خەبات ... سەرۆکی کۆمیسیۆنی هاوبەشی تورکیا لە یەکیەتی ئەورووپا - ژۆست لاکەندیکی - ڕایگەیاند ... کە تورکیا بەبێ ئەوەی لە پردی دیاربکر و قووبرس تێپەربێت ناتوانێ ببێتە ئەندامی یەکیەتی ئەورووپا ... بە گوێرەی ئەو هەواڵەی کە لە زاری ئەندامی یەکیەتی ئەورووپا بڵاوبۆتەوە ... لاکەندیك پێی وایە تورکیا دەبێ بەشی یۆنانی قووبرس بەرەسمی بناسێ و بە زووترین کات هەوڵ و چارەسەری کێشەی کورد لە باکووری کوردستان بدات ، ئەگینا ناتوانێت ببێتە ئەندام لە یەکیەتی ئەورووپا.

بۆ ئەم مەبەستەش لە ٢٠٠٦/٦/١٢ وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵڵا گوول و شاندێکی یاوەری و شاندێکی قووبرس ، کۆبوونەوەیەکی هاوبەشیان گرێدا لە پێناو ئەو مەبەستانە و داننان بە قووبرس و هێورکردنەوەی بیروبۆچوون و هەڵوێستەکانی نێوان هەردوو وڵاتی دژ بە یەکتری لە هەرێم و ئاسانکاری کردن لە پێناو چوونە ناو یەکیەتی ئەورووپا .

٢٠٠٦/٦/١٦ هێزی سەربازی و پۆلیسیەکانی ڕژێمی شانشینی ئوردن هێرشیان کردۆتە سەر کەمپی ڕوەیشدی سەر سنووری نێوان ئوردن و ئێراق ، کە کوردە ئاوارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی لکێنراو بە ئێرانی شا ، ئەویش بە هۆی هەڵاتنیان لە ژێر دەستی ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران ... شایانی باسە ئەمە دووەم جارە هێزە سەربازی و پۆلیسیەکانی ڕژێمی شانشینی ئوردن بەوکارە هەڵدەستێت .

٢٠٠٦/٦/١٨ جێگری سەرۆکی سووریا بۆ کاروباری ڕۆشنبیری نەجاح ئەلعەتار چاوی

بەسیٚ سەرکردەی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بە سووریا کەوت ، بۆ دووەم جار سەرکردەکانی عەبدولحەمید دەروێش سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سووریا و نەزیر موستەفای سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سووریا و تاهر سەفوکی سکرتێری پارتی نیشتیمانی لە سووریا .

هەروا لە ڕۆژی ٦/٢٨ هەمان ساڵ جارێکی دیکە چاوی بە هەرسیٚ سەرکردە کەوت ، مەبەستیش چارەسەکردنی کێشەی کورد لە ڕۆژئاوای کوردستان ، بە تایبەت کە ڕەگەزنامەی سووریيان لیٚ وەرگیراوەتەوە لەگەڵ کۆتایی هێنانی بە شوێنەواری ئاماری هاودێری ساڵی ١٩٦٢ .

جێگەی باسکردنە لە ڕۆژی ١٩٦٢/٨/٢٣ حکومەتی سووریا بڕیاری لیٚ وەرگرتنەوەی ڕەگەزنامەی سووریا بووە ، کە لە ١٢٠ هەزار هاووڵاتی کورد لە سووریا وەرگیراوەتەوەو بڕیارەکە لە ١٩٦٢/١١/٥ جیٚ بەجیٚ کراوە .

٢٠٠٦/٦/١٨ کۆماری کازاخستان چووە ڕیزی داگیرکردنی گەردوون ... ئەویش بە ڕەوانەکردنی مانگی دەستکرد – بە ناوی مانگی کازسات – کە تایبەتە بە گەیاندن لە بنکەی – بایکوونور – لە ڕۆژئاوای وولاتەکە ... دوای ئەم کارەی کازاخستان بە هەڵدانی ئەو مانگە دەستکردە ... سەرۆکەکانی کازخی – نور سولتان نزاديابيف – و سەرۆکی ڕووسیا – ڤلادیمێر بۆتین – هۆشداریاندا بە هەڵسان کازاخستان بەو کارە تەکنۆلۆژیایە لەو بنکەیەدا .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە یەکیەتی سۆڤیەتی جاران ئەو بنکەی دروستکردووە لە کۆماری کازاخستان کە کۆمارێك بوو لە کۆمارەکانی پێکهاتەی سۆڤیەتی ... هەروا سۆڤیەت لە بواری تەکنۆلۆژیا یەکەم مانگی دەستکردی بە ناوی – مانگی سبۆتنیك – ی پیشەسازی لە ساڵی ١٩٥٧ بەرەو ئاسمان هاویشت بۆ ئەوەی لە چوار دەووری گۆی زەوی بسوورێتەوە

، دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت .

ڕووسیا ئەم بنکەیەی بەکرێ گرتبوو بۆ کاری مانگی دەستکرد لەو وولاتەدا ...دوای ئــەوەش ئــەم بنکــە لەلایــەن رابــەرانی وێــستگەی گــەردوونی نێوودەووڵــەتی بــەکاردێت ... ڕووســیا بــە پێــی گرێبەســت رێکــەوتن ئــەو بنکەیــەی بــەکرێ گرتــووەو بــۆ ســاڵی ٢٠٥٠ دەتــووانێ بــەکاری بــێنێ بــۆ مەبەستەکانی هەڵدانی مانگی هەمەجۆری دەستکرد ... بەر لەوە بۆ کاری سەربازیــشی بــەکاردەهێنرا ... بــەڵام دوای ئــەوە بــۆ کــاری بازرگــانی بــەکاردەهێنرێ وەك ڕەوانــەکردنی دەووڵەمەنــدە گــەوورەکانی جیهــان بــەرەو گەردوون بە مووشەکی دەستکرد ، لە پێناو گەشەپێدانی گەشت و گوزار لە جیهاندا .

جێگەی زیاتر باسکردنە کە کازاخستان دەیەوێ ڕۆڵی هەبێ لەم بوارەدا بە هۆی توانای دارایی کە کازاخستان هاوبەشە لە بەرهەمی نەوتی ژێر ئاو لە دەریای قەزوین و لە هەمان کاتیش بە هاوکاری ڕووسیای یەکگرتوو لە بواری مانگە دەستکردەکان کاردەکەن .

هەروا بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای بایکۆنوور لە ئێستادا هی ڕووسیایە ، لە گەڵ ئەوەشدا هاوکاری کۆماری کازاخستانیش دەکات لەم بوارەدا ، لە پێناو بــەرەو پێــشبردنی و لــە هــەمان کــاتیش هــەردوو حکوومــەتی ڕووســیا و کازاخــستان هــەوڵی دامەزرانــدنی دەزگــای دیکــەی نــوێ بــۆ موشــەکی نــوێتر دەدەن بەجێگەگرتنــەوەی – مووشــەکی بڕۆتــۆن – کــە ســووتەمەنیەکەی زیانبەخشە لە هەرێمەکەدا .

سەرچاوە :- BBC.arabic.c .



٢٠٠٦/٦/١٨ بۆ یەکەم جار لە جیهان ئافرەت لەدوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کەنیسە بگرێتە دەست ... جێگەی ئاماژە پێکردنە ، کە کەنیسەی ئەسقەفیەی ئەنجلیکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خاتوو – کاترین گیفرتس شووری – لە رێگەی دەنگدان هەڵبژێری بۆ سەرۆکایەتی کەنیسەکە ، کە خاتوو کاترین بووە یەکەم ئافرەت لە جیهانی مەسیحی بتوانێ سەرۆکایەتی کەنیسەی ئەنجلیکانی بگرێتە دەست ... کە ئەم کارەش بووە هۆی سەرهەڵدانی ناڕەزایی و مشتومڕ و گفتووگۆکردن لە نێوان قەشەکانی کەنیسەی ئەنجلیکانی لە جیهان ... کە خاتوو کاترین ٩٥ دەنگی بەرامبەر ٩٣ دەنگی بەرهەڵستکار بەدەست بێنێ ، کە جیاوازیەکە دوو دەنگ بوو لەکاتی هەڵبژاردنەکە . کە لە نێوان حەوت پاڵێوراو ئەم خاتوونە سەرکەوتنی بەدەست هێنا ... کە ئەمەش بۆ دووەم جارە کێشە لە کەنیسەکانی ئەنجلیکانی سەرهەڵبدات ... کە یەکەم جار لەلایەن وێنەکێش خاتوو – گین رۆبنسۆن – هات ، ئەویش داوای ئەوەی کرد کە دەبێ بەپێی پەرەسەندن و پێشکەوتن کارەکانی ئایینی مەسیحی ببرێ بەڕێوە ... هەروا گووتی :-

دەبێ ژن خوواستن لە لایەن قەشەکان هەبێ نەك وەك رێنماییە کلاسیکیەکانی پێشوو بە نۆبەکردن بە نەخواستنی ژن و دروست نەکردنی هاوسەریەتی لەناو رێزەکانی بەرپرسان و رەهبانەکانی کەنیسە ... کە ئێستا ئەو مشتوومڕە و گفتووگۆیە لە جیهانی مەسیحی بەردەوامە و لە چەندین کەنیسەکانی جیهان ئەو بیرووبۆچوونەیان لە جیهان پەسەندکرد لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارەدا.



٢٠٠٦/٦/٢٤ ســـەرەك كۆمـــاری فلـــپین – گلۆریـان ئـاروبۆ – ڕەزامەنـدی خـۆی بـە مـۆرکردنی یاسـای هەڵووەشـــاندنەوەی لــــە سـێدارەدانی لـە وولاتەکـە کـرد ... ئـەویش لـەدوای ڕەزامەنـدی کـــردن بـــە زۆرینـــەی دەنـــگ لەلایــەن کۆنگرێـسی وولاتەکـە ... هەڵووەشـاندنەوەی یاسـای لــە سـێدارەدان بـووە هـۆی ئـەوەی کـە ١٢٠٠ بەنـدکراو کـە بڕیـاری لـە سـێدارەدانیان بـۆ دەرکرابـوو لەلایـەن دادگـای بـاڵای فلـپین و بڕیـاری لـە سێدارەدان سـووککرایەوە بـۆ بەنـدکردنی هـەتا مـردن ... ئـەم بڕیـارەش بـە هـۆی پاڵەپەستۆی یەکیـەتی ئـەوروپا و کەنیسەو ڕێکخراوەکـانی مـاف مـرۆڤ لەجیهان هات ، کە زیاتر لە حەوت جار کارەکانی لە سێدارەدان لـەم وولاتـەدا ئەنجامدراوە .

جێگــەی باســکردنە کــە حکوومــەتی فلــپین لــە ســاڵی ١٩٨٧ بڕیــاری لــە سێدارەدانی لە وولاتەکەی هەڵووەشاندەوە کە لـەو کات – جۆزێف ئسترادا – سەرۆکایەتی فلپینی لەدەستدا بوو ... بەڵام بە هۆی کاری توونـدو تیژی و تاوان لەم وولاتەدا کار بە یاسای لە سێدارەدان کرا لە وولاتەکەدا .

لـە هـەمان کـات ڕۆژی ٦/٢٦ مـاری ئـەکاتیری سـەرەك وەزیرانـی تـەیمووری خۆرهەلات بەرەسمی دەست لەکارکێشانەوەی لـە پۆستەکەی ڕاگەیانـدو ئـەو بڕیارەش بووە هۆی ئاهـەنگ گێران لەلایـەن هـەزارا هـاووڵاتی وولاتەکـە ، کـە بـەر لـەوە داوای دەسـت کێشانەوەی سـەرەك وەزیرانیـان کردبـوو ... چـونکە شــەڕو پێکـدادانی نێـوان ڕێزەکـانی هێـزە چـەکدارەکان کـە ژیانیـان بـەرەو نەهامەتیەکی دیکە دەبرد لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٦/٢٥ لە دوای لە سەر کارلابردنی سەربازیەکان لە دەسەلات لـە مـانگی ٢٠٠٦/٨/ لە یەکەم هەنگاودا مۆریتانیەکان ڕوویان لـە سـندوقەکانی دەنگدان کـرد ، لـە ســەر گۆرانکــاری لــە دەســتووری وولاتەکــەیان لــە پرۆسـەیەکی ڕاپرســی

ئازادانـەی گـەرم ، کـە ئامـانجی ئـەم ڕاپرسـیـەش زەمینـە سـازی تـەواوە لـە بەردەم هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی ئـەم وولاتـە ، کـە بڕیـارە لـە ئاداری سـاڵی ٢٠٠٦ ئەنجام بدرێت ... ئەم گۆڕانکاریەش ماوەی سەرۆکایەتی لە شەش بۆ پێنج ساڵ و داوا دەکات کە تەمەنی پاڵێوراوی سەرۆکایەتی دیاری بکرێت ، کە تەمەنی ٤٠ ساڵ کەمتر نەبێت و لە ٧٠ ساڵیش زیاتر نەبێت .

٢٠٠٦/٦/٢٥ سەرەك وەزیرانی ئێراق – نوری مالکی – لە بەردەم ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێراق دەستپێشخەری دیالۆگ و ئاشتبوونەوەی نیشتیمانی ڕاگەیاند ، کە لە ٢٤ خاڵ پێك هاتبوو لەوانە ڕاگەیاندنی لێبوردن بۆ هـەموو ئـەو کەسانەی کـە تـاوانی جـەنگ و تـاوانی تیرۆرسـتیان ئـەنجام نـەداوە ، لـە هـەمان کـات چاوخشاندنەوە بە دەستەی ریشەکێش کردنـی بـەعس و هەڵوەشاندنەوەی و چـەندین خـاڵی دیکـەی ئاسـایش و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و گفتووگـۆو باری ژیان لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٦/٢٧ بەهۆی ڕامیاریەتی نا لە باری هەڵوێستی حکوومەتی جووڵانـەوەی حەماسـی ئیسلامی ، بە کوشتنی دوو سەربازی ئیسرائیل و بەدیل گـرتنی سـەربازێکی ئیـسرائیلی . کـە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هێزەکـانی سـووپای ئیـسرائیل گەمارۆی کەرتی غەزەو دەووروبەری بدات بە ڕووخاندنی پردوو وێستگەی کارەبـا و ، دوای ئـەوە لـە ٦/٢٨ دەسـتگیرکردنی ١١ وەزیـرو ٢١ ئەنـدامی ئەنجوومـەنی نیشتیمانی فەلەسـتینی بـە بـەردەوامی گـەمارۆو ئەنجامـدانی کـاری سـەربازی دژی حکوومـەتی حـەماس ، لـە هـەمان کـات چـوار فرۆکـەی سەربازی بە سەر ئاسمانی سنووری سووریا تێپەڕین بەسەر کۆشکی بەشـار ئەسەد ، بەڵام بێ ئەوەی هیچ کارێکی سەربازی ئەنجام بدات .




٢٠٠٦/٦/٢٧ لە دوای بەدەست نەهێنانی هەرسێ سەرکردەی پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنام لە هەڵبژاردنی مەکتەبی سیاسی پارتەکەدا ، کە سەرەك کۆمارو سەرەك وەزیران و سەرۆکی پەرلەمانی ڤێتنام دەستیان لە پۆستەکانیان کێشاوە بۆ ماوەدان بە گەنجان ، ئەویش بە هەڵبژاردنی – نگویان مینەتریت – سەرۆکی پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنامی بە سەرۆك کۆماری ڤێتنام بە ڕێژەی ٩٤٪ لەکۆی دەنگەکان.

هەروا – نگویان تان دۆنگ – بەسەرەك وەزیران هەڵبژێردرا ... لەشاری – هۆتشی مبنەی – پایتەختی ڤێتنام ... کە پارتی کۆمۆنیست خاوەنی دەسەلاتە لە ڤێتنام و یەك پارتە کە دەسەلاتداریەتی ڤێتنام دەکات لەدوای سەرکەوتنیان لەشەڕی ڤێتنامی ئەمەریکی لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/٦/٢٩ دادگای فیدراڵی باڵای ئەمەریکا لە بڕیاریکی دا دژی بڕیاری سەرەك کۆماری ئەمەریکا جۆرج بۆش وەستا بە دادگایکردنی بەندکراوەکانی بەندیخانەی گوانتانامۆی کووبا کە پێویستە دادگای فیدراڵ ئاسایی دادگایی ئەنجام بدات نەك دادگای سەربازی ، بە هۆی هەڵسانیان بەکاری تیرۆرستی دژ بە ئەمەریکا و وولاتانی دیکە نەك تیرۆری سەربازی .



٢٠٠٦/٦/٢٩ هەڵبژاردنـــەکانی ئەنجوومەنی نوێی ئومەی کوێتی دەستی پێکرد ، لە پێناو هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنێکی نوێ ، کە بۆ یەکەم جارە لە مێژووی ئەم وولاتە ئافرەت بتوانێ خۆ بپاڵێورێ و دەنگ بدات لە پێناو بوونی بە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێی

ئومەی کـوێتی ، کـە ئەمـەش هـەنگاوێکی زانـستیانە و دیموکراتیانـە لـەو وولاتـەو گـەل بـەرەو سـەقامگیری و چەسـپاندنی رای خـۆی بگەیەنێتـە نـاو دەزگای یاسادانی ئەم وولاتە .



٢٠٠٦/٦/٣٠ ڕابـەری ڕێکخـراوی قاعیـدەی تیرۆرست – ئوسامە بن لادن – لـە لێـدوانێك بـۆ ڕێکخـراو و گروپـە چەکدارەکانی ئیسلامی لـە ئێراق و ئەفگانـستان و سـۆماڵ ، بـە لێـدانیی حکوومەتـەکانیان بـە هـەموو شـێوەیەك ، بـە تایبـەت هێزەکـانی سـووپای ئەمـەریکا و هاوپەیمانان .
بـەڵام بـۆ ڕۆژی دوای ٢٠٠٦/٧/١ تیرۆرسـتان بـە خۆتەقاندنـەوەو مینرێـژکردنی سەیارە لـە گـەرەکی سـەدر بووە هـۆی کوشتنی زیاتر لـە ٦٠ هاوولاتی و زامداربوونی زیاتر لە ١٠٠ هاوولاتی لە شارەکەدا .

٢٠٠٦/٦/٣٠ دەسـت پێکردنـی پرۆسـەی هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی بـە شـێوەیەکی دیموکراسی لە دوای ٤٠ سـاڵ لـە دەسـەڵاتی تـاك ڕەوی لـە کۆنگـۆ کینـشاسا ... هـەروا خـوولی دووەمـی هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتیش لـە ٢٠٠٦/١١/١١ ئەنجامدراو ئەنجامەکەی بە سەرکەوتنی لۆرانکابیلا بە ڕێـژەی ٦٠٪ لـە کۆی دەنگـدەران لـە وولاتەکـەدا ... لـە هـەمان کـات شـەڕوپێکدادان لـە گوونـدو شارۆچکەو شـارەکان ، بە تایبـەتی لـە شـاری کینـشاسای پایتـەختی کۆنگـۆ بەردەوام بـوو لـەنێوان حکوومـەت بەسـەرکردایەتی کـابیلاو بەرهەڵستکارانی لە وولاتەکەدا .

جێگـەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم وولاتە ناوزەندە بە شـەڕی نـاوخۆیی ، کـە لـە ئاکـامی ئـەو شـەڕە یـەك لـەدوای یەکانـە بـووە هـۆی کـوژرانی زیـاتر لـە ٤,٠٠٠,٠٠٠ ملیـۆن کەسـی لـەم وولاتـەدا لـەنێوان لایـەن و گروپـە دژ بـە

یەکترەکان بە تایبەتی دژی دەسەڵاتداریەتی – مۆبۆتۆ – ئەمەش لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان
ئەفەریکیاو جەنگی ناوچەی دەریاچە گەورەکان کە حەوت وولات بەشداری تێداکرد لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٦ – ٢٠٠٢ . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە وولاتی کۆنگۆ بەرەو کەوتن بۆ دۆزەخ هەنگاوینا لە کێشووەرەکەدا .
دوای ئەوە لە ساڵی ٢٠٠٣ . ئەمەریکا و ، بەریتانیا و ، فەرەنسا و ، ئەڵمانیا و ، بەلـژیکا و، باشووری ئەفەریکیا بووە ژێر دەستەی پارێزراو هێزە نێوودەووڵەتیەکان بە ١٧٠٠٠ هەڤدە هەزار سەرباز بەشداری کرد لە گەڵ ٢٠٠٠ سەربازی ئەورووپی ، لەپێناو بەرەو ئارامکردنەوەی باری ڕامیاری و کۆمەلایەتی لە هەموو بوارەکان لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٧/١ سەرۆکی چینی مللی – هۆو جینتاو – گەورەترین هێڵی ئاسنی لە جیهاندا لە ڕێوورەسمێکی تایبەتدا کردەوە بە ناوی – هێڵی کینچای ئەلتبتە – لە سەر تەکنۆلوژیای هندی و درێژیەکەی ١١٤٠ کیلۆمەترەو ٧١٠ میلە و ... کە دەرفەتێکی گەورە بۆ وولاتانی هەژار دەرەخسێت و ناوچەی لاسایەتیت و سەرجەم ناوچەکانی دیکەی چین دەگرێتەوەو تاکو ئێستا و درێژترین هێڵی شاسنی لە جیهاندا ٥٠٧٢ کیلۆ مەترە .

٢٠٠٦/٧/٢ پسپۆڕانی هێزی ئاسایشی هەولێر توانیان پلانێکی گەورەی تیرۆرستی لەناو شاری هەولێر پوچەڵ بکەنەوە ئەویش دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵ تیرۆرست – موحسن تەها عەبدوڵلا – کە پۆلیس بووە لە بنکەی ئاگر کوژێنەوەی شۆرش و ئەندامی ڕێکخستنی پارتی کاری چارەسەری دیموکراتی کوردستان لە هەولێر لە بەر ئەو هۆکارە دادگا بارەگای پارتی چارەسەری دیموکراتی داخست لە شارەکەو هەرێمەکەدا .
٢٠٠٦/٧/٢ سەرەك وەزیرانی شانشینی ئوردن – مەعروف ئەلبخیت – لە وەلامی حکوومەتی ئێراق سەبارەت بە لیستی ناوی ئەو ٤١ داواکراوەی کردبووەوە گووتی :– ڕەغدە سەدام حوسین – لە ژێر چاودێری و میوانداری هاشمیەکانە ... هەروا گووتی :– بوونی ڕەغدە و منداڵەکان لە ئوردەن لە بەر چەند هۆکارێکی مرۆیی پوختەوە ناوبراویش لە میواندارو چاودێری هاشمیەکانە لە وولاتەکەدا .

۲۰۰٦/۷/۲ ڕاوێژکاری ئەمنی نیشتیمانی ئێراقی – موفەق ئەلروبەیعی لیستێکی – ٤١ ناوی لەدارو دەستەو بنەماڵەی سەدام ئاشکراکرد ، کە لە دەرەوەو ناوەوەی ئێراقن لە نێوانیانیش ساجدەی هاوسەری سەدام و ڕەغدەی کچی سەدام و جێگری سەدام عزەت ئیبراهیم .

۲۰۰٦/۷/۲ دوای دووساڵ لە بێدەنگی هەردوو سەرکردەی کەرتی قووبرسی یۆنانی و قووبرسی ژێر دەستی تورکیا – تاسوسوبابا دوبولوسی – سەرۆکی قووبرس یۆنانی و عەلی تەلعەت سەرۆکی قووبرسی تورکی پاش شکستی گفتووگۆکانی ئاشتی کۆبوونەوە .

۲۰۰٦/۷/۳ وەزیری دەرەوەی ئێراق – هوشیار زێباری – لە سەردانێکی ڕەسمیدا گەیشتە ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا و لەلایەن وەزیری دەرەوەی تورکیا – عەبدوڵڵا گوول – پێشوازی لێکراو لەهەمان کات چاوی کەوت بەسەرەك وەزیرانی تورکیا – ئۆردگان – و وتووێژەکانیان لە بارەی باری ئێراق و بازرگانی و پەیوەندی و پرسی کەرکوك و پارتی کرێکارانی کوردستان pkk بوو لە ناوچەکەدا .

۲۰۰٦/۷/٤ پەرلەمانی لیتوانیا بڕیاریدا کیرکیلاس بکاتە سەرەك وەزیرانی وولاتەکە ... شایانی باسە پەرلەمانی لیتوانیا دوای ئەوەی مانگی ڕابردوو پەرلەمانتاران زیمبانتس باکینیسی سیاسی پایە بەرزی پارتی دیموکراتی سوشیالیستی پاڵێوراو بۆ پۆستی سەرەك وەزیرانی وولاتەکەیان ڕەتکردەوە ، بەزۆرینەی دەنگ بڕیاریدا جیدیمیناس کیرکیلانس وەزیری بەرگری پاش هەفتەیەك لە هەڵبژاردنی سەرۆکی وەزیرانی لیتوانیا هەڵبژێرێت ... دوای ئەوە پەرلەمان بەردەوام بوو لە گفتووگۆکردن لە گەڵ پارتە رامیاریەکانی وولاتەکە ، لە پێناو پێکهێنانی حکوومەتی نوێی لیتوانیا .

۲۰۰٦/۷/٤ پەرلەمانی کوردستان دوای چوار ڕۆژ لەدانیشتنی تایبەت بە زۆرینەی دەنگ قانوونی وەبەرهێنان لە کوردستان پەسەندکرا ... ئەویش لە دانیشتنی ژمارە /١٥ پەرلەمانی کوردستان ئەنجامدرا .

۲۰۰٦/۷/٤ سەرۆکی شارەوانی ئامەد – دیاربەکر – ، – ئوسمان بایدەمیر – لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا ، بە تۆمەتی پەیوەندی بە pkk دەستگیرکرا . لە هەمان کات لێکۆڵەرەوەکانی تورکیا ڕایگەیاند . کە سەرۆکی شارەوانی دیاربەکر بە تۆمەتی ئەندامیەتی لە

ڕێکخراوی پەکەکە دەستگیرکراوە و چاوەڕوان دەکرێت بۆ ماوەی ١٥ ساڵ زیندان بکرێت لە لایەن دادگای تورکیا .

٢٠٠٦/٧/٥ یەك ملیۆن و حەوسەد هەزار هاووڵاتی مەکدۆنیا بەرەو سندوقەکانی دەنگدان بەڕێکەوتن ، لە پێناو هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێی مەکدۆنیا ، کە لە ١٢٠ ئەندام پێك هاتووە ، ئەمەش یەکەم هەڵبژاردنە لەدوای سەربەخۆیی مەکدۆنیا لە ساڵی ١٩٩١ .

٢٠٠٦/٧/٥ کۆریای باکوور مووشەکی حەوتەمی دوورهاوێژی تاقیکردەوە لە گەڵ ئەوەی نارەزایی نێوودەوڵەتی هەبوو دژی ئەو کارە ئەنجامدراوە بەر لەوەش ... شایانی باسە لە کاتژمێر



٥,٢٢ دەقیقە کەوتە خوارەوە موشەکەکە لە دەریای ژاپۆن – یابان – کەوتە خوارەوە ... دوای ئەوە ئەمەریکا بەکردارێکی ئیستیفزازی داناو ئەمەش وای لە ژاپۆن کرد داوا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەوڵەت بکات ، کە کۆبوونەوەی تایبەت ئەنجام بدات لەم بارەیەوە لە پێناو چارەسەری ئەم کێشەیە لە کێشوەرەکەدا .

٢٠٠٦/٧/٨ سەرۆکی تەیمووری ڕۆژهەڵات لە لێدوانێکی ڕۆژنامەنووسیدا ڕایگەیاند کە – خوسیە راچۆی هورتا – کە خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئاشتی وەرگرتووە بە سەرەك وەزیرانی نوێی وولاتەکەی دەستنیشانکراوە – ئستائیلاو داسیلفا – بە جێگیری یەکەمی سەرەك وەزیران دەستنیشانکراوە .

شایانی باسە تەیمووری ڕۆژهەڵات دوورگەیەکی بچووکە لە زەریای هادی و لەلایەن ئەندۆنوسیاوە داگیرکرابوو لە ساڵی ١٩٩٩ بە تەواوی ئازادکرا .

٢٠٠٦/٧/٨ کۆبوونەوەی وەزیرەکانی دەرەوەی وولاتی دراوسێی ئێراق ، لە تارانی پایتەختی ئێران بەسترا ، بە ئامادەبوونی نوێنەری میسر و کۆمکاری عەرەبی لە گەڵ وەزیرەکانی دەرەوەی ئێراق و ، سووریا و ، سعوودیە و ، کوێت و ، تورکیا و ، میسر و ، ئێران و ، بەحرێن ، بە هەڵسەنگاندنی دواین پێشهاتەکانی ئێراق و هاوکاری کردنی بەغدا تاوتۆکرا .

٢٠٠٦/٧/١٧ مۆرکردنی گرێبەست لە نێوان حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان و کۆمپانیای عزەت ئەنتەرگراف سعوودیە ، بۆ دابینکردنی ١٦ فرۆکە بەکرێنی لەلایەن حکوومەتی هەرێم لە جۆری شۆیزەر/٣٣٣ ، بە بڕی ٣٥ ملیۆن دۆلار ، کە هەشت فرۆکە تایبەتە بە بواری کشتووکاڵ و هەشتەکەی دیکەش بۆ کاروباری پۆلیس ، کە سەر بە وەزارەتی ناوخۆ دەبێت لەگەڵ ٣٥ ئۆتۆمبیل بۆ هەردوو وەزارەتی کشتووکاڵ و ناوخۆی هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/٧/١٧ نەخشەی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە لە گۆڤارێکی سەربازی ئەمەریکی بە ناونیشانی – سنووری خوێن – بڵاوکرایەوە ... بە پێی ئەم نەخشەیەش سنووری چەندین وڵات بە گۆڕانکاری دەگرێتە خۆ ، کە ئێران و ، تورکیا و ، ئێراق و ، سعوودیە و ، پاکستان و، سووریا و ، ئیماراتی عەرەبی و ، یەمەن و ، ئوردن و ئەفگانستانە ... بە گۆڕینی سنووری ئەم وڵاتانە لە بچووک کردنەوەو گەورەکردن و دانانی دەوڵەتی دیکەی نووێ بە پێی نەخشەکە ئەویش :-




ئـەو دەوڵەتــە نوێیانــەی کــە دادەمــەزرێن بەدابەشــکردنی ئێــراق بەســێ دەوڵــەت – دەوڵــەتی کوردســـتان – و شــیعەو ، ســـوننە – دەوڵــەتی کوردستان ، گـەورە کـە لـە باکووری ئێراق دەست پێدەکات بە کـەرکوك و هەندێ ناوچە لە پارێزگای مووسڵ و خانەقین و دیالە و بەشـەکانی دیکە لـە ســووریا و ، تورکیــا و ، ئێــران و ، ئــەرمینیا و ، ئازربایجـان ، کــە دەبێتــە دەوڵەتێکی سەر بە ئەمەریکا .

دەوڵەتی شیعە کە لە باشووری ئێراق و بەشێك لە ڕۆژهـەڵاتی سعوودیە و چەندین پارچە لە ڕۆژئاوای ئێران – ئەهواز – بە شێوەی پڕبێنی لە سـەر دەووری کەنداو ئەنجام دەدرێت .

دەوڵــەتی ســوننەش لەســەر ئــەو ناوچــانەی کــە لــە دەوڵــەتی ئێــراق دەمێننەوەو دوورنیە لەگەڵ سووریا ببێتە یەك .

دەوڵەتی بلوشستانی نوێ ، کە سنوورەکەی لـە باشـووری خـاکی ڕۆژئـاوای پاکستان و بەشێك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران .

تێبــینی :– نامــەوێ بــە درێــژی باســی چــۆنیەتی نەخــشەی ڕۆژهــەڵاتی ناوەراستی گەورە بکەم بەهۆی بوونی هەردوو نەخشەی ١ – ٢ ی ئامانجەکە



٢٠٠٦/٧/٢٣ کۆچـی دوایـی ڕۆشـنبیرو نووسـەرو ڕونـاکبیرو وەرگێـری گـەورەی کـورد ماموٚسـتا جـەرجیس فـەتحوللا لـە شـاری هـەولێری پایتـەخت لـە هەرێمی باشووری کوردستان .
جێـی باسـە خوالێخۆشـبوو جـێ پەنجـەی لـە مێـژووی نووسـینی کوردیدا دیارو بەرچاوبوو لە ڕێگـەی نووسـینەکانیەوە ، یـاخوود لـە ڕێگەی کتێب وەرگێردراوییـەکان ، کـە هـەموویان بـاس لـە خـەباتی نەپسـاوەی گـەل و نیشتیمانەکەمان دەکات لە هەرێم ناوچەکەدا .

٢٠٠٦/٧/٢٧ لـە دوای هاوێـشتنی ، یـاخوود بەرزبوونـەوەی سـاروخی ڕووسـی ، کـە ١٨ مـانگی دەسـتکردی لەسـەر پـشتابوو لـە بنکـەی بـایکۆنووری ڕووسـی لـە کۆمـاری کازاخستان کەوتـە خـوارەوە ، بە هـۆی تەقینـەوەی مووشـەکەکە لـە دوای ٨٦ چـرکە ... بـەر پرسـان لـە مەڵبەنـدی چـاودێری کردنـی مووشـەك ڕوونیـان کـردەوە ، کـە ئـامێری کـارپێکردن لـە پـەك کـەوت کـە ئەمـەش بووە هۆی ڕوودانی کارەسات .
مووشـەکەکەش بـە دووری ٢٥ کیلۆمـەتر لـە بنکـەی بـایکۆنوور کەوتـە خـوارەوەو زیـانی گیـانی لێنەکەوتـەوە لەناوچـەکەدا ... لـەناو ئـەو ١٨ مانگە دەستکردە ١٧ مانگ تێك شکان ، کە هی کۆمپانیـای بیانیـەکان بـوو . لەوانـە هەندێکیان هی کۆمپانیە ئەمەریکیەکان بوون.
سەرچاوە :- BBC.mmvtt



٢٠٠٦/٧/٢٨ کۆبوونـەوەی سـێ ڕۆژی ٣٦ پـارتی ڕامیـاری ئێراقـی لـە شـــاری ئەســـتەمبوڵ کۆبوونـــەوە لەســـەر داوای نوێنـــەری نەتـــەوە یـــەکگرتووەکان ، کـــە پارتەکانی شیعەو سوونەو کورد و تورکمان بەشداریان تێدا کرد ... لە بارەی بیرووبۆچوونیان لە سەر چاکسازیە پێویستیەکان ، ئەویش بە داماڵینی چەکی میلیشیاکان و لە هەمان کات باسیان لە شەفافیەتی کاری حکوومەت و ڕێکخستنی سووپا کرد لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/٧/٣٠ هێزەکانی ئاسمان سووپای ئیسرائیل بۆردومانی شارۆچکەی – قانای – لوبنانی کردو لە ئەنجام بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٦٠ هاووڵاتی ، کە زیاتر لە ٢٧ یان منداڵ بوون هەروا لە شارۆچکەی سرفا لە باشووری لوبنان زیاتر لە ٣٠ هاووڵاتی کوژران ، جگە لە وێرانکردنی بە دەیا خانوو لە خانوو و دوکان و پرۆژەو دام و دەزگای میری لە شارەکەدا .

٢٠٠٦/٧/٣١ سەرۆکی ئەمەریکا – جۆرج بۆش – لە شاری میامی لە ووتارێکدا لە گەڵ فەرماندەی پاسەوانانی کەنار ، شەڕی ئیسرائیلی دژ بە حزبوڵڵا بەبەشێك لە شەڕە دژە تیرۆر وەسف کرد و گووتی :– تەنگژەی ئێستا بەشێکە لەخەباتی نێـوان هێـزە ئازادیخوازەکـان و هێـزە تیرۆرسـتەکان لـە هـەرێم و ناوچـەو جیهاندا .

٢٠٠٦/٨/١ سـەرۆکی ئەنجوومـەنی شـوورای ناوەنـدی پـارتی ئیـسلامی ئێـراق و بەنـژاد کورد – موحسن عەبدولحەمید – لە پەڕاوێزی کۆڕێك لە شاری ڤینیسیای ئیتاڵیا ، کە لە سەر جێ بەجێکردنی فیدراڵیەت لە ئێراق بوو گووتی :–
ڕەوشـــی ئـــەمنی ئێـــراق زۆر ئـــاڵۆزەو هۆکارەکـــانی زۆرن ... لەوانـــەش دەســـتتێوەردان و هاتنـــە نـــاوەوەی ژمارەیـــەك ڕێکخـــراوی گوومـــانلێکراوو وولاتانی دراوسێی ئێراق ... سەبارەت بە فیدراڵیەت ناوبراو گووتی :–
فیدراڵیـەتی کوردسـتان ڕەزامەنـدی هـەموو لایـەکی لـە سـەرە چـونکە ئـەوان

نەتەوەیەکی جیاوازن و لە سەر خاکی خۆیاندا دەژین و لە سایەی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکان تووشی گەلێك زوڵم و زۆری و چەوسانەوە هاتوون و ئێمە فیدراڵیەتی کوردستانمان قبوڵە ، بەلام فیدراڵیەت لە سەر بنەمای تایفیمان پێ ڕاست نیە لە وولاتەکەدا .

چونکە عەرەبی ئێراق یەك نەتەوەن و گیروگرفتە کۆمەلایەتی و ئابووریەکانیش یەکە ... هەروا گووتی :- دژی فیدراڵیەتی ناوەراست و باشوورین ... چونکە نەخشەی دابەشکردن لە ئێراق لە گۆریندایە .

٢٠٠٦/٨/٧ ڕۆژنامەی خەبات لە لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەکە نووسیویەتی :- سەرەك وەزیرانی تورکیا – ڕەجەب تەیب ئۆردگان – بەردی بناغەی پڕۆژەی دروستکردنی بەنداوێکی لە سەر ڕووباری دیجلە بە ناوی – ئیلیزبۆی – لە نزیك دارکیتجیت لە دووری ٤٥ کم لە سنووری سووریا دانا . کە دەبێتە هۆی لەناوچوونی شوێنەواری مێژوویی و ئاوارە بوونی هەزاران خێزانی کورد ... لەو بارەوە ئۆردگان گووتی :-

ئەنجامدانی ئەم پڕۆژەیە لەسەر ئەو بنچینەیە کە حکوومەتی تورکیا دەیەوێت بارودۆخی هەرێمە کورد نشینەکان خۆش بکات و ئەوە بەڵگەی ئەوەیە ، کە حکوومەتی تورکیا ناوچەی باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیای فەرامۆش نەکردووەو ئەمە دەستکەوتێکە بۆ خەڵکی ناوچەکە .

جێی سەرنجە دروستکردنی ئەم بەنداوە دەبێتە هۆکاری ئەوەی شارۆچکەی حەسنکێف ، کە کەوتۆتە سەر ڕووباری دیجلە ژێر ئاو بکەوێت کە چەندین شوێنەواری دێرین و مێژوویی تیایە ، کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی ئاشووری و ڕۆمانی و عوسمانی لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/٨/١٢ سەرەك وەزیرانی ئێراق – نوری مالکی – لە پەیوەندیەکی تەلەفۆنیدا لە گەڵ سەرەك وەزیرانی تورکیا – ڕەجەب تەیب ئۆردگان – چەند پرسیارێکی پەیوەست بە هەردوو دەووڵەتیان تاوتۆ کرد ، هەر لە پەیوەندیەکەدا سەرەك وەزیرانی ئێراق بڕیاری حکوومەتی بەغدای سەبارەت بەداخستنی سەرجەم بارەگاکانی پەکەکە لە بەغدا و ڕاگرتنی چالاکیەکانی بە سەرەك وەزیرانی تورکیا ئۆردگان ڕاگەیاند – هاوکات مالکی داوای لە ئۆردگان کرد ، کە ئاسانکاری بخاتە ڕێگەی گواستنەوەی بەروبوومەکانی سووتەمەنی ئێراق لە

بەرامبەردا ئۆرگان بەلێنیدا کە لەو بارەیەوە ئاسانکاری بکات .

٢٠٠٦/٨/١٢ ئەنجوومــەنی ئاسایــشی نێوودەوڵــەتی پــڕۆژەی بڕیــاری ئەمــەریکا و فەرەنــسای پەیووەســت بــە ڕاگــرتنی شــەڕی نێــوان ئیــسرائیل – لوبنــان – حزبوڵلای پەسـەند کـرد ، بـە ژمـارە/١٧٠١ و داوا لـە هەردوولایـەنی شـەڕکەر کرا کە ڕۆژی دووشەممەی ٨/١٤ شەڕەکە ڕابگرێ لە نێوانیاندا .

٢٠٠٦/٨/٢١ یەکەم دانیشتنی دادگایی کردنی سەدام حوسێن و پیاوەکانی بە تایبەتی عـەلی حەسـەن مەجیـد لـە سـەر ئـەنفالکردنی کـورد لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان دەسـت پێکـرد ... هـەروا سـوڵتان هاشـم – حوسـێن رشـید محمـد فەریقی روکـن – جابر عەبدولعـەزیز حسین پارێزگاری بغـداد – تـاهر توفیـق یوسف مستشار فی امانە سر القطر .

٢٠٠٦/٨/٢٣ هێزەکانی سووپای تورکیا لە سەر سنووری ڕۆژهەلاتی کوردستانی لکێنـراو بــە ئێــراق ، بــە تایبــەتی ئــەو گوندانــەی کــە دەکەونــە نێــوان پیراشمــار و زەردەشــت ئاگاداریــان کردونەتــەوە هــەر لاوێــك بیــەوێ بــچێتە ئــەوروپا حکومەتی تورکیا ئاسـانکاری تـەواویان بـۆ دەکـات ... سەرچاوەیەکی نزیك ئەم هەواڵەی تورکیا بەشەرێکی دیکەی دبلۆماسی دژی کورد دانا .

٢٠٠٦/٨/٢٣ لە کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەنووسـی – مۆردا قەرەیلان – لـە سـەرکردایەتی pkk پێشنیاری ڕێگە چارەیەکی ئاشـتیانەی ئاگر بەسـت و دانووسـاندی لـە گـەڵ حکوومەتی تورکیا ڕاگەیاندو گووتی :-

pkk پرۆژەیــەکی ئاشــتی لەگــەڵ حکوومــەتی تورکیــا هەیــەو ئــەم پــرۆژەش بەرهـــــەمی داواکـــــاری حکوومـــــەتی هـــــەرێمی کوردســـــتانەو ناوەنـــــدە جەماوەریەکانە . هەروا گووتی :- ئێمە ئامادەین لە یـەکی ئـەیلول کـە ڕۆژی ئاشــتیە لــە جیهــان شــەڕ ڕابگیرێــت و پێویــستە رژێمــی تورکیــاش ئامــادەی هەبێت .

٢٠٠٦/٩/٢ فرۆکەیەکی نەفەر هەڵگری گواستنەوە لـەکاتی نیشتنەوەی لـە فرۆکەخانـەی مەشـهەدی بـاکووری خۆرهـەلاتی ئێـران سـووتاو لـە ئاکـام هاوولاتیـانی نـاو فرۆکەکـە ، کـە ژمارەیـان ٨٠ هـاوولاتی بـوو گیانیـان لەدەسـت دا کـە ١٤٧ هاوولاتی هەڵگرتبوو .



٢٠٠٦/٩/١٢ پاپـای فاتیکـان - پاپـا بنـدیکتی شـازدەهەم - لـە کۆڕێکیـدا لـە زانکـۆی Regensburg لـە باشـووری ئـەڵمانیا بەناونیشانی - بـاوەر و عـەقل و زانکـۆ چەند یادەوەری و تێرامانێك - پاپا لـە ووتارەکەیـدا کـە باسـی لـە پەیوەنـدی نێـوان عـەقل و توونـدوتیـژی دەکـرد لـە ئـایینی مەسـیحی و ئیـسلامدا ... لـەم بارەیـەوە نمونـەی بـە نووسـراوێکی ئیمپۆاتـۆری بیـزەنتی - مانوێـل - ی دووەم - پالابۆلۆگۆس - لە ساڵەکانی ١٣٥٠ - ١٤٢٥ داهێنایەوە .

پاپا ئـەو نمونـەی لـە کتێبێك وەرگتبـوو بـە نـاوی - گفتووگۆیـەك لـە گـەڵ موسـوڵمانێکدا - کـە لـە شەسـتەکانی سـەدەی بیـستەم زانـای نیولۆژیـای ئـەلمانی لـە بنـەرەت لوبنـانی - عـادل تیـدۆر خـوری - ١٩٣٠ پرۆفیسۆر و سـەرۆکی بەشـی نیولۆژیا لـە زانکـۆی - مونستەر - لـە خۆرئاوای ئـەلمانیا ئامادەی کردبوو بلاوی کردۆتـەوە ، لەم نووسراوەیەدا ئیمپراتـۆری نـاوبراو گفتووگۆیەکی خۆی دەخاتـە ڕوو ، کـە لـە سـاڵی ١٣٩١ دا لـە سـەربازگەیەکی زسـتانە لـە نزیـك شـاری ئەنکـەرەی تورکیـا لـە گـەڵ زانایـەکی موسـلمانی فارسـیدا ئـەنجامی داوە ... ڕەنگـە هـەر ئیمپراتـۆر خـۆی ئـەو گفتووگۆیـەی تۆمارکردبێت ... ئەوەش لەکاتی گەمارۆدانی - کونستا نتینۆبۆلیسدا - لـە نێـوان سـاڵانی ١٣٩٤ - ١٤٠٢ دا ئـەم رایـەش ڕەنگـە ئـەوە لێـك بداتـەوە کـە بۆچی بەڵگەکانی خۆی بە دوورو درێژی باس دەکات و بەو شێوەیە بایەخ بە وەڵامەکانی زانا فارسەکە نادات .

شایانی باسە ئـەم ووتـارەی پاپا لـەم زانکۆیـە بـووە هـۆی کاردانـەوە لـە سـەر باری دەروونی ئیسلام و وولاتانی ئیسلام ، بە تایبـەتی وولاتـانی عـەرەبی و بووە هۆی هەڵگیرسـانی ڕاپـەرین و پێکدان و کێشەو ململانێیـەکی دژوار لـە هـەموو بوارەکـانی پەیوەنـدی نێـوان ئـاینی ئیـسلام و ئاینی مەسـیحی لـە جیهاندا .

٢٠٠٦/٩/٢٢ سـەرەك وەزیرانـی ئیـسپانیا – خۆسـێ ماریـا ئازنـار – داوای لـە جیهـانی ئیسلامی دەکات ، کە داوای لێبوردن بۆ ٨٠٠ ساڵی داگیرکردنی ئیسپانیا بکەن ... ئەمەش لە میانەی داواکاری سەرۆکی زانایانی ئاینی ئیسلامی جیهان – یوسف قەرەزاوی – وولاتانی ئیسلامی و عەرەبی بە لێبوردنی پاپا و پاش گەزبوونەوەی لە ڕاگەیاندنەکانی لە زانکۆیەکی ئەڵمانی بە ناوی ئەوەی ، کە سووکایەتی بە ئاینی ئیسلام کردووە ... نەك داوا لە پاپا بکەن بە داوای لێبوردن لە ئیسلام بەڵکو ، جیهان دەبێ داوای لێبوردن لە ئیسپانیا بکەن بە داگیرکردنی بۆ ماوەی ٨٠٠ ساڵ .

٢٠٠٦/٩/٢٧ دوای ئەوە هـاو وولاتـی – ڕەحـیم ئیـبراهیم وسـو – کـە خـەڵکی هـەرێمی کوردستانە لە لایەن هێزەکانی سووپای ئێرانەوە دەستگیر دەکرێت . لە دوای ئەشـکەنجەدانی بـە سـووتاوی تەرمەکـەی درایـەوە خانەوادەکـەی ، خانەوادەکەی دەڵێن ئەو کوردە هیچ تاوانێکی نەبووە تەنیا لە بەر ئەوەی کوردبوو بەم شێوەیە هەتك کراوە لەلایەن ڕژێمی بە ناو ئیسلامی ئێران .

٢٠٠٦/٩/٢٧ لە چوارچێوەی سەردانەکەی بۆ شاری کەرکوك جێگری سەرۆکی پەرلەمانی تورکیـا – ئۆردوهـان جومـازی – گـووتی :– ئێمـەش وەکـو ئەمەریکیـەکان وولاتەکـەمان مـاف بـوونی لـە ئێراقـدا هەیـە ، ئـەویش لـە کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەنووسیدا ئۆرهان جوماز لە وەڵامی پرسیاری ڕۆژنامەنووسیەکەیدا دەربارەی بوونی تورکیا لە ئێراق گووتی :–

وەکـو دەووڵـەتێکی دراوسـێیە مـاف ئـەوەمان هەیـە چـۆن ئەمەریکیـەکان بوونیـان لـە ئێـراق هەیـە ئێمـەش بوونمـان لێـرە هـەبێت ... دەربـارەی چارەنووسی پارێزگای کەرکوك گووتی :–

چارەنووسی ئەم شارە خەڵکەکەی دیاری دەکات بە پێی ماددەی /١٤٠ ، کە یەکێکە لە ماددەکانی دەستووری هەمیشەیی ئێراق ، بەڵام لە چوارچێووەی ئەو ماوەیە هەر شتێك زەرەر لە کەرکوك بدات ... ئێمە دژی دەوەستینەوە ، جێی باسە لە چوارچێوەی سەردانەکەی بۆ کەرکوك چاویان بە سەرۆك و ژمارەیـەك لـە ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی شـارەوانی کـەرکوك کـەوت – لـە دانیشتنەکەدا ، کە کەرکوك لە چوارچێووەی جووگرافیای کوردستانە .

٢٠٠٦/٩/٢٨ ڕێووڕەسمی بە خاك سپاردنی دایکی دوا قەیسەرەکانی ڕووسی – تیقۆلای

دووەم -- ماریا میدوروفناس – لە دەرەوەی شاری سان بترۆسبۆرگ لە باکووری وولات ، کە بەتریك ئەلکسی دووەم سەرۆکی کەنیسەی ئەرسۆزکسیەی ڕووسی سەرپەرشتی مەراسیمەکەی کرد بە دووبارە ناشتنەوەی لە دوای ٧٨ ساڵ لە دانیمارك .

شایانی باسە دایکی قەیسەر نیقۆلای دووەم لە دایك بووی ساڵی ١٨٤٧ لە دانیمارك ، هەروا لە ساڵی ١٩٢٨ هەر لە دانیمارك کۆچی دوایی کرد , لە دوای شۆرشی بەلشەفیەکان لە ڕووسیا و لە سێدارەدانی قەیسەری ڕووسیا ... ناوی تەواوی ئەمیرە بترس پۆلسی ، لە گۆرەپارەپاش بیترۆف لە تەك مێردەکەی قەیسەر – ئەلکسەندەری سێیەم – دەنێژرێت .

٢٠٠٦/٩/٣٠ کەوتنە خوارەوەی فرۆکەیەکی بەرازیلی لە ناوچەی ئەمازۆن کە ١٥٠ هاوولاتی هەڵگرتبوو لە ئەنجامی خۆپێکدادانی بە فرۆکەیەکی تایبەت لە چیای کاتشیمۆ و لە ئەنجام هاوولاتیانی ناو فرۆکەکە گیانیان لەدەستدا و جگە لە تێك شکانی فرۆکەکە .

٢٠٠٦/٩/٣٠ سەرۆکی هەرێمی کوردستان فەرمانی پێکهێنانی لیژنەیەکیدا ئەویش بە ئاگادارکردنەوەی سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێم و ئەنجوومەنی وەزیران ، لە ژێر چاودێری دادوەرێك بۆ لێکۆڵینەوە لەو دۆسیانەی کە لە هەندێ ڕۆژنامەدا سەبارەت بە سیخوورێتی کردن بۆ ڕژێمی پێشووی بەعسی لە ئێراق و ئەویش لە دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەل پێشکەش بە سەرۆکایەتی هەرێم دەکرێت و کارەکانی دادگایی کردنی یاسایی دەست پێدەکات .

٢٠٠٦/٩/٣٠ سەرۆکی فەرەنسا – جاك شیراك – لە سەردانەکەیدا بۆ یەریڤانی پایتەختی ئەرمینیا و لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕایگەیاندو گووتی :- پێویستە لە سەر تورکیا دان بە کۆمەڵ کوژیەکانی ئەرمەنی کە لە ساڵی ١٩١٥ ئەنجامی دابوو بنێ ، لە گەڵ ٣٠ هەزار کورد بۆ ئەوەی ڕێگە خۆشکەربێت بۆ چوونە ناو یەکیەتی ئەورووپا .

شایانی باسە پارێزگای یەریڤان شارێکی کوردیە لە هەموو ڕوویەکەوە داگیرکراوە تاکو ئێستا .



٢٠٠٦/١٠/٢ ســەرۆكی ئــەركانی هێزەكــانی ســـووپای توركیــا – ژەنــەراڵ باسـر بوبوكاینـت – لـه وەڵامـی ئــەو ئاگربەســتەی كــه پــارتی كرێكـــارانی كوردســـتان pkk یەكلایەنه ڕاگەیاندو گووتی :- ســـــووپا تـــاكو كۆتـــایی دەســتبەرداری شــەڕی چــەكدارانی پەكەكــه نابێــت ، لــه چوارچــێوەی ئــەو ووتارەی ، كه له ئەكادیمیای جەنگ له شاری ئەستەمبوڵ پێشكەشی كرد ، هــەروا باســر گــووتی :- هێــزه چــەكدارەكانی توركیــا پێــشتر چــەندین جــار ڕایانگەیانـدوه كـه لـه شـەڕی خۆییـدا دژی پەكەكـه بەردەوام دەبێـت تـا یـەك چەكداری پەكەكه نامێنێ ، چونكه هەڵوێستی حكوومەتی توركیا نەگۆڕەو ناشگۆڕێ ، هەروا گـووتی پەكەكـه بەبێ جیاوازی واز لـه خـەباتی چـەكداری بێنێ .

٢٠٠٦/١٠/٣ بــاڵوێزی ئــەكوادۆر لــه ڕێكخــراوی نەتــەوه یــەكگرتووەكان نیــشانیدا كــەوا گواتیمــالا و فــەنزویلا لــه كێبركێكــانی بــه ئەنــدام بــوونی لــه ئەنجوومــەنی ئاســایش كــشایەوه ، بــۆ ئــەوەی پەنــەما ببێتــه ئەنــدام ، تــا ئێستاش دوای ٤٧ پرۆسەی دەنگدان هەر گواتیمالا لـه پێشكەوتندا بوو كه له لایەن ئەمەریكاوه پشتگیری لێدەكرا .

٢٠٠٦/١٠/٣ سەرەك كۆماری توركیا – نەجدەت ئەحمەد سیزار – بە ڕەسمی حكوومـەتی قووبرسی بەوه تۆمەتباركرد كه ڕۆڵێكی نیگەتیفی گێرا لـه دانووستانەكانی فینلەنـدا ، كـه بـۆ مەبەسـتی چارەسـەركردنی كێـشەی دوورگـەی قـووبرس ڕێكخـرا بـوو ، توركیـا دووپـاتی كـردەوه ، كـه حكوومـەتی قـووبرس هۆكـاری یەكەمی سەرنەكەوتنی ئەم دانووستاندنەیە .
شایانی باسه حكوومەتی قووبرس له بەرایی دانووستاندنەكەدا كشایەوه بە هۆی ناڕازیبوونی له سەر شێوازی بەڕێووه چوونی دانووستانەكه .

٢٠٠٦/١٠/٤ لــه سەرچــاوەی www.bab.com دا بڵاوكراوەتــەوه كــه لەیــەكێك لــه دوورگەكانی زەریای هندی درەختێك هەیە خەڵك و ئاژەڵان دەخوات بەوەی ،

کە پەلك و لقە زۆرەکانی بەدەووری نێچیرەکەی پێچ دەدات و دەیمژێ و بەری نادات تاکو دەیکاتە پەیکەرێکی مرۆیی ، خەڵکی ناوچەکە لەو بڕوایەدان ڕوحی باپیران و خواوەندەکانیان لەو گەڵاو پەل و پۆی ئەو درەختانە خۆی دەبینێت ، بۆیە دەیپەرستن و بە پیرۆزی ڕایدەگرن و لە سەر شێوەی پەیکەری باپیران و خواوەندەکانیان قوربانی بۆ دەدەن .

٢٠٠٦/١٠/٦ سەرەك وەزیرانی حکوومەتی فەلەستینی و سەرکردەی جووڵانەوەی حەماسی ئیسلامی – ئیسماعیل هەنیە – لە لێدوانێکی دا ویستی بەرگری لە هێزەکانی جێ بەجێکاری حەماس بکات تێیدا هێزی پێشمەرگەی کوردستانی بە – عصابە – ناوبرد .

٢٠٠٦/١٠/٨ تاقیکردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی لەلایەن کۆریای باکوور ، کە بووە هۆی تەنگەژەیەکی نا لە باری نێوو دەوڵەتی ، بە تایبەتی ئەمەریکا و بەریتانیا و کۆریای باشوور و یابان – ژاپۆن – ، دوای ئەوە بۆرسەکانی ئاسیا لە ١٠/٩ پاشەکشەی بەرچاویان بەخۆدی دوای ڕاگەیاندنی کۆریای باکوور بە دەستپێکردنی ئەزموونی ئەتۆمیووڵاتەکەی ، بە تایبەتی لە چین و کۆریای باکوور بە دەستپێکردنی ئەزموونی ئەتۆمی ووڵاتەکەی بە تایبەتی لە چین و کۆریای باشوورو سەنگافورا .

هەروا ئەو ئەزموونە مەرامێکی ڕامیاری لە ناوچەکەو لە جیهاندا نایەوەو زۆربەی زۆری ووڵاتان هەرەشەی برینی هەموو پەیووەندیەکانیان لەگەڵ کۆریای باکوور کرد ، بە تایبەتی کۆریای باشوور کە دووپاتیکردەوە کەوا کۆریایەکی بێ چەکی ئەتۆمی دەوێت لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٦/١٠/٨ لە دوایین هەڵبژاردنەکانی بەلژیکا پارتی بیلانگی ڕاسترەوی بەرهەڵستکار تووانی زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بێنێ ، پارتی بیلانگی ڕاسترەو ، کە ساڵانێك بوو بە هۆی ووتاری سیاسی ڕەگەز پەرستانە دەنگی پێویستی بەدەست نەدەهێنا بۆ گەیشتن بە کورسیەکانی ئەو ناوچەیەی کە خەڵکەکەی بە هۆڵەندی دەدوێن لە ووڵات جیا بێتەوە ، کە هەرێمی ئەنتڤێر بە سەرچاوەکانی هەواڵ و چاودێرانی سیاسی وای بۆ دەچن کە پارتی بیلانگ خۆی لە قەیرانێکی سیاسی لەبن نەهاتووە ببینێت .

٢٠٠٦/١٠/١١ فرۆکەیەکی بچووك کە نەوی دەفڕی خۆی بە باڵەخانەی مانهاتندا ، کە

دەکەوێتە ناوەراستی شاری نیورۆکی ئەمەریکی ، کە لەو ڕووداوە دووکەس گیانیان لەدەست داوە ، کە باڵەخانەکە لە پەنجا نهۆم پێك هاتووە ، کە ١٨٣ شووقە لەخۆ دەگرێ .

٢٠٠٦/١٠/١١ ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق لە دانیشتنی ژمارە /٤٧ ی بڕیاری لە سەر پڕۆژە یاسای پێکهێنانی هەرێمەکان بڕیاری بۆ درا ، بەڵام بەرەی تەوافق و لیستی ئێراقیە و بەرەی گفتووگۆی نیشتیمان . نارەزایی خۆیان بەرامبەر بەو بریارە نیشاندا .

٢٠٠٦/١٠/١٢ ئیدارەی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ڕاگەیاندنەکانیان ، پارتی کرێکارانی کوردستان pkk بەوە تاوانبارکرد کە بۆتە هۆی هەڕەشەکردن لە رژێمی تورکیا .

کە ئەم ڕاگەیاندنەش لەلایەن نوێنەری تایبەتی ئەمەریکا بۆ گفتووگۆی نێوان تورکیاو pkk ژەنەراڵی خانەنشین – جۆزێف رالستۆن – .

کە داوای لە پارتی کرێکارانی کوردستان کرد بە فرێدانی چەك و دەست هەڵگرتن لەکاری توندو تیژی و لە هەمان کات هەڵوێستی یەك لایەنەی pkk بەڕاگرتنی شەڕ ، یاخوود ئاگر بەست بەکارێکی باش ناوزەندکرد لە پێناو کۆتایی هێنان بەکێشە دژوارەکان ، کە ئەو ئاگر بەستەش لە ٢٠٠٦/١٠/١ لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاتی تورکیا راگەیاندرا بوو .

سەرچاوە:- BBc.arabic



٢٠٠٦/١٠/١٣ وەزیری دەرەوەی کۆریای باشوور – بان کی مۆن – هەڵبژێردرا بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و دوای هەڵبژاردنی بۆ ئەو پۆستە لە ووتارێکیدا بەڵێنیدا لە خوولی داهاتووی نەتەوە یەکگرتووەکان چاکسازی ئەنجام بدرێت .

شایانی باسە ئەمەش لە دوای دە ساڵ لە ئەمینداریەتی گشتی نەتەوە

یەکگرتووەکان دێت لە لایەن – کۆفی ئەنان – لە بارودۆخێکی نێودەوڵەتی ئاڵۆز ، بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکەی ٢٠٠٦/٩/١١ و لێدانی ئەفگانستان و ئێراق و چەندین کێشەی نێودەوڵەتی دیکە لە جیهان .

٢٠٠٦/١٠/١٣سەرۆکی بزووتنەوەی موجاهیدینی خەلقی ئێران – مریەم رەجەوی – خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بڕیاری دادگای ئەورووپی دەربڕی سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری بلۆککردنی سامانی دارایی بزووتنەوەکە ... هەروا گووتی :– ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە خەبات لە دژی ڕژێمی فاشی ئێران شەرعیە .

ئەم ڕاگەیاندنەی مریەم رەجەوی لە بەردەم پەرلەمانی ئەورووپی بوو ، کە بڕیاری دادگا ناوزەندکردنی بزووتنەوە لە تیرۆر هەڵدەگرێ ... لە هەمان کات مریەم رەجەوی داوای قەرەبووی لە ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران کرد بە هۆی زیان لێکەوتنی بزووتنەوەکە .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە بزووتنەوەی موجاهیدی خەلقی ئێران بزووتنەوەیەکی ڕامیاریە ... دوای ڕژێمی کۆماری ئیسلامی لە ئێران دامەزراوە ... بەڵام لە میانەی شەری هەشت ساڵەی نێوان ئێراق و ئێران ئەم بزووتنەوەیە خۆی دا پاڵ ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، بە سەرکردایەتی – سەدام حوسین – ... دژ بە گەلی کوردستان . کە چەکدارەکانی ئەو بزووتنەوەیە بەشداریان لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی گەلی کوردستان لە ئازاری /١٩٩١ کردووە لە گەڵ ڕژێمی بەعس و خزمەت کردنی ڕژێمی بەعسی دژی ڕاپەڕیووەکانی گەلانی ئێراق بە تایبەتی گەلی کوردستان ... بەڵام دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس لە دوای ٢٠٠٣/٤/٩ چالاکیەکانی ئەم بزووتنەوە یەکی خراو ئەندامەکانی بۆ وولاتانی ئەورووپا کۆچیان کرد لە ئێراق .



١٤/١٠/٢٠٠٦ - پیتــــەر گالبرێـــــت - بـــــاڵوێزی پێـــــشووی ئەمـــەریکا لـــە کرواتیـــا دووپاتی کـردەوە ، ئەگـەر بێت و تورکیا بیـەوێت بـە شـــــەڕ ڕووبـــــەڕووی ســـەربەخۆیی هــــەرێمی کوردستان بێتـەوە دەبێت شـەڕ لـە گـەڵ سـەد هـەزار پێشمەرگەی کوردسـتان بـەرپابکات و ئەمـەش جـەنگێکی گـەورەی نێـوان هێزەکانی سووپای تورکیا و سووپای ئەمەریکای لێدەکەوێتەوە .

ئەمـەش لـە لێدوانەکەی بۆ ڕۆژنامـەی - تایگـەر سایتونی - ئـەلمانی ، کـە گالبرێـت جـەختی کردۆتـەوە ، کـە هـەر جـۆرە هێرشـێکی تورکیـا بـۆ سـەر هـەرێمی کوردسـتان خـەونی ئەندام بوونی ئەنکەرە لە یەکیـەتی ئـەورووپا لـە بـارە دەبـات ، هـەروا کـورد پێیـان دەکرێـت ڤێتنـامێکی دیکـە لـەناو تورکیـا دروست بکەن لە هەرێمەکەیاندا .

هەروا گالبرێت داوای لە ئەمەریکا کرد ، کە هێزەکانی لـە باشووری ئێـراق و ناوەراستی بکشێتەوە کوردستان و گەر پێویستی کرد لـەوێوە شـان بەشـانی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان کارەکانیان ئەنجام بدات .

١٥/١٠/٢٠٠٦ حکوومەتی ئێراق لە بەیانێکیدا ڕایگەیاند ، کە هەردوو حکوومەتی ئێراق و حکوومـــەتی کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران ، تیمێکـی کارکردنیـان بـۆ جـێ بـەجێکردنی ڕێکەوتنامـەی ئـەمنی نێوانیـان پێـك هێنـاوەو ئێستا دیراسەی ئالیەتی جێ بەجێکردنی ئەو بەرنامەیە دەکەن .

لـە بەیانـەکـەدا هـاتووە ، کـە ڕاوێـژکاری ئاسایشی نەتـەوەیی لـە ئێـراق - د. موفق روبەیعی - لە گەڵ وەزیری ئەمنی و ئیستیخباراتی ئێرانیدا کۆبۆتـەوە سەبارەت بە کارکردنی کـاری ئـەو تیمـە گفتووگۆیـان کـردووە ... ئامـانج لـەم هاوکاریەش گۆرینەوەی زانیاریە بۆ ڕێگـەگرتن لـە دەرکردنـی تیرۆرسـتان لـە ئێرانەوە بۆ ناو خاکی ئێراقدا .

١٥/١٠/٢٠٠٦ هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆکایەتی لـە ئـەکوادۆر دەسـتی پێکـرد ، واش مەزەنـدە

دەکرێت کە – رافایل کورییا – لەم هەڵبژاردنانە سەرکەوتن بەدەست بێنێ .
شایانی باسە ناوبراو هەڵگری هەمان هزرو سیاسەتی هۆگۆ شاڤێزی هەیە لەگەڵ ئەوە تاکو ئەم هەڵبژاردنە ئەکوادۆر دوو سەرۆکی نژاد عەرەب سەرۆکایەتی ئەکوادۆریان کردەیە ، کە یەکێکیان بە هۆی نەخۆشی دەروونی و ئەوی دیکەیان بە هۆی ڕامیاریەتی چەوت دوورخراونەتەوە لە دەسەڵاتەکە .

٢٠٠٦/١٠/١٥ ڕۆژنامەی مەعاریفی ئیسرائیلی بڵاوی کردەوە ، کە خاتوو – تسیبی لیڤنی – وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل کە ڕۆژی یەکشەمە لە گەڵ کۆمەڵێك باڵیۆزی عەرەب لە شاری قوودس دەعوەتی ئیفتار کراوە ، لە ئوتێلی مەلیك داود و لە دەعوەتەکەش حەنا سەنیورە کە فەلەستینیەکی دانیشتووی شاری قوودسە ئامادە بووە .
لەم دەعوەتەدا باڵیۆزە عەرەبەکان زۆر بەگەرمی و بە ماچ و تەوقەکردن پێشوازیان لە خاتوو لیڤنی کردووە ... بەڵام ڕۆژنامەکە ناوی هەموو باڵیۆزەکانی ئاشکرا نەکردووە تەنها ئەوەندە نەبێت ، کە دەڵێ هەر یەکە لە باڵیۆزانی میسر و ئەردەن و مۆریتانیا بەردەوام لە گەڵ خاتوونەکەی ئیسرائیلدا بوون .

٢٠٠٦/١٠/١٥ کۆمەڵێك لە سەرەك عەشیرەتە هاوردەو داگیرکەر لە گوندی هیندیەی نزیك قەزای حەویجە کۆبوونەوە ، کە تێیدا عەبدولرەحمان مونشدعاس دژ بە دەستوورو ئیدارەی کەرکوك و هێزەکانی فرە رەگەز ووتەیەکی پێشکەش کردو ئامادەبوانیش بە ئاشکرا وێنەی سەرۆکی روخێندراوی ئێراق سەدەم حوسێنیان هەڵگرتبوو ، کە دژی کورد و هەرێمی کوردستان وەستان لە هەموو بوارەکاندا .

٢٠٠٦/٦/١٦ ڕێکخراوی EUTCC کۆنفرانسی سێیەمی بە ناونیشانی کاتێك بۆ دادپەروەری و دیالۆگ و چارەسەرکردنی لە سەر دۆسیەی کوردو تورك ، لە ناو پەرلەمانی ئەورووپا لە شاری برۆکسلی پایتەختی بەلژیکا گرێدا ، ئەم کۆنفرانسە بایەخێکی زێدە گرنگی هەبوو ، لە بەر ئەوەی زیاتر لە ١٥ پەرلەمانتاری ئەورووپی و چاودێران و ئەکادیمی و شارەزایان لە سەر کێشەی کورد تیایدا ئامادە بوون .

شایانی باسه لێژنەی مەدەنی تورکیا یەکێتی ئەوروپا وەك رێکخراوەیەکی قــازانج نەویــست لــه بەلــژیکا تۆمــارکراوەو لــه دەســتەیەکی کــارگێری و دەســتەیەکی راوێــژکاری پێــك هــاتووه ، لــه دوای یەکــەم کۆنفرانــسی نێــوو دەووڵەتی ، یەکیەتی ئەوروپا و ،تورکیـاو ، کورد ، کـه لـه مـانگی /۱۱/۲۰۰٤ گرێدرا دامەزراوە و ساڵانە کۆنفرانسێك رێکدەخات .

کۆنفرانــسی ۲۰۰٦ بــه هــۆی بــاری دژواری کــورد لــه تورکیــا و لــه ئاکــامی خۆپێشاندانەکان لـه باکووری کوردستان بایـەخێکی گرنگی هـەبوو چونکه خۆپێــشاندانەکانی مــانگی /۳ و مــانگی /٤/۲۰۰٦ ، کــه چــەندین هــاووڵاتی کورد بوونه قوربانی له باکووری کوردستان .

۱٦/۱۰/۲۰۰٦ هێزەکـانی ئاسایـشی ڕژێمـی بەعسی لـه سـووریا رێگـەی نـەدا ئۆپۆزسـیۆن کۆنگره رۆنامەوانیەکەی ئەنجامبدات له شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا ، کـه ئاسایـشی سـووریا هـەموو ئـەو رێگایانـەیان داخـست کـه بـۆ شـوێنی کـۆنگره رۆژنامەوانیەکـه دەچـوون و ماوەیـان بـه کۆنگرەوانـان نـەدا کـۆنگره ساز بکەن .

له بەیاننامەکیدا نووسینگەی راگەیاندنی دیمەشق ڕوونیکردەوه ، کـه لـەو کاتـه ساڵێك بـه سـەر دامەزرانـدنی ئـەم دەسـتەیه تێپـەربووەو بریـار بـوو لـەم رۆژەشــدا کــۆنگره ئــەنجام بــدەن ، کــه ئاسایــشی ســووریا چــواردەووری کۆبوونەوەکەیان گرتبوو .

۱٦/۱۰/۲۰۰٦ له شارۆچـکەی چـێمای رۆژئـاوای وولاتـی ئەسـیوبیا گـەورەترین شـەڕ لـه نێـوان موسـوڵمانان ومەسیحیەکان بـەرپابوو ، ئـەم شـەڕە تەواوکـەری شـەڕی چـوارەم رۆژی رابـردووی بـووه ، کـه بـووه هـۆی تێکـدانی سـەدەها مـاڵ و بارەگای چەند رێکخراوەیەکی ئایینی ... سەرەرای هەوڵەکانی حکوومەت لـه پێنـاو بەرپا نـەبوونی شـەڕی ئایینی نێـوان مەسـیحی و ئیسلام ، بەڵام تـاکو ئەمرۆژه نەیانتوانی رێگەچارەی بۆ بدۆزێتەوه .

۱۷/۱۰/۲۰۰٦ له دوای هـەوڵ و تەقەلایـەکی زۆر وەزارەتـی نـاوخۆی بـەریتانیا لـه لەنـدەنی پایتــەختی بــەریتانیا ڕەزامەنــدی نوانــد لــه کردنــەوەی رادیــۆی ناوەنــدی بــەریتانیای یەکیــەتی لاوانــی دیمــوکراتی کوردســتان ، کــه ئەمــەش رۆڵــی بەرچاوی دەبێ بۆ لاوانی کوردی ئەوروپا و ئێراق و کوردستان .

٢٠٠٦/١٠/٢٠ موفتی موسولمانانی نیشتەجێی ئوسترالیا – شێخ تاجەدین ئەلهیلالی – لە وتاری نوێژی هەینی و لە مزگەوتەکەی خۆی لە شاری – سیدنی – لە ئوسترالیا ، گووتی :– ئەو ئافرەتە ئوسترالیانەی کە جل و بەرگی ڕووت لە بەر دەکەن ، هانی پیاوانی ئەم وولاتە دەدەن تا دەستدرێژی سێکسیان بکەنە سەر ... هیلالی کە زیاتر لە ٢٢ ساڵە لە ئوسترالیا دەژی و سوودی لە ئازادی و یاساکانی ئەم وولاتە وەرگرتووەو وەسفی ئافرەتە سفوورەکانی ئوسترالیای بە گۆشتێکی فرێدراو لە بیابانێکدا کرد ، کە پڕ بووبێت لە پشیلەو سەگی برسی.

ئەم لێدوانە بووە هۆی ئەوەی کە نارەزاییەکی توند لە نێوەندە رامیاری و ئیسلامیەکانی ئەو وولاتەدا پەیدا ببێت ، کە دەرئەنجام ڕاگرتنی ئەم موفتیەی لە وتارەکەیدا لێکەوتەوەو لە لایەن ئیدارەی مزگەوتەکەی خۆیەوە ، دوا بە دوای بە دیارکەوتنی دەر ئەنجامی ئەو لێدوانە تاجەدین هیلالی لە بەردەم کەناڵەکانی راگەیاندن داوای لێبووردنی لە حکوومەت و گەلی ئوسترالیا کرد .

بەڵام سەرەك وەزیرانی ئوسترالیا – جۆن هاوەرد – گووتی : – ئەم داوای لێبووردنە بەس نیە و دەبیَ هیلالی و هاوشێوەکانی بزانن ، کە ئوسترالیا وولاتێکی ئازادەو ئەوەی ڕێز لەم ئازادیە ناگرێت لە لای ئەوان جێگای نابێتەوە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٠/٢٠ کۆنفرانسی کورد لە پەرلەمانی ئەوروپا ، کە دوو رۆژ بەردەوام بوو ژمارەیەك لە سیاسەتمەداری کورد وەك سەرۆکی پارتی کۆمەڵگای دیموکراتی – ئەحمەد تورك – و – عوسمان بایدەمیر – سەرۆکی شارەوانی ئامەد – دیاربکر – ئامادەی بوون .

شایانی باسە لەو کۆنفرانسەدا داوا لە حکوومەتی تورکیا کرا بە زووترین کات کۆتایی بە ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکانی لە باکووری کوردستان بێنیَ ، هەروا سەبارەت بە ئەنجامە کۆتایەکانی کۆنفرانسەکە بەیاننامەیەکی لە ٣١ خاڵدا بلاوکردەوە ، کە پێشێل کردنی ماف مرۆڤ و کەمە نەتەوایەتیەکان و چارەسەرکردنی کێشەی کورد گرنگترین بەندەکانی بوون .

هەروا لە بەیاننامەکەدا هاتووە ، کە هەوڵەکانی بە ئەندام بوونی تورکیا لە

یەکێتی ئەوروپا دەبێت بەند بێت بە ئەنجامدانی چاکسازی دیموکراسی کە دەوڵـەتانی ئـەوروپا پـشتگیری لێدەکـەن و ئەوەشـی روونکـردەوە ، کـە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا بۆ ئارامی تورکیا زۆر گرنگە و ئاگر بەسـتەکەی پەکەکـەش وەك هـەنگاوێکی ئـەرێنی پێـشوازی لێکـراو کۆنفرانسەکە داوای لـە یەکیـەتی ئـەوروپا کـرد رێکخرەرێکـی تایبـەت بـە چارەسـەرکردنی کێشەی کـورد دیـاری بکـات و کۆمیتەیـەکی تایبـەتیش بـە ئاشتی دروست بکات.

٢٠٠٦/١٠/٢٤ لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی کێـشە هەڵواسـراوەکانی نێـوان حکوومـەتی سـەریلانکا و یاخیبووەکـان ، دانووسـتاندنی نێوانیـان لـە وولاتـی سویـسرا بەرێووە دەچێ .

٢٠٠٦/١٠/٢٧ بە درێژایی سێ رۆژ دوو کۆنگرەی جیا لە هەمبەر رەوشی هەنوکەیی ئێراق لـە شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا گرێـدرا ، لـە دوو رۆژی یەکەمـدا لێژنـەی پـشتگیری دیموکراسـی ئێـراق کۆنگرەیـەکی بـۆ زیـاتر لـە ١٠٠ سیاسـەتمەدارو رۆشـنبیری ئـەکادیمی ئێراقـی و کوردسـتانی لـە هـۆڵی سەنتەری رۆشنبیرانی کوردستان لە لەندەن سازکرد .

لەلایـەکی دیکـەوە وەزارەت دیـالۆگی ئێراقـی بـە ئامـادەبوونی – ئـەکرەم ئەلحەکیم – وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری دیالۆگی ئیشتیمانی و ژمارەیەك لە کەسایەتی و نوێنەری پارت و لایەنە رامیاریەکانی ئێراق کۆنگرەیەکیان لـە ١٠/٢٩ ی هـەمان سـاڵ سـاز کـرد ، لـە بـارەی بـاری ئـاڵۆزی ئێـراق و داهـاتوویی ئێـراق لـە بوارەکـانی ئـەمنی و ئـابووری و خزمـەتگوزاری و تیرۆرست و ئاوەدان کردنەوەو پەیووەندی وولاتی دراوسێ ... بەڵام ....!..؟.

٢٠٠٦/١٠/٢٨ ناوەندەکانی هەڵبژاردن لە سربیا دەرگاکانیان کردەوەو دەنگدەران دەنگیـان لە سەر راپرسیەکی گشتی کرد ، دەربارەی دەستووری نوێی وولات ... کە رایدەگەیـەنێت کـە هـەرێمی کۆسـۆڤۆ کـە ئێـستا لەلایـەن نەتـەوە یەکگرتووەکانەوە بەرێووە دەچێت بەشێکە لە سربیا و لێی جیانابێتەوە .

لەحاڵـەتی دەنگـدان لـە بەرژەوەنـدی دەسـتوور کـە ئەمـە دەبێتـە یەکـەمین دەستوور بۆ دەووڵەتی سربیا و بە هەڵووەشاندنەوەی وولاتی یۆگسلافیا .

بەڵام ئەلیانەکانی کۆسۆڤۆ کە نزیکەی ٩٠٪ ی دانیشتووانی هەرێمەکە پێك

دێـنن ، کـە ژمـارەی ٢,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆنـە نـاتوانن دەنـگ بـدەن ... چـونکە ناویـان لـە لیـستی دەنگـدەران نیـە و لـەو کاتـەوە ، کـە بەشـداریان لـە هەڵبژاردنـەکانی ساڵی ١٩٩٠ نـەکرد ، بۆیـە کـەس لـە کۆسـۆڤۆ بایـەخێك بـۆ راپرسـیەکە دانانێـت و ئەنجامەکـەی هـیچ کاریگەریـەکی لـە سـەر رەوشـی کۆتـایی کۆسـۆڤۆ نابێـت ، گـەر زیـاتر لـە ٥٠٪ دەنگیـان لـە سـەردا لـە کـۆی ٦,٦٠٠ ملیۆن دەنگدەر .

٢٠٠٦/١٠/٢٨ بۆ یەکەمجار لـە مێژوودا سـەرۆکی پێشووی لوبنـان – ئـەمین ئەلجومـەیل – سـەردانی کوردسـتان بکـات و لـە هـەمان کـات سـەرۆکی پـارتی کـە تـانیبی لوبنانیـە و لـە لایـەن سـەرۆکی هـەرێم و بـە رێپرسـانی حکوومـەتی هـەرێمی کوردستان پێشوازی لێکراو چەند بیرووبۆچوون لە بارەی کورد و ئێـراق و ناوچەکە ئاڵوگۆڕکرا .

٢٠٠٦/١٠/٢٨ گرێدانی کۆنفرانسی شانۆی کوردی لە شاری منشنی ئەڵمانی گرێدرا ، کە شانۆکارانی کورد لە ئەوروپا و دەست نیشانکردنی ئامانجەکانی پاشە رۆژ و چۆنیەتی پەرەپێدانی شانۆی کورد بوو لە ئەوروپا ئەویش بە :–

١– دامەزراندنی ناوەندێك بۆ شانۆکارانی کورد لە ئەوروپا .

٢ – دامەزراندنی لێژنەیەك کە پێك هاتووە لە پسپۆرو شارەزاو رەخنەگران

٣– دەستەی ئامادەکردن بۆ کۆنفرانسی داهاتووی دەستنیشانکرا .

٢٠٠٦/١٠/٢٩ سـەرەك وەزیرانـی تورکیـا – رەجـەب تـەیب ئۆردوگـان – لـە راگەیاندنێکیـدا گـووتی :– حکوومـەتی تورکیـا ئامـادە نیـە هـیچ گۆڕانکاریـەك لـە یاسـای سـزادانی وولاتـدا بکـات ، ئـەو لێدوانـەی سـەرەك وەزیرانـی تورکیـا لـە کاتێکدایە ، کە یەکیـەتی ئـەوروپا تورکیـای ئاگادارکردۆتـەوە ماددەی /٣٠١ ی یاسای سزادان بگۆڕدرێت ، کە تایبەتە بە پاراستنی شوناسی تورکیاو بە پێی ئەو یاسایە دەیان رووناکبیری ئـەو وولاتـە دادگـایی کـران ... یەکیـەتی ئەوروپا ماددەی /٣١٠ ی یاسای سزادان لە تورکیا بە پێشێلکردنی ئـازادی را دەربـڕین دادەنێـت و چـاودێرانی سیاسـیش پێیـان وایـە نـەگۆڕینی ئـەو یاسایە لەلایەن حکوومـەتی تورکیـاوە زیـانی بـە ئەندامبوونی ئـەو وولاتـە لـە یەکیەتی ئەوروپا دەگەیەنێت .

٢٠٠٦/١٠/٢٩ کەوتنـە خـوارەوەی فرۆکەیـەکی سـەر بـەهێڵی ئاسمـانی نیـژیر کـە ١٠٠ سەرنشینی هەڵگرتبوو گیانیـان لەدەسـت داو لـە گـەڵ تێکشکانی فرۆکەکە ،

که فرۆکەکە له شاری لاگۆسەوه له ڕێگەی شاری ئەبودژە دەیوویست بەرەو سۆکۆنۆ بچێت له باکووری رۆژئاوای وولات له شاری ئەبووژاش ، که ١٠ له سەر نشینەکانی دابەزین ، که ژمارەیان ١١٠ کەس بوو ئەوەی که له ناو فرۆکەکە ماونەتەوه هەموویان گیانیان لەدەست دا ...؟.

٢٠٠٦/١٠/٢٩سەرۆکی کووبا – فیدل کارستڕۆ – دوای ٤٠ رۆژ له چاکبوونەوەی بۆ یەکەمجار له سەر شاشەکانی تەلەفزیۆن به دیارکەوێت ... له پەیامێکیدا به جەماوەری کووبا کاستڕۆ نیشانیدا ، که ئەو هێشتا نەمردووه ، کەچی هەواڵی مەرگیان راگەیاندو دووپاتیکردەوه کەوا تەندروستی بەرەو باشی دەچێت .

٢٠٠٦/١٠/٢٩پاش ململانێیەکی زۆر له گەڵ نەخۆشی و دوای پێشکەشکردنی چەندین بەرهەمی ئەدەبی دانسقه ، ئەحمەد هەردی شاعیری ، نەتەوەی کورد له شاری سلێمانی ماڵئاوایی له گەل و نیشتیمان و خانەوادەکەی کرد و له ڕێورەسمێکی بەرچاو له گۆرستانی گردی سەیوان له شاری سلێمانی بەخاك سپێردرا .

شایانی باسه شاعیری نەتەوەیی له ساڵی ١٩٢٢ له شاری سلێمانی چاوی به جیهان هەڵهێناوه و بەشداری شۆرشەکانی گەلی کوردستانی کردووەو دوای نسکۆی شۆرشی ئەیلول له ساڵی ١٩٧٥ ئاوارەی ئێران بووه .

شاعیر له ماوەی تەمەنی چەندین بەرهەمی ئەدەبی دانسقەی پێشکەش به گەلی کورد کردووه ... دوای ئەوه له ساڵی ١٩٩٣ له شاری لەندەن نیشتەجێ بووه و دوایی گەراوەتەوه هەرێمی باشووری کوردستان له شاری سلێمانی .



٢٠٠٦/١٠/٢٩ زاناو رووناکبیری سۆڤیەتی جاران و وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی جاران و حکوومەتی بۆتینی رووسیای یەکگرتوو – یفگینی بریماکۆڤ – ووتارێکی لە هۆڵی کتێبخانەکەی حافز ئەسەدی سەرۆکی کۆچ کردووی سووریا لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا بۆ ئامادە بووان خوێندەوە ، کە زۆربەی بەشداربووان لە کۆرەکەدا لە بەر پرسانی پارتی بەعسی دەسەلات دار بوون لە سەر سووریا .

ئەویش بەبۆنەی بلاوکردنەوەی کتابەکەی بە ناوی – الشرق الاوسگ – . المعلوم و المخفی – ... کە کتابەکەی لە سەر باری جوولانەوەی دیموکراتی و کۆمۆنیستی لە وولاتانی عەرەبی ، بە تایبەتی بەمەش دیموکراتی و ئەسیووبیا دەکات ... هەروا لەدوای تەواوبوونی کۆرەکەی لە هۆڵەکەدا واژووی لە سەر وانەکانی ئەو کتابەی کرد کە پێشکەشی ئامادەبووانی کرد لە هۆڵەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە دەسەلاتدارانی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران و هێڵی رامیاریەتی سۆڤیەت بە هەمان شێوەو شێوازی وولاتانی دیکەی سەرمایەداری بوو ... بەلام لە بوارێك و کەش و هەوایەك و بارێکی دیکەی دەسەلاتەکەیان مامەڵەیان لە گەڵ وولاتانی جیهان دەکرد .

بۆ نموونە :– جوولانەوەی رزگاری خوازی نیشتیمانی و نەتەوەیی لە جیهان و بزووتنەوەی پارتە کۆمۆنیستەکان لەجیهان و جوولانەوەی دیموکراتی لە جیهان ... کە سۆڤیەت پشتگیری لێدەکرد ، لە پێناو دابەشی جیهان بوو لە رووی رامیاری و ئابووری و بازرگانی لە بەرژەوەندی تایبەتی وولاتەکەی خۆی ئەویش :–

١– بە پالپشتی سۆڤیەت کۆماری کوردستان لە رۆژهەلاتی کوردستان لە

شاری مەهاباد لە ١٩٤٧/١/٢٢ ڕاگەیاندراو هەر بە پشتیووانی سۆڤیەت لە ١٩٤٧/١٢/١٧ ئەم کۆمارە رووخێندرا .

٢- بە پاڵپشتی سۆڤیەت کۆماری یەمەنی دیموکراتی لە بەشی باشووری کۆماری یەمەن دامەزرا ، کە پارتی کۆمۆنیست دەسەڵاتداریەتی گرتە دەست و دوای ئەوەش هەر بە پشتیووانی ئەو ، ئەو کۆمارە رووخێندرا و هەردوو کەرتی یەمەن یەکیان گرتەوە .

٣- هەروا بە پاڵپشتی سۆڤیەت رژێمی کۆمۆنیستی لە ئەسیووبیا دامەزراو هەر ئەویش رەزامەندی لە سەر رووخاندنی کرد .

٤- هەروا لە کووبا و، لاوس و ، کەمبۆدیاو ، ڤێتنام و ، جەزائر و ، فەلەستین و چەندین جێگەی دیکە لە جیهان .

٥- دوای هەموو ئەو رووداوانە خۆشی لە ١٩٩٢/١٢/٧ لە راگەیاندنێك هەڵووەشێندرایەوە ..

ئەمانە هەموو لە ئەنجامی بەرژەوەندی تایبەتی بوو لە بوارەکانی سەربازی و ئابووری و بازرگانی و رێکەوتنە هاوبەشەکانی لەگەڵ ئەمەریکا و ئەو وولاتانەی کە کێشەکانیان تێیدا تەشەنەی کردبوو ... لەوانەش هەر بە چەك و تەقەمەنی سۆڤیەت لە پارتی کۆمۆنیستی ئێراق و ، بە تایبەتی لە بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد دەدرا لە ئێراق ، بێ ئەوەی بەرگری لە گەلانی چەوساوەی ژێر دەسەڵاتی رژێمی بەعس لە ئێراق بکات ... هەروا لە چەندین بواری دیکە لە وولاتە جیاجیاکانی جیهاندا .

٢٠٠٦/١١/٢ لە دوای هەوڵێکی زۆر پەنەما توانی کورسیەکی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوو دەووڵەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەدەست بێنێ و هەر بەوبۆنەوە فەنزویللا و گواتیمالا دەستیان لە خۆ پالاوتنی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوو دەووڵەتی کشاندەوە ، سەرەرای سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان وولاتانی ناوچەکە لە پەیوەندیە دبلۆماسیەکان .

٢٠٠٦/١١/٣ هەردوو وەزیری ناوخۆی رژێمی سووریا و ئێران لیوا بساو عەبدولحەمید لە گەڵ سەرکردەی هێزی ئاسایشی ناوخۆی ئێران عەمید ئیسماعسل ئەحمەدی رێکەوتن لە سەر فراوانکردنی – هاوکاری هاوبەشی نێوانیان و

بەهێزکردن و بەرەو پێشبردنی ئەو رێکەوتنامەی کەلە نێوانیان مۆرکرا – .

٢٠٠٦/١١/٣ لـە مـاوەی کۆنگرەیـەکی رۆژنامەوانیـدا لـە شـاری بـــەیروتی پایتـــەختی لوبنـــان – هاوپـــەیمانان پارتـــە نیـــشتیمانیەکانی لوبنانی راگەیاندرا لە ژێر دروشمـــی لـــە رێگـــای



هەڵسان بە دامەزراندنی بەرەیەکی بەرفراوان لـە پێنـاو دەرچوونی نیشتیمان کە ئەم پارتانـەی لـە خۆ دەگرت – پارتی سووری نەتـەوەیی کۆمەڵایـەتی – پـارتی پێشکەوتووی لوبنـانی عـەرەبی سۆشیالیستی – پـارتی یەکیـەتی – رێکخـراوی رێکخستنی ناسری – جووڵانـەوەی ناسریەکان – جووڵانـەوەی گـەل – جووڵانـەوەی ناسـری بیٚ لایـەن – جووڵانـەوەی لوبنـانی عـەرەبی – پـارتی دیمـوکراتی گـەل لـە پێنـاو بـەرگری کـردن بـە هەڵنەگیرسـانی شـەڕی ناوخۆ و چەسپاندنی ئاشتی و ماوەنەدان بە دەست تێوەرنەدانی دەرەکی لـە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١١/٤ راپرسـیەکانی ئـەم دواییـەی نیگـاراگوا ئـەوە دەردەخـەن کـەوا پێدەچێت لـە کێبڕکێـی هەڵبژاردنـــەکانی ســـەرۆکایەتی نیگـــاراگوا دانیێـــل ئورتیگـــای ســـەرکردەکانی چـــەپرەوەکان لـــە دژی رکابەرەکـــەی ئـــەدواردۆ ئۆرتیگـــا سەرکەوتن بەدەست بێنیٚ ... دانێل ئۆریگا – شایانی باسە لـە ساڵی ١٩٧٩ لە هەڵمەتێکیدا دەستی بە سەر زەوی دەووڵەمەندەکاندا گرت و بەو هیوایەی کە کۆتایی بە سیستەمی سەرمایەداری لە وولاتەکە بێنیٚ .

٢٠٠٦/١١/٤ سەرۆکی فەنزویللا هۆگۆ شاڤێز جارێکی دیکە هەرەشەی راگرتنی نەوتی لـە ئەمەریکا کرد ، ئەگەر هەوڵی رووخـانی حکوومەتەکـەی بـدات لـە ئاکامی ئـەو هەڵبژاردنـە نـەنێت ، کـە بـەو هۆیـەوە جـارێکی دیکـە بـۆ پۆسـتی سەرۆکایەتی هەڵبژێردایەوە .

هەروا ئەوەشی روونکردەوە کە بەرهەڵستکارانی حکوومەتەکەی بە پاڵپشتی ئەمەریکا پیلان لە دژی دەگێریٚ بە پاڵپشتی ئەمەریکا .

٢٠٠٦/١١/٥ ئەو باو بارانەی کە ناوچەی سمێلان و بلێی سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان گرتەوە زەرەرو زیانی ماددی پێکەوتووە ، کە لە ئەنجامدا تەواوی گووندی بلیَ خاپوور بووە ، کە ١٥٠ سەر حەیوان و ٢ تراکتۆر و ٤ ئۆتۆمبیل و ، جگە لە خانووبەرەو کێڵگەو سامانی دیکە ، کە ئەو زیانە مەزەندە دەکرێت بە لە ٩٠٪ لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١١/٥ لە یەکیَ لە گۆرەپانەکانی شاری مۆسکۆی پایتەختی رووسیا بە سەدەها کەس لە راستڕەو و نەتەوەییەکان بریاری قەدەخەکردنی خۆپیشاندانیان لەلایەن



پارێزگای مۆسکۆ رەتکردەوە ... ئەم خۆپیشاندانە دژی پەناهەندە کۆچبەرەکان سازکراو تیایدا هەندێکیان دروشمی ئایینی و هەندێکی دیکەیان دروشمی نارەزاییان بەرزکردبووەوە دژ بەو پەناهەندانە . لە لایەکی دیکە وەك کاردانەوەیەك لە دژی ئەم رەفتارەی راستڕەوەکان ، چەپرەوەکان هەڵسان بە خۆپیشاندان وتێیدا دروشمی – من رووسیم – کەواتە فاشی نیم – یان بەرزکردەوە.

شایانی باسە لە ماوەی ٥ساڵی رابردوو راستڕەوەکان چەندین خۆپیچشاندانیان لە دژی هاتنی پەناهەندەو کۆچبەران بۆ رووسیا رێکخستبوو تا ئەم مێژووە نزیکەی ٤٠ کەس گیانیان لەدەستداوە و بەسەدا کەسیش زامدارکراون .

٢٠٠٦/١١/٥ وەزیـــری دەرەوەی تورکیـــا – عەبـــدوڵڵا گـــوول – لــــە چـــاوپێکەوتنێکیدا لـــــە ڕۆژنامەکانی تورکیادا چەندین ووتـــەی لـــە ســـەر بـــاری کوردستان و کـەرکوک و ناوچە بەعەرەبکراوەکان و دابراوەکـان و ئێـــراق کـــرد کـــە ئاژانـــسی ئاسیۆشـید پـرێس ووتـەکانی گوولی بەم جۆرە بڵاوکردۆتەوە



. دابەشکردنی ئێراق دەبێتە هۆکاری ئاژاوەو خوێنرشتنی زیاتر .

ئەمـە بـە پێـچەوانەی ئەوانـەی کـە پێیـان وایـە دابەشـکردنی ئێـراق دەبێتـە هۆکاری کۆتایی پێهێنان بەو ئاژاوەییە ، لەم بارەوە گوول گووتی :– نـابێ هەرگیز بیر لەو ئەلتەرناتیفە بکرێتەوە لە بەر ئەوەی ئێراق بەرەو ئاژاوەیـەکی تازە دەبات ئاسیۆشید پرێس نووسیویەتی :–

تورکیـا کـە سـنوورێکی هاوبەشـی لەگـەڵ ئێراقـدا هەیـەو ژمارەیـەکی زۆری هاووڵاتیانی کوردی تیایە ... ترسی ئەوەی هەیە سەربەخۆیی کوردسـتان لـە ئێراقدا ببێتـە هانـدەرێك بـۆ کوردەکـانی تورکیـا و کوردسـتانی سـەربەخۆش ببێتـە پاڵپـشت بۆیـان ، هەربۆیـە گـوول دەڵێـت :– لـە کـاتی دابەشـکردنی ئێراقدا دراوسێکان دەستە وەستان نابن و سەیری بارودۆخەکە بکەن ، لـە بەر ئـەوەی ئـەم کێشەیە تـەنیا کێشەی ئێـراق نابێـت و دەبێتـە کێشەیەکی هەرێمی ناوچەیی و جیهان .

لە بارەی هەرەشـەکانی بۆسـەر هـەرێمی باشـووری کوردسـتان و گەرانـەوەی شاری کەرکوك بۆسـەر هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، گـوول ئامـاژەی بـەوە کـرد کـە نـابێ لـە سـەر خـەونی کوردسـتان بـەردەوام بێـت ئەنکـەرە رەخنـەش لـەوە دەگرێـت ، کـە لـە نەخشەی کـورد سـەبارەت بـە شـاری کـەرکوك واتـە سـەرۆکی دبلۆماتکـاری تورکیـا گـوول دان بـە پێکهاتـەکان و دەسـتووری هەمیـشەیی ئێـراق و ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی هەڵبـژێردراو حکوومەتەکـەی

ئێراق نانێت .

٢٠٠٦/١١/٦ لە ژێر چاودێری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان لە هۆڵی میدیا لە شاری هەولێری پایتەخت لە ژێر دروشمی – یەکگرتن و سەربەخۆیی ئۆلۆمپی شاری پێشکەوتنی وەرزش – کۆنگرەی یەکگرتنەوەی هەردوو لێژنە و ئەنجوومەنی ئۆلۆمپی کوردستان گرێدرا – بە ئامادەبوونی شارەزاو کەسایەتی کورد و بەرپرسانی حکوومی و پارتی و رووناکبیران و وەرزش وانان لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١١/٦ رێکخراوی ترانسپێرێنسی ئینتەر ناشنال ، کە رێکخراوەیەکی ناحکوومی بە هێزی جیهانیەو بنکەی سەرەکی لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیایە , ئەم رێکخراوەیە لە ساڵی ١٩٩٣ دامەزراوە ... کار بۆ بنبرکردنی گەندەڵی لە جیهاندا دەکات ... ساڵانەش راپۆرتێك لە سەر ئاستی گەندەڵی لە نێوو ژمارەیەکی زۆر وولاتاندا دەکات ، کە تێیدا ئاستی گەندەڵی ١٦٣ وولاتی جیهاندا ئاشکراکرد و بە پێی ئەو راپۆرتە ، کە ئێراق لە خانەی ١٦١ ی لیستەکەدا جێی گرتووە ، واتە ئێراق لە پلە سێی گەندەڵیە لە جیهاندا .

٢٠٠٦/١١/٦ بڵاوکردنەوەی راسپاردەی گروپی لێکۆلینەوەی ئێراق کە لە راپۆرتەکەی – بیکەر – هاملتۆن – داهاتبوو ... راسپاردەکەی لە ٧٩ راسپاردە پێکهاتبوو ... لە هەمان کات ئەم راسپاردانە داوا لە ئیدارەی حکوومەتی ئەمەریکا بە سەرکردایەتی جۆرج بۆش دەکات ، کە لە ٢٠٠٦/١٢/٣١ دەکات کە لەگەڵ حکوومەتی ئێراق هەڵمەتێکی تازەی دبلۆماسی دەست پێبکات ، لە پێناو مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی ئێراق و ناوچەکەدا .

جێگەی دیاریکردنە کە لە خاڵی /٣٠ دا لە بارەی پارێزگاری کەرکوکدا هاتووە ئەمەیە :–

لە ژێر رۆشنایی ئەو بارودۆخە مەترسیدارەی کە لە کەرکوك هەیە ،

پێویستی بە ناوبژیوانی نێوو دەوولەتی هەیە بۆ دوورکەوتنەوەی لە توونـدو تیـژی تـایفی ، کـەرکوك لەوانەیـە ببێتـە بەرمیلـە باروتێـك ، بـە ئەنجامـدانی راپرسی لە سەر چارەنووسی کەرکوك هەر وەك لە دەستوور هاتووە کە پێش کۆتـایی سـاڵی /۲۰۰۷ راپرسـی لـە سـەر بکرێـت ، ئـەوا ئـەو بەرمیلـە دەتەقێتـەوە ، هـەر بۆیـە پێویـستە جیّ بـەجێکردنی دوابخـریّ ، دەبێـت ئـەو کێشەیە لە چوارچێوەی کاری دبلۆماسیدا بخرێتە سەر خشتەی کارەکانی – کۆمەڵەی نێوودەوولەتی هاریکاریکردن لە ئێراق .

هـەروا لـە بارەی پرۆگرامـی حکوومـەتی مـالکی و هەڵبـژاردنی ئەنجوومـەنی پارێزگاکان و چاوخشاندنەوە بە دەستووری ئێراق ، کە لـە خاڵـەکانی ٢٦ – ٢٧ – ٢٨ – ٢٩ باسی لێوە دەکات ... هەروا ئەو راسپاردانە چەندین لایەنی دیکە دەکاتە پێنووسی راسپاردەکەیان ، لە ئێراق و ، ئێران و ، سووریا و ، توورکیا و ، وولاتـانی دیکـەی دراوسێی ئێراق ... کە ئەم راسپاردانە بووە جێگـەی سـەرهەڵدانی نـارەزایی گـەلی کوردستان و چـەندین لایـەنی دیکـەی ئێـراق و وولاتـانی ناوچـەکە ، لـە هـەمان کـات بـووە جێگـەی دڵخۆشـکەری هەندیّ وولاتی دیکە ، بە تایبەتی وولاتانی دراوسێی ، ئێراق و ، تورکیا لـە سەر باری پارێزگای کەرکوك .

هەرچـەندە ئـەو راسـپاردانە کـاری جیّ بـەجێکردنی بـە دەسـتگیرنەبوونە لـە لایـەن حکوومـەتی ئەمـەریکا و شـێوەی یاسـایی خـۆی نەگرتـە کارەکـان لـە ئێراق و ناوچەکەو ئیدارەی ئەمەریکادا .

۲۰۰٦/۱۱/۷ کۆچـی دوایـی گـەورە مۆزیکـای سینەمایی – بـازل پۆلیـدۆریس – بـە هـۆی نەخۆشـی شـێرپەنجە ... کە لـە مـاوەی ۳۰ سـاڵدا ئـەو خزمەتـەی پێشکەش کردووە .

شـایانی باسـە ئـەو هونەرمەنـدە لـە سـاڵی ۱۹٤٥ لـە شـاری کـساس سـیتی هاتۆتە دنیاوە .

۲۰۰٦/۱۱/۷ راپۆرتە هەواڵەکان ئاماژە بە بەرەوپێشچوونی ووتووێژی نێوان حکوومـەتی نیپـال و بەرهەڵـستکارە ماویـەکان دەکـەن ، کـە بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشە سەرەکیە هەڵواسراوەکانی نێوانیان بەرێکەوتنێك گەیشتوون .

شایانی باسە کە ماوەی ۱۰ ساڵ زیاترە شەڕو کوشتار لە نێوان هـەردوو لادا بەردەوامە ، کە بۆتە هۆی کوژرانی زیاتر لـە ۱۳۰۰۰ هـەزار کـەس ، لـە پاش

راپەرینـە جەماوەریەکـەی پـێش دوو مـانگی رابـردوو لـەم وولاتـە گفتووگـۆ لەنێوانیاندا هاتۆتە ئاراوە .

هــەر ئــەو راپەرینــەش گیاننــدای پاشــای وولاتەکــەی ناچــارکرد واز لــە فەرمانرەوایی راستەوخۆی ئەو وولاتە بێنێت و حکوومەتێکی بنکە فراوان لە پارتەکان دابمەزرێنێت ... پەرلەمانی ئەم وولاتـەش بە تێکرایی دەنگ لـە هـەنگاوێکی بوێرانـەدا رژێمـی علمانیـەتی راگەیانـد کـە پێـشتر تاکـە مامەڵـە لەگــەڵ هیندۆســیەکان بــوو لــە جیهــان و ئاســتێکیش بــۆ دەســەلاتە بەرفراوانەکەی پادشای ئەم وولاتەداناو تەنیا وەك هێمایەك مایەوە .

٢٠٠٦/١١/٨ بەرەی تەوافقی مەزهەب سوونـنەی عەرەبی ئیسلام هەرەشەی چەك هـەڵگرتن و کشانەوەی لە پرۆسەی رامیاری ئێراق راگەیاند ... شایانی باسە لیستی بـەرەی تـەوافقی ئێراقـی کـە گـەورەترین لیـستی عـەرەبی سـوونـنەیە لـە نـاو ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێـراق هۆشـداریدا بە حکوومـەتی ئێـراق ، گـەر ئـەو داوایانەی کە پێشکەشیکردووە جیٚ بەجیٚ نەکرێت بە تایبـەتی لـە هەمبـەری هاوسەنگی لە دانانی پۆسـتی دەزگاکـانی وولات ... کـە ئـەو داوایانـەش دوو هەفتـە بـەر لـەو مێژوونامەیە ئاراسـتەی لایەنـە رامیاریـەکانی دیکـەی کـردوو هاوسـەنگی لـە پۆسـتەکانی دەسـەلات و هەڵووەشـاندنەوەی میلیـشیاکان و تەنیا چەك لە دەست دەووڵەت بێت .

٢٠٠٦/١١/٨ حکوومـەتی دانیمـارك داخوازیـەکانی رژێمـی تورکیـای رەتکـردەوە سـەبارەت بەداخـشتنی کـەناڵی تەلـەفزیۆنی رۆژ تـی ڤـی کـوردی ، کـە لـە وولاتەکـەی پـــەخش دەکرێـــت ... حکوومـــەتی تورکیـــا چـــەندین بەڵگـــەی پێـــشکەشی دانیمـارك کـردووە سـەبارەت بـەوەی ، کـە کـەناڵی رۆژ تـی ڤـی هـەوڵی ئـەوە دەدات تیرۆر لە تورکیا پەرەبسەنیٚ ... بەلام حکوومەتی دانیمارك بروای بـەو بەڵگانەی تورکیا نـەکردووەو داوای لـە حکوومـەتی تورکیـا کـرد بەڵگەنامـەی بروا پێکراو پێشکەش بکات .

٢٠٠٦/١١/٩ لـــــە دوای هـــــەوڵ و توانایـــــەکی زۆر لـــــە گفتووگـــــۆی نێـــــوان ڕووســـــیاو وولاَتـــــانی عـــەرەبی و بـــە ئـــەنجام گەیانـــــدنی ئـــــەم گفتووگۆیەو ئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی ، کە مانگی دەستکرد لە سەر پشتی موشەکێکی ڕووسی لە بنکەی گەردوونی – بایکانوور – لە کۆماری کازاخستان بەرەو ئاسمان رەوانەکرا ، لە پێناو بەهێزکردنی بواری گەیاندن و پەیوەندی بە ناوی – مانگی دەستکردی بەدر /٤ ، کە لە سەر هەژماری دەزگای عەرەبی بۆ گەیاندنی گەردوونی – ئەرەبسان – دوای ئەوە لە ڕاگەیاندنێکی هەردوو ئاژانسی – ئیتارتاس و ئەنترفاکس – ڕووسیا ، کە ئەو مانگە دەستکردە دەتوانێ پەخش و گەیاندنەکانی بگاتە باشووری ئەفەریکحیاو ڕۆژهەلاَتی ناوەراست و هەندێك بەشی لە ئەورووپای ڕۆژهەلاَت لە جیهاندا .




٢٠٠٦/١١/١٠ لێژنـــەی ڕێکخستنی کار لە نێوان پـــارت و دەزگاکـــانی گـــەلی – کلـــدان – ئاشـــوور – ســـریان – یاداشـــــتنامەیەکیان ئاراســـتەی ئەنـــدامانی لێژنەی دارشتنی دەستوور کرد ، لە هەرێمی باشووری کوردستاندا ، کە پانزە خاڵی لەخۆ گرتبوو ، لێژنەکە داوا دەکەن ئاماژە بەکوشت و بری نێوان ساڵەکانی ١٩٢٣ – ١٩٦٩ بکرێ و ناویان بەکلدانی ئاشووری سریانی بهێنرێ و بە ڕوونی مافی ئۆتۆنۆمی لە دەستووردا ئاماژەی پێبدرێ ، هاوکات داوا دەکەن کە ڕۆژی یەکی نیسانی هەموو ساڵێك – کە جەژنی سەری ساڵی کلدانی ئاشوور سریانیەکان – بکرێ بە پشووی رەسمی لە

هــەرێمی كوردسـتان لـە دەسـتووردا ، هـەروا یاداشـتنامەكە دوای چـەندین كۆبوونەوە لە نێوان پارت و دامـەزراوە كلـدانی و ئاشووری و سـریانیەكانی هـەرێمی كوردسـتان سـەبارەت بـە تێبینیـەكانیان و بیروبۆچوونیان لـە مـەڕ پـرۆژەی دەسـتووری هـەرێمی كوردسـتان و دوا جـار نوێنـەری هەریـەك لـە پـارتی نیـشتیمانی ئاشـووری و رێكخـراوی كلـدانی ئاشـووری و پـارتی كۆمۆنیستی كوردستان و سەكۆی دیموكراتی كلدان و كۆمەڵەی رۆشنبیری كلـدانی و پـارتی بێـت نـەهرێنی دیمـوركراتی یاداشـتنامەكەیان مـۆركردو ئاراستەی لێژنـەی دەسـتووری لـە پەرلـەمانی هـەرێمی باشـووری كوردسـتان كرا .

٢٠٠٦/١١/١٢ دەست پێكردنی پرۆسەی دەنگدان لە ئۆنوسیتیای باشوور بۆ سـەربەخۆیی هەرێمەكـە بـۆ بەشـداری كـردن لـە ریفرانـدۆمی سـەربەخۆیی ئۆسـیتیا ... ئۆسـیتیای باشـوور لـە سـاڵی ١٩٩٢ سـەربەخۆیی خـۆی لـە گورجـستان راگەیانـد دوای شـەڕێكی كـورت بـە هـۆی نـەبوونی بـە بەشـێك لـە یـەكێتی ڕووسـیا ، یەكیـەتی ئـەوروپا و ، پـەیمانی نـاتۆ ، رەخنەیـەكی توونـدیان لـەم ریفراندۆمە گرت و بەهۆكارێكی توندوتیژیان دانا .

شـایانی باسـە هاووڵاتیـانی ئـەو هەرێمـە تـاكو ئێـستا پاسپۆرتی ڕووسـیا هەڵدەگرن و رۆڵی ڕووسیا بە كاردێنن ، بەڵام زمانەكەیان جیاوازەو نزیكە لـە زمانی فارسی لە ناوچەكەدا .

**تێبینی:- لـــە جێگەی دیكە بە شێوەیەكی تێروو تەسەل باسی هەدوو هەرێمی ئۆسیتیاو ئەبخازیا كراوە لە بەرگەكانی پێشوو لەگەڵ نەخشەی هەرێمەكان لە بەرگی سێیەمدا .**

٢٠٠٦/١١/١٢ دەسـتپێكردنی كۆبوونـەوەكانی لوتكـەی ئاسـیا و ئۆقیانووسـی هـێمن لـە شاری هانۆی پایتەختی ڤێتنام ، كە ماوەی یـەك هەفتـە دەخایـەنێ و تیایـدا بـاس لـە پەیوەندیـەكانی بازرگـانی نێـوان وولاتـانی ئاسـیا و ئۆقیـانووس دەكرێت و چاوەروان دەكرێت یەكێك لە راسپاردەكانی لـە دوا رۆژدا بەسـتنی كۆنگرەیەك بێت لە بارەی ئەزموونی ئۆتۆمیی كۆریای باكوور .

٢٠٠٦/١١/١٢ سـەرەك وەزیرانــی بۆسـنیا – عـەدنان ئـازریجی – دووپـاتی كـردەوە كـەوا دەووڵەتی سربستان لـە نێو بۆسنیا دانامـەزرێت و بۆسنیا بـە یـەكگرتوویی

دەمێنێتـەوە ، ئـارزیج سـربەکانی بـەوە تاوانبـارکرد . کـە هـەردەم تەگـەرە دەخەنـە بەردەم ئەو چاکسازیان کە یەکێتی ئەوروپا داوایدەکات و هـەموو لایـەك کـۆکن لـە سـەر یـەکبوونی خـاکی بۆسـنیا ، بـە تایبـەتی ئەمـەریکا و وولاتە زلهێزەکان ... داواشی کرد کەوا هەموو هاوولاتیانی بۆسنیا بەرگری لە وولاتی خۆیان بکەن لە دژی سربەکان و بۆسنیا .

٢٠٠٦/١١/١٤ کۆبوونـەوەی لێژنـەی هەڵسـەنگاندنی بـارودۆخی ئێـراق بـە سـەرۆکایەتی - جـیمس بیکـەر - و - لـی هـاملتۆن - لـە هـەردوو پـارتی کۆمـاری و ، دیموکراتی و ، ئەندامانیش ، کۆندۆلیزا رایس و ، جۆن هایدن و ، جۆرج نیگرۆ پۆنتی و ، مایکل هایدین و ، زەلمای خەلیلزاد ، لە گەڵ جۆرج بۆش ، لە کۆشکی سپی لە شاری واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا ئەنجامدرا ، کە لەو دیدارە داوا لە جۆرج بۆش کرا کە هەنگاوی کارا بنرێت .

ئـەویش بـە دانـانی پرۆگرامێکـی گونجـاو و لـە بـار بـۆ هێورکردنـەوە و بـەرەو باش بردنی باری ئێراق لە سەر شێوازی رژێمی دیموکراتی لە ئەمەریکا لە رۆژهـەلاتی ناوەراسـت بـە ئێراقێکـی دیموکراتی فیدراڵی لـە هـەموو بـوارە جیاکان و کاردانەوەی لەسەر ناوچەو هەرێم.



٢٠٠٦/١١/١٦ لـەو کاتـەی کـە - مـەحمودی ئەحمـەدی نـەژاد - ی سـەرۆك کۆمـاری ئیسلامی لـە ئێـران و لـە زانکۆی - ئەمیرکەبیر - لـە تارانی پایتـەختی ئێـران ووتـاری پێـشکەش دەکـرد بـۆ قوتابیـانی زانکۆکـە و قوتابیـانی ئامادە بـوو ووتاری ئەحمـەد نـەژادیان بـری و بـە دەنگـی بـەرز دروشـم لـە دژی نـەژاد دەڵێنـەوە ، بـە تایبـەتی لـە دروشمـەکانیان داوای مردنـی دکتـۆر ئەحمـەدی نـەژادیان دەکـرد ... دوای ئـەوە شـەرو پێکـدادان لـە نێـوان قوتابیـانی دژ بـە دەسـەلاتی نـژاد و هاوپـەیمانانی نژدا لـە گۆرەپـانی زانکۆکـە بـەرپابوو . بـەو هۆکـارە سـەرەك کۆماری ئێران ووتارەکەی بری و ئەو کەسانەی بە کەمینەی ستەمکار دانا .

جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە ئـەو ڕووداوە دوای ئـەوە هـات کـە لـە ١١/١٥ سەدان قووتـابی سـەر بە باڵی چاکسازیەکان لە زانکۆی – ئـەمیر کـبیر – لـە شـاری تـاران خۆپێـشاندانیان دژی چەوسـانەوە سـازکرد و بـە دەسـەڵاتی داپلۆسێنەریان لە قەڵەمدا ، کە لەو زانکۆیە دوو چاری بوونەتەوە ... هـەروا لـە چـەندین زانکـۆو پەیمانگـەکان لـە شـارەکانی ئێـران دەنگـی نـارەزایی بـەردەوام دژی دەسـەڵاتی بـە نـاو ئیـسلامی لـە ئێـران ، بـە تایبـەتی لـە ناوەندەکانی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان .

سەرچاوە :– ئاژانسی هەواڵی نیمچە فەرمی فارسی .

٢٠٠٦/١١/١٧ سەرەك کۆماری پێشووی ئێران – محەمەد خـاتمی – لـە کـاتی سـەردانەکەی بۆ تورکیا ، کە تەلەفزیۆنی ئێن تیڤی تورکی لێدوانەکەی محەمەد خاتـەمی بڵاوکردەوە کە گووتی :– چارەسەرکردنی کێشەی پەکەکە لـە کوردستـانی تورکیا تـەنها بە ڕێگـای سەربازی چارەسەرناکرێت . خاتـەمی گـووتی :– پێویـستە کێـشەکانی گـەلی کـورد لـەو وولاتانـەی کـە تێیـدا دەژیـن چارەسەربکرێت و داواکانیان جێ بەجێبکرێت .

٢٠٠٦/١١/١٧ لـە ڕاگەیاندنێکیانـدا – پـارتی نیـشتیمانی ئاشـووری و ڕێکخـراوی کلـدۆ ئاشـووری – لـە پـارتی کۆمۆنیـستی کوردسـتان و پـارتی بێـت نـەهرێن و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کلدانیەکان – داوایان لە حکوومەتی هـەرێمی باشووری کوردسـتان کـرد ... بـە پێـدانی دانیـشتووانی مەسـیحیەکانی ڕۆژهـەڵات و باکووری پارێزگای مووسڵ بە ماڤی ئۆتۆنۆمی و ، لـە هـەمان کـات داوایـانکرد کـە ئـەو ناوچـانەی دەکەونـە نـاو سـنووری هـەرێمی باشووری کوردسـتان بگەڕێندرێتەوە سەر حکوومەتی کوردستان .

هەر بەم بۆنـەش ئەو پارت و ڕێکخراوانـە یاداشتێکیان ئاراستـەی پەرلـەمانی هەرێمی باشووری کوردستـان کـرد ... بە دەسـت گیربوونیـان بـە دەسـتووری هەرێمی باشووری کوردستان و بەو سنوورەی کـە نەخشـەی کێشاوە بـەپێی بەڵگەنامە مێژوویی و جووگرافیەکان و گەڕاندنەوەی ناوچەی نەینەوا بۆ ژێر دەسەڵاتی کوردستـان .

هەروا داوایـان لـە پەرلـەمانی کوردستـان کرد بـە هـەمووارکردنی ئـەو برگـەو ماددانـەی کـە پەیووەنـدن بـە کلـدانی و ئاشـووری و سـریان هەیـە لـە سـەقامگیری دادپـەروەری و لـە هـەمان کـات داوایانکرد بـە چەسپاندنی ئـەو

ماددەو برگانەش لە دەستووری ئێراق ، لە پێناو دڵنیا بوون لە داهاتوویان لـە هـەموو بوارەکـانی رامیـاری و ئـابووری و نەتەوایـەتی و ئـاییینی و رۆشـنبیری لـە وولاتەکـەدا ... لەگـەڵ چـەندین بـیروو بۆچـوونی دیکـە لـەم بوارانەدا .

٢٠٠٦/١١/٢١ کۆچـی داویـی دەرهێنـەری سـینەمایی ئەمـەریکی – رۆبـەرت ئالتمـان – لـە یەکێ لە نەخۆشخانەکانی لۆس ئەنجلۆس لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا .
شایانی باسە دەرهێنەری سینەمایی ئەمەریکی لە ساڵی ١٩٢٥ لە کەساس سیتی لە ئەمەریکا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

٢٠٠٦/١١/٢٥ وەزیـری دەرەوەی ئـەرمینیا – فارشـان ئۆسـکانیان – لـە سـەردانەکەی بـۆ قـووبرس دەسـتی درێـژکرد بـۆ تورکیـا ، لـە پێنـاو ئاسـایی کردنـەوەی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو وولات ، وەکو پیشەیەك بۆ رێکەوتنی سیاسی لە سەر بابەتی کۆمەڵکوژی ئەرمەنیەکان ، کە لـە سـەدەی ٢٠ روویدا لـە گـەڵ ئەوەشـدا رایگەیانـد ، کـە مەبەسـت داننـان بـۆ تورکیا بـۆ کۆمەڵکوژەیەکـەی مـەرجی پێـشینە نیـە بـۆ دامەزرانـدنی پەیووەندیـەکی سروشـتی و دراوسێیەتی چاك لە نێوان هەردوو وولاتدا .
شایانی باسە رژێمی تورکیا پەیووەندیەکانی دبلۆماسی لە گەڵ ئەرمینیای دراوسـێ نیە بـە هـۆی ناکۆکیـەکانی لـە سـەر قەسـابخانەی ئەرمەنـەکان لـە ساڵانی ١٩١٥ – ١٩١٧ لە ژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

٢٠٠٦/١١/٢٥ پاپـای فاتیکـان – پاپـا بنیـدلکتی شـانزەهەم – یارمـەتی بـۆ ناوچـە کوردنشینەکانی باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیاوە دەدات ، بـە هـۆی ئـەو لافاوانـەی کـە لـە بەرواری ٢٠٠٦/١١/٥ لـە تورکیـاو کوردسـتان روویـدا و داوای کـرد ئـەو یارمەتیانـە بـەبێ جیـاوازی دابـەش بکرێت بەسەر لێقەوماوان لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١١/٢٥ هێزەکانی سووپای رژێمی ئێران سنووری باشووری کوردستانیان لە سەر سنووری پارێزگای سلێمانی بەزاندو بە نیازی پەلاماردانی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان p.k.k بوون لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١١/٢٥ لە هەڵبژاردنـەکانی ئەنجوومـەنی شـارو گووندەکانی رۆژهـەڵاتی کوردسـتانی داگیرکراوی ژێر دەسـەڵاتی ئێـران ، سـەدان هاووڵاتی کورد ئامادەی خۆیـان

راگەیانـدبوو ، بـەڵام زۆربەیان رێگـەیان پێنـەدراو تـا ئێـستاش هۆكارەكـەی دیار نیە ... ژمارەی ئەو كەسانەی خۆیان بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ئێران ، لـە شـارو گونـدەكانی پـاڵێوراو بـوو رێگـەیان پێنـەدرا بـە شـداری لـەم هەڵبژاردنە بكەن و مەزەندە دەكرا ، كە تەنیا لە شاری مەهاباد ٧٥٪ رێگەیان پێنەدرا ... گەرچی زۆربەی ئەندامانی پێشووی لێژنەكان كورد بوون و لـە شارەكانی دیكـەش بە هـەمان شێووە و شێواز مامەڵـەیان بەرامبـەر بە كورد كردبوو لە هەرێمەكەدا .



٢٠٠٦/١١/٢٧ لە شاری مۆسكۆی پایتەختی رووسـیای یـەكگرتوو ، كۆنفرانسێك بەناوی رووسیا و جیهانی ئیسلامی گرێدرا و لەم كۆنفرانـسە پـسپۆر و لێكۆڵـەری زۆربـەی وولاتـە ئیسلامیەكان و رۆژهـەڵاتنناس و پـسپۆرانی زانكۆكـانی رووسیا ئامادەی بوون ... كە تـەوەرێكی ئـەو كۆنفرانـسە تایبەت بوو بە پرسی كورد لە دوا رۆژی كۆنفرانسەكە ، كە ژمارەیەك بابـەتی بە پێز پێشكەش كران و هـەر لـە دوای كۆتایی كۆنفرانسەكە دكتۆر ناسح غەفور نوێنەری هەرێمی باشووری كوردستان ئامادەی بوو ، لـە هـەمان كات و لـە رۆژی ٢٠٠٦/١٢/٦ میـدالیای پتـەوكردنی پەیوەندیـەكانی رووسـیا و كوردستانی پێ بەخشرا .

٢٠٠٦/١٢/٢ پرۆسەی هەڵبژاردن لە سلۆڤاكیا دەستی پێكرد بۆ هەڵبـژاردنی ئەنجوومـەنی شـارەوانیەكان ، لـەم پرۆسـەیەدا كۆمـەڵ و گروپـە رامیاریـەكان بـە ١٢٧٦ پاڵێوراو بەشداری پارتە رامیاریەكانی دیكـەش ، كە بەشێوەی تـاك دابـەزی و ٣٨٥٩ پاڵێوراویان هەیە ، هەر لەم پرۆسـەیەدا پراتیسلاڤای هاووڵاتیـانی پایتـەخت پارێزگـار و ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی شـار هەڵدەبـژێرێت جگـە لـە ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانی ، بە پێی دوایین هەوالیش پرۆسـەكە بـەبێ

گرفت بەڕێوەچوو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/٢ لێژنەی سەرپەرشتکارانی خەلاتەکانی -- بۆلتیەرز -- بۆ ڕوژنامەگەری ڕایگەیاند ، دوای ٢٦ ساڵ و دوا بە دوای ئاشکرابوونی بریاریاندا وێنەگرێکی ئێرانی خەلات بکەن ... جیهانگیر ڕەمزی ئەو وێنەگرە ئێرانیە بوو ، کە لە مانگی /١٩٧٩/٨ وێنەی لە سێدارەدانی ١١ بەندکراوی ئێرانی لە ڕۆژنامەیەکی ئێرانی بلاوکردەوە ، بە بێ ئەوەی ناوی وێنەگرەکە ئاشکرا بکرێت بە مەبەستی پاراستنی گیانی وێنەگرەکە .

کە دواتر ئەو وێنەیە لە هەموو ڕۆژنامە جیهانیەکان بلاوکراوە و خەلاتی دەزگای ڕۆژنامەگەری پۆلتیەدزی ١٩٨٠ ی بە دەست هێنا ، بەبێ ئەوەی خاوەنەکەی دیاربێت لە لایەن خۆشیەوە -- سیگ گیسلەر -- ی بەرپرسی خەلاتەکانی پۆلیتەرز ئاشکرای کرد ، کەوا لە سەر داوای ڕەمزی خۆی ناوەکەی ئاشکراکراوە و داوەتنامێکیان ئاراستەی ڕەمزی کردووە تاکو لە ئاهەنگی دابەشکردنی خەلاتەکانی ٢٠٠٧ ئامادە بێت کە لە مانگی/٢٠٠٧/٣ ئەنجام دەدرێت .

٢٠٠٦/١٢/٣ ئەندامی مەکتەبی سیاسی و جێگری سکرتێری گشتی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان ، نەشیروان مستەفا ، دەستی لە کاری پارتایەتی لە یەکیەتی نیشتیمانی کشاندەوە ، دوای ٣٠ ساڵ لە خەبات ، ئەویش بە هۆی کێشەی نێوان ئەندامانی سەرکردایەتی یەکیەتی ، بە تایبەت لە دوای هەڵبژاردنەکان لە مانگی ٢٠٠٦/١٠/١١ .

٢٠٠٦/١٢/٥ بە هۆی بارودۆخی باری پارێزگای کەرکوک و ناوچە لێدابراوەکانی و جێ بەجێ نەرکردنی ماددەی/١٤٠ ی یاسای هەمیشەیی ئێراق ... پارت و ڕێکخراوە کوردستانیەکانی پارێزگای کەرکوک بیرخەرەویەکیان ئاراستەی لێژنەی بیکەر – هاملتۆن کرد ، لە بارەی چارەسەرکردنی ڕەوشی کەرکوک و

داخوازیەکانی پارێزگاکە ، کە ١٦ پارت و ڕێکخراوی کوردستان لە کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشووری ... کە ئەم کۆبوونەش لە بارەی کۆمیتەی ناوخۆی پارتی و کۆمۆنیستی کوردستان بوو لە پارێزگای کەرکوك لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٦/١٢/١٠ جێگری سەرەك کۆماری ئێراق – تارق ئەلهاشمی – لە سەر داوەتێکی رەسمی لە لایەن ئەمەریکا گەیشتە شاری واشنتۆن و چاوپێکەوتنی لە گەڵ سەرۆکی ئەمەریکا – جۆرج بۆش – ئەنجامدا ، لە بارەی باری ئێراق و دۆزینەوەی ڕێگە چارەی پەیووەندیە ناوخۆیی و ناوچەو هەرێمەکان .

٢٠٠٦/١٢/١٠ دوای بڵاوبوونەوەی راپۆرتی لێژنەی بیکەر – هاملتۆن ، هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد بەرامبەر بەو راپۆرتە ... بیتەر گالیرێس دیبلۆماتی پێشووی ئەمەریکا داوای لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان کرد ئەگەر پێشنیارەکانی لێژنەی ناوبراو لە ئێراقی فیدراڵ جێ بەجێکرا ، ئەوە هەموو پەیووەندیەکانی لە گەڵ حکوومەتی ناوەندی رابگرێت .

راپۆرتەکەی بیکەر – هاملتۆن ٩ خاڵی سەبارەت بە ئێراق و دراوسێکانی لەخۆ گرتووە .

سەبارەت بە کوردستان راپۆرتەکە لە راسپاردەی ژمارە/٣٠ دا داوای دواخستنی ماددەی/١٤٠ ی دەستووررو راپرسی لە سەر کەرکوك دەکات و چارەسەرکردنی بەناوبژیوانی نێوو دەووڵەتی و بە گروپی پشتگیری نێوو دەووڵەتی دەسپێرێ ، هەروا لە راسپاردەی /٢٨ یشدا ، دەسەڵاتی بەناوهێنانی کێڵگەکان نەوت لە هەرێمەکان وەردەگرێتەوە و کۆنترۆڵکردن و دابەشکردنی داهاتەکانی نەوت و حکوومەتی مەرکەزی دەگەڕێنێتەوە ، پیتەر لە لێدوانێکی تایبەت بە رادیۆی دەنگی ئەمەریکا ، داوا لە حکوومەتی کوردستان دەکات .

ئەگەر پێشنیارەکانی لێژنەی ناوبراو جێ بەجێکرا ئەوە گشت پەیوەندیەکانی لە گەڵ بەغدا رابگرێ و ریفراندۆمێك بۆ سەربەخۆیی راگەیاندووە ، کە بەیاننامەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان کاریگەری باشی دەبێت لەجێ بەجێ نەکردنی ئەم راسپاردانەو پێویستە سەرکردایەتی کورد لە سەر دژایەتی نەکردنی ئەم راپۆرتە بەردەوام بێت .

۲۰۰٦/۱۲/۱۱ لە دوای ۲٥ ساڵ لە دابرانی پەیوەندی لە نێوان هەردوو رژێمی بەعس لە ئێراق و سووریا لە پەیوەندی دبلۆماسی و بالوێزخانەیی کە ئەمرۆ باڵوێزخانەی ئێراق لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا کرایەوە .

۲۰۰٦/۱۲/۱۱ گرێدانی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی رامیاری ئاسایشی نیشتیمانی ئێراق بە ئامادەبوونی بەرێزان – جەلال تاڵەبانی – و –– مەسعوود بارزانی – و –– مەحمود مەشهەدانی – و –– نوری مالکی – و سەرۆکی ژمارەیەك قەوارەی سیاسی و کوتلەی پەرلەمان بەشداریان تێداکرد ، گفتووگۆکان لە پێناو بەرەو باش بردنی باری ئەمنی و ئیداری و پرۆژەو هەنگاونان بەرەو پێشەوە .

۲۰۰٦/۱۲/۱۱ وەك هەڵوێستێك دژ بە راپۆرتەکەی بیکەر – هامیلتۆن تەواوی پارتە سیاسیەکانی کوردستان کە پێکهاتوون لە ۱٥ پارتی کوردستان لە بارەگای لقی /۲ پارتی کۆبوونەوە لە هەولێر .

۲۰۰٦/۱۲/۱۱ دەنگدانی هەرێمی ئاتشێی ئەندۆنسیا بۆ بەشداری کردن لە یەکەمین هەڵبژاردنی بەرپرسانی خۆجێی روویان لە سندووقەکانی دەنگدان کرد ، ئەمەش لە چوارچێوەی رێککەوتنی ئاشتی نێوان حکوومەت و جودا خوازەکانی ئاتشێی دێت ... کە لەم دواییە واژووی لەسەرکراو کۆتایی بەو ململانێیە هێنا ، کە زیاتر لە ۲۹ ساڵ کوشتاری خایاند و نزیکەی ۱٥ هەزار کوژراوی لێکەوتەوە ، بە پێی رێکەوتنەکە جودا خوازی ئاتشێی دەستەبەرداری جیابوونەوە لە ئەندونوسیابوون پاش ئەوەی حکوومەت رازی بوو ئۆتۆنۆمیان پێ بدات و مافی ئەوەیان هەبێت بەشێوەیەکی دیموکراسیانە بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکەن لە هەرێمەکەدا .

۲۰۰٦/۱۲/۱۱ مۆرکردنی رێکەوتنامەی نهێنی لە نێوان کوێت و پەیمانی باکووری ئەتلەسی بە گۆڕینەوەو پێدانی زانیاری ... بە تایبەتی زانیاری لە سەر هەردوو بواری ئاسایش و سەربازیدا ... ئەم رێکەوتنەش لەدوای دەست پێشخەریەکەی پەیمانی ئەتلەس هات ، کە لە ۲۰۰٤/٦/۳۰ کۆبوونەوەی پەیمانی ناتۆ لە شاری ئەستەمبۆڵی تورکی ئەنجامدرا .

دوای ئەوە چەندین بەرپرسانی ناتۆ بە وولاتانی کەنداودا سوورانەوەو گفتووگۆیان لەگەڵ بەرپرسانی دەسەڵاتدارانی ئەو وولاتانە ئەنجامدا .

ئەویش لە پێناو بە هێزکردنی هاوکاری لە هەموو بوارەکانی ئاسایش و سەربازی ، بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکەی ٢٠٠١/٩/١١ ، هەردوو شاری واشنتۆن و نیویۆرکی ئەمەریکی و جەنگی ئەفگانستان و ئێراق .

ئەویش بە هۆی لە بارچوونی ئارامی و ئاسایش لە و دوو وولاتەو دراوسێکان و ناوچەو هەرێمەکان لەجیهاندا ، بە تایبەتی لە کێشووەری ئاسیادا لە هەموو بوارەکانی ڕامیاری و ئابووری و بازرگانی و پەیوەندیە هەمەلایەنەکان ، لە نێوان ئەو وولاتانەو پەیوەندی لە گەڵ وولاتانی دیکەی جیهان .

٢٠٠٦/١٢/١٢ لەخوولی/٢٧ سەرانی Gcc لە پایتەختی شانشینی سعوودیە گریداو سەردانی ئەم وولاتانە بڕیاری دەرکردنی دراوێکی یەکگرتوو بۆ کەنداو لێکۆڵینەوە لە سەر توانای دەستەبەرکردنی وزەی ئەتۆمیان دەرکرد ... ئەگەرچی دەرکردنی مەسەلەی دراوی یەکگرتوو بۆ وولاتانی Gcc تازە نیە و چەند ساڵێکە چۆتە ئەجندەی کارەکانی Gcc یەوە ... بەڵام بە ئەگەرەکانی دەستەبەرکردنی توانای ئەتۆمی ئەمە یەکەمین جارە چۆتە ئەجندەی Gcc بەکۆ دەنگی هەنگاوی عەمەلی بۆ دەنرێ ، کە ئەمە خۆی لە دوو بڕیاری گرنگ دەگرێ ، یەکەمیان :- بە دەرکردنی دراوێکی یەکگرتوو لە ساڵی ٢٠١٠ ، دووەم :- هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی توانای ئەتۆمی لە نێوان وولاتانی کەنداو ئەویش :- - سعوودیە - قەتەر - ئیماراتی عەرەبی - بەحرێن - عومان - لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/١٣ حکوومەتی چینی مللی لە بڕیارێکیدا ١٥٠ ملیۆن قووتابی لە گوندو شارۆچکەکان لە باجی خوێندن لێخۆشبوونیان بۆ دەکرا ، بە هۆی نا لە باری باری ئابووری لە قووتابیانی گووندنشینەکان لە چین ... ئەمەش لە پێناو هەڵگرتنی ئەو جیاوازیەی کە لە نێوان ناوچە کەناریە

دەوولەمەندەکانی و هەرێمە هەژارەکاندا هەیە .

ئەم لێخۆشبوونەش لەو قووتابیانەی کە خوێندنیان ماوەی نۆ ساڵە ... ئەم لێخۆشبوونەش بودژەکەی ١٥ ملیار یوانە ... کە دەکاتە ١,٩٠٠ ملیار دۆلاری ئەمەریکی ساڵانە ... هەروا چینی مللی بەر لەو بریارەش دیسان ٥٠ ملیۆن قووتابی دیکە لێخۆشبوونی باجی خوێندنی بەرکەوت ... ئەمەش لەدوای بەرزبوونەوەی نارەزایی جووتیارانی نیشتەجێی گوندو شارۆچکەکان دێت ... کە ئەم هەنگاوەش یارمەتی دەرە بۆ بەرەو باشبردنی باری ژیانی جووتیاران و کاسبکاران لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە : رۆژنامەی – تشاینا دیلی ٢٠٠٦/١٢/ .

٢٠٠٦/١٢/١٣ سەرۆکی ئەمەریکا – جۆرج بۆش – داوای کردنەوەی دۆسیەی باری ناوخۆی سووریای کرد ... هەروا داوای ئازادکردنی بەندە رامیاریەکانی کرد لەژێر دەسەلاتی بەعس لە سووریا ... هەروا داوای راگرتنی سووریای کرد لە پشتگیری کردنی لایەنە دژەکانی ئارام بوونەوەی باری لوبنان و دوورکەوتنەوە لەو هەڵوێستانەی کە نائارامی و بەیەکەوە ژیانی گەلانی لوبنان دەخاتە مەترسی .

ئەمەش لە بلاوکردنەوەی بەیانێك هات لە لایەن – بیت الابیچ – هەروا بۆش داوای ئاشکراکردنی ئەو جێگایە دەکات کە لوبنانیەکانی لیّ حەشاردراوە ، هەروا داوای لە حکوومەتی سووریا کرد . کە دەست تێوەردان لە کاروباری لوبنان نەکرێت ... هەروا لە بارەی گفتووگۆکردن لە گەڵ سووریا و ئێران بە پێی راسپاردەکانی – هاملتۆن – بیکر – بەلام بۆش لەو راگەیاندنەیدا روونی کردەوە ، کە چاوپێخشاندنەوە لە ئیستراتیژیەتی ئێراق و ناوچەکە دەکرێت .

لە هەمان کات سەرۆکی ئەمەریکا بۆش داوای لە وولاتانی دواروسێی ئێراق کرد کە هەوڵی بەرەو باشبردنی باری ناوخۆو پەیوەندیەکانی لە دەرەوە بدرێت و ، هەروا لوبنان و دوای ئەوە هەوڵدان لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین لە ناوچەکەدا .




٢٠٠٦/١٢/١٨سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – تۆنی بلێر – لە گەڵ سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردوگان – کۆبوونەوەیەکی هاوبەشیان لە ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا ئەنجامدا ... دوای ئەوە لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا تۆنی بلێر گووتی :– بە هێزکردنی رەوتی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست جەختی لەسەر ئەوەکردەوە ، کە تورکیا لە دانوساندنەکانی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین خاوەن پێگەیەکی تایبەتە .

هەروا تۆنی بلێر گووتی :– سەقامگیرکردنی ئاشتیانە لە رۆژهەڵاتی ناوەراست هەوڵی هەموو لایەکە ... دوای ئەوە بلێر پشتیوانی خۆی بۆ بە ئەندام بوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا دووپاتکردەوە ... دوای جێبەجێکردنی داواکانی یەکیەتی ئەوروپا لە وولاتەکەیدا ، ئەم گفتووگۆیەی نێوان بلێر و ئۆردوگان لە دوای سەردانەکەی بلێر بوو بۆ تورکیا ... کە تۆنی بلێر چەند مانگێکی لە دەسەڵاتداریەتی سەرەك وەزیرانی بەریتانیای ماوەو هەوڵەکانی لە پێناو رووسپی کردنەوەیە بەرامبەر بە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی چ بۆ ناوخۆی بەریتانیا و چ بۆ وولاتانی جیهان .

٢٠٠٦/١٢/١٨پرۆسەی هەڵبژاردنەکان لە شاری دوبەی و رەئس ئەلخەیمە درێژەی کێشاو بەرلەوەی بەیانی چوارشەممە لە عەمان و ئەلشارقە و ئەم ئەلقیوین کۆتایی بێت ، ئەم هەڵبژاردنەش ئامانج لێی دەستنیشانکردنی ٢٠ ئەندامە لە کۆی ٤٠ ئەندام ، لە ئەنجوومەنی فیدراڵ . کە دەسەڵاتێکی راوێژکاری هەیە بۆ ئەوەی فەرمانرەواکانی ئیمارات دابمەزرێنێت .

جێگەی باسە بۆ کردنە ئەنجامە فەرمییەکانی دەریخستووە کە رێژەی بەشداریکردنی لە ئەبوزەبی گەیشتە لە ٦٠٪ . بەڵام لە ئەلجەزیرە گەیشتە ٨٠٪ لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/١٨لە دوای گفتووگۆیەکی چرو درێژخایەن لە تەلاری ئەنجوومەنی وەزیرانی

حکوومەتی ناوەندی ئێراق لە شاری بەغدای پایتەخت ، سەرەك وەزیرانی ئێراق – نوری مالکی • و سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە بارەی دۆسیە هەڵواسراوەکانی نێوان هەردوولا ، بە تایبەتی دۆسیەی نەوت و سامانە سروشتیەکان گفتووگۆکرا و بە یەکلادنەوەی دۆسیەی ئەمنی نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و حکوومەتی ناوەندی ، دوای ئەوەش لە لێدوانێکی سەرۆکی حکومەتی هەرێم دۆسیەی بوودژە تەواو بوو بە رێژەی ١٧٪ی بوودژەی ئێراق بۆ هەریمی کوردستان چەسپێندرا .

٢٠٠٦/١٢/١٨ رۆژنامەی واشنتۆن پۆستی ئەمەریکی لە راپۆرتێکی ئەمنی ٤٠ لاپەرەی نهێنی گواستۆتەوە ، کە حکوومەتی سعوودیی ئاماژەی پێ کردووە ، ئێران بە شێوەیەکی کردەیی دەوولەتێکی مەزهەب شیعەی لە ناو دەووڵەتی ئێراقدا دامەزراندووەو هەموو پێداویستیەکیشی بۆ دابینکردووە ... رۆژنامەکە لە راپۆرتەکەی گواستۆتەوە ، کە ئێران چەك بە میلیشیا شیعیەکان دەدات و مەشق و راهێنانیان پێدەکات و زۆرچالاکانەش هاریکاری ئەو سیاسەتمەدارە ئێراقیانە دەکات کە لایەنگیری ئێرانن .

٢٠٠٦/١٢/١٩ دادگای تورکیا دەستی کرد بە دادگایی کردنی چوار کەس بە بیانووی ئەوەی کە بوونی ناسنامەی تورکیان رزاندووە ... لە ماوەی وەرگێراندنی کتابێك بە ناوی – الاقتصاد اليامي لوسائل الاعلام الجماهيری – کە ئەم کتێبە لەلایەن ئەکادیمی ئەمەریکی – نعوم تشومسنکی – دانراوە ... ناوەرۆکی کتابەکەش باس لە رۆڵی راگەیاندنەکانی تورکیا دەکات لە ئەنجامەکانی گەلانی تورکیا .



هەروا رەخنە لە هەڵوێستی تورکیا دەگرێ بەرامبەر نەتەوەی کورد لە باکووری کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا ... ئەم چوار کەسەش نووسەر -- فاتح تاس وەرگێر ئاتدر أیاد و ، لە گەڵ دوو سەرنووسەر– عومەر فارووق کۆرهان – و – تایلان تۆسۆن – بەر لەوەش

یەکێتی ئەوروپا داوای لە تورکیا کردبوو بە چاکسازی کردن لە یاسای تاوانەکان و تورکیا ماوە بەو یاسایە دەدات ، کە ئەمەش کۆسپێکە لە بەرپابوونی ئازادی بیروبۆچوون لە تورکیا ، ئەم یاسایەش دژی نووسەرو رۆژنامە نووسەکانی تورکیایە و بە تایبەتی رۆماننووس – ئۆرهان یاموك – کە هەڵگری پاداشتی نۆبڵە لە ئاداب و هەروا بە دەیا نووسەرو رۆژنامەنووس دیکە لە تورکیا .

٢٠٠٦/١٢/١٩ لیژنەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراقی فیدراڵ داوای لە حکوومەتی ئێراق کرد وەك نارەزایی دەربرین دژی گرێدانی کۆنگرەی بەناو پشتیوانی لەخەڵکی ئێراق ، کە لە تورکیا بەسترا ... بەبانگ کردنەوەی باڵوێزی لەو وولاتەدا ... کە لێژنەکە داوای لە سەرەك وەزیرانی ئێراق کردووە ، کە هیچ شاندێك بۆ تورکیا رەوانە نەکات .

٢٠٠٦/١٢/١٩ داداگای مافەکانی مرۆڤی ئەوروپا ، تورکیای بە تاوانبار زانی لە بەر ئەوەی لە پاراستنی ژیانی نووسەرو دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان و خەڵکی سەرکەوتووە نەبووە .

دادگای ئەوروپا رایگەیاند ، کە تورکیا دەیزانی ژیانی سەرکردەی کوردی لە مەترسیدایە . بەڵام هیچ هەوڵێکی جدی بۆ پاراستنی گیانی موسا عەنتەر ئەنجام نەداوە و ناوبراو کە چالاکیەکی رۆشنبیری کوردی تورکیا بوو لە ساڵی ١٩٩٢ کوژرا ، دادگای ئەوروپا دوای تاوانبار ناسینی حکوومەتی تورکیا بوو هەروا داوای کرد کە رێژەی ٢٥٠٠ یۆرۆ کە دەکاتە ٣٣٠٠ دۆلار وەك قەرەبووی حالەتی دەرونی خێزانەکەی موسا عەنتەر و ، هەروا ٣٥٠٠ یۆرۆش بۆ تێچوون و خەرجیەکان بدرێتە منداڵەکانی موسا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە موسا عەنتەر بەرێوەبەری پێشووی مەڵبەندی کوردی بوو لە ئەستەمبوڵ ، کە بیرۆکەکانی پاراستنی مافەکانی کوردی بەناوبانگ بوو لە شاری دیاربکرو لە لایەن کەسێکی نەناسراو لە کاتی سازدانی ڤیستیڤالێکی خۆجێی تیرۆرکرا ... کە ئێستاش دادگای ئەورووپی لەو لێکۆلینەوەیە بەردەوامە .

٢٠٠٦/١٢/٢٠ لە ئیمارەتەکانی شارقە و عەجمان و ئوم القدیون دەستکرا بە دوا قۆناخی هەڵبژاردنی نوێنەرانی ئەم ئیمارەتانە ، ئەم هەڵبژاردنەش تا ئێستا یەکەمین

پرۆسەی دەنگدانە لە مێژووی وولاتەکە ، لەم پرۆسەیەدا ٥٩٥ هەزار کەس بەشداری تێدا کرد ، کە ١١٦٣ کەسیان ئافرەت بوون ، نوێنەرانی ئیماراتی عەجمانیش ژمارەیان ٤٣٦ کەس ، کە ٢٤ ئاقرەت بوون ، لە شاریقە لە کۆی ١٠١٧ کاندیدەکان ٢٧ ئافرەت بوون ، کە تاکو ئێستا بۆ یەکەمجارە ئافرەت لە ئەبووزەبی کورسیەکی پەرلەمانی مسۆگەر کردووە .

٢٠٠٦/١٢/٢٠ لە شاری نیویۆرکی ئەمەریکا ، یەکەمین دوو ستوونی تاوەری ئازادی دانرا ، لە شوێنی تاوەری بازرگانی جیهانی کە لە ٢٠٠١/٩/١١ بەهێرشێکی تیرۆرستی روخێنرا ، ئەم تاوەرە بەرزی ٥٤١ مەترە دەبێتە بەرزترین باڵەخانە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/٢١ دبلۆماتێکی تورکی کە نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات ئەوەی رەتکردەوە ، کە وولاتەکەی هیچ هاوکاریەکی هێزەکانی رژێمی رووخێنراوی بەعسی کردبێت لە شالاوە بەدناوەکەی ئەنفالدا لە ساڵی ١٩٨٨ ... ئەو دبلۆماتکارە لە وەڵامی ئەو بەڵگەنامانەدا کە لەچوارچێوەی دادگایکردنی سەدام و دارو دەستەکەیدا ، کە لە رۆژانی بەر لە ١٢/١٩ باسیان لە هاوکاری نێوان تورکیا و رژێمی بەعسی لە ئێراقدا دەکرد لە پرۆسەی بەدناوی ئەنفالدا گووتی :-

ئەوە هیچ پەیوەندی بەراستی نیە و ئەوە لە نێوان خوودی ئێراقیەکانەوە بووەو ئێمە هیچ پەیوەندیمان پێوەوە نیە ... هەروا گووتی :- کۆمەڵگای نێوو دەووڵەتی ئەو هاوکاریانەی لە بەرچاوە ، کە تورکیا پێشەکەشی کوردەکانی ئێراقی کردووە ، لە ئاماژەکەیدا بۆ کۆچرەوەکەی ساڵی ١٩٩١ و پەنابەرانی کوردی سەرسنووری تورکیا کە لەسەر خاکی کوردستانە .

شایانی باسە هاوکاریە مۆرکراوەکانی سنووری لە نێوان رژێمی بەعسی و رژێمی تورکیا و وولاتانی دراوسێ و ناوچەو جیهان لەو رێکەوتنامانە ئاگادارن ، کە لە دوای ساڵەکانی ١٩٨٠ لە نێوانیان مۆرکرابوو دژی بزووتنەوەی کورد ، کە لە سەر خاکی هەر چوار پارچەی کوردستان و راگواستنی گوند نشینەکانی بە پانی ٢٠ کم و بە درێژایی سنوورەکەدا .



٢٠٠٦/١٢/٢٥ یەکـــەمین ڤیـــستیڤاڵی کورتـــە فلیمـــی نێـــوو دەووڵەتی هـەولێر ، لە ژێـــــر چـــــاودێری ســـەرۆکی حکوومـــەتی هـــەرێمی کوردســـتان و بـــە ئامـــادە بـــوونی نوێنـــــەری وەزیـــــری رۆشـــنبیری و وەزیـــری وەرزش و لاوان و ژمارەیـــەك لـــە بەرپرســـــان و هونەرمەنـدانی هـەر چوار پارچـەی کوردسـتان لـە هـۆڵی میدیا لـە شـاری هـەولێری پایتـەختی هـەرێمی کوردسـتان دەسـتی پێکـرد ... کـە ٢٥ کورتـە فلیمی خۆماڵی و ٢٥ کورتـە فلیمی نێوودەووڵـەتی لـەخۆ گرتبوو بۆ ماوەی چوار رۆژ بەردەوام بوو لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/٢٦ئەنجوومـەنی گـەڵ لـە تورکمانـستان کـە بالاترین دەسـەلاتی دەسـتووریە لـە وولاتەکەدا بریاریدا لـە سـەر یاسـای هەلبـژاردنی سـەرۆك لـە وولاتەکـەدا ، لـە دوای نزیکەی ٢٠ ساڵ و لە دوای راگەیاندنی سـەربەخۆیی تورکمانـستان لـە یەکیـەتی سـۆڤیەتی جـاران ... ئەمـەش لـە دوای کۆچـی دوایـی سـەرۆکی تورکمانستان – سابر مورد نیازۆف – کە بە باوکی تورکمـان ناو زەند بوو ... بـەر لـەوەش لـە سـاڵی ٢٠٠٣ ، ئەنجوومـەنی گـەڵ لـە سـەر داوای سابرنیازۆف یاسایەکی دەرکـرد بە پێکهێنـانی دەسـتەیەکی بالا کـە لـە دوو ئەندامی پەرلەمان و ئەندامانی حکوومـەت و سـەرۆکی دیوانی سـەرۆکایەتی و داواکاری گشتی پێکهاتبوون لە وولاتەکەدا .

ئەم یاسـایەش بـە هـەمان شێوازچـەندین ئەنـدامی لـەو دەسـتەیە گـۆری بـە جێگـە گرتنـەوەیان بـە ئەنـدامی نـوێ لـە سـەر داوای سـەرۆك و بـاری نـوێی وولاتەکـە لـە دوای مردنـی نیـازۆف و جێگـەی گرتنـەوەی لەلایـەن بـردی محەمەد دۆف لە سەر دەسەلاتداریەتی وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/٢٦کۆچی دوای سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا – جیرالدفۆرد – لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا .



جێگەی ئامازە پێکردنە کە سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا – فۆرد – لە ساڵی ١٩١٣ لە ویلایەتی لیبراسکا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... جیرالدفۆرد لەدوای تەوابوونی پۆستی سەرۆکایەتی ئەمەریکا – ریچارد نیکسۆن – لە ساڵی ١٩٧٤ سەرۆکایەتی ئەمەریکای گرتە دەست ... بەلام لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٦ بەرامبەر سەرۆکی ئەمەریکا – جیمی کارتەر – دۆراندی و جیرالدفۆرد ٣٨مین سەرۆکی ئەمەریکا بووە .

لە کاتی سەرۆکایەتیەکەی لە ساڵی ١٩٧٥ هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە ... هەروا بەهۆی رامیاریەتی گەلانی ئەمەریکا لە ١٩٧٤/٨/٢٤ لە خۆپێشاندان و مانگرتن و نارەزایی بەرامبەر رامیاریەتیەکەی دەردەبرن بە هۆی دەرکردنی فەرمانی لێخۆشبوون لە سەرۆك – نیکسۆن – کە بەتۆمەتی – وتەرگێت – لەدەسەلات لادرا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٦/١٢/٣٠ لە دوای سەردانەکەی پاپای فاتیکان – بێدیکتی شانزەهەم – سەردانی مزگەوتی سوڵتان ئەحمەدی کردوو رووی کردە مەککە بۆ چەند خوولەکێك نوێژی کرد ، بەو سەردانەش پاپا دەبێتە دووەم پاپای فاتیکان کە سەردانی مزگەوت بکات ، ئەوەش دوای پاپا جان پۆلی دووەم دێت کە لە ساڵی ٢٠٠١ سەردانی مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق بکات ... هەروا پاپا سەردانی مۆزەخانەی ئایا سۆفیای کرد ، کە لە بنەرەتدا کەنیسە بووەو لە ساڵی ١٤٥٣ کراوە بەمزگەوت و لە ساڵی ١٩٣٥ یش کراوە بە مۆزەخانە .

پاپا سەردانی کەنیسەی قەدیس جۆرجیۆی کرد ، کە بارەگای پاتریارکی

ئارتۆدۆکسە .

**<u>تێبینی:–</u> گەر بەراوردێك لە نێوان وێنەکان بکەیت ، هەر مێژوویەك و وێنەی خۆی لـــەگەڵ دانراوە ، لە بەر ئەوەی نەمویستووە وێنەکان دووبارە ببنەوە . تکایە .**

## ٢٠٠٧



٢٠٠٧/١/١ زاناکــانی چــینی میللــی دەڵــێن :– ئێمــە دەتــوانین پێـــشبینی بکـــەین بـــە ڕوودانی بوومەلەرزە بەر لە ڕوودانــی بــە چــەند ڕۆژێـك ... بـەویش بـە توانـای ئـەو – مار – انـەی کـە بـەکاریان دێنین بۆ ئەم مەبەستە . جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە ئەو ڕێگایەی زاناکانی چینی میللی گرتۆتیانە بەر لە پەرە پێدانە ، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ چاودێریکردنی هەڵس و کەوتی ناسروشتی ئەو جۆرە مارانە لە کاتی ، یا خوود بەر لە ڕوودانی بوومەلەرزەکە ، جا لـە هـەر شـوێنێك بێت بە هۆی تێك چوونی باری جەستەی ئەو مارە ، کە بە ئاسانی مرۆڤ هەستی پێدەکات .

هەروا زاناکانی نووسینگەی بوومەلەرزەی شاری تانینگ لە هـەرێمی گـوانگ کسی بـە چـاودێری کردنـی مارەکـانی لـە چـەندین کێڵگـەی کشتووکاڵی لـە مـاوەی ٢٤ کاتــژمێر بـە کامێراکـانی ڤیــدیۆ ، کـە بەسـتراونەتەوە بـە تـۆڕی ئینتەرنێت .

بە پێـی ووتـەی زاناکـان . کـە مـار دەتـوانێ هەسـت بـە بوومەلـەرزە بکـات بە دووری ١٢٠ کم بەر لە ڕوودانی لە ماوەی ٥ ڕۆژدا ... هـەروا زاناکـان دەڵێن ، ئەمارانەی کە لـە سـەر زەوی بەخـشاندنی خـۆی دەڕوات هەسـت دەکـات کـە بوومەلـەرزە ڕوودەدات و باری تەندروسـتی و جەسـتەی دەگـۆڕێ و خـۆی بـە دار و دیـوار و بـەردا دەدات ، بـۆ ئـەوەی خـۆی لـەو شـوێنە ڕزگـار بکـات ...

هەروا بەڕێوەبەری نووسینگەی بوومەلەرزە لە شاری تانینگ دەڵێ :- مار هەستیارترین گیان لەبەرە لەسەر گۆی زەوی ، کە هەست بە بوومەلەرزە دەکات و هۆکارەکەش ئەوەیە کە بەر لە ڕوودانی مارەکان لەو جێگایەی لێی خەوتوون ، یاخوود حەشارداوە دەچنە دەرەوە بۆ هەڵاتن جا لە هەر کەش و هەوایەك بێت - هاوین یاخوود زستان ، یا بەهار ، یا پایز - گەر بوومەلەرزەکەش گەورەبێت ، ئەوا ئەو مارە یاخوود مارەکان وەك چۆن شێت بێت یا وەك لە کاتی گیان لە دەست دانی لێدێت .

ئەم زانیاریانەش لە ڕێگەی چەسپاندنی کامێرای بەردەوام و بەستنەوەی لەگەڵ تۆڕی ئینتەرنێت دەردەکەوێت و لەم کارەش سەرکەوتنی باشی بەدەست هاتووە ... هەر بەم هۆکارەش ناوچەی تانینگ هەموو کات ئەگەری ڕوودانی بوومەلەرزەی لێدەکرێت ، کە یەکێکە لە نێوان ١٢ شاری چینی ، کە ئەم کامێرایەی لێ چەسپاندراوە بۆ چاودێری کردنی ١٤٣ یەکەی مارەکان ... لە بەر ئەوە ی چینی میللی وولاتێکە هەردەم بوومەلەرزەی لێ ڕوودەدات بە شێوەیەکی بەردەوام ، کە لە ساڵی ١٩٧٦ بوومەلەرزەیەکی لێدا ، کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی زیاتر لە ٥٠٠,٠٠٠ پێنج سەد هەزار کەس لە شاری نانگشان کە بوومەلەرزەیەکی وێرانکەر بوو لە وولاتەدا.

سەرچاوە:- bbc arabic

٢٠٠٧/١/٣ کۆماری سلۆڤینیا یەکەم دەووڵەتی کۆمۆنیستی پێشوو بوو بچێتە دراوی یەکیەتی ئەوروپا ... شایانی باسە کە سلۆڤینیا بەشێك بوو لە یۆگسلاڤیا ، ئەویش بە بۆنەی سەری ساڵی نوێی زاینی لە وولاتەکە و جیهاندا ... ئەویش بە هەڵوەشاندنەوە دراوی ئەو وولاتە کە ناوی --توولار-- بوو ... هەروا سلۆڤینیا لە ناو کۆمەڵە وولاتەی ڕۆژ هەلاتی ئەوروپا بوو چووە ناو یەکیەتی ئەوروپا لە ساڵی ٢٠٠٤ کە ١٠ دەووڵەت بوون ... یەکێك بوو لە ناو ئەو ١٠ دەووڵەتە دەستگیربوو بە مەرجەکانی ئابووری پێویست بۆ چوونە ناو یەکیەتی ئەوروپا . بەر لەوەش سلۆڤینیا سێ جۆر لە دراوی بەکارهێناوە لە مامەڵە پێکردن و دواییان توولار بووە ... ئەویش جیابوونەوەی لە یۆگسلاڤیا لە ساڵی ١٩٨١ . کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی

کــه جــەماوەری سـلۆڤینیا ترسـی لـه بەرزبوونـەوەی نرخـی کـەل و پـەل و پێداویـستیەکانی ژیـان ، وەك هەنـدێ لـه وولاتـانی دیکـەی نـاو یەکیـەتی ئەورووپا .

٢٠٠٧/١/٥ سەرۆکی بەشی کتێبه دەگمەنەکان و کۆمەڵە کتێبی تایبەت بە کتێبخانەی کۆنگرێـسی ئەمـەریکا – مـارك دیمووینیـشن – دڵگرانـی بەرامبـەر – کیـت ئەلیـسۆن – ی ، یەکـەم ئیـسلامی هەڵبـژێردراو بـۆ بـوونی بـە ئەنـدامی کۆنگرێـسی ئەمـەریکی ، کـە رووبـەرووی هێـرش بـووەوە لـە کـاتی سوێند خواردن ، نیازی بوو کە ئەویش بە قورئـان نـەك بە ئنجیل ، ئەویش لەسەر دانەیـەکی مێـژوویی لـە نێـوان هـەموو دانـە قورئانـەکان ، کـە مێـژووی دەگەرێتـەوە بـۆ سـاڵەکانی ١٨١٠ کـە خاوەنداریەتەکـەی هـی سـەرۆکی ئەمەریکای پێشوو – تۆماس جیڤرسۆن – بووە لە کتێبخانەکەدا .

لـەو کاتـەی کـە جیڤرسـۆن بـووە سـێیەمین سـەرۆکی ئەمـەریکا لـە نێـوان ساڵەکانی ١٨٠١ – ١٨٠٩ ئاواتی کۆکردنەوەی کتیبی باشـی دەگمـەن بوو ، کە کتێبخانەکەی زیاتر لە ٦٠٠٠ شەش هەزار کتێبی تیا بووە ... بەڵام ئەو کتێبخانەیە لە ساڵی ١٨٥١ تووشی سووتاندن هات ، کە زۆربەی زۆری کتێبەکان سووتان و هەندێکیشیان رزگارکران ، یەك لەوانە ئە قورئانە بوو کە – کیت ئەلیسۆن – نیازی بوو کە سوێندی یاسایی پێخوارد لە بەرامبەر دەستەی سەرۆکایەتی کۆنگرێس لە ئەمەرکا .

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەلیسۆن بکەوێتە بەرامبەر رەخنە لێگرتنی و سەرزەنشتکردنی لە لایەن کەنیسە و پیاوان و دام و دەزگاکان کە هەڵگری بڕوای مەسیح بوون لە ئەمەریکا و ، هەتا تووشی رەخنە لێگرتن بوو لەلایەن ئەندامانی کۆنگرێس ... کە ئەندامی کۆنگرێس – فرگیل گوود – ی کۆماری لە وویلایەتی ڤرگینیا نوێنەرایەتی ناوچەیەك دەکات رەخنەی لە ئەلیسۆن گـرت و، کەچـی ئـەویش لـە هـەمان وویلایەتـە و نوێنـەری ناوچـەیەکە لـە ئەمـەریکا . ئـەم کارەشـی لـە پێنـاو رێزلێگرتنـی ئەلیـسۆن زیـاتر بـووە لـە نێووەنـدەکانی هـەڵگری بـڕوای ئیـسلام لـە جیهـان بـە تایبـەتی جیهـانی ئیسلامی لە جیهان .

٢٠٠٧/١/٥ پەرلەمانتاران لە پەرلـەمانی رووسـیا – رۆمـا – دڵگـران بـوون بـەوەی کـە لـە

دوای وەرگرتنی دەستەی سەرۆکایەتی کۆنگریٚسی ئەمەریکا لەلایەن پارتی دیموکراتی ئەمەریکا ، تووشی کیٚشە و گرفت زیاتر دەبیٚت بە هۆی گرژی و دژواری پەیوەندی لە نیٚوان حکوومەتی ڕووسیای یەکگرتوو و ئیدارەی پارتی دیموکراتی بە ئیدارەی جۆرج بۆش لە جیهان ... کە ئەمەش دەبیٚتە هۆکاری ئەوەی کە کۆنگریٚسی ئەمەریکا کە زۆرینەی ئەندامانی دیموکراتەکانن و زیاتر چاودیٚری بخەنە سەر باری دەسەڵاتی ڕووسیا لە بوارەکانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازی و رامیاریەتی ناوەوە و دەرەوەی ڕووسیا و پیوەندیەکانی لەگەڵ دراوسیٚکانی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی پیٚگووتراوی جاران .

لە بەر ئەوەی ئەندامانی پەرلەمانی ڕووسیا گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە کۆنگریٚسی ئەمەریکا ، لە دوای سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆنگریٚس کە پارتی دیموکراتی بووە خاوەنی بڕیار لە کۆنگریس و لەسەر ئەمەریکا و جیهان ، زیاتر پاڵەپەستۆ دەخەنە سەر سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش ، بۆ ئەوەی لە هەڵس و کەوتی زیاتر توووند بیٚت بەرامبەر بە ڕووسیا لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

ئەمەش دوای ئەوە هات کە ڕاپۆرتیٚکی ئامادەکراو لەلایەن ئیدارەی لیٚکۆڵینەی کاروباری دەرەوە و بەرگری و بازرگانی لەلایەن کۆنگریٚسی ئەمەریکا ... لە ڕاپۆرتەکە دەرکەوت کە تەرازووی پەیوەندیەکانی نیٚوان مۆسکۆ و واشنتۆن لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوو لە باریٚکی خراپترا بووە سەرەڕای ڕەخنەگرتن لە رامیاریەتی ڕووسیا لە ساڵی ٢٠٠٦ . ڕاپۆرتەکەش کە لە ٧٥ لاپەرە پیٚکهاتبوو لە سەر پەیوەنیەکانی نیٚوان ڕووسیا و ئەمەریکا بووە بەر لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگریٚس . ڕاپۆرتەکەش خۆی لە دوو لایەنی بیروو بۆچوون دەگرت ئەویش :-

یەکەم :- یەکبوونی بیرووڕا لە سەر تیرۆری نیٚوودەووڵەتی لەلایەن ئیسلامە توووند ڕەوەکان ، کە هیٚڵیٚکی ترسناکی بنەڕەتیە لە سەر ئاسایشی نیٚوودەووڵەتی ووڵاتە جیاجیاکان ... هەروا لە بارەی بلاْوکردنەوەی چەکی کۆمەڵکوژی تەواو و ... لە بارەی هاوکاری لە بواری نەوت و گاز لە جیهاندا

دووەم :– بەڵام تەوەری دووەم لە سەر کودەتابوو لە سەر دیموکراتیەت و رامیاریەتی دوورکەوتنەوە لە بازاڕی ئابووری ئازادی ، لەلایەن دسەڵاتی ڕووسیا و دەست تێوەردان لە کاروباری ووڵاتانی سەربەخۆی دراوسێی ڕووسیا وەك – جۆرجیا و ، مۆلدافیا و ، ئۆکرانیا و ، هەروا هاوکاری لە نێوان ڕووسیا و ئێران لە بواری ئەتۆمی و بەر هەڵستکاری مۆسکۆ دژی سزا خستنە سەر ئێران و چەندین لایەنی دیکە ، لەگەڵ پەیمانی ناتۆ و یەکیەتی ئەوروپا و بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا و بازرگانی جیهان و پەیوەنیە نێوودەووڵەتیەکان .

٢٠٠٧/١/٨ وەزیری مالیزیا – حەمید ئەلیار – لە لێدوانێکیدا ئەو تۆمتباریەی کە خراوەتە سەر ووڵاتەکەی بە فرۆشتنی چەك بۆ ئێرانی ڕەتکردەوە ، کە کۆمپانیای – نارگیت ئێرفریت – ی مالیزی چەکی فرۆشتبێتە ئێران و سووریا .

لە بەر ئەوەی مالیزیا هەر لەو چوارچێوەدا ، ئیدارەی ئەمەریکا سزای ئابووری بەسەر کۆمپانیای ڕووسیا و چینی دا سەپاند ، بە هۆی فرۆشتنی چەك بە دانی بە هەردوو ووڵاتی سووریا و ئێران و دوورنیە یۆرانیۆمیشی فرۆشتبێتە ئێران ، لە چوارچێوەی هەوڵەکانی ئێران لە پێناو دروستکردنی چەکی ئەتۆمی لە ووڵاتەکەیدا و بوونی بە ووڵاتێکی ئەتۆمی و چوونە ڕیزی ووڵاتانی خاوەن چەکی ئەتۆمی لە جیهاندا .

٢٠٠٧/١/٩ سەرۆکی ڕووسیای یەکگرتوو – ڤلادمیر پۆتین – داوای لە حکوومەتەکەی کرد ، بە دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی گونجاو لە پێناو دابین کردنی بەرژەوەندی ئەوروپیەکان لە بەکارهێنانی نەوت و گاز . ئەویش بە هۆی دروست بوونی کێشەی گومرگی و باج لە نێوان ڕووسیا و ڕووسیای سپی – بیلا ڕووسیا – ئەمەش لە دوای بریارێکی ڕووسیای سپی هات ، بە بەرزکردنەوەی نرخی باجی ڕۆیشتنی بۆریە نەوتیەکان بە خاکەکەیدا بۆ ٤٥$ چل و پێنج دۆلار ، بۆ هەر یەك تەن لە نەوتی ڕووسیدا .

بەم هۆیەش ڕووسیای یەکگرتوو ئەو بریارە و داوایەی ڕووسیای سپی ڕەتکردەوە و بووە هۆی ڕاگرتنی هەناردەی نەوت بۆ ووڵاتانی ڕۆژئاوا و بووە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی نەوت ... کە ئەڵمانیا سێیەکی داهاتی

نەوتی وولاتەکەی لە ڕووسیاوە بۆی دەچیت ، جگە لە وولاتانی دیکە لە وولاتانی یەکیەتی ئەورووپا و وولاتانی پۆلەنداو سلۆڤینیا لە سەر سنووی ڕووسیای یەکگرتوو .

شایانی باسە کە ڕووسیا و ڕووسیای سپی هاوپەیمانن لە بوارەکانی سەربازی و ئابووری بازرگانی و دامەزرێنەری کۆمەنولسن لە کۆمارەکانی پێك هاتەی سۆڤیەتی پێشوو لە کیشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/١/٩ ڕۆژنامەی – ئەلقەبەس – ی کوێتی لە زاری بالۆێزی تورکیا لە واشنتۆن بلاوی کردەوە کە – نابی شانسۆ – ی بالۆێزی تورك گووتی :– دوای ئەوەی دیموکراتیخوازەکان دەسەلاتی تەواویان بەسەر کۆنگرێسدا شکا و بالادەست بوون ، حکوومەتی تورکیا نیگەرانە لەوەی کە – لۆبی ئەرمەنی – کاربکات بۆ ئەوەی کۆنگرێسی ئەمەریکا بڕیارێك دەربکات سەبارەت بەو قەسابخانەی بەر لە ٩٠ سالْ پێش ئەمرۆ واتە لە ١٩١٥/٤/٢٤ لە تورکیا بە سەر ئەرمەنەکان هات ، لە لایەن دەسەلاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیەکان ، کە تیایدا ١,٥ یەك ملیۆن و نیوو ئەرمەنی و ٣٠٠٠٠ سی هەزار کورد لە ناوبران .

لە بەر ئەوەی سەرۆکی کوتلەی دیموکراتەکان – نانسی بلوسی – لە میانەی وتەکانیدا گووتی :– لە کۆنگرێسی ئەمەریکا پشتگیری لە داواکاری ئەرمەنەکان دەکات ... هەروا بالۆێزی تورکیا گووتی :– بۆیە پێویستە کە حکوومەتی تورکیا لە هەموو ڕوویەکەوە هەولْبدات بەرپەرچی داواکاری ئەرمەنەکان بداتەوە ... لە بەر ئەوەی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا – بیل کلنتۆن – و سەرۆکی ئەمەریکا – جۆرج بوش – داواکاریەکانی ئەرمەنەکانیان فەرامۆش کردووە ، لە بەر ئەوەی تورکیا ڕۆلْ و شوێنێکی گرنگی لە ناوچەکەدا هەیە .

بەلام دیموکراتەکان دوورنیە ئەو هەلە بقۆزنەوە لە پێناو بە هێزکردنی جێ پێگەی خۆیان بۆ هەلْبژاردنەکانی داهاتووی سەرۆکایەتی لە ئەمەریکا ، دوای تەواوبوونی ماوەی دەسەلاتی جۆرج بوش لە دەسەلاتەکەیدا لە ئەمەریکا .

٢٠٠٧/١/١٠ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بوش ڕایگەیاند ، بە بلاوکردنەوەی ئەو پلانە

ئیستراتیژیه نوێیەی کە نیازیەتی لە ئێراق ئەنجامی بدات بە هۆی هەڵەکردن لــە جــێ بــەجێکردنی پرۆگرامــەکانی لــە ئێراقــی داهــاتوودا . ئــەویش بــە زیادکردنی ژمارەی سەربازەکانی لە ئێراق بە ۲۱۵۰۰ بیست و یەك هەزار و پێنج سەد سەرباز ، کە ژمارەی سەربازەکانی ئەمەریکا بەو زیادەیە دەکاتە ۱٦۰۰۰۰ سەد و شەست هەزار سەرباز لە ئێراق .

بە بە هێزکردنی نەخشەی ئاسایشی ئێراق و ٤۰۰۰ چوار هەزاریش بۆ کــارە ســەربازیەکان لــە پارێزگــای – رومــادی – . هــەروا جــۆرج بــۆش لــە لێدوانەکەیدا هیـوای خواسـت کـە هێـزە فـرە لایەنـە هاوپەیمانـەکانی ڕۆڵـی خۆیان زیاتر بکەن بۆ ئەوەی ئەو قۆناخەی کە ئێستا هێزەکانی هاوپـەیمانان تێیکەوتوون لیی ڕزگاربن .

لەلایــەکی دیکــەش ســەرۆکی ئەمــەریکا داوای لــە کــۆنگریس کــرد ، کــە ڕەزامەندی لە سەر یەك – بلیۆن – دۆلار بکات بۆ خەرجیەکانی بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵگای مەدەنی و ، هەروا بۆ دەسەلاتی داد لە ئێراق .

ئەم ڕاگەیاندنەی بۆش لە ناوەندەکانی بەرهەڵستکاریەتی پارتی دیموکراتی بــوو ، کــە لــە ســەر کــۆنگریس بالادەســتە و ، لــە هــەمان کــات کۆبوونــەوەی کۆنگرێس بۆ سنووردانان لە زۆری ژمارەی سـەربازانی ئەمـەریکا لـە ئێـراق و ئەفگانـستان و بـوونی خەرجیـەکی زۆری زیـان بـەخش بـە وولاتەکەیـدا ، لـە هــەمان کاتیــشدا ســەرەك وەزیرانــی ئێــراق – نــوری مــالکی – ڕەزامەنــدی و پــشتگیری لــە مەرجەعیــەتی تــایفی مەزهــەب شــیعە – عــەلی سیــستانی – وەرگــرت ، بــە دامــاڵینی چــەك لــە دەســت ڕێکخــراو و گروپــە ئیسلامیەکانی هەردوو مەزهەب شیعەو سووننەی ئیسلامی لە ئێراق .

جێگەی باسکردنە کە لە دوای رووخاندنی ڕژێمی پارتی بەعسی لە ئێراق لـە ۲۰۰۳/٤/۹ گۆڕەپانی ئێراق لـە ناوەند و باشووری ئێراق ، بـووە گۆڕەپـانی ململانێـی نێـوان شـیعە و سـووننەی عـەرەب ، لـە پێنـاو دەسـەلات و سـامان . نەك لە پێناو ڕزگارکردنی گەلانی ئێراق ، لەو مەرگەسـاتەی کـە مـاوەی ٤۰ ساڵ بوو تێی کەوتبوو ، لە لایەن ڕژێمی بەعس بە سـەرکردایەتی – سـەدام حسین – و هاپەیمانەکانی لە کورد و عەرەب و تورکمان لە وولاتەکەدا .

لە بەر ئەوەی لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لە ساڵی ١٩٢٠ تا رووخاندنی ڕژێمی بەعسی مەزهەب سوونەی ئیسلامی لە ئێراق دەسەڵاتدار بوو لە هەموو بوارەکاندا و بە ئارەزووی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ گەلانی ئێراق دەکرد ، کە مەزهەب شیعەی ئیسلامی عەرەب لە هەموو بوارەکان لە ژێر ئێش و ئازار دابوون ... بەلام کە سەدام لە ناوبردرا ، مەزهەب شیعەی ئیسلامی عەرەب توانیان ببنە خاوەن دەسەلات لە ئێراق . بە پێچەوانەی ٨٠ ساڵی رابردووی دەسەڵاتی مەزهەب سوونەی عەرەبی ئیسلام .

ئەو ململانێ و کێشەی نێوان ئەو دوو مەزهەبە گەیشتە ئاستی بەرپابوونی شەڕی ناوخۆیی نێوانیان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە شارەکانی بەغدا و مووسڵ و سەلاحەدین و دیالە و ، لە شارەکانی دیکەی باشووری ئێراق ، بە تایبەتی لە شاری بەغدا ، کە ڕۆژانە لەو شارانە بە ڕێژەی ١٠٠ کەس دەکوژرا لە هەردوو لایەن بە تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێل و کەسانی تیرۆرست لە هەندێ جێگەش شەڕی گەڕەك و شەقامیش ڕووی دەدا لە شاەکانی ناوەندو باشووریدا .

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکە دزینی سامانی گەلانی ئێراق لە لایەن ئەو دوو مەزهەبە ، بە تایبەتی نەوت و سامانە بە نرخەکانی گەلانی ئێراق . لایەنی سێیەمیش کە کورد بوو ، ئەویش درێخی نەکرد لەم بوارەدا بە پاوانکردنی سامانی گەلانی دانیشتووی هەرێمی باشووری کوردستان و پشتگوێ خستنی لە داهاتووی ئامانجەکانی گەلی کوردستان . لە هەموو بوارەکاندا ، بە تایبەتی لە پارێزگای کەرکوك و ناوچە دابڕاوەمانی دیکەی هەرێمی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی بەعس و دوایی مەزهەب شیعە و سوونەی عەرەبی ئێراق .

ئەتوانین بە قۆستنەوەی ئەو هەلە لە بارانەی کە لە ئێراق بۆ کورد هاتوونەتە پێشەوە بە هۆی پاراستنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی هەردوو پارتی دەسەڵاتدار لە هەرێمی کوردستان ، کە یەکیەتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان بوون ، بە لاوەنانی بەرژەوەندی گشتی کورد و بەتایبەتی لە ڕووی نەتەوەیی و نیشتمانیدا ... ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جێ پێگەی عەرەب لە ئێراق بەهێز بووە بە پێچەوانەی جێ پێگەی كورد ، كە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاواز دەبوو... وەك دەڵێن – دەم دەخوات و چاو شەرم دەكات – سەركردایەتی كورد كە بەند بوون بەو دوو پارتە كە داهاتووی كورد بەرەو هەڵدێر دەبەن لە هەموو بوارەكاندا لە هەرێمەكەدا .

٢٠٠٧/١/١٠ جێگری سەرۆكی شارەوانی تارانی پایتەختی ئێران – محەمەد هادی حەیدەری – لە ووتەیەكیدا بۆ ڕۆژنامەی – ئیعتماد ملی – ئێرانی كە پیس بوونی كەش و هەوا لە تاران گەیشتۆتە ئاستێكی مەترسیدار لە شارەكە و دەوروبەریدا . و لەو كاتەش بە تایبەتی كە باری پیس بوونی كەش و هەوا گەیشتۆتە پلەی ١٠٠٪ بە بێ ئەوەی هەستی پێبكرێت تەنیا لەلایەن ئەو كەسانە نەبێت ، كە تووشی نەخۆشی تەنگەی هەناسە كێشان دەبن و ، یاخوود ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە .

ئەم هۆكارەش بۆتە هۆی ئەوەی كە لە ماوەی یەك مانگدا ٣٦٠٠ كەس گیان لە دەست بدەن بەم هۆیەوە . بە پێی ڕاپۆرتی شارەوانی تاران لە ڕاپۆرتەكەیدا و بۆتە هۆی ئەوەی ، كە لە شاری تاران و سنووری شارەوانیەكان ڕۆژانە ١٢٠ سەد و بیست كەس گیان لە دەست دەدەن ، هەروا لە ماوەی ئەو مانگەدا ٤٥٠ چوارسەد و پەنجا كەس گیانیان لەدەست داوە ، كە ٨٠٪ بە هۆی پیسی كەش و هەوا بووە ... هەر لەو ڕووەوە جێگری سەرۆكی شارەوانی تاران لە ووتەكەیدا بۆ ڕۆژنامەی – ئیعتماد ملی – گووتی :-

پێویستە شۆڕشێكی ڕاستەقینە بكەین بۆ لە ناوبردنی ئەو دیاردەیە لە شاری تاران و هەموو شارەكانی دیكەی ئێران و ، لە ئێران بەتەواویدا . هەروا گووتی :- لە ماوەی مانگی/ ٢٠٠٥/٣ تاكو كۆتایی ٢٠٠٦ ، ٩٩٠٠ نۆ هەزار و نۆ سەد كەس بە هۆی پیس بوونی ژینگە گیانیان لە دەست داوە ... هەروا پیسبوونی كەش و هەوا لە ئاكامی فرێدانی گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن و بە هۆی خراپی و زۆری ئۆتۆمبێل و ، تاران بۆتە پیسترین شار لە جیهان ، بە هۆی پیسی كەش و هەوا كە زیاتر لە ٦,٠٠٠,٠٠٠ شەش ملیۆن ئۆتۆمبێل لە شاری تارانە لە وولاتەكەدا .



٢٠٠٧/١/١٠ لـە شـاری سـلێمانی لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان سەرۆك کۆماری ئێراق – جەلال تاڵەبانی – و بـاڵوێزی پێـشووی ئەمـەریکا لـە ئێـراق – زەلمـای خـەلیل زاد – لـە کـۆنگرەی ڕۆژنامەوانیـدا . گـووتی :– ئـەرك و کـاری کەسـانی دەرەوەی دەیانەوێ کار لە هەست و خواس لە سەر کاروباری ناوخۆی ئێراق بکەن ... هەروا گووتی :–

پەیوەندی تایبەت لە نێوان کورد و واشنتۆن بەهێزە و دەستکەوتەکانی بە هاوکـاری و هاوپەیمانیـەتی کـوردەوە بـووە ... کـە کـورد پاڵپـشتی تـەواوی ئەمەریکا بووە ، بۆ سەرکەوتن و کە بەشێکی سەرکەوتنەکەش بۆ ئارامگیری ئاسایشی کوردستان دەگەرێتـەوە ... هـەروا باڵوێزی پێشووی ئەمـەریکا لـە ئێراق گووتی :–

ئێستا لە قۆناخی کارکردنداین بۆ سەقامگیری و ئارامی بارودۆخی ناوچە تـازە ئـازاد کراوەکـانی کوردسـتانین بـە گەڕاندنـەوەیان بـۆ سـەر هـەرێمی کوردستان ... هەروا باری هەرێمی کوردستانی بە سەرکەوتوو ناو زەند کرد لە بواری ئابووریدا ... هەروا گووتی :–

ئەمـەریکا بۆ ئازادکردنی ئێراق هـاتووە نـەوەك بۆ داگیر کردنـی ناوچـەکە جێگەی باسکردە کە ئەمەریکا هەموو هەڵ و توانایەکی لە پێناو پاراستن و بـەهێزکردن و بتـەوکردنی بەرژەونـدی تایبـەتی خۆیـەتی لـە بوارەکـانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازی ، بە پێی رامیاریەتی جیهانگەری لـە جیهـان ... ئەمەریکا پـی لـە سـەر جەسـتە مرۆڤایـەتی دادەنـێ بـۆ ئـەوەی سەرکەوێ لەو ئامانجانەی کە داپڕشتووە لە هەموو بوارەکان و شـوورەیی لـە لانیە بۆ یارمـەتی دان و هاوکاریکردنـەکانی لەلایـەن دەسـەڵات و نەتـەوەکانی ژێردەستە .

لەوانە گەلی کوردستان لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان ، بە چ هاوکاریـەك

بۆ ئەمەریکا چووە پێشەوە و کوردیش هیچ مەرجێکی نەبوو بۆ داهاتووی گەل و نیشتیمانەکەی و تەنیا ئامانج رووخاندنی ڕژێمی سەدام بوو لە ئێراق . ئەی دوای رووخاندنی سەدام ، کورد دەبێت چی بکات بۆ گەیشتنی بە مافەکانی لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی نیشتیمانی . بەلاَم بە داخەوە سەرکردایەتی کورد بە تایبەتی سەرکردایەتی پارتی و یەکیەتی هەموو هەولْ و توانا و ئاواتەکانیان خۆ دەوولەمەند کردن و داگیرکردنی دەسەلاَت و پاوان کردنی داهات و ... هەروا ... ؟ ... ! .

٢٠٠٧/١/١١ لە هێرشێکی کۆماندۆزەکانی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا بۆ سەر کۆنسلیەی ئێران لە شاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان بە دەستگیرکردنی – ئاغای جەعفەری – کە لە ڕۆژی ١/١٠ بەسەردانێکی نهێنی گەیشتە شاری هەولێر ، لە پێناو چاوپێکەوتنی بە سەرۆکی هەرێمی باشووری کوردستان – مەسعوود بارزانی .

جێگەی ئاماژە پێکردن و روون کردنەوەیە کە ئاغای جەعفەری لە شاری سلێمانیەوە بەرەو هەولێر هاتبوو ... ئەمەریکیەکان لە ڕێگەی سیخوورەکانی خۆی زانیاریان لە سەر سەردانی نهێنی ئەم گەورە تیرۆرستەیان پیْ گەیشتووە . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەم هێرشە ئەنجام بدرێت ... ئاغای جەعفەری یەکێکە لە گەورە تیرۆرستەکانی سەر بە کۆماری بە ناو ئیسلامی لە ئێران ... کە دەستی لە شەهید کردنی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژهەلاَتی کوردستانی ژێر دەسەلاَتی ئێران هەبووە .

لەلایەکی دیکەش دەلێن کە ئاغای جەعفەری دەستگیرکراوە بە یارمەتی دانی لەلایەن سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان دەرباز کراوە ... هەر لەم بارەیەوە سەرەك کۆماری ئێراق و سکرتێری گشت یەکیەتی نیشتیمانی جەلال تالەبانی و مەسعوود بارزانی لە کاتێکی وا ناسك و دژواردا و لە ناو هەنگلی ئەمەریکیکان پێشوازی لە تیرۆرستێکی وا دەکەن...! . ئاغای جەعفەری لەکاتی شەڕی نێوان ئێراق و ئێران بەرپرسی هەواڵگەری و قەرارگەری ڕەزامەندی سووپای پاسدارانی ئێران بووە ... لە هەمان کاتیش دۆستی هەردوو سەرکردەی کورد جەلال و مسعوود بارزانی

بووە و ، پەیوەندیان بیٚ پچڕان بوو لە نێوان هەردوولایەندا ... ئەم جۆرە پەیوەندی و کارانە داهاتووی کورد و کوردستان دەخەنە مەترسی لە داهاتوودا لە ناوچەکە دا .

٢٠٠٧/١/١٢ سەرەك وەزیرانی تورکیا – ڕەجەب تەیب ئۆردوگان – هەڕەشەی بە کوردستانبووی شاری کەرکوك لە باشووری کوردستان دەکات ... لەسەر کێشەی کەرکوك و کوردستانی بوونی ئۆردوگان وەهای لێهاتووە کە لە هەموو بۆنەیەکدا ئەگەرە وەکو پەیوەندی بە کەرکوك و کوردستانبوونی نەبێت ... ئەو باس لە کێشەی کەرکوك دەکات و بە کێشەی تورکی دەزانێت ، باس لە هێزی پێشمەرگەی پارتی کرێکارانی کوردستان – PKK – دەکات ... و بە مەترسیەکی گەورە بۆ سەر تورکیا دەزانێت . لە خۆباییبوونی ئەو سیاسەتمەدارە ڕەگەز پەرستە بەرچاوتەنگە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی ، کە لە هەموو کات و ساتێکدا هێرش بکات بۆ سەر داگیرکردنی هەرێمی باشووری کوردستان ، کە بەڕەوا و مافێکی نەتەوەیی تورکی دەزانێت .

سەرەك وەزیرانی تورکیا ئۆردوگان ئەو مافە بەخۆی و بە دەووڵەتەکەی دەدات ، کە هەمیشە دەست بخاتە کاروباری ئێراق و کوردستانەوە بە ئەرگۆمێنتی هاتنی ئەمەریکیەکان بۆ ئێراق چۆن مافێکە ئەمەریکیەکان بە خۆیانداوە ، ئاواش تورکیا مافی کەرکوك لە دەستی کوردەکان دربهێنێت و هێرش بکاتە سەر هەرێمی باشووری کوردستان .

دوژمنان و ناحەزان و نەیارانی کورد هەموو جۆرە مامەڵەیەك لە پێناو کۆتایی هێنان بە باری هەرێمی باشووری کوردستان بە ڕەوا دەزانن . ئەوەی پارێزگای کەرکوك و شاری کەرکوك و ئاسایشی نەتەوەیی کوردی بەلاوە گرنگ نەبێت ، سەرانی کوردن و هەر بۆیە هەموو دەنگێك بۆ کەرکوك و پاراستنی کوردستانیەتی کەرکوك دەنگێکی ڕەواو هەست و هۆشێکی نەتەوەیی و نیشتیمانیە ... نەبوونی پێچەوانەکەیەتی ، پێویستە لەسەر هەموو میدیاکانی کورد کە تەواوی وزە و هێز و توانای خۆیان بۆ ئەم مەبستە بخەنە گەڕ ، لە پێناو بەگەیاندنی ئامانجەکانی گەلی کوردستان .

٢٠٠٧/١/١٣ سەرۆکی پاکستان – پەرویز مووشەرف – و سەرەك وەزیرانی پاکستان–

شەوکەت عەزیز – لە گەڵ وەزیری دەرەوەی هندستان – برناب موکرگی – لە ئیسلام ئابادی پایتەختی پاکستان کۆبوونەوە بە شێوەیەکی فەرمی ... گفتووگۆکانیان لە سەر پەیوەندی نێوان ئەم دوو وولاّتە دژ بە یەکتر بوو ، لە سەر هەرێمی کەشمیری دابەشکراو لە نێوان هەردوو وولاّتدا ، لە دوای بە دەست هێنانی سەربەخۆیان و دەرچوونیان لە ژێر ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای مەزن .

ئەمەش لە دوای هێرشەکەی چەکدارە ئیسلامیەکان هات بۆ سەر شاری مۆمبای هندی لە مانگی/ ٢٠٠٦/٧ ، کە لە ئاکامی ئەو هێرشە ١٨٦ کەس گیانیان لە دەست دا ... هەروا گفتووگۆکان لەسەر باری پەیووەندیەکانی ئەم دوو وولاّتە بوو ، لە بواری ئابووری بە بوژاندنەوەی ڕێکەوتنەکانی بازرگانی لە باشووری ئاسیاو ، هەروا هێڵی بۆڕیە نەوتیەکانی نێوان ئێران و پاکستان و هندستان و گاز بوو ... هەروا بە گۆڕینەوەی کۆنسلیە و کردنەوەی بارەگاکانیان لە شارەکانی کەراتشی و مۆمبای لە وولاّتەکانیاندا .

٢٠٠٧/١/١٤ سەرۆکی پێشووی لوبنان – ئەمین جومەیل – بۆ یەکەم جار لە سەردانێکیدا لە ٢٠٠٦/١٠/٢٩ گەیشتە شاری هەولێری پایتەخی هەرێمی باشووری کوردستان و لە لایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان – مەسعوود بارزانی – و – کەریم سنجاری – پێشوازی لیکرا . بەلاّم ئامانجی ئەم سەردانەی سەرۆک کۆماری پێشووی لوبنان بۆ کوردستان نادیار بوو ، کە لە پێناو چی و بۆچی سەردانی باشووری کوردستانی کرد .

جێگەی باس کردنە کە سەرچاوە لوبنانیەکان و عەرەبیەکانیش ئەو سەردانەی ئەمین جومەیل بە سەردانێکی پەیوەندی تایبەتی دادەنێن ، وەك لە بەر ئەوەی بە ماوەی سێ هەفتە لە دوای گەڕانەوەی ئەمین جومەیل بۆ لوبنان کورەکەی – بیار جومەیل – لەلایەن چەند چەکدارێك تیرۆرکرا ... کوڕەکەی ئەمین جومەیل وەزیر و پەرلەمانتارێکی لوبنانی بوو ... بەر لە کوشتنی بیار جومەیل بە چەند ڕۆژێك ئاسایشی لوبنان دەستی بەسەر ٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠$ هەشت سەد ملیۆن دۆلاردا گرتبوو لە فڕۆکەخانەی لوبنانی ، کە لە فڕۆکەخانەی هەولێر بۆ لوبنان لە چەند سەندوقێك ڕەوانەی

لوبنان کرابوو .

کە بۆ بیار جومەیل ڕەوانە کرابوو لەلایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان مەسعوود بارزانی ... بە پێی ئەو سەرچاوە لوبنانیانە ڕەوانە کردنی ئەو پارەیە بە ڕێکەوتن بوو ، لە نێوان ئەمین جومەیل و مەسعوود بارزانی و لە پێناو ڕەوانەکردنی بۆ بانکە تایبەتیەکانی خۆیان . کە پارەکە بە پارەی ڕەش حساب دەکرا و ، بۆ ئەوەی بۆی سپی بکرێتەوە لە ڕێگەی خستنە ناو بانك و مامەڵە پێکردن .

بەڵام مافیاکانی لوبنان هەر زوو هەستیان بەو کارە کردووە و لە ئاکام بیاریان تیرۆر کرد و پارەکەی کەوتە بانکی لوبنان ، بە لە ژێر دەست ئاسایشی لوبنان ... بردنی پارە و ڕەوانە کردنی بۆ لوبنان ڕاستە ، بەڵام ناوەڕۆکی کارەکە چۆنە ، ئەوە پەیوەندی بە مەسعوود بارزانی و ئەمین جومەیلەوە هەیە لە ئەنجامدانیدا ...؟..!.

http.syriatrutn.org/a/. hakikah/index.php? option= com .cantent.

٢٠٠٧/١/١٤ لە پێناو بە دەست هێنانی سەر بەخۆیی بۆ هەرێمی کۆسۆڤۆ و سەرۆکی حکومەتی کۆسۆڤۆ – ئەگیم تشیکۆ – داوای لە دانیشتووانی سربەکان کرد ، لە هەرێمەکەدا لەگەڵ کەمە نەتەوایەتیەکانی دیکەی هەرێم ، بە پاڵپشتی کردنی لە پێناو بە ئەنجام گەیاندنی کارە هەمەلایەنەکانی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی هەرێمەکە ، وەك دەووڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سنووری دانپێنراو لە ناوچەکەدا .

هەروا داوای لە سربە هەڵاتووەکان و کەمە نەتەوایەتیەکانی دیکە کرد بگەڕێنەوە سەر سامان و ماڵەکانیان و لەلایەن حکوومەتی کۆسۆڤۆ مافیان و سامانیان پارێزراوە . ئەم لێدوانەی تشیکۆ لەو کاتە هات کە لەگەڵ دانیشتووانە سربەکان لە یەکێ لە گوندەکانی ناوچەی – برزرین – لە باشووری هەرێمەکە ئەنجامیدا ... هەروا لەلایەکی دیکە نووسەر و ڕۆژنامەنووسی ناوداری ناوچەکەو سربیا– فیتوون سووروی – لە ڕاگەیاندنێکیدا ، کە لە شاری برشتینای پایتەختی سربیا بوو گووتی :– بڕوا بکەن کە کۆمەڵگای نێوودەووڵەتی دان بە سەربەخۆیی کۆسۆڤۆ دەنێ و دەچنە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش ، بە ئامانجگەیاندنیشی بەر

لــە مــانگی/ ٩ ی داهــاتوودا ... ســووروی ئەنـدامی شــاندی ئـەلبانی گفتووگۆکـەر بووە لەگـەڵ سربیا بە چاودێری ڕێکخراوی نێوودەوڵـەتی – مارتی ئهتیسار – لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی کۆسۆڤۆ لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/١/١٤ پەرلـەمانی بۆسـنە – هرسـك ، کـە لـە ٤٢ ئەنـدامی موسـڵمان و سـربیەك و کرواتیــەك پێکهـاتووە ... بـە زۆرینـەی ٢٩ دەنـگ ڕەزامەنـدی کـرد لەســەر دامەزرانـدنی سـربی – نیکـۆ شـبیرتش – ی تەمـەن ٥٠ سـاڵ بـە سـەرۆکی نــوێی حکوومــەتی کۆمــاری بۆســنە – هرســك . لــە جێگــەی ســەرۆکی حکوومەتی ئایین مسلم – عـەدنان تیرزیـتش – بـە هـۆی تـەواوبوونی ماوەی دەسەڵاتەکەی لەسەر وولاتەکەدا .

ئەم دامەزراندنـەش بە پێـی دەسـتووری وولاتەکەیـە کـە سـەرۆك بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ هەڵدەبـژێردرێت بـە پێـی ڕێکـەوتنی – دایتـۆن – کـە دەبـێ گۆڕینەوەی دەسەڵات بە نۆبە بێت لە نێوان پێکهاتەکانی بۆسنەی ئیسلام و کرۆات و سربەکان لەسەر پۆستە سەرەکیەکانی ئەم وولاتەدا .

لەگەڵ ئەوەشدا سـەرۆکایەتی دەووڵـەت بە ناوی دەسـتەی سـەرۆکایەتی کۆمــاری –– بۆســنە – هرسـك –– ە و لــە ســێ ســەرۆك پێکهــاتووە ، لــە ئیسلامێك و سـربیەك و کرواتیـەك ... کـە بۆ هەریەکـەیان لـەو سـێ سـەرۆکە مافی بەکارهێنانی ڤیتۆی هەیە لە بڕیارەکـانی دەسـتەی سـەرۆکایەتی ، گـەر بڕیارەکە لە بار نەبوو بە پێی دەستوورو ڕیکەوتنی دایتۆن ... هـەر یـەك لـەو سێ سەرۆکە سەرۆکایەتی دەستەی سـەرۆکایەتی دەگرتـە دەسـت بـۆ مـاوەی هەشـت مـانگ . سـەرەڕای بـوونی هەنـدێ مەترسـی لـە لێدوانەکـەی سـەرۆکی هەڵبژێردراو لـە وتەکانیـدا لـە داهاتووی بۆسـنە و هرسك ، بە هـۆی بـوونی بیروو بۆچوونی توونـدی نەتەوەیی سربی لەلایەن دانیشتووانی وولاتەکە .

٢٠٠٧/١/١٥ سـەرۆکی دەسـەڵاتی فەڵەسـتین – مـەحمود عـەباس – لە ڕاگەیاندنێکیدا لـە بـەردەم وەزیـری دەرەوەی ئـەمـریکا – کونـدالیزارایس – لـە شـاری ڕامـەڵا گـووتی:– چارەسـەری کـاتی بـۆ دەوولـەتی کـاتی ڕەتدەکەینـەوە ، کـە هـەر شتێکی کاتی بە بڕیارێك ، یاخوود بە بیروو بۆ چوونێك داهـاتووی کێـشەدار دەبێـت و ئێمـەش لەگـەڵ دەوولـەتی کـاتی و چارەسـەری کـاتی بـۆ کێـشەی نێوان دەووڵەتی فەڵەستین و ئیسرائیل نین .

لە هەمان کات و وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لێدوانەکەی سەرۆکی فەلەستینی بە باشی هەڵسەنگاند و تێگەیشت ... بەر لەوەش لە ڕۆژی ١/١٤ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردن لە گەڵ شا عەبدوڵڵا کۆبوونەوە و شا عەبدوڵڵاش ئەو هەڵوێستەی ڕەتکردەوە بە پێشنیاری دامەزراندنی دەوڵەتی کاتی فەڵەستین ... و ئێمە لەگەڵ دەوڵەتێکی فەڵەستینی خاوەن سنووری سەربەخۆیین شان بە شانی دەوڵەتی فەڵەستینی و بەردەوام بوونی هاوکاری و برایەتی و بەیەکەوە ژیان لە دراوسێیەتی لە ناوچەکەدا .

هەروا سەردانەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کوندالیزاش هەر بۆ ئەم مەبەستە بوو ، کە لێی سەرنەکەت و سووڕانەوەیەکی بە وولاتانی سعوودیە و میسر کرد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا .

٢٠٠٧/١/١٥ دادگای تێهەڵچوونەوەی دەستووری لە ویلایەتی – باڤاریا – ی ئەڵمانیا داوایەکی – ڕایەڵەی ئیسلامی – ڕەتکردەوە لە بارەی پۆشین لەلایەن دانیشتووانە ئیسلامەکان ، بە تایبەتی مامۆستایانی ئافرەتی هەڵگری بڕوای ئاینی ئیسلام ، لە دام و دەزگاکانی حکوومی و قوتابخانەکان لە وویلایەتەکەدا.

باڤاریا هەرێمێکی سەربەخۆیە لە ناو سنووری ئەڵمانیای یەکگرتوو ، مافی خۆیەتی کە هەر یاسایەك دەربکات کە پەیوەند بێت بە وویلایەتەکە و گونجاو بێت لە گەڵ دەستووری ئەڵمانیا . هەروا لە لایەکی دیکە دانیشتووانە ئیسلامەکان نارەزاییان دەربڕی بەرامبەر بەو یاسایە و قەدەخەکردنی پۆشین لە ساڵی ٢٠٠٤ و لەگەڵ ئەوەشدا ڕێز لە بیروو بۆچوون و بڕوای هەموو ئاینەکان گیراوە و کاردانەوەی خراپی نیە لە سەر وویلایەتەکەدا .

٢٠٠٧/١/١٧ گرێدانی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی هاوکاری وەزیرەکانی دەرەوەی کەنەدا و لە شاری کویتی پایتەختی دەوڵەتی کوێت و بە بەشداربوونی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا – کۆندالیزا رایس – لە کۆبوونەوەکە و لەگەڵ وەزیرەکانی ، میسر و ، ئەردەن و ، هەروا شانشینی سعوودیە ، دوای یەك هەفتە لە ڕاگەیاندنە ستراتیژیەکەی سەرۆکی ئەمەریکا ، لە پێناو بەرپا

کردنـی بـاری ئارامی و ئاسایش لـه ئێـڕاق و بەتایبـەتی لـه شاری بەغدای پایتەختی ئێڕاق .

لـەو کاتەشـدا شـاری بەغـدا و شـارەکانی دیکـەی ئێـڕاق تووشـی چـەندین کـردەوەی تیرۆرسـتی بـووە ، کـە بـووە هـۆی کـوژرانی ١١٥ کـەس وزامـدار بوونی زیاتر لە ٢٠٠ کەس .

هەروا لە دوای کۆبوونەوەی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لەگەڵ وەزیرەکانی ئەنجوومـەنی هاوکاری وولاّتـانی کەنـداو لـە شـاری کوێـت ، لـە کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەوانیـدا لـە نێـوان کۆنـدالیزا رایـس و وەزیـری دەرەوەی سـعوودیە – سعوو فەیسل – گووتی :-

سعوودیە لە ١/١٦ داوای لە حکوومەت و پێك هاتەکانی ئێڕاق کـردووە ، کـە هەموارکردن لە دەستووری ئێڕاق بکرێت ، ئەویش بۆ دابینـکردن و ماوەدان لە پێش پیك هاتەکانی گەلانی ئێڕاق ، بەشداری کردنی هـەموو لایەنـەکان لـە کـارە رامیاریـەکان ... هـەروا گـووتی :- سـعوودیە لەگـەڵ سـتڕاتیژیەکەی ئاسایشی سەرۆکی ئەمەریکا – جۆرج بۆش – دایە لە ئێڕاق .

شـایانی باسـە کـە دەسـەلاّتدارانی سعوودیە ڕۆڵـی بالاّیـان لەگـەڵ وولاّتـانی ئێران و ، تورکیا و ، سووریا هەیە لـە دەسـت تێوەردانی کاروبـاری نـاوخۆی ئێڕاق ... بە تایبەتی دژی ڕژێمی فیـدراڵێن لـە ئێڕاق و فیدڕالیـەتی کـوردیش لە هەرێمی باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێڕاق ، جێگـەی دڵـە ڕاوکێیانـە لە ئێراق و مەترسی دەسەلاّتی نوێی ئێڕاق لە سەر ناوچەکە و کارلێکردن لـە دەسەلاّتەکانیان لە ناوچە و وولاّتەکانیان .

٢٠٠٧/١/١٧ لیژنــەی ئاســایی کردنــەوەی پارێزگــای کــەرکوك لــە هــەرێمی باشــووری کوردستـان ، بڕیاریدا بە پێدانی هەر خێزانێکی دەرکراو لە سەردەمی ڕژێمـی بەعسی لە ئێراق تا ڕووخانـدنی لـە ٢٠٠٣/٤/٩ بە پارچە زەویـەکی جێنـشین لـە پارێزگاکـە و ، بـە تایبـەتی لـە شـاری کـەرکوك لەگـەڵ بـڕە پارەیـەك کـە ١٠,٠٠٠,٠٠٠ دە ملیـۆن دینــارە ، بـۆ ئــەوەی بگەڕێتــەوە ســەر شــوێنی پێشووی خۆی لە شارەکەدا .

لـە هـەمان کـات سـەرۆکی پەرلـەمانی کوردسـتان هۆشـداریدا بـەوەی عەرەبـە هاوردەکان و تورکمانەکانی بەرهەڵستکار و دژی ئاسایی کردنەوەی کـەرکوك

لە داهاتوودا ، کێشە بۆ پارێزگاکە و بە تایبەتی شارەکە دروست دەکەن ... هەروا لیژنەی بالاّی جیّ بە جیّکردنی مادەی/ ١٤٠ لە دەستووری ئیّراقی لە ١/١٦ کۆبووەوە لە بارەگای ئەمینداریەتی گشتی ئەنجوومەنی وەزیران لە شاری بەغدای پایتەختی ئیّراق . سەرۆکی نووسینگەی کەرکوك لە لیژنەکەدا لە لیّدوانیّکیدا کە کۆبوونەوەکە لە دوو تەوەردا خۆی گرتووە ئەویش :-

یەکەم :- دۆزینەوەی ڕیّگایەکی گونجاو بۆ گەڕاندنەوەی ئەو خیّزانە عەرەبانەی کە لە سەردەمی دەسەلاّتی سەدام هیّنراونەتە شارەکەو هەموو پیّداویستیەکی ژیانیان بۆ دابین کرابوو لەلایەن ڕژیّمی بەعس لە ئیّراق ، بۆ ناوچەو شارەکانی پیّشووی خۆیان ... کۆ لیژنەکە لەسەر ئەو تەوەرە ڕیّکەوتن بۆ دۆزینەوەی ئاسانترین و لەبار ترین ڕیّگا لە پیّناو بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارەدا .

دووەم :- تەوەری گەڕاندنەوەی ئەو کوردانەی کە لەلایەن ڕژیّمی بەعس لە ئیّراق لە شارەکە و پارێزگاکە دەرکراون بۆ ناوچەکانی دیکەی هەریّمی باشووری کوردستان و جیّگە پڕکردنەوەیان بە خیّزانە عەرەبەکان و بە پیّدانی هەر خیّزانیّك بە پارچە زەویەك و ١٠,٠٠٠,٠٠٠ دە ملیۆن دینار بۆ هەر خیّزانیّك لە پارێزگاکەدا .

جیّگەی باس کردنە کە پارێزگای کەرکوك لە هەریّمی باشووری کوردستان شاریّکی پڕ لە سامانی نەوت و گازە ، لە سالّی ١٩٢٧ ئەم شارە بەرهەمی نەوتی لیّ ئەنجام دەدریّت و ڕەوانەی دەرەوە دەکریّت ، کە ئەمەش بۆتە جیّگەی گرنگی پیّدان لە لایەن وولاّتانی عەرەب و دراوسیّی ئیّراق ، بە تایبەتی تورکیا و ، وولاّتانی دیکە وەکو ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بە دەست تیّوەردانی لە کاروباری ئاسایی کردنەوەی شارەکەو کۆسپ خستنە پیّش جیّ بەجیّکردنی مادەی/ ١٤٠ ی دەستووری ئیّراقی ، کە لە ٧٥٪ ی زیاتر دەنگی بۆ دراوە و لەسەری ڕیّکەوتن لە قۆناخی نویّی ئیّراق و بنیادنانەوەی و چارەسەرەسەرکردنی کیّشە تەشەنەدارەکانی هەلّواسراو بوونە لە ماوەی دەسەلاّتە یەك لەدوای یەکەکانی ئیّراق .

بگرە لە دامەزراندنی دەوولّەتی ئیّراق لە سالّی ١٩٢٠ بۆ ڕژیّمی شایەتی و

دوایی دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لە ساڵی ١٩٥٨ و ، دوایش ڕژێمەکانی بەعس لە ئێراق ، کە کێشەی کورد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو ئاڵۆزتر هەنگاوی پێـــدەنرێ ، ســـەرەڕای داننـــانی بـــە مـــافی کـــورد لـــە ســـاڵی ١٩٥٨ تـــاکو ڕێکەوتنامـــەی ئاداری/ ١٩٧٠ . بـە شێوەیەکی فەرمی و یاسایی بە مـافی ئۆتۆنـۆمی لـە چوارچێوەی سنووری ئێراق ، لەوانـەش ئیدارەی کـەرکوك لـە نێوان کوردو عـەرەب هاوبـەش بێت لـە پارێزگاکـە و ، بـە تایبـەتی لـە شـاری کەرکوك و ناوچەکانی دیکەی وەك خورمـاتو و مەخموور و چەندین جێگـەی دیکەی سەر بەو پارێزگایە بوون .

کەچـی لـە دوای ڕێکەوتنامـەی ئـاداری/ ١٩٧٠ دەسـت کـرا بـە گـۆڕنی دیموگرافی جووگرافی و سنووری بەر لە ساڵی ١٩٦٨ ، بە نانـەوەی کێشـەی دژوار و چارەسەر کردنی وا بە ئاسانی ناکرێت .

هـەر لـەم بارەیـەوە دەسـتووری هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، کـە لـە سـێ مـاددەی سـەرەکی پێکهـاتووە ئـەویش :- بـەمافی چـارەی خۆنووسـین و ناسـنامەی پارێزگـای کـەرکوك ، بـە تایبـەتی شـاری کـەرکوك و ئـەو ناوچـە دابڕاوانەی کە لەسەردەمی بەعس لە پارێزگای کەرکوك و ناوچەکانی دیکەی هـەرێم لـە پارێزگاکـانی هـەولێر و دهـۆك و سـلێمانی گوازراونەتـەوە سـەر پارێزگاکانی مووسڵ و سەلاحەدین و دیالە .

بـەڵام ئێـران و سـووریا و تورکیـا ، هۆشـداریان داوەتـە لایەنـە رامیـاری و نەتەوەیی و ئاینی و ووشیار بوونیان لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە هەرێمی باشووری کوردستان ، لەلایەن پەرلەمان و دەسەڵاتی کوردی لە ناوچەکەدا .

کەچی ئێران ١٩٥,٠٠٠ سەد و نەوەد و پێـنج هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـە و زیاتر لە ١٢,٥٠٠,٠٠٠ دوانزە ملیۆن و پێـنج سـەد هـەزار کوردی پێـووە لکـاوە ... هـەروا سـووریا زیـاتر لـە ١٧,٠٠٠ حەڤـدە هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشە و زیاتر لە ٢,٥٠٠,٠٠٠ دوو ملیۆن و پێـنج سـەد هـەزار کـوردی پێوە لکاوە و ، هەروا تورکیا زیاتر لەو سێ ووڵاتەی ئێران و ئێڕاق و سوریا کـە ٢١٥,٠٠٠ دوو سـەد و پـانزە هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـە و زیـاتر لـە ٢٢,٠٠٠,٠٠٠ بیست و دوو ملیۆن کوردی پێووە لکاوە کە دانیشتووی ٢٤ پارێزگان لە ناوچەکەدا .

ئەمانە مافی خۆیانە گەر هەرکێشەیەك بۆ گەلی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان دروست بکەن ... بەڵام ئەمڕۆ ... کورد دەبێتە خاوەنی دەوڵەتی خۆی ، گەر سەرکردایەتی کورد یەك هەڵوێست بێت ئەویش بە بەلاوە نانی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان لە کۆکردنەوەی سامان و پارە و پاوانکردنی دەسەلاّت و خۆ دەوڵەمەند کردن .

کە ئەم دەوڵەتانە هەموو هەوڵەکانیان بە رێژەی ٧٥٪ ی بۆ خزمەتکردنی گەل و نیشتیمان و دەسەلاّتەکانیانە و ٢٥٪ بۆ خۆیان و پارتەکانیانە بە پێچەوانەی سەرکردایەتی کورد کە لە ٧٥٪ بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانە و لە ٢٥٪ لە پێناو گەل و نیشتیمانەکەیانە ، کە ئەمەش بە شێوەیەکی دادپەروەرانە نیە لەلایەن سەرکردایەتی کورد لە کوردستان ، بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان ....!...؟.





٢٠٠٧/١/١٩ تیرۆرکردنی نووسەر و ڕۆمان نووس و ڕۆژنامەنووسی ئەرمەنی خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی — ئاگوس — هیرانت دینك — لە شاری ئەستەبوڵی تورکیا ، لەلایەن گەنجێکی تەمەن ١٨ ساڵان بە دەمانچە و لێدانی چوار گوللە لە ڕێی چوونەوە ماڵەکەیدا.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هیرانت دینك بە هۆی نووسینی لە سەر قەسابخانەکەی ئەرمەن لە باکووری کوردستان کە لە ١٩١٥/٤/٢٤ لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی ئەنجامدرا . لەلایەن دادگایی ئەستەمبوڵ لە مانگی/ ٢٠٠٥/١٠ بۆ ماوەی شەش مانگ زیندانی کرا . هەروا بە هەوڵیداوە نزیك بوونەوە لە نێوان گەلی تورك و ئەرمەن لە ناوچە و وولاّتەکەدا و لەو

پێناوەش چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنگرەی ئەنجامداوە .
دوای تیرۆرکردنــی هیرانــت ســەرەك وەزیرانــی تورکیـا – ڕەجـەب تـەیب ئۆردوگـان – لـە لێـدوانێکی ڕۆژنامەوانیـدا گـووتی :– کوشـتنی هیرانـت کوشـتنی هـەموو لایەکمانـە ... بـەلاَم هـەر لـەو کاتـەدا پەرلـەمان و سـەرۆك کۆمـاری ئـەرمینیا – ڕۆبـەرت کۆشـاریان – گووتیـان تـیرۆر کردنـی هیرانـت نیشانەی سەرسوڕمانی لێدەکەوێتەوە لێرە بە دواوە ، لـە بەر ئـەوەی هیرانت مرۆڤێکی ئەرمەن و تێکۆشەرێکی ڕاست گۆ بوو ، لە پێناو ڕاست کردنـەوەی هەڵەکان و بەرپاکردنی بەیەکـەوە ژیان لـە نێوان گـەلانی ناوچـەکە و بـەرگری کـردن لـە مـافی گـەلانی تورکیـا ، بەتایبـەتی گـەلی ئەرمـەن لـە وولاَتەکـە و لـە جیهاندا .

٢٠٠٧/١/٢٢ پاســـەوانی شۆڕشـــی ئێرانـی دەسـتی کـرد بـە تـــاقی کردنــــەوەی مووشــەکی فرجـای/٥ ، کــــە لــــە دووری ٧٥ کیلۆمـــەتر لـــە نیـــشان دەدات . ئەمـەش بـە هـۆی



جموو جۆڵیـەکانی هێزەکـانی سووپای ئەمـەریکا بـووە کـە کەشـتی هـەڵگری فڕۆکـەی ڕەوانـەی ئـاوی کەنـداو کردبـوو لـە ناوچـەکەدا. هـەر لـەو کاتەشـدا ململانێی نێوان ئیدارەی ئەمـەریکا و سـەرکردەکانی پارتی دیموکراتی ، کـە زۆرینـەن و کۆنگرێس و ئەنجوومەنی پیرانیـان لـە دەسـت دایـە و هۆشـداریان دایـە ئیدارەی سـەرۆکی ئـەمریکا – جـۆرج بـۆش – کـە لـە هـەر بڕیـارێکی بۆ هێرش کردنـە سـەر ئێـران ، نـا بێ بە بێ بڕیـارو ڕەزامەنـدی هـەردوو ئـەنجام هیچ بکات لە ڕامیاریەتی نێوو دەوڵەتی لە جیهاندا .



٢٠٠٧/١/٢٣ چینی مللی دووپاتی سەركەوتنی تاقیكردنەوەكەی كردەوە بە كەوتناندنەوەی مانگێكی دەستكرد ، كە ئەمەش بووە هۆی نانەوەی كێشە لەلایەن ڕای گشتی وولاّتانی جیهان ، بە تایبەتی ئەمەریكا و وولاّتانی هاوپەیمانی لە ئەوڕپای ڕۆژئاوا دا .

لەو كاتەشدا ووتە بێژی فەرمی وەزارەتی دەرەوەی چینی مللی لە لێدوانێكی دا گووتی :- چینی مللی سەرەڕای هەوڵەكانی ، بەلاّم لە ڕامیاریەتی نێوو دەووڵەتی و تاقیكردنەوە ئاشتیەكانی خۆی لانادات لە پەرەسەندن و پێشخستنی توێژینەوەی گەردوونی لە دەرەوەی سەرگۆی زەویدا. ئەم تاقیكردنەوەش بە بەكارهێنانی مووشەكێكی جۆری زەوی ئاسمانی مام ناوەند بە لەناو بردنی مانگی دەست كردی تایبەتمەند بە لێكۆڵینەوەی باری كەش و هەوا .

كە ئەمەش بۆ یەكەم جارە لە ماوەی ٢٠ ساڵی رابردوو ، دوای بەدەست هێنانی چینی مللی لەو تاقیكردنەوەیە دا ، یابان و ئوستڕالیا و ئەمەریكا تووشی مەترسی بوون ، لەوەی كە ئەم تاقیكردنەوە ببێتە هۆكاری پێشبڕكێی چەك لە گەردوون دا . هەروا چینی مللی لە لێدوانی ووتەبێژی فەرمی خۆی ، ئەوەی ڕاگەیاندبوو كە بەر لەو تاقیكردنوە ئاگاداری وولاّتانی دیكە بە تایبەتی ئەمەریكای كردبوو لە بە ئەنجام گەیاندنی تاقیكردنەوەكەی لە وولاّتەكەدا .

٢٠٠٧/١/٢٣ شانشین عەبدوللاّ عەبدولعەزیز شانشینی سعوودیە نامەیەكی دەست نووسی خۆی ئاڕاستەی سەرەك وەزیرانی توركیا – ڕەجەب تەیب ئۆردوگان – كرد ، كە ناوەڕۆكی نامەكە باسی لە بارودۆخی ناوچەكە دەكرد ، بە تایبەتی ، ئێراق و ، لوبنان و ، فەڵەستین و ، پەیوەندیەكانی وولاّتانی

ناوچەكە و پەیوەندی نێوان سعوودیە و توركیا .

نامەكەی بە دەستی وەزیری دەرەوەی سعوودیە – فەیسەڵ ئەلسعوود – لە كاتی سەردانە كورت و ناكاویەكەی بۆ توركیا ، دای بە دەستی ئۆردوگان و لـە كۆبوونەوەیـەكی كـورتی یـەك كاتـژمێری و ، دوایـی وەزیـری دەرەوەی سعوودیە بەرەو پاریسی پایتـەختی فەرەنسا كەوتـەڕێ بۆ بەشـداری كردنـی كۆنگرەیـەك ، كـە لـە سـەر بـاری لوبنـان و ناوچـەكەدا ئـەنجام دەدرێـت لـە فەرەنسا .

٢٠٠٧/١/٢٤ پەرلـەمانی كوردسـتان لـە كۆبوونەوەیـەكی نائاسـاییدا ، كـە سـەبارەت بـە هەڕەشـەكانی توركیـا و دەسـتتێوەردانی لـە كاروبـاری نـاوخۆی هـەرێمی كوردسـتان سـازیكردبوو ، دوای كۆتـایی هـاتنی دانیشـتنەكە ڕاگەیانـدێكی بلاَو كردەوە كە ئەمەش دەقەكەیەتی :–

١– ڕەتكردنـەوەی هـەموو جـۆرە دەسـتتێوەردانێكی توركیـا لـە كاروبـاری ناوخۆی ئێراق و هەرێمی كوردستان ، كە خزمـەت بە بەرژەوەنـدی دۆسـتانە و دراوسێیەتی نێوان هەردوولا ناكات .

٢ – هەموولایـەكمان پابەنـدین بە دەسـتووری هەمیشـەیی ئێـراق و جـێ بە جێكردنـی مـاددەی / ١٤٠ ، بـە هـیچ شـێوەیەك قبـوڵ ناكـەین ، جـێ بـە جێكردنـی ئـەو ماددەیـە و پرسـەی ڕاپرسـی لـە سـەر ئایندەی كـەركوك لـە مـاوەی دیـاریكراوی خۆیـدا دوابخرێـت . هـەروا پێویسـتە هـەر كێشـەیەكی پەیوەسـت بـە ئاسایشـی سنوورەكانی نێـوان توركیـا و ئێراقـی فیـدڕاڵ ، لـە ڕێـی پابەنـد بـوون بـە یاسـا نێودەوڵەتیـەكان و ڕێزگـرتن و پاراسـتنی سـەروەری نیشـتیمانی ، بـە ڕێگـای دایـەلۆگی سیاسـی و لێكتێگەیـشتن چارەسەربكرێت .

٣ – پێویـسـتە ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێـراق و حكوومـەتی فیـدڕاڵ ، هەڵوێـستی لێپرسـراوانەیان دژ بـەم جـۆرە دەسـتتێوەردانانەی دەوڵـەتی توركیا هەبێت ، و ڕێگا بە هیچ دەوڵەتێكی بیانی نـەدەن بـەو جـۆرە دەست لــە كاروبــاری نــاوخۆی ئێــراق وەربــدات . هــەر وەك پێویـسـتە پارتــە رامیاریـەكانیش كە لـە پەرلـەمان و حكوومـەتی فیدڕاڵی بەژدارن ، ئەوانیش ڕێگا بە ئەندامەكانیان نەدەن بەشداری لەو جۆرە كۆنفرانسانەدا بكەن ، كە

پێشتر مەرام و ئەنجامەكانی ئاشكرایە . چونكە كاریگەری خراپ دەكاتە سەر پرۆسەی رامیاری و پەیوەندیەكان و هاوپەیمانیەتی نێوان پێكهاتەكانی ئێراق .

٤ – داوا لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و بەریتانیا و یەكێتی ئەوروپا و نەتەوە یەكگرتووەكان دەكەین ، كە فشار بخەنە سەر توركیا بۆ ئەوەی دەست نەخاتە ناو كاروباری ناوخۆی ئێراق . هاوكاری و پشتیووانی مللەتی ئێراق بكات ، نەك لە رێی بەستنی ئەم جۆرە كۆنفرانسانە و هەرەشەكردنی بەردەوام دژ بە گەلی كوردستان و دەستخستنە ناو ئیرادەی گەلانی ئێراق ، كە پێچەوانەیە لەگەڵ دەستووری هەمیشەیی ئێراقدا .

٥ – دووپاتكردنەوە لە سەر بوونی پەیوەندی دۆستانە و پاراستنی بەرژەوەندیە هاوبەشەكانی نێوان توركیا و هەرێمی باشووری كوردستان و ئێراق دەكەینەوە . كە پێویستە لە سەر بنەمای رێزگرتنی دراوسێیەتی و بەرژەوەندیە هاوبەشەكان بەرەو پێش بچێت .

٦ – لە رێی ئەم راگەیاندنەوە داوەتی ، نوێنەرانی پەرلەمان و حكوومەت و هەر لایەنێكی دیكەی توركیای پەیوەندیدار بەو مەسەلەیە دەكەین ، سەردنی كوردستان بكەن ، بۆ باسكردنی هەموو كێشەكان و گەیشتن بە راستیەكان ، كە بە شێوەیەكی چەواشەكارانە دەگاتە دەست بەرپرسانی توركیا ... سەرۆكایەتی پەرلەمانی كوردستان .

٢٠٠٧/١/٢٤ گرێدانی كۆنگرەی – داڤووس – لە سویسرا بە ئامادە بوونی كۆمەڵێك لە كەسایەتی گەورەی پیاوانی كارەكانی راگەیاندن و میداكان لە جیهاندا . لە نێوان بەشدار بووان – شای ئوردن و ، سەرەك وەزیرانی بەریتانیا و ، سەرۆكی دەسەلاتی فەلستینی و ، ئەندامانی كۆنگرێسی ئەمەریكی و ، وەزارەتەكانی وولاتانی عەرەبی و ، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل و ، لە گەڵ بەژداربوونی سەرۆكی كۆمپانیای مایكرۆسۆفت لە وولاتەكەدا .

زۆر لەلایەنە رامیاری و ئابووریەكان ، وا تەماشای ئەو كۆنگرەیە دەكەن كە هەلێكی بێ وێنەیە بۆ سەركردەكان لە جیهان ، بۆ گفتووگۆكردن لەسەر ئەو بارە و ئەو تەوەرەی كە رووبەروویان دەبێتەوە لە بوارەكانی رامیاری ئابووری لە جیهاندا

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم جۆرە کۆنگرانە لە پێناو رزگار بوونی کێشەو گرفتەکانی وولاّتانی زلهێزی سەربازی و ئابووری و بازرگانیە لە جیهان ، لە پێناو پتەو کردن و ماوە چۆل کردن لە بەرامبەر کۆمپانیاو دام و دەزگا تایبەتیەکانیان ، بە گەورەترین و زۆرترین قازانج لە سەر حسابی خوێن مژینی هێزی جەستەی هەژاران و کەم دەرامەتان و داگیراوان لە جیهان ، لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە جیهان و لە گۆرنانی دادپەروەری لە ماف و ئەرك و ژیان لە سەر گۆی زەویدا .

٢٠٠٧/١/٢٤ رۆژنامەی ئیماراتی ئەمرۆ ، لە باەبەتێکیدا بلاّوی کردەوە کە لە ناوچەی کەنداو نزیکەی ٣٠٠ فرۆکەی تایبەت هەیە ، کە خاوەنەکانیان – بیزنسمانی – وولاّتانی کەنداون و زۆربەیان خەلّکی سعوودین ... هەروا ٥٠ بیزنسمانی ئیماراتیش فرۆکەی تایبەتیان هەیە.



جێگەی باسکردنە کە جێگری سەرۆکی جێ بە جێکردنی کۆمپانیای – رۆیالگیت – بۆ فرۆکەوانی – بیلال یوسف – بە رۆژنامەی ئیماراتی ئەمرۆی راگەیاند کە :– کردەوە تیرۆرستیەکان کە بە فرۆکە ئەنجام دەدرێن وای لە بیزنسمانەکان کردووە روو لەبەکارهێنانی فرۆکەی تایبەت بە خۆیان بکەن بۆ ئەنجام دانی کارەکانیان .

بە پێی سەرژمێریەکی کۆمپانیای رۆیالگیت مانگانە نزیکەی ٢٠٠ گەشتی تایبەت لە ئیمارات ئەنجام دەدرێت ، ئەمەش لە ئەنجامی بەرز بوونەوەی ئاستی داهاتی کۆمپانیاکان و بوونی ژمارەیەکی زۆری کۆمپانیا جیهانیەکانە لە وولاّتەکەدا ، کە لقیان لە ناوچەکەدا کردۆتەوە ... هەروا زۆربەی بیزنسمانەکان حەز دەکەن بە فرۆکە تایبەتیەکانی خۆیان گەشت بکەن لە وولاّتەکەدا .

٢٠٠٧/١/٢٥ لە سەر بڕیاری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان بە نووسراوی ژماری / ٧١٦ لێژنەیەك بۆ پێداچوونەوەی مینحەی سەنتەرە

رۆشنبیریەکان و ئەو رێکخراوانە پێك هات ، کە مینحەی مانگانە لە حکوومەت وەردەگرن و لە ئاکامی چەندین کۆبوونەوەی لێژنەکەو پێشنیار گەیشتە ئەوەی کە مانگانە ٢ دوو ملیارو ٣٩٨ ملیۆن دینار بە ٥١٢ سەنتەر و رێکخراو دەدا.

کە مانگانە ٤١١ ملیۆن دینار دراوەتە ٢٩٨ سەنتەرو رێکخراو لە شاری سلێمانی و ، ٩٨٦ ملیۆن دینار دراوەتە ٢١٤ سەنتەرو رێکخراو لە شاری هەولێر و دهۆك و ، لە کۆبوونەوەی یەکەی لێژنەکە کە لە هەشت کەس پێك هاتبوو لە ٢٠٠٧/٢/١٩ بڕیاریدا کە مینحەی ٨٦ سەنتەر لە دهۆك و هەولێر و ٤٨ سەنتەر و رێکخراو لە سلێمانی بڕدرێتەوە .

ژمارەی سەنتەرو رێکخراوەکان لە ٥١٢ سەنتەر و رێکخراوەوە ببێتە ٣٧٨ سەنتەرو رێکخراو ... ئەمەیە دادپەروەری مافی مرۆڤ لە ژیان و لە کار ، کە لەوکاتە رێزلێنان لە دەووری ٤٠٠ ملیۆن دینار بوو هەموویان بڕی ، کە ئەمەش ئەو پارەتە سەرەکیانە لێی بەرپرسیارن ، کە خۆیان دروست کەری کێشەکانن بە هۆی دژایەتی کردنی یەکتری لە پێناو بەرژەوەندییە تایبەتیەکان و گەل و نیشتیمان ....؟..!.

٢٠٠٧/١/٢٥ سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان سامانەکانی خۆی بۆ ئەندامانی رێکخراوەکە ئاشکرا کرد ، کە سامانەکەی ٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلارە.

جێگەی باسکردنە کە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان – بان کی مۆن – وەزیری دەرەوەی کۆریای باشوور بووە لە وولاتەکەی و بە هۆی لێهاتوویی ئەم مرۆڤە و بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانی لە پۆستە

جیاجیاکانی و هەوڵەکانی ، لە پێناو بەرقرار کردنی ئاشتی لە جیهان ، بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵبژێردرا ، بە پشتگیری کردنی لە لایەن ئەمەریکاو وولاتانی هاوپەیمان .

بان کی مۆن ، جگە لەو برە پارەیە خاوەنی خانووەکە لەگەڵ دوو پارچە زەوی لە شاری سیئۆلی پایتەختی کۆریای باشوور ... ئاشکرا کردنی سامانەکەی بان کی مۆن بە پێی بڕیارێکی ڕێکخراوەکە بووە ، بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئەندامان و دەستەی سەرۆکایەتی ڕێکخراوەکە چ سامانێکیان هەبووە بەر لە بوونیان بە ئەندام ، یاخوود بە سکرتێرو دوور کەوتنەوەیان لە هەر کێشەیەك ، کە دێتە پێشیان لەرووی دارایی و داهاتەکانیان لە ماوەی پلەکانیاندا .

٢٠٠٧/١/٢٥ بە پێی سەرژمێریەکی نوێیدا کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی هاتووچۆی سعوودیە ئەنجامدراوە ، بەر لەچەند رۆژێك بلاوکراوەتەوە ، کە ئەو ئافرەتانەی تا کۆتایی



ساڵی ٢٠٠٦ ئۆتۆمبێلیان کریووە یا ئۆتۆمبێلیان بەناویان کراوە گەیشتۆتە ٧٥ هەزار ئۆتۆمبێل ... هەروا ئەو ئافرەتانە نزیکەی ١٢٠ هەزار ئۆتۆمبێلیان هەیە و لەوانەش تەنیا یەك ئافرەت ٦٣٠ ئۆتۆمبێلی بەناو بووە ، کە لە تۆمارگای هاتووچۆی وولاتی سعوودیە بەناو کراوە و ... بەلام دیار نیە کە ئەو ئۆتۆمبێلانە هەمووی هی خۆیەتی ، یاخوود تەنیا بە ناوی ئەو ئافرەتە کراوە و یەکێکی دیکەیە بە هۆی باج بەناو ئەو کراوە .

جێگەی باسکردنە ئەو ئافرەتانەی کە ئۆتۆمبێلیان بەناو تۆمار کراوە ژمارەیان بەرێژەی ٦٠٪ زیادی کردووە ، بە بەراورد لە گەڵ ساڵی ٢٠٠٣ ... هەروا ئافرەتانی سعوودیە بەپێی یاسا بۆیان نیە ئۆتۆمبێل لێبخوورن و ئافرەتانی ئەم وولاتە بەردەوامن لە هەوڵەکانیان بۆ ئەوەی یاسایەك ڕێگەیان

پێبدات بەلێخۆڕینی ئۆتۆمبێل شان بەشانی پیاوان لە وولاتەکەیاندا.

٢٠٠٧/١/٢٥ لە ئەنجامی خۆ لێکدانی دوو فڕۆکـــەی هێلیکۆپتـــەری سەربازی لە نزیك شاری — مانتـا — ی ئیکـوادۆر ، کـە دەکەوێتە سەر زەریای هێمن ... یەکێك لەو هیلۆکۆپتەرانە وەزیـری بـەرگری گوادالـوب لاریڤای ئیکوادۆری هەڵگرتبوو لە گەڵ کچەکەی کە تەمەنی ١٧ ساڵان بوو گیانیان لە دەست دا .




جێگەی ئاماژە پێکردنە کە خاتوو لاریڤا تەمەن ٥٠ ساڵ لە ١/١٥ی ئەم ساڵە پۆستی وەزارەتی بەرگری گرتبووە دەست ... ئەویش کە لە پارتێکی چـەپڕەوی بـچووك بـوو لـە وولاتەکـەی و لـە دوای سـەرکەوتنی سـەرۆکی چـەپڕەوی ئیکـوادۆری — رۆفائیـل کۆریـا — ئـەو پۆسـتەی بـە خـاتوو — گوادالوب لاریڤا — بەخشی لە حکوومەتەکەی لە وولاتەکەیدا.

٢٠٠٧/١/٢٥ لـە کـاتی گرێـدانی کـۆنگرەی مونتـــەداری کۆمەڵایـــەتی جیهـانی لـە شـاری نـایرۆبی پایتــەختی کینیـا ... و لــە هـۆتێلی پێــنج ئەسـتێرە — وندسـوور — کـە نرخـی یـەك ژەم خواردن بـە ٧ دۆلار بوو . لەوکاتەشـدا منداڵـەکانی شـەقامە جیاجیاکـانی شـارەکە ، لـە برسـان هێرشیان کردە سەر هۆل و چێشتخانەی هوتێلەکەو هەرچی خواردنی سەر مێزەکان و ناو چێشتخانەکانەکە هەبوو هەموویان خوارد و ئەوەی بردیان .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە خاڵەکانی ئەم کۆنگرەیە لە باری کۆمەڵایـەتی و برسێتی بـوو لـە جیهـان و ، ئەنـدامانی کۆنگرەکـە ئـەو کارەشیان بـە چـاوی خۆیـان دیـت لـەم شـارە و بـاری هـەژاری لـەم وولاتـە و لـە وولاتـانی دیکـەی

جیهاندا .

٢٠٠٧/١/٢٥ سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك لە لێدوانێکیدا لە کۆنگرەی پاریس /٣ بە پشتیووانی کردن لە لوبنان ، گەیشتنە ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی کە ٧,٦٠٠ بلیۆن دۆلار ، وەك پشتگیری بدرێت بە لوبنان لەوانە وولآت و حکوومەتی شانشینی سعوودیە بە ١,١٠٠ بلیۆن و سەد ملیۆن دۆلاری بەر کەووت بە پشتگیری کردنی لوبنان . ئەمەش لە پێناو ئاسانکاری کردن لە هەڵسووڕاندنی کاروباری وولآتەکە و بەهێز کردنی ژێرخانی ئابووری ، لەوانەش ٧٠٠ ملیۆن دۆلاری کاش درایە حکوومەتی لوبنان لەلایەن وولآتانی بەشدار بوو لە کۆنگرەی پاریسی /٣ لە فەرەنسادا.

٢٠٠٧/١/٢٥ سەرۆکی ڕووسیای یەکگرتوو -- ڤلادیمێر پۆتین -- لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ هیندستان ، ئەویش بەشداری کردن لەکەرنەڤالێکی سەربازی بە بۆنەی یادکردنەوەی ڕاگەیاندنی کۆری هیندستان لە کیشووەری هیندیدا ، لەکاتی سەردانەکەی بۆ هیندستان چەندین ڕێکەوتنی ئابووری و بازرگانی و سەربازی مۆر کرد ، لە گەڵ سەرۆك وەزیرانی هیندستان -- مان موهان سینگ -- و -- سەرۆکی هیندستان – عەبدوکلام – لە شاری نیودەلهی پایتەختی هیندستان ، هەروا ڕێکەوتنیان لەسەر چوار بنکەی ووزەی ئەتۆمی کرد .

جێگەی باسکردنە کە پەیوەندیەکانی نێوان ڕووسیاو هیندستان لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتی جاران وە تاکو ئێستاش بەردەوامە و هیند لە پێشەوەی وولآتانی جیهانە لە کرینی چەك وتەقەمەنی لە ڕووسیا و چەکی بچووك تا دەگاتە مووشەك و فرۆکەو پەیوەندی سەرباز لە نێوانیان زۆر بەهێزو ، جگە لە پەیوەندیەکانی ئابووری و بازرگانی و رامیاری و رۆشنبیری .

هەروا جگە لە چەندین ڕێکەوتن لە نێوان ڕووسیاو هیندستان بە دوو لایەنە . بەلآم بریاریاندا بەرێکەوتنی سیٚ لایەنە لە نێوان ڕووسیا و هیندستان و چینی میللی ، لە بوارەکانی ئابووری و سەربازی و ئەتۆمی و بازرگانی . کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە وولآتانی رۆژئاوا دڵگران بکات بە تایبەتی ئەمەریکا .

٢٠٠٧/١/٢٦ نووسەرو ڕووناکبیری پۆڵەندی – ریزارد کایۆتشتسکیی – لە تەمەنی ٧٤ ساڵیدا ماڵئاوایی لەگەڵ پۆڵەندا و جیهان کرد لە وولاتەکەیدا . ئەم



نووسەرە بەکارکردن لە ڕێکخراوە هەمەلایەنەی و ململانێی ڕامیاری لە جیهانی سێیەم ناسراو بووە ... کایۆتشتسکیی دەربارەی زۆر لە شۆڕش و بزووتنەوە ئازادیخوازەکان لە نووسینی لە سەریان بەردەوام بووە ، لەوانەش لەسەر سەرکردە و شۆڕشگێڕی ناوداری ئەرژەنتینی و جیهانی –تشی گیڤارا – ی نووسیووە

هەروا لە سەر زیاتر لە ٢٧ شۆڕشی دیکەی جیهانی نووسییوە و یەکێك بووە لە کاندیدکراوە هەرە بەهێزەکان بۆ خەلاتی نۆبلی ئاداب بۆ ماوەی چەند ساڵ . لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نووسینێکی لە بارەی شیعر و ڕۆمان نەنووسیبوو . کایۆتشتسکیی لە ساڵی ١٩٥٩ تا ١٩٨١ کاری ڕۆژنامەوانی کردووە و خاوەنی چەندین کتێبە ، کە بۆ ٣٠ زمانی بیانی وەرگێڕدراوە کە گرینگترینیان کتێبەکەیەتی کە بە ناوی – ئیمپراتۆر – ی بووە و کاردانەوەی بەر چاوی هەبوو لەلایەن ڕووناکبیرانی جیهانیدا .

٢٠٠٧/١/٢٨ هاوولاتیانی ڕەسەنی وولاتی یەمەنی هەڵگری بڕوای جوولەکە لە گوندی سالم کە نزیکەی ٤٥ خێزان بوون . ئەویش بە هۆی هەڕەشە لێکردنیان لەلایەن ئیسلامە توندڕە و ئیسلامەکانی دیکەی عەرەب ناچار بوون جێگەو شوێنی خۆیان بەجێ بهێڵن

و ڕوو لە هوتێلێکی یەمەن بکەن لە باکووری وولاتەکە . ئەم خێزانانش بەر لە ١٠ ڕۆژ هەلاتبوون لە جێگەی خۆیان .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە دانیشتووانی وولاتی یەمەنی هەلگری بڕوای جوولەکە بەر لە زایینی و ئیسلامیش لەو ناوچە و هەرێمانە ژیاون و دوای دامەزراندنی دەوولەتی ئیسرائیل لە سالی ١٩٤٨ زۆربەی هەرە زۆریان کۆچیان بۆ دەوولەتی جوولەکە کرد ، کە زیاتر لە ٦٠,٠٠٠ شەست هەزار خێزان دەبوون ، لەوکات و دوای ئەویش بە هۆی دروست بوونی ترس لەلایەن بەرامبەر بە ئیسلامەکان ڕوویان لە ئیسرائیل کردوو ، ئەوەی کە لەو وولاتەش ماونەتەوە هەمووکاتێ لەوە دەترسن کە لەلایەن ئیسلامەکان پەلامار بدرێن . بەم هۆکارەش چەند سەدێك لە خێزانەکان لە وولاتە ماوون .

گەر ئیسلام بە تایبەتی ئیسلامی عەرەب دەسەلات و توانایان هەبێ ئەوەی هەلگری بڕوای ئیسلامی نەبێ بەزیندی چاوان زیندە بەچالیان دەکەن و ، ماوە بە کەسی تاك و کۆمەل و خێزان و بنەمالەو نەتەوە نادەن ، بە ئارەزووی خۆیان ژیان بەرنەسەر و تەنیا لە ژێر ڕەشمالی عەرەب و ئیسلام بن لە هەموو بوارە جیاجیاکان

گەر مێژووی نەتەوەی عەرەب لە بیابانی دوورگەی عەرەب بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێت.

کە چ نەتەوەیەکی دواکەوتوو بوونە بە تایبەتی بەهاتنی ئیسلام لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ، بە تایبەتی لە بواری ئابروویی – ئەخلاق – هەروا دوای ئیسلامیش و تاکو ئێستاش بەعەقلیەتی دوو هەزار سال بیردەکەنەوە ، لە مامەلە کردن و چارەسەر کردنی کێشەکان و دانانی غەیرە ئیسلام بە کافر .

وا بیردەکەنەوە تەنیا عەرەبی ئیسلام لە پلە یەکە لە ئاین و غەیرە عەرەب پلە دوو بە ناو ئایینی ئیسلام و دواتریش.

هەروا عەرەب خۆی بەخاوەنی هەموو شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەزانێ و بەخاوەنداریەتی و خۆی دەزانێ ، لە کۆشك و تەلار و بالەخانەو پرد و گۆرو مەزارگەو نووسینەکان .

لەگەل ئەوەشدا هیچیان هەر عەرەبی و ئیسلامی نین ... ئەهراماتی وولاتی

مصر و ، بابل و ، ئاشوور و ، سۆمەر ، لە وولاتی نێوان دوو زێی – میزۆپۆتامیا – هی عەرەب نیە و یەك عەرەبیش کاری لەو شوێنەوارە شارستانیەتانە نەکردووە ، گەر دەستی عەرەبی تیا بووایە هەمووی وێران دەکرد و ئاسەواری نەدەما لە جیهانی ئیسلامی ... هەروا دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەتایبەتیش تورکمان ، تەنیا شارستانیەت و شوێنەوارەکانیان دروستکردنی مزگەوت و تەکیە و دیوەخان و باڵەخانەی تایبەت بە دەسەلاتەکانیان بووە ، ئەویش بە بەنجەی دەستان دەژمێردرێن لە جیهاندا .

گەر عەرەب و تورکمان خاوەنی شارستانیەتن لە جیهان ... بۆچی لە سەرەتای بوونی عەرەب و دەسەلاتی عوسمانی و ، بەتایبەتی ئیسلام نەیان توانییە کارگەیەکی بچووك لە دەرزی دروستکردن ، تا دەگاتە چەك و تەقەمەنی و ئەلکترۆن و تەنکنەلۆژیا بکەن ... ڕاستە شارستانیەتی عەرەب و ئیسلام کوشتن و وێرانکردن و تۆقاندن و داگیرکردن و ئەنفال کردن و زیندە بەچاڵکردن و تالان و سووتاندنی گەلانی جیهان بووە ، لەو ناوچە و هەرێمانەی دەستیان پێ ڕاگەیشتووە و بەخاوەنداریەتی خۆیان زانیووە لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، بە تایبەتی بەرامبەر بە کورد و ئەرمەن لە سەر خاکی کوردستان ....!...؟.

٢٠٠٧/١/٢٩ کۆمەڵگای ڕووسیای یەککگرتوو تووشی مشتوومڕێکی بەردەوام بوونە لە دوای هەرەس هێنانی یەکیەتی سۆڤیەت لە دوای ساڵی ١٩٩٢ ... لە داهاتووی جەستەی مۆمیاکراوی



دامەزرێنەری دەوڵەتی سۆڤیەت و سەرکردەی شۆڕشی سۆشیالیستی ڕووسیا – ڤلادمیر ، لینین – هەروا بەرامبەر بە مەزارەگەکەی کە بە دیواری کەرملین نووساوە لە گۆڕەپانی سوور لە مۆسکۆی پایتەختدا .

جێگەی باسکردنە کە تەرمەکەی ئەم سەرکردەیە لە دوای مردنی لە

١٩٢٤/١/٢٤ بـه هـۆی نەخۆشـی راسـتەوخۆ جەسـتەكەی مۆمیـه كـراو لـه گـۆڕێكی بەتەختـەدار دروسـتكراو لـه تـەك دیـواری كـەرملین لـه نـاو شوشەبەندێك دانرا.

بـەلام دوای ئـەوە لـه سـاڵی ١٩٣٠ ئـەو مـەزارەی ، یـاخوود ئـەو گـۆرەی كـه ئێستا هەیەتی ، لەلایەن حكوومەتی سۆڤیەتی جاران دروستكراو – لینین – بە تەواوی جلەكانی خۆی لە ناو شوشە بەندێك دانراو رۆژانە بەسەدا كەس سەردانی گۆرەكەی دەكرد ، بە هۆی بەهێزی و توانای ئەم مرۆڤە بێ وێنەیە لە جیهاندا.

بەلام لە دوای نـەمانی یەكیـەت سـۆڤیەت و پـارتی كۆمەنیـست لـه دەسـەلات دوو بیروبۆچوونی لێك جیا دەركەوت كە :-

یەكـەم:- زۆربـەی چـەپڕەو و زانـا و روونـاكبیران و كەسـایەتیە سـەربازی نەوەی سۆڤیەت وایان پێ باشە ، كە هـەر وەك خـۆی بمێنێ لـه بـەر ئـەوەی لینین و گۆرەكەی هێمای سەركەووتنە لەهەموو بوارە جیاجیاكان .

دووەم:- بیروبۆچوونێكی وایان پێ باشە تەرمەكـەی لـه گۆرسـتانێك بـەخاك بسپێردرێت لە سەر رێنماییەكانی ئایینی مەسیحی و بەهۆی نـەمانی رۆڵـی بیروبۆچوون و دەسەلات و سەردەم سەردەمی دیموكراتیەت و بـازاڕی ئـازاد و بەیەكەوە ژیانە.

بەلام سـەرەرای كـەم و كـوری و كێشەو گرفتـەكان ئـەو دادپەروەریـەی كـه لـه رژێمـی سۆشیالیستی یەكیـەتی سـۆڤیەت و وولاتـانی دیكـەی نـاو پـەیمانی وارشۆ هەبوو ، لە هـیچ وولاتێكـی دیكـەی سـەرمایەداری و هاوپەیمانـەكان و وولاتە دیموكراتەكانی دیكە بەدی نەدەكرا لە جیهاندا .

٢٠٠٧/١/٣٠ كۆچی دوایی نووسـەرو بەرهـەم هێنـەری ئەمـەریكی –– سـیدش شـیلرۆن –– لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا ، لە ناوەندی ئایزنهاوری پزیـشكی لـه رانشۆمیراج لـه رۆژهەلاتی وویلایەتی لۆس ئەنجلۆسی ئـەمریكا ... بـه نەخۆشـی هـەوكردنی سـیەكانی ... شـایەنی باسـه ئـەم نووسـەرە لـه سـاڵی ١٩١٧ لـەدایكێكی جوولەكـەی ئـەلمانی و بـاوكێكی جوولەكـەی رووسـی چـاوی بـه جیهـان هەلهێناوە ... سەرەتای دەست بەكاربوونی ئـەم نووسـەرو بەرهـەم هێنـەرە لـه ساڵی سیەكان بووە . شایەنی باسە بەرهەمەكانی ئـەم نووسـەرە بـۆ ٥١ زمـان وەرگێـردراون و بـه ١٠٨ وولات بلاوبوونەتـەوە ، لـه سـاڵی ١٩٤٨ خـەلاتی

ئۆسکاری پێ بەخشراوە ... ئەم نووسەرە لە ژیانیدا درێخی نەکردووە لە نووسینەکانی لە پێناو خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و مرۆڤ لە سەر گۆی زەویدا

.

٢٠٠٧/١/٣٠ دادگای فیدراڵی ئەمەریکا سزای بەندکردنی بۆ – رۆبیرت شتاین – بە حەوت ساڵ بڕیەوە ... هەروا سزاکەشی بە بڕی ٦,٣٠٠,٠٠٠ ملیۆن بۆ بەرپرسێکیدی بڕیاردا ، کە تۆمەتی بەشداریکردنی لە تۆڕێکی ساختە و سپیکردنەوەی پارەدا لە سەردەمی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان لە ئێراق تۆمەتبار کرابوو .

جێگەی روونکردنەوەیە کە رۆبیرت شتاین لە مانگی/ ٢٠٠٦/٢ بەگەندەڵی و دزی تۆمەتبار کراوە و دانی بە دزینی پارە لە سندووقی ئاوەدانکردنەوەی ئێراق ناوە ، لەوکاتەی کە رۆبیرت بەرپرسی دارایی ئەو سندوقە بووە . رۆبیرت شتاین بە یارمەتی چەند بەرپرسێکی دیکە توانیوویەتی زیاتر لە ١,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی لە سندووقەکە بۆ ژمارەی بانکی بە ناوی – بزنس مانێکی – ئەمەریکی لە رۆمانیا بگۆری لەوکات .

هەروا شتاین دانی بەو کارەی ناوە لەکاتی کارکردنی لە ئێراق ، بە بەرتیل وەرگرتنی بە بری ١,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلار و ئۆتۆمبێل و چەندین کەل و پەلی دیکەی وەرگرتووە ... شتاین بەو پارە دزراوە چەك و تەقەمەنی کریووە و رەوانەی ئەمەریکای کردووە ، بۆ بەئەنجام گەیاندنی کاری تیرۆری تایبەت بەخۆی لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٢/١ لە سەرداەکەی بۆ تورکیا ، وەزیری دەرەوەی سووریا – ولید موعلم – لە دوای چەندین جار لە گفتووگۆی هاوبەشی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا – عەبدوڵلا گوڵ – و بەپرسانی تورکیا رێکەوتنێکیان مۆرکرد ، کە لە پێنچ خاڵ پێك هاتبوو لە سەر باری ئەمنی ئێراق و ناوچەکە . ئەویش :– بە ئاشتبوونەوەی گشتی و هەڵووەشاندنەوەی میلشیا و خشتەی کشانەوەی هێزەکانی سووپای هاوپەیمانان .

هەر لەو کاتەشدا سەرۆکی سووریا – بەشار ئەسەد – پێشوازی لە سەرۆکی دەستەی زانایانی ئیسلامی سووننە – حارس زاری – کرد و گفتووگۆکانیان بە ئارەزوو و خواستی خۆیان کۆتایی پێ هێنا ، لە بارەی باری ئێراق و داهاتووی ، ئەمەش لەو کاتە هات کە یەك هەفتە دوای

سەردانەکەی سەرەك کۆماری ئێراق جەلال تاڵەبانی هات بۆ سووریا .

سەرەڕای ئەوەش دانیشتووان و حکوومەتی سووریا دڵخۆش نەبوون بە لێدوانەکانی حارس زاری لە سووریا و ناوچەکە ، بە هۆی دەست تێوەردانی لە کاروباری ناوخۆی ئێڕاق لەلایەك و جێ بەجێکردنی ماددەی /١٤٠ لە لایەن کورد لەلایەکی دیکە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٢/٢ کۆچی دوایی سەرۆکی تورکمانستان – سابار موراد نیازۆف – ماوە دانێك بوو بۆ بیست ساڵی ڕابردوو بەشێکردنەوەو گفتووگۆ لە سەر ڕێرەوی داهاتووی دەوڵەت و دەسەلات ، لە پێش سەرکردەکانی دیکەی تورکمانستان بەتایبەت جێگرەکەی . هەروا لە هەموو کات و ساتێك و سەردەمێك ، کە سەرکردەی یەك کەسی کێشە و



نائارامی لە دوای خۆی بەجێ دێلی ، جا لە هەر وولاتێك بێت و جاریش هەیە سەرکردایەتی بە کۆمەڵیش کە سەرکردەی دەستەیەك ، یاخوود ئەنجوومەنێك کۆچی دوایی دەکات ، یاخوود دەسەلات بەجێ دێلی ئەو وولاتە و دەسەلاتەکەی دوای خۆی تووشی کێشە و ململانێ دەکات ، جا بەهەرەس هێنانی ، یاخوود پەرینەوەی بە قۆناخێکی نادیار و پر لە گرفت .

بۆ نموونە:–

دەست کێشانەوەی سەرۆکی بالای یەکیەتی سۆڤیەت میخائیل گوریانشۆف بووە هۆی هەرەس هێنانی یەکیەتی سۆڤیەت ، کە پەرلەمانی یەکیەتی سۆڤیەت لە ٢٥٠٠ ئەندام پێك هاتبوو لە گەڵ ٣٥ وەزیر لە ئەنجوومەنی وەزیران و ١٢ ئەندامی دەستەی ئەرکانی سووپا و دەستەکانی دیکەی دەسەلاتی دەووڵەتی سۆڤیەت .

لێرەدا دەسەلاتی تاکرەوی هۆکار و کاردانەوەی خۆی دەنوێنێ ، گەر دەسەلاتەکەی دکتاتۆر نەبێت و دیموکراتیش بێت ... لەو کاتەی سابار

موراد نیازۆف ، کە سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی کۆماری تورکمانستان بوو لە ساڵی ١٩٨٥ ، کە سەرۆکی ئەو وولاتە بوو ... دوای ئەوەی کە هەلبژێردرا بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی بالاّ لە ساڵی ١٩٩٠ و ، دوای ئەویش بە سەرۆکی تورکمانستانی سۆڤیەتی هەلبژێردرا بە کۆی دەنگی ٩٣٪ . دوای بڕیار دان لە سەر دەستوور لە ١٩٩٢/٦/٢١ و دوای ئەوەش لە هەڵبژاردنی نویێ ، دیسان لە ٩٩,٥٪ ی دەنگەکانی بە دەست هێنا ، کە پاڵێوراوی یەکەم بوو بۆ پۆستی سەرۆکی تورکمانستان .

دوای وەرگرتنی دەسەلاّت لە سەر هەموو دام و دەزگا بالاّکانی کۆماری تورکمانستان لە ساڵی ١٩٩٣ ڕایگەیاند ، کەخۆی هەموو شتێکە بەناوی – تورکمانیاس – واتە باوکی تورکەکان . دوای ئەوە لە مانگی/ ١/١٩٩٤ لە کاتی ڕاپرسیەك لەلایەن گەلی تورکمانستان ، دیسان ماوەی دەسەلاّتەکەی بۆ پێنچ ساڵی داهاتووی بۆ سەر سەر وولاّتەکە درێژکرایەوە و دوای ئەوەش لە ساڵی ١٩٩٩ لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نیشتیمانی بڕیاردرا کە – نیازۆف – دەسەلاّتدار بێ لەو پلە و پایەدا هەتا هەتایە ، واتە تاکو مردنی لە سەر وولاّتی تورکمانستاندا.

لە نیووەی دەسەلاّتی نیازۆف ، کتابێکی دەرکرد بەناوی – روخناما – کە ژیان وچەند چیرۆکێکی تیا کۆکردبووە ، کە ئەم کتابە لە هەموو قوتابخانەکان ببووە کتابی خوێندن و لە هەموو کاتەکان و لە هەموو قۆناخەکانی خوێندن . لە گەڵ چەندین بیروبۆچوونی دیکە ... لە وولاّتەکەدا.

لێردا سەیر ئەوەیە کە لە مرۆڤێك و لە سەرکردیەتی چەپرەو بەرەو مرۆڤێکی دکتاتۆر لە سەر دەسەلاّت . هەر لە دوای مردنی نیازۆف تورکمانستان بووە گۆرەپانی گورزەکێشکانێ لە نێوان وولاّتانی ناوچەکە و جیهان ، بەتایبەتیش ئەمەریکا . کە ئەم وولاّتە تووشی بارێکی نالەبار بوو ، بە سەر هەڵدانی تەواوی کێشە تەشەنە دارەکان و بەرپابوونی شەڕی نێوان لایەنگرانی نیازۆف و بەرهەڵستکارانی لە وولاتەکەدا . کە کێشەی نەوت و گازیش کێشەیەکی سەرەکی بوو لە نێوو وولاّتانی کێشووەرەکەو جیهاندا .

بەلاّم بە هۆی یارمەتی دانی و گەمارۆدانی بارودۆخەکەو دیاریکردنی رۆژی هەلبژاردن لەلایەن ئەنجوومەنی نیشتیمانی تورکمانستان لە ٢٠٠٧/٢/١١ و

لـه ئـەنجامی هەلبژاردنـەکانی – کوریـان گـول بیردمخەمـەدۆف – بەسـەرۆکی تورکمانـستان هەڵبـژێردرا . بـەلام لـە کـەش و هــەوا و بـارێکی نـوێی دوای مردنی نیازۆف لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٢/٣ وەزیری کشتووکاڵ و چاککردنی کشتووکاڵ لە ڕژێمی بەعس لە سووریا ، نووسـراوێکی بـە ژمـارە/ ١٦٨٢ دەرکـرد و بـەپێی ئـەو نووسـراوە کـردەی دابەشـکردنی باخـەکانی دەووڵـەتی لـە ناوچـەی درێـك لـە سـەر سـنووری باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق دەست پێکرد و ، هەر بە بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی کشتووکاڵ و چاککردنی کشتووکاڵ لە پارێزگای حەسەکە ، هەڵسا بە مـۆرکردنی گرێبەسـت لـە نێـوان کۆمەڵـەی جووتیـاران و شـاری دێریـك و ١٥١ خێـزان لـەو خێزانانـەی کـە لـەکاتی فراوانکـردن و چـەپەی عەبدوالعزیز و بە سەر پەرشتی باسل لە تووشی زەرەرو زیان هاتبوون و ، کە لە ٦/١٣ هەمان ساڵ لە پێناو بە دەست هێنـانی ئەم زەویانـەی خوارەوە کە لە سەر سنووری تورکیا وئێراقدان کە خاکی کوردستانە ئەویش:–

- تەعریبکردنی خەرابە و رەشك و گۆرینی ناوەکەی بۆ سوویدیە شرقیە کە رووبەرەکەی ٣٥٢٠ دۆنمە.
- تـەعریبکردنی قەدیربـەگ و گـۆرینی ناوەکـەی بـۆ تـل الاحـراء کـە رووبەرەکەی ٢٢٠ دۆنمە .
- تەعبیرکردنی فزرچی و گۆرینی ناوەکەی بۆ قفاء رجب کە رووبەرەکـەی ٨٠ دۆنمە .
- جێگەی ئاماژە پێکردنە دەسەڵاتدارانی ڕژێمی بەعس لە سووریا ئەم خێزانـە عەرەبانـەی لـە گونـدەکانی شـاری شـەدادە هێنـابوو ، کـە ١٠٠ کیلۆمـەتر کەوتۆتـە باشـووری شـاری حەسـەکە ، بـۆ گونـدە کوردنـشینەکانی گونـدەکانی شـاری دێزیـل و نزیکـەی ٥٦٠٠ دۆنمـە لەو زەویە لە خاکی کوردستان بە سەریان دابەشکرا .

رۆژنامەی خەبات ژمارە/ ٢٥٨٧.

٢٠٠٧/٢/٥ لە ڕاگەیاندنێکی پزیشکی کومپانیای – کلۆنید – بە هەڵسانی بـە کـۆپی کردنـی شەشـەمین منـداڵ لـە ئوسـترالیا ، کـە منداڵەکـەش کـوڕە ، سـەرەرای ئـەوەی کـە دەسـەلاتەکانی پزیـشکی و زانـستی و دەسـەلاتە



رامیاریەکان لە ئوستralیا ، ئەم کارە رەتدەکەنەوە ، بەلام کارە زانستیەکانی پزیشکی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز لەم بوارەدا.

جێگەی باسکردنە کە لە راگەیاندنێکی کومپانیای کلۆنیدا ، کە یەکەم منداڵ کە کچ بووە لە ساڵی ۲۰۰۲ لە دایک بووە لە رێگەی کۆپی کردن . ئەو منداڵە کۆپی کراوانەش هەمووی تەندروستیان باش بووە بە شێوەیەکی رێك وپێك لەم وولاتەدا.

سەرەرای ئەوەی کە وەزیری تەندروستی ئوستralیا – تۆنی ئەیووت – لە ووشەیەکدا دژی ئەو کارە وەستاو بەرێگەیەکی نا یاسایی ناو زەند کرد کە داهاتوویەکی خراپی لێدەکەوێتەوە ، کەچی ئەم کومپانیایە بەردەوامە لە کارەکانیدا بە بڵاوکردنەوەی لە سەر تۆری ئەنتەرنێت بەرەو راگەیاندنەکانی جیهان .

سەرچاوە :– BBC,dkabic.com یان Reuteks


۲۰۰۹/۲/٦



دادوەری مەدەنی ئەمەریکای پێشوو – پۆل پریمەر – لە ئێراق بەرامبەر لێژنەی کۆنگرێسی ئەمەریکی وەستاو بەرگری لە هەڵس و کەوت و رەفتارەکانی خۆی کرد ، کە لەو کاتەی دادوەری ئەمەریکا بوو لە ئێراق لە ساڵەکانی ۲۰۰۳ – ۲۰۰٤ ، ئەویش بە خەرج کردنی بە دەیان ملیار دۆلار لەو وولاتەداو دیارنەبوونی چەندین ملیار لەوکاتەی کە پۆل پریمەر بەرپرسیاریەتی ئەو وولاتەی لە دەست بوو.

ئەم برە دولارەش لە داهاتەکانی نەوت و ئەو پارەی کە بلۆکرابوون لە

خەزنــەکانی وولاّتــانی دەرەوەی ئێــراق ، لەلایــەن ئەمــەریکا و ڕێکخــراوی نەتــەوە یەکگرتووەکان . بەلام پۆل پریمـەر بە بـەرگری کـردن لـە خـۆی و لـە دەسەلاتەکەی ، کە لەو ماوەی لە ئێراق بووە ، ئەویش بـە خـەرج کردنـی ئـەو پارەیە لە دام و دەزگاکانی لە ئێراق و نۆژەنکردنەوەی و هەروا خـەرجکردنی مووچەی بە مەلاّینی خێزانە ئێراقیەکان.

ئـەویش بـە هـۆی لـە بارچـوون و بەرزبوونـەوەی نـارەزایی لەلایـەن پێـك هاتەکانی گەلانی ئێراق ، لە بوارەکـانی رامیاری و ئابووری و کۆمەلاّیـەتی و شەڕی ناراستەوخۆی ناوخۆی ئێراق . ئەمانە بوون بە هۆکاری خـەرجکردنی ئـەو بـرە پارەیـە و لـە پێنـاو هێورکردنـەوەی بارودۆخەکـەو بەرەوباشـبردنی ماوەی دەسـەلاّتی ئەمەریکا و هێزەکانی هاوپەیمانان لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٢/٧ دەســـەلاّتدارانی نەمســا توانیـــان تۆرێـــك لـــە بازرگانـەکانی کـە بازرگـانی بـــە منـــدالاّن بکـــەن دەسـتگیرکردن ، کـە زیـاتر لـە ٢٣٦٠ گومـان لێکـراون کە لە زیـاتر لـە ٧٧ وولاّتـدا لە جیهاندا.

لەم بارەیەوە وەزیری ناوخۆی نەمسا – گینـتێر بلاتـر – لـە ڕاگەیاندنێکیـدا گـووتی :– ئەوانـەی کـە گومانیـان لێـدەکرێت پارەیـەکی زۆریـان داوە بـۆ ئەوەی تەنیا تەماشای کارە سێکسیەکان بکـەن ، کـە بەشـێوەیەکی نامرۆڤانـە بەرامبەر بەو مندالاّنە ئەنجام دەدرێت.

ئەمەش لە دوای بلاّوکردنەوەی کاسێتی ڤیدیۆدا هاتووە لـە سـەر سـایتێکی ئەنتـەرنێت ، کـە کۆمپانیایـەکی نەمـسا ئەنجامـدەری بـووە لـە وولاّتەکـەدا. نەمساش دەستی بە لێکۆلّینەوە لە گەلّ وولاّتانی پەیوەندار کردووە . هـەروا لەگەلّ ئەمەریکا و ئەلمانیاش.

هـەروا وەزیـری نـاوخۆی نەمـسا گـووتی :– نووسـینگەی لێکۆلّینـەوەی

فیدراڵی ئەمریکا – ئیف بی ئای – لێکۆڵینەوە لە گەڵ ٦٠٠ گومانلێکراو ئەنجامدەدات . هەروا ئەلمانیاش لێکۆڵینەوە لە گەڵ ٤٠٠ گومانلێکراو ئەنجامدەدات و ، هەروا فەرەنساش لە گەڵ ١٠٠ گومانلێکراو دەدات . لە گەڵ ئەوەشدا ئەوەی بەو کارانە تۆمەتبار کراون تەمەنیان لە نێوان ١٧ تا ٦٩ساڵە.

دوای ئەوە پۆلیسی نەمسا گووتی :– ئەم کارە گورزێکە لە مێژوودا لە نەمسا بەگرتنی تۆری بازرگانی کردن بە شێوەیەکی نامرۆڤانە کە بەرامبەر بە منداڵان ئەنجامدەدرێت لە جیهان ...؟...!.

سەرمایەدارو رژێمی ئیمپریالیازم و ووڵاتانی فاشی و رەگەز پەرستی و شۆڤیتی بە سەرکردایەتی ئەمەریکا بەرپرسیارن لەو مەرگەساتە لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٢/٨ تابلۆی وێنە کێشی ناوداری هۆلەندی و جیهانی رامیرانت لەخانەی سۆنبیز بۆ زیاد کردنە ئاشکراکان لە شاری نیۆرکی ئەمەریکا راگەیاندرا ، کە تابلۆکە بە ٢٨,٨٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی فرۆشرا ... کریاری ئەم تابلۆیە نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات . ئەم تابلۆیە کە نرخەکەی ١٨ هەزار دۆلار بوو ، بەلاَم لە ئاکامی زیاد کردن گەیشتە ملیۆن دۆلار .

شایەنی باسە ئەم تابلۆیەی رامیرانت لە ساڵی ١٦٦١ وێنەی کێشا بوو ... واتە ٨ بەر لە کۆچی دوای ... درێژی تابلۆکە ٩٢×٧٥ سەنتیمەتر بوو ... ئەم تابلۆیە لە بارێکی سەخت لەلایەن رامبرانت وێنەی بۆ کێشراوە کە کاتێك ناچار کرا بۆ ئەوەی دەست لەسەر ماڵ و سامانی خۆی هەڵبگرێت.



٢٠٠٩/٢/٨ لەم رۆژەدا باراك ئۆباما پالاَوتنی خۆی بۆ سەرۆکایەتی کردنی ئەمەریکا راگەیاند ، لەناو پارتی دیموکراتی لە ئەمەریکا ، ئەویش شان بەشانی ، هیلاری کلنتۆن و ، ئەدوارد جۆنز و ، جۆن

بایدن . دوای ئەوەی کە لە هەڵبژاردنی سەرەتایی کە لە مانگی/ ٢٠٠٨/١ لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا ئەنجامدرا ، باراك ئۆباما سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا ، هەروا باراك ئۆباما لەکاتی پروپاگندەکانی رامیاری هەڵبژاردن ، توانی دوو کتێب بەرهەم بهێنێت .

یەکەمیان :- بەناوی -- احلام ما والیدی - لە سالی ١٩٩٥ کە باس لە ژیانی منداڵی و پەیوەندی لەگەڵ باوکی دەکات .

دووەم :- کتێبی بەناوی -- الجرأه علی الامل -- کە لە سالی ٢٠٠٦ بە چاپی گەیاند ، کە باس لە باری رامیاری وداهاتووی ئەمەریکا دەکات ، کە ئەم کتێبەی بە سەرکەوتووانە دەفرۆشرا لە جیهاندا .

جێگەی باسکردنە کە باراك حەسن ئۆباما لە شاری هۆنۆلولو لە ویلایەتی هاوای لە ١٩٦١/٨/٨ لە دایکێکی سپی پێستی ئەمەریکی لە کانساس و لە باوکێکی ئەفەریکی لە کینیا چاوی بە جیهان هەلهێناوە . دوای دوو ساڵ لە دایك بوونی ئۆباما دایك و باوکی لێك جیادەبنەوەو دایکی شوو بە پیاوێکی ئەندەنووسی دەکات و ئۆبامای لە گەڵ خۆی بردە ئەندۆنوسیا ، دوای ئەوە ئۆباما گەرایەوە ئەمەریکا و لە گەڵ دایکی ، واتە داپیری ژیانی بردە سەر.

ئەم کەسایەتیە لە بنەماڵەیەك و خێزانێکی هەژار لە دایك بووە و پەروەردە کراوە لەلایەن داپیری ، بەلآم بە هۆی زیرەکی و توانای هۆشمەندیەتی وسەرکەوتوویی دەستی بە خوێندن کرد لە قوتابخانەی - یۆناهۆ - لە هۆنۆلولو . کە ئەو قوتابخانەیە ، تەنیا منداڵە سپی پێستە دەوڵەمەندەکان تیایان دەخوێنند ، باراك ئۆباما لە خوێندنەکانی بەردەوام بوو تاکو بروانامەی بەکەلۆریۆسی لە یاسا بەدەست هێنا .

دوای ئەوەش پەیوەندی بە پارتی دیموکراتی ئەمەریکی کردو تا بووە سیناتۆر لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا ، توانی لە هەموو بوارە جیاجیاکان سەرکەوتن بە دەست بێنی . ئۆباما دژی رامیاریەتی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش بوو ، بە لێدانی ئێراق و ئەفگانستان و شەڕی دژ بە ئێراق و چەندین بواری دیکە.

دوای ئەوە باراك ئۆباما لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکا ، کە لە ٢٠٠٨/١١/٤ ئەنجامدرا . توانی سەرکەوتنێکی بێ وێنە بە دەست بێنێ بە

بوونی بە یەکەم سەرۆکی ئەمەریکای ڕەش پێست لە بنچینەدا ئەفەریکایی بوونی بە ٤٤ مین سەرۆکی ئەمریکا ، هەروا سەرکەوتنی بە ٣٤٩ دەنگ بەرامبەر ١٦٢ دەنگ بۆ جۆن مەکینی پالیۆرواوی پارتی کۆماری . کە ئەمەش بووە هۆی داگیرکردنی هەردوو ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا.

هەروا باراك ئۆباما لە ماوەی پروپاگەندەی هەڵبژاردنەکانی ٤٥٤ ملیۆن دۆلار خەرجی بوو ، تا بە سەرکەوتنی لە هەلبژاردنەکە ، بەرامبەر بە جۆن مەکینی ، کە خەرجیەکانی لەو هەڵبژاردنە ٢٣٠ ملیۆن دۆلار بوو . واتە بەهەردووکیان ٦٨٥ ملیۆن دۆلار خەرجی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بوو لەلایەن هەردوو پارتی کۆماری و دیموکراتی .

باراك ئۆباما دوو کچی هەیە بە ناوی مالیا ١٠ ساڵان و ساشا ٧ساڵانە خێزانەکەی مێشل کە دەرچووی کۆلیژی یاسایەو مامۆستای زانکۆیە . باراك ئۆباما سەرکردەیەکی ڕاستەقینە بە مانای سەرکردە ، لە بەر ئەوەی بە توانا و زیرەکی خۆی گەیشتە ئەو پلەو پایە بەرزە لە خێزانێکی هەژاری هەژارپەرست و بوونی بە سەرۆکی زلهێزترین دەوڵەت لەسەردەمی نوێی جیهاندا .

٢٠٠٧/٢/١٢ لە دوای یەك ڕۆژ لە گەڕانەوەی وەزیری دەرەوەی تورکیا – عەبدوللا گول – لە سەردانەکەیدا بۆ ئەمەریکا ، سووپاسالاری هێزەکانی تورکیا – یەشار بوویۆك ئەنیسنی – لە سەردانێکی چوار ڕۆژەیدا گەیشتە شاری واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا . لەم سەردانەشی – بوویۆك – چاوی بەجێگری سەرۆکی ئەمەریکا – دیك چینی – کەوت و لە هەمان کات لەگەڵ سووپا سالاری ئەمەریکا – پیتەر بیس – جێگری وەزیری بەرگری ئەمەریکا – ئەریك ئەدیلمان – کەووت.

لە لێدوانی ئەم بەرپرسانەدا گووتیان:– ئێراق و پارتی کرێکارانی کوردستان – پەکەکە – لە باکووری کوردستان و لەم وولاتە وهەوڵەکانی ئەرمەن بۆ ڕازی کردنی کۆنگرێسی ئەمەریکا ، ئەویش بۆ دەرکردنی بریارێك ، کە تورکیا بە ئەنجامدانی کوشتارکەی ئەرمەن لە ساڵی ١٩١٥ تۆمەتبار بکات ، کە لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە باکووری

كوردستان ئەنجامدرا . لە پێشەوەی ئەو ووتەو باسانەن كە سووپاسالاری توركیا – ئەنیت – لەگەڵ بەرپرسانی ئەمەریكا باسیان دەكات .
جێگـەی باسـكردنە كە پەیوەندیـەكانی نێـوان توركیـاو ئەمـەریكا لـە دوای ئەوەی كـە پەرلـەمانی توركیا رازی نـەبوو هێزەكـانی سـووپای ئەمـەریكا بە خاكەكەیدا بۆ ناو ئێراق گوزەر بكـەن ، و ساردی تێكەوتووە ، بەرپرسـانی توركیـا دەیانـەوێت لـە رێگـەی پەیوەنـدیان بـە ئەمـەریكاوە رامیاریەتـەكانی خۆیان لەناوچەكەدا بینە پێشەوەو رامیاریەتی خۆیـان لـە ناوچـەكە مسۆگەر بكـەن ، بـە گەیانـدنی ئاواتـەكانیان بـە تایبـەتی لـە سـەر خـاكی باكووری كوردستان .

٢٠٠٧/٢/١٢ لـــــە دوی هەواڵـــــەكانی حكوومـــــەتی هـــــەرێمی باشـــــووری كوردســـــتان گەیـشتە ئـەو قۆناخـەی كـە لــە بــواری بەرهــەمهێنانی نـــــەوت ســـــەركەوتنی بەدەســـت بێنـــێ ، بـــەڵام حكوومەتی ناوەنـدی بەغدا



و پەرلەمانی ئێراق و لەلایەن ئەندامانی هـەردوو مەزهـەب شیعە و سوونەی عەرەب ، دژایەتی هەواڵەكانی كوردیان دەكرد ، كە ئەویش رێكنەكـەوتن بـوو لە سەر یاسـای وەزارەتـی نـەوت ، كە بریتیـە لـەو بۆندانـەی كـە حكوومـەتی هەرێمی كوردستان مۆری كردون لەگەڵ كۆمپانیە بەرهەم و دەرهێنانی نەوتە بیانیەكان لە هەرێمەكەدا .
جێگەی روونكردنەوەیە كە لە دوای زنجیرەیەك كۆبوونەوە لە كۆبوونەوە لـە ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئێـراق لـە بـارەی یاسـای نـەوت . كـە ئەنجوومـەن بـەكۆی ٩٥٪ هـەنگاوەكان بـۆ بڕیـاردان لەسـەر یاسـای ئـەو وەزارەتـە تـەواو بوونە ، بەڵام خـاڵی سـەرەكی كـە وایكـردووە تاكو ئێستا ئـەو پرۆسـەیە دوا بكـەوێت ، كـە بریتیـە لـەو بۆنـدە نەوتیانـەی حكوومـەتی هـەرێمی باشـووری كوردسـتان بـۆ وەبـەرهێنانی نـەوت لـە كوردسـتان مـۆری كـردوون . لــەم

بارەیەوە گفتووگۆکان سەبارەت بە یاسای وەزارەتی نەوت ئێستا روو لە تەواو بوونە و زۆریان نەماوە.
بەلام حکوومەتی ناوەندی لە بەغدا داوا دەکات گشت بۆندە نەوتیەکان بەسەرپەرستی بەغدا بەرێوەبچێت ، ئەمەش لە کاتێکدا کە حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان مافێکی دەستووری خۆیەتی سەرپەرشتی بۆندەکانی وەبەرهێنانی نەوت لە کوردستان بکات ... لەگەڵ ئەوەشدا دەستووری هەمیشەیی ئێراق بریاری لەسەر ئەوە داوە ، کە کوردستان مافی ئەوەی هەیە کە سەرپەرشتی وەبەرهێنانی نەوت لە کوردستان بکات .
سەرەای تەواو بوونی پرۆسەی بڕیاردان لە سەر یاسای وەزارەتی نەوت . بەلام دوای ئەوە چەندین ماددە و برگەو خاڵ لە یاساکە دەستکاری کراو تاکو کۆتایی ساڵی ۲۰۰۸یش ئەم یاسایە مۆرنەکراو لەلایەن ئەنجوومەنی ئێراق پەسەند نەکرا .



۲۰۰۷/۲/۱۲ لە هەوڵەکانی رژێمی ئیسلامی لە ئێران ، بەردەوام بووە لە بەهێز کردن و زۆر کردنی ژمارەی سەربازەکانی و هێزی پۆلیس لە سەر سنووری نێوان حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان و ئێران هەرچەند ئەو سنوورەشی لەسەر خاکی هەرێمی رۆژهەلاتی کوردستانە ، ئەویش لە دژی بزووتنەوەی رزگاری کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان و لێدانی بنەکەو بارەگاکانی لە چیا بەرزەکانە لە سەر سنوور و قەدەخەکردنی هاتوو ، ئەویش لە رێگای تۆ پباران کردنی ناوچەکان بە تۆپ و تۆپی گەورەو هاوەن ، ئەمەش بە هەماهەنگی لە گەڵ رژێمی تورکیا ، کە هەردوو رژێمی ئێران و تورکیا لە سەر بزووتنەوەو دژ بە مافی کورد هاوپەیمانن لەناوچەکەدا .




٢٠٠٧/٢/١٢ سەرۆك كۆماری گینیا – لانــسانا كــۆنتی – لــە لێدوانێكی تەلەفزیۆنیدا بــاری ناكــاوی – واتــا یاســــای عروفــــی – راگەیانــــــد ، لــــــە وولاتەكەیدا بەتایبــەتی لە پایەتەخت ، بە هۆی خۆپیــــــــــشاندان و رێپێوانی سەندیگای كرێكاران لە وولاتەكەدا . ئەمەش بە هۆی بەردەوام بوونی لانسان لە دەسەلات بۆ ماوەی ٢٣ سالْ و گویْ نەدانە داخوازییەكانی گەلی گینیا ، بە تایبەتی چینی هەژار و كاسب كارو كرێكاران . لە هەمان كــاتیش دامەزرانــدنی ســەرۆك وەزیــران – دانــی دەســەلات بــەو و دانــی دەسەلاتی حكوومەت بە – ئۆژینی كامبرا –- كە ئەو كەسە نزیكترین كەسە لە لانسانا لە وولاتەكەو جیْ بە جێكەری داخوازی و بریارەكانی سەرەك كۆماری گینیایە لە ناوچەكە .

هــەروا دوای راگەیانــدنی بــاری ناكــاوی و دانــی دەســەلات بــە هێزەكــانی سووپای گینیا بە بەرپەچدانەوەی خۆپیشاندەران لە پایتەخت و شارەكانی دیكەی وولاتەكە ، كە ئەمەش بووە هۆكاری ئەوەی كە بارودۆخی ناوخۆی نێوان دەسەلات و گەلی گینیا بەرەو لێك ترازان هەنگاو بنیْ و كاردانەوەی لەسەر بواری و ئابووری و رامیاری و كۆمەلایەتی هەبیْ لە وولاتەكەدا.



٢٠٠٧/٢/١٣ لە لێدوانێکی گووتە بێژی فەرمی حکوومەتی ڕووسیای یەکگرتوو – میخائیـل گـامیتین – بـە نـاوی وەزارەتـی دەرەوەی ڕووسـیا لـە بەیاننامەیەکیدا ڕایگەیاند . کە لە ڕێگەی بالیۆزی ئەمەریکا لە شاری مۆسـکۆ ، داوامـان لـە واشـنتۆن کـردووە کـە بـۆ مۆسـکۆی ڕوون بکاتـەوە ... ئایـا لێدوانـەکانی وەزیـری بـەرگری ئەمـەریکا – ڕۆبـرت گیـتس – هەڵوێـستی فـەرمی ئیـدارەی ئەمەریکایـە ، یـاخوود بیروبۆچوونی تاکە کەسی خۆیەتی .

جێگـەی باسـکردنە کـە لـە هەفتـەی ڕابـردوو وەزیـری بـەرگری ئەمـەریکا – گیتس – لە بەردەم ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنـەرانی ئەمـەریکا ڕایگەیانـد ، کە پێویستە واشنتۆن هێزە سەربازییەکانی بەرەو پێش ببات بۆ ڕووبەروو بوونـەوەی بارودخـە گوماناوییـەکان لـە هەنـدێ وڵاتـی وەك – ڕووسـیا ، چینی میللی ، کۆریای باکور ، ئێران – لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٢/١٣ بە بۆنەی یاد کردنەوەی ٢٨ ساڵەی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران ، لە کۆشکی – گۆرەپـانی نێـوان ئەمەوییـەکان و نویـەلا – کـە ١٢٠٠ لـە بەرپرسـانی دام و دەزگاکـانی دەسـەڵاتدارانی ڕژێمـی سـووریا ئامـادە بـوون لەسـەر داوای بالیۆزی ئێران – حەسەن ئەختەری – لە سووریا . کە بەرپرسانی سووریا لە دام و دەزگـا و پـارتی بـەعس و کەسـانی ڕامیـاری و سـەربازی و ئـەمنی و ئایینی و ڕۆشنبیری ئامادەی ئاهەنگەکە بوون ، هـەروا سـەرۆکی پەرلـەمان – مـەحمود ئـەبرش و ، سـەرەك وەزیرانـی سـووریا محمـد نـاجی و ئەمینـداری پارتی بەعس عبداللە الاحمر و، بە دەیا بەرپرسـی دیکـە ئامـادەی ئاهەنگەکـە بوون لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا .

لـەو ئاهەنگـەدا سـەرەك وەزیرانـی سـووریا لـە ووتەکەیـدا گـووتی :– هەماهـەنگی و هاوکـاری لـە نێـوان هـەردوو وڵاتـی سـووریاو ئێـران تاکـە

رێگایە بۆ بەرەنگاربوونەوەی پاڵە پەستۆ ی دەرەوەی سووریاو ئێران لە وولاتەکان و لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٢/١٣ لە راگەیاندنێکی ووتە بێژی فەرمی حکوومەتی کۆریا باکوور گووتی :- لە دوای کۆبوونەوەکانی ئەمرۆ بە لێنیداوە کە کۆریای باکوور چالاکیە ئەتۆمیەکانی رابگرێت و گشت کارگەکانی تایبەت بەم بوارە دابخات ، لە بەرامبەریشدا یارمەتی لە بواری ووزە پێدەگات .

هەروا بە گوێرەی هەواڵی ئاژانسی دەنگوباسی فەرەنسا ، دووپاتی راستی ئەو لێدوانەی کردەوە کە کۆریای باکوور لە بەرامبەر راگرتنی چالاکیە ئەتۆمیەکانیدا ، یارمەتیەك لە بواری ووزە وەردگرێت کە دەگات ١٠٠٠,٠٠٠ یەك ملیۆن تەن لە نەوت ، بە مەرجێك رێز لەو بەڵێنە بگرێت ، کە کۆبوونەوەکەی ئەمرۆ داویەتی . هەروا نوێنەری ئەمەریکا لەو کۆبوونەوەیەدا بەڵێنی دا ، کە کۆریای باکوور لە لیستی وولاتانی پاڵپشت کاری تیرۆر بسرێتەوەو سزا بازرگانیەکانیشی لەسەر هەڵگرێت لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٢/١٤ لـە جیهـانی ئـادەمیزاد کـە – بینـگ یـانگ – کـە خـەڵکی هـەرێمی مەنگۆلیایـە بـە درێـژترین مـرۆڤ لـە جیهانـدا دادەنرێـت ، کـە درێـژی بـەژنی ٢,٤٠ دوو مـەترو چـل سانتیمەترە ، هەر لـەم ماوەیـەدا – بینـگ – ژیـانی هاوسـەرگیریەتی پێکـەوە نـا لـە گەل خاتوو – کسیا – کە تەمەن ١٨ ساڵە و درێـژی بـەژنی ١,٧٠ مەترێك و حەفتا سانتیمەترە .



ئاهەنگی گواستنەوەش لەلایـەن کۆمپانیایـەکی چینی ئـەنجام درا لـە پێنـاو پروپاگنـدەی خـۆی بـە بـەرز بوونـەوەی رۆڵـی ئـەو کۆمپانیـا لـە شـاری – ئیردۆسی – چینیدا . ئەم بەژن درێژییە کێشەی بۆ دروست کردبوو کەس لە کـچان رازی نـەدەبوون بـە هاوسـەرگیریەتی لـە گـەڵ بینـگ ، بـەڵام لـە دوای هەوڵێکی زۆر خاتوو کسیا رەزامەندی لە سەر هاوسەرگیریەتی لە گەڵ بینگ کـرد ، هـەروەك لـە ئینـسکلۆ پیدیای گینـس داهـاتووە . کە بینـگ درێـژترین مرۆڤە لە مێژوویی مرۆڤایەتی لەسەر گۆی زەویدا لە جیهان .

٢٠٠٧/٢/١٥ سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردگـان – ئـەمرۆ لـە لێدوانێکیدا گەشـبینی خـۆی لەمـەڕ پەیوەنـدی کـردن بـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان دەربـڕی و رایگەیانـد ، کـە دەکرێـت وولاتەکـەی پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان بەهێزتر بکات .

لێدوانەکەی سەرەك وەزیرانی تورکیا ئەنکەرەی بە سەر دوو بەرە دەسەڵات و حکوومەت و دەسەڵاتی سەربازی دابەش کرد ، کە سەرەك کۆماری تورکیا – ئەحمد سیزار – خـۆی خستە پاڵ بـەرەی سـەربازی وولاتەکەی . چونکە بـەلای ئەوانـەوە دانووسـتان و پەیوەنـدی کـردن بـە حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان هێلی سوورە بۆ تورکیا .

جێگـەی باسـکردنە کـە ئۆردوگـان لـە ڕێگـەی سـەردانەکەیدا بـۆ کۆمـاری تورکمانـستان ، ئـەم لێدوانانـەی لـە بـارەی پەیوەنـدی حکوومـەتی تورکیـا لەگەڵ حکوومەتی هـەرێمی باشووری کوردستان ڕاگەیانـد و گـووتی :- ئـەم پەیوەندییـــەش پێویـــستە لـــە بەرژەوەنـــدی و ئاشـــتەوایی وســـەقامگیری ئاسایشی هەردوولا بێت .

هـەروا ڕێکخـەری تورکیـا بـۆ دۆسـییەی پەکەکـە – ئـەدیب یاشـەر – لـە لێـدوانێکی گووتویـەتی :- ئەگـەر بـزانین پەیوەنـدی و دانووسـتاند لەگـەڵ حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان لەمـەر چارەسەرکردنی کێشەی پەکەکە ، و لە بەرژەوەندی ئێمـەدا بێـت ، ئـەوا ئەنکـەرە ئامادەیە ئـەم هـەنگاوە بنێـت لـە نێوانماندا .

سـەرەرای ئـەوەش بەرپرسـانی تورکیـا زۆربـەی لێدوانـەکانیان لـە سـەر ئەنجامـدانی ئۆپراسـیۆنی سـەربازییە لـە سـەر خـاکی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، بـەلاًم ئەمـــەریکا لەمـــەر ئـــەم لێدوانانـــە هۆشـــداری داوەتـــە حکوومەتی تورکیا .

٢٠٠٧/٢/١٦ ڕاگەیاندنی ووتە بێژی فەرمی حکوومەتی ژاپۆن – یاسۆ ئیسا شیۆزاکی – گووتی:- حکوومەتی ژاپۆن بریاریـداوە کە سزای بازرگـانی ئـەتۆمی بەسـەر ئێران بسەپێنێت ، بۆ ئەوەی بەرنامە ناوەکیەکانی خۆی بووەستێنێت . ئـەم هەوڵەش لە مالپەری – ئیلاف – بلاوکراوەتەوە ، کە ووتە بێژی حکوومـەتی ژاپـۆن لـە کۆنگرەیـەکی رۆژنامەوانیـدا گـووتی:- پێویـستە پارێزگـاری لـە ئاشتی رۆژهەلاًتی ناوەڕاست بکەین و ڕێگە لە بلاًوبوونەوەی چەکی ئـەتۆمی بگرین .

لە بەر ئەوە پێویستە هەندێك ڕێوشوێنی توونـد لـە بەرامبـەر ئێـران بگرینـە بەر . هـەروا گـووتی :- ئـەو سزاشەی کە ژاپـۆن بریاریـداوە لـە سـەر ئێـران بیسەپێنێ ، بریتیە لـە بلـۆك کردنـی پـارەی ١٠ دەزگـا ، لـە گـەڵ پـارەی ١٢ کەسـی سـەرمایەدار کـەوا مەزەنـدە دەکرێـت . کەپەیوەنـدیان بـە بەرنامـەی ناوەکییـەکانی ئـەتۆمی ئێران هـەبێت . هـەروا قەدەخـەکردنی فرۆشـتنی هـەر کەرەسـتەیەکی تەکنـەلۆژایی کـە پەیوەسـت بێـت بـە چالاکی نـاوەکی . ئـەم بریـارەی حکوومـــەتی ژاپـــۆنیش پـــشت بەســـتە بـــە بریـــاری ئەنجوومـــەنی

ئاسایشی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە جیهاندا.

٢٠٠٧/٢/١٧ لە بابەتێکی بڵاوکراوەی دنگووباسی – ئەسیۆشیێتدپرێس – دا ، لە سەر زاری ناوەندەکانی دەنگووباسی نەمسا بڵاویان کردەوە . کە ئەو چەکانە بە وەزارەتی ناوخۆی ئێران فرۆشاون ، لەم بارەیەوە بەرپرسانی نەمسا ڕەزامەندیان لە سەر هەناردەکردنیان داوە ، لەم بارەیەوەش وەزارەتی دارایی نەمسا رایگەیاند ، کە وەزارەتەکەیان لە مانگی/ ١ی ئەم ساڵ فرۆشتنی چەکی جۆری – گلاك – یان بە ڕێگەی یاسایی کردووەو ئێرانیش بەڵگەنامە پەیوەندارەکانی مۆرکردووە ، کە ئەو چەکانە نەداتە هیچ لایەنێکی دیکە .

جێگەی باسکردنە کە ئێران ٣٠,٠٠٠ سی هەزار پارچە چەکی گلاکی لە نەمسا کریووە ... لە ڕۆژی سێشەمەی رابردوو ڕۆژنامەی – دیلی تیلگراف – بڵاوی کردەوە ، کە هێزەکانی سووپای ئەمەریکا دەستیان بە سەر زیاتر لە ١٠٠ پارچە چەکی جۆری – ئستیر – دا گرتووە ، کە لە وولاتی نەمسا بەرهەم دەهێنرێت ... ئەم چەکانەش بە ئێران فرۆشراون بەبێ ڕەزامەندی ئەمەریکا لە گەڵ ئێران مۆریان کردبوو لەنێوانیاندا .

٢٠٠٧/٢/٢١ لە شاری تارانی پایتەختی ئێران و لە زانکۆی تاران ، سەدان قوتابی کورد لە بەر دەرگای کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆ ، کۆبوونەوەو دوای



سروودی ئەی ڕەقیب داوایان لە هێزە رامیارییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کرد ، کە بەرەیەکی کوردستانی پێك بێهێنن .

ئەم کۆبوونەوەیەش بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی – زمانی دایك – ئەنجامدراو ، دوای ئەوە یەکێك لە قوتابیەکان بابەتێکی لەمەر بارودۆخی رامیاری وئابووری کوردستان خوێندەوە ، لە گەڵ تاوانبار کردنی دەسەڵاتدارانی ئێران ، دوای ئەوە قوتابیەکی دیکە بابەتێکی درێژی لە سەر زانستی زمان

پێشکەش بە ئامادەبووان کرد.

هــەروا ئــەو قوتابیانــەی کــە لــە نەتــەوە کــوردیش نــەبوون پالپــشتیان لــە داخوازییــەکانی قوتابیــانی کــورد کــردوو لــە دواییــدا قوتابیــە کوردەکــان بــە سروود و هەڵدانی چەند دروشمێکی رامیاری کۆتاییان بە کۆبوونەوەکەیان هێنا .

٢٠٠٧/٢/٢٢ لە راگەیاندنێکی رێکخراوی مافی مرۆڤ لە سووریا کە ئەمرۆ رۆژی – پێنج شەممە – بە ئامادە بوونی دادوەرێك ، دادگای سەربازی هێزەکانی سووپای رژێمــی بەعــسی لــە ســووریا ، ٥٠ هــاو ولاّتــی گــەنجی کــوردی لــە رۆژئــاواو شارەکانی دیکەی ئەم وولاّتە دادگایکرکرد ، ئەویش بە تاوانی ئەنجامـدانی خۆپیشاندانێکی هێمنانە لە دوای تیرۆر کردنـی – شێخ مەعشوق خەزنـەوی – لە وولاّتەکەدا .

هــەروا لــە راگەیاندنەکــەی رێکخــراوی مــافی مرۆڤدا هــاتووە ، کــە ئــەم ٥٠ گەنجــە کــوردە لــە دوای تــیرۆر کردنــی شــێخ مەعــشوق خەزنەویــدا لــە ٢٠٠٥/٦/٥دا هاتووە لـە شـاری قامـشلی لە رۆژئاوای کوردستـانی لکێنـدراو بە سووریا ، لەلایەن هێزە ئەمنیەکانی رژێمی بەعسی لە سووریا ، بەتاوانی خۆپشاندان دەستگیر کراون.

بــەلاّم تــەواوی دەســتگیرکراوەکان لــە خۆپیــشاندانەکان بەشــدار نــەبوون ، بەڵکو زۆربەیان بە شێوەیەکی هەرەمەکی دەستگیرکران ، لە بەر ئەوەی کـورد بوون . هەروا لە راگەیاندنەکەی مافی مرۆڤدا هاتووە ، کە دۆسییەی ئـەو ٥٠ گەنجــە ، پــاش دەســتگیرکردنیان لــە قامــشلیەوە بــۆ دادگایکردنیــان گواسترانەتەوە بۆ دادگای سەربازی لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا . سەرپێچیەکی نایاساییان ئەنجامدا بێت . هەروا دادگای ناوبراو پێشێلی لە مافەکانی مرۆڤ و بنەما یاساییە نێوودەوڵەتیەکانی کردووە لە وولاّتەکەدا .



٢٠٠٧/٢/٢٣ لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پیرانـــــی مەکــــسیکی ، وویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا بــە کۆمــەڵ کــوژی گــەلی ئێـراق تۆمــەتبار کـرد ،

ئەمەش لە کاتی پەسەند کردنی یاداشتنامەی تاوانبارکردنەکەی دادگایی کردنی سەربازێکی ئەمەریکی بەرەچەڵەك مەکسیکی دێت ، بەتۆمەتی هەڵاتن لە راژەی سەربازی ، بە هۆی رەتکردنەوەی بە بەشداری کردنی لە شەڕی دژ بە ئێراق .

ئەم سەربازەش ناوی – سەرگەنت ئۆگستان ئۆگوابۆ – کە تەمەنی ٣٥ساڵ بووە و لە دایك بووی مەکسیکە ، کە لە ساڵی ٢٠٠٠ رەگەزنامەی ئەمەریکی وەرگرتووە ، ئێستا لە بەندیخانەی سەربازگەی ئەمەریکایە لە – مانهایم – لە ئەلمانیا بەند کراوەو لە چاوەروانی دادگایی کردنیەتی . هەروا ئەنجوومەنی پیران لە مەکسیك – ئۆگوابۆی – بە یەکێك لە قوربانیەکانی راو حەزەکانی جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمەریکا داناوە ، ئەگەر ئەوەش دەکرێت کە دادگا بڕیاری حەوت ساڵ زیندانی بەسەر ئۆگوابۆت بسەپێنێت .

٢٠٠٧/٢/٢٣ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا رەزامەندی خۆی دەربڕی لە سەر هەوڵەکانی حکوومەت بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە تورکیا بە رێگەی دبلۆماسی . ئەنجوومەنی نەتەوەیی تورکیا ئەوەشی روونکردەوە ، کە هەوڵە دبلۆماسیەکان دەیەوێت رەوشی شاری کەرکوکیش چارەسەر بکات .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لە بەیاننامەیەکدا کە بلاّوی کردەوەو گووتی :- شتێکی باش دەبێت ئەگەر هەوڵە دبلۆماسیە رامیارییەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی پارتی کرێکارانی کوردستان pkk و گرژیەکانی ئێراق بە هۆی ناکۆکی لەسەر شاری کەرکوك بخرێتە گەڕ .

هەورا بەیاننامەکە لە کۆبونەوەیەك دەرچوو ، کە سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەبیب ئۆردگان و سەرکردەی مەدەنی و سەربازییەکانی تورکیا بەشدارییان لەو کۆبوونەوەیە کرد.

جێگەی روونکردنەوەیە کە بابەتی گفتووگۆکردن لە گەڵ سەرکردە رامیارییەکانی هەرێمی باشووری کوردستان ، یەکێك بووە لەو بابەتە رامیاریانەی کە ماوەیەکە لە نێوو حکوومەتی تورکیا لێکۆلینەوەی چری لە بارەیەوە دەکرێت ... هەروا لە ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا ، وەك ئاماژەیەك بۆ حکوومەتی تورکیا دێتە هەژماردن

تاکو دەست بە گفتووگۆ لە گەڵ سەرکردایەتی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان ئەنجام بدرێت لە ناوچەکەدا.




٢٠٠٧/٢/٢٤ لــــە ســــەردانێکیدا ســــەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردگـــان – بەســـەرۆکایەتی شـــاندێکی ئـــابووری و ئـــایینی گەیشتە شاری ریازی پایتەختی ســـعوودیەو ، لەگـــەڵ شـــا عەبـــدوڵلای شـــای ســـعوودیە دەستیان کرد بە گفتووگۆکانیان . ئەمـەش بـە هـۆی گۆرانکارییـە ناوچەییەکان ، بارودۆخی ئێراق ، کێشەی فەلەستین و شێوەی پەرەپێدانی هاوکارییـە دوولایەنـەکان لـە نێوانیاندا تەوەری سەرەکی گفتووگۆیەکانیان بوو لەناوچەکەدا.

هەورا وەزیری دەووڵەت بۆ کاروباری ئایینی – محمد ئایدەن – ، و وەزیری دەرەوەی تورکیا – عەلی باباجان – و چەند بەرپرسێکی بالای دیکە ئەندامی شاندەکە بوون . لە ماوەی یەك ساڵدا سەرەك وەزیرانی تورکیا سێ جار سەردانی سعوودیەی کردو لەگەڵ بەپرسانی ئەم وولاتە سەبارەت بە کاروباری ئایینی و ئابووری پەیوەندییەکانی دیکە لە گفتووگۆو پەیوەندی بەردەوامن .

لەوکاتەشدا سەرەك کۆماری سووریا – بەشار ئەسەد – داوای لە شای سعوودیە شا عەبدوڵلا کرد ، بە داوەتی فەرمی سەردانی سووریا بکات لە پێناو بەشداریکردنی لە کۆبوونەوەی وولاتانی عەرەبی لە سووریا سەبارەت بە باری ئێراق و لوبنان و فەلەستین گفتووگۆ بکەن لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٢/٢٧ لە دوا رووخاندنی رژێمی بەعس لە ئێراق بەسەرکردایەتی کردنی سەددام حوسێنی لە ٢٠٠٣/٤/٩ و سەرهەڵدانی کێشەی نێوان پێکهاتەکانی ئێراق و ، بە تایبەتی کێشەی نێوان مەزهەب شیعە و سووننەی ئیسلامی عەرەب و ئایین و کاردانەوی لە سەر بیروبڕوای گۆمەڵگای ئێراق و پەلاماردانی

ئایینـەکانی مەسـیح و سـابیئە لـە ئێـراق و بـووە هـۆی کـۆچ پێکردنیـان بـۆ دەرەوەی ئێراق ، بە تایبەتی رووکردنیان بۆ هەرێمی باشووری کوردستان .

لەوانەش هەڵگری بڕوای سابیئەی ئایینی زەکەریا یەحیا و رووکردنیان بـۆ هـەرێمی کوردسـتان ، لـە گونـد و شـارەدێ و شارۆچـکە و شـارەکانی وەك پارێزگای هەولێر و دهۆك و سلێمانی ، بەتایبەتی پارێزگای هەولێر کە تـاکو ئـەم مێـژووە زیـاتر لـە ٥٦ خێـزان لـەو تایەفە روویان لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان کردووە .

لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆربـەی ئەنـدامانی ئـەو ئایینـە بـەرەو وولاّتـانی ئـەورووپا رۆیـشتن و ، هـەروا بـۆ وولاّتـی سـووریاو ئوردنیش کۆچیان کـردووە . بـەلاّم هەنـدێ لـەو خێزانانـە پێیـان بـاش بـوو روو لـە هـەرێمی کوردسـتان بکـەن و دەسـەلاّتی هـەرێمیش ئاسـانکاری بـۆ کـردوون و لێژنەیـەکی بـۆ راپەرانـدنی کارەکانیان پێك هێنرا .

جێگەی روونکردنەوەیە کە هەڵگری بڕوای ئایینی – سابیئە ، مەنـدائی – ژمـارەی دانیـشتووانیان لـە ئێـراق زیـاتر لـە ١٥٠ هـەزار خێـزان دەبـێ و لـە پارێزگاکـانی باشـووری ئێـراق و بەغـدا نیـشتەجێن لـە وولاّتەکـەدا ، لـە بـەر ئـەوەی هـەڵگری ئـەم ئاینـە بەر لـە هـاتنی ئیسلام و فتووحـاتی ئیسلامی بـۆ ئێـــراق ، بـــە ژمارەیـــەکی زۆر دانیـــشتووی وولاّتـــی نێـــوان دوو زێـــێ – میزۆبۆتامیا – بوونەو لە بنچەدا عەرەب نین و ئارامین .

بەلاّم بە هۆی پاڵە پەسۆو ماوە دەدانیان زۆربەیان بە زۆر کراون بـە ئیسلام و بە عەۆرەب بە هۆی بەرپابوونی بارو دۆخی ئایینی و شالاّوە ئازاردانـە یـەك لـە دوای ئەکـەکانی عـەرەبی شـۆڤێنی ئیسلامی لـە ناوچـەکەدا ، هـەروا وەك نەتەوەو ئلیینەکانی دیکە کـە بـە زۆری زۆردارو بـە زەبـری هێـزی شمـشێر بـە ئیسلام کـردن و بـە عـەرەبکردن و بـە داگیرکـردن بـەردەوام بوونـە لـە ناوچـەو هەرێمـە جیاجیاکـان ، لەوانـەش ئـەم خێزانـە سابیئەی مندائی . لـە جیهـانی ژێر دەسەلاّتی داگیرکەری ئیسلام .

سەرچاوە:- BBC,aradec.com

٢٠٠٧/٢/٢٧ لـە راگەیانـدنێکی وەزیـری پلانـدانانی ئێـراق – عـەلی بابـان – بۆ رادیـۆی – سەوا – گـووتی :– ئەنجوومـەنی وەزیرانـی ئێـراق بـە کـۆی دەنـگ بڕیـاری لـە

ســەر یاســای نــوێی نەوتــدا كــرد ، كــە لــەم یاســایەدا كێــشەی داهــات و خاوەندارێتی نەوتی ئێراق یەكلاكراوەتەوە .

هــەورا وەزیــری پلانــدانان گــووتی :- لــەم یاسـایە كێـشەی مـافی گـەران و پشكنین چارەسەر كراوە و گشت لایەنـەكان لـە سـەری رێـك كـەوتوون ، بۆیـە ئەنجوومەنی وەزیران . بەكۆی دەنگ بڕیاری لە سـەر یاسـای نـوێی نـەوتدا ، كە لەم یاسایە كێشەی داهات و خاوەنداریـەتی نـەوتی ئێراقـی بلاوكـردەوە . هــەروا گــووتی:- لــەم یاســایەدا هــیچ مــاف و ئاســانكاریەك بــۆ كۆمپانیــا ئەمەریكیــەكان نــەكراوە ، بــەڵكو رەچــاوی بەرژەوەنــدی گــشتی گــەلی ئێــراق

- كراوە لە وولاٌتەكەدا.

٢٠٠٧/٢/٢٨ گرێدانی كـۆنگرەی نێوودەوڵـەتی لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـراق ، لـە پێنــاو چارەســەركردنی كێــشە ئەمنیــەكان لــە ئێــراق ، بــە بەشــداربووانی وولاٌتــانی دراوســێی ئێـراق وەك :- ئێـران ، ســووریا ، توركیـا ، سـعوودیە ، ئوردن ، كوێت ، لەو كۆنگرەیەش هـەر پێـنج وولاٌتـی ئەنـدامی هەمیشەیی لـە رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و ئەمەریكاش بەشداریان تێدا كـردوو ، لـە گەڵ ئەمیندارو دەستەی سەرۆكایەتی كۆمكاری عەرەب .

ئەم كۆنگرەیەش بۆ یەكەمجارە لە ئێراق گرێ دەدرێت ، بە گفتووگۆكردن لە سەر كێشە و گرفتەكانی ناوخۆی ئێراق و دراوسێكانی لە ناوچەكەدا .

جێگــەی باســكردنە كــە ســەركەوتنی ئــەم كۆنگرەیــە بەرچــاو نابێــت لــە داهاتووی ئێراق ، لە نـاوخۆو لـە پەیوەندیـەكانی لەگـەڵ وولاٌتـانی دراوسـێی گـەر دەست تێوەردان لە كاروباری نـاوەخۆی ئێـراق بـەردەوام بێـت و كێشە هەڵواسراوەكانی كۆن و دوای رووخاندنی رژێمی بـەعس هـەوڵی چارەسـەری بۆ نەكرێت بە پێی دەستووری ئێراق .

هــەروا لەلایــەكی دیكــەش بەشــداری ئێـران و ســووریا لەگــەڵ ئەمــەریكا لــە پێنــاو رازی كردنــی دیموكراتەكانــە لــە كــۆنگرێس و ئەنجوومــەنی پیرانــی ئەمەریكا ، لـە دوای سـەركەوتنیان و زاڵ بوونیـان لـە هـەردوو ئەنجوومـەن لـە ئەمەریكا .

٢٠٠٧/٢/٢٨ لـە رۆژنامـەی – صـبـاحی – تـورکی ، بابـەتێکی بلاوکـردەوە کـە سـەرەك کۆمـاری پێـشووی تورکیـا – کـەنان ئـەوران – کـە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە ، کە پێویسته وولاتەکەی هەڵوێستی برایانـەی لەگـەڵ کـورد هـەبێ و پالپـشتی لـە ووتـەکانی وەزیـری



دەرەوەی تورکیا کرد ، بۆ گفتووگۆ کردن لە گەڵ سەرکردایەتی کورد لە باشووری کوردستان ... هەر رۆژنامەی صباح لە ژمارەی ئەمرۆیدا . هەروا سـەرۆکی پێشووی تورکیا ئەگـەری ئەوەشـی دا کە تورکیا لـە داهـاتوودا پەیرەوی لە سیستەمی ئەیالەتی بکات .

جێگـەی روونکردنەوەیە کە کـەنان ئـەوران لـە ماوەی ساڵەکانی ١٩٨٢ – ١٩٨٩ سـەرەك کۆماری تورکیا بـووە . هـەروا لـە سـەر کێـشەی پارێزگـای کـەرکوك و شـاری کـەرکوك ڕایگەیانـدووە ، کـە – ئێمـە مافمـان لـە کەرکوکـدا هەیە ، بەڵام ئـەوە بـەو مانایـە نایـەت ، کـە دەسـت بەسـەر کەرکوکدا بگرین و خۆم دژی ئەوەم . ئەگەر تورکیاش بچێتە ناو خاکی کـەرکوك هـەموو جیهـان بەرامبـەر بـە تورکیـا دەوسـتن ، هـەروا سـەرۆکی پێشووی تورکیا داوای لـە پـارتی کۆمەڵگـەی دیمـوکراتی کـورد – DTP – کـرد ، کـە وەکـو گـشت پارتەکانی دیکە بچێتە ناو پەرلەمانی تورکیاو رێژەی دەنگدانی بۆ چوونە ناو پەرلەمان ، نەبێتە ئاستەنگ لە بەردەم پارتەکەدا .

هـەروا سـەرۆکی پێشووی تورکیا – ئەوران – گـووتی :– مـن دەتـوانم لـەو بارەیـەوە لەگەڵ خاتوو – لـەیلا زانا – دابنیـشم و گفتووگۆی لەگـەڵ بکـەم . هـەروا سـەبارەت بـە گفتووگـۆکردن لەگـەڵ سـەرکردایەتی کـورد لـە باشـووری کوردسـتان گـووتی :– مـن پاڵپـشتی خـۆم بـۆ ووتـەکانی وەزیـری دەرەوەی تورکیا عەبدوللا گول دووپات دەکەمەوە .

لەلایـەکی دیکـەو لـە ناوەڕاسـتی ئـەم مانگـەدا ، وەزیـری کاروباری دەرەوەی تورکیا رایگەیاند ، کە ئامادەین بۆ چارەسـەری کێشەی نێوانیـان گفتووگۆ

لەگەڵ سەرکردایەتی رامیاری کورد بکەن . و هەروا ناوبراو گووتی :– کە ئێستا بوونی دەوڵەتی کوردی بۆتە ڕاستیەك و پێویستە کاربەدەستانی تورکیاش ئەمە قبوول بکەن لەناوچەکەدا .

**تێبینی:– خوێنەری بەڕێز ، دانەنانی هەندێ وێنە لە گەڵ مێژووەکەی یاخوود ڕووداوەکەی ، بۆ دووبارە نەبوونەوەی وێنەکەیە یاوێنە بەر دەست نەکەوتووە ، تکایە .**

٢٠٠٧/٣/١ لــە هێرشــێکی ناکاویــدا هێزەکانی ئەمنی ئێرانی ١٧ هاووڵاتیــان لــە چــەکدارە کــەردەکان شــەهید کــرد لــە هەرێمی ئازربایجانی ڕۆژئاوا لەســـەر ســـنووری نێــوان تورکیا و ئێران ، لە ئەنجامی بــەرپابوونی شــەڕی نێــوان چەکدارانی ئەمنی ئێـران و چەکدارانی بزوتنـەوەی – بیـژاك – ی کـورد لـە ناوچەکەدا .



جێگەی باسکردنە کە لەو شەڕەدا چوار لە پاسەوانانی شۆڕشی ئێرانی کوژران ، کە سێ لەوانە ئەفسەر بوونە . لەو کاتەشدا هەرێمی ئازربایجانی ڕۆژئاوا چەندین زنجیرە شەڕی لێ ئەنجامدرا لە چەند ڕۆژی ڕابردوو ، هەروا ڕۆژی ٢/٢٩ زیاتر لە ٣٠ هاووڵاتی شەهید کران لەلایەن هێزەکانی پاسەوانی شۆڕشی ئێران ، لە ئەنجامی شەڕو پێکدادان لە هەرێمەکەدا ، لە هەرێمی سیستان و بلوشستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران . هەروا ١٤ لە سەربازانی ئێرانیش کوژران لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەکی سەربازی لەلایەن چەکدارانی کورد لە هەرێمی ئازربایجانی ڕۆژئاوا .

هەروا جووڵانەوەی بیژاك جووڵانەوەیەکی کوردیە لە ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان ، شەڕی پارتیزانی ئەنجاە دەدەن و پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان pkk دا هەیە لە سەر خاکی کوردستان .

سەرچاوە :- BBC Arabic.com

٢٠٠٧/٣/١ ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان ڕەخنەی توندیان لە ڕژێمی شانشینی سعوودیە گرت ، بە هۆی زۆر بوونی لە سێدارەدان لەو وڵاتەدا

هەروا ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی – هیومان رایتسی وۆتش –

ئەویش ڕەخنەی توندی لە دەسەڵاتدارانی سعوودیەو دادگا تایبەتیەکانی سعوودیە گرت بە زۆر بوونی بڕیاری لە سێدارەدان لە سێدارە دەدران لەو وولاتەدا .

جێگەی باسکردنە کە دادگای سعوودیە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ ١٧ هاووڵاتی دەرکرد و لە سێدارە دران ، هەروا لە ٢٠٠٧/٢/١٩ بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ چوار هاووڵاتی سریلانکا دەرکرد ، بە ناوی بەکارهێنانی چەك و لاشەکانیان بە هەڵواسراوی مایەوە لە گۆڕەپانی لە سێدارەدانەکەدا .

ئەنجامدانی لە سێدارەدان لە وولاتانی عەرەبی بەردەوامە بە شێوەیەکی بەرچاو ونهێنی ، کە دژی دەسەڵاتەکانیانە . لە هەمان کات بەناوی کارێکی دیکە لە سێدارە دەدرێن . هەروا لە ئێرانیش بە هەمان شێوەو شێواز لە وولاتانی ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٢ لە داوایەکی بە ناوی وەزارەتی دەرەوەی چینی مللی – کین جانگ – گووتی:– چینی مللی داوایەکی ئاراستەی ئیدارەی ئەمەریکا کردووە ، کە ئەو ژمارە مووشەکانەی کە بڕیارە بیفرۆشێتە تایوان هەڵیوەشێنێتەوە . کە ٤١٨ مووشەکی دوورهاوێژی مام ناوەندی و ٢٣٥ مووشەکی بۆشایی ئاسمانی لە جۆری – فامزیك – بە بڕی ٤٢١ ملیۆن دۆلار.




جێگەی باسکردنە تایوان بەشێکە لە چینی مللی و چینی مللیش تایوان بە بەشێك لە خاکی خۆی دەزانێ ، ماوە بە هیچ لایەنێکی نێوو دەووڵەتی نادات دەست تێوەردان لە کاروباری تایوان بکات دژی چینی مللی لە کێشووەرەکەدا.

هەروا لەلایەکی دیکە ئیدارەی ئەمەریکا لە ڕێگەی ئاژانسی هاوکاری ئەمنی ئەمەریکی داواکەی چینی مللی ڕەتکردەوەو گووتی :– ئەمەریکا دەستگیر نیە بە یارمەتی نەدانی تایوان بە هۆی بوونی ڕێکەوتنی ئەمنی و

ئابووری و بەرگریکردن لە یەکتری لە نێوان ئەمەریکا و تایوان لە ناوچەکەدا



٢٠٠٧/٣/٢ لە ڕاگەیاندنی لیژنەی چاودێری هەڵبژاردنەکانی وولاتی سەنیگال – عەبدوللا واد – بۆ خوولی دووەمی سەرۆکایەتی کردنی کۆماری سەنیگال بەرامبەر بە پالێوراوەکانی بەرهەڵستکاری ، کە سەرۆك واد بە ڕێژەی ٥٠٪ زیاتری بە دەست هێنا و دووەم پالێوراویش سەرەك وەزیرانی پێشوو ئیدریس سیل ١٤,٩٣٪ و پالێراوی سێیەمیش پالێەراوی پارتی سۆشیالیستی بەرهەڵستکار – تاتۆر دینگ – ١٣,٥٧٪ .

جێگەی باسکردنە کە سەنیگال تاکە وولاتە لە وولاتەکانی کێشوەری ئەفەریکیا کودەتای سەربازی تیا ئەنجام نەدرابێت و ، لە هەمان کات تاکە وولاتە کە زۆری دانیشتووانەکەی موسڵمان بێت و تاکە وولاتیشە هەڵبژاردن بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و لە بارێکی دیموکراتی ئەنجامبدرێت لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٣ لە دوای هەوڵێکی زۆر دەسەلاتدارانی جەزائیر توانیان نزیکەی ١٠٠٠٠ دە هەزار تاوانبار لە سەر بازرگانی کردن لە ماددەی بێهۆشکەر زیندانی بکەن . ئەم ڕاگەیاندنەش لەلایەن دیوانی نیشتیمانی بۆ لە ناوبردنی ماددەی بێهۆشکەر لەڕاپۆرتێکدا بلاوی کردەوە لە جەزائیر . جێگەی روونکردنەوەیە کە لە ڕاگەیاندنەکەی دیوانی نیشتیمانی بەم شێوەیە ووتی :– کە ٩٨٧٩ هەزار کەسی دەستگیر کردووە لە ساڵی ٢٠٠٥ کە لەو ژمارەیەدا ٨٦٩٨ هەزار کەس تاوانبار کراون ، لەو ژمارەیەش ٩٧٨٩ هەزار کەس خەڵکی جەزائیرن و ٩٠ کەسیش بیانین ، کە ژمارەی تاوانەکان گەیشتە ٦٨٨٠ ، لەوانەش ١٩٧٤ کەس بەهەڵسانیا بە بازرگانی پێکردن بووە لەو ماوەیەدا .

هەروا لە ڕاگەیاندنەکەی دیوانی نیشتیمانیدا ئەوەشی دەرخست کە دەسەلاتدارانی جەزائیر توانیویانە ١٠,٠٤٦ کیلۆگرام لەو ماددە دەست بە

سەر دابگرن لە - قنب هندی - و ٥٢٧ کیلۆ گرام لە حەشیشەی کیف و ٨٥٨ کیلۆگرام لە تۆی قنب هندی و ، ٧٥٧ تویکڵی قنب هندی ، ٣١٩٠١٤ لە حەبی هلوسی جۆراو جۆر ، لە گەڵ ئەوەشدا دەست بەسەرا گرتنی ٧٧٧٤ کیلۆگرام لە کۆکایین و ٢٥ کیلۆگرام لە هیرۆیین و ١٢ کیلۆگرام لە ئەفیوون .

هەروا بەڕێوەبەری گشتی دیوان عەبدولمەلك سایح بۆ ئاژانسی فەرمی ئەوەی ڕاگەیاند ، کە لێکۆڵینەوە بەردەوامە و بەرگریکردنیش بەردەوامە دژی ئەو کارە نامرۆڤیە لە هەموو لایەنەکانی وولاتەکەدا ، بە هاوکاری وولاتانی دراوسێی جەزائیر لە ناوچەکەدا .

سەرچاوە :- ڕۆژنامەی /دار الحیاه

٢٠٠٧/٣/٣ دادگای تورکیا فەرمانی دەستگیر کردنی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا -- ئەحمد تورك -- و جێگرەکەی ئایسەڵ ئۆگلوك - بە تۆمەتی بەزاندنی یاساکانی پارت و ڕێکخراوەکان تاوانبارکراون لە وولاتەکەدا.

شایانی باسە بە پێی یاساکانی تورکیا بەکارهێنانی هەر زمانێك جگە لە زمانی تورکی لە بلاوکراوە رامیاریەکان قەدەخەیە ... جێگەی ئاماژە پێکردنە پارتی دیموکراتی لە ساڵی ٢٠٠٥ دامەزراوە و ئیستا بە هێزترین پاتی کوردیە ، کە لە گەڵ دەسەلاتی تورکیا بەشداری پەرلەمانی کردبێت بە هاوکاری و یارمەتی پارتی کرێکارانی کوردستان ، کە هەوڵی بەشداربوونی پەرلەمانی تورکیا دەدەن لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٣ وەزیری دەرەوەی فەرەنسا - دۆست پلازی - لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا گووتی :- هەر پێنج وولاتە ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیا لە سەر دیاریکردنی چوارچێووەی قۆناخی داهاتووی ئەنجوومەنی ئاسایش ڕێك کەوتن ، لە هەمان کات روونی کردەوە کە شەش وولاتەکە لە سەر کارکردن بە بڕیاری بەندی/ ٤١ میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێك کەوتن .

هەروا لەلایەکی دیکە ووتەبێژ بەناوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا - گوان

مـۆر – لـە ووتەکەیـدا گـووتی :- نوێنـەرانی شـەش وولاَتەکـە لـە رێگـەی تەلەفۆنـەوە گفتووگـۆی باشـیان ئەنجامـداوەو بڕیـارە ، ئـەمرۆش درێـژە بـە گفتووگۆکانیان بدەن و چاوەڕێ دەکرێت پرۆژە بڕیارێك لـە هەفتـەی داهـاتوو گەلاَڵـە بکرێـت لـە دژی ئێـران ، کـە گەیـشتنە رێکـەوتن کـە بەرێکـەوتنی چوارچێووە ناسراوە . بەلاَم ئێران بەردەوامـە لـە سـەر پیتاندنی یۆرانیۆم لـە وولاَتەکەیدا .

٢٠٠٧/٣/٣ لـە ئاکـامی بـارو دۆخـە تێـك هەڵکـشاوەکان و چـارە سـەر نەکردنی پشتگیری لـە کێشە هەڵواسـراوەکانی کـورد لــە هـــــەرێمی باشـــــووری کوردســـتانی لکێنـدراو بـــە ئێـراق ، کێـشەکانی دیکـەی گــەلانی ئێـراق . کێـشەی



نێـوان مەزهـەب سـووننە و شـیعە و ئاینـەکانی دیکـەی ئێـراق ، پەیوەنـدی نێـوان دەسـەلاَتی کـوردی لـە گـەڵ دەسـەلاَتی ناوەنـدی ئێـڕاق ، لـە شـاری بەغدای پایتـەخت . ئـەمرۆ باڵیۆزی ئەمەریکا لـە ئێراق زەلمـای خـەلیلزاد و سـەرۆکی کوتلـەی ئەلعراقیـە ئـەیاد عـەلاوی و ئەنـدامی پەرلـەمانی ئێـڕاق عـەدنان پاچەچـی ، گەیـشتنە شـاری سلێمانی و لـە شارۆچکەی دووکان لـە پێنـاو گفتووگـۆکردن لـە گـەڵ سـەرەك کۆمـاری ئێـڕاق و سـکرتێری گـشتی یەکیـەتی نیـشتیمانی جـەلال تاڵـەبانی ، کۆبوونـەوە ئەنجامـدەدرێت لەگـەڵ ئەنـدامانی بـیرۆی ڕامیـاری یەکیـەتی لـە پێنـاو ڕێگـە خۆشـکردن لـەجێ بـەجێکردنی کێـشەکان بەگـشتی و کێـشەی کـورد بـە تایبـەتی لـە هـەرێمی باشووری کوردستان .



٢٠٠٧/٣/٣



کۆریـای باشـوور گومـانی لـه ووشـەکانی سـەرەك وەزیرانـی یابان کرد ، کە سەرەك وەزیرانی یابـان تـوورەیی خـۆی لـه لێدوانەکانی بەرپرسانی کۆریا لە ٢٠٠٧/٢/٢٩ دەربڕی بەو هۆیـەی کە گوایە دەسەڵاتی شانشینی لە یابان لە کاتی جەنگی دووەمی جیهان زیاتر لە ٢٠٠ هەزار ئافرەتی ناچار کردووە بە تێرکردنی سەربازەکانی هێزی سوپای کۆریا بەکاری سێکسی .

بەلاّم یابان ئەو هەواڵ و زانیاریانەی ڕەتکردەوە . هەر لەو کاتەشدا وەزیری دەرەوەی کۆریای باشوور ڕاگەیاندنەکانی سەرەك وەزیرانی یابانی بە درۆ خستەوەو گووتی :- سەرەك وەزیرانی یابان زانیاری لە سەر ئەم کردارانە نیە ، کە کاتی خۆی دەسەڵاتی یابان پێی هەڵساوە هەروا گووتی :- پێویستە سەرەك وەزیرانی یابان و دەسەڵاتدارانی یابان ڕووبەڕووی ئەم ڕاستیانە ببنەوە ، کە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی دەسەڵاتداران پێی هەڵساون .

دوای ئەوە سەرەك وەزیرانی یابان – شینزۆ ئابی – لە لێدوانێکی ڕۆژنامەوانیدا گووتی :- مشتوومڕێکی زۆر هەیە لەم بارەیەوە کە ئافرەتانی یابان ناچار کراون بە تێرکردنی سەربازە یابانیەکان بە سێکسی ئافرەتان و هەروا گووتی :-

بەڵگەی تەواو ڕاستیەکان لە بەر دەستدا نیە ، کە ئەم کارانە بسەلمێنێ .
هەر لەو کاتەشدا ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا ، ئەوەی خستە ژێر لێکۆڵینەوە ، کە ئەمەش بووە هۆی نارەزایی حکوومەتی یابان و وەزیری دەرەوەی یابان گووتی:-

پڕۆژەی ئەو یاسایە هیچ سەرچاوەیەکی ڕاستی نیە لە وولاّتەکەدا ، بەلاّم سووپای ئیمپراتۆری یابان لە کاتی جەنگی دووەمی جیهان ، بەم کارە هەڵساون بە ناچارکردنی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار ئافرەت بۆ ئەنجامدانی کاری سێکسی لە گەڵ سەربازەکانی جەنگی یابان بۆ تێرکردنی جەستەی

سەربازەکانی سووپای یابان و ، هەر بەم هۆکارە چەندین ئافرەت داوایان لە سەر بەرپرسانی سووپاو حکوومەت تۆمار کردووە .

دوای ئــەوەش حکوومــەتی یابــان هەڵــسا بــە دامەزرانــدنی ســندووقی قەرەبۆکردنەوەی ئەو ئافرەتانە ، بە کۆکردنەوەی پارەی قەرەبوکردنــەوەیان ، نــەك لــە لایــەن حکوومــەت پشتگیری لێبکرێــت ، بــەڵکو پــشتگیریەکە لەلایــەن دەووڵەمەندان و کۆمپانیاکانی یابان بێت لە وولاتەکەدا .




٢٠٠٧ /٣/٣ لــە دوای دەســت نیــشان کردنــی رەمــەزان کــادیرۆڤ ، لــە لایــەن ســەرۆکی ڕووســیای یــەکگرتوو – فلادمێــر پــوّتین – پەرلــەمانی شیشان بە کۆی دەنگ رەزامەندی لە سەر پالاوتنی کادیرۆڤ کرد بە بوونی بە سەرۆکی شیشان .

جێگــەی باســکردنە کــە روزامــەن کــادیرۆڤ ، کــوری ســەرۆکی تیرۆرکــراوی کۆماری شیــشانە – ئەحمــەد کــادیرۆڤ – کە لە ساڵی ٢٠٠٤ بە هــۆی بــوونی شــەڕو پێکــدادان لــە نێــوان هێزەکــانی دژ بــە دەســەلاتی ڕووســیا و هێــزە چــەکدارەکانی لایــەنگرانی ڕووســیا و هێزەکــانی ســووپای ڕووســیا . دامەزرانــدنی رەمــەزان کــادیرۆڤ بــە ســەرۆکی شیــشان بــووە هــۆی جێگــەی نارەزایی بە هۆی بوونی بە سەرکردەی کۆمەڵێك لە چەکداری دژ بە یەکێتی سۆڤیەتی جاران لە تەمەنی ١٦ سالاندا .

بــەلام دوای ئــەوە وازی لــە دژایــەتی کردنــی ڕووســیا هێنــاو بــووە لایــەنگری ڕووســیا و ســەرۆکی ڕووســیا پــوّتین ، دژی بەرهەڵــستکارانی دەســەلاتی شیشانی سەر بە ڕووسیا

لە گەڵ ئەوەشدا رەمەزان کادیرۆڤ بەر لە بوونی بە سەرۆکی شیشان سەرەك وەزیرانی حکوومەتی شیشان بوو .

ئەم کارەش بەرای مۆسکۆ چاوەروانی ئەوەی لێدەکرا ، کە کــادیرۆڤ توانــای بنبرکــردن و لــە نــاوبردنی هێــزە چــەکدارەکانی شیــشانی دژ بــە ڕووســیا و

حکوومـەت و دەسـەڵاتی شیشان هەیـە لەناوچـەکەدا و پاڵپـشتی بـە هێـزی ڕووسیایە لە ناوچە و هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٤ لـە هەوڵـە بەردەوامـەکانی کۆمـاری چـینی میللـی لـە پێنـــاو گەشـــەپێدانی ئـــابووری و بازرگـــانی و ســـەربازی و بـــەهێزکردنی ژێرخـــانی ئـــابووری ، ووتەبێـژی فـەرمی بە نـاوی کۆنگرەی نیشتیمانی گـەل



لـە پـەکینی پایەتـەختی چـینی میللـی گـووتی :- چـینی میللـی بـەنیازە بـوودژەی دابینکـراوی بـەرگری بـۆ سـاڵی ٢٠٠٧ بگاتـە ڕێـژەی ١٧,٠٨٪ لـە ووڵاتەکەدا . هەروا گووتی :-

بۆ ساڵی ٢٠٠٨ی داهاتوو بودژەی دیاریکراو دەگاتە ڕێژەی ٣٥٠,٩٢ ملیار ییوان ، بە زیادەی ٥٢,٩٩ ملیار ییوان . هەروا گووتی :-

بـەرز بوونـەوەی بـودژەی سـەربازی و بـەرگری گەیـشتۆتە ١٤,٧٪ لـە سـاڵی ڕابـردوو ، کـە بووەتـە ٣٦,٦ ملیـار دۆلار ، بـەڵام ئەمـەریکا ئـەو لێدوانـەی ڕەتکردەوە و گـووتی :- بـە پێی سەرچاوە چاودێریەکان ڕێـژەی دیاریکراو لەلایەن حکوومەتی چین زۆر لەوە زیاترە ، کە باسی لێووە دەکەن .

کە ئەمـەش بۆتـە جێگـەی دڵخۆشنەکەر لەلایـەن ئیدارەی ئەمـەریکا . هـەروا جێگـری سـەرۆکی ئەمـەریکا – دیـك چـینی – لـە ڕاگەیاندنێکیـدا گـووتی :- پێشبرکێی چەکی چیینی و تاقی کردنەوەی مووشەکی نوێی لـە مـانگی/ ١ی ڕابـردوو ، بـە تەقاندنـەوەی مـانگی دەسـتکرد لـە بۆشـایی ئاسمـان لـە گـەڵ ڕامیاریەتی ئاشکرای چین نـاگونجێنیٚ . بـەڵام چینی میللـی ئـەو لێدوانانـەی ڕەتکردەوە و گـووتی :- هەوڵەکانی چینی میللی لە پێنـاو بـەرگری کردنـە و بەس لە ووڵاتەکەدا .

هـەروا لەلایـەکی دیکـە ئـەم ڕاگەیاندنـە بـەر لـە یـەك ڕۆژ هـات کـە کۆنگرەی ئەنجوومـەنی گـەلی چـینی سـاڵانە دەیبەسـتیٚ ، کـە ٣٠٠٠ نوێنـەر لـە هـەموو

هـەرێم و ناوچـەکانی وولاتەکـە ئامـادە دەبیَ ، ئـەم کۆنگرەیـەش لـە پێنـاو پەرەسەندن و پێشکەوتن و گەشەپێکردنی وولاتەکەیە لە هەموو بوارەکـانی رامیـاری و سـەربازی و ئـابووری و بازرگـانی کۆمەلآیـەتی ورۆشـنبیری وپەیوەندیـە ناوخۆییـەکان و دەرەوەی چـینە لـە چەسـپاندنی رژێمێکـی دادپەروەرانە لە وولاتەکەیاندا .

٢٠٠٧/٣/٤ لە کەش و هەواو بارو دۆخی نـوێیی ئێـڕاق ، لـە دوای رووخانـدنی رژێمـی بەعسی لە ئێڕاق ، بە سـەرکردایەتی سـەدام حوسـێن ، کـە بـووە هـۆی بازرگـانی کردنێکـی هـەزاران بـە شـوێنەوارەکانی ئێڕاق بە تایبەتی لە شاری شوێنەواری بابل و دەسەلآتدارەکانی بەر لە مێژووی زایینی لە وولآتی نێوان دوو زێدا – مێژۆپۆتامیا .



ئـەویش بـە دزینـی – سـەبەتەی بـچووك و پەیکـەری ئاسـن و فـەخفووری و پارچـەی دراوی بـابلی عـیری و کەرپوچـی کـۆن و پارچـە تـابلۆی دیـوار ، کـە هـەموو وێنـەی شـووێنەوار و نووسـینەکانی بزمـاری و سـۆمەر و کـەل و پـەلی قاپ و قاچاخ ، کە ئەم کەل و پەلانـە مێژوویان بۆ ٢٥٠٠ سـالْ بـەر لـە زایینی دەگەڕێتەوە .

جێگــەی روونکردنەوەیــە کــە شــووێنەوارەکانی بابــل کــە ٢٥٠ جێگــەی شــووێنەواری هەیــە ، بــە تایبــەتی لــە ناوچــەی – بــرس – کــە مەحرەقــەی پێغەمبەر ئیبراهیم خەلیل و شـوێنەواری نەمروود و – کـیش – تیایا لەگەلْ کفلی جوولەکەکان .

هەروا ئەو گوندانـەی کە لـە دەوورووبـەری شـوێنەواری بابل بوونـە ، وەك – گوندی جمجمە – و – گوندی کوێرش – و – گوندی برتوون – کە دەکەوێتـە بـاکووری شـاری حیلـە ، بـە دووری ١٠٠ کیلۆمـەتر لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـڕاق . هـەروا بـوونی – مـسلەی حـامووراربی و پاشمـاوەی

نبووخزنەسر – لە گەڵ چەندین شتی دیکە لە دەسەڵاتداریەتی ئەوکات .

لە گەڵ ئەوەشدا شوێنەواری بابل لە ناو لیستی رێکخراوی یونسکۆی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو ، بە یەکێك لە شوێنەوارەکانی جیهان ، بەڵام لە دوای دەستکاری کردنی لە لایەن سەرۆکی ئێراق سەدام حوسێن لە دیوارو شـوێنە گرنگـەکانی شـووێنەواری بابـل و چـۆلکردنی گونـدەکانی دەووروبـەری و دروسـتکردنی کۆشـکی سـەرۆکایەتی لـەو جێگایـەدا ، رێکخراوی یونسکۆ شووێنەواری بابلی لە لیستەکە دەرهێنا .

دوای ئـەوەش کـە رژێمـی بـەعس لـە ئێـراق نـەما هێزەکـانی سـووپای هاوپـەیمانان کۆشـکی سـەرۆکایەتی سـەدامی پێـشویان کـردە بارەگـای هێزەکـانی سـەربازیان و دەسـتکرا بـە دزیـن و وێرانکردنـی ئـەم جێگـە شووێنەوارە پیرۆزە لەو ناوچەیەدا ، کە هەمووی تەواوکەری یەکتر بوون لە گـەڵ قـەلاّی هـەولێر و شـوێنەواری نـەمروود لـە رۆژهـەلاّتی مووسـڵ و شووێنەواری خەزەر لە باشووری مووسڵ و چەندین جێگەو شوێنی دیکەی شووێنوار لە وولاّتی نێوان دووزێیدا .

لێرەدا من نامـەوێ بە بیروو هەستێکی نەتـەوەیی بەرچاو تـەنگ بچمە ناو ئـەو تێبینیانـە ، بەڵکو ئـەوە دەسەلمێنم ، کـە عـەرەب و تـورك بـە تایبـەتی عەرەب و هەڵگری ئاینی ئیسلامی بە تایبەتی عەرەب کە ئاینی ئیسلام بە هـی خۆیـان دەزانـێ و قورئـان بـە زمـانی عەرەبییـە و خۆیـان بـە پلـە یـەکی ئیسلام و نەتەوە دەزانێ لە هەموو بوارەکاندا .

بەڵام عـەرەب خـاوەنی هیچ شـووێنەوارێك نیـە لـە سـەر گۆی زەوی ، تـەنها مزگەوت نەبێت و گەرچی هەموو شووێنەوارەکانی ئێراق و سووریا و میسر و وولاّتـانی دیکـە بـە هـی خۆیـان دەزانـێ ، بـەڵام مـافی ئـەوانی پێـووە نیـە هەموو کات ئامادەن وێرانی بکەن ، کە بازرگانی پێووە کردن و پاڵەپەستۆی وولاّتانی جیهان نەبێت لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٣/٤




لــه دوای هــەوڵ و گفتووگــۆی بەردەوام له نێوان دەسەلاتدارانی ساحل عاج و بەرهەڵستکارانی ، کــه لــه ئــەنجام بــووه هــۆی مۆرکردنی ڕێکەتننامەی ئاشتی له وولاتی بۆرکینا ڤاسۆ له نێوان ســەرۆکی ســاحل عــاج – لـۆران ژیاژبۆ – و سەرکردەکانی بەرهەڵستکارانی لە پێناو بەرەو باشبردنی باری وولاتەکە له هەموو بوارەکاندا .

ئەمەش له پێناو یەکگرتنی وولاتەکه ، کە بووه دووبەشی دژ بە یەکتری لە دوای دەست بە سەراگرتنی بەرهەڵستکاران لە باکووری وولاتەکە ، لە دوای ســاڵی ٢٠٠٢ ، ئــەویش بــەپێك هێنــانی حکوومــەتێکی هاوبــەش کــە بەرهەڵستکاران بەشداری تێدا بکەن . ئەویش بە دەرکردنـی یاسـایەکی بنەڕەتی ، بۆ ئەوەی لە هەڵبژارنەکانی داهاتوو دیاریکرێت ، کە کێ مافی دەنگدانی دەبێت له هەڵبژاردنەکاندا لە ساحل عاج له نێوانیاندا .

سەرەڕای ئەوەی کە بڕیار بوو هەڵبـژاردن لـە ساڵی ٢٠٠٤ ئەنجام بدرێت بەلاّم بۆ ماوەی دووجار ئەو هەڵبژاردنە دواخرا لە پێناو گەیشتن بەڕێکەوتن و نەمانی کێشەکان . هەر لەو ماوەیەشدا کە زۆربەی دانیشتووانی باکووری ساحل عاج ئیسلامن و هەوڵی کودەتایان داوە دژی دەسەلاتی لۆران ژیـاژیۆ له مانگی /٩-١٠/٢٠٠٢

هەروا بە هۆی نالەباری بارو دۆخی وولاتەکە و شەڕو پێکدانان نزیکەی ١٠٠٠٠ دە هەزار سەربازی فەرەنسا و نەتەوە یەکگرتووەکان لەو وولاتەن بە ناوی ئاشتی پارێز بە چاودێرکردنی وەستاندنی شەڕ لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٤ گـەلی هـەرێمی ئەبخازیایە بـەرەو سـندووقەکانی دەنگـدان هـەنگاوینا لـە پێنـاو هەڵبـژاردنی ئەنـدامانی پەرلـەمانی نـاوخۆی هەرێمەکە . لـەو کاتەشـدا دەسـەڵاتدارانی ناوەنـدی لـە جۆرجیـا پەیمانی گەڕاندنەوەی هەرێمەکەیاندا ، بۆ ژێر دەسەڵات و سنووری کۆماری جۆرجیا ، کە هەرێمی ئەبخازیا پشتگیری تەواوی لەلایەن ڕووسیای فیدڕاڵی لێدەکرێت لـە پێنـاو جیابوونـەوە لـە جۆرجیـا و ڕاگەیانـدنی ئـەبخازیای سەربەخۆ لە ناوچەکەدا .

جێگـەی ڕوونکردنەوەیـە کـە هـەرێمی ئـەبخازیا و ئۆسـیتیا بـەر لـە جـەنگی یەکەمی جیهانی هـەوڵی سـەربەخۆیی هەرێمـەکانیان دەدەن چ لـە نـاو ڕژێمی ڕووسـیای قەیـسەری پێشوو چ لـە کـاتی دەسـەڵاتی یەکیـەتی سۆڤیـەت و چ دوای هەڵوەشـاندنەوەی یەکیـەتی سـۆڤیەت ، بەتایبـەتیش لـە دوای هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەت و کەوتنە ژێـر دەسەڵاتی جۆرجیا ، کە چەندین جار شـەڕو پێکـدانان لـە نێوان حکوومـەتی نـاوخۆیی و هێزەکـانی سـووپای جۆرجیا ڕوویداوە .

لـەم هەڵبژاردنـەش ئەنـدامانی پـاڵێوراو ئامانجیـان گەرانەوەیـە بـۆ ژێـر دەسەڵاتی جۆرجیا و بەهێزکردنی هەڵوێستە بۆ ئەبخازایەکی سـەربەخۆ لە داهـاتوو و داننـان پێیـان لـە لایـەن وولاتـانی ئەنـدام لـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان . بـەڵام دەسـەڵاتدارانی ناوەنـدی لـە جۆرجیـا ئـەم هەڵبژاردنەیان بە نا یاسـایی داناو دژی وەسـتان ، کەچـی ڕووسـیای فیـدراڵ پشتگیری لەو هەڵبژاردنە دەکرد لە هەرێمەکەدا .

لـە لایـەکی دیکـە کێـشەی نێـوان ئـەبخازیاو جۆرجیـا و شـەڕو پێکـدادان وایکرد ، کە زیاتر لە ٢٥٠ هەزار کـەس لـەو هەرێمـەدا کـۆچ بکـەن ، سـەرەڕای گەڕانەوەی هەندێ کەس لە خێزانەکان بۆ هەرێمەکە بە هـۆی وەسـتانی شـەڕ

لـە نێوان هـەردوو لایەنـدا . بـە تایبـەتی دانیـشتووانە جۆرجیـەکان ، کـە بڕیاریاندا بەشداری هەڵبژاردنەکە نەکەن

لە گەڵ ئەوەشدا هێزەکانی ئاشتی پارێزی ڕووسیای فیدڕال جێگرن لە هـەرێمی ئـەبخازیاو ئۆسـیتیا ، بـە پـشتگیری کردنـی ئەبخازیـە سـەربە ڕووسیەکان لە بواری ڕامیاری و ئابووریدا . سەرەڕای چەندین بیرووبۆچوون و لێـدوانی دژ بـە یـەکتری لـە نێـوان ڕووسـیا و جۆرجیـا و لایـەنگیرانی هەردوولایان ... بەلام ئەبخازیاو ئۆسیتیا دەبنە دەوولەتی خاوەن سنوور لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٤ لـە لێدوانـەکانی سـەرکردەی سابئە مندائیەکانی داهاتوو ، کە خێزان و کەسانی هەڵگری بــڕوای ئــاینی ســابئە و مندائیـەکان تووشـی توانـەوە هــەنگاو دەنـێن ، بـە هـۆی پاڵەپەسـتۆی هـەلگری بڕوای ئیسلام لـە ئێـڕاق ، بەتایبـەتی لـە دوای ڕووخانـدنی ڕژێمـی بـەعس لـە ئێـڕاق لـە ٢٠٠٣/٤/٩و بـەرفراوان بوونی ماوە لە پێش هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلام لە ئێڕاقدا .



جێگەی باسکردنە کە ئەم ئاینە سەر بە – ئادەم و نووح و یوحەنامعەمەدان – ن . کـە بڕوایـان بەتوونـدو تیـژی و تـیرۆر و لێـدان و کوشـتن و بـڕین و دژایەتی کردنی یەکتری نیە . هـەڵگری بڕوای ئاینی سابئە لە ئێڕاق بەر لە ئیـسلام و مەسـیح بـووە ، واتـە دانیـشتووانی ئارامیـەکان لـە ئێڕاق بـەر لـە عەرەب و دانیشتووانەکانی دیکە بوونە ، واتە عـەرەب بە خـەونیش ئێڕاقیـان نەدیبوو لـە وولاتـی نێوان دووزێـی – میوزۆپۆتامیا – و باشووری ئێـستای ئێڕاق .

واتـە ئاینەکـەیان ئـاینی پێغەمبـەر یـەحیا زەکەریایـە و ئارامیـە . لـە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس زیاتر لە ٨٠٪ ی دانیشتووانی ئەم ئاینە لـە ئێڕاق هەلاتوون و ڕوویان لە سووریا و ئوردن و وولاتانی دیکە کردووە بە تایبـەتی

لە باشووری کوردستان ، ئەوەی ماوەتەوە لە ژێر ترس و تۆقاندنن لە لایەن ئیسلام و زۆریشیان بە زۆر کراونەتە ئیسلام لە ڕێگەی ترساندن و لێدان و کوشتن و پەلاماردانیان .

ئەمەش بە هۆی بارودۆخی ئێراق و خۆ بەزل زانین لە لایەن ئیسلامەکان بە هەردوو مەزهەبەکانیەوە ، ئەوەیە ئاینی — تەسامح و ئاشتی و بەیەکەوە ژیان — بەڵام گەر دەسەلاتیان نەبێ — گەر دەسەلاتیان هەبێ بە پێچەوانەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، نەك هەر لە ئێراق بەڵکو لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٣/٦ کۆچی دوایی فەیلەسوف و کۆمەڵناسی فەڕەنسی -- جان بودیار-- لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ... شایانی باسە ئەم فەیلەسوفە لە ١٩٢٩/٦/٣٠ لە شاری ڕیمی فەرەنسا چاوی بە دونیا هەڵهێناوە ... هەروا ئەم فەیلەسوفە تەنیا بایەخی بە هزرو فەلسەفە نەداوە ، بەڵکو شیکەرەوەیەکی دیاری ڕووداوە ڕامیاریەکان و وێنەگرێکی شارەزاش بووە . بە هۆی کۆمەڵێك پەرتوکی فەلسەف و ڕامیاری ناوبانگی بە جیهان بڵاوبۆتەوە .

لەوانە -- جەنگی کەنداو — فانتازیا — جان بودیار ، لە ئەڵمانیا و زانکۆی سۆربۆنی پاریس خوێندنیەتی ، کە ماوەیەك وەك وەرگێر و ڕەخنەگر کاری کردووە و درێژەی بە خوێندن داوە ، تاکو پلەکانی خوێندنی تەواو کردیە و لە ساڵی ١٩٦٦ بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە بە ناونیشانی سیستەمی شتەکان ... ئەم فەیلەسوفە زیاتر لە ٥٠ بەرهەمی هەیەو وەك کەلتورێك بۆ گەل و نیشتیمانەکەی جێ هێشتووە لە وولاتەکەی و جیهان .

٢٠٠٧/٣/٦ تورکیا دادگایکردنی ئەحمەد تورکی ڕاگەیاند کە سەرۆکی پارتی — دەتەپە — یە بە ناوی ئەوەی کە ناوی عەبدوللا ئۆجەلان بە — بەڕێز ئۆجەلان — هێناوە نەك بە تاوانبار ، بەم هۆکارەش بە دەیا کەس لەلایەن دام و دەزگا ئەمنیەکانی

ڕژێمــی تورکیــا دەســتگیر کــراون و پــەلاماردانی ئەنــدامانی ئــەو پارتــەش بەردەوامە لەلایەن دەسەلاّتدارانی تورکیا بۆ سەر ئەندام و لایەنگرانی ئەو پارتە لە وولاّتەکەدا .

هــەروا لــە لایــەکی دیکــە دام و دەزگــا پەیوەنــدارەکان بــەردەوامن لــە لێکۆڵینەوەی ئەو لێدوانانەی کە بە ناوی ئەوە درکاندن ئەنجام دەدەن ، کە گوایــە عەبــدەللا ئۆجــەلان دەرمــان خــوارد کرابێــت لەلایــەن دەســەلاّتدارانی تورکیا ، ئەو لێکۆڵینەوانەی ڕەتکردەوە کە بەرامبەر بە ئۆجەلان کرابێت لە وولاّتەکەدا .



٢٠٠٧/٣/٦ لــە شــاری لــۆزانی سویــسڕا داواکاری گشتی داوای کـرد بـە زیندانی کردنی سەرکردەی تورک – دوگـو برینـژیك – بـە زینـدانی شەش مانگ ، بە تاوانبار کردنی بــە بــەرگری کــردن لــە ڕژێمــی عوسمـانی و دەوولـەتی تـورك بە نـە بـوونی کۆمـەڵ کـوژی لـە ژێـر دەســـەلاّتەکانی تورکیــا چ لـــە ســــــەردەمی دەســــــەلاّتی ئیمپراتۆریەتی عوسمـانی و چ لە دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا ، بەرامبەر بە نەتەوەکانی ئەرمەن و کورد لــە بــاکووری کوردســتانی داگیرکــراوی ژێــر دەســەلاّتی تورکیــا ، بــە پێــی پەیمانی مۆرکراوی لۆزانی لە ساڵی ١٩٢٣ دا .

جێگەی باسکردنە کە دادگای سویسڕا ، بڕیاری دادگایکردنی سەرکردەی نەتەوەی تورك دوگوی دا ، بە هۆی دان نەنانی بە کۆمەڵ کوژیەکەی ئەرمەن لە ساڵی ١٩١٥ لە لایەن دەسەلاّتی عوسمانی لە باکووری کوردستان . هەروا یاســای سویــسڕا و حکوومــەتی سویــسڕا ، دانــی بــەو کۆمــەڵ کوژیــە نــاو دەسەلاّتی تورك و عوسمانی تاوانبار کرد ، کە کارێکی جینۆساید و نەژاد پەرســتە ، هــەروا پەرلــەمانی سویــسڕا دانــی بــەو کۆمــەڵ کوژیــە نــا دژی

دەسەلاَتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕژێمی تورکیای نوێ لە ناوچەکەدا .

لێرەدا کە دوگو برینـژیك سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیا بووەو لە لێدوانێکی گشتی لە ساڵی ٢٠٠٥ لە شاری لۆزان ، دانی بەو کۆمەڵ کوژیە نەنا و بەرگری لە دەسەلاَتی عوسمانی و تورکیای نوێ کرد . کە لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی دەسەلاَتی عوسمانی پیلانی لە ناوبردنی ١,٥ ملیۆن و نیوێك ئەرمەنی دارشت ، کە زیاتر لە ١٢ دەووڵەت و چەندین دەستەو ڕێکخراوی نێوو دەووڵەتی دەسەلاَتی عوسمانی تاوانبار دەکەن بەو کۆمەڵ کوژیە ، بەلاَم دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش دەسەلاَتی نوێی تورکیا دان بەو ڕاستیە نانێت کە ئەنجامدراوە لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٦ لە بڕیارێکی دەسەلاَتی ناوەندی بۆسنەدا ، بە وەرگرتنەوەی ڕەگەزنامەی زیاتر لە ١٥٠٠ عەرەبی دانیشتووی بۆسنە ، بە تایبەتی لە شاری سەرایڤۆی پایتەخت کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە عەرەبە دانیشتووانەکان لە شاری سەرایڤۆ خۆ پیشاندان و ناڕەزایی بەرامبەر بەو بڕیارە و حکوومەتی بۆسنە دەربڕن لە وولاَتەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەو عەرەبانە زیاتر لە ١٥ ساڵە ڕوویان لەو وولاَتانە کردووە لە پێناو هاوکاری کردنی ئیسلامەکان ، لە بواری چەکداری دژی ئیسلامەکان لە هەرێمی بەلکان بە ناوی – موجاهدین – بەم هۆیەش ئەم عەرەبانە لە ئاسیا و ئەفەریکیا ڕوویان لەو هەرێمە کردووە ، بۆ یارمەتی دانی ئیسلامەکان لە شەڕی نێوان ئیسلام و مەسیحی و ئاینەکانی دیکە ، ئەویش لە ڕیگەی یارمەتیەکانی عەرەبی و ئیسلامی لە ساڵەکانی ١٩٩٢ – ١٩٩٥ گەیشتوونەتە ئەم ناوچە و بە هۆی مانەوەیان ، زۆر لەو عەرەبانە ژنیان لە بۆسنیەکان هێناوەو ماڵ و منداڵیان هەیە . ئەم عەرەبانەش لە کاتی چوونە ناو سنووری بۆسنە ناونووس کراون بە گەڕانەوەیان لە دوای تەواو بوونی کارە مرۆییەکانیان لە وولاَتەکەدا .

بەلاَم ئەوەی ڕاستبێ لە پێناوی یارمەتی مرۆیی نەبووە ، بەڵکو لە پێناو شەڕ کردن بووە ، لە پاڵ ئیسلامەکان دژی مەسیحیەکان و کەسانی دژ بە ئیسلام و بە هێز کردنی جێ پێگەی خۆیان و هەلاَتنیان لە وولاَتەکانی

خۆیان و ڕووكردنیان لەو ناوچەو هەرێمانە ، بۆ شێواندن و تێكدانی باری ئـەو وولاتانـە و نانـەوەی ئـاژاوە وەك ئەفگانـستان و پاكستان و كـەشمیر و هندستان و چەندین وولاتی دیكە .

لە گەڵ ئەوەشدا عەرەب زیاتر لـە ٢٢ دەووڵـەتیان هەیـەو زیاتر لـە چـەندین دەووڵــەتی ئیــسلامیش هەیــە بــۆ یارمــەتی لێقــەوماوەكانی عــەرەب لــە وولاتەكانیان لـە جیهانی ئیسلامیدا . ئـەم بڕیارەش لـە دوای ناڕەزایـیـەكانی ئەمەریكا و وولاتانی ئەوروپا هات ، كە بۆسـنە و ناوچـەكە بەرەو بە ئیسلام كردن و بە عەرەبكردن كارێكی بەر چاو و دیارە لە ناوچەو وولاتەكەدا .

٢٠٠٧/٣/٧ لە كیشووەری ئەفەریكیا ، لە تەمەنی درێژ و ڕێز لە یەكتر گرتن بۆتە بارێكی لە بار و گونجاو لە وولاتـی سـەنیگال ، ئـەم هۆكارەش بووە هـۆی ئـەوەی كـە سـەرۆكی سـەنیگال -- عەبـدەڵلاّ واد -- دەسـەلآتەكەی تـەواو بێـت و لـە ٢٠٠٧/٢/١٥ توانی بە سـەر ١٤ پـاڵێوراو سـەركەوێت لـە هەڵبژاردنـەكان ، بە پێی ڕاگەیاندنی فەرمی ئـەو وولاتـە بـە بە دەست هێنـانی ٥٥,٨٦٪ لـە كـۆی دەنگی دەنگدەران ، كە دەكاتـە ١,٩١٠,٣٦٨ لـە كـۆی ٣,٤١٩,٧٥٥ دەنگـدەر لە وولاتەكەدا .

بــەلام پــاڵێوراو -- ئیـدریس سـیل -- كـە سـەرەك وەزیرانـی پێـشووی سەنیگال بوو بە پلـە دوو سـەركەوتنی بە دەسـت هێنـا بە ڕێـژەی ١٤,٩٣٪ . بەلام پاڵێوراوی پارتی سۆشیالیستی ئوسمان تانگوردینگ بە پلـەی سێیەم هات و بەرێژەی ١٣,٥٧٪ ی بە دەست هێنا لە هەڵبژاردن لە وولاتەكەدا .

سەرەڕای ئەوەش ڕەخنـەی زۆر ئاراسـتەی دەرچـوونی عەبدوڵلاواد كـرا بە ناوی ئەوەی نابێ لە خوولی یەكەمی هەڵبژاردن ئەو ڕێژەیە بـە دەسـت بێنـی ، ئەمەش بە گێرەی ڕاپۆرتی گروپی ئابووری وولاتـانی ئەفـەریكیا – ئیكـواس – هات كە ئەو هەڵبژاردنـە چـەند خـاڵێكی سەرپێـچی لێ بـەدی كـراوە ، گـەرنا هەڵبژاردنـەكان بـە شـێوەیەكی خـاوێن و ڕێـك و پێـك بـە ئەنجامگەیـەنراوە لـە وولاتەكەدا .

جێگـەی ڕوونكردنەوەیـە كـە – عەبدوڵلاّ واد لـە تەمـەنی ٨٠ سـاڵیدا تـوانی هەڵبژاردنـەكانی ٢٠٠٠/٣/١٩ ، گـەورەترین سـەركەوتن بـە دەسـت بێنـێ بـە سـەر سـەرۆكی پێـشووی سـەنیگال– عەبـدە زییـوف – كـە تـوانی میراتـی دەسەلات لە سەنیگال بگرنە دەست لە گەڵ سەركردەی مێژووی سـەنیگال –

ليوبۆلـد سـيدار سـنگوور – ى شـاعير و روونـاكبير لـە وولأتەكـەدا . ئـەم سەركرديەش – سيدارسنگوور – لە سالّى ١٩٦٠ دەسەلأتدارە لـە سـەنيگال ، لە دواى بە دەست هێنانى سەرخۆيى سەنيگال لە ژێر دەسـەلأتى فەرەنسا .

دەرچوونى ئەم دوو سەركردەيەش لە دەسەلأتى سەنيگال ، بە هۆى تەمەن گەورەيى و نەتوانينيان بە هەڵسوراندنى كاروبارى وولأتە كە و بە هۆى بەر بلأوبوونـەوەى هـەژارى بـە رێـژەى ٥٠٪ ى دانيـشتووانى وولأتەكـەدا . سـەرەڕاى ئـەوەش ئـارامى و ئاسـايش لـەم وولأتـەدا بـەرقرارە لـە هـەموو وبوارەكان ، بە پێى راپۆرتە هەمەلايەنەكان لەو وووڵاتەدا .

<u>تێبينـى</u> :– بـۆ زانيـارى زيـاتر دەتـوانى بگەرێيتـەوە سـەر كتێبـى – ئينـسكلۆپيدياى كوردستان و جيهان – لە دانانى / عەلى كەندى – چاپى دووەم / ٢٠٠٨ .

٢٠٠٧/٣/٧ لـەم رۆژەدا زيـاتر لـە يـەك مليـۆن كـەس لـە – وحـدەويين – كـە زۆربـەيان لـە پرۆتـستانتەكان ، و كۆماريـەكان ، كـە زۆربـەيان كاسـۆليك بـوون ، بـەرەو سـندووقەكانى دەنگـدان هـەنگاويانننا بـە دەسـت



نيشان كردنى نوێنەرى – پەرلەمان – كە ١٠٨ ئەندام هەڵدەبژێرن لە نێوان ٢٥٠ پاڵێوراو ، كە لە پارتـە جياوازەكان پێك هاتوون لـە كەرتەكەدا – واتـە ئيرلەنـدە – بـە شـێوەيەكى راسـتەوخۆ لـە لەنـدەنى پايتـەختى بـەريتانيا و ، ياخوود بە يەكگرتنەوەى دوورگەى ئيرلەنـدە بە شێوەيەكى تـەواو لـە هـەموو بوارەكان لە كێشووەرو ناوچەكەدا . جێگـەى رونكردنەوەيـە كـە سـەركردەى يەكگرتنەوەكـە – ئايـان بيلـسى – بـۆ پۆسـتى سـەرۆكايەتى حكوومـەتى ئيرلەندەى باكوور – ئيلستر – دەگرێتە دەست ، كە بە مافى ئۆتۆنۆمى شـادە ، لـە نـاو شانـشينى بـەريتانيا بـە هاوكـارى – جيرى ئـادامز – سـەركردەى پارتى – شينى فين – لاباڵى راميارى لە سووپاى كۆمارى ئيرلەندە .

لێرەدا کە ئایان بیسلی بە ئەسپی جەنگ ناوزەندکراوە و ، جیری ئارامز – – بە ڕێوی – ناوزەندکراوە . هەروا لە گەڵ پێك هێنانی ئەو حکوومەتە کەوا بڕیارە لە ٢٦/ ٣ ی ئەمساڵ بڕیاری بۆ بدرێ ، بە حکوومەتێکی فرە لایەنە کە هەموو پارت و ڕێکخراوەکان بەشداری تێدا دەکەن .

ڕێکەوتنی ساڵی ١٩٩٨ کە لە لایەن سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – تۆنی بلێر – و سەرەك وەزیرانی ئیرلەندەی باکوور – بیرتی ئیهرن – مۆرکرا ، بە پێك هێنانی حکوومەتی تێکەڵاو لە کەرتەکەدا ، کە بە مافی ئۆتۆنۆمی شاد دەبێ ، بە پێی بوونی دەسەڵات لە سەر کاروباری بەرگری و دەرەوە لە وولاتەکەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا ڕووبەری ئایلستر شەش یەکی دوورگەی ئیرلەندیە، لەو کاتەی کە شانشینی بەریتانیا و لکاندیەیە ژێر دەسەڵاتەکەی لە ساڵی ١٨٠١ بە پێی یەکیەتی لە نێوان بەریتانیا و ئیرلەندا ، کە لە ساڵی ١٥٤١ دامەزرا ، دوای ئەوە لە سەردەمی شانشین ئەلیزابیتی یەکەم و شانشین جیمسی یەکەم ، شەڕ و پێکدادان لە ساڵی ١٦٠٧ دەستی پێکرد ، بە هۆی کۆچ کردنی دانیشتووانە ئینگلیزیەکان بۆ کەرتەکە ، واتە ئیرلەندەی باکوور لەوکاتدا .

دوای ئەوە دووبارە لە ساڵی ١٩١١ شەڕی نێوان چەکدارانی ئیرلەندا و بەریتانیا دەستی پێکردەوە و کاری کۆچکردن بەردەوام بوو لە دوای ئەوەی ، کە ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا نەیتوانی بگاتە ڕێکەوتن لە گەڵ بەرپرسانی کەرتەکە ، واتە دورگەی ئیرلەندە .

ئەویش بە پێدانی نیمچە سەربەخۆیی ناوخۆیی لە دوورگەکەدا ، بە هۆی رازی نەبوونی ئەنجوومەنی لۆردات ، کە ئەنجوومەنی باڵای بەریتانیا و بڕیاری کۆتایی لە لای ئەو ئەنجوومەنیە لە بەریتانیا . کە ئەو کات زۆربەی ئەندامانی لۆردات لە لاباڵی ڕاسترەوەکان بوون و هەوڵەکانیان بە ئینگلیزکردنی دوورگەکە بوو ، دژی دانیشتووانی ڕەسەنی دوورگەکەدا . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پرۆتستانتەکان برچەك بکرێن دژی کاسۆلیکەکان ، کە بە هەزاران هاووڵاتی بەرەو ئەمەریکا و کەنەدا کۆچیان کرد لە دوورگەکەدا .

بەلاّم لە ساڵی ١٩٢١ ئیرلەندەی باشوور سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و شاری – دبلینی – كردە پایتەختی كۆماری ئیرلەندە ، و بە مانەوەی ئیرلەندەی باكوور لە ژێر دەسەلاّتی بەریتانیا.

دوای ئەوەی سەرەك وەزیرانی ئەو كاتی بەریتانیا – وینستۆن چرچل – لە ساڵی ١٩٤٠ هەوڵیدا ، كە ڕێكەوتن لە گەڵ حكوومەتی ئیرلەندای باشوور مۆر بكات لە پێناو شەڕكردن لە گەڵ ئیرلەنەی باكوور و بە یەككگرتنەوەی هەردوو ئیرلەندای باكوور و باشوور لە یەك وولاّتدا . بەلاّم ئەو هەوڵە سەركەوتوو نەبوو لە وولاّتەكەدا

دوای ئەو هەموو هەوڵ و پلانەو نەخشە جۆراو جۆرانە لە ساڵی ١٩٧٣ دەست بە شەڕی نێوان سووپای كۆماری ئیرلەندە و سووپای بەریتانیا كرا ، سەرەڕای ئەوەش شەڕی مەزهەبی لە نێوان كاسۆلیك و پرۆتستانت پەرەی سەند لە سەردەمی دەسەلاّتی سەرەك وەزیران – مارگرێت تادشەر – بە ئەنجامدانی قەسابخانە لە لایەن هێزەكانی سووپاو پۆلیسی بەریتانیا ، دژی مەزهەبی كاسۆلیكی مەسیحی لە دوورگەی ئیرلەندەی باكوور .

بەلاّم لە سەردەمی سەرەك وەزیران جۆن مێجەر دەست كرا بەگفتووگۆی نهێنی لە نێوان هەردوولایەنی بەریتانیا و ئیرلەندەی باكوور ، لە پێناو چارە سەركردنی كێشەكان ، لە دوای ئەوەی كە سەرۆكی لیبیا موعەمەر قەزافی یارمەتی بەچەكردنی هێزی سووپای كۆماری ئیرلەندەی باكووری دەكرد ، دژی ئەو كارەی كە ئەمەریكا پێی هەڵسا ، بە بۆردومان كردنی شاری تەرابلسی لیبیا لە بنكە سەربازیەكانی بەریتانیا . ئەم شەڕو پێكدادانە بەردەوام بوو لە نێوان هەردوولا تاكو ڕێكەوتنی ئاشتی ، بە یارمەتی سەرۆكی ئەمەریكا بیل كلنتۆن لە ساڵی ١٩٩٨ مۆركرا ، لە نێوان سەركردەكانی ئیرلەندەی باكوور و حكوومەتی بەریتانیا و ، بارو دۆخەكانی نێوانیان بەرەو چارەسەركردن هەنگاو دەنێ لە هەموو بوارە جیاجیاكان لە دوورگە كە و لە بەریتانیا و لە ناوچەكەدا . دوای ئەو هەموو ململانێ و كێشە و گرفتانە و گەیشتنی بە بیروبۆچوونی ڕاستی ، ئەوە بوو لە ٢٠٠٧/٣/٢٦ ڕێكەوتنی مێژوویان مۆركرد بە دابەشكردنی دەسەلاّت لە دوورگەكەدا .

٢٠٠٧/٣/٧ هـەردوو وولآتـی – ئیمـارەتی ئـەبوو زەبـی و كۆمـاری فەرەنـسا رێكـەوتنی رۆشنبیریان بۆ ماوەی ٣٠ سالٚ مۆركرد ، بە دروسـت كردنـی مۆزەخانـەی – لۆڤـەر ئـەبوو زەبـی – وەك مۆزەخانەیـەكی نێوودەوولـەتی لـە ژێـر ناوچـەی رۆشنبیری لە دوورگەی – سەعدیە – بە دووری ٥٠٠ مەتر لە سەر رووبەری ٢٤٠٠٠ هـەزار مـەتر چوارگۆشـەدا لـە هـەموو پێداویـستیەكانی لـە ژوور و هۆڵەكانـدا . لـە كـەناری پایتـەختی ئـەبوو زەبـی . ئـەم رێكەوتنـەش لـە لایـەن سـەرۆكی دەوولـەتی ئـەبوو زەبـی -- شـێخ خەلیفـە زایـد ئـال نهیـال -- و نوێنـەری سـەرەك كۆمـاری فەرەنـسا جـاك شـیراك مـۆركرا بـە خوێندنـەوەی ووتـەی هـەردوولای رێكەوتنەكە ، لـە رێـوڕەسمی كردنـەوەی دانـانی بـەردی بناخەی مۆزەخانەكە .

دوای ئەوە كاری پڕۆژەكە كەوتـە كـاركردن و لـە سـاڵی ٢٠١٢ كۆتـایی دێـت ، بـە كردنـەوەی لـە مـانگی/ ٢٠١٢/٣ دا لـە لایـەن هـەردوو وولآت . هـەروا لـە لایـەكی دیكـە ئـەبوو زەبـی خـەرجی نۆژەنكردنـەوەی – شـانۆی ئـۆپرا – ی پایتەختی لە كۆشكی – مۆنتان یلو – ی بە ناو بانگی خستە ئەستۆی خۆی ، كـە لـە سـاڵەكانی ١٨٥٢--١٨٥٦ لـە لایـەن – هیكتـۆر لیفـول – دیزایننەكـەی بـۆ نەخـشە كێـشرابوو ، تـاكو ئێـستاش شـێوە جـوان و بـەهرەدارەكانی بـە خـۆوە هێشتووە لـە كـاتی دروسـتكردنی هـەر وەك خـۆی مـاوە ، كـە شـانۆی ئـۆپرا نـاوی -- شـێخ خەلیفـەی -- سـەرۆكی ئیمـارات هەڵـدەگرێ . هەرلـە رێكەوتنەكـە چـەندین برگـەو مـاددە و خـاڵی هاوكـاری رۆشـنبیری لـە خـۆ گرتـووە ، بـە دانـانی ئـەو شـووێنەوارە دێرینانـە لـە مۆزەخانـەی ئـەبوو زەبـی نێـوو دەوولـەتی لـە كاتـەكانی پێویـست بـە پێـی رێكەوتنەكە لە وولآتەكەدا .



٢٠٠٧/٣/٨ لە ئاهەنگێکی دڵخۆشکەردا سەرەك کۆمار و دەسەلاتی سووریا – بەشار ئەسەد – قۆناخی یەکەمی کارگەی دروستکردنی ئوتومبێلی بە هاوکاری و هاوبەشی کۆماری ئیسلامی ئێران کردووە ، کە جێگری سەرۆکی ئێران – بارفیز داودی – ئامادەی ئاهەنگی کردنەوەی کارگەکە کردو بریادرا ، کە لە مانگی /٤/ی هەمان ساڵ ئەم کارگەیە دەست بە کارکردن بکات ، کە ساڵانە ١٠ دە هەزار ئوتومبێل بەرهەم دێنێ بە ناوی ئوتومبێلی – شام – لە سووریادا .

جێگەی روونکردنەوەیە کە سەرۆکی سووریا ئەسەد لە ئاهەنگەکەدا رایگەیاند ، کە هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمان لە ٤/٢٢ی هەمان ساڵ ئەنجام دەدرێت ، بە پێی مەرسوومی کۆماری . هەڵبژاردنەکانی نوێنەرایەتی هەر چوار ساڵ جارێك لە سووریا ئەنجام دەدرێت ، بەلام کاتی دیاری کردنی هەڵبژاردنەکان بە مەرسوومی کۆماری دەبێت ، نەك بە پێی دەستووری ئەو وولاتە .

سەرەرای ئەوەی کە چوار لە بەرهەڵستکارانی رژێمی سووریا لە مانگی/ ٢٠٠٣/٣ بەژداری هەڵبژاردنی نوێنەرانیان نەکرد ، بە هۆی هەڵوێستە شۆڤینیەکانی دەسەلاتی سووریا ، بە نەبوونی دیموکراتیەت و مافی مرۆڤ ، کە ژمارەی دانیشتووانی سووریا نزیکەی ١٨,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە و لەو ژمارەیەدا ٧,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەس مافی دەنگدانیان هەیە لە وولاتەکەدا .

هەروا لە و ٧,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆنەش زیاتر لە ١,٥٠٠ یەك ملیۆن و پێنچ سەد هەزار لە گەڵ کورد مافی دەنگدانیان هەیە لە رۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە سووریا و لە تەواوی وولاتی سووریا . بەلام . کورد ... ؟...! .

٢٠٠٧/٣/٩ لە هەوڵێکی چارەسەرسازی قووبرسە یۆنانیەکان ، دەستیان کرد بە هەڵگرتنی کەرتێکی گرنگ لە پەرژینی دروستکراو لە نێوان هەردوو قووبرسی تورکی و یۆنانی کە لێك جیا دەکەنەوە لە هەردوو لایەنی



نیکۆسـیای پایتـەختی قووبرس .

جێگـەی باسـکردنە کـە ئەم پەرژینـە ناوزەند بوو بـە – هێلـی سـەوز – لـە نێـوان هـەردوو کۆمـەڵی یۆنانی و تورکی لە ساڵی ١٩٧٤ تـاکو ئـەم رۆژە لـە هەرێمەکـەدا ، لـە دوای داگیرکردنـی لە لایـەن هێزەکـانی سـووپای رژێمـی تورکیـا . هـەڵگرتنی ئـەم پەرژینەش لە کاتە تاریکەکان بوو بەر لەوەی رووخاندنەکەی ئاشکرا بکرێت . ئەمـەش لـە دوای رووخانـدن ، یـاخوود هـەڵگرتنی پردێـك بـوو بـە هـەمان شێووە لە نێوان هەردوو کەرتی دابەشکرا و لە هەرێمی دوورگەکەدا.



هـەروا لـە لایـەکی دیکـە تورکـەکانیش پردێکیـان لـە مـانگی/ ٢٠٠٦/١٢ رووخانـد ، کـە لـە سـاڵی ٢٠٠٥ دروسـتکرابوو ، بـە یارمـەتی و پـشتیوانی حکوومـەتی تورکیـا . ئـەم کـارەش لـە پێنـاو رێگـە خۆشـکردن بـوو بـۆ یەکگرتنـەوەی هـەردوو کـەرتی قووبرسـی یۆنـانی و تـورکی ، لـە رێگـەی گەیشتن بە رێکەوتنی ئاشتی یەکجارەکی لـە هـەموو بوارەکـانی یەکگرتنـەوە لە دوورگەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٩



گرووپێـك لـە زاناکـانی فەرەنـساو سویـسریەکان توانیان ئامێرێك بە ناوی ربووتـــا – robot – دروسـت بکـەن ، لـە پێنـاو زانینـی چـۆنیەتی یەکـەم هەنگاوی گیـان لـە بـەر کـە بـە سـەر وشـکانیدا بـڕوات . ئـەم ئـامێرەش لـە شـێوەی گیـان لـە بـەری – سلمندەری ئاوی – لە شێوەی کرم ، بەڵام پێستەکەی لە پێستی بۆق دەچێ

، ڕۆیشتنەکەشی لە شێوەی مارە ، یاخوود کرمی گەوورە .

لە توانای زاناکاندا هەیە هۆشداری بدەنە ئەو ئامێرە لە ڕێگەی ئامێری ئەلیکترۆنی بە گۆڕینی ڕێگەی جوولانەوە و ، یاخوود بە مەلە کردنی لە ناو ئاودا . ئەم ئامێرەش دەتوانێ ئەوە بسەلمێنێ ، کە ئەو گیان لە بەرەی کە بە شێوازی مارەزبچکی دەڕوات چۆن دەتوانێ لە ئاو و لە سەر وشکانی بڕوات ، کە دوو جۆر لە ڕۆیشتنی لە جەستەدا جێگیرکراوە ، بە پێی شانەکانی هەستیاری لە سەری ، یاخوود لە جەستەیدا . دوای ئەوە زاناکان توانیان ئەو زانیاریە بە دەست بێنن ، کە ئەم جۆرە گیان لەبەرە بەر لە ٣٦٠ ملیۆن ساڵ ئەو جۆرە ڕۆیشتنە لە ناو ئاو و دوایی لە سەر وشکانی زەوی ئەنجام بدەین .

ئەم تاقیکردنەوانەش لە سەر ڕۆخەکانی دەریاچەی شاری ڤیەننا ئەنجامدراوە و لێی سەرکەوتوو بوونە .

دوای ئەو تاقیکردنەوەیە زانا -- ئۆکی یان ئیسبیرت -- کە یەکێکە لەو گروپە زانایانە دەڵێ :- مووخ ناتوانێ هیچ کارێك ئەنجام بدات ، تەنیا لەو کاتە نەبێت کە بە کارەکە هەڵدەستێت و ڕوو لەو شوێنە دەکات ، کە خواستیاریەتی ، یاخوود هەر کارێکیدێکە ، وەك چۆن مریشکێك سەردەبڕی و بێ سەرە ، بەڵام بۆ ماوەیەك دەڕوات بێ ئەوەی هیچ لایەنێکی دیاریکراوی هەبێت ... زا نست پیرۆزەو بە پیرۆزیش بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێ لە هەموو بوارەکاندا .

٢٠٠٧/٣/١٠ لە کەش و هەوایەکی دۆستانەیان هەردوو وەزیری بەرگری سووریا – عماد حەسەد تورکمانی و ، وەزیری بەرگری ئێرانی – ژەنەڕاڵ مستەفا نەجار – دەستیان کرد بە گفتووگۆی نێوانیان ئەویش بە – فراوانکردنی هاوکاری و قووڵکردنەوەی یارمەتی بەرگری و پەلە کردن لە جێ بەجێکردنی ڕێکەوتنەکانی مۆرکراو لە نێوان سەرۆکی هەردوو دەوڵەتی ئێران و سووریا لە تاران و دیمەشق . بە تایبەتی هاوکاری و پەیوەندی سەربازی لە نێوان هەردوو وڵاتدا لە هەموو بوارەکانیدا ، لە پێناو پشتگیری کردنی یەکتری لە هەر ئەگەرێکی ناکاو لە ڕوودانی بۆ سەر هەردوو وڵاتدا .

ئەمەش لە دوای سەردانەکەی سەرۆکی سووریا بەشار ئەسەد هات بۆ

ئێــران و ئەنجامــدانی گفتووگــۆکردن لــه گــەڵ ســەرۆکی ئێــران مــەحمودی ئەحمــەدی نــەژاد ، ئــەویش لــه پێنــاو چەســپاندنی ئــارامی و ئاســایش لــه ناوچەکە و لە هەردوو وولاّتدا .

جێگـەی روونکردنەوەیە کە کۆمـاری ئێران زیاتر لـه ١٩٥ هـەزار کیلۆمـەتر چوار گۆشە و زیاتر لـه ١٢,٥٠٠,٠٠٠ ملیـۆن کـورد کەوتۆتـه ژێـر دەسـەلاّتی ئێــران ، هــەروا کۆمــاری ســووریاش زیــاتر لــه ١٧٠٠٠ هــەزار کیلۆمــەتر چوارگۆشــە و زیــاتر لــه ٢,٥٠٠,٠٠٠ ملیــۆن کــوردی پێــووە لکێنــدراوە و کێشەوگرفتی نێوان کورد و دەسەلاّتدارانی ئەو دوو وولاّتـەو وولاّتـانی دیکـه بەردەوامە ، بە هـۆی جـیّ بـەجیّ نـەکردن و دان نـەنان بـه مـافی تـەواوی گـەلی کوردستـان لە سەر خاکی کوردستـان.

٢٠٠٧/٣/١٠ لــه کــاتی ســـەردانەکەی سەرۆکی ئەمـەریکا جـۆرج بــوّش بــوّ بــەرازیل ، چەندین رێکەوتنی لە گەڵ ســـەرۆکی بـــەرازیل -- لـــویس ئگناســـیوو -- مۆرکرد لە بواری ئابووری




و تەکنــەلۆژی ، لــه پێنــاو پەرەپێــدان و گەشــەپێکردنی لــه نێــوان هــەردوو وووڵاتدا . له بواری پیشەسازی ئوتومبێل و بەرهەمی سووتەمەنی و نـەوت . لـەو کاتـەش کـه سـەرۆکی ئەمـەریکا لـه سووڕانەوەیەکیدا بـەردەوام بـوو بـۆ پێـنج وولاّت , وەك ، کۆلۆمبیـا و ، گواتیمـالا و ، مەکـسیك و ، بـەرازیل و ، مۆنتیفیـدیۆ . لـه پێنـاو گەڕانـەوەی بەرژەوەندیـه لـه دەسـت چـووەکانی لـه کێشووەری ئەمەریکای لاتینی ، کە لەوکاتەشدا سەرۆکی فەنزوێلا – هۆگـۆ شافێز -- سەردانی ئەرژەنتینی دەکرد لە پێناو بە هێـز کردنـی هاوکـاری و هاوپەیمانی و برایـەتی ، دژی رامیاریـەتی ئەمـەریکا و رژێمـی سـەرمایەداری لە جیهاندا .

جێگەی باسکردنە کە سەردانی سەرۆکی ئەمـەریکا بۆ ئـەم وولاّتانـه ببـووە جێگـەی نـارەزایی و تـوورەیی دانیشتووانی ئـەم وولاّتانـه بـه خۆپیـشاندان وەلاّمی سـەردانەکە و پێشوازیکردن بـوو لـه جـۆرج بـۆش ... بـه پێچەوانەی

سـەردانەکەی هۆگـۆ شـافیز بـوو کـە بەخۆشـحاڵی و چەپڵەرێزان پێشوازیان لێدەکرد لە وولاتەکەی کە رووی تیٚ دەکرد لە کیشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/٣/١١ ئاژانسی ئەنادۆڵی تورکیا بلاّویکردەوە ، کە هێزەکانی پۆلیسی تورکیا لە پارێزگای وانـی باکووری کوردستان ٢٧ هاولاتی کوردی لە میانەی ئەو ریٚپیٚوانانەی کـە لـە شـارەکانی وان و دیاربەکر بـۆ پاڵپشتی کـردن لـە کۆمەڵەیەکی دیموکراتی سازکرا دەستگیر کردووە لە هەریٚمەکەدا .

جیٚگـەی باسـکردنە کـە تورکیا وولاتیٚکـە و رژیٚمەکـەی عەلمانیـە تـا ئیٚستا دانی بە مافە سەرەتاییەکانی کورد لە باکووری کوردستان و تورکیا نانیٚت و پارت و ریٚکخراوە کوردیەکان قەدەخە دەکات و بەشداری رامیاری لە بەردەم هاوولاتی کورد بەرتەسك دەکاتەوە لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و نیشتمانیدا .

٢٠٠٧/٣/١٣ لـە دوای هـەوڵیٚکی زۆر تـوانرا کـۆنگرەی گـەلی کلـدانی ئاشـووری لـە رۆژی ٣/١٢ ئەنجام بدریٚت لە شارۆچکەی عەنکاوەی سەر بە پاریٚزگای هولیٚر لە هـەریٚمی باشـووری کوردسـتان ... لـە ئـەنجامی گفتووگـۆی کۆنگرەوانـان ، توانیـان یاداشـتیٚك ئاراسـتەی لیٚژنـەی نووسـینەوەی دەسـتووری هـەریٚمی باشـووری کوردسـتان لـە پەرلـەمانی کوردسـتان بکـەن . کـە داوای هەموارکردنی چەند ماددە و برگە و خالیٚکیان لە دەستوورەکەدا کردبوو .

سـەبارەت بـە دیبـاژەی رەشنووسـی دەسـتووری هـەریٚم لـە یاداشـتەکەدا هـاتووە :- زۆر پیٚویسـتە ئـازار و مەینەتـەکانی گەلەکـەمان لـە گـەلٚ ئـازارو مەینەتـەکانی گـەلی کـورد هاوشـان بکریٚـت . بـۆ ئـەوەی پیٚکـەوە ژیـانیٚکی هاوبەشانە و بوونیاتنانی داهاتوو لە هەریٚمی کوردستان قوولتر بکریٚتەوە .

هەروا سەبارەت بە مافە مەدەنی و ئازادیە گشتیەکان کە لە ماددەی /٢١ ی برگـەی / ٢ و مـاددەی /٢٣ لـە برگـەی /١ و مـاددەی ٤٩ . کـە تایبەتـە بـە مافـەکانی ئافرەتـان و یەکسـانیکردنیان بـە پیـاوان و بەشـداریکردنیان لـە پەرلەمان و ئەنجوومەنە ناوچەییەکان هاتووە ، کە یاداشتەکە داوایکردووە کـە ئـەو ماددانـە لـە چـەمکە خیٚلاّیـەتی و هاوسـەرگیری بـە زۆرەملـیٚ رزگـار بکریٚن .

هەروا لە یاداشتەکەدا ، سەبارەت بە پیٚکهیٚنانی کوردستان دا هاتووە ، کە

لە ماددەی /٦ ی دەستووری هەرێم هاتووە ، کە کۆنگرەکە پێی وایە ئەو ناوهێنانە لە گەڵ راستیەکانی یەکگرتووی گەلی . کلدانی سریانی ئاشووری نگونجێت . لە بەر ئەوەی ڕەشنووسی دەستورەکە ئامـاژە بە کلدان و ئاشووری دەکات ، دوو گەلی لێك جیا . ئەمەش لە داهاتوو ڕەنگدانەوەی باشی نابێت لە ناو پێك هاتەکانی ئاشووری لە گەڵ گەلانی دیکەی هەرێمی باشووری کوردستان .

هەروا سەبارەت بە مافەکانی ئیدارەی گەلی کلدانی سریانی ئاشووری لە یاداشتەکەدا هاتووە :- لە بەر ئەوەی ماددەی /٢ی دەستووری هەرێم هەموو ئەو ناوچانەی گەلەکەمان تێیدا دەژین خستۆتە چوار چێوەی سنووری هەرێمەوە . بۆیە ئەو مافانەی کە لە دەستووری ئێراقیش بە هەرێمەکان دەدرێت . دەبێ لە دەستووری هەرێمی کوردستان جێی بکرێتەوە ، تاکو بتوانین مافە ئیداریەکان لەو شوێنانەی کە زۆرینەی گەلەکەمانی تێدایە پیادە بکەین .

**<u>تێبینی</u>:- سەرچاوە:- لە راگەیاندنی یاداشتنامەی ئاراستە کراو بۆ پەرلەمانی کوردستان ، لە هەرێمی باشووری کوردستاندا .**

٢٠٠٧/٣/١٤ لە دوای دەرکەوتنی نەخۆشی ناکاوی سەرەك کۆماری ئێراق و سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان – جەلال تاڵەبانی – کە لە ٢٠٠٧/٢/٢٥ گواسترایەوە بۆ شاری عەممانی پایتەختی ئوردن ، لە پێناو چارەسەر کردنی نەخۆشیەکانی لەو ووڵاتە دا.

دوای تەواو بوونی چارەسەرکردنەکەی سەرەك کۆماری ئێراق جەلال تاڵەبانی لە ڕێگەی فڕۆکەخانەی نێوو دەووڵەتی لە شاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ گەیشتەوە شاری سلێمانی و لە لایەن بەرپرسانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و بەرپرسانی پارتەکان پێشوازی لێکراو گەیانرا جێگەی حەسانەوەی لە شارەکەدا .

٢٠٠٧/٣/١٤ لە دوای ئەوەی کە فلیمی – داڤیدتوولهێلدان – ی دەرهێنەری کورد – مانۆ خەلیلی – بریاری بەشداریکردنی درا ، کە لە ڤیستیڤالی سینەمای ئیماراتی عەرەبی بکات . بەڵام رژێمی تورکیا لە رێگەی باڵیۆزخانەکەی خۆی لەم وولاتەدا رێگەی بە نمایشکردنی ئەم فلیمە نەدا .




جێگەی روونکردنەوەیە کە ڤیستیڤاڵی سینەمایی ئیماراتی عەرەبی ، کە لە رۆژی ٣/٧ ی رابردوو دەستی بە کارەکانی نمایشکردن کردوو ماوەی شەش رۆژ بەردەوام بوو ، بریار وابوو کە لە رۆژی پێنجەمی ڤیستیڤاڵەکە ئەم فلیمە کوردیە نمایشبکرێت . بەڵام حکوومەتی تورکیا توانی رێگە لە نمایشکردنی ئەم فلیمە بگرێت ، بە تۆمەتی ئەوەی کە ئەم فلیمە هاندانە بۆ تیرۆر ، هەروا ئەم فلیمەش بەرهەمی کەناڵی تەلەفزیۆنی ئاسمانی وولاتی سویسرا بووە ، لە گەڵ ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و بە هاوکاری وەزارەتی رۆشنبیری سویسرا و دەزگای هاندانی کاری سینەمایی سویسری لە لۆران بەرهەم هێندراوە .

ئەم کارەی رژێمی تورکیا دوور لە کارەکانی مرۆڤایەتیە و ناشارستانیە و بە دەست تێووەردانی لە بواری رۆشنبیری و هونەری وولاتی ئیماراتی عەرەبی خستە روو . ئەمەیە دوژمنانی کورد و ، هەست و هۆشی کورد توانای رۆشنبیرانی کورد لە سەر خاکی کوردستان و دەرەوەی خاکی کوردستان .

٢٠٠٧/٣/١٤ لە هەوڵە بەردەوامەکان لە لایەن پارت و رێکخراوە کوردستانیەکان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان ، رۆژی چوارشەممە بە ئامادە بوونی چەند وەزیرێکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی پارتە کوردستانیەکان و یەکە ئیداریەکان لە شارەکانی خانەقین و سەعدیە و جەلەولا و مەندەلی لە شاری خانەقین کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانیان گرێدا ،

لــە پێنــاو دۆزینــەوەی ڕێگــا چــارەی جــێ بــەجێکردنی مــاددەی ١٤٠/ ی دەســتووری هەمیــشەیی ئێــراق ، کــە بەنــدە بــە چارەســەرکردنی کێــشە هەڵواســراوەکانی ناوچــە دابڕاوەکــان لــە هــەرێمی باشووری کوردســتان و بــە تایبەتی پارێزگای کەرکوك لە هەرێمەکەدا .



٢٠٠٧/٣/٢٠ لــە ســێدارە دانــی جێگــری ســەرەك کۆمــارو ســـەرۆکی ئەنجوومــەنی ســەرکردایەتی شــۆڕش و ســەرکردەی هێزی سووپای ئێراق – تــەها یاسین ڕەمەزان – ناسراو بــە – تەهاجەراوی – لە دوای چوار ساڵ لە ڕووخاندنی ڕژێمــی بــەعس لــە ئێــراق بــە سەرکردایەتی سەدام حوسێن .

جێگەی باسکردنە کە سەدام لە ٢٠٠٦/١٢/٣٠ لە سێدارە دراو ، بەرزان تکریتــی و عــەواد بەنــدەر لــە ٢٠٠٧/١/١٤ لــە ســێدارە دران . لــە مــاوەی دەســەڵاتی ئەحمــەد حەســەن بەکر و ســەدام حوســێن ، تــەها یاسین ڕەمــەزان چەندین پۆستی گرنگی گرتۆتە دەست ، لە پێناو خزمەت کردنــی دەســەڵاتی بــەعس و لــە نــاوبردنی ئــێش و ئــازاردانی گــەلانی ئێــراق بــە تایبــەتی گــەلی کوردســتان ، کــە ڕۆڵــی بــاڵای هــەبوو لــە ڕاگواســتنی دانیــشتووانی کــورد لــە پارێزگــای کــەرکوك و پارێزگــای مووســڵ و پارێزگــای دیالــە ، تــا ڕووخانــدنی ڕژێمەکــەیان لــە ٢٠٠٣/٤/٩ لــە لایــەن هێزەکــانی سووپای هاوپــەیمانان ، بــە سەرکردایەتی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ناوچە و ئێراق . تــەها یاســین ڕەمــەزان لــە مــانگی ٢٠٠٣/٨/ لــە لایــەن پێــشمەرگەکانی یــەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستگیرکرابوو ، دوای ئەوە درایە دەست هێزەکــانی سووپای هاوپەیمانان لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٣/٢٤ بــە بۆنــەی ئاهەنگــەکانی ســەری ســاڵی کــوردی و چــەژنی نــەورۆزی کــورد و نەتەوەکانی دیکەی کیشووەری ئاسیا ، ڕژێمی تورکیا لــە ڕێگــەی هێزەکــانی پۆلیس و ئەمنی ڕژێمی تورکیا دەستی کرد بە دەستگیرکردنی زیاتر لە ٤٣١ گــەنجی کــورد ، لــە کــوڕ و کــچی دانیــشتووانی بــاکووری کوردســـتان و

شارەکانی دیکەی ناو وولاّتی تورکیا ی بە زۆر دروستکراوی لە سەر خاکی گەلانی هەرێمەکە . لەو کاتەش کە ڕژێمی تورکیا دانی بە چەژنی نەورۆز ناوە بە یادکردنەوە و ئاهەنگ گێڕان لەم وولاّتەو ، بە تایبەتی لە باکووری کوردستان لە لایەن گەلی کوردستان و نەتەوەکانی دیکەی ئەم وولاّتە لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٣/٢٤ لـە دوای پـالاّوتنی دادوەر -- ڕەناباگواندداس -- بە سەرۆکی دادگای بالاّی پاکستان ، سووێندی یاسایی خوارد بەرامبەر بە بەرپرسانی دادگا لە پاکستان ... جێگای باسکردنە کە دامەزراندنی ڕەنا لەم پۆستە گرنگەدا لە پاکستان لە دوای دەست لە کارکێشانەوەی دادوەری بالاّی پاکستان – افتیخار مەحەمەد شودری – هات بەر لە دوو هەفتەدا ، هەروا دادوەر ڕەنا لە کەمە نەتەوایەتی هیندۆسییە و بۆ یەکەم جار لە مێژووی بوونی پاکستان هیندۆسی ئەم پۆستە بگرنە دەست . لە گەلّ ئەوەشدا دامەزاندنی ڕەنا بووە جێگەی دلّ گرانی توێژی پارێزەران و مافپەروەران لە پاکستان وە بووە هۆی دەست لە کار کێشانەوەی شەش لە دادوەرەکان لە وولاّتەکەدا .

ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەش سەرۆك کۆماری پاکستان پەروێز موشەرەف کە لە ڕێگەی کودەتا لە سالّ ١٩٩١ دەسەلاّتی گرتە دەست بەردەوام بوو لە دەسەلاّت و دەیویست لە دەست سەرۆکی دادگای بالاّی پاکستان ئیفتیخار رزگاری بێت ، بۆ ئەوەی نەبێتە کۆسپ لە پێش خۆ پالاّوتنی بۆ سەرۆکایەتی پاکستان .



٢٠٠٧/٣/٢٩ لـە لێدوانێكی وەزیـری دەرەوەی ڕووسـیا – سـێرگی لاڤـرۆڤ – هۆشداریدا بە ئیدارەی ئەمەریكا ، بـە ئـەنجام نـەدانی مـانۆری سـەربازی خـۆی لـە ئاوەكـانی كەنـداو بـۆ ئـەوەی ئـەو بـار گرژییەی كە لە نێوان ئەمەریكا و تاران دایـە و زیـاتر لـەوە پـەرە نەسـێنێت , بـە هـۆی نـەبوونی هێزی دەریایی لە ئەمەریكا لە ئاوەكانی كەنداوی فارسـی ، ئەمەش لـە ڕۆژی پێنج شـەممە كـە لـە ڕۆژنامـەی – خـەلیجی فارسـی – وەزیـری دەرەوەی ڕووسیا سێرگی لاڤیرۆڤ داوای كرد .

كە هیچ مانۆڕێكی تایبەتی لە لایەنی دەریای ، یاخوود سەربازی نەگرێتە بەر تاوەكو بار گرژییەكە زیاتر پەرە بسێنێت ، كە ئێستا لە ئارادایە ئەمەش لە دوای بڕیاری ئیدارەی ئەمەریكادا هاتیە ، كە بڕیارە لە هەفتەی داهاتوو مانۆڕی سەربازی لە ئاوەكانی كەنداو ئەنجام بدات ، لەم بارەیەوە وەزارەتی بەرگری ئەمەریكا بڕیاری دا پەلە لە بەڕێوەبەردنی ئەو مانۆڕە تایبەتییەی كەنداو بكات لە ناوچەكەدا .

٢٠٠٧/٣/٢٩ ڕاگەیاندنی ئەنجوومەنی باڵای پارتە ڕامیارییەكانی كوردستان ئەنجام درا ئەم ئەنجوومەنەش لە پارتەكانی :– پارتی دیموكراتی كوردستان ، یەكێتی نیـشتیمانی كوردسـتان ، یـەكگرتووی ئیـسلامی كوردسـتان ، كۆمـەڵی ئیـسلامی كوردسـتان ، پـارتی كۆمەنـستی كوردسـتان ، پـارتی سۆشیالیستی كوردستان ، پارتی زەحمەتكێشانی كوردستان .

بـەژداریان لـە پێكهێنـانی ئـەو ئەنجوومەنـە كـرد ، لـە گـەڵ ئەوەشـدا ئاشوورییەكان و كلدانیەكان و توركمانەكانیش دەتوانن بەژداری تێدا بكەن لە گەڵ سەرۆكی حكوومەتی كوردستان و سەرۆكی پەرلەمانی كوردستان و جێگرەكانیان ، لە گەڵ جێگری سەرۆكی هەرێمی كوردستان .

ئەم ئەنجوومەنەش مانگی جارێك بە سەرۆكایەتی سەرۆكی هەرێم ، یان شـووراى كوردسـتان كۆدەبنـەوە لـە پێنـاو هەڵسەنگاندنی بارودۆخـە

هەنووکەییەکان لە ناوخۆی هەرێم و ئێراق و پەیوەندییەکان ، لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێم لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لە هەردوو بواری نەتەوەیی و نیشتیمانی لە هەرێم و ناوچەکەدا و پەرەسەندنەکانی قۆناخی پێشکەوتن لە بواری ڕامیاری و ئابووری و بازرگانی و کۆمەڵایەتی لە کوردستان ... بەڵام ... ؟ ...!.

٢٠٠٧/٤/٣ گرێدانی کۆنگرەی پێنجەمی وەقفی مەزهەب سووننەی ئیسلام لە ئێراق لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردن ، بێ ئەوەی مەزهەب شیعەی ئیسلامی عەرەب بەشداری تێدا بکات . بە ئامادەبوونی ٢٠٠ کەس لە پیاوانی ئاینی دوور لە ئێراق ، کە سەرکردایەتی ئەو وەقفە لە بەهاری /٢٠٠٣ گۆڕانکاری تێدا کرد



جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە ئەم لایەنە مەزهەب ئیسلامیە لە ئێراق ، ڕۆڵی خراپیان گێڕا لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، لە بەر ئەوەی هەر لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لە لایەن بەریتانیا و هاوپەیمانەکانی ، ئەو مەزهەبە سووننە ئیسلامیە عەرەبە لە ئێراق ، دەسەڵات دار بوو تاکو ٢٠٠٣/٤/٩ بە ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حوسێن لە ئێراق .

هەروا بە هۆی کێشەو شەڕو پێکدادان لە نێوان هەردوو مەزهەب شیعە و سووننەی ئیسلامی عەرەب لە ئێراق ، بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٢٦٠ کەسایەتی ئاینی لە مزگەوت و مەزارگەکان و پەرستگاکان ، و تێکدان و ڕووخاندنی زیاتر لە ١٩٠ مزگەوت و بلۆکردنی زیاتر لە ٤٠ مزگەوت لە دوای تەقاندنەوەی مەزارگەی ئیمام عەسکەری لە شارۆچکەی سامەڕا لە مانگی /٢٠٠٦/٢ .

بە هۆی بیروو بۆ چوون و بڕوای ئایینی ئیسلام زیاتر لە ٦٠٠٠ مزگەوت لە ئێراق دروستکراوە ، جگە لە شارو شارۆچکە و گوندەکانی کوردستان .
هەر لەو کۆنگرەیەشدا باڵوێزی ئێراق لە عەمان بەشداری تێداکرد ، دوای ئەوەش لە کۆنگرەی شەشەمی وەقفی سوننە لە ٢٠٠٧/٤/٥ ئەنجوومەنی زانایانی مەزهەب سوونەی پێك هێنا لە ئێراق .

٢٠٠٧/٤/٣ لە سەردانێکی ئاشتەوایی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا – نانسی بیلوسی – گەیشتە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا ، کە ئەمە یەکەم سەردانی بەرپرێسکی باڵای ئەمەریکایە بۆ سووریا ، بەر لە ماوەیەکی زۆردا بە هۆی بوونی کێشەی نێوان ئەمەریکا و سووریا .




جێگەی باسکردنە کە سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا ، بەر لەوەش چاوی کەوت بە سەرۆکی فەڵەستینی مەحمود عەباس لە شاری ڕامەڵڵای فەڵستینی و سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل ئیلهوود ئۆڵمەرت لە شاری قوودس و نامەیەکی سەرەك وەزیرانی ئیسرائیلی هەڵگرتبوو بۆ سەرەك کۆماری سووریا بەشار ئەسەد .
لە کاتی سەردانەکەیدا بیلوسی لە لایەن بەر پرسانی سووریا پێشوازی لێکراو بیلوسی لە لێدوتنەکانیدا گووتی :-
سووریا ڕۆڵی کاریگەری هەیە لە ڕامیاریەتی ناوچەکەدا و ئەویش لە پێناو شکاندنی ئەو کێشە و گرفتەی کە لە نێوان سووریا و ئەمەریکا دا هەیە و پێویستە چارەسەربکرێت و بارودۆخەکە بەرەو ئارامگری هەنگاوی پێ بنرێ و سووریاش هەوڵی بەربەرەکانی تیرۆر بدات شان بە شانی وولاتانی دیکە لە جیهاندا .
هەر لەو سووڕانانەوە و سەردانانەیدا لە گەڵ سەرۆکی لوبنان و سەرەك وەزیران فوئاد سەینورە و بەرپرسانی دیکەی لوبنان گفتووگۆی ئەنجامدا .
هەروا لە لایەکی دیکە ئیدارەی ئەمەریکا رەخنەیان لە بیلۆسی گرت بە هۆی

سەردانی بۆ سووریا و لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٣ لە کۆماری ئۆکرانیا بە هۆی بوونی کێشەی نێوان ڤیکتۆر یانۆکۆفیتش لایەنگری رووسیای یەکگرتوو و ، یۆشینکۆی لایەنگری ئەمەریکا . بە تایبەتی لە دوای هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی ئۆکرانیا لە لایەن یۆشینکۆی دەست کردن بە هەڵبژاردن لە وڵاتەکەدا ، کە ڤیکتۆر یانۆکۆڤیتش ئەو هەنگاوەی بە کودەتایەکی رامیاری ناوزەند کرد ، کە لەو کاتە بە هەزار هاوڵاتی لایەنگرانی خۆپیشاندانیان بەرامبەر باڵەخانەی حکوومەتی ئۆکرانیا ئەنجامدا بوو لە شاری کیفی پایتەختی ئۆکرانیا .




جێگەی باسکردنە کە سەرۆکی ئۆکرانیا یۆشینکۆ لە ٤/٢ لە بڕیارێکییدا پەرلەمانی وڵاتەکەی هەڵوەشاندەوە و داوای هەڵبژاردنی کرد لە مانگی/٥ ی هەمان ساڵ ، واتە لە مانگی /٥ ی داهاتوو لە وڵاتەکەدا .

بەڵام ڤیکتۆر ئەو بڕیارەی یۆشینکۆی بە دوور لە دەستووری ئۆکرانیا ناوزەندکرد لە دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی ئۆکرانیا ، بە ڕێگای نایاسایی بە تێرکردنی ئەندامانی پەرلەمانی لایە نگری خۆی لەووڵاتەکەدا . لە گەڵ ئەوەشدا لایەنگرانی ڤیکتۆر لە پەرلەمان باڵا دەستن و داوای مانەوەیان کردووە ، بەڵام بڕیارەکەی یۆشینکۆی بە کودەتایەکی خراپ ناوزەندکرد .

لە بەر ئەوەی یۆشینکۆ سەرۆکی ئۆکرانیا و ڤیکتۆریش سەرەك وەزیرانی ئۆکرانیایە کە یۆشینکۆ دەسەڵاتی تەواوی لەسەر ئۆکرانیا هەیە لە هەموو بوارەکانی دەسەڵات لە سەر وڵاتەکەدا . لە لایەکی دیکەش لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیران وەزیری بەرگری – ئەناتۆلی هراتسینکۆ – ڕایگەیاند کە هێزەکانی سووپا دەتگیرن بە بڕیاری سەرۆکی ئۆکرانیا – یۆشینکۆ – رایگەیاند کە هێزەکانی سووپا دەستگیرن بە بڕیاری سەرۆکی ئۆکرانیا

یۆشینکۆ ، هەروا لەم کات وساتەشدا لایەنگرانی هەردوو کۆمەڵ بوون لە بەردەمی باڵەخانەی حکوومەت و پەرلەمان لە شاری کیف لە ئۆکرانیا .
کە بووە هۆی دروست بوونی کێشەوگرفت و ئاڵۆزبوونی کێشەکە ، هەر وەك لە شۆڕشی پرتوقالی کە لە ساڵی ٢٠٠٤ ڕوویدا و بووە هۆی سەرکەوتنی یۆشینکۆ بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی کردنی ئۆکرانیا ، سەرەڕای ئەوەش یۆشینکۆ توانی لە هەڵبژاردنەکانی مانگی/١/٢٠٠٥ ، سەرکەوتن بە دەست بێنێ بە سەر ڤیکتۆر یانۆکۆفیتش و ، لە هەمان کات دانی بەو سەرکەوتنە هێنا . ئەو کێشەو گرفتەش تاکو ئیستا بەردەوامە و دوور نیە لە داهاتوو ئۆکرانیا ببێتە دوو وولاتی لێك جیا بە هۆی بوونی دانیشتووانی ڕووسەکان لەم وولاتەدا بە شێوەیەکی بەرچاو لە ڕۆژهەلاتی ئۆکرانیادا .

٢٠٠٧/٤/٣



لە کۆماری نیجیریا دادگای فیدراڵی بالا ، فەرمانی بە لیژنەی هەڵبژاردنەکاندا بە ڕێگەپێدان بە جێگری سەرۆك – ئەتیکۆ ئەبووبەکر – کە بچێتە ناو هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ئێستا ئەنجام دەدرێت لە مانگی/٤ لە وولاتەکەدا .
هەروا لە فەرمانەکەی دادگای بالادا دەلێ لە دەسەلاتی لیژنەی هەڵبژاردن نیە کە ئەبووبەکر لە هەڵبژاردنەکان بێ بەش بکات ، کە ئەمەش لە ڕێنماییەکانی دادگا ناگونجێ لە گەڵ بە ئەنجامگەیاندنی ڕێووڕەسمی هەڵبژاردن .
جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە ئەبووبەکر بووە سەرکردەیەکی بالا لە ئۆپۆزسیۆن لە دوای دروست بوونی کێشەی لە گەڵ سەرۆکی پێشووی نیجیریا – ئۆلۆسیگون ئۆباسانگلۆ – لە وولاتەکەدا .
بەلام بەر لەوەش لیژنەی ئەنجوومەنی وەزیران ئەبووبەکری بە کەسایەتیەکی گەندەڵ دانا لە ماوەی دەسەلاتەکەی ، بە تایبەتی لە بارەی بواری نەوت بە شێوەیەکی فەرمی ، کە ئەمەش لە لایەن ئەبووبەکر

رەتکرایەوە لە ماوەی دەسەلاتەکەیدا لە سەر نیجیریا .





الشهيدة دعاء خليل اسود — العمر ١٧ عاماً

٢٠٠٧/٤/٧ لە کردەوەیەکی نامرۆڤانەی چەند کەسانێکی توندڕەوی هەڵگری بڕوای ئێزیدیە کوردەکان ، کچە گەنج و بێ تاوان – دوعا – کوژرا ، بەلام چ کوشتنێك ، بە بلۆك و لێدانی لە بەر چاوی دانیشتوان لە قەزای شەنگال لە هەرێمی باشووری کوردستان .

لە دوای ئەو کارە ناشیرنە و لە هەڵمەتێکی تۆڵە ٢٤ کرێکاری ئێزیدی هەژار لە لایەن تیرۆرستانی ئیسلامی توندڕەو شەهیدکران.

هەر بەم هۆکارە دڵتەزێنە ٥٠ رێکخراوی ئافرەتان و ژنان و ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی کوردی دانیشتووی کوردستان ، سەبارەت بە کوشتنی خاتوو دوعا خۆپیشاندانیان ئەنجامدا بۆ بەردەم پەرلەمانی کوردستان و دوای ئەوە یاداشتنامەیەکیان ئاراستەی پەرلەمانی کوردستان و وەزارەتی داد و وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی مافی مرۆڤ کرد و ، داوای تۆڵەسەندنەوەی خوێنی پاکی خاتوو دوعایان کردو ، ئەم لایەنە پەیوەندارانە ، بە تایبەتی پەرلەمانی کوردستان . بەڵێنیاندا بە وەرگرتنی تۆڵەی دوعا و پشتگیری لە دایك و باوکی و خوشك و براکانی دوعا ، کە بە کردەوەیەکی نامرۆڤانە و دوور لە هەستی مرۆڤایەتی و ئایینی و یاسا ئەنجام درا لە ناوچەکە دا ، کە بووە هۆی زرینگانەوەی ئەو باسە نەك هەر لە کوردستان و ئیراق بەڵکو لە هەموو جیهاندا .

٢٠٠٧/٤/٧ لە ئاكامی نا لە باری بارودۆخی پەیوەندیە كۆمەلأیەتیەكان لە پاكستان و بەرز بوونەوەی ئەو بارودۆخەو كاردانەوەی لە سەر باری ئایینی ، كە لە ئەنجام بووە هۆی ئەوەی كە شەڕو پێكدادان لە نێوان مەزهەب سوونەی ئیسلامی زۆرینە و مەزهەبی شیعە ی كەمینە روودات لە باكووری رۆژئاوای پاكستان .

ئەم رووداوە لە ئەنجامی پەلاماردانی مەزهەبی شیعە بوو لە لایەن مەزهەب سوونەی ئیسلام لە شاری – یارشینار – كە كەوتووتە ڕۆژئاوای ویلایەتی بشاوری سنووری ڕۆژئاوای پاكستان ، دەسەلأتدارانی پاكستان دڵگرانن لە كێشەی نێوان ئەو دوو مەزهەب ئایین ئیسلامیە لە وولأتەكەدا ، كە بۆتە هۆی بەر بلأوی نا ئارامی و سەقامگیر نەبوونی بارودۆخەكە و بەكار هێنانی چەك دژی یەكتری لە وولأتەكە دا



٢٠٠٧/٤/٨ لە لێدوانێكی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئیراق و لە سەر لیستی هاوپەیمانی كوردستان – سەعدی بەرزنجی – ڕەتیكردەوە كە كۆنگرەی وەزیرەكانی دەرەوەی دراوسێی ئێراق ، بە هۆی كاریگەری لایەنی رامیاری كوردی لە توركیا بۆ میسر گوازرابێتەوە و ئەوەشی ڕاگەیاند ، كە گۆڕێنی شوێنی كۆنگرەكە لە جێگەی خۆیدا بوو نەك بە پێچەوانە .

لە بەر ئەوەی لە بنەڕەتا ئێمە لە هاوپەیمانی كوردستان و رەنگە زۆربەی ئێراقیە كانیش متمانەمان بەوە نیە كە ئەنكەرە شوێنێكی لە باربێت بۆ

سازدانی هەر کۆنگرەیەك دەربارەی ئێراق .

هەروا گووتی :- ئێمە لە سەرەتا پێمان باشبوو ئەم کۆنگرەیە لە ئێراق سازبدرێت ، بەلاّم نا لە باری ئاسایش کێشە بوون لەبەردەمی کۆنگرەکە . بەلاّم لە بەر ئەوەی ئەنکەرە ئەجیندای خۆی لە ئێراق هەیە ، لەو پێناوە دا تورکیا هەولّی ئەوەی دەدا کە کۆنگرەکە لە خاکی ئەودا سازبدرێت . بەلاّم بێگومان سازدانی ئەم کۆنگرەیەش لەو وولاّتە کارگێری تورکیای لە سەردە بوو .

بۆیە وا باشتر بوو کە شوێنەکەی بگوازرێتەوە بۆ شاری قاهیرەی پایتەختی میسر ، بەلاّم گواستنەوەی کۆنگرەکە لە سەر داوای ئێراقیەکان بووە ، نەك هەر بە تەنها لیستی هاوپەیمانی کوردستان . بەلاّم سەبارەت بە نارەزایی عەرەبە سووننەکان بە گواستنەوەی کۆنگرەکە بۆ شاری قاهیرە لە میسر ، ئەوان پێیان باش بوو کۆنگرەکە لە تورکیا سازبکرێت ، لە بەر ئەوەی تورکیا زیاتر پشتگیری سووننەکانی دەکرد ، بەلاّم حکوومەتی میسر بە دیدێکی یەکسان کۆنگرەکەی بەرێووە دەبرد و بروانێتە چینی پێك هاتەکانی گەلی ئێراق و ، لە گەلّ ئەمەشدا لایەنگیری لایەنێك ناکات و هەولّدەدات کۆنگرەکە بە بەشداربوونی هەموو لاەیەنەکان سەربکەوێت .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە وەزارەتی دەرەوەی میسر رایگەیاند ، کە ئەو کۆنگرەیە لە ٥/١٣ دەست پێدەکات لە شاری شەرمشێخی میسر ، کە وەزیرەکانی دەرەوەی وولاّتانی دراوسێی ئێراق و ، هەر پێنج وولاّتەکەی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان و ، وولاّتانی هەرێمی ، هێزە نێوو دەوولّەتیەکان ، پیشەسازیەکان و ، نوێنەری کۆمکاری عەرەب و ، کۆنگرەی ئیسلام بە شداری تێدا دەکەن لە وولاّتەکە دا

٢٠٠٧/٤/٩ لە راگەیاندنێکی ئەندامی دەستەی نیشتیمانی بۆ کاروباری مین لە ئێراق گووتی :- لە ماوەی مێژووی رووداوەکانی شەڕی ئێراق لە گەلّ ئێران



و کوێـت و بـەر لـەوەش لـە هـەرێمی کوردسـتان ، زیاتر لـە ٢٥ ملیۆن مین لـە سەر خاکی ئێراق چێندراوە ، لە پێناو بەرگری کردن لە رژێمە یەك لە دوای یەکەکانیان لە ئێراقدا.

جێگەی باسکردنە کە لـە گـەڵ یادکردنـەوەی رۆژی جیهـان و پـشت بەسـتن بـە راپـۆرتی رێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان ، ژمـارەی ئـەو مینانـەی کـە تاکوو ئێستا لە ژێـر زەوی مـاون زیـاتر لـە ٢٥ ملیـۆن مـین , کـە ئەمـەش بۆتـە هۆکارێکی مەرگەساتی بۆ گەلانی ئێراق ، کە رۆژانـە چـەندین هـاوولاتی کـەم ئەنـدام دەبن بە هـۆی تەقینـەوەی لـە ژێـر پێیـان و و لـە دەسـت دانـی قـاچ و دەسـتەکانی ، بـە تایبـەتی ئـەو هـاو ولاتیانـەی کـە کـاری کـشتووکاڵی و کاسبکاری دەکەن لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٩ لە هەوڵەکانی رژێمـی تورکیا بـۆ گـەمارۆدانی کـورد لـە هـەموو بوارە جیـا جیاکـان ، بـە تایبـەتی لـە بـواری رۆژنامـەوانی لـەم وولاتـەدا ، هەڵسا بە داخستنی رۆژنامەی رۆژانەی – گۆنـدم – بـۆ مـاوەی / ١٥ رۆژ ، بـە هۆی بلاوکردنەوەی بابەتی بەرگری کردن لە مافەکانی کورد.

Gündem

ئـە م رۆژنامەیـەش لـە تووركیـا دەردەچـێت و رۆژانـەی گۆنـدەم دابخرێـت بەلکوو لە ٢٠٠٧/٣/٦ دیسان بۆ مـاوەی یـەك مـانگ دەرگـای دەرچـوونی لـە سەر داخرا لە لایەن دادگای تورکیا ، بە هـۆی بـەرگری کردنـی لـە مافەکانی کورد لە باکووری کوردستان .

هـەروا دوای دەرچـوونی یەکـەم ژمـارەی لە لایـەن دادگـای توورکیا بریـاری راگرتنـی دەرچوو لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٩ سەرەك وەزیرانی تووركیا – رەجەب تەیب ئۆردگان – لە م رۆژەدا هۆشداری دا بە سەرۆكی هەرێمی باشووری كوردستان – مسعوود بارزانی – بە هۆی



لێدوانەكەی دژی توركیا ، بە دەست تێوەردانی لە كاروباری ناوخۆی هەرێم و لە پێناو لە ناو بردن و لە باربردنی ئەو ئەزموونەی كە لە هەرێمی باشووری كوردستان هاتۆتە كایەوە ، ئەم لێدوانەی سەرەك وەزیرانی تووركیاش لەو كاتە هات كە سەرۆكی هەرێمی باشووری كوردستان ، بە هۆی كردارەكانی تووركیاو رێز نەگرتن لە هەڵوێستی كورد ، ئەوا كورد دەتوانێ خەباتی زیاتر بگوازێتەوە ناو شارەكانی ژێر دەسەلاتی تووركیا لە باكووری كوردستان لە تووركیا.

رژێمی تووركیا دەسەڵاتدارێكی داگیركەری خاكی كوردستانە لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی تووركیا و بەر لەوەش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاكوو ئەو رۆژەش تووركیاو تۆرانی هەرچی بە هەستیان داهاتوو بەرامبەر بە كوردو ئەرمەن ئەنجامیان داوە ، لە هەموو بوارەكان بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و نیشتیمانی لە سەر خاكی كوردستان ، گەرچی هەڵوێستی سەرۆكی هەرێمی كوردستان مەسعوود بارزانی لە جێگەی خۆی بووەو دە بوایە زیاتریش بوایە دژی هەڵوێستەكانی دەسەلاتدارانی مەدەنی و سەربازی لە تووركیا .

لێرەدا هەڵوێستەكانی تووركیا دژ بە كووردوخاكی كوردستان ، وای كردیە كە لە دوای ساڵی ١٩٨٤ تاكوو ئەم رۆژە زیاتر لە ٣٧٠٠٠ هەزار كەس گیانیان لە دەست بدات جگە لە گیان پێ لە دەست دانی كورد لە باكووری كوردستان بە سەر كردایەتی و شۆرشگێرانەی پارتی كرێكارانی كوردستان لە باكووری كوردستان.



٢٠٠٧/٤/١٢ لە داواکاریەکی سەرکردەی ئـــەرکانی هێزەکـــانی سووپای تورکیا – ژەنەڕاڵ یاشـار بویوکانیـت – دا بـە جـێ بـەجیکردنی کـاری ســەربازی لــە هــەرێمی باشـــووری کوردســـتان – دژی جەکـدارو گـەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان ، لە شاخ وچیا بەرزەکانی کوردستان .

ئەم داواکاریـەی سـەرۆکی ئـەرکانی تورکیا لـە کۆنگرەیـەکی رۆژنامەوانیدا هات و داوای کرد ، کە کارێکی پێویستیە بە هەڵسانی سووپا لـە باکووری ئێـراق . هـەروا گـووتی :– بـەر لـەوەی ئـەو کـارە ئەنجامبـدرێت پێویـستە بریـاری رامیـاری لـە پەرلـەمانی تورکیا بـۆ وەربگیرێـت و مـاوە بـە هێزەکـانی سـووپا بـدرێت ، بـە ئەنجامـدانی ئۆپراسـیۆنیکی سـەربازی فـراوان دژی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە سەر سنوورەکانی نێوان تورکیا و ئێران و تورکیاو ئێراق .

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـەم لێدوانـەی یاشـار لـە دوای پـەلامار و هێرشـە بـەر چـاوەکانی گـەریلاکانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان هـات دژی هیزەکـانی سـووپای تورکیـا و پێگـەیانـدنی زیـانی گیـانی و کـەل و پـەلی سـەربازی لـە ناوچەکەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی مـەدەنی و سـەربازی لـە تورکیا داوایان لـە حکوومـەتی ئێـراق و ئەمـەریکا کـردووە ، کـە پـەلاماری چـەکدارانی پـارتی کرێکـاران بـدەن و لـە سـەر سـنوورەکان دەریانبکـەن ، بـەڵام نـە حکوومـەتی ئێـراق و نـە ئەمـەریکا بـەو کـارە هەڵنەسـتاون و ئەمـەریکاش دژی لێـدوانی سـەرکردەی ئـەرکانی سـووپای تورکیـا وەسـتا لـە بـارەی ئەنجامـدانی ئۆپراسیۆنی سەربازی و چوونە ناو خاکی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان لـە ناو سنووری ئێراقدا .



٢٠٠٧/٤/١٣ لـــە نامەیـــەکی پـــارت و ڕێکخـــراوە کوردیـــەکانی ڕۆژئـــاوای کورســـتان لکێنـــدراو بـــە ســـووریا ئاراستەی ڕژێمی تورکیا و دەسەلأتدارانی تورکیا کراو ، داوایان لە تورکیا کرد کە دان بە مافە ڕەواو ئاسایەکانی گەلی کوردا بنێت . هەروا ئەو هەڕەشانەی کە لە هەرێمی باشووری کوردستان دەکات ، کە هەرێمێکی ئارامە و هەموو بوارەکانی پەیوەندی تیا مسۆگەرە ، کە لە سەر تورکیاش پێویستە هەوڵی باشترکردنی پەیوەندیە دراوسێیەکانی لە گەڵ وولأتانی ناوچەکە و حکوومەتی هەرێم بدات ، هەروا داوا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات ، کە پاڵە پەستۆ بخاتە سەر تورکیا ، بە چارەسەر کردنی کێشەی کورد لەم وولأتەدا ، بە ڕێگەی ئاشتیانە لە مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان .

جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە ئەو پارت و ڕێکخراوانەی کە ئەو بەیاننامەیان ئاراستەی تورکیا و نەتەوە یەکگرتووەکان و وولأتانی پەیوەنددار کردووە ئەمانەن ئەویش :-

١- پارتی دیموکراتی کوردستان – سووریا ... ٢- پارتی یەکیەتی کورد ... ٣- یەکیەتی دیموکراتی کورد ... ٤- ڕێکخراوی فەرنسا ...

٥- ڕێکخـــراوی کورد لە سووریا .

٢٠٠٧/٤/١٤ لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا زیاتر لە ٣٠٠,٠٠٠ سێ سەد هەزار کەس خۆپیشاندانیان ئەنجامدا دژی دەسەلأتی سەرەك وەزیران -- ڕەجەب تەیب ئۆردگان -- و پارتی داد و گەشەپێدانی دەسەلأتداری ئیسلامی لە تورکیا . ئەم خۆپیشاندانەش لە پێناو جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەلأت بوو ، بە بەرزڕاگرتن و بەردەوام بوون لە سەر ڕژێمی زانستی – عەلمانی – لە تورکیا .

هەروا دژی ئۆردگان وەستان بە خۆنە پالأوتنی بۆ سەرۆك کۆماری تورکیا . ئەم خۆپیشاندانەش لە بەردەم مەزاری کەماڵ ئەتاتورك بوو لە ئەنکەرە و

ڕێزگـرتن لـە ڕامیاریـەتی کـەماڵ ئـەتاتورك و وەسـتان دژی ئـەردۆگان . ئـەم خۆپیـشاندانەش لــە بــەر دوو ڕۆژ هــات بــە خۆپیــالأوتنی ئــەردۆگان بــۆ سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە تورکیادا .

٢٠٠٧/٤/١٦ لـــە دوای ســـەرکەوتنی ســـەرۆکی ئـــەکوادۆر – ڕەفایل کۆریا – لە ڕاپرسی گەلانی ئەکوادۆر ، لە پێناو هـەموار کردنی بنـەرەتی لە یاسای ڕامیـاری بنـەڕەتی . دوای ئەوە کۆریا پشتگیری



لە جەماوەری وولأتەکەی کرد ، بە پێکهێنـانی ئەنجوومـەنی گـول لـە جیـاتی پەرلەمان بۆ دووبارە نووسینەوەی دەستووری نویٚ ، کە لـە بەرژەوەنـدی و خزمەتی گەلی ئەکوادۆر بێت .

بەلأم ڕەخنە گران وای بۆچوون کە کۆریا هەمان پلان و نەخشەی سـەرۆکی ڤـەنزوێلا هۆکـۆ شـاڤێزی گرتۆتـە بـەر لـە وولأتەکـەدا و ، بـە شـێوازێکی نـا دیمـوکراتی هـەڵس و کـەوت دەکـات ، ئەمـەش لـە دوای گەندەڵیـەکی بەرچاو هـات لـە لایـەن پەرلـەمانی ئـەم وولأتـە و گـەلی ئـەکوادۆر بـە زۆرینـەی دەنـگ پشتگیریان لە کۆریا کرد لە وولأتەکەدا .

٢٠٠٧/٤/١٦ لـــە دوای گەیـــشتن بـــە ڕێکـــەوتن لـــە نێـــوان حکوومـەتی سـاحل عـاج و چـەکدارەکان لـە بـاکووری وولأتەکەدا .

ئەویش بە هەڵگرتنی ئەو بەرژینـــە ، یـــاخوود ئـــەو بەربەسـتەی کـە بـاکوور و باشوور لێك جیا دەکاتەوە لە وولأتەکەدا .



ئەمەش لە گەڵ سەردانەکەی سەرۆك کۆمار لۆراند باگیۆ و سـەرەك وەزیـران

، کە بەرەو ناوچەکە چوون بۆ هەڵگرتنی ئەو ناو بڕەی کە هەردوو هەرێم لێك جیا دەکاتەوە ، ئەویش بە لابردنی لە ئاهەنگێکی گەورەدا ، لە پێناو چارەسەر کردن و بنبرکردنی هەموو کێشەو گرفتێك لە وولاتەکەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا زیاتر لە ۱۱۰۰۰ هەزار سەربازی فەرەنسا وەك ئاشتی پارێز لەو ناوبڕەدا کە درێژیەکەی ٦۰۰ کیلۆمەتر بوو نیشتەجێن لە پێناو چاودێریکردنی ئاگربەست و جێ بەجێکردنی ڕێکەوتنەکە لە نێوان هەردوو لایەن ، ئەمەش لە دوای پەیوەندی باش هات لە نێوان سەرەك کۆمار لۆرانت و سەرکردەی چەکدارەکانی باکوور – گۆیام سوورو – بە مۆرکردنی ڕێکەوتن لە مانگی/۳/۲۰۰۷ لە نێوان هەردوو لایەن ، لە پێناو یەکگرتنەوەی هەردوو هەرێم و ڕێگە خۆشکردن بۆ هەڵبژاردن لە وولاتەکەدا .

۲۰۰۷/٤/١٦ لە لێدوانێکدا بۆ گۆڤاری – دیرشبیگل – ی ئەڵمانی ، سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردگان – گووتی :– تورکیا و ئەڵمانیا مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە لە پەیوەندیە دێرینەکانی نێوان هەردوو وولات ، بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە کە حکوومەتی ئەڵمانیا بانگهێشتی تورکیای نەکردووە کە بە شدار بێت لە یادکردنەوەی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا ، کە لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ئەنجامدەدرێت .

هەروا سەرەك وەزیرانی تورکیا گووتی :– ئێمە دەمانەوێت بەروارێکی دیاریکراو هەبێت لە وەرگرتنی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا لە ۲۰۱٤ یان لە ۲۰۱۵ ، کە ئەمەش نەبۆتە مێژووی دیاریکراو بۆ وەرگرتنی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا بەڵکو ئەگەرە .

جێگەی باسکردنە کە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا – ئەنگێلا میرکل – دژی ئەوەیە کە تورکیا ببێتە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا و ، هەروا فەرەنسا و چەندین وولاتی دیکە لە ئەوروپا ، بەڵام هیچ لەو وولاتانە لاریانیە پەیوەندیەکان لە گەڵ تورکیا بەردەوام بێت لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

۲۰۰۷/٤/١٦ کەناڵی تەلەفزیۆنی ڕووسیا ناسراو بە کەناڵی دووەمی ڕووسیا ، ڕاپۆرتێکی لە سەر هەڕەشەکانی ڕژێمی تورکیا بۆ سەر هەرێمی باشووری کوردستان بڵاوکردەوە لە گەڵ ڕاگەیاندنەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان . هەروا هەڕەشەکانی تورکیا و دەست تێوەردانی لە هەرێمی کوردستان ، سنوور

بەزاندنە و دەست تێوەردانە لە کاروباری ناوخۆی وولاتێکی سەربەخۆ لە ناوچەکەدا و پێشێلکردنی پرەنسیپەکانی مافی نێوو نەتەوەیی و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە .

هەروا لە ڕاپۆرتەکەدا باس لە کێشەی هەرچوار پارچەی کوردستان و ئەو ئارامیەی کە لە هەرێمی باشووری کوردستان هەیە کرد . هەروا باسی لە پەیووەندیەکانی هەرێمی کوردستان و ڕووسیا کرد ، لە پێناو پتەوکردنی ئەو پەیووەندیە بە کردنەوەی کۆنسلی ڕووسیا لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٤/١٧ گرێدانی کۆنگرەی ڕێکخراوی پەنابەرانی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ، بە ئامادە بوونی ٦٠ وولات لە شاری ژنێف سازکرد ، هەر لەو کاتە بەرێوەبەری نووسینگەی کۆمسیۆنی کاروباری پەنابەران لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست – رادهوان نووير– گووتی :–

ئێمە هەوڵ دەدەین و هیوا خوازین ئەم کۆنگرەیە چارەسەرێك بێ بۆ تەنگەژەی پەنابەرانی نێوو دەووڵەتیەکان ، بە تایبەتی پەنابەرە ئێراقیەکان سەرەڕای بوونی چەندین کێشە لە لایەن وولاتانی پەیوەندار ، بە تایبەتی ئەو وولاتانەی کە خەڵکی روویا تێکردوون بە هۆی باری ناهەموار و نا ئارامی لە وولاتەکانیان.

لەم کۆنگرەیەدا کە دوو ڕۆژ دەخایەنێ زیاتر لە ٤٥٠ کەسایەتی تیایدا بەشدار بوون ، کە نوێنەرایەتی وولات و ڕێکخراوی نێوودەووڵەتی دەکەن . کە وەزیری دەرەوەی ئێراق سەرکردایەتی شاندی ئێراق دەکات لە کۆنگرەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٢٠ لە هەڵمەتێکی دژایەتی کردن ، هێزەکانی سووپا و ئاسایشی ڕژێمی بەعس لە سووریا هەڵیانکوتایە سەر نوسینگەی مافی مرۆڤ و ماوەی بە ئەندامانی نەداوە و ڕێگەیان بە بەشداربووان نەداوە لە خۆپیشاندانەکە ڕۆڵی خۆیان بگێڕن و دوای ئەوە

نوسینگەکەیان داخستووە و ناوی ئەندامەکانیان نووسیووە و بە کارێکی قە دەخـەکراویان داناوە ، دوای ئـەوە رێکخـراوی مـافی مـرۆڤ لـە سـووریا – سواسـیە – ڕاگەیانـدنێکی بلاوکـردەوە دژی دەسـەلاتدارانی سـووریای بـەم کارە هەلساون بە دووبارە نەبوونەوە و بە ڕێزگرتن لە مافە ئازادیەکانی مـرۆڤ و داوای هەنگاونانی راست و دروستیان لە دەسـەلاتدارانی سووریا کـردووە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٢٣ کۆچـی دوایـی سـەرەك کۆمـاری ڕووسـیای فیـدرالی ، یـاخوود ڕووسـیای یـەکگرتوو – بـۆریس یەلـسن – لـە شـاری مۆسـکۆی پایتـەختی ڕووسـیا لـە تەمەنی ٧٦ سالیدا ... جێگەی ئاماژە پێکردنە کە بۆریس یەلسن ڕۆلی بالاو گرنگی هەبوو لە هەلوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەتی ، بە هاوکاری سەرۆکی یـەکێتی سـۆڤیەت میخائیـل گۆرباتـشۆف لـە وولاتەکـەدا لـە سـالی ١٩٩١ . هەروا ڕووسیای بەرەو وولاتیکی دیموکراتی و باری ئازاد هـەنگاو پێنـان لـە دوای بـوونی یەکـەم سـەرۆکی ڕووسـیا لـە سـالی ١٩٩١ بـە سـەرکەوتنی لـە هەلبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە کۆماری ڕووسیای نـاو یـەکێتی سـۆڤیەت لـە دوای ڕووخانی ڕژێمی کۆمۆنستی لە کیشووەرەکەدا .

**<u>تێبینی:–</u> لە ناوەرۆکی ئەم مێژوونامەیە باس لە چۆنیەتی هەلوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆڤیەت دەکا لە بەگی سێیەمدا .**

٢٠٠٧/٤/٢٨ نووسینگە کۆمـەلگای حکوومـەتی ڕووسیای یـەکگرتوو لـە شـاری مۆسـکۆی پایتەختی ڕووسیا ، بۆ دابینـکردن و پاراسـتن و پێشخـستنی پیـشەسازی و بەرهەمهێنانی ناوەکی ڕووسیا ، کە ئەرکی ئێستا و پێویستەکی هەنووکەیە لە وولاتەکەدا . هەروا گووتی :–

حکوومەتی ڕووسیا کۆمپانیایەکی نوێ دادەمەزرێنێت بە ناوی – کرۆم – بۆ ئەوەی بتوانێ لە بازاری نێوودەوولەتی لە بواری وەزەی ناوەکی ململانێی لە گـەلّ وولاتـانی دیکـەی جیهـان بکـات ، بۆیـە بریـاری داوە کـە لـە مـاوەی ١٢ سالی داهاتوودا ٢٦ وێستگەی ناوەکی دابمەزرێنێت .

جێگەی باسکردنە کە لە ماوەی دەسـەلاتی یـەکێتی سـۆڤیەتی جاران تـەنیا ٣٠ وێستگەی ناوەکی دامەزراوە لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٤/٢٨ لـە دوای هـەولّ و مانـدوو بـونێکی زۆر لـە نێـوان چـەندین لایـەن لەوانـە یـەکگرتووی ئیسلامی کوردسـتان گەیـشتنە ئـەوەی کـە بەرەیـەکی پتـەو پێـك


بێنن له پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانیان .



جێگـەی روونکردنەوەیــە کــە ٨ لایــەنی ئێراقــی و لەوانــەش یــەکگرتووی ئیـسلامی کوردسـتان لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، لـە شـاری قـاهیرەی پایتەختی میسر بەشداری لە کۆنگرەی دامەزراندنیان کرد ، بە نـاوی بـەرەی قـاهیرە ، کە هـەموو لایەنـەکان لـە سـەر ئـەو پرۆگرامـە مۆریـان کـرد . کە ئـەم بەرەیــە دان بــە سیــستەمێکی فیــدراڵی لــە ئێــراق دانــانێ و ناســنامەی عەرەبیەتی و ئیسلامی ئێراق دەپاێزێ .

لـەو کاتەشدا هـەردوو پـارتی سـەرەکی لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، یــەکێتی نیــشتمانی کوردســتان و پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان ، لــە بەیاننامەیـەکی هاوبەشـدا هێرشـیان کـردە سـەر ئـەو بـەرە رامیاریـەی کـە بەیاننامەکە بە بەرەیەکی گومان لێکراوی ناوزەند کرد .

هــەروا بەیاننامەکــە داوا لــە یــەکگرتووی ئیــسلامی کوردســتان و پــارتی ئیـسلامی ئێراقـی و لیستەکەی سـەرەك وەزیرانـی پێـشووی ئێـراق ئـەیاد عەلاوی دەکات ، کە شانبەشانی چەند لایەنێکی دیکەی سوونەی بەشداری ئـەو کۆبوونـەوەیان کردبـوو ، کـە لـەو بەرەیـە بکشێنەوە و بگەڕێنـەوە ڕیـزی هاوپەیمانی و هێز و لایەنە رامیاریە ئێراقیەکان لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی نێوان شانشینی سعوودیە و ئیماراتی عـەرەبی لـە شـاری ریـازی پایتـەختی سـعوودیە ، ئـەم ڕێکەوتنـەش بـە گواسـتنەوەی هاووڵاتیـانی هـەردوو ووڵات بـە ڕێگـەی ناسـنامەی کەسـی – ناسـنامەی کەسی – لـە سـەر دەربەنـدەکانی دەشـتایی و دەریـایی و ئاسمانی ، بە پێی

ڕێکەوتنەکەو ڕێنماییەکانی کە لە سەر بنەماکانی ئەو ڕێکەوتنە دەردەچێت لە نێوان هەردوو وولأتدا . کە وەزارەتی ناوخۆی هەردوو وولأت لەم کارە دا بەر پرسیارن .

جێگەی باسکردنە کە ئەم دوو وولأتەش ئەنجوومەنی هاوکاری کە نداو بە یەکەوەیان دەبەستێتەوە و بڕگەیەکە لە ئامانجەکانی ئەو ئەنجوومەنە لە هەموو بوارەکانیدا .

٢٠٠٧/٥/١ لە ووتەیەکیدا بە بۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانی لە شاری کاراکاسی پایتەختی فنزوێلا ، سەرۆکی فنزوێلا -- هۆگۆشافێز -- ڕیگەیاند بە کشانەوەی لەخەنەی دراوی نێوو دەوولەتی و بەنکی نێوو دەوولەتی ، لە دوای دانەوەی قەرزەکانی بەو دوو دەزگایە و تەنیا مانەوەی وەك بەشدار بوو لەم دوو دەزگایەدا .

هەروا سەرۆکی فنزوێلا سافێز گووتی :-

زیاتر لەوە نامانەوێ ڕوو لە ئەمەریکا بکەین بۆ یارمەتی دان و هاوکاری کردن ئەویش لە دوای سەرکەوتنی لە هەموو بوارەکاندا . هەروا سافێز بڕیاریدا بە زیادکردنی مووچەی کرێکارانی بە ڕێژەی ٢٠٪ لە مووچەکەیان . و فەرمانیدا بە وەزیری دارایی وولأتەکەی – روودریگۆ کابیزاس – بە جێ بەجێکردنی ئەم بڕیارە لە وولأتەکەدا و ڕێو ڕەسمی کشانەوەی لەخەنەی دراوی نێوو دەوولەتی و بانکی نێوو دەوولەتی . و هەروا گەڕانەوەی سامانەکان .

هەروا سەرۆکی فنزوێلا سافێز گووتی :- دەمانەوێ فەنزوێلا هەنگاو پێ بنێین بەرەو دەوولەتێکی سۆشیالیستی .

حێگەی باسکردنە کە فنزوێلا پێنچەم وولأتە لە بەرهەم هێنانی نەوت لە جیهان کە ئەمریکاش زیاتر لە ٢٠٪ ی ئەو نەوتە بۆ وولأتەکەی دەکرێ ، لە پێناو دابینکردنی پێداویستیەکانی سووتەمەنی . لە بەر ئەوەی ئەو دوو دەزگایە بارەگایان لە ئەمریکاو قەرز بە وولأتانی جیهان دەدەن ، بە تایبەتی وولأتانی تازە پێگەیشتوو و لە خشتە بردنیان لە ڕێگەی قەرزو ، قازانجێکی زۆریش بە دەست دێنێ لە وولأتانی هەژار لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٥/٢ لە لێدوانێکی تەلەفۆنیدا سەرۆکی ئەمەریکا -- جۆرج بۆش -- ڕایگەیاند

و گـووتی :- ئەنـدامانی هـەردوو ئەنجوومـەنی نوێنـەران و پـیران ، پـرۆژە یاسایەکیان ئامادە کردووە و بەم هۆیـەوە بیرووڕای سیاسـەتمەدارانمان بە سەر فەرمانی سەرکردە سەربازیەکانمان زاڵ دەکات و پێش چەند ساتێك مافی خۆم بۆ ئەو پڕۆژە یاسایە بەکارهێناوە لە وولاتەکەدا .

هەروا سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش گووتی :- مافی ڤیتـۆ بەکار دێنم لە دژی پاشەکشەکردنی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق .

جێگـەی باسـکردنە دیموکراتـەکان کـە زۆرینـە لـە هـەردوو ئەنجوومـەنی نوێنـەران و ئەنجوومـەنی پـیران پێـك دێـنن ، سـەرکەوتوو بـوون ، لــە پەسـەندکردنی پـڕۆژە یاسـای پـارە دابینکردنـی شـەڕی ئێـراق و دانـانی خشتەیەك بۆ کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق .

٢٠٠٧/٥/٣ سـەرۆکی فەرەنسا -- جاك شیراك -- خـەلاتی ئازادی ڕۆژنامەنووسـی بـە ئافرەتە ڕۆژنامەنووسـی لوبنـانی -- مـەی شـریاق - بەخشی ، کـە بـە هـۆی هەڵوێستە ڕۆژنامەییـەکانی دووچاری برینێکـی قووڵ هاتبوو ... سەرۆکی فەرەنسا ناوبراوی بە هێمای ئازادی ڕۆژنامەنووسـی ناو برد ، کە بە هـۆی ئـازادی هەڵوێـستەکانی دووچـاری هێرشـێکی تیرۆرسـتی بـووە و لــە ٢٠٠٥/٩/٢٥ دا ، کـە بـەو هۆیـەوە دەسـت و قاچێکی لـە دەسـتدا . هـەروا ڕۆژی ئـازادی خـاتوو مـەی شـدیاق لـە سـاڵی ٢٠٠٦ یـش خـەلاتی جیهـانی ئازادی ڕۆژنامەنووسی لە لایەن ڕێخراوی یونسکۆی پێ بەخشرا ... لە دوای ئـەو کارانـەش خـاتوو مـەی لـە کـارە ڕۆژنامەنووسـی و نووسـینەکانی بەردەوامە .



٢٠٠٧/٥/٣ لـە شـاری هـەولێری پایتـەختی هەرێمی باشووری کوردسـتان و لـە هـۆڵی فـەرهادی لـە زانکـۆی سـەلاحەدین ، کۆڕێـك بـۆ شوێنەوارناسـانی ڕووسـیا - ستانیلاگریگۆڤ - ڤیاگیلاڤ - لادائیڤاسکۆ - ئەنجامدرا .

ئـەم کـۆرەش بـە هەڵسەنگاندنی بـاری شـوێنەواری لـە هـەرێمی باشـووری

کوردستان بە پێی تێپەڕبوون و گواستنەوەی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان و ، رۆڵی کورد لەم قۆناخانەدا . هەروا شوێنەوارناسەکان جەخت لە سەر یەکێك لە تیۆورە مێژووییە شوێنەوایە گرنگانەیان کردەوە ، کە ئەمڕۆ لە جیهان ژمارەیەکی زۆر لە مێژوو نووسان باوەڕیان بەم بوارەدا هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە نەتەوە هیندۆ ئەوروپییەکان لە خاکی کوردستانەوە بەرەو ناوچەکانی دیکەی جیهان کۆچیان کردووە ، بەمەش کوردستان دەبێتە لانەی ئەو نەتەوە هیند و ئەوروپیانە و جێگەی سەرنجی مێژوونووسان و شوێنەوارناسان و توێژەرانی مێژوون لە سەرانسەری جیهان .

هەروا ئەم هۆکارەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە مێژووی بوونی کورد لە سەرەتاوە تاکو ئێستا و کوردستانیش دەبێتە بەشێکی گرنگی مێژوو و شارستانیەت لە جیهان . ئەم هەوڵەش بە هاوکاری لە نێوان مێژوونووسان و شوێنەوارناسانی کوردستانی لە گەڵ شوێنەوارناسان و مێژوو نووسانی جیهان ئەنجامدرا ، لە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٥/٣ کۆچی دوایی – بزنە – بەناوبانگەی باشووری سوودان ، لە دوای یەك ساڵ لە مێرد کردنی بە تۆمبی .

جێگەی روونکردنەوەیە کە چیرۆکی ئەو بزنە پەیوەندە بە داب و نەریتی دانیشتووانی باشووری سوودان ، ئەویش تۆمبی کاری سێکسی لە گەڵ ئەو بزنە ئەنجامدەدات و ... کە خاوەنەکەی بەو کارە دەزانێ و روو لە دادگا دەکات بە تۆمارکردنی داوا لە سەر تۆمبی ، کە پڕیداوەتە بزنەکەی کە ئەویش لە لای دانیشتووانی باشووری سوودان ئابڕوو بردنە .

دوای ئەوە دادگاش بڕیار دەدات کە دەبێ تۆمبی بزنەکە کە ناوی – رۆز – ە مارەبکات و ببێتە هاوسەری و ، لە ئەنجام تۆمبی ناچاردەکرێت رۆز مارە بکات بە پێشینەی ١٥ هەزار دیناری سوودان و دەچێتەوە ماڵەکەیان جووبای پایتەختی هەرێمی باشووری سوودان .

دانیشتووانی باشووری سوودان لە داب و نەریت و کەلتورێکی پارێزەرانە دەخولێتەوە ، بۆ نموونە :– هەرکەسێك پەلامار ، یاخوود کاری سێکسی لە گەڵ کچێك ، یاخوود ئافرەتێك ئەنجام بدات . ئەوا دەبێ ببێتە

هاوسەری یەکتری ، ئەویش لە پێناو پاراستنی ئابڕووی ئەو خێزانە ، یاخوود ئەو بنەماڵەیەدا .
ئەم دەنگ و باسەش لە لایەن ڕۆژنامەی – جۆبا پۆست – کە یەکەم ڕۆژنامە بوو ئەو باسەی بلاو کردەوە ، کە سەرنووسەرەکەی – تۆم ڕۆدس – گووتی :– بلاوکردنەوەی ئەم باسە بە هۆی بڕیاری دادوەران هات ، کە وەك ئابڕو بردنێك بێت بەرامبەر بە تۆمبی و کەسایەتی ڕەگەزی نێر لە هەرێمەکەدا . کە ڕۆژێش مرۆڤێکی بەریتانیەو گووتی :– هیچ ماندوو بوون و کێشەیەکمان تووش نەبووە لە بلاوکردنەوەی ئەو باسەدا لە هەرێمەکەو سوودان و جیهاندا .
سەرچاوە:– bbc. Arabic . com

٢٠٠٧/٥/٣ گرێدانی کۆنگرەی شاری شەرمشێخی میسری بە ئامادەبوونی زیاتر لە ٦٠ وولات ، کە خۆی لە دوو کۆبوونەوەی گرنگدا ، کە یەکیان لە سەر باری ئێراق و ئەویدیکەیان لە نێوان وولاتانی زلهێزی سەربازی و توانا داری ئابووری بوو ، کە ئەمەریکاو کۆمکاری عەرەبی بە شداریان تێدا کرد .
جێگەی باسکردنە کە کۆنگرەکە لە لایەن ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆتایی پێ هێنرا ، ئەویش بە یارمەتی دانی ئێراق و بە پلانی پێنجەکی یارمەتی دانی ئێراق . کۆنگرەکە بە سڕینەوەی حەوت دەوڵەت لە قەرزەکانیان لە سەر ئێراق کە نزیکەی ٢٠ بلیۆن دۆلار بوو ، کە بەشی سعوودیە بە تەنیا ١٦ بلیۆن دۆلار بوو بە سڕینەوەی قەرزەکانی لە سەر ئێراق.
ئەم قەرزانەی سەر ئێراق لە لایەن وولاتانی جیهانی و عەرەبی بە هۆی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان ئێراق و ئێران بوو لە لایەن ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، ئەویش بە کرینی چەك و تەقەمەنی بە هەموو جۆرەکانی و ، خۆراك و یارمەتیدانی پارەش بۆ ئەوەی لەو شەڕەدا سەرکەوێت ، بە تایبەتی لە لایەن وولاتانی عەرەبی وەك سعوودیە و کوێت بە ئامۆژگاری ئەمەریکا لە ناوچەکەدا.

٢٠٠٧/٥/٤ لە هەوڵەکانی بەرپرسانی ڕامیاری لە ڕاسترەوی سویسرا دەستیان کرد بە ڕێکخستنی ڕاپرسیەك ، لە پێناو ڕێگە گرتن ، یاخوود قەدەخەکردنی

بانگدان لە سەر مزگەوتی ئاینی ئیسلام لەو ولاَتەدا ، کە بانگدان هێمای ئایینی ئیسلامە و بە دەسەلاَتێکی ئایینی و ڕامیاری دەژمێردرێت ، بەلاَم لە گەلْ ئەوەشدا پارت و ڕێکخراوە ڕاسترەوەکانی سویسرا لاریان نیە لە بە ئەنجامگەیاندنی ڕێوورەسمی ئایینی بە پێی دەستووری ولاَتەکەیاندا .

جێگەی باسکردنە کە لە بەیاننامەکی بالاَترین کۆمەلْی نوێنەرانی پارت لەو ولاَتەدا ، وەك – یەکیەتی دیموکراتی ناوەندی – ڕاسترەو – و ، پارتی یەکیەتی دیموکراتی فیدرالْی – ڕاسترەوی مەسیحی – ئەویش بە ڕاگرتنی هەولْەکانی ناوەندە ئیسلامیەکان و سەپاندنی یاسا لە سەر بە یاساکردن و ڕێگە گرتن لە هەولْەکانیان . ئەو ڕاپرسیەش دەبیْ لە ۱۰۰,۰۰۰ سەد هەزار واژوو زیاتر بێت ، بۆ ئەوەی ببێتە لێکۆلْینەوەیەکی دەستووری و ، دوایی بۆ دەنگدان لە سەری ئامادە دەکرێت و ئەوەش تاکو ۲۰۰۸/۱۱/۱ دەبیْ بۆ دەنگ ئامادە بکرێت .

هەروا چەندین ئەندام پەرلەمانتاران – کریستیان وایبر – و ، ئۆلریخ سلوپر– و ، ئۆسکار فربزینگر – گووتیان قەدەخە کردنی بانگدان مانای وانیە مزگەوتیش قەدەخەبکرێت و ... هەروا بانگدان لایەنێکی ئیمپریالی هەیە ، و لە هەمان کاتیش منارەی مزگەوتەکە لایەنێکی جیهادی هەیە . ئەم سەرهەلْدانەش لەم بوارەدا ، کە ۳۱۱ هەزار ئیسلام لە سویسرا هەیە ، کە ژمارەی دانیشتووانی ۷,۵۰۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە لەو ولاَتەکەدا .

۲۰۰۷/٥/٤ — لە بریارێکی پەرلەمانی ڕووسیای یەککگرتوو ، بە گەڕاندنەوەی ئالاَی چەکووش و داس – بە ئالاَی فەرمی هێزەکانی سووپای ڕووسیای یەککگرتوو لە ولاَتەکە لە سەر بالْەخانەو دام و دەزگاکاندا .

جێگەی باسکردنە کە ئالاَی چەکووش و داس ، لە گەلْ سەرکەوتنی شۆرشی بەلشەفی لە سالْی ۱۹۱۷ ئالاَی یەکیەتی سۆڤیەت بوو تاکو هەلْوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆڤیەتی لە سالْی ۱۹۹۱ دا . دوای ئەوە سەرۆکی ڕووسیای فیدڕالْ -- بۆریس یلْسن --ئالاَیەکی دیکەی دروست کرد لە جیاتی ئالاَی چەکووش و داسەکە .

ئەم بریارەی پەرلەمانیش بەم هۆکارە بوو ، کە لە سەرکەوتنی یەکیەتی سۆڤیەت لە چەنگی دووەمی جیهان ، کە لە مانگی/٥/١٩٤٥ پەرلەمانی

ئەڵمانی – رایخستاژ – بەرزکرایەوە لەو کاتەی هێزەکانی سووپای سوور چوونە ناو ئەڵمانیا و پایتەختەکە لە شاری بەرلین ، ئەویش لە لایەن دوو سەربازی کورد – بفرۆڤ و کانتیاریا – لە ۱۹٤٥/٥/۲ دا .

۲۰۰۷/٥/٥ لە دوایی فرینی فرۆکەیەکی کامیرۆن لە فرۆکەخانەی ساحل عاج بەرەو کامیرۆن ، لە ئاکامدا کەوتە خوارەوە و بووە هۆی گیان لە دەست دانی ۱۱٥ هاووڵاتی سەرنشینی ناو فرۆکەکە .
کە ۱۰٦ هاووڵاتی هەڵگری فرۆکەکە بوون لە گەڵ گرووپی فرۆکەکە ، کە لە ۹ هاووڵاتی پێك هاتبوو لە شوفێر و چاودێر و ئەندامانی گروپەکە .
کەوتنە خوارەوەی فرۆکەکە لە شارۆچکەی – نایتی – لە باشووری شاری کریبی لە کامیرۆن ، کە دەکەوێتە سەر سنووری لە گەل وولاتی گینیای کەمەرەیی لە ناوچەکەدا . ئەم فرۆکەیەش لە جۆری – بوینگ /۷۳۷--۸۰۰ بوو ، سەر بە کۆمپانیای ئاسمانی کینیە لە وولاتەکەدا .

۲۰۰۷/٥/٦ لە سەر رووباری زێی گەورە لە شارۆچکەی خەبات ، کە سەر بە پارێزگای هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستانە ، بۆ یەکەم لەم شارۆچکەیەدا ئاهەنگی هاوسەرگیری تایەفەی سابئە مەندائی بەرێووە بچێت
جێگەی باسکردنە کە ئەم تایەفە هەڵگری بروای ئایینی یحیا زەکەریەن و ژمارەیان بەرچاوە لە ئێراق ، و بە هۆی رەوشی نا لە باری باری ناوەندو باشووری ئێراق روویان لە هەرێمی کوردستان کردووە ، لەم ئاهەنگەشدا سەرۆکی تایەفەی سابئە مەندائی – شێخ مەلۆ – کە لە شاری بەغدا رووی لەم شارۆچکەیە کرد بۆ بەشداری کردن لەو ئاهەنگە هاوسەرگیریەدا .
هەر بەم هۆکارە زیاتر لە ٦۰ خێزان روویان لە کوردستان کردووە و لە

شارۆچکە و شارەکانی نیشتەجێن . دوای ئەوە سەرۆکی تایەفەی ساوبئە شێخ مەلۆ داوای کرد کە پەرستگایەك بۆ بەڕێووەبردنی ڕێوورەسمی ئاینەکە لە کوردستان دروست بکرێت . ئەم ئاهەنگەش لە سەر دەستی پیاوەکی ئایینی بەرز بەڕێووە دەچێت .

هەڵگری بڕوای سابئە مەندائی ، ئارامیین و خۆیان بە عەرەب نازانن و بەڵکو لە ژێر زەبرو زەنگی شمشێری بە ئیسلام کردن لە کاتی فتووحاتی ئیسلامی گەمارۆی ئایینەکانی ، سابئە و مەندائیش لەم هەڵمەتە بە عەرەبکردن و بە ئیسلام کردنە بیٚ بەش نەبوونە لە ناوچەو هەرێمەکانی وولاتی نێوان دوو زێی – میزۆبۆتامیا – و شام لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٥/٦ لە بەیاننامەیەکدا کە لەلایەن ئەندامانی پەرلەمان و پارتە رامیاریەکان و کۆمەلآیەتیەکانی سووید ڕاگەیەندرا .

کە کۆنفراسێك ئەنجامدەدرێت بۆ بە جینۆساید ناساندنی ئەنفال دژی گەلی کورد لە لایەن ڕژێمی بەعسی لە ئێراق .

کۆنفراسەکەش چەند تەوەرێکی لە خۆگرت وەك – ژیانی ژنانی ئەنفال لە کوردستان – بیٚ دەنگی ئەوروپا لە سەر تاوانی ئەنفال – لە کاتی دەست پیٚ کردنی کۆنفراسەکە فلیمێکی دیکیوٚمێنتی سەبارەت بە ئەنفال نمایش کرا ، دوای ئەوە چەندین بابەت بە ناونیشانی – شالآوی ئەنفال بۆ لە ناوبردنی گەلی کورد ، تاوانێکی سەدام بوو دژی گەلی کورد لە ئێراق .

هەروا لە بەیاننامەکەدا هاتووە ، کە تاکو ئێستا ٤١ ئەندام پەرلەمان و ٣ پارتی سوویدی و ٣ سەرۆك پارت دانیان بەوە داناوە کە ئەنفال جینۆسایدە . وتاری پێنج پارتە سوویدیەکانیش لە لایەن ئەمانە پێشکەش کرا .

١-- پارتی چەپی سوویدی – باکۆب بۆهانسۆن – ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپا و پەرلەمانی سووید . ٢-- یۆهانسۆن :- ئەندام پەرلەمان لە پارتی سەنتەری سوید . ٣-- میرتۆفت :- ئەندام پەرلەمان لە پارتی ژینگەی سوید . ٤-- مالم :- ئەندام پەرلەمان لە پارتی گەلی سووید . ٥-- رید ریکسۆن :- نوێنەری سۆشیال دیموکراتی سووید .

٢٠٠٧/٥/٨ لە لێدوانێکی ووتە بێژی فەرمی ، بە ناوی هێزەکانی پاراستنی هەرێم – جەبار یاوەر – گووتی :- سەبارەت بە ئامادەکاریەکانی تورکیا بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی لە هەرێمی کوردستان ، کە تورکیا نیازی وایە ئۆپەراسیۆنیك لە ناوچەکانی باشوور و باشووری تورکیا ، کە دەکاتە باکووری کوردستان ئەنجامبدات . ئەویش لە پێناو کۆنترۆل کردنی شاخەکانی شاری شەرناخ و ناوچەکەیە ، کە لەم ماوەیەدا چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان pkk لە باکووری کوردستان چالاکیان لەو ناوچانە بەردەوامە .



ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەش ، ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی هیچ پەیوەندیەکی بە هەرێمی باشووری کوردستانەوە نیە و پێشتریش تورکیا ئەو هەڵمەتەی خۆی ڕاگەیاندووە ، کە لە ناوچەکانی شەرناخ و کێوی جوودی لە ئۆپەراسیۆنی سەربازی بۆ ڕاوەدونان و وەدەرنانی پەکەکە ئەنجامیداوە .

لەو ئۆپەراسیۆنە سەربازیانەی کە هێزەکانی سووپای تورکیا دەیانەوێ بەشداری تێدا بکات بە ٢٠,٠٠٠ بە بیست هەزار سەرباز مەزەندە دەکرێت ، لە بەر ئەوەی چەندین جاری دیکە تورکیا ئەو هەوڵانەی خستۆتە گەڕ ، بەڵام ئەم جۆرە کارە سەربازیانە سەرکەوتوو نابێت ، خۆی تووشی باری نا

لەباری زیاتر دەکات و ناتوانێت سنووری هەرێمی باشووری کوردستان ببەزێنێت ، کە ئەم لێدوانانە تەنیا هەرەشەیەکی ڕاگەیاندنەو دەیەوێ باری ناوخۆی تورکیا زیاتر ئارام بکاتەوە بەهۆی کێشە هەمەلایەنەکان لە ناو تورکیادا .

٢٠٠٧/٥/٨ گووتە بێژی فەرمی حکوومەتی ئەرمینیا – کاربتیان – لە وەزارەتی دەرەوەی ئەرمینیا رایگەیاند :– کە وولاتەکەی ڕێگەی بەو هەشت چاودێرە نەداوە . بچنە ناو خاکی ئەرمینیا لە بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردنەکانی کە لە ٥/١٢ ی ئەم ساڵ ئەنجامدەدرێت .

جێگەی باسکرنە کە حکوومەتی ئەرمینیا ماوەی بەو چاودێرە تورکانە نەدا ، کە سەر بەرێکخراوی ئاسایش و هاوکارین لە ئەورووپا بچنە ناو سنووری ئەرمینیا .

هەروا بەرێوەبەری نووسینگەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ لە رێکخراوی ناوبراودا کە بارەگای لە شاری – ڤییەنا – یە گووتی :– ڕێگە گرتن و نەدان بەم چاودێرە تورکانە کە بە شداربن لە چاودێری کردنی پڕۆسەی هەڵبژاردن ، کارێکی دیموکراسی نیە و لە گەڵ بنەماکانی شەفافیەت و بابەتیانەیە کە پێویستە ئەم بنەمایە لە هەڵبژاردنی دیموکراسی هەبێت لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٥/٩ لە ئاکامی ئوتومبێلێکی بارهەڵگری مینرێژکراو توانی لە بەردەم باڵەخانەی وەزارەتی هەرێم ، بۆ کاروباری ناوخۆی حکوومەتی هەرێمی کوردستان خۆی




بتەقێنێتەوە ، کە لە ئاکامی ئەو خۆتەقاندنەوەیدا بووە هۆی شەهید بوونی ١٤ هاولاتی و زامدار بوونی ١٢٣ هاولاتی دیکە .

جێگەی باسکردنە کە تیرۆرستان ئەمە یەکەمجاریان نیە کە لەرێگەی تەقاندنەوەی ئوتومبێل لە شارۆچکە و شارەکانی کوردستان پێی هەڵدەستن ، ئەمەش لە ڕێگەی کوردە خۆفرۆش و عەرەبە ناوخۆیی ئێراق دراوسێکانی

ئێراقه ، ئەویش لە پێناو شێواندن و لە باربردنی ئەو بارە لە بارەی کە لە هــەرێمی باشــووری کوردســتانی لکێنــدراو بەئێراقــدا هاتۆتــە کایــەوە لــە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٠ کۆچی دوایی نووسـەر و رووناکبیری ئینگلیزی -- دوردەن سمیس -- لە تەمـەنی ٦٥ سـاڵیدا لـە بـەریتانیا ... شـایانی باسـە ئـەم نووسـەرە لـە سـێ لایەنی جیاوازدا کاری کردووە ... سەرتا لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لە سـاڵی ١٩٦٠ و وویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا لـە سـاڵی ١٩٧٠ و ، ڕووسیای یەکگرتوو لە ساڵی ١٩٨٠ – ١٩٩٠ دا .

بەرلـە رووخـان و دوای رووخـانی یەکیـەتی سـۆڤیەت لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٩٤ – ١٩٩٧ زنجیرەیـەك گۆشـەی هەفتانـەی بـۆ مۆسـکۆ تـایمز نووسـی و سەرەتا لـە تەلـەفزیۆنی بەریتانیا وەك ئامادەکاری پرۆگرام کـاری کردووە و هـەر بە هـۆی ئەویـشەوە نـاوی دەرکـردوو ناسـرا ... دوای ئـەوە فلیمێکـی بەرهەم هێنا و فلیمەکە دەربارەی کۆنسێرتی -- جۆنی کاشزە -- لە سـاڵی ١٩٦٩ ، کە لە زیندانی نیشتمانی سان کبینتن بوو لە کالیفۆرنیا لە ئەمەریکا .

دوای ئـەوە لـە ئەمـەریکا گیرسـایەوە و ووتـاری رامیـاری روایکالأنـەی لـە رۆژنامـەکانی شـاری نیـۆرۆك بلأودەکـردەوە . لـە سـاڵی ١٩٧٦ پـەرتوکێکی ڕەخنـەگری بلأوکـردەوە بـەناوی -- کـێ جـۆرج جاکسـۆنی کوشـت -- لە دوای سـاڵەکانی ١٩٨٠ دوردەن سمـیس رووی کـردە ڕووسـیای سـۆڤیەت ، چیرۆکێکی نووسی بە ناوی ئەوەی کە بە ڕووسـیا سەرسـام بووە ... دوای ئـەوە گەرایـەوە بـەریتانیا و ژیـانی تـەرخان کـرد ، بـۆ بەرهـەم هێنـانی فـیلم دەربارەی ڕووسیا و لە ساڵی ٢٠٠٥ لە BBC سیدیەکی دوو دەنگی پـەخش کرد ، کە دەربارەی ئولیگارشیی رووسیا بوو ... ئەم نووسـەرە لـە کارەکانی بەردەوام بوو تاکو کۆچی دوایی کرد .

٢٠٠٧/٥/١٠ لە هەڵمەتێکی واژوو کۆکردنەوە لە پارێزگای دهۆك ، لە پێناو گرنگی دان بە زاراوەی زمانی کرمانجی ژووروو ، گرووپی – تەهروین – کە



لە چەند ڕێکخراو و سەنتەرێکی ڕۆشنبیری پێك هاتووە ، لە هەوڵەکانیان زیاتر لە ٢٠٠٠٠ بیست هەزار واژوویان کۆکردۆتەوە و ئاراستەی پەرلەمانی کوردستان و حکوومەتی هەرێمی کوردستانیان کردووە ، لە پێناو گرنگی دان بە زاراوەی کرمانجی ژووروو لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بە تایبەتی لە پارێزگای دهۆك لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٠ لە سەر کێشەی کوشتنی خاتوو – دوعا – ی کچە کوردی ئێزیدی و دوای ئەوەش هەرەشەی ئەمیری بە ناو دەووڵەتی ئیسلامی لە ئێراق ، زیاتر لە هەزار هاووڵاتی کوردی دانیشتووی شاری مووسڵ ، شارەکەیان لە ترسان جێ هێشتووە بەرەو پارێزگای دهۆك و قەزای شێخان .

هەر بەم هۆکارەش لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بە هەرەشەی ئیسلامە دواکەوتووەکان لە قوتابی و کاسبکارانی کوردی ئێزیدی ، شارەکانی هەولێرو سلێمانی و قەزاو ناحیەکانی جێ هێشتوو ، بەرەو ناوچە نشینەکانی کوردی ئێزیدی گەڕاونەتەوە کە ژمارەیان زیاتر لە ١٥٠٠ قوتابی و کاسبکار دەبوو ، ئەمەش بووە هۆکارێکی نا لە بار لە سەر پەیوەندیەکانی نێوان کوردی سووننەی ئیسلام و کوردە ئێزیدیەکان لە هەرێمی باشووری کوردستان ، هەرچەندە سەرۆکی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی هەرێم لە هەوڵەکانیان بەردەوام بوون لە ئارامکردنەوەی ئەو کێشە لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٠ لە هەولێکی وەزارەتی پێشمەرگەی حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان و بەشداری کردنی لە سەقامگیری پرۆسەی ئازادی لە ناوەندو باشووری ئێراق بێت . بڕیاریدا ١٠٠٠ هەزار پێشمەرگە ، کە لە دوو لیوا پێك هاتبوو لە خاڵەکانی سنووری و خاڵەکانی پشکنین کارەکانیان ئەنجام

بدەن .

ئـەم هەوڵـەش لـە پێنـاو ڕێگـە گـرتن لـە تیرۆرسـتانی کۆمـەڵی ئەنـسار و ئیسلام بگرن . سەرەڕای ئەوەش کە کورد لایەنێکی بنەڕەتی و سەرەکی بوو لە بەرەو باشبردنی باری ئێراق لە هـەموو بوارەکـان ، بە تایبـەتی لـە بـواری ئاسایش و ئارامی ئاوەدانکردنەوە ، بەلاّم لایەنە عەرەبەکان دژی ئەوەن ، کە کورد ڕۆڵی بالاّی هەبێ بە چاو پێ هەڵنەهاتنیان بە کورد لە ئێراق .

٢٠٠٧/٥/١٥ لـەم ڕۆژەدا حکوومـەتی ئێـراق بڕیـاری دا ، کـە ڕۆژی ٥/١٦ ی هـەموو سـاڵێك یادکردنەوەی گۆڕە بە کۆمەڵەکان بێت لە ئێراقدا .

جێگـەی باسـکردنە کـە لـە ٢٠٠٣/٥/١٦ و لـە دوای ڕووخانـدنی ڕژێمـی بەعس لە ئێراق ، گەورەترین گۆڕی بە کۆمـەڵ دۆزرایـەوە . کە لـە لایـەن ئـەو ڕژێمە لە ڕێگەی کوشتن و گوللە بارانکردن و زیندەبەچاڵ بە کۆمەڵ لـە ژێـر خاك نراون ، بە تایبەتی لە باشوور و باکووری ئێراق .

واتە بە لە ناو بردنی کورد و عـەرەبی مەزهـەبی شـیعەی ئیسلام لـە ئێـراق بە تایبەتی گەلی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کە بێ وێنە بوو لـە جیهان ، بە ئەنجامدانی لەلایەن ڕژێمی بەعس لە ئێراق ، بە سـەرکردایەتی سـەدام حوسـێن و داروودەسـتەکەی جـا بـە هـەر جۆرێـك و شـێوازێك بۆیـان گونجابێت لە وولاّتەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٦ گیـان لـە دەسـت دانـی بـە دەیـا کـەس و زامـدار بـوونی بـە دەیـا کەسـی دیکـە لـە نێـوان هێـزە چـەکدارەکانی ڕێکخـراوی حەماسـی ئیـسلام و چـەکدارەکانی



جووڵانـەوەی فتح لـە کـەرتی غـەززەی فەلەسـتین ، بـە هـۆی بـەردەوام بـوونی کێـشە چارەسـەر نـەکراوەکانی نێوانیـان لـە شـارەکەداو لـە فەلەسـتین بـە شـێوەیەکی گـشتی ، ئەمـەو جگـە لـە بـوونی کێـشەی بـەردەوام لـە نێـوان دەسەلاّتی فەلەستینی و دەسەلاّتی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا .

ئەم شەڕو پێکدادانەش لە دوای هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی حەماس هات لە فەلەستین ، بە هۆی هەڵوێستە توند ڕەوەکانی لە دەسەڵات و دژی سەرۆکایەتی فەلەستین و ، لە لایەکی دیکەش دژی دەوڵەتی ئیسرائیل و ، پێشێل کردنی یاسا نێودەوڵەتیەکان و ڕێکەوتنە مۆرکراوەکانی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٦ شاری ماری شوێنەوار لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا ئامادەیە بۆ چوونە ناو لیستی شوێنەواری جیهانی لەم ساڵەدا . ئەویش لە دوای چوونە ناو ئەو لیستە هەردوو شوێنەواری – حەسین و سەلاحەدینی ئەیوبی – لە ساڵی ٢٠٠٧ دا .

جێگەی باسکردنە کە لە ڕاگەیاندنێکی بەڕێوەبەری شوێنەوارو شارستانیەتی جیهانی لە ڕێکخراوی یونسکۆی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان – ڤالیری باندریم – کە ڕێکخراوەکە هەوڵ دەدات شاری ماری شوێنەوار ، کە دەکەوێتە پارێزگای دێرەزۆر بکەوێتە ناو لیستی شوێنەواری جیهان لەو ساڵەدا .

هەروا ناوچەی ماری شوێنەوار ناودەنگێکی بەرچاوی جیهانی هەیە ، کە دەکەوێتە ڕۆخی ڕاستی زێی فورات لە نزیک شارۆچکەی – ئەلبووکەمال – کە گردەکە ناوزەندە بە گردی – حەریری – کە لە سەر ڕووبەری ١٠٠٠ مەتر درێژی و پانی ٦٠٠ مەتر لە دەڤەرەکەدا .

هەروا دووپاتی ئەوە دەکرێتەوە لە سەرچاوە مێژوویەکانی ، کە شانشینە کۆنەکان دەسەڵاتدار بوونە لە سەر ماری لە هەزارەی سێیەمی بەر لە مێژووی زایینی ، کە ژمارەیان ١٣ شا بووە ، کە ناوزەند بوونە بە ڕەچەلەکی دەیەم لە سەر شاکانی ماری ، کە ئەو شایانە پەیوەندیان هەبووە لە گەڵ شانشینەکانی سۆمەری لە وڵاتی نێوان دوو زێی – میزۆپۆتامیا – ی کۆن و ئێراقی ئێستا .

لە گەڵ ئەوەشدا لە کاتی دەرکەوتنی دەسەڵاتی ئەکەدیەکان لە سەردەمی دامەزرێنەرەکەی – سارکۆن – ماری هەر وەك خۆی مایەوە و پارێزگاری لە خۆکردووە بە دەڤەری دوای خۆی ، ئەویش ڕەچەڵەکەکانی ئەکەدی . لە دوای گەران و پشکنین لە هۆڵەکانی کۆشکی شوێنەواری ماری ، بە دەیا

پەیکەرو بەردی گەورە و وێنەی دیواری ڕەنگاوڕەنگ ، کە پەیوەند بوون لەو کات بە دیواری ئایینی و رامیاری ، کە وێنەکان بێ وێنەن لە ڕەنگەکان بەر لە ٤٠٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا .

هەروا لە کتێبخانەی کۆشکی ماری ئەرشێفی ماری دۆزراوەتەوە ، کە زیاتر لە ٢٠ بیست هەزار تابلۆی بزماری لەخۆ دەگرت ، کە لە نامەی ئایینی و نامە گۆرینەوە و گرێبەست و نامەی دبلۆماسی پێك هاتبوو بە گۆرینەوەی لە نێوان دەسەلاتی ماری و ئەو وویلایەتانەی کە سەر بە دەسەلاتی ماری بوون ، وەك – عەشارە ، ترکی ، وتیتۆل – هەروا شاکانی دیکەی وەك – سیدا و سەری شمرا و ئوگاریت و دەسەلاتی – یماحاز ، لە حەلەب ، و کرکمیش ، ژرابلس . لە ناوچەکەدا .

لێرەدا ئەو دەقەرە بەشێکە لە خاکی کوردستان و هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی دیکەی وەك عەرەب و تورك بوونیان نەك هەر لەو ناوچەیە نەبووە ، بەڵکو باسیان لە بوونی ئەو دوو نەتەوە نەکراوە نەك هەر لە ناوچەکە بەڵکو لە بیابانی دوورگەی عەرەبی و بیابانی مەنگۆلیای نێوان رووسیا و چینی مللی ئێستا لە جیهان . بەلام کورد ....! ....؟ .

سەرچاوە:- www.daralhayt .com.

٢٠٠٧/٥/١٧ لە هەردوو لایەنی وولاتی کۆریای باکوور و ، کۆریای باشوور هێلی ئاسنی شەمەندەفەرەکانیان دەستی بە کارەکانی خۆی کرد بە پەڕینەوەی هەر یەك لە شەمەندەفەری کۆریای باکوور و باشوور لە سنووری ئەو یدیکە و دەست کردنیان بە گواستنەوەی هەڵگری باڵ و مرۆڤ و پێداویستیەکانی هەردوو وولات لە کیشووەرەکەدا ، کە بە نیمچە دوورگەی کۆریا ناوزەندە .

جێگەی باسکردنە کە ئەمە بۆ یەکەم جارە لە دوای جەنگی نێوان هەردوو کۆریا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٠ – ١٩٥٣ ، ئەمەش بە ڕووداوێکی مێژوویی هەژمار دەکرێت لە نێوان هەردوو کۆریا لە کیشووەرەکەدا . ئەم دوو شەمەندەفەرەش ، کە یەکیان لە وێستگەی مۆنسان لە کۆریای باشوور لە پەرینەوەی هێلی جیا کەرەوەی هەردوو کۆریا ، ئەم هەوڵەش بۆ تاقی کردنەوە بوو ، کە یەکەم جارە و تەنیا هاوولاتیانی هەردوو کۆریایان هەڵگرتبوو ، یەکیان بۆ وولاتی ئەوی دیکە . ئەم رووداوەش لە ئاهەنگێکی

فراوان لە هەردوو کۆریا ئەنجام درا لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٥/١٧ لە کۆتایی کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی لە شاری ئیسلام ئابادی پایتەختی پاکستان ، ئەویش بە گفتووگۆ کردن لە سەر باری رامیاری و ئابووری و سەربازی و کۆمەڵایەتی و پەیوەنیەکانی نێوان وولاتانی ئیسلامی لە گەڵ وولاتانی دیکەی جیهان .

جێگەی باسکردنە کە ئەم کۆبوونەوەیە لە سەر کێشەی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین و ئێراق و ئەفگانستان و پاکستان و سوودان و ، چەندین جێگەی دیکە باسکران و چەندین بیروو بۆچوون و پێشنیار دەرخران ، ئەویش لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەکان بە پێی گۆڕانکاریەکانی سەردەم لە هەرێم و ناوچە وجیهان . لەم کۆبوونەوەش وەزیری دەرەوەی ئێراق ئامادەی بوو لە هەموو لایەنەکانی کۆبوونەوەکە و گفتووگۆ کردن لە سەری .

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە کە ئەو ٥٠ دەووڵەتە ئیسلامیە ڕوویا وەرنەگێڕا بۆ کێشەی کورد و چارەسەر کردنی ، چ بە پێی ئەو ئایەتەی کە لە قورئاندا هاتووە – ان خلقنا قبائل و شعوباً لتتعارف – یاخوود بە پێی مافەکانی مرۆڤ و یاساکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ناوچەکەدا ...!...؟.

٢٠٠٧/٥/١٧ لە کاتی پێشوازی لێکردن لە بالیۆزی ئێران لە ئێراق – حەسەن کازمی قومی – لەلایەن وەزیری نەوتی ئێراقی – حوسێن شەهرستانی – ڕێکەوتنێکی ئابووریان مۆرکرد ، بە دامەزراندنی لولەنەوتی ، واتە بۆری گواستنەوەی نەوت لە ئێراق بۆ ئێران ، بە ڕێژەی ٢٠٠ دووسەد هەزار بەرمیل نەوت لە باشووری ئێراق بۆ ناو خاکی ئێران ، ئەویش بۆ پاڵاوتنی ئەو نەوتەو کردنی بە بەنزین و نەوتی سپی و پێداویستیەکانی دیکە لە بەرهەمی نەوت لە پاراوگەی ئەبادانی ئێرانی ، کە ئەمەش هۆکارێکی باشە بۆ کەمکردنەوەی پێداویستیەکانی ئێراق لەم بوارەدا .

٢٠٠٧/٥/١٧ لە دوای تاوانبارکردنی سەرۆکی بـانکی نێـوو دەوڵـەتی – بـۆك وولفۆیتز – بە کارێکی گەندەڵی ، کە مووچەی هاوڕێیەکی خۆی لـەم بانکـەدا پـێ بەخـشیووە و ئەمــەش بــە پێــی ڕێنمــایی و یاساکانی بانکی نێوو دەوولەتی بـەکاری گەنـدەڵی دادەنرێـت لـە کارگێری بانکەکەدا .



هەر بەم هۆکارە سەرۆکی بانکی نێوو دەووڵەتی بۆل لە ڕاگەیاندنێکیدا گووتی :– من لە ٦/٣٠ ئەم دەستکاری پۆستی سەرۆکایەتی بانکی نێوو دەووڵەتی دەکێشمەوە ، سەرەڕای دڵگرانی ئەمەریکا لەم هەڵوێستەی بۆل و لە هەمان کات وولاتانی ئەوروپا کارەکەی بۆلیان بە کارێکی گەندەڵی لەقەڵەمدا .

٢٠٠٧/٥/١٨ بۆ یەکەم جار خاتوو – ڕەشیە داتی – لە ڕەچەلەك مەغربی پۆستی وەزارەتێك لە وەزارەتەکانی فەرەنسا بگرێتە دەست لە وولاتەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە خاتوو ڕەشیدە داتی لە ١٩٦٥/١١/٢٧لە ناوچەی– سان ریمی – لە باوکێکی مەغربی و دایکێکی جەزائیری چاوی بە جیهان هەڵێناوە لە فەرەنسا ، کە خاتوو داتی دووەم منداڵە لە نێوان ١٢ برا و خوشکێك لەو خێزانە هەژارەدا .

لەو کاتەی کە خاتوو داتی لە دایك دەبێ لە خێزانێکی خوێندەوار و هەژار ، ئەمەش وای کرد کە لە بواری پەرستیاری کاربکات ، لە پێناو باش کردنی بـژێوی ژیـانی خێزانەکـەی و خـەرجی تایبـەتی خـۆی بـۆ تـەواو کردنـی قۆناخەکانی خوێندن . دوای ئەوەی کە کاتی بۆ دەرەخسێ دەچێتە زانکۆ و لە بەشی ماف دەست بە خوێندنی یاساو هەژمار دەکات .

دوای ئەوە بە هۆی توانای ئەم خاتوونە ، بە فەرمانبەر لە کۆمپانیای نـەوتی فەرەنـسی – ئێلـف – دادەمـەزرێت ، لـە هـەمان کـات لـە خوێنـدنی ماستەر بەردەوام دەبێت ، دوای ئەوە لە ساڵەکانی ١٩٩٢ – ١٩٩٣ لە بەشی

وردبین لە بانکی ئەوروپی بۆ ئاوەدان کردنەوە و گەشە پێدان لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا کاردەکات ، هەروا دوای تەواو کردنی خوێندن لە یاسا ، دەستی کرد بەکاری پارێزەری و هەر لەوکاتەی وەزیری ناوخۆی فەرەنسا ، نیکۆلا سارکۆزی داوای دەکات و لە ساڵی ٢٠٠٢ بە بەرپرسی تاوانەکان دایدەمەزرێنێت .

دوای ئەوە لە ساڵی ٢٠٠٦ ڕۆڵی باڵای دەبێ لە پێناو چارەسەر کردنی کێشەی نێوان سارکۆزی و سەرۆکی فەرەنسا و وەزیری دەرەوەی فەرەنسا .

دوای ئەوە لە مانگی/ ٢٠٠٦/١ پەیوەندی بە پارتی یەکیەتی لە پێناو جوولانەوەی مللی بە سەرکردایەتی سارکۆزی دەکات . دوای ئەوەش نیکۆلا سارکۆزی لە ٢٠٠٧/١/١٤ بە ووتە بێژی فەرمی دایدەمەزرێنێت لە پروپاگەندەی هەڵبژاردنەکان لە فەرەنسا . خاتوو داتی بە هۆی توانای رۆشنبیری و ئازایەتی ناوزەندێکی باش لە ناوەندەکانی گەلی فەرەنسا بەدەست دێنێ و دبێتە کەسایەتیەکی لێهاتوو لە فەرەنسادا .

٢٠٠٧/٥/١٨ لە ووتەیەکیدا سەرۆکی فنزوێلا – هۆگۆ سافێز – داوای لە پاپای ڤاتیکان – بندیکتی – کرد کە داوای لێبوردن لە گەلانی بنچەیی ئەمەریکا بکات ، بە هۆی لێدوانەکانی پاپا لە بەرازیل ، کە گوتوو بووی کەنیسەی کاسۆلیکی ئایینی مەسیحی بەسەر گەلانی بنچەیی ئەمەریکای لاتینی دا ناسەپێنێ و رێژەی هەڵگری بڕوای مەزهەبی کاسۆلیك لە ئایینی مەسیحی لە ساڵی ٢٠٠٠ کەم بۆتەوە و بۆتە ٧٤٪ کەچی لە ساڵی ١٩٨٠ لە ٨٩٪ هەڵگری بڕوای مەزهەبی کاسۆلیك بوون لە بەرازیل .

٢٠٠٧/٥/١٨ لە دوای سەرکەوتنی پاڵێوراوی سەرۆکایەتی فەرەنسا –– نیکۆلا سارکۆزی –– بە سەرۆکی فەرەنسا ، ئەمرۆ توانی ناوی حکوومەتەکەی ئاشکرا بکات ، کە لە ١٥ وەزیر پێك هاتووە لە جیاتی ٣٠ وەزیر ، کە بەر لە دەسەڵاتی ئەو حکوومەتی سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك دایمەزراندبوون لە وڵاتەکەیدا .

ئەویش بە دامەزراندنی– فرانسوو ڤیون – بە سەرەك وەزیران و هەروا – برناد کۆشنەر – بە وەزیری دەرەوەی فەرەنسا . کە زۆربەی حکوومەتەکەی لە وەزارەتەکانی ئافرەتن لە فەرەنسا و چەندین وەزیرەکانی سەردەمی جاك شیراك پۆستی وەزارەتیان پێ سپێردرا لە فەرەنسا .

٢٠٠٧/٥/١٨ لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی جەزائیر ، بەرەی ڕزگاری نیشتمانی ، و پارتە گەورەکە ، کە ناوی بە پارتە هاوپەیمانیەکەی سەرۆکایەتییە لە جەزائیر ، پێشکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا ، ئەم ئەنجامەش لە لایەن وەزیری ناوخۆی جەزائیر – یەزید زرهونی – ڕاگەیاندرا .

جێگەی باسکردنە کە سێ پارت لایەنگری سەرۆکی جەزائیر عەبدولعەزیز بووتەفلیقەیان کرد ، بەڵام کورسیەکانی دیکە بەر پارتەکان کەوتن وەك :-

١-- بەرەی ڕزگاری نیشتمانی جەزائیر / FLIV توانی ١٣٦ کورسی لە کۆی کورسیەکانی پەرلەمانی بەدەست بێنی لە هەڵبژاردنەکان ... ٢-- هەروا پارتی دووەم کە لە ناو هاوپەیمانیە لە کۆمەڵی نیشتمانی دیموکراتی RND توانی ٦١ کورسی بەدەست بێنێ لە هەڵبژاردنەکان ... ٣-- هەروا جووڵانەوەی کۆمەڵگای ئاشتی –خمس – توانی ٥٢ کورسی لە هەڵبژاردنەکان بە دەست بێنێ لە وولاتەکەدا .

جەزائیر ژمارەی دانیشتوانی ١٨,٧٠٠ ملیۆن کەسە ، کە توانای دەنگدانیان هەیە و لە هەمان کات پسوولەی دەنگدانی بە ڕێژەی ١٠٪ زیادی کردووە بۆ پارتە بچووکەکان .

٤-- هەروا پاڵێوراوە بێ لایەنەکان لە جەزائیر توانیان ٣٣ کورسی بەدەست بێنن لە هەڵبژاردنەکان ... ٥-- هەروا پارتی کرێکاران لە جەزائر توانی ٢٦ کورسی بە دەست بێنێ لە هەڵبژاردنەکاندا .

٢٠٠٧/٥/١٨ گرێدانی کۆبوونەوەی مونتەدای ئابووری جیهانی لە سەر کەناری دەریای مردوو لە وولاتی ئوردن بە ئامادە بوونی ١٥٠٠ کەسایەتی رامیاری و ئابووری لە ٥٥ وولات لە جیهان .

جێگەی باسکردنە کە ئەو مونتەدایە لە ساڵی ١٩٧٣ وەك ڕێکخراوەیەك کۆبوونەوەکانی خۆی ساڵانە و ، هەرساڵێك لە وولاتێك ئەنجام دەدات . ئەویش لە پێناو بەرەو باشبردنی باری پەیوەندی و ئابووری و کەمکردنەوەی کێشەکانی و نەهێشتنی برسیەتی و ، کەش و هەواو ، ڕێگەگرتن لە شەڕو کێشەو یارمەتی دانی وولاتانی هەژارو ، قەرزو بازرگانی و پەیوەندیەکانی دیکەی هەمەلایەن لە نێوو وولاتانی جیهاندا .

ئەم کەبوونەوەیەش لە بارەی ئاشتی و سەقامگیری ئارامی و داواکانی

شـەڕو کاریگـەری لـە سـەر بـاری ئـابووری و بووژاندنـەوەی لـە رۆژهـەلأتی ناوەڕاست ، هـەروا دانیشتنە لابەلاکانی ئەو کۆبوونەوەیە لـە سـەر کێشەو ئـاوو کەرتـەکانی دابـین و وزە و فێرکـردن و تـەکنۆلۆژیاو زانیاریـەکان ، سەرەڕای بوونی پارت و گروپ و رێکخراوی ئیسلامی لە ناوچەی عەرەبیدا ، لە گەل چەندین بابەتی دیکە .

هـەروا لـە ناوەنـدەکانی ئـەم کۆبوونەوەیـە ، کۆمـەڵی gll بـۆ رۆژی دوایـی کۆبوونـەوەی خـۆی گرێـدا ، کـە دووەم کۆبوونـەوەی ئەنجامـدراو لـە دوای سـاڵی /٢٠٠٥ لـە سـەر بـارودۆخی پەیوەندیـەکان لـە هـەموو بوارەکانـدا لـە جیهان .

٢٠٠٧/٥/١٩ لە دوای چەندین پەیوەندی و گفتووگۆی سەرکەوتوانە لە نێوان حکوومـەتی هـەرێمی کوردستان ، لە باشووری کوردستان و بەریتانیا ، تا ئەو کاتـەی توانرا کونسلخانەی بـەریتانیا لـە شـاری هـەولێری پایتـەخت بکرێتـەوە بـە دامەزرانـدنی خـاتوو –ئەلیسن – بە کونسلی گشتی بـەریتانیا لـە هـەرێمی کوردستان .

دوای ئەوە لە ئاهەنگێکی قەشەنگ بە ئامادە بوونی بەرپرسـانی پەیوەنـدار لـە حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و سـکرتێری یەکـەمی باڵیۆزخانـەی بـەریتانیا لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـراق – تـۆم میـل – و چـەندین بەرپرسـی دیکـەی حکـوومی و پـارتی لـە هەرێمەکـەدا ، بەشـداریان لـە کردنەوەی کونسلخانەکە کرد لە شاری هەولێر لە هەرێمەکەودا .

٢٠٠٧/٥/١٩ گروپێك لە توێـژەرانی خەزنـەی دەریـایی ، واتـە لـە قووڵایی دەریـا ، توانیـان نیـوو ملیـۆن پارچـە دراوی زێـڕ و زیـوو بدۆزنـەوە ، کـە لـەو کەشـتیە نگرۆبووەکانی لە زەریای ئەتڵەسی تووشی بووە .

جێگەی باسکردنە کە کۆمپانیای – ئۆدیس – بارەگاکەی لە بەریتانیایە لە ساڵی ١٨٦٥ باڵێکی لە دراوی زێرو زیوو بە ژمارەی ٢٠ هـەزار پارچـەی هـەڵگرتبوو ، دوای چـەند رۆژێـك پەیوەنـدی ئـەو کەشـتیە لـە گـەڵ لایەنـە پەیوەنـدارەکانی پـچڕا ، کـە قـووڵایی زەریـا لـە جیهـان زیـاتر لـە ٣ ملیـۆن کەشتی تیا نگرۆبووە .

هـەروا ئـەو خەزنەیـە بـە ٥٠٠ ملیـۆن دۆلار مەزەنـدە دەکرێـت ، کـە ئەوکاتـە

بووه ، كه ئەمەریكا ژێر دەستەی بەریتانیا بووه له كیشووەرەكەدا .

٢٠٠٧/٥/١٩ لــه هەولــه بەردەوامــەكانی تیرۆرسـتانی ئیـسلام و دژ بـه كـورد و خـاكی كوردستان ، كۆمەڵه چەكدارێك لەو شـەوەدا هەڵسان بە گەمارۆدانی گوندی كورد نشینی – حەمید شفی – له نزیك شارۆچكەی مەندەلی سەر سنووری نێوان ئێراق و ئێران .

دوای ئـەوه بـه نـاوی پاراسـتی ئاسایش لـه ناوچەكەدا و دەركردنـی ژن و منداڵ و پیاو لێك جیاكردنەوەیان ، دوای ئەوه ١٥ هاوڵاتی كورد گولله باران دەكەن ، لەوانه ١٣ هاوولاتی هەر ئەو كات گیان لـه دەسـت دەدەن و ، دوایـی دوو هاوولاتی دیكەش گیان له دەست دەدەن ، به هۆی زامدار بوونەكەیان له گوندەكەدا له هەرێمی باشووری كوردستان .

٢٠٠٧/٥/٢١ له ڕاگەیاندنێكی نوێنەری ڕێكخراوی نەتەوه یەكگرتووەكان بۆ پەنابەران له شـاری كـابوولی پایتـەختی ئەفگانستان گـووتی :– ڕژێمـی ئێرانـی ئیـسلامی زیاتر له ٧٠,٠٠٠ حەفتا هەزار پەنابەری ئەفگانی له وولاتەكەی دەركردووه

.

جێـی ئامـاژه پێكردنـه كـه بـه هـۆی شـەڕی نـاوخۆی ئەفگانستان لـه دوای داگـیر كردنـی لەلایـەن هێزەكـانی سـووپای سـووری سـۆڤیەت و ، دروسـت بوونی پارت و ڕێكخراو و گرووپی ئیسلامی ، به تایبـەتی لـه لایـەن تاڵیبان و ئوسـامەبن لادن و شـەڕكردن دژی سـۆڤیەت ، تـا دوای سـاڵەكانی ١٩٨٩ بـه دەرچـوونی هێزەكـانی سـووپای سـوور لـەم وولاتـەدا و نـەمانی دەسـەڵاتی كۆمۆنـستی و بـەرپا بـوونی شـەڕی نێـوان پێكهاتـه ئیـسلامیەكان لـه ئەفگانستان .

له هەموو بوارەكان و شلەژانی ژێرخانی ئابووری و لێك ترازاندنی پەیوەندیه كۆمەڵایەتیـەكان ، كـه ئەمــەش بـووه هـۆی هــەڵاتن و دەربـەدەر بـوونی دانیــشتووانی هاوولاتیــانی بێلایــەن و هــەژار بــۆ وولاتــانی دیكــەی دراوسێكانی ئەفگانستان ، وەك پاكستان و ئێران ، ئـەویش لـه دوای لێدانی ئەفگانستان له ساڵی ٢٠٠٢ له لایەن ئەمەریكا و وولاتانی هاوپەیمان .

ئـەم هۆكارانـەش بـووه هـۆی ئـەوەی كـه پەنابـەره ئەفگایـەكان لـه لایـەن حكوومەتی ئێران دەربكرێن و ، به گەڕانەوەیان بۆ وولاتەكەی خۆیان ، كه له

ماوەی ٢١/٤/-- ٢٠٠٧/٥/٨ زیاترلە ٥٢,٠٠٠ پەنجا و دوو هەزار ئەفگانی ڕەوانە بکرێنەوە و دوور کەوتنەوە لە ناو سنووری ئێران . ئەمەو سەرەڕای یارمەتیدانیان لە لایەن ڕێکخراوی بەرنامەی خۆراکی جیهانی لە سەر نەتەوە یەکگرتووەکان ، بەلاّم ئەم هەولاّنە چارەسەری کێشەکان ناکات لە وولاّتەکەدا .

٢٠٠٧/٥/٢١ لە داوایەکی دەسەلاّتدارانی ناوەندی لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ئەویش بە دواخستنی ماددەی /١٤٠ بۆ سێ ساڵی دیکە دوابخرێت .



جێگەی باسکردنە کە حکوومەتی ئێراق لە ڕێگەی هەوڵەکانی سەرەك وەزیرانی ئێراق نووری مالکی ، داوای لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە باشووری کوردستان کردووە ، کە جێ بەجێکردنی ماددەی /١٤٠ بۆ سێ ساڵ دوابخرێت ، بەلاّم حکوومەتی هەرێمی کوردستان ، ئەو داوایە و ئەو بیروو بۆ چوونانەی ڕەتکردەوە و داوای جێ بەجێکردنی بە پێی دەستوور کردووە لە سەر ئەو ناوچانەی کە لە سنووری هەرێمی کوردستان و پارێزگای کەرکوك و ناوچەکانی دیکە لە کوردستان دابڕاون ، لە لایەن ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، بە سەرکردایەتی سەدام حوسێن و دارو دەستەکەی لە وولاّتەکەدا .

ئەم زانیاریەش لە ئەنجامی کۆڕێکی جەماوەری لە شاری دهۆك لە هۆڵی جەزیری لە لایەن ئەندامی بیرۆی رامیاری یەکیەتی نیشتمانی مەلا بەختیار ئاشکرا کراوە .

لە لایەکی دیکە حکوومەتی ئێراقی ناوەندی زۆرینەی هەردوو مەزهەبی شیعە و سوننەی ئیسلامی عەرەب هەوڵەکانیان ، لە پێناو جێ بەجێنەکردنی ئەو ماددەیە بەردەوامە و بە سەدا بیان و و تەگەرە دروست دەکەن . ئامانجیش لەمە بەهێز کردنی جێ پێگەی خۆیان و دوایی وەستان

دژی داخوازیەکانی کورد لە ئێراق ، بەڵام ...!...؟ ئەی کورد ...!.



٢٠٠٧/٥/٢١ لە ڕاگەیاندنێکی وەزیری بەرگری پۆڵەنـــــدا – ئەلکـــــسەندەر شتـــــشیگیلۆ – گــــووتی :- سیـستەمی قـەلغانی مووشـەکی وویلایەتـــــە یـــــەکگرتووەکانی ئەمـــــەریکا لـــــە ســـــاڵی ٢٠١٠ کارەکـانی لـە وولاتـی پۆڵەنـدا تەواو دەبێت .

جێگـــــەی باســـــکردنە کــــە ئەمەریکا بە هاوکاری پەیمانی ناتۆ لە هەوڵێکی چڕ دایە بۆ ئەوەی بنکەی قەلغانی مووشەکی لە هۆڵەندا دابمەزرێنێت لە گەڵ کۆماری تشیك ، ئەویش بە مەبەستی دەستەبەر کردنی دڵنیایی لە پێناو چاودێری کردنی بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا ، کە لە دوایاندا مەترسی لە هەرەشەکانی ئێران .

هـەروا لـە لایـەکی دیکـە ئـەم کـارە و هەڵوێـستە بۆتـە کێـشەیەکی دژوار لـە نێـوان ڕووسـیای یـەکگرتوو و ئەمـەریکا و وولاتـانی دیکـەی هاوپـەیمانی ئەمـەریکا لـە پـەیمانی نـاتۆ ، هـەروا وەزیـری دەرەوەی ڕووسـیا – سـێرگی لافرۆڤ – لـە ڕاگەیاندنێکیدا گـووتی :- ئـەمـەریکا لـە ڕێگـەی ئـەو سیـستەمە گـەمارۆی ڕووسـیا دەدات و ڕووسـیاش ئەمـەی پـێ قبـوول ناکرێـت لـە ناوچەکەدا ، بە تایەتی لە کیشووەری ئەورووپای ڕۆژئاوا لە جیهادا .



٢٠٠٧/٥/٢٢ لـە ڕاگەیانـدنێکی ووتـە بێـژی حکوومـــــەتی تورکیـــــا ، کــــە ژەنـــەڕاڵی خانەنـــشین کـــراو – ئـــەدیب یەشـــار – ڕێکخـــەری وولاتەکــــەی بــــۆ کــــاروباری دۆســـیەی پەکەکــە لــە ســـەر پۆسـتەکەی لادرا ، بـە هـۆی ئـەنجام نـەدانی کارەکـانی لـە چارەسـەرکردنی

کێشەی پارتی کرێکارانی کوردستان p.k.k لە باکووری کوردستان .

جێگەی باسکردنە کە دوای لادانی یەشار لە سەر پۆستەکەی – رەفئەت ئوگونا – ی لەو پۆستە دامەزراند ، بۆ هاوکاریکردن لە گەڵ – جۆزێف راستن – رێکخەری واشنتن لە سەر چارەسەری دۆسیەی پەکەکە لە تورکیا و دراوسێکانی ، بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٥/٢٢ سیاسەتمەداری دکتۆر -- مەحمود عوسمان -- لە لێدوانێکیدا ڕایگەیاند ، کە ئەو گفتووگۆیانەی کە لە نێوان سەرەك وەزیرانی ئێراق و سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دا ، لە مەڕ یاسای نەوت و گاز و لە گەڵ ئەمەشدا وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، بۆ بڕیاردانی ئەم یاسایە گوشاری خستۆتە سەر هەموو لایەنەکان لە ئێراقدا .



جێگەی باسکردنە کە ئەمەریکا خۆی خاوەن ماڵە و دوا بڕیاریش لە دەست ئەمەریکایە ، بە پێی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان ، بە پێی بەندی /٧ لەو بڕیارەدا لە دوای داگیر کردنی ئێراق . هەروا لەو کاتە سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و سەرەك وەزیرانی ئێراق ، لە سەر یاسای نەوت و غاز و گفتووگۆکردنیان پێشوازیان لە دوو شاندی ئەمەریکا و بەریتانیا کرد .

هەروا لە بارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لە سەر داهات و چاودێری کردنی و چوار لە پاشکۆکانی یاسای نەوت ، کە دەسەڵاتی کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی و بابەتی هەڵکەندنی بیرە نەوتی تازە ، گرنگترین ئەو خاڵانەیە کە هەردوو لایەن یاسای نەوت و غاز گفتووگۆی لە سەر دەکەن .

لێرەدا ئەو کێشانەی نێوان حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان و حکوومەتی ناوەندی ئێراق ، بەردەوامە و نەگەیشتوونەتە هیچ ڕێکەوتنێك بۆ ئەوەی ئەو یاسایە مۆر بکرێت ، لە نێوان هەردوو لایەن پەیوەندار ، تاکو تەواو کردنی ئەم مێژوو نامەیەدا لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٥/٢٣ لـه هەوڵـه سـەربازیەكانی و فرەوانكردنـــــی هێـــزی ســـەربازی ئـەمرۆ حـەوت كەشـتی جـەنگی ئەمـەریكا گەیشتنه ئاوەكانی كەنداو ، ئەمـەش بـۆ یەكـەم جاره لـه دوای سـاڵی ٢٠٠٣ كەشـتیه جەنگیـەكانی هێزەكـانی سـووپای ئەمـەریكا بگەنـه ناوچـەكه و بـەژداری كردنیان له مانۆره سەربازیەكەی ئەمەریكا لـه كەنداو و لـه پێنـاو زیاتر بـەر سەقامگیری و ئارامی لـه ناوچـەكەدا بـەر پەرچدانەوەی لـه هـەر ئەگـەرێكی روودانـی شـەڕ لـه گـەڵ ئێران و پاراسـتنی سـنوورەكانی ئێـراق ، ئەمـەش لـه لێدوانەكـەی ئـەدمیرال – كـیفن كۆسـگریف – هـات لـەم بارەیـەوه لـه لایـەن هێزەكانی سووپای ئەمەریكا له ناوچەكەدا .



٢٠٠٧/٥/٢٣ لـــه دوایـــین دانیـــشتنیدا دادگای نێوو دەوڵـەتی لـه شــاری لاهــای پایتــەختی هۆڵەنـدا ، بڕیـاری ١٧ سـاڵ زینـدانی بـه سـەر بازرگـانی ماددەی كیمیاوی – فرانس ڤان ئەنرات – سـەپاند ، كـه تاوانبـــاره بـــه بازرگـــانی ماددەی دروستكردنی كیمیایی و فرۆشـتنی بـه سـەرۆكی رژێمـی بەعسی لـه ئێراق سەدام حوسێن .

جێگـەی باسـكردنه كـه دادگاكـه بـه ڕاشـكاوی سـەلماندویەتی كـه ئـەو مادانەی – ڤان ئەنرات – له ناوچه كـورد نـشینەكانی رۆژهـەڵاتی كوردسـتان و باشـووری كوردسـتان بـەكارهێنراوه لـه لایـەن رژێمـی بەعـسی لـه ئێـراق . هـەروا پەیوەندیـەكانی فرانس ڤـان ئـەنرات و رژێمـی بەعـسی لـه ئێـراق ، بـۆ دادگا روون بۆتەوه ، كه چەندین جار رژێمی بەعسی لـه ئێـراق و بـه تایبـەتی

سەدام حوسێن رێزو سووپاسی ڤانی کردووە ، کە ئەمانە هەمووی بوونەتە بەڵگە لە لایەن دادگای نێوودەووڵەتی و رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی دیکەی پەیوەندار لە جیهاندا .

هەروا خاڵێکی گرنگی سەپاندنی حووکمەکە ئەوەیە ، کە بریارەکە بە پێی ئەو بەڵگە و دیکیۆمێنتانەیە کە وولاّتانی ئەوروپی و نەتەوە یەکگرتووەکان لە راپۆرتەکانیاندا سەلماندویانە ، کە سەدام حوسێن دژ بە گەلی کورد تووشی ژینۆساید بووە ، هەروا لە سەرەتای ساڵی ساڵی ٢٠٠٣ فرانس ڤان ئەنرات ، بە تاوانی ئەنجامدانی تاوانی جەنگ بە ١٥ ساڵ زیندان و قەرەببوو کردنەوەی زیان لێکەوتان و ١٥ سکالاّکاری دۆسیەی زیندانی کرابوو .

کە لەم ١٥ سکالاّکارە ١٣ کەسیان خەڵکی ئێران و دووەکەی دیکەشیان خەڵکی شاری هەڵەبجەی هەرێمی باشووری کوردستان بوون ، بەلاّم بۆ دواجار دادگای تێهەڵچوونەوە لە شاری لاهای پایتەختی هۆڵەندا — فرانس ڤان ئەنرات — ی بە ٦٥ ساڵ زیندانی کرد ، ئەویش بە هۆی دروستکردنی ماددەی کیمیاوی و فرۆشتنی و هاوکاری کردنی لە ئەنجامی تاوانی جەنگ دژی گەلی کورد لە کوردستان .

**تێبینی:— لە ناوەرۆکی ئەم کتێبەدا ژیان و کارەکانی ڤان ئەنرات بە شێووەیەکی رێك نووسراوەتەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان و کارکردنی لە ژیانیدا**

٢٠٠٧/٥/٢٤ لە پێشانگای نێوو نەتەوەیی شێوەکاری — ئاشتی منالاّن — کە هەموو ساڵێك لە شاری هیرۆشیمای وولاّتی ژاپۆن بەرێوەدەچێت ، و پێنج لە مندالاّن و مێرد



مندالاّنی شێوەکاری بۆ دووەمین جارە چەندین خەلاّتی پڕ بایەخ لەوانە دیبلۆماسی شانازیەکان بەرهەکانیان بە پلەی باشترین بەرهەمیان بەدەست هێنا لەو پێشانگایەدا .

جێگەی باسکردنە کە هونەرمەند — دارا مورادی — کە تەمەنی ١١ ساڵە لە

رۆژهـەلاتی کوردسـتان ، لـە ٢١ یەکـەمین خـوولی کێبڕکێـی نێوونەتـەوەیی شێوەکاری لە شاری هیرۆشیمای ژاپۆن بەشداریکرد و توانی پلـەی باشترین شـێوەکار بەدەسـت بێنـێ . ئـەم پێشانگایەش لەلایـەن مێـرد منـدالأن لـە تەمەنی ٧ تا ١٥ سالی ئەنجامدەدرێت ، کە وولأتـەکانی وەك -- کۆریـای باکوور ، ئەمەریکا ، چینی مللی ، ژاپۆن ، ئوسترالیا ، ڕووسیا ، فەرەنسا ، و سەریلانکا -- بەشداریان تیدا کرد ، هەروا لـە دوای ئـەو خوولـە منـدالأنی ئێرانیش دەتوانن سالأنە بەرهەمەکانیان لـە چوارچێوەی هونەری – ئاشتی – بۆ بەشداریکردن لەم کێبڕکێیە نێوو نەتەوەییە ئامادە بکەن لەم وولأتەدا .
لـە بـەر ئـەوەی بۆتـە پردێکـی پەیوەنـدی لـە نێـوان هـەردوو – مۆزەخانـەی ئاشتی لـە شـاری هیرۆشیماو قوربانیـانی چـەکە کیمیاییـەکانی ئێـران ، بـە تایبەتیش لیّدانی شاری سەردەشتی کوردستان لـە ئێران لـە لایـەن ڕژێمـی بەعـسی لـــە ئێـــراق ، کـــە زیـــاتر لـــە ٥٠٠٠ هـــەزار هـــاوولأتی شـــارەکە و دەووروبەری تووشی نەخۆشی هەمەجۆر بوون ، لە ئاکامی بۆردمان کردنـی ئەو شارە بە چەکی کیمیاوی لە ناوچەکەدا ، بە هـۆی شـەڕی هەشـت سالـەی نێوان ئێران و ئێراق و لیّدانی کورد لە کوردستان .

٢٠٠٧/٥/٢٤ لـە سـوورانەوەیان بـە سـەر ئاسمـانی ئێراقـدا و لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، کـە دوو لـە فرۆکـە جەنگیـەکانی هێـزی سـووپای ئەمـەریکا لـە جۆری – ئێف/١٦ – سنووری تورکیایان بۆ ماوەی چوار خوولـەك بەزانـد ، بـەم هۆکـارەش بـالۆیزی ئەمـەریکا لـە تورکیـا – رۆس وللـسن – داوای لێبووردنی لـە دەسـەلأتدارانی تورکیا کـردووە ، بە هـۆی بەزانـدنی سـنووری تورکیا لە لایەن فرۆکە جەنگیەکانی ئەمەریکا ، لە سەر پارێزگای هەکاری لـە رۆژهـەلأتی تورکیـا ، واتـە سـەر ئاسمـانی هـەرێمی باکووری کوردسـتان لـە ناوچەکەدا .



٢٠٠٧/٥/٢٤ سەرۆكی فەرەنسا -- نیكۆلا ساركۆزی -- لە لێدوانێكیدا بە فەرمی ڕیگەیاند ، كە وولاتی توركیا لە ناو یەكیەتی ئەوروپا و بوونی بە ئەندام لەو یەكیەتیە جێگەی نابێتەوە ، هەروا گووتی :- ئەو پێشنیارە پێویستە بخرێتە پێش دەمی لوتكەی یەكیەتی ئەوروپا و ، پێویستە لوتكەی یەكیەتی ئەوروپا گرنگی بە بابەتی بوونی توركیا بە ئەندام لەو یەكیەتیە ، لە بەر ئەوەی ئەو كارە هیچ ئەنجامێكی لێناكەوێتەوە.

جێگەی باسكردنە كە چەندین وولاتانی ئەندام لە یەكیەتی ئەوروپا رازی نین كە توركیا ببێتە ئەندام لە یەكیەتی ئەوروپا ، ئەویش لە بەر دوو هۆكاری گرنگ ئەویش :-

یەكەم :- بوونی بە دەوولەتێكی ئیسلامی و دەسەلاتداری حكوومەتەكەش ئیسلامەو ئەندامە لە رێكخراوی كۆنگرەی ئیسلامی و زۆربەی رووبەری خاكی توركیا دەكەوێتە كێشووەری ئاسیا نەك ئەوروپا .

دووەم :- بوونی بە وولاتێكی عەسكەرتاریەت و لە هەمان كات نەبوونی دیموكراتی و پێشێل كردنی مافی مرۆڤ و چەوسانەوەی باری نەتەوەیی و نیشتمانی و زمان و كەلتور و داب و نەریت ، بە تایبەتی بەرامبەر بە گەلی كورد و ئەرمەن و كارەساتەكانی ، كە لە لایەن دەسەلاتەكانی عوسمانی كۆن و توركیای نویٚ بەرامبەر كورد و ئەرمەن لە وولات ئەنجامی داوە لە باكووری كوردستان لە هەرێمەكەدا .

٢٠٠٧/٥/٢٤ لــە کۆنگرەیــەکی رۆژنامەوانیــدا وتــە بێــژی فــەرمی حکوومــەتی ئێــراق – عــەلی دەبــاغ – لــە گــەڵ شــاندی کــوردی لــە هــەرێمی باشــــووری کوردســـــتان بـــە ســـــەرۆکایەتی ســـــەرۆکی حکوومــەتی هــەرێمی کوردســتان -- نێچیر بــارزانی -- رایگەیانــد



و ووتــی :- کــە هــیچ کێــشەیەك لــە نێــوان شــاندی حکوومــەتی هــەرێمی کوردستان نیە ، هەروا گووتی :- ماددەی /١٤٠ ی دەستوور لە وادەی خۆی جێ بەجێ دەکرێت .

جێگەی باسکردنە کە شاندی کوردی بە سەرۆکایەتی سەرۆکی حکوومەت نێچیر بارزانی سەردانی بەغدایان کرد ، لە پێناو گفتووگۆکردن لە سەر ئەو بوارانەی کە بۆتە کێشە لە نێوان هەرێمی کوردستان و حکوومەتی ناوەندی بەغدا ، بە سەرۆکایەتی نووری کەمال مالکی و ، چەندین کۆبوونەوە و چاو پێکەوتن ئەنجامدرا لە پێناو گەیشتن بە رێکەوتن لە سەر ماددەی /١٤٠ و یاسای نەوت و بودژەی پێشمەرگە و هەموار کردنی دەستوور و چەندین لایەنی دیکە .

بــەڵام بەداخــەوە تــاکو کۆتــایی ســاڵی ٢٠٠٨ ووتــەکانی ووتــە بێــژی حکوومەتی ئێراق عەلی دەباغ بە باداچوو ، ئەو ووتانەی ئەو تاکو مێژووی دیاریکراو هەر وەك خۆی ماونەتەوە و بەڵکوو زیاتر هەوڵی ئاڵۆزکردنی دەدەن ، لە لایەن مالکی و لایەنەکانی دیکەی عەرەب لە بەغدای پایتەختی ئێــراق و ، هــەوڵی گــەمارۆی دەســەلاتی کــوردی لــە هــەرێمی باشــووری کوردستان دەدەن و کۆسپ دەخەنە پێش جێ بەجێکردنی ماددە و برگە و خاڵــەکانی دەســتوور ، نــەك هــەر بــۆ کــورد ، بــەڵکوو بــۆ هــەموو ئێــراق بــە تایبەتی بۆ گەلی کورد لە باشووری کوردستان .



٢٠٠٧/٥/٢٤ لە هەوڵە تیرۆرستیەکانی ئیسلامە توندرەوەکانی ئیسلامی ، هەڵسان بە تەقاندنەوەی پردی نێوان شاری خانەقین و گوندی ئیمام ، لە هەرێمی باشووری کوردستان . ئەم پردەش گوندی ئیمام بە شارۆچکەی خانەقین دەبەستێتەوە . ئەم پردەیەش بە پردی ژمارە/١ یەك و بە پردی سەوز ناو زەند بوو ، هەروا ئەم پردەش ناوچەکانی جەلەولا و دەورووبەری بە شاری خانەقین دەبەستێتەوە لە ناوچەکەدا .



٢٠٠٧/٥/٢٥ لە هەوڵە جۆراو جۆرەکانی سەربازیدا و لەم رۆژەدا هێزەکانی سووپای ئەمەریکا دەستی کرد بە مانۆرێکی سەربازی لە دەریای کەنداو ، لە ئاوەکانی بەحرێن و ئێران دەستیان پێکرد ، کە ئەم مانۆرە سەربازیە ژمارەیەکی زۆری کەشتی جەنگی هاتوونەتە ناو ئاوی کەنداو و لە ناویاندا دوو فرۆکە هەڵگری گەورە هەیە ، کە وزەی ناوەکی هەڵدەگرن .

هەروا ئەفسەری دەریاوانی ئەمەریکی – دینز گارسیا –– گووتی :– ئەو مانۆرە سەربازیە لە پێناو سەرکەوتنی پرۆسەی ئازادیە لە ئێراق ، هەروا بۆ ئەوەی سەربازەکانمان زیاتر توانای راهێنانیانی هەبێت لە هەموو بوارەکانی سەربازیدا لە ناوچەکەو جیهاندا .

٢٠٠٧/٥/٢٥ ئەمەریکا و ، بەریتانیا و ، فەرەنسا و ، ژاپۆن . رەخنەی توونديان لە لێدوانەکەی بەرێوەبەری گشتی ئاژانسی وزەی ناوەکی – محەمەد بەرادعی – گرت کە سەبارەت بە بەرنامەی ناوەکی ئێران دابووی .



جێگــەی باســکردنە نوێنــەرانی ئــەم چــوار وولاتــە لــە میانــەی کۆبوونەوەیەکدا لە شاری ڤیەنای پایتەختی نەمسا رەخنــەیان لــە بــەرادعی گـرت ، لـە بـەر ئـەوەی لـە لێـدوانێکی رۆژنامەوانیـدا گووتبـووی :- پێویـستە رێگـە بـە ئێـران بـدرێت بەردەوامبێت لە سەر ئەنجامدانی بەشێك لە بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆم .

لـەو کاتەشدا نوێنـەرانی ئـەم چـوار وولاتـە پێیـان وایـە ئـەم جـۆرە لێدوانـە هەڵوێستی رامیاری نێوودەووڵەتی بەرامبەر بە دۆسیەی نـاوەکی ئێـران لاواز و بـێ هێـز دەکـات . هـەروا داوایـان لـە بەرێوەبـەری گـشتی ئاژانسی وزەی نـاوەکی محەمـەد بـەرادعی کـرد پابەنـد بێـت بـە بڕیارەکـانی ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نێوودەووڵـەتی ، کـە داوا لـە ئێـران دەکـات بەرنامـەی پیتانـدنی یۆرانیۆم بە تەواوی ڕابگرێت لە وولاتەکەیدا .

٢٠٠٧/٥/٢٥ لـە دوای گەرانـەوەی لـە ئێـران — موقتــەدا سـەدر — لـە مزگـەوتی کوفـەی ســـەر بـــە پارێزگـــای نەجــەف لــە باشــووری بەغــدا ، لــە ووتەکەیــدا داوای کرد کە هێزەکانی سووپای هاوپـەیمانان و ، بەتایبەتی هیزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق بچنە دەرەوە . لە لایـەکی دیکە ووتەبێژی کۆشکی سپی ئەمەریکا داوای لـە موقتـەدا سـەدر کـرد ، کـە رۆڵی کەسایەتیەکی رامیاری لە ئێراق بگێرێت لە پێناو بەرەو باشبردنی بارو دۆخی ئێراق .

جێگـەی باسکردنە کـە موقتـەدا سـەدر و ئەوانـەی هاوشـێوەی ئـەون ، تـا

ڕژێمی سەدام لە ئێراق لە دەسەلآت بەردەوام بوون ، پیاوی ئەو ڕژێمە بوون لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە ئێراق .

بەلآم لە دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق بە سەرکردایەتی سەدام حوسێن ، ئەم جۆرە پیاوانە بوونە فسۆس پالەوانی گۆرەپانەکە و دروست کردنی ئاژاوە و لە بار بردنی باری هەولەکان ، لە پێناو چارەسەرکردنی کێشە هەلواسراوەکانی جێ بەجێ نەکراو لە ماوەی ٨٦ سالی رابردوو دا لە ئێراق ، کە ئەمانەش بە هەمان بیروو بۆچوون و هەست مامەلە لە گەل بارو دۆخەکە و داهاتووی ئێراق دەکەن .

کە هیچیان وەك ، مالکی و ، جەعفەری و ، ئەیاد عەلاوی و ، عەبدولعەزیز حەکیم و ، مەشهەدانی و ، عەدنان دلێمی ، لە سەدام باشتر نین و ئەوانەی لە شێووەی ئەوانەشن ، بەلکوو سەدام لە چاو ئەوانە بە سەد ئاو شووراوەتەوە لە بەر ئەوەی سەدام خاوەنی ووتەی خۆی بوو لە ئیراقدا .

٢٠٠٧/٥/٢٨ لە راگەیاندنێکی ئەنجوومەنی ئێراق و لایەنە رامیاریەکان و ئاینیەکان لە ئێراق ، تەقینەوەی مەزارگەی شێخ عەبدولقادر گەیلانیان لە شاری بەغدا تاوانبارکرد ، کە بووە هۆی گیان لە



دەست دانی ٢٤ هاوولآتی و زامدار کردنی ٦٨ هاوولآتی دیکە لە هەموو رەگەزەکان و تەمەنەکاندا . لە لایەن تیرۆرستە ئیسلامیە توندرەوەکانی عەرەب لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ، و بەردەوام بوونیان لە تەقاندنەوەی مزگەوت و مەزارگە و پەرستگا ئاینیەکان لە ئێراق لە نێوان هەردوو مەزهەب شیعە و سوونەی ئیسلامی عەرەب لە وولآتەکەدا .

٢٠٠٧/٥/٢٨ لە هەولەکانی یەکلاکردنەوەی هەلبژاردنی سەرۆکایەتی تورکیا پەرلەمانی تورکیا بۆ جاری دووەم لە خوێندنەوەی یەکەمیدا بریاری لە سەر چەند یاسای دەستووری دا ، بۆ ئەوەی رێخۆشکەر بێت لە پێناو کاندیدکردنی سەرەك کۆمار بە هەلبژاردنی ئازادانە لە لایەن جەماوەر بە شێوەیەکی

ڕاستەوخۆ .

جێگـەی باسـكردنه كـه لـه كۆبوونـوەی پەرلـەمان مـشتوومڕێكی تونـدی لێكەوتـەوە لـە نێـوان ئەنـدامانی پـارتی داد و گەشـەپێدانی دەسـەلآتدار لـە حكوومەت و ئەندامانی بەرهەڵستكار لە پەرلەماندا . هەر لەو كاتەش سەرەك كۆمـاری توركیـا – ئەحمــەد نــەژدەن سـیزار – هەفتــەی رابـردوو ئــەم هەمواركردنەی رەتكردەوە ، كە گوایە ناگونجێت لە گەڵ یاسا و سیستەمی دیموكراتی ، هـەروا ئەندامی پەرلـەمانی سەر بە پارتی داد و گەشەپێدان ، لێدوانەكەی سیزاری رەتكردەوە و بە لێدوانێكی رامیاری و یاسایی دانەنا بە پێی دەستووری وولآتەكە لە توركیا .

٢٠٠٧/٥/٢٩ لـە هەوڵـەكانی توركیـا لـە پێنـاو گـەمارۆدانی راگەیاندنـەكانی كـوردی بـە تایبەتی لـە سایتەكانی ئەنتـەرنێت بەردەوامە ، ئەویش لـە هاك كردنـی ئـەو سـایتە كوردیانــە جـا لــە هــەر شــوێنێك و جێگایــەك بێــت لــەم بــوارە تەكنۆلۆژیایەدا لە پێناو رێگە گرتن لە بلآو كردنەوەی زانیاری لـە سـەر باری كورد لە هەموو بوارەكانی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و زمان و داب و نــەریت و مێــژوو ، یــان كــەلتوور و كۆمەلآیــەتی و بــە تایبــەتی لــە لایــەن هەوڵەكانی دیالۆگ .

كـە توركیـا دژی هەوڵـەكانی كـورد و دوورە لـە زمـانی دیـالۆگ ، جـا بـە هـەر جۆرێـك كـە بتـوانیّ رێگـەگربێت لـە گـەلی كوردسـتان و دواجـاریش سـایتی گۆڤـاری گـولآنی هـاك كـرد و ، ئەمــەش یەكـەم جـاری نیـە كـە بـەم كـارە هەڵدەستێت ، بەڵكوو بەردەوامە بەرامبەر بە كورد جا كەسایەتی كورد بێت ، یاخوود پارت و رێكخراوەكان بێت ، یاخوود نووسـەر و هونەرمەنـد و مێـژوو نـووس و رونـاكبیر بێـت ، بـە هـاك كردنـی سایتەكانیان گـەر لـە بەرژەوەنـدی توركیاش بێت ، تەنیا لە بەر ئەوەی دژی كوردە و مافی كوردی لاڕەوا نیە لـە هەموو بوارەكان لە سەر خاكی كوردستان .

تێبینی:– خوێنەری بەرێز هەر مێژوویەك و وێنەی لە گەڵ دانراوە ، بەلآم هەندێكی كە وێنەی لـــــە گەڵ نیە ، نەم ویستووە وێنەكان زۆر دووبارە ببنەوە ... لە ڕیزمدا .

٢٠٠٧/٦/٤ لــە ڕاگەیانــدنێكی ووتــە بێــژی فــەرمی ســەرەك وەزیرانــی بــەریتانیا بـۆ ڕۆژنامەنووسـان ڕایگەیانـد ، كـە وولآتـانی ئـەورووپا بـە تێكـرا سـەبارەت بـە




هەڵوێستی ڕووسیا هەست بە نیگەرانی دەکەن .
هەروا ووتی :- کە ئێمە دەمانەوێت پەیووەندی و دانووستاندنی ئەرەنی سەبارەت بە ئێران و ، کۆسۆڤۆ و ، هەندێك پرسی دیکە لە گەڵ سەرۆکی ڕووسیا پۆتین ئەنجامبدەن ، هەروا ووتی :-
مەبەست لە سیستەمی دژە مووشەکی ئەمەریکا لە ئەوروپا ... بە ئامانج گرتنی ڕووسیا نیە ، بەڵکو بۆ خواستنی ئەمەریکا لەو وولاتانەی کە دەیانەوێت چەکی ناوەکی بەدەست بێنن ... ئەویش :- وەك ئێران و کۆریای باکوورە لە ناوچەکاندا .
هەروا سەرۆکی ڕووسیا - فلادیمیر بۆتین - گووتی :- ئاراستەکردنی مووشەکەکانی ڕووسیا بەرەو ئەوروپا ، بۆ هەر ئەگەرێکی کارلێکردنی ئاسایشی نەتەوەیی ڕووسیا نەك ئەوروپا ، بە هۆی کێشەی قەلخانی مووشەکی :- وولاتی تشیك و پۆلەندا لە لایەن پەیمانی ناتۆ لە جیهاندا .
هەروا بۆتین بۆ ڕۆژنامەی - کۆرییلا دیلا - ی ئیتاڵی گووتی :- ئەگەر ئەمەریکا تواناداە مووشەکەکانی خۆی بگەیەنێتە پۆلەندا و کۆماری تشیك - ڕۆژهەلاتی ئەوروپا - ئەوا دەبێ ڕووسیا ئامانجی نوێ لە ئەوروپا بگرێتە بەروو ، هەروا گووتی :- بەم کردەی ئەمەریکا ، ئەوروپا دەبێتە - بەرمیلێك باروود - و ئارامی و سەقامگیری لەم کێشووەرە نامێنێت .

٢٠٠٧/٦/٤ لە هەوڵەکانی ڕژێمی تورکیا لە پێناو ڕێگەگرتن لە جمووجوڵی پارتی کرێکارانی کوردستان pkk لە باکووری کوردستان ، ڕاپۆرتێکی ئاراستەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کردووەو لە هەمان کات نوێنەری تورکیا لە نەتەوە یەکگرتووەکانی - باکی ئیلکین - لەم بارەیەوە دانووستاندن لە گەڵ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان - بان کی مۆن - ساز دەدات ، لە پێناو چارەسەری کێشەو ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن لە ناو خاکی هەرێمی باشووری کوردستان .

هەروا لە لایەکی دیکە ئەمەریکا نایەوێت ، کە تورکیا دەست لە کاروباری هەرێمی کوردستان وەربدات ، بۆ ئەم هەنگاوە وەزیری بەرگری ئەمەریکا – رۆبەرت گیتس – لە ٦/٣ جەختی لە سەر ئەوە کردەوە ، کە نابێت توریکا بە بیانووی ڕاوەدوونانی چەکدارانی پەکەکە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە هەرێمی کوردستان ئەنجام بدات ، کە کێشەکە زیاتر بەرەو ئالۆزبوون دەبات لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٦/٥ لە داوایەکی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا – کۆندالیزا رایس – کە ئاراستەی کۆنگرێسی ئەمەریکای کردبوو ، بە تەرخان کردنی ٧٥ ملیۆن دۆلار لە بوودجەی ئەمساڵ ، بۆ بەرنامەی دیموکراسی لە ئێران ، بەڵام تا ئێستا ٦٦ ملیۆن دۆلار لەو برە پارەیە بۆ ئەم بەرنامەیە تەرخانکراوە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاند ، کە تاکو ئێستا ٢٠ ملیۆن دۆلار بۆ بەرنامەی بڵاوکردنەوەی دیموکراسی تەرخان کراوەو ١٢ ملیۆن دۆلاریش لە پارەکە دراوە بە بەرنامەی رۆژهەڵاتی ناوەراستی نوێ .

هەروا سایتی ڕادیۆی – سەوا – بابەتێکی بڵاوکردەوە ، کە کۆنگرێسی ئەمەریکا لە لایەن خۆیەوە ٣٦ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردووە بۆ پرۆژەی پەخشی تەلەفزیۆن ، بۆ ئێران و هەروا ٥ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردووە بۆ بەرنامەی ئاڵووگۆر کردنی ڕۆشنبیری و فێرکردن لە گەڵ چەندین لایەنی دیکە لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٦/٥ لە لێدوانێکی سەرۆکی هاوپەیمانی ئەمەریکیا بۆ قەرزدان و گەشەپێدان – میناتا تۆریە – بۆ ڕۆژنامەنووسانی خوێندەوەو گووتی :– بانکی هەژاران لە دژی بانکی دەووڵەمەندەکانە ، کە ئابووری وولاتمان هەڵدەلووسێ دایمەزرێنین .

ئەم لێدوانەشی لە ئەنجامی کۆتایی لووتکەی هەژاران هات لە پایتەختی وولاتی – مالی – ئەویش بە دامەزراندنی – بانکی باشوور – یان لە بەرامبەر – بانکی باکوور – دا ، کە کروپی هەشت وولاتە پیشەسازیەکە پێک هاتووە هەروا گووتی :– ئامانجیش لە دامەزراندنی بەنکەکە گەشەپێدانی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری وولاتانی هەژارەو بانکی نێوو

دەوڵەتیش پێویستە هەڵووەشێتەوە لە جیهان ، نەك دەست بەسەراگرتنی ئابووری جیهان لە ڕامیاریەتی جیهانگەری بەرەو وولاتانی هەژار لە جیهان .

٢٠٠٧/٦/٦ لیفنت بیلمان ووتە بێژی فەرمی بە ناوی وەزارەتی دەرەوەی کۆماری تورکیا گووتی :- ئەگەر سەرکردەکانی هەرێمی باشووری کوردستان ڕێوو شووێنی پێویست لە دژی چەکدارانی پەکەکە بگرنە بەر ، لەو کاتەدا ئامادەین گفتووگۆ لە گەڵیاندا ئەنجام بدەن .

هەروا گووتی :- ئەگەر بێت ئەو مەرجەی ئێمە جێ بەجێنەکرێت ئەو گفتووگۆیە لە میارەیەوە هیچ سوودێکی نابێت ، هەروا گووتی:-

سەرکردایەتی ڕامیاری کوردستان پێیان وایە گفتووگۆی مەرجدار نابێت بخرێتە پێش چارەسەری کێشەکان لە گەڵ دەسەڵاتدارانی تورکیا .

هەروا لەم بارەیەوە لە سەرەتای ئەم هەفتەیەدا سەرەك وەزیرانی ئێراق نووری مالکی و سەرۆکی هەرێمی باشووری کوردستان مەسعوود بارزانی ، سەبارەت بە هەرەشەی سنوور بەزاندنی هەرێمی کوردستان لە لایەن هێزەکانی سووپای تورکیاوە داوایان کرد ، کێشەکەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری کوردستان لە ڕێگەی دبلۆماسی چارەسەربکرێت ، نەك لە ڕێگەی سەربازی کە دەبێتە هۆی زیاتر ئاڵۆزکردنی کێشەکان لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٦/٨ وەزیری گەیاندنی ئیسرائیل – شاتوول مۆفاز – دووپاتی ئەوەی کردەوە کە پەیووەندی لە نێوان ئیسرائیل و سووریا بەردەوام لە ڕێگەی نامە گۆرینەو بە شێوەیەکی زۆر نهێنی ئەنجامدراوە ، ئەویش لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هەردوو وولات لە سەر گردۆلکەکانی جۆلانی داگیرکراو لە لایەن دەسەڵاتی ئیسرائیل لە کاتی شەڕی نێوان ئیسرائیل و عەرەب لە ١٩٦٧/٦/٥دا.

هەروا سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل – ئەیهود ئولمەرت – چەندین جار نامەی ئاڕاستەی سەرۆکی سووریا – بەشار ئەسەد – کردووە و داوای لێکردووە کە ئیسرائیل لە گردۆلکەکانی جۆلان دەست هەڵدەگرێ ، بەمەرجێك سووریا پەیووەندیەکانی خۆی لە گەڵ ئێران و حزبوللای لوبنانی بپچڕێنێت ، بەلام سەرۆکی سووریا وەلامی نامەکانی نەداوەتەوە بۆ ئەوەی بگەینە ئامانجێکی

باش .

لـه بـەر ئـەوەی تـەوەری نێـوان ئێـران و حیزبـوللای لوبنـان و جووڵانـەوەی حەماسـی فەلەسـتینی – رایـدكالین – و بـەرەو بـەهێزبوون هـەنگاو دەنـێن ، گەرچـی ئیـسرائیل و ئەمـەریكاش هەوڵـدەدەن تـەوەری لایـەنی سـعوودیە و ئوردن و میسر ، بەهێز بكـەن كـە هـەوڵی چارەسـەری كێـشەكان لـە ڕێگـەی ئاشـتی و گفتووگـۆ دەدەن لـە نێـوان ئیسرائیل و وولاتـانی پەیووەنـدار ، بە تایبەتی چارەسەری كێشەی فەلەستین لە ڕۆژهەلاتی ناویندا.

٢٠٠٧/٦/١١ لە شاری دیاربەكر – ئامەد – لە باكووری كوردستان ڕادیـۆی بەشـی كـوردی لە ڕادیۆی – جاگری fm – بەخشەكانی خۆی بلاوكردەوە ، هەروا بەرپرسـی بەشـی ڕادیـۆی كوردی – عومـەر جـەلیل – لـە لێدوانێكی بـۆ سەرچـاوەكانی ڕاگەیاندن ئاماژەپێكراو ڕایگەیاند ، كـە ڕادیـۆ و تەلـەفزیۆنی توركیا مۆڵـەتی پێدراوە كە ماوەی پەخشی ڕادیۆكە یەك كاتژمێرە لە هەفتەیەكدا .

٢٠٠٧/٦/١١ لە هەوڵەكانی وەزارەتی بەرگری ئیسرائیل ، ئەمرۆ مـانگێكی دەستكردی بە ناوی – ئۆفەك /٧ – هەڵدایە ئاسمانی ناوچەكانی پـڕۆژەی ئـەتۆمی ئـێران ، بـۆ ئـەوەی چـاودێری تـەواوی جمووجۆڵیـەكانی حكوومـەتی ئـێران بكـات ، لەمەڕ بەدەست هێنانی چەكی ناوەكی .

جێگــەی باســكردنە كــە حكوومــەتی ئیــسرائیل لــە ڕابــردووش مانگــە دەســتەكردەكانی بــە نــاوی – ئۆفـەك/٥ – و – ئۆفـەك /٦ – بـەرەو ئاسمـان هەڵـداوە ، كـە مـاوەی پێـنج سـاڵ لـە كارەكـانی چـاودێری لـە سـەر ئێـران و ناوچـەكەدا بەردەوامـە ، بـە كۆكۆدنـەوەی زانیـاری لـە سـەر جمووجۆڵیـە سـەربازیەكان و كارەكـانی دیكـەی سیخووری سـەربازی لـە ناوچـەكەدا ، كە دژی ئیسرائیل و هاوپەیمانـەكانی ئـەنجام دەدرێـت لـە ناوچـەكەو ڕۆژهـەلاتی ناوەراستدا .

لـە بـەر ئـەوە ئیـسرائیل لـە چالاكیە ناوەكیـەكانی ئێـران نیگەرانـەو كۆماری ئیـسلامی ئێـرانیش بـە یەكـەمین دوژمـنی خـۆی دەزانـێ ، لـە بـەر ئـەوەی مەحمودی ئەحمەدی نژادی سـەرۆكی ئێـران ، لـە مـاوەی دەسـت بەكاربوونی چەندین جار هەرەشەی سڕینەوەی دەووڵەتی ئیسرائیلی كردووە لە لێدوان و ڕامیاریەتەكەیدا.

٢٠٠٧/٦/١٢ لە ڕاگەیاندنێکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری کوردستان پەکەکە شەڕی دژ بە ڕژێمی تورکیا و هێزەکانی سووپای تورکیا وەستاند و لە هەمان کات لە ڕاگەیاندنەکەیدا ئەوەشی ڕوونکردەوە ، کە هێزە چەکدارەکانی پارتی کرێکاران تەنیا بەرگری لە خۆ دەکات و داوا دەکات کە چارەسەری کێشەی کورد لە ڕێگەی گفتووگۆ چارەسەر بکرێت لە وولاتەدا .

ئەم ڕاگەیاندنەش لە بارەگای پارتی کرێکارانی کوردستان بوو لە وولاتی بەلژیکا ، لە گەڵ ئەوەشدا هێزەکانی سووپای تورکیا لە سەرەتای مانگی/٤ بەردەوامن لە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن دژی چەکدارانی پەکەکە و دانیشتووانە کوردەکانی باکووری کوردستان ، سەرەڕای ئەوە ئەمەریکا و یەکیەتی ئەوروپا دژی کردارە سەربازیەکانن کە لە لایەن هێزەکانی سووپای تورکیا ئەنجام دەدرێت لە سەر خاکی باکووری کوردستان .

٢٠٠٧/٦/١٣ لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە کەنێسەی ئیسرائیل – شیمۆن بیریز – سەرکەوتنی بەدەست هێنا بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی ئیسرائیل .

جێگەی باسکردنە کە سەرۆکی پێشووی ئیسرائیل – موشیە کاتساف – بە هۆی گەندەڵی لە دەسەڵات دەستی لە کاری پۆستی سەرۆکایەتی ئیسرائیل کێشاوە لە سەر بڕیاری کەنیسەت و لە ئاکامی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٠ ، کە کاتساف بۆ پۆستی سەرۆکایەتی سەرکەوتنی بەدەست هێنا .

هەروا بیریز ئەندامی پارتی کاربووە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ، بەڵام بەهۆی چەندین کێشە وازی لە پارتی کاری ئیسرائیلی هێناو چووە ناو پارتی کادیمای ئیسرائیل ، کە ئەم پارتە لە لایەن سەرەك وەزیرانی پێشوو – ئیریل شارۆن – دامەزرابوو ، کە دوای ئەوە بە هۆی نەخۆشی کەوتە نەخۆشخانەو تاکو تەواوبوونی ئەم مێژوونامەیە چارەنووسی دیار نیە لە گۆرەپانی ڕامیاری و دەووڵەتی ئسرائیل .

٢٠٠٧/٦/١٤ کۆچی دوایی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و سەرەك کۆماری نەمسای پێشوو – کۆرت فالدهایم – لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا لە نەمسا .

جێگەی باسکردنە کە کۆرت فالدهایم لە ١٩١٨/١٢/٢١ لە – سانکت ئەندرا وردیرن – لە نزیك شاری ڤیێنا لە نەمسا چاوی بەجیهان هەڵهێناوە ، دوای تەواو کردنی قۆناخەکانی خوێندن بڕوانامەی دکتۆرای لە فەلسەفە لە ساڵی

١٩٤٤ بە دەست هێناوە ، هەروا لە ئەکادیمیای ڤیێنا دەرچووە ، دوای ئەوە بۆتە ئەفسەر لە ڕیزەکانی سووپا ، لە بەر ئەوەی ئەنجوومەنی جوولەکەی جیهانی فالدهایمی تاوانبار کردووە بەوەی کە لەوکاتەی بەرپرسی یەکێك لە یەکەی سووپا بووە زیاتر لە ٤٢٠٠٠ هەزار جوولەکەی یۆنانی ڕەوانەی سەربازگەکانی نازی ئەلمانیا کردووە .

کە ئەو یەکە سەربازیەش بەرپرسیاربووە لە قەسابخانەکەی کە بە هەزارا جوولەکەی یۆگسلاڤ کوژران لە چیای کوزارا ، بەڵام کۆرت فالدهایم ئەو پڕوپاگندەی ڕەتکردەوەو بە ئەرکێکی سەربازی ناوزەندکردوو خۆی لەو داوایانە دوورخستەوە .

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٢ – ١٩٨٢ کۆرت فالدهایم بە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵبژێردرا ، هەروا دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٨٦ بە سەرەك کۆماری نەمسا هەڵبژێردرا ، سەرەڕای ئەوەی کە گوایە فالدهایم خزمەتی هەبووە لە سووپای نازی ئەلمانیاو دەستی لە کۆمەڵکوژیەکەی جوولەکەدا هەبووە .

لە ماوەی دەسەڵاتی لە ئەمینداریەتی نەتەوە یەکگرتووەکانن سەرکەوتووانە کارەکانی بە ئەنجام گەیاندووە لە دۆزینەوەی ڕێگە چارەسەرکردن ، بە تایبەت لە نێوان ئیسرائیل و فەلەستینی لە جیهان .

٢٠٠٧/٦/١٥ لە وتەیەکی سەرۆکی ئەرژەنتین – نیستوورکیرتشنر – بە بۆنەی یادکردنەوەی ٢٥ ساڵەی تێپەربوون بە سەر کۆتایی هاتنی جەنگی دوورگەی فۆکلاند کە دەکەوێتە باشووری زەریای ئەتڵەسی ، کە ئەرژەنتینیەکان پێی دەڵێن دوورگەی – ئەلمالعیناز – لە ناوچەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە کێشەی نێوان بەریتانیاو ئەرژەنتین لە سەر ئەو دوورگەیە زۆر کۆنەو چەندین جەنگی لە سەرکراوە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا ، کە دوا جەنگیان لە ١٩٨٢/٦/١٤ بوو ، بۆ داگیرکردنەوەی دوورگەکە لەلایەن بەریتانیا بەهێزی سووپا لەوکاتدا .

هەر بەم بۆنەوە سەرۆکی ئەرژەنتین لە ووتەکەیدا گووتی :– بەریتانیا لە ڕێگەی داگیرکردن دوورگەکەی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیی و ئێمەش لە ڕێگەی ئاشتی و بە یاساکانی دادگای نێوو دەووڵەتی دوورگەکە

دەگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆمان و وولاتەکەمان ... کە لەو جەنگەدا نزیکەی ٩٠٨ کەس لە نێوان هەردوو وولات گیانیان لە دەست دا ، کە ٦٥٠ کەس لە ئەرژەنتینیەکان ، و ٢٥٥ کەسیش لە بەریتانیەکان لە دوورگەکەدا .

٢٠٠٧/٦/٢١ بەپێی هەواڵی BBC زنجیرەی حەوتەمی چیرۆکەکانی -- هاری بۆتەری -- خاتوو -- ج.ك.رۆلینکی -- رۆماننووسی ئینگلیزی بکەوێتەوە بازارەوە ، کە تا ئێستا لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت نزیکەی ١,٦٠٠ ملیۆن دانەی لیّ فرۆشراوە ... خاتوونی نووسەر بەم دواییە ڕایگەیاند ، کەوا بۆ ئەم بەشەی زنجیر جەربەزەییەکەی بۆتەر ناونیشانی -- کەلێنەکیلۆنەکان -- ی هەڵبژاردوەو لەناویشیدا دوو کەسایەتی سەرەکی دەمرن .
بەمەش ڕێگا بە چەند و چوونی زۆری جیهانی دەدات ... شایانی باسە تا ئەم رۆژە ٣٥٢ ملیۆن دانە لە پەرتووکی هاری بۆتەر فرۆشراوە بۆ سەر ٦٤ زمانیش وەرگێردراوەو پێنج بەشیشی سەرکەوتووانە کراون بە فلیمی سینەمایی ... کەواتە ئەوەندە بەسە بۆ تووانای داری خاتوونی نووسەر و دەوڵەمەند بوون لە جیهاندا .

سەرچاوە :- رۆژنامەی خەبات /٢٥٥٠ .

٢٠٠٧/٦/٢٥ لە بەردەم کۆشکی کۆنگرەکانی پارتی کرێکارانی بەریتانیا لە شاری ماجستەر خۆپێشاندانێك دژ بە ڕامیاریەتی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا - گۆردن براون - ئەنجامدرا و داوایان کرد بە بۆنەی وەرگرتنی پۆستی سەرەك وەزیران و وولاتەکەیان بڕیاری کشانەوەی هێزەکانی سووپای بەریتانیا بدات لە ئێراق . هەروا داوای خۆ پێشاندەران ئەوە بوو کە براون لە هاوهەڵوێستی بەریتانیا لە ئاست وویلایەتە یەکگرتووەکان دژ بە ئێران و جێگەکانی دیکە لە جیهان دوورکەوێتەوە لە ڕامیاریەتی دەرەوەی وولاتەکەدا .



٢٠٠٧/٦/٢٥ لــه لێــدوانێكی ســەركردەی رێكخــراوی قاعیــدەو دووەم كەســایەتی ئــەو رێكخــراوە بــە – ئەیمــەن زەواهــری – پــشتیووانی خــۆی بــۆ بزوتنــەوەی حەماسی فەلەستینی ، كە بە تەواوی دەستی بەسەر كەرتی – غەزە – دا گرتــووە و داوای رێكخــستنی ریزەكــانی لــە گــەڵ جیهادیــەكان كــرد بــۆ ڕووبەڕووبوونــەوەی هێرشــێك لــە ڕەنگەیــە بــە هاوكــاری میــسرو وولاتــانی دیكەی عەرەبی و ئیسرائیل بكرێتە سەری .

هەروا داوای كرد كە زیاتر رێزەكانیان رێكخەن لە گەڵ برا موجاهیدەكانی فەلەستین و جیهان و دووركەوتنەوە لە كێشەو ململانێ و هەوڵەكان لە پێناو بەڕەنگاربوونەوەی دوژمنان بێت .

هـەر لـە لێدوانێكیدا بەر لـە مـانگی /٣ی رابردوو رەخنـەی لـە جووڵانـەوەی حەماس گرت ، بە هۆی مۆركردنی رێكەوتنامە لە گەڵ جووڵانـەوەی فـەتح بـە نــاوی رێكەوتنامــەی – مەككــە – لــە ســعوودیە بــە چــاودێری شانــشین عەبدوللای شانـشینی سـعوودیە ، لـە پێنـاو بـەلاوە نـانی كێـشەی نێـوان هەردوو جووڵانەوەكەی فەلەستین .

٢٠٠٧/٦/٢٥ لــە دانیــشتنێكی نهــێنی ســەركردەكانی ئــەركانی سووپای توركیا لە شاری ئەنكــەرەی پایتــەختی توركیا ، چەند تـەوەرێكی تایبەت بە ڕەوشی ئـەمنی و دوا پێشهاتەكانی ئێراق و بـە تایبـەتی كوردسـتان



خستۆتە بەر باس ، دوای ئـەوە لـەم بارەیـەوە ڕاپۆرتێكی ١٤ خـاڵی بـە نـاوی ئـەو ڕەوشـەی ئێـستا ئێـراق هەیـەتی و ئـەو هەڵوێـستانەی لـە بەرامبـەردا وەرگرتــووە ، كــە لــە زۆربــەی خاڵەكانــدا نیگــەرانی لــە هەمبــەر هــەر پێــشكەوتنێكی هــەرێمی باشــووری كوردســتان دەسنیــشانكردووە و پێیــان وایە كە كۆسپێكی گەورەیان بۆ توركیا دروست كردووە .

دانیشتنە نهێنیەكـەی سـووپای توركیـا ، كە وێنەیەكی دەسـت رۆژنامـەی –

دێلی تورکی – کەوتووەو لە ژمارەی ئەمرۆیدا بڵاوبۆتەوە ، کە تێیدا هاتووە ئەو کارانەی لە ئێراق و بەتایبەت لە کوردستان ڕوودەدەن ، وا لە مەترسیەکانی سەر تورکیا دەکەن کە کێشەکان نە لە ڕێگەی دبلۆماسیانە و نە لە ڕێگەی سەربازییەوە ناتوانرێت هیچ چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە .

هەروا لەم دانیشتنە نهێنیەدا سووپای تورکیا ئاماژەی بەوە داوە ، کە مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی ، بە دامەزراندنی لە شکرێکی سەربازی سەردەمیانە هەنگاو دەنێن ، لە ناو ئەو لە شکرەشدا ١٧٠٠ چەکداری پارتی کرێکارانی کوردستان پەکەکە هەیە لە هەرێمەکەدا .

هەروا لە خاڵی یەکەمی ڕاپۆرتەکەدا هاتووە :– ئەو ڕەوشەی لە ئێراق دروستبووە و بە تایبەتیش ئەو گۆرانکاریانەی کە لە هەرێمی کوردستان هاتۆتە کایەوە ، لە بارەی باری ئاڵۆزی بارودۆخەوە مەترسی بۆ سەر داهاتووی تورکیا هەیە و بەرەو ئاراستەیەك دەچێت کە چارەسەر نەکرێت .

هەروا لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە کە ئەو مەترسیانەی بە هۆی پێشهات و دوا گۆرانکاریەکانی لە ئێراق و بە تایبەتی لە کوردستان ڕوودەدەن ، لە داهاتوودا لە ڕێگەی یاسا نێوو دەووڵەتیەکانیش چارەسەری بۆ ناکرێت ...

هەروا پلانێك بۆ داهاتوویەکی نزیك دارێژراوە ، کە تەواوی تورکمان ، لە سەرجەم مافەکانیان بێ بەش بکرێت ، گەر ئەو پرۆسەیە بەردەوام جێ بەجێ بکرێت نە لە ڕێگەی دبلۆماسی و نە ڕێگەی سەربازییەوە ناتوانرێت هیچ چارەسەرێکی بۆ بکرێت .

هەروا لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە :– ئەو ڕەوشەی لە هەرێمی کوردستان هاتۆتە کایەوە ، بە هیچ شێوەیەك لە لایەن تورکیاوە قبووڵ ناکرێت و ناشێت دەرفەتی پێ بدرێت .

هەروا سووپای تورکیا سەبارەت بەبوونی چەکدارانی پەکەکە لە هەرێمی کوردستان چەند خاڵێکی دیاریکردووە وەك :–

١– چەکدارانی پەکەکە لە هەرێی کوردستان بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ کێشەیەك ببنەوە بەردەوام لە هەوڵی خۆ ڕێکخستن و لە گەڵ هێزە ڕامیاریەکانی کوردستانیش لە یەك نزیك دەبنەوە .

٢– چەکدارانی پەکەکە بە ڕێژەی ١٠٠٪ پاڵپشتی و هاوکارییە

لۆژستیەکانی لە ئێراقەوە پێدەگات ، بۆیە ئەم ڕێکخراوە پێویستی بەوە نیە بە یارمەتی دانی هیچ وولاتێکی دیکە .

٣- چــەکدارانی پەکەکــە تــەواوی مەشــق و ڕاهێنــانی ئەنــدامانی لــە هەرێمی کوردستان دەبینن .

٤- پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان ، لە هەوڵەکانیان بۆ دامەزراندنی لەشکرێکی سەردەمیانە بەردەوامن و تا نزیکەی ٢٠٠ چەکداری پەکەکە لە ناو ڕیزی هێزەکانی پارتی و٥٠٠ چەکداریش لە هێزەکانی یەکیەتین .

٥- چەکدارانی پەکەکە لە هەرێمی کوردستان لە شاخدان نزیکەی ١٥٪ تا ١٨٪ ی خەڵکی ئێراقن .

ئەمــەو چــەندین خــاڵی دیکــە لــە کۆتــایی ڕاپۆرتەکــەدا هــاتووە:- شــەڕێکی دەروونی بۆ سەربازانی تورکیا لە مەڕ گۆرانکاری و دوا پێشهاتەکانی ئێراق و ناوچەکە و هەرێمەکەدا لە ئارادایە .

٢٠٠٧/٦/٢٦ لــە ڕاپــۆرتێکی ڕێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان ، کــە لــە لایــەن – تۆمــاس بیتشمان – ئامادەکراوە لە ڕاپۆرتی ساڵانەیدا لە سەر بەرهــەم هێنــانی مــاددە بێ هۆشــکەرەکان ، کــە ئەفگانــستان لــە ٩٢٪ ی سەرچاوەی بەرهــەم هێنــانی ئەو مــاددە بێ هۆشکەرانەیە ، کە لەجیهان بازرگانی پێووە دەکرێت ، هــەروا ڕاپۆرتەکــە ئەوەشــی دیــاریکرد ، کــە چــاندنی گــوڵی – خــشخاش – لــە ئەفگانستان بە ڕێژەیەکی زۆر زیادی کردووە ، بە قەد سێ ئەوەندەی جاران ســەرەڕای بــوونی زیــاتر لــە ٣٠,٠٠٠ هــەزار چــەکدار لــە هێزەکــانی نێــوو دەووڵەتی لەو وولاتەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەفگانستان لە ساڵەکانی ١٩٨٠ لە ٣٠٪ بەرهەمی ئەو جۆرە ماددەی بەرهەم دەهێنا ، بەڵام ئەو بەرهەمە سێ جار بەقەد ئەوەنــدەی زیــادی کــردووە . هــەروا لــە ڕاپۆرتەکــەدا هــاتووە ، کــە هــەرێمی – هلمەنــد – هەرێمێکە کە نیووەی بەرهەمی ئەو ماددە بێ هۆشکەرە لە جیهــان بەرهــەم دێنێ ، کە هــەرێمی هلمەنــد زیــاتر لــە ٧٠ هــەزار هکتــار لــە زەوی بــۆ چــاندنی ئــەقیوون بــەکاردێنن ، کــە ئەمــەش بۆتــە سێیەکی ئەو زەویانــەی کــە هــەردوو

وولاتی – میانمارو بۆرما – ئەفیوونی لێدەچێنرێت .
کە ئەمەش بۆتە کارێکی چارەسەر نەکراو سەرەرای بوونی دەسەلاتی ئیسلامی لە ئەفگانستان و ئێران و ، بەڵکوو دانیشتووانی ئەم دوو وولاتەش زیاتر لە هەموو دانیشتووانی وولاتانی دیکە بە کاری دێنن ، وەك ژەمێکی خواردن بەرامبەر بە وولاتانی دیکەی جیهان .

٢٠٠٧/٦/٢٧ لە دوای سەرکەوتنی لە کۆنگرەی پارتی کرێکارانی بەرتانیا ، بە سەرۆکی پارت و بوونی بەر سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – گۆردن براون – بەرەو کۆشکی – باکنگهام – بەرێکەوت ، بۆ دەست ماچکردنی شانشین ئەلیزابێت و پیرۆزکردنی بەو پۆستەی کە سەرەك وەزیرانی ژمارە /٥٣ یە لە بارەگای حکوومەت – ١٠ داوننگ ستریت – لە سەردەمی – رۆبرت و بۆل – کە لە ساڵەکانی ١٧٢١ – ١٧٤٢ دەسەلاتداریەتی بەریتانیا کردبوو .
سەرەك وەزیرانی نوویێ بەریتانیا – گۆردن براون – تەمەن ٥٦ ساڵ و لە بنچەدا ئەسکەتلەندیە و لە خێزانێکی قەشە گەورە بووە ، لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا چۆتە زانکۆو بەر لە ٢٤ ساڵ پێش ئێستا بۆتە ئەندامی پەرلەمانی گشتی بەریتانیا ، هەر لەو ماوەش توانیوویەتی بڕوانامەی دکتۆرا لە فەلسەفە بەدەست بێنیٚ ، بەر لە بوونی بە سەرەك وەزیران ، کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بووە ، رۆژانە ١٨ کاتژمێر کاری کردووە ... هەروا لە تەمەنی ٤٩ ساڵیدا لە گەڵ خاتوو – سارە ماکۆلی – هاوسەرگیریان پێکەوە ناوە لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا .
تێبینی :– سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – تۆنی بلێر – لە رۆژی ٦/٢٧ دەستی لە پۆستی سەرەك وەزیران کێشاوەو – گوردن براون – لە ٦/٢٨ پێك هاتەی حکوومەتەکەی ڕاگەیاند لە سەر بەریتانیا .

٢٠٠٧/٦/٢٧ سەرەك کۆماری ئێراق و سکرتێری گشتی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان – جەلال تاڵەبانی – لە فرۆکەخانەی سلێمانی نێوو دەووڵەتی بە رۆژنامەنووسانی ڕاگەیاند ، کە رژێمی ئیسلامی ئێران لێپرسراوان و ئەندامانی گروپەکانی جووند و مجاهدی ئیسلامی دەستگیرکردووەو بارەگاکانی داخستوون بەلام لە ڕاستیدا ئەم دەستگیرکردنەی بەرپرسەکانی ، کە تیپەکانی کوردستان زیاتر دەستگیرکردنێکی رەمزی بوونەو چونکە

تاکو ئێستاش رژێمی به ناو ئیسلامی ئێران کۆمەك و یارمەتی دەری گروپە ئیسلامیە توندڕەوەکانن و بەڵگەش ، ئەو هێرشە بوو کە ٢٠٠٧/٧/١٥ کردرایە سەر پاسەوانانی سنوور و لە ئەنجام بووە هۆی کوژرانی٩ لە پاسەوانانی کورد لە سەر سنووری نێوان ئێران و هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٦/٢٩ سەرەك کۆماری ئێراق – جەلال تاڵەبانی – لە بەرامبەر کۆنگرەوانانی نێوودەووڵەتی لە شاری ژنێڤی وولاتی سویسرا رایگەیاند :– کە ئێراق بەرەنگاری هێرشی تیرۆرستانی عەرەبی دەبێتەوە لە هەر یەك لە وولاتانی ، مەغربی عەرەبی و ، سعوودیەو ، سووریا و ، میسرو ، لیبیا .
هەروا گووتی:– ئێراق بەرەنگاری دوژمنداریێتی عەرەب دەبێتەوە لە بەرامبەر کورد و سوونەو شیعەو هاوکاربوونە ، لە پێناو دەرکردنی بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش کە داگیرکاری سەپاندە سەر ئێراق ... ئەوان و لە هەمان کات کاك جەلال تاڵەبانی ئەو رێکەوتنەی ئاشکراکرد ، کە لە نێوان سەرۆکایەتی کۆمارو حکوومەت هەیە لە پێناو دروستکردنی سەرکردایەتیەکی بە کۆمەڵ بۆ چارەسەرکردنی گرفت و گلەیەکانی نوێنەرانی عەرەبی مەزهەب سوونە ، بۆ مومارەسەکردنی رۆڵی سەرکردایەتی بڕیارەکان و چاودێری کردنی کاروباری دەووڵەت .

٢٠٠٧/٦/٢٩ کۆچی دوایی سیاسەتمەداری ناسراوی کورد و پەرلەمانتاری کوردی پێشووی پارتی رنج و دیموکراسی ناوداری کورد لە باکووری کوردستان – ئۆرهان دۆگان – لە شاری وانی باکووری کوردستان ، بە هۆی سەکتەی دڵ لە کاتی ووتار خوێندنەوەی لە ڤیستیفاڵی چاندو هونەری بایەزیدی ئاگری بۆ هەزاران هاوولاتی کورد لە نەخۆشخانەی سەدەی بیستەمی زانکۆی وان .
بەم بۆنە پارتی کۆمەڵگای دیموکراتی لە شارەکانی ئامەد و سەرجەم ناوەندو پێکهاتەکانی پێویست بەم پارتە ٣ رۆژ ماتەمی گشتی ڕاگەیاند ...
شایانی باسە ئەم سیاسەتمەدارە لە ساڵی ١٩٥٥ لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی لە ئاوایی -- دارگەچیت – لە شاری ماردین چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، لە ساڵی ١٩٧٤ دەستی بەخوێندنی یاسا کردووە لە زانکۆی ئەنکەرە ... لە ساڵی ١٩٨٩ ئۆگان کۆمەڵەی ماف مرۆڤی لقی جەزیرەی دامەزراندو پاشان وەکو یەکێك لە دامەزرێنەرەکانی پارتی رەنجی گەل

ناسراو لە ساڵی ١٩٩١ لە سەر لیستی پارتی سۆسیال دیموکراتی تورکیا بە نوێنەری خەڵکی شرناخ چوو بۆ پەرلەمانی تورکیا و پەرلەمان لە هەواڵانی دیکەی هاوبیرو کوردی پارتی رەنج و دیموکراتیان دامەزراند .
لە ١٩٩٤/٥/٢ لە گەڵ هەڤاڵەکانی بە تایبەت لەیلا زانا بۆ ماوەی ١٠ ساڵ زیندانی کرا و لە ٢٠٠٤/٦/٩ ئازاد کران ، ئەم سیاسەتمەدارە کوردە لە خەبات و تێکۆشان و خۆراگری لە پێناو گەل و نیشتیمان بەردەوام بوو تاکو ماڵئاوایی لە گەل و نیشتمانەکەی کرد لە باکووری کوردستان .

٢٠٠٧/٧/٢ هێزەکانی ئاسایشی چەمچەماڵ دەست بەسەر ٧٠ تەن چای بەسەرچوو داگرت ، کە لە ئێرانەوە رەوانەی هەرێمی باشووری کوردستان کرابوو.... بە مەبەستی فرۆشتنی بە بازرگانانی ئێراق و دابەشکردنەوەی بەسەر هاولاتیاندا.... لە هەمان رۆژیش ئاسایشی کەرکوک دەستی بە سەر لۆرییەك چا داگرت ، لە کاتی بەتاڵ کردنی چاکەو بۆ هەمان مەبەست لە ئێراق و لە کوردستان .

٢٠٠٧/٧/٣ رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ کە بنکەی سەرەکیان لە ئەمەریکایە راپۆرتێکی ٩٣ لاپەرەی سەبارەت بەرەوشی خراپی زیندانیانی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان ، لە زیندانەکانی ئاسایشی حکوومەتی هەرێم ئامادەکردبوو ، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لە هەولێری پایتەختی هەرێم ناوەرۆکەکەی بلاو کردەوە ، کە -- سارالی ویتسن -- بەرێوبەری رۆژهەلاتی ناوەراست و باکووری ئەفەریکیای رێکخراوەکەی مافی مرۆڤ ، ئەویش لە سەر ئەشکەنجەدان لە زیندانەکانی هەرێمی باشووری کوردستان گووتی :-
هێزەکانی ئاسایش بە شێوەیەکی رۆتین دەستگیرکراوان دەخەنە بەر ئەشکەنجەو خراپ مامەڵەکردنی دیکە ... دوای ئەوە جێگری سەرەك وەزیرانی ئیراق وئەندامی سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان دکتۆر بەرهەم سالح لە ٢٠٠٧/٧/٩ لە بابەتێکدا چەندین تێبینی و پێشنیاری لە رۆژنامەی خەبات خستە بەرچاو ، بۆ دام و دەزگاکانی حکوومەتی هەرێم ، بە تایبەتی ئاسایش و بەندینخانەکانی پارتی ویەکیتی ، کە هۆکارەکانی ئەو پارتە دەسەلاتدارانە لە هەموو بوارەکانی حوکمرانی لە

هەرێمەکەداو ، دوای ئەوە ڕۆژنامەی خەبات بەشێوەیەکی ناڕەزایی وەلامی نوسینەگەی دکتۆر- بەرهەم سالح - یان دابووەوە.
هـەر لـە سـەر ئـەم بابەتـەش نووسـەری ئـەم کتێبـە لـە چـاوپێکەوتنێکی ڕاسـتەوخۆدا لـە ۷/۱۱ /۲۰۰۷ . لـە گـەڵ کـەناڵی ئاسمـانی تەلـەفزیۆنی سەحەری ئیرانی باسـی لـەم لایەنە کـرد....کە ئەم ڕاپۆرتەشی کاردانەوەی داهاتووی خراپی نوانده سەر باری دەسەلاتی کورد و هەرێم و جیهان .

۲۰۰۷/۷/۳ کۆچی دوایی گۆرانیبێژی بەناوبانگی ئەمەریکی خاتوو-- بیڤرلی سیلزی -- لە تەمەنی ۷۸ساڵیدا ، بە نەخۆشی شێرپەنچە لە سنگیەوە.....شایانی باسە ئەم خاتوونە لە سالی ۱۹۲۹ لەگەڕەکی بیرۆلکینی شاری نیورۆك چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .
ئەم خاتوونە لە ماوەیەکی کەمدا بەسەر پلیکانەی ناوبانگی گۆرانی ئۆپیرالی هەلـدەزنێ . لـە سـاڵی ۱۹۵۵ بـە سـەرۆکی خانـەی مـیترۆ پولیتـان ئـۆپیرای شـاری نیـۆرك دادەنرێـت ... کـۆی بەرهەمـەکانی زیـاتر لـە ۷۰ شـانۆگەری ئاهەنگـسازی و ۱۸ شـانۆگەری ئـۆپیرالی وچـەندین کۆنـسێرتی تایبـەت دادەنرێت ، چەندان جاریش خەلاتی بەرزی پێ بەخشراوە ، لەوانە خەلاتی ئازادی سەرۆکایەتی لە سالی ۱۹۸۰.
هـەروا خـەلاتی سـەنتەری کیتری لـە سـاڵی ۱۹۸۵ وچەندان خـەلاتی دیکـەی پیشەیی ، لەوانە چوار خەلاتی تیمی بە دەست دێنێ لە وولاتەکەیدا .
ڕۆژنامەی خەبات ژمارە/۲۵۰۰

۲۰۰۷/۷/٤ سـەرەك وەزیرانـی پێـشووی ئێـراق و سـەرۆکی پـارتی دەعـوەی ئیـسلامی مەزهــەب شــیعەی تونــدرەو -- ئیــبراهیم جەعفــەری - بــە ڕەسمــی پرۆژەیـەکی داواکـاری پیـشکەش بـە نوێنـەری سـەرۆکی ئەمـەریکا جـۆرج بـۆش لـە ئیراق کـرد ، کـە لـە ۹ خـال پێـك هـاتبوو...یـەکێك لـەو خالانـە کـە داوای کردبـوو ، بـە پێـدانی پۆسـتی سـەرەك کۆمـاری ئێـراق بـە مەزهـەب



سوونندی ئیسلام و، پێدانی پۆستی سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق بە كوردو خۆشی پۆستی سەرەك وەزیران وەرگرێتەوە ، لە پاڵ ئەوەشدا بە جێ بە جێكردنی مادەی/ ١٤٠ بە رازی كردنی كورد لە هەرێمی باشووری كوردستانی بە ئێراق لكێندراو لەو وولاتە داو لە گەڵ چەندین پێشنیار و بابەتی دیكە و لە پێناو جێ بە جێكردنی خواست ونیازە شۆڤینیە توندرەو لە سەدام چووەكەی لەو وولاتەدا.

٢٠٠٧/٧/٦ یانەی وەرزشی هەولێر لە هەرێمی باشووری كوردستان ، لە تۆپی پێ مێژوویەكی بۆ شاری هەولێرو كوردستان تۆمار كردو بۆ یەكەم جار لە مێژوویدا توانی ببێتە پاڵەوانی خوولی بژاردەی ئێراقی فیدراڵ.....كە هەردوو یانەی هەولێرو جەوییەی بەغدا لەو یاریەدا روبەرووی یەك بوونەوەو ، لە ئاكام یانەی هەولێر توانی بە گۆڵێك لە خوولی یەكەمدا سەركەوتن بەسەر یانەی جەوییە بە دەست بێنێ و تەواوی جەماوەری یاریگاكەی هێنایە هەژان ، كە زیاتر لە ٢٠ هەزار هاندەر ئامادەی بوون لە یاریگاكەدا .



٢٠٠٧/٧/٧ لە شاری لشبۆنەی پایتەختی پورتووگال سەیرو سەمەرە نوێیەكانی جیهان راگەیاندرا ، ئەو كردارەش لە رێگەی دەنگدان بە هۆی ئینتەرنێت و نامەی تەلەفۆنی بچووكەوە بەرێوە چوو . لەم كارەشدا ٧٠ حەفتا ملیۆن كەس لە سەرانسەری جیهاندا بەشداریان تێدا كرد ، هەروا ئاژانسەكانی هەواڵ هەریەك لە شوورەی مەزنی چینی مللی و ، پەیكەری مەسیحی و ، ودلسۆز لە بەرازیل و ، پەرستگای تاج مەحەل لە هندستان ، بە سەیرو سەمەرەی نوێی جیهان دانران .

هەروا شاری بەترای ئوردن و ، كۆلیزێ لە رۆماو ، شوویێنەواری ماتچوبیكتۆچكۆ لە پیرۆو ، شاری شیشن ئیتزا ، كە پاشماوەی شارستانیەتی مایایە لە مەكسیك خرانە ناو لیستە نوێیەكان .

هەروا رێكخەران رایانگەیاند





، کـه ئەهرامـەکانی جیـزەش خرایـــە دەرەوەی کـــێ بـــر کێیەکـە ، لـە بـەر ئـەوەی بـە سـەیرو سـەمەرەی شـەرەف دانـــران . هـــەر یـــەك لـــە ئەکرۆپۆڵ لە شاری ئەسینا ، یـا خوود تـاوەری ئیڤـل لـە شـــــاری پـــــاریس و ، پەیکـەرەکانی مـەوای لـە دوورگەی ئیسستەر ناویان لە لیـــستەکەدا نـــەهاتبوون . رێکخـراوی یۆنیسکۆ رژدبـوو لـە سـەر ئـەوەی کـە کـەمترین بـــەراورد لـــــە نێـــوان دەستپێشخەری راگەیاندن بۆ ٧ حـــەوت ســـەرو ســـەمەرە نوێیـەکانی جیهـان و کـاری زانـستی و پـەروەردەیی لـە ئـارادا نییـە سـەبارەت بـە خستنە ناوەوەی شوێنەکان لە لیستی کەلەپووری جیهانیدا .

هـەروا ئاهـەنگی راگەیانـدنی ئەنجامـەکانی کـە ئەکتـەری بـەریتانی -- بـن کینگـسی -- و ئەکتـەری ئەمـەریکی -- هـیلاری سـوانگ -- لـە لـشبۆنە پێشکەشیان کرد . هەروا وادەیەکی رەمزیان بۆ دانا ئەویش رۆژی ٧/٧ بوو ، هەروا کۆمەڵێك ئەستێرەو کەسایەتی دیار ئامادەی بوون لـە ناونیشاندا -- نیل ئەرمستۆنگ -- و ئەکتـەرو گۆرانیبێـژ -- جنیڤـەر لۆپێزو ، سـەرەك وەزیرانی پورتووگال خۆسێ سوکراتیس ، و ئەستێرەی تۆپی پێـێ رۆنالـدۆ لە بەرازیل .

جێگەی ئاماژە پێکردنە ، کە شاشەکانی تەلەڤزیۆن ئاهەنگەکەیان بۆ ١٧٠ وولاّتـی جیهـان گواسـتەوە . هـەروا پێـشنیار کـرا ، کـە سـەیرو سـەمەرە کۆنـەکانی جیهـان زینـدوو کرانەوەیـەکی مللـی بـۆ بکـرێ . کـە لـە لایـەن --

هیرۆدۆتی میژوونووسی یۆنانی ٤٢٥--٤٨٤ ی پێش زاین و زانا کالیماخۆس ٢٤٠--٣٠٥ ی پێش زاین ، کە نزیکەی ٢٠٠ ساڵ بەر لە زاین و خرایە لیستێك لە مۆزەخانەی ئەسکەندەریە لە وولاتی میسردا .
ئەو لیستەی کە ئەمرۆ ئێمە پێی ئاشناین لە سەدە ناونجییەکان کۆکرایەوەو لەو کاتیشدا زۆر لەو شووێنانە لە سەر گۆی زەوی نەمابوون ، کە بریتی بوون لە :-

١- هەرەمی گەورە لە شاری جیزە ،کە لە دەورووبەری ساڵانی ٢٥٠٠-٢٦٥٠ ی پێش زاین دروستکاوە ، تا ببێتە گۆرستانی شاری فرعەونەکانی میسری خۆفۆ . کە لە بنەماڵەی چوارەمەو تا ئێستاش هەر گەوورەکە ماوە لە وولاتەکەدا .

٢- باخچە هەڵواسراوەکانی بابل لە باشووری ئێراقی ئێستادا ، کە لە ساڵی ٦٠٠ ی پێش زاین دروستکراو بەر لە سەدەی یەکەمی بەر لە زاین بە هۆی بوومەلەرزەیەکەوە وێران بوو .

٣- پەیکەری ئەرتمیس لە ئەفسوس لە تورکیای ئێستادا ، کە لە ساڵی ٥٥٠ ی پێش زاین دروستکراوە ، بۆ بەرز راگرتنی خواوەندی گریك ئەرتمیس تەرخان کراو ساڵی ٣٥٦ هیرۆستراتۆس پەیکەرەکەی خاپوور کرد .

٤- پیکەری زیوس لە ئۆلۆمپیا لە یۆنان کە لە ساڵی ٤٣٥ ی پێش زاین دروستکراوە و بەرزایەکەی ١٢ مەترە ، فەرمانڕەوایانی مەسیحی لە نێوان هەردوو سەدەی ٥-٦ بۆ زاڵبوون بە سەر بتپەرستی هەڵیان وەشاندەوە لە وولاتەکەدا .

٥- ئارامگای مووسولوس لە هالیکار ناسۆس ، کە ئێستا باشووری رۆژهەلاتی تورکیای ئێستایە - واتە ئەوەی لە تورکیایە لە سەر خاکی کوردستانە - کە لە ساڵی ٣٥١ ی پێش زاین دروستکراوەو بەرزیەکەی ٤٥ مەتر بووە . هەر چوار لاشی بە نیگاری دیار رازێندرابووەوە . بە هۆی روودانی بوومەلەرزەوە زیانی پێگەیشتووەو لە ساڵی ١٤٩٤ ی پێش زاین خاچپەرستانی ئەورووپا بە تەواوی وێرانیان کرد .

٦- پەیکەری زلی رۆدس کە لە ساڵی ٢٨٠-٢٩٢ ی پێش زاین دروستکراوە ، کە پەیکەرێکی زلی برونزی خواوەندی گریك هیلیۆس بووە . کە بە هەمان

بارستایی پەیکەری ئازادی نیورۆکی هەبووە لە ئەمەریکا . لە ساڵی ٢٢٤ پێش زاین بە هۆی بوومەلەرزە خاپوور بووە .
سەرچاوە :- www.moheet.com

٢٠٠٧/٧/٧ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا --گۆردن براون -- داوای لە فەرمانگەی كۆچ كرد ، كە چاو بە بارودۆخی ئەو وەرگێرە ئێراقیانە بخشێننەوە كە لەگەڵ هێزەكانی سووپای بەریتانیا كار دەكەن ، كە ژمارەیان ٩١ وەرگێرە – مترجم -- كە ئەوان داوایان كردبوو بە پەنا هەندەیی لە بەریتانیا وەربگیرێن ، ئەم وەرگێرانەش كە لە بەرژەوەندی هێزەكانی بەریتانیا ئەم كارانەیان ئەنجام دەدا.

بەڵام داوای وەرگێرەكان لەلایەن فەرمانگەی كۆچ رەتكراوەتەوە سەرباری داواكردنی ئەو داوایە لەلایەن ئەفسەرێكی پایە بەرزی بەریتانی لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٧/٩ نووسەری ناوداری كورد پرۆفیسۆر عەبدولرەحمان حاجی مارف كۆچی دوایی كرد ، بە هۆی رووداوی ئوتومبێل لە نێوان رێگای كەركوك -- سلێمانی ، شایانی باسە پرۆفیسۆر عەبدولرەحمان لە ساڵی ١٩٤٠ لە شاری سلێمانی چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .؟

خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لە شاری سلێمانی لە باشووری كوردستان تەواو كردووە ... بەكالیۆرۆس و دكتۆرای لە یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو لە زمان وئەدەبی كوردیدا بەدەست هێناوە ... پرۆفیسۆر عەبدولرەحمان لە تەمەنبدا توانیویەتی خزمەتێكی زۆری زمان وئەدەبی كوردی بكات ، كە زیاتر لە ٣٠ كتێبی قەبارە گەورەی بە نرخ بگەینێتە دەست خوێنەران وكتێبخانەی كوردی لە كوردستان .

٢٠٠٧/٧/١١ رۆژنامەی توركی بەناوی – تودەی زەمان – رەخنەی لە حكوومەتی یۆنان گرت ، كە ئەویش لە رێگەی وەزیری دەرەوەی توركیا بوو ، بە هۆی ئەو نەخشەیەی كە تێیدا هەرێمی باشووری توركیای وەكو بەشێك لە دەوولەتی كوردستانی سەربەخۆ پێشانداوە ... ئەم نەخشەیە لە شاری ئەسینای پایتەخت یۆنان ،

ئەویش لە كۆنفراسێكی سەربازی لە ژێر ناوی بەرێوەبەری قەیران پێشانداوە ... لە كۆنفراسەكەدا نوێنەری سووپای توركیا و نوێنەرانی

سەربازی چەندین وولاتی دیکە بەژداریان تێدا کردو بە نیشاندانی نەخشەی کوردستان لە کۆنفراسەکەدا ... تورکیا بە توندی تورە کرد . پرۆفیسۆر مازیس ، کە شارەزایەکی رامیاری بوو ، کاروباری ستراتیژی و سەربازیە لە ووتەکانیدا لە کۆنفرانسەکە ،سوودی لە نەخشەی کوردستانی یەکگرتوو وەردەگرێت .

کە بۆ یەکەم جارە لە گۆڤارێکی سەربازی ئەمەریکا بلاو کراوەوە پاشان لە کۆلیژی سەربازی ئەمەریکاو پەیمانی ناتۆش وانەی لەسەر وتراوەتەوە . ئەمەش ئەفسەری تورکی بەژداربوو لە کۆنفراسەکەو ناڕەزای توندی پێشانداو کۆنفراسەکەی جیٚ هێشت ، دوای ژەنەرال و حکوومەتی تورکیا نامەی ناڕەزاییان ئاراستەی حکوومەتی یۆنان و، ئەمەیان بە هەلێکی گونجاو لە قەلەمدا بۆ دابەش بوونی تورکیا.

ئەم سمینارە کە پەیوەست بوو بە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی قەیرانی ڕامیاری وسەربازی لە ناوچەو ناوخۆی ئەزمونی سەربازی نوێنەرانی وولاتانی جیهانی بوو لە لایەنی ئەنیستیتۆی ئانالایزی بەرگری یۆنانیەوە بەڕێوە چوو لە وولاتەکەدا .

شایانی باسە لە سالی ٢٠٠٦ لە ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا ، هەمان نەخشەی کوردستانی یەکگرتوو لە کاتی وانە گووتنەوە بۆ ئەفسەرانی وولاتانی پەیمانی ناتۆ بەکارهاتبوو ، کە ئەمەش بووە هۆی گرژی نێوان ڕژێمی تورکیا و ئەمەریکا و ئیتالیا .

٢٠٠٧/٧/١٢ کۆچی دوایی زانای ناسراوی کورد دکتۆر -- محەمەد موکری -- لە شاری ئیڤری ، لە نزیك شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە تەمەنی ٨٦ سالیدا ... شایانی باسە دکتۆر محەمەد لە سالی ١٩٢١ لە شاری کرماشان لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیرکراو لە لایەن ئێران ، چاوی بە جیهان هەلهێناوە لە هەرێمەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە دکتۆر محەمەد لە بنەمالەی سیفەدین موکریە ، کە لە سەدەی هەژدەمدا حاکمی سەربەخۆی کوردستانی موکری بووە . لە مندالیەوە بە گوێرەی ڕێنوێشینەکانی باوکی پارەلێك لەگەلٚ زمانی فارسی , زمان وڕێزمانی عەرەبی دەخوێنیٚ....لە تەمەنی ١٣ سالیدا کرماشان جیٚ

دێلێ و روو لە شاری تارانی پایتەختی ئێران ، دەکات و ئامادەیی شەرەف لە تاران تەواو دەکات ، دواتر لە کۆلیژی ئاداب لە سالی ١٩٤٩ کارنامەی دکتۆراکەی لە بارەی دیالێکتی ئاخێوەرەکانی رۆژئاوای ئێران تەواودەکات .

لە سالی ١٩٤٦ یەکەمین ئیدارەی تەعلیماتی ئێرانی و هۆزە کۆچەرەکانی ئـــــێران دادەمەزرێنێ ، لە ســـاڵەکانی ١٩٤٧ _١٩٥٠ چەندین بابەت و لێکۆلینەوە کۆدەکاتەوە و چەندین دەست نووسی بلاۆکردۆتەوە و زۆرشی لە دوای خۆی چێهێشتوە ... لە ساڵی ١٩٥١ بووەتە بەرێوەبەری گشتی لە وزارەتی فەرهەنگی نیشتمان . سەرنووســـەری گواری — ماه -- بەخستان بووە ... لە ساڵی ١٩٥٤ لە دوای کودەتاکەی شا بە سەر موسەدەق موکری زیندان دەکرێ .

دوای ئازادکردنی لە سەر داوەتی پرۆفیـــسۆر ماسینۆن میندرسکی ماسێ بێنیسفینست دەچێتە فەرەنسا .... لە ساڵی ١٩٥٤ تاکو ١٩٧٩ چەندین بەرهەم و بابەت بە فەرەنسی بلاۆدەکاتەوە و هەر بەم بۆنەیە پاداشتی دەووڵەتی فەرەنسا وەردەگرێ ... دوای روخاندنی ڕژێمی شا دەگەرێتەوە ئێران و دەیکەنە بالیۆزی فەوقەلعادەی ئێران لە مۆسکۆ و دواتر مەنگۆلیا ... لە ســـاڵی ١٩٨٩ دەگەرێتەوە فەرەنســـا .

٢٠٠٧/٧/١٦ کۆچی دوایی زاناو نووسەری کورد -- سەلام حەیدەری -- لە تەمەنی ٨٠ سالیدا ، بە نەخۆشیەکی درێژ خایەن لە ماڵەکەی خۆیدا ... مامۆستا سەلام حەیـدەری خـاوەنی چـەندین پەرتوکـە ، وەك شـەوێك لەگـەڵ خـەیام - خەوننامەی کوردی - مەولود نامەی کوردی لایەنیکی ونیوو لە مێژووی کورد . ئەم نووسەرە لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ، بە بریاری پێشەوا قازی محەمەد دەکرێتە سکرتێری رۆژنامەی کوردی لە هەرێمەکەدا .

دوایی روخاندنی کۆماری کوردستان لە لایەن رژێمی ئێران دەچێتە ڕووسیا و پاشان ووڵاتەکانی ئەفگانستان و ، ئەردەن و ، میسر و ، سعودیە دەگەرێ . هەروا سەلام حەیدەری ئەندامێکی جالاکی ژێ کاف بووە و لە ساڵی حەفتاکان بە بریاری سەرکردایەتی کورد دەکرێتە قازی لە پارتی دیموکراتی

كوردسـتان لـە دەڤـەری بێتواتـەی سـەر بـە قـەزای رانیـەی سـەر بـە پارێزگـای سلێمانی باشووری هەرێمی كوردستان .

جێگەی ئاماژە پێكردنە كە مامۆستا سەلام حەیدەری لـە تەمـەنی ٢١ سـالیدا خەڵاتی گەورەی پێ دەبەخشرێ ، كە یەكێكیان لە لایەن مستەفا بـارزانی و ئەوی دیكەیان لە لایەن زانكۆی ئەزهەر. تـەرمی سـەلام حـەیدەری لـە گونـدی دواوەی ناحیـەی بێتواتــە لــە گۆرسـتانی مـەلا زادە دەنێـژرێ لــە هــەرێمی باشووری كوردستان.

٢٠٠٧/٧/١٦ بۆ بینینی زیاتر لە ٤٥ هەزارجۆرە گوڵی رەنگاورەنگ لـە پیشانگایەك ، كـە لە شاری برۆكسل ئەنجامدراو زیاتر لـە ٧٠,٠٠٠ هـەزار كـەس سـەردانی ئـەو پیشانگایەیان كرد . كە ساڵانە ئەم پێشانگایە ئەنجام دەدرێت لە ڤیستیڤاڵی گووڵ ، كە لێژنەیەكی جیهانیش تـەرخان دەكرێـت بـۆ هەڵبـژاردنی جـوانترین گووڵ لە ڤیستیڤاڵەكەدا .

٢٠٠٧/٧/١٦ لە دوای ٤٠ ساڵ لە دەربەدەری نووسەرو شاعری ناوداری گەورەو یەكـەمی فەلەستینی و عەرەبی مەحمود دەرویش گەرایەوە شـاری حـەیفای فەلەسـتین .

جێگەی ئاماژە پێكردنە كە مـەحمود دەرویـش مـاوەی ٥٠ سـاڵ بـەرگری لـە كێـشەی گــەلی فەلەسـتین كـرد بـە بـێ پـچران . كـە بـە شـاعیرو نووسـەرو رونـاكبیرێكی چـەپرەو ناوزەنـد بـوو ، لـە هـەموو بوارەكـانی مـافی مـرۆڤ و نەتەوە و نیشتیمان و سەربەخۆی گـەلان و دادپـەروەری لـە دەسـەڵات و ژیـان و لە كار...!...؟.

٢٠٠٧/٧/١٦ لە ئەنجامی تەقینەوەی چوار ئوتومبیلی مینرێژكراو لـە لایـەن تیرۆرسـتانەوە لە شاری كەركوك لە نزیك بارەگای یەكیتی نیشتیمانی كوردستان ، چـەندین جێگـەی دیكـە ، كـە لـە ئاكامـدا بـووە هـۆی شـەهید بـوونی زیاترلـە ١٠٠ هاووڵاتی و زامداربوونی زیاترلە ٢٠٠ هاووڵاتی كورد لە شارەكەدا .

٢٠٠٧/٧/١٧ سەرەك كۆماری سووریا بەشار ئەسەد لە وتەیەكیدا بە بۆنـەی نوێكردنـەوەی وادەی سـەرۆكایەتیەكەی بـۆ حـەوت سـاڵی دیكـە رایگەیانـد رێوشـوێنی پێویست دەگرێتە بەر بۆ پێدانی رەگەز نامەی سووری بە ژمارەیـەك لـە كـورد ، بـە تایبـەتیش ئەوانـەی كـە لـە بەشـی بـاكووری وولاتـدا دەژیـن ... هـەروا

بەشار ئەسەد گووتی:-
کۆ دەنگیەك هەیە لە سووریا لـە سەر پێویستی چارەسەر کردنـی مەسـەلەی سەر ژمێـری سـاڵی ١٩٦٢ ... ئەمـەش لـە ئاماژەیەکدا بۆ ئەو کوردانـەی کە لەو سەر ژمێریەدا ناونووس نەکران و بەو هۆیەوە رەگەز نامەیان پێنـەدرا ... هـەروا ئامـاژەی بـە پـرۆژەی یاسـایەك کـرد ، کـە کـاری لـە سـەر دەکرێـت بـۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە .
شـایەنی باسـە کـۆنگرەی حزبـی بـەعس لـە سـووریا کـە لـە مـانگی ٢٠٠٥/٦ بەسترا ، داوای چارەسەرکردنی کێشەی سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢ لە شـاری حەسەکە کردبوو ، کە نزیکەی یەك ملیۆن و نیوو کوردی تێدا نیشتەجێیە و گرنگیان بە بوژانەوەی ئەو ناوچەیە نەداوە . هەندێ لە پارتە کوردیەکان لە سـووریا دوپـاتی دەکەنــەوە کـە ٢٢٥٠٠٠ هـەزار هـاو وولاتـی کـورد لـە رەگەزنامــە بـێ بەشــکران لــە وەتــەی ئــەو ســەرژمێریە لــە ســاڵی ١٩٦٢ ئەنجامدراوە لە هەرێمەکەدا.

٢٠٠٧/٧/١٧ رۆژنامەکانی ڕووسیای یەکگرتوو دەرکردنـی ٤ دیپلۆماتکاری ڕووسیان لە بەریتانیا بە شەڕێکی دیپلۆماتی ناو برد ، کە بەریتانیا دژی ڕووسیا بەرپای کردووە ... رۆژنامەی ئەزڤیستیای نزیك لە کەرملێن نووسیویەتی:- سـەرۆك وەزیرانی تازەی بەریتانیا گۆردن براون شەڕی لە دژی ڕووسیا راگەیاند ، بە شەری دیپلۆماتی و شەری ڤیزا .
هـەروا نووسـیویەتی:- کـە پێویـستە کـرملێن بـە زووتـرین کـات وەلامێکـی گونجاو بداتەوە ، هەروا رۆژنامەی کۆمەر سانق ئابووری لەلاپـەرێکی خۆیـدا بلاوی کردۆتەوە ، کە ڕووسیا و بەریتانیا دەستیان بە شـەڕێکی دیپلۆمـاتی کــردووە ... کــە بــەریتانیا رۆژی ٧/١٦ چــوار دیپلۆماتکــاری ڕووســیای دەرکردبوو و رایگەیاندبوو ، کە چاو بە هاوکاری نێوان لەندەن ومۆسکودا دەخشێنێتەوە .
ئەمـەش لـە وەلامـی بـە دەسـتەوە نـەدانی چوار گومـانلێکراو لـە مەسـەلەی کوشـتنی سـیخورێکی پێـشووی ڕووسـیا یـەکگرتوو ، بـە نـاوی ئەلکسەندەر لێفینیسکۆ ، کە لە شاری لەنـدەن ژەهـر خوارد کرابـوو لـە لایـەن مۆسـکۆوە .
ئەمەو چەندین بابەتی دیکە لە رۆژنامەکان باسی لێوە کرا لەم بارەیەوە .

۲۰۰۷/۷/۱۷ بریـاری لـە سـێدارە دانـی عـەدنان حەسـەن یـووری رۆژنامـە نـووس و بەڕێوەبەری هەفتە نامەی راگیراوی کوردی فارسـی ئاسۆ لـە لایـەن دەزگای شۆڕشی شـاری مەریوانـەوە بۆیـان دەرچـووە ، لـە لایـەن کۆمـاری ئیسلامی ئێران ... شایانی باسە ئەم دوو کوردەی شاری سنە دەست بەسـەر کـران ، کە هیوا بۆ تیماریش لـە شاری مـەریوان ماوەی نزیکـەی ۷ مـانگ دەستگیر کرابوو .

۲۰۰۷/۷/۱۷ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش بە فەرمانێکی سەرۆکایەتی ماڵ و دارایـی گشت ئەو وولاتانەی کە واشنتۆن گومانی ئەوەیان لێکراوە کە پاڵپشتی لـە تێکدانی باری سەقامگیری ئێراق دەکەن ... بلۆك کرد . لەم باریـەوە کۆشـکی سپی گووتی :– ئامانج لەم بریارە گەمارۆدانی ئەو گروپە تیرۆریستانەیە کـە لـە لایـەن سـووریا و ئێـران ، یارمـەتی دەدرێـن ... لـەم بـارەوە سـەرۆکی ئەمەریکا دەقی بریارەکەی لـە پـاش دەرچونیەوە دەبێتە یاسا و دەست بە جـێ بـە جێکردنـی دەکرێـت ... هـەروا سـەرۆکی ئەمـەریکا ئـەم کارانـە بـە هەڕەشـەیەکی گـەورە و مەترسـیدار دەخاتـە سـەر ئاسایـشی نەتـەوەیی و سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا و باری ئێراق بەرەو حکوومەتێکی دیموکراتی لە ناوچەکەدا.

۲۰۰۷/۷/۱۸ بە بۆنەی ۸۹ ساڵەی ساڵیادی لە دایك بوونی سـەرۆکی ئـەفریکیا ، بە پێك هێنـانی گروپێکـی هـزری راگەیانـد . کـە ژمارەیـەك لـە کۆنـە سـەرکردە و کەسایەتی لـە خـۆ دەگرێـت و وەك مانـدێلا گـوتی:–دەتـوانین بـە ئـازادی و دڵنیایـەوە ئاخـاوتن بکـەین و لـە چارەسـەر کردنـی کێـشە مرۆییـەکان لـە جیهاندا .

هەروا هاوکاری بکەن و دەتوانین بە ئاشکراو نهێنـی کاربکـەن . ئەمـەش لـە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لە جۆهانسبۆرگ ، ماندێلا کە خەلاتی نۆبلی بـۆ ئاشتی وەرگرتـووە و بە پاڵـەوانی دژ بـە نەژاد پەرسـت ناسـراوە وگـووتی:– هیوادارم ئەم گروپە بتوانێت تاریکی ئەم جیهانە روناك بکەنەوە.

۲۰۰۷/۷/۱۸ زیـاتر لـە ۱۰۸ شـارەزای ئێراقـی لـە بـواری نەوتـدا نامـەیکی کراوەیـان ئاراستەی پەرلـەمانی ئێراقـی فیدراڵ کـردووە و تیایـدا داوایـان لـە پەرلـەمان کردووە ، کە پەلە لە یاسای نەوت و غاز نەکـەن ... ئـەو شـارەزا ئێراقیانـەی

که له عەرەبی هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلامی پێك هاتبوون له نامەکەیاندا گوتوویانه:—
بەرنووسی یاسای نەوت و غاز که خراوەته بەردەست پەرلەمان له ناوەرۆکدا جیاوازی لەگەڵ پەرنووسەکەی پێشوو نییه جگه لەوەی که ئەمجارە به زمانێکی پاراوتر دارێژراوە ... چونکه ئەو پەرنووسه هەموو تێبینیەکانی ئەنجوومەنی شوورای دەوڵەت تێبینیەکانی شارەزایان که کۆرەکەی عەمانی پایتەختی ئوردن و کۆرەکەی سەندیگاکانی کارمەندان نەوت و دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ژمارەیەك له لایەنە رامیاریەکان پشتگوێ خستووە ... هەروا داوایان کرد که ئەم یاسایه دەبێ له بەرژەوەندی تەواوی گەلانی ئێراق بێت له وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٧/١٨ سیاسەتمەداری کورد خاتوو لەیلا زانای نوێنەری پێشووی پەرلەمانی تورکیا له میتینگێکی پروپاگەندەیدا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی تورکیا ، که بریاره له ٢٠٠٧/٧/٢٢ ئەنجام بدرێت ، داوای پێك هێنانی سیستەمی فیدراڵی و سازبوونی هەرێمی کوردستان و داننانی به هەموو مافەکانی رەوای گەلی کوردستان له باکوری کوردستان ، له ئەنگەرە خواست و هەرەشەی ئەوەیکرد ، که کورد بۆ دوایین جار دەستی ئاشتی بۆ رژێمی تورکیا درێژدەکات ... ئەگەر ئەم مافانه مسۆگەر نەکرێن , تورکیا تووشی پارچه بوون دەبێت .

خاتوو لەیلا زانا پەرلەمانتاری پێشووی پارتی رەنج و دیموکراتی و پشتیووانی له کاندیدەکانی کوردی سەربەخۆی سەربه دە تەپه بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی تورکیا کرد ، که لەو کۆبوونەوەیه به دەیا هەزار هاوولاتی کورد ئامەددا ، که هەرەشەی ئەوەیکرد که کورد داوای چارەسەری کێشەکه به ئاشتیانه دەکات و ، گەر تورکیا دەستی نەگرێت و پێشوازی له چارەسەری ئاشتیانەی کێشەی کورد نەکات ، ئەوە گەلی کورد چیدیکه دەست درێژ ناکاتەوە ... له گەڵ دەیا ووتەی دیکه به بەرگری کردن له مافەکانی گەلی کوردستان له باکووری کوردستان .



۲۰۰۷/۷/۱۸ هێزەکانی سووپای رژێمی تورکیا بەردەوامە لە بۆردمان کردنی گوندەکانی سەر سنووری نێوان تورکیا و هەرێمی باشووری کوردستان و بۆتە هۆی ئەوەی ، کە بە دەیا گوندنشینەکان گوندەکانیان جێ بهێلن و ڕوو لە ناوچە ئارامگرەکان بکەن ،

شایانی باسە ڕێکەوتنامەی پاراستنی سنووری نێوان ئێراق وتورکیا و ئێران ، بە هاوکاری هەردوو ڕژێمی ئێران و تورکیا دژ بە چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بەردەوامە ، سەرەڕای ئەوەی کە ئێستا پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناو خاکی تەواوی تورکیا لە خەبات بەردەوامن دژ بە رژێمی تورکیا .

ئەویش لە پێناو بە دەست هێنانی مافە ڕەواکانیان و ئەمەو چەندین مانگە تورکیا بە دەیا هەزار سەربازی بە هەموو جۆرە چەك و تەقەمەنی سەردەمی ، لەو کارانە بەردەوامە و هەرەشەی هێرشکردنە سەر هەرێمی باکووری کوردستان دەکات ، لە پێناو شێواندن ودروستکردنی دوودڵی و نا ئارامی لەم هەرێم و مەترسی بوونیان لە داهاتووی دەسەلاتەکانیان و هۆکارەکانی دیکەی وەك راگەیاندنێکی بە پێز بۆ هەڵبژاردن دوای رۆژی ۷/۲۰و چەندین باری دیکە لەو ناوچەدا.

۲۰۰۷/۷/۲۰ لیژنەی شەش قۆڵی تایبەت بە دۆسیەی ئەتۆمی کۆریای باکوور لە شاری پەکینی پایتەختی چینی مللی ، کۆبونەوەکانی خۆی ئەنجامدا لە پێناو گەیشتنی بە رێکەوتنێك بۆ دیاریکردنی ئەو هەنگاوانەی کە پێویستە بهاوێژرێت ، ئەویش کۆتایی هێنان بە بەرنامە ئەتۆمیەکەی کۆریای باکوور.

شایانی باسە لە رابردووش کۆریای باکوور پێنج دامەزراوی ئەتۆمی خۆی داخست ، وەك هەنگاوی یەکەم بۆ لێك هەڵوەشانەوەیان بەرامبەر بە دابین کردنی برێکی زۆری سووتەمەنی هەر وەك ڕیکەوتنەکەی مانگی ۲۰۰۷/۲ لە نێوان کۆریای باکوور و کۆمەڵگای نێوودەوڵەتی ، کە جەختی لە سەر دەکردەوە ... سەرەرای ئەوەش کۆریا پابەندی خۆی بە هەڵوەشاندنەوەی

دامەزراوە ئەتۆمیەكان دووپاتكردەوە لە وولاّتەكەیدا .

٢٠٠٧/٧/٢٠ تیمەكانی بواری جیولۆژی دارفوور لە سوودان بە هاوكاری تیمێكی گەوورە لــە زانایــانی ئەمــەریكی ، لــە ئــەنجامی پــشكنینێكی بەردەوامیانــدا بۆیــان دەركەوت ، كەوا لە ژێر خاكی ئەو هەرێمە دەریایەكی گەوورە هەیە ... كە بە زۆری كەوتۆتە ناوچە وشك هەلاّتووەكانی دارفوور.

شایانی باسە كە ئەم تیمەش بە هاوكاری مانگە دەستكردەكان توانیان ئەم دەریا ژێر زەویە بدۆزنەوە و بە پەیامێكی ئاشتیان بۆ دارفوور ناوزەند كرد و ، هیوای باشتربوونی باری ژیانی خەلكی دارفۆریان بۆ خواست . ئەم هەوڵەش بە هاوكاری بنكەی ئاسمانی ناساو وەزارەتی بەرگری ئەمەریكاو ، بە بەكار هێنانی سێ مانگی دەستكرد موژدە بە دایكبوونی ، یاخوود دۆزینەوەی دەریایەكی ئاو لە ژێر خاكی دارفوردا .

كە دەكرێ بۆ بواری كشتووكاڵی زیاتر لە ٦٠ هكتار زەوی بە كار بێنێ و باری گوزەرانی و ژێرخانی ئابووری هەرێمەكە بەرەو باشتر ببات .

٢٠٠٧/٧/٢٢ كۆچی دوایی دوا شانشینی ئەفگانستان -- محەمەد زاهر شا -- لە تەمەنی ٩٢ ساڵیدا لە شاری كابوولی پایتەختی ئەفگانستان ... شایانی باسە محەمەد زاهر لە ساڵی ١٩٣٣ پۆستی شانشینی ئەفگانستانی گرتە دەست تاكو ساڵی ١٩٧٣ . كە لە ئەنجامی كودەتایەك لە دەسەلاّت لادرا و بەرەو ئیتاڵیا رۆیشت و لە لەو وولاّتە جێ نشین بوو تاكو ڕوخاندنی رژێمی كۆمۆنیستی وجوولانەوەی تالەبان .

لە ساڵی ٢٠٠٢ بە یاوەری سەرۆكی ئەفگانستان حامد كارازی گەراوە ئەفگانستان و لە خانووە كۆنەكەی خۆی نیشتە جێ بوو تاكو كۆچی دوایی كرد . لە ماوەی دەسەلاّتی محەمەد زاهر ئەفگانستان ئارامی وئاسایشی بە خۆوە دیت ، سەرەڕای هەژاری وولاّت لە بواری ئابووری و ژێرخانی ئابووری و چەندین لایەنی دیكەدا .

بەلاّم لە دوای كودەتاكە لە ساڵی ١٩٧٣ و لە دەسەلاّت لابردنی تاكو كۆچی دوایی زاهر شا ، هەموو كات لە شەڕ و ئاژاوە وكێشە ناوخۆییەكانی ئاینی و نەتەوەیی و رامیاری و كێشەی دراوسێیەتی و ئابووری و بازرگانی و دەربەدەری لەو وولاّتە بەردەوام بوو لە ناوچەكەدا .

٢٠٠٧/٧/٢٣ رۆژنامەی خەبات لە ژمارە /٢٥٦٤ بلاوی کردەوە ، کە ماڵپەری israein بابەتێکی لە سەر جیاکردنەوەی پێك هاتەکان لە کوردستانی کلێندراو بە سووریا بلاوکردەوە ... بابەتەکە باسی لە دەربڕینی ناڕەزایی لەلایەن سەرکردەکانی کورد لە کوردستانی ژێر دەسەلاتی سووریا دەکات . دژی بەشار ئەسەدی سەرەك کۆماری سووریا و بە جیاکردنەوەی پێك هاتەکان تۆمەتباری دەکەن .

ئەمەو هەوڵەکانی ڕژێمی سووریای بەعسی جیاکردنەوەی سووریەکان لەگەڵ کوردی ئێراق ، بە گواستنەوەی بنەماڵە عەرەبەکان بۆ ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەلاتی سووریا . سەرەك کۆماری سووریا بەشار ئەسەد دەڵێ :- کورد پەیوەندیان لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمەریکا هەیە ... کێشەی نێوان کورد لە سووریا و رژێمی بەعسی لە سووریا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٠ . کە کاتێك حکوومەتی سووریا بە هۆی بڕیارەکانیەوە دژی کوردلەو وولاتەدا .

کە کوردی تووشی هەژاری و برسیەتی و دەربەدەری کرد ... لەمە بە دواوە کورد بوونە مەسەلەی سەرەکی و بەردەوام زەویەکانیان لێ زەوت دەکرا و مافی هاوولاتی بوونیان لێ زەوت دەکرا . کە بە هەزار کورد لەلایەن ڕژێمی بەعسی لە سووریا گیانی پێ لە دەست دراوە و رەوانەی زیندانیەکان کراون و بە هەزارا خێزانی لە جێگەو شوێنی رەسەنی خۆی ڕاگوێزنران وجێگەیان بە عەرەب پڕ کراوەتەوە لە ناوچەکانیان .

٢٠٠٧/٧/٢٣ بە پێ هەواڵێکی ماڵپەڕی شاشفخ thn ow lian لە دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ٢٠٠٧/٧/٢٢ لە ٢٠٠٧/٧/٢٣ لە ناوچەی سێیەمی ئەستەمبۆڵدا ....خاتوو سەباحەت تونجەلی کاندیدی سەربەخۆ . کە کوردەو لە لە گرتووخانەی کەیژەدابوو .

دوای ئەوەی کە سەرکەوتنی بە دەست هێنان ئازاد کراو چووە پەرلەمانی تورکیا .

شایانی باسە خاتوو سەباحەت تونجەلی بە تۆمەتی ئەندامبوونی لە پارتی کرێکارانی کوردستان ، دەستگیر کرابوو لە باکووری کورد\ستان ، لە هەمان کات سکرتێری گشتی پارتی بزووتنەوەی نەژاد پەرستی تورکیا --جیهان

پاچەچی – دووپاتی کردەوە لە سەر ئەوەی کە پارتەکەی بە نیازە لە پەرلەماندا لە گەڵ کاندیدە سەربەخۆکانی کوردا ململانێی توونـد بکات ...
بەگوێرەی هەواڵێکی -- ئێن تیڤی -- جیهان پاچەچی گووتویەتی:-
پارتی بزووتنەوەی نەژاد پەرستی تورکیا لە جیٚ ئەوەی کە هەوڵی ململانێی توونـد بدات ، تێدەکۆشیٚ بۆ ئەوەی لە گەڵ لایەنە جیاوازەکاندا بە تایبـەتی کوردیش ڕێکەوتن ئەنجام بدەن .
جێی ئاماژە پێکردنە کە دەووڵەت باخچەلی سەرۆکی پارتی بزووتنـەوەی نەژاد پەرستی تورکیا ، تەئکیدی کردبوو ، کە ئەندامانی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتی سەر بە پەکەکەن و پێویستە ڕێگەیان پیٚ نەدریٚ بچنە ناو پەرلەمانی تورکیا ... هەروا سەرۆکی پارتی دیموکرات لە تورکیا محەمەد ئاغار بە هۆی سەرنەکەوتنی پارتەکەی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی تورکیا لە ٢٠٠٧/٧/٢٢ دەستی لە کاری پارتایەتی کێشاوە و بڕیار درا دوای ٤٥ ڕۆژ کۆنگرەی گشتی پارتەکە ئەنجام بدرێت و سەرۆکێکی نویٚ بۆ پارتەکە هەڵبژێرن لە تورکیا.

٢٠٠٧/٧/٢٤ بە هۆی باری نا لە باری دوورگەی سۆلۆمۆن لە سەر زەریای هێمن ونەمانی توانی حکوومەتی ئەم وولاتە بە زاڵ بوونی بە سەر کێشەکان و بەردەوامی لە خۆپێشاندان و نارەزایی و بەرهەڵستکارانی حکوومەتەکە بە سەرکردایەتی -- ئالان کیماکیزا -- و ناچار بوونی بە چوونە ناو ئەو وولاتە و گەڕاندنەوەی ئارامی بۆ دوورگەکە ، حکوومەتی ئوستراليا زیاتر لە ٢٢٢٥ سەرباز و پۆلیسی ڕەوانەی ئەم دوورگەیە کرد ئەویش بە دوانزە فڕۆکەی سەربازی لە پێناو ئارام کردنەوەی بارودۆخەکە لەو وولاتەدا .
لەوکاتەشدا سەرەك وەزیرانی سۆلۆمۆن ، ئالان کیما کیزا ، بە کەشتیەك لە هۆنیارای پایتەختی سۆلۆمۆن لەو وولاتە چووە دەرەوە بە هۆی گومان

کردن لە فراندنی لە لایەن هێزە چەکدارە بەرهەڵستکارەکانی لەو وولاَتەدا .
جێگەی ئاماژە پیّ کردنە کە ئەم دوورگەیە ژمارەی دانیشتوانی ٤٥٠ هەزار کەس دەبێت و پێشوازیان لە هێزەکانی سووپای ئوسترالیا کرد لە پێناو سەقامگیر کردنی ئارامی و ئاسایش بۆ وولاَتەکە ، ئەویش بە هۆی لێکترازانی باری ئابووری و رامیاری کۆمەلاَیەتی لە ئەنجامی شەڕ و ئاژاوە لە نێوان حکوومەتی سۆلۆمۆن لە گەلّ یاخیبووەکان لەم وولاَتەدا .

٢٠٠٧/٧/٢٤ وەزارەتی دەرەوەی کۆماری بولگاریا لە ڕاگەیاندنێکیدا :- کە دەسەلاَتدارانی کۆماری لیبیا بە تایبەتی سەرۆکی لیبیا معەمەر قەزافی بریاری لێخۆشبوونی و ئازادکردنی بۆ هەر/٥ پەرستارە بولگاریەکە و دکتۆرە فەلّەستینەکەی دەرکرد . ئەمەش لە فرۆکەخانەی سۆفیای پایتەختی بولگاریا لە لایەن سەرۆکی بولگاریا و ژمارەیەك لە بەر پرسان پێشوازیان لێکردن .
ئەمەش بە فرۆکەیەکی سەرۆکایەتی فەرەنسا و بە یاوەری هاوسەری سەرۆکی فەرەنسا نیکۆلای سارکۆزی لە شاری تەڕابلسی لیبیا گواسترانەوە بولگاریا ... جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەمانە لە دوای تاوانبار کردنیان بە بلاَوکردنەوە و گواستنەوەی فایرۆسی ئایدز بۆ مندالاَنی کۆماری لیبیا تاوانبار کرابوون و بریاری لە سێدارە دانیان بۆ دەرچوو .
بەلاَم پاش ماوەیەك بریارەکە سووك کرا بۆ بەنکردنی هەتاهەتایە و دوای ئەوەی بە هۆی گفتووگۆی چڕ لە نیوان یەکێتی ئەوروپا و ، فەڕەنسا و ، قەتەر لە گەلّ کۆماری لیبیا و پالّەپەستۆی بەردەوام ، لە ئاکام گەیشتنە ئەنجامی ئەوەی . کە ئەم پەرستارانە و دکتۆرە فەلّەستینیەکە ئازاد بکرێن .
ئەم کارە مرۆڤایەتیە بووە هۆکری یەکەم یارمەتی دانی مندالاّن و خێزانەکانی مندالاَنی تووشبوو بەو نەخۆشیە لە بواری یارمەتی و چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیە ، چ بە کردنەوەی نەخۆشخانەی تایبەت لە لیبیا و ، چ بە چارەسەر کردنی مندلاَنی تووشبوو بە نەخۆشی ئایدز ، چ لە دەرەوەی وولاَت . لەلایەکی دیکە باری ئابووری و بازرگانی و رامیاری و پەیوەندی بە نێوو دەوولّەتیەکانی لیبیا لە قۆناخێك گواستەوە بۆ قۆناخێکی لە بار و گونجاوتر لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لەگەلّ وولاَتانی ڕۆژئاوا

و یەکێتی ئەوڕوپا .

٢٠٠٧/٧/٢٤ بە هۆی باری دژواری کوردستان و ئێراق ، لە بوارەکانی ڕامیاری وئابووری و بێکاری و نەبوونی مافی مرۆڤ لە ژیان ولە کار و نەبوونی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی وچارەسەر نەکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان و نەبوونی پاڵپشتی بۆ گەنجان و دەرچوانی قۆناخەکانی خوێندن و کاردانەوە وکارلێکردنی باری پارتایەتی لە سەر کۆمەڵگای ئێراق بە تایبەتی لە کوردستان و پاوانکردنی سامانەکانی گەل لە بواری سامانی سروشتی و دارایی پلە و پایە جۆراوجۆرەکان و کاردانەوەی لە سەر دەروون و داهاتووی گەنجانی کوردی و ئێراق .

ئەمەش کە بۆتە هۆی ئەوەی لە ماوەی ٢٠٠٦/١/١ تاکو ٢٠٠٦/١٢/١٣ دا ، ٩٨٤٦ کەس لە تورکیاوە لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیل سنورداش بکرێنەوە بۆ کوردستان ، کە ژمارەو شوێنی نیشتەجێ بوونیان و ، ١٠٧٩ کەس هی پارێزگای هەولێر و ، ٤١٤٦ هی پارێزگای سلێمانی و ، ١٩٩٣ هی پارێزگای دهۆك و ، ٤٤٦ هی شاری بەغدا و ، ٣٠٩ هی پارێزگای کەرکوك و ، ٩٥١ هی زاخۆ و ، ٧٥٢ هی شاری موسڵ و ، ٧٠٦ کەس هی سنورداش کراوی پارێزگاکانی دیکەی ئێراقی .

ئەمەو لەلایەنی دیکە لە ٢٠٠٦/١٢/١٤ تاکو ٢٠٠٧/٧/١٣ ، ٦٤٦٠ کەس لە تورکیاوە سنورداش کراونەتەوە بۆ کوردستان لە ڕێگەی ئیبراهیم خەلیل ئەویش ، ١٣٦٩ کەس هی دهۆك و ، ٢٠٩٤ هی سلێمانی و ، ٧٩٩ هی پارێزگای هەولێر و ، ٤٠٩ هی زاخۆ و ، ٣٠٨ هی شاری بەغدا و ، ٤٢٨ هی شاری موسڵ و ، ٣٠٩ هی شاری کەرکوك و ، ٤ هی شاری نەجەف و ، ٤ هی کەربەلا و ، ٤ هی ناسریە و ، ١٩ هی بەسرە و ، ١ هی بابل و ، ١ کەس سنورداشکراوی خەلکی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان .

واتە کۆی گشتی دەکاتە ١٦٣٠٦ کەس لە ٢٠٠٧/١/١ تاکو ٢٠٠٧/٧/١٣ سنورداش کراونەتەوە هەرێمی باشوری کوردستان... ئەم زانیاریەش بە پێی نوسراوی ژمارە/٨٢١٢٦٢ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٢/٢٥ و هەروا لە ٢٠٠٧/٧/١٣ لە ژووری بازرگانی پیشەسازی هەولێر ، وەك ناوێکی بازرگانی تۆمارکراوە و لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاسایشی زاخۆ و دهۆك بە تایبەتی لە شاری هەولێر ، زانیاری زیاتری دیکە هەن زۆربەی هەرە زۆریی

لەم بوارەدا .

٢٠٠٧/٧/٢٥ مۆرکردنی نوسراوێکی ڕێکەوتن لە نێوان حکوومەتی لیبیا و فەرەنسا ئەنجام درا ، بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی ئەتۆمی شارستانی و ئاوی دەریا و بواری سەربازی ... ئەمەش دوای ئازادکردنی تیمە پزیشکە بولگاریەکان ... هەر لە دوای ئەوە ڕێکەوتنەکە بلاو کرایەوە لە مانۆری سەربازی نێوان فەرەنسا و لیبیا و لەگەڵ چەندین بواری دیکە لە نێوان هەردوو وولات لە ناوچەکەدا .

لە هەمان کات هەنگاو نان بەرەو بەرز بوونەوەی پەیوەندی لە حکوومەتی لیبیا لە گەڵ وولاتانی دیکەی جیهان ، بە تایبەتی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ، بەریتانیا و ، یەکیتی ئەوروپا و ، بانکی نیوو دەوولەتی و ، ڕێکخراوی بازرگانی جیهان .

٢٠٠٧/٧/٢٦ ڕوودانی تەقینەوەیەکی گەوورە لە بنکەیەکی سەربازی سووری لە ناوچەی موسلمییەنی نزیك شاری حەلەب و لە ئاکامدا ١٥ سەرباز کوژران و ژمارەیەکی دیکەش زامداربوون ، ئەویش لەکۆگایەکی تایبەت بەفێرگەیەکی سەربازانی پیادە ، کە دەکەوێتە دووری ١٠ کم لە باکووری شاری حەلەبەوە ، کە بە دووەم شاری سووریا دێت لە دوای شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا .

٢٠٠٧/٧/٢٦ بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە فرۆشتنی کومپانیای ستراتیژی سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش یاسایەکی مۆرکرد ، کە بە گوێرەی ئەم یاسایە ئەمەریکا بە پێ ڕاوێژکردن بە دەزگا هەواڵگەریەکان . هیچ کۆمپانیایەکی ستراتیژی وەبەرهێنەری بیانیەکان نافرۆشێت ... چونکە بە بۆ چوونی سەرۆکی ئەمەریکا ، ئەو کۆمپانیا بەرهەمهێنەرە ستراتیژیانە بەشێکن لە گەرەنتی سەروەری و ئاسایشی ئەمەریکا .

هەر لەم بارەیەوە حکوومەتی ڕووسیای یەکگرتوو لە ٧/٢٣ پرۆژە یاسایەکی هاوشێوەی خستۆتە بەردەم پەرلەمانی ڕووسیا -- دۆما -- و هەروا وولاتانی یەکێتی ئەوروپاش بە هەمان شێوە و شێواز هەنگاویان هاوێشتووە ، ئەم کارانەش دەبێتە هۆکاری ڕێگە گرتن لە بازاڕی ئازادی بێ نەخشەو پلانی لێهاتوو لە جیهاندا.



٢٠٠٧/٧/٢٧ لـــه دوای گفتووگـــۆی بەردەوام لە نێوان هەردوو پـارتی دەسـەڵاتدار لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان ، ئـەویش بـە مـۆرکردنی ڕێکەوتنامـەی بـە نـاو سـتراتیژی بـۆ مـاوەی / ١٠ سـاڵ ، لـە شاروچکەی دوکانی سەر بە پارێزگای سلێمانی ، لە لایەن سکرتێری گشتی یـەکێتی نیـشتیمانی جـەلال تاڵـەبانی و سـەرۆکی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان مەسـعوود بـارزانی و بە بە ئامـادە بـوونی ئەنـدامانی هـەردوو مەکتـەبی سیاسـی پارتی و یەکێتی و لـە دوای مـۆرکردنی ڕێکەوتنامەکـەی نێوانیان ڕاگەیاندنی کۆتاییان ڕاگەیاند لە نێوانیاندا .
بەڵام دەقی ڕێکەوتنەکە بلاو نەکرایەوە ، ئەمەش بە پێی خواستی هـەردوو پارتی دەسەڵاتدار بوو ... ئەمەش بە دابەشکردنی دەسەڵات و پارە و سامان و ، بـەلاوە نـانی پارتـەکانی دیکـەی گۆڕەپـانی رامیـاری و نەتـەوەیی و نیـشتیمانی لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان و ، بـەلاوە نـانی ئـاوات و ئامانجـەکانی گـەلی کوردسـتان . لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان ، بـە نـاوی چاکـسازی و مـافی مـرۆڤ و ئاوەدانکردنـەوە و بـەرەو پێـشبردنی بـاری کوردستان و هەڵسەنگاندنی باری کوردستان و ئێراق و ناوچە و پەیوەندی لە گەڵ وولاتانی دراوسێی کوردستان.
کـە لـەو کاتـەی ڕژێمـەکانی ئێـراق و تورکیـا بـە توانـای هێـزی سـووپای ڕژێمەکانیان بەردەوامن لە بۆردمان کردنی سەر سنوورەکانی نێوان هـەرێمی باشووری کوردستان و ، ڕژێمـەکانیان لـە سـەر خـاکی کوردسـتان بێ ئـەوەی بتوانن هەنگاوێکی بەرچاو هـەبێ لـە تاوانبارکردنی هـەردوو ڕژێم و گـەمارۆ دانی کوردستان و دەیا کێشە و ناکۆکی و نـا لـە باری لـە هـەرێمی باشـووری کوردستاندا .

٢٠٠٧/٧/٢٧ لـە دوای چـەندین جار لـە کردنـەوە و داخستنی خـاڵی گومرگی پاشمـاخی

سەر سنووری نێوان هەرێمی باشووری کوردستان و ڕۆژهەلاتی کوردستان ، ئەویش بە کردنەوەی ئەم خاڵە سنووریە وەك مەڵبەندێکی گومرگی سنووری نێوودەوڵەتی ، لە لایەن پارێزگاری سنە و پارێزگاری سلێمانی لە ڕێوڕەسمێکی فەرمی کرایەوە ، کە ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی گرنگ لە پتە و کردنی باری ئابووری و بازرگانی و هاتووچوونی هاولاتیان ، لە هەردوو لایەنی هەرێمی باشووری کوردستان و ڕۆژهەلاتی کوردستان و ئێراق و ئێران و گەشتی هاوولاتیان بۆ جیهان .

٢٠٠٧/٧/٢٧ سکرتێری تایبەتی پاپای ڤاتیکان -- بندیکتی شانزەهەم -- جاینزفن ، هۆشداریدا ... کە دەبێت ئەوروپایەکان بێنەوەو پارێزگاری لە مەسیحیبوونی خۆیان بکەن .

جێگەی ئاماژەیە کە جاینزفن پشتگیری لەو وتارەی پاپا بندێکت کرد ، کە لە ساڵی ٢٠٠٦ لە کۆڕێکی قوتابیانی زانکۆی ئەلمانیا رایگەیاندبوو ... کە ئیسلام لە ڕێگەی توونـد و تیژیەوە بلاوبوونەتەوە و نارەزاییەکی زۆری لە ناو جیهانی ئیسلامیدا دروستکردوە ... کە ئێستاش کێشەی نێوان هەردوو ئایینی ئیسلامی و مەسیحی لە جیهان بەرەو بەرزبوونەوە هەنگاو دەنێ ، بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکەی ٢٠٠١/٩/١١ لە شارەکانی نیوروّك و واشنتۆنی ئەمەریکا .

٢٠٠٧/٧/٢٧ لە دوای ڕووداوەکەی مزگەوتی سوور لە ئیسلام ئابادی پایتەختی پاکستان و گۆڕینی باری ناوخۆی پاکستان و دروست بوونی کێشەی نێوان لایەنە ئایینیەکان ، لە گەڵ حکوومەتی پاکستان و بەرزبوونەوەی کێشەو گرفت لە بوارەکانی دەسەلاّت و سەربازی و ئابووری و بازرگانی ، بە تایبەتی بەرزبوونەوەی کێشەی نێوان دەسەلاّتی سەرەك کۆمار -- پەروێز موشەرەف -- و کۆمەڵگای پاکستان ، کە بووە هۆی ئەوەی پەروێز موشەرەف هەنگاوبنێ بۆ بەرەو باشبردنی باری وولاتەکەیان لە کێشوورەکەدا .

ئەویش بە چاوپێکەوتنی بە سەرۆکی پارتی گەلی پاکستان خاتوو -- بەنازیر بۆتۆ -- لە شاری ئەبوو زەبی و ڕێکەوتن لە سەر داهاتووی پەیوەندیان و ، لە پێناو بەرەو باشبردنی باری پاکستان و ، هەروا چارەسەر

کردنــی کێــشەکان . بــە تایبــەتی لــە دوای هەڵبژاردنــەکانی داهــاتووی سەرۆکایەتی و پەرلەمان لە وولاتەکەیاندا.

٢٠٠٧/٧/٢٨ لـە هـەرێمی – بیراکـس-- ی ڕۆژهـەلاتی مەکـسیك ١٢ هـەزار بـووك و زاوا زەماوەنـدێکی بـە کۆمـەڵیان سـازکرد ، کـە بـووە گـەورەترین زەماوەنـد لـە مێژوودا و ، بەمـەش ئـەم زەماوەندە چووە ئەنسکلۆپیدیاکەی گینیتسی بۆ ژمارە بێ هاوتاکـان , ئـەم زەماوەنـدە بـە کۆمەڵـە بەبۆنـەی ٥١٤ مین سـاڵیادی دەرچوونی یاسای خوازبێنی مەکسیکی ئەنجام درا لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە:– ڕۆژنامەی خەبات ژمارە /٢٥٧٠.

٢٠٠٧/٧/٢٨ لە لێدوانێکدا – ئەحمەد تــــورك – ئەنــــدامی پەرلــــەمانی تورکیــــا دوویاتی کردەوە لە سەر ئـەوەی کـە هـیچ یـەك لـە پەرلــــــــەمانتارە ســــەربەخۆکانی پــــارتی




کۆمـەڵگای دیمـوکراتی لـە پەرلەمانـدا بـە زمـانی کـوردی سـوێندی یاسـایی نـاخۆن . هـەروا تـورك گـووتی :– کاندیـدە سـەربەخۆکانی پـارتی کۆمـەڵگای دیموکراتی بڕیاریانداوە کارێك نەکەن کە ببێتە مایەی زیاد بوونی گـرژی و هەسـتیارییەکان و هـەوڵ ئـەوەش دەدەن کـە بـە پێـی یاسـا و ڕێـساکانی پەرلەمان بجولێنەوە .

سـەبارەت بـە مەسـەلەی هەڵبـژاردنی سـەرۆك کۆمـاری نـوێی تورکیا ئـەحمـەد تـورك گـووتی :– ئامـادەین کاندیـدە سـەربەخۆکانی پێـشاندا بۆ ئـەوەی کـە یارمەتی پارتی دادو گەشە پێدان بدەن ... بەڵام لە لایەکی دیکە سـەرۆك و ئەنـدامانی پـارتی ڕەگـەز پەرسـتی تورکیـا ، بـەوە ڕازی نیـە یـەکێك ببێتـە سەرەك کۆماری تورکیا ئیسلامی بێت ، چونکە تورکیا ڕژێمێکـی عەلمانیـەو ماوەیان پێنادرێت لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٧/٢٨ ئەنجوومــەنی نوێنــەرانی ئەمــەریکا ، یاســای بەرنگاربوونــەوەی تــیرۆری پەسەند کرد . کە یاساکە بودژەیەکی زیاتر بۆ ئەو کارانە تـەرخان دەکـات ،

کە زیاتر دووچاری هەڕەشەی تیرۆر دەبنەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە ، کە دەبێ دەسەڵاتدارانی ئەمن و ئاسایش بە وردی گشت فرۆکە و پاپۆڕە بارهەڵگرەکان بپشکنن .

ئەم یاسایەش بەکۆی / ٣٧١ دەنگ بەرامبەر / ٤٠ دەنگ ڕەزامەندی خۆی پێشاندا لە سەر یاسای بەرنگاربوونەوەی تیرۆر لە ماوەی ٤ساڵدا ، کە بڕی ٤ چوار ملیار دۆلار بۆ ئەمنی گەشتیاران تەرخان دەکرێت و ٧٥٠ ملیۆن دۆلار بۆ ئەمنی فرۆکەخانەکان و ملیارێك و ٨٠٠ ملیۆن دۆلار بۆ ئەو شارانە تەرخان دەکات ، کە زیاتر دوچاری هەڕەشەی تیرۆر دەبنەوە و سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش یاساکەی مۆر کرد .

٢٠٠٧/٧/٢٨ لە دوای ٣٠ ساڵ لە دابڕانی پەیوەندی ئەتۆمی لە نێوان هندستان و ئەمەریکا ، ئەویش بە مۆرکردنی ڕێکەوتنێکی ئەتۆمی لە بواری مەدەنیدا بە کار بێت ... لەم بارەیەوە هەریەك لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ، کۆندالیزا رایس و ، شوی برتاب مەخرەج هاوتا هیندیەکەی لە بەیاننامەیەکیاندا دوپاتیان کردەوە ، کە ئەم هەنگاوە دەبێتە هۆکارێك بۆ جێ بەجێکردنی بەڵێنەکەی سەرەك بۆش ، کە پێشتر بە سەرۆکی هندستان دابوو .

دەقی ڕێکەوتنەکەش جەخت لە سەر دابین کردنی سووتەمەنی ئەتۆمی لەلایەن ئەمەریکا بۆ هندستان دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی لە بواری ئاشتیدا بەکاری بهێنێت , ئەمەش وەك هەردوو وڵات دوپاتیان کردەوە ، یارمەتی بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی دەدات لەلایەن خۆیەوە -- نیکۆلاس پێرنز -- یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ، دوپاتی کردەوە ، کە ڕێکەوتنەکە نامەیەکی گرنگە و ئاراستەی ئەو وڵاتانە دەکات ، کە لە یاسا دەرچوون ، وەك ئێران ، کە ناوەرۆکەکەی دەڵێت ... ئەگەر بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە لە بواری خۆ پڕ چەککردن هەڵسوکەوتتان کرد و پابەند بوونی خۆتان بە یاساکانی نیشاندا ئەوا ئێوەش بۆ نموونە ئەندام لە یانەی وڵاتە ئەتۆمیەکان بانگهێشت دەکرێن لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٧/٢٨ حکوومەتی کاتی فەلەستین بە سەرکردایەتی سەلام فەیاز لە بڕیاریکدا ووشەی بەرگری چەکداری لە دژی حکوومەتی ئیسرائیل لابرد ، ئەویش لە پێناو بەرەو پێشبردنی گفتووگۆی ئاشتیانەی نێوان ئیسرائیل و دەسەلاتی

فەلەستینی بە سەرکردایەتی مەحمود عەباس لە نێوانیاندا ، ئەویش بە ئامۆژگاری و پاڵپشتی ئەمەریکا و یەکێتی ئەوروپا و ، دوای ئەوانەش کۆمکاری عەرەبی لە ناوچەکەدا بە کۆتایی هێنان بە داگیر کراوی ئیسرائیل و دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستینی لە سەرجەم ناوچەکانی کەناری ڕۆژئاواو کەرتی غەزە ، کە پایتەختی قوودس بێت و ، هەروا چارەسەری دادوەرانەی سەرجەم پەنابەرە فەلەستینیەکان ... بەلاّم بزووتنەوەی حەماسی ئیسلامی بە سەرکردایەتی خالد مەشعل ئەو بڕیارەی ڕەتکردەوە .

٢٠٠٧/٧/٢٩ ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێراق یاسای گۆڕینکاری پێکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنەکەی پەسند کرد ... کە ئامانج پڕکردنەوەی شوێنی ئەندامە مردوو یان ئەوانەی دەستیان لە کار کێشاوەتەوە ... ئەنجوومەنی نوێنەران ئەگەر لە کۆی ٦٠ دانیشتنی ئەنجومەندا لە بیست دانیشتنیدا ئامادە نەبێت ، ئەوا مافی ئەندامیەتی ئەنجوومەنی نامێنێت و دەبێت دەست لە کار کێشانەوەی خۆی ڕابگەینیٚ لە ئەندامیەتی ئەنجوومەنەکەدا .

٢٠٠٧/٧/٢٩ بە پێی فەرمانی سەرۆکایەتی هەرێم بە ژمارە /٥٢ لە ٢٠٠٧/٦/١٢ دەستەی نوێی دەزگای ئەکادیمیای کوردی ، کە پێشتر بە کۆڕی زانیاری کوردستان ناسرابوو دامەزرابوو ... کە یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لەم ڕۆژەدا لە لایەن دەستەی نوێی ئەنجامدا ... سەرەتا بە یادی -- دکتۆر ئاو رەحمان حاجی مارف -- کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئەکادیمیای کوردی لە باشووری هەرێمی کوردستان لە شاری هەولێر ، دەستیان بە گفتووگۆ کرد ... ئەم کارەش کە ماوەیەکی درێژ خایەنە و هەوڵی بۆ دراوە و بە یاسا و پرۆگرامێکی نوێی سەردەمیانە بێتە کایەوە لە هەرێمی باشووری کوردستان ، ئەویش لە پێناو پەرە پێدانی لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

٢٠٠٧/٧/٢٩ مۆرکردنی پرۆژەیەکی بازرگانی لە نێوان وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی باشووری کوردستان و لێپرسراوی تیمی سەربازی مەدەنی سووپای ئەمەریکا موقەدەم -- کریس برگر-- ... ئەویش بە مەبەستی فرۆشتنی مافوری کوردستان لە ئەمەریکا ... ئەوەش یەکەمین پرۆژەی بەرهەمهێنانە کە وەزارەتی ڕۆشنبیری ئەنجامی دەدات ... کارگەی مافورەکان لە هەرێمی باشووری کوردستان ، ژمارەیان ٧ کارگەیە و٤١٢ کرێکار کاری تێدا دەکەن

و سەر بە وەزارەتی ڕۆشەنبیرین .

شایانی باسە ئەمەریکیەکان تا وەکو ئیستا مافوریان لە وولاتانی تورکیا و ئێران و هیند و کینیا دەکڕی و کوردستانیش دەبێتە بەشێك لەو وولاتانەو بەرهەمەکەی بە ئەمەریکا بفرۆشێت و لێی بکڕێت .

۲۰۰۷/۷/۲۹ بۆ یەکەم جار لە مێژووی هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئێراقی لە یاریگای شاری جاکارتای پایتەختی کۆماری ئەندنۆسیا و بە ئامادە بوونی سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی جیهانی – فیفا -- و سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی ئاسیا و بە ئامادە بوونی ٤٥ هەزار کەس لە هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئێراق ، توانی ببێتە پاڵەوانی جامی نەتەوەکانی ئاسیا و بە سەر هەڵبژاردەی تۆپی پێی وولاتی سعوودیە سەرکەوێت .

ئەویش بە هێرشبەری تۆپی پێی ئێراق لە گێمی دووەم توانی گۆڵێك تۆمار بکات ، کە ئەمەش بەس بوو بۆ سەرکەوتنی ئێراق بە بوونی بە پاڵەوانی کیشووەری ئاسیا

جێگەی ئاماژە پێکردنە و وەبیرهێنانی گەلی کوردستانە ، کە خۆم لە ماوەی هەردوو گێمدا ، چرکە بە چرکە ئاگاداری یاریەکە بووم و لە هیچ شاشەکانی تەلەفزیۆنی ئێراقی وعەرەبی ، بە تایبەتی ئێراقی ناوی کورد و ئێراقی فیدراڵ و ئێراقی تەئاخی و برایەتی بێت تەنیا یەك جار ناوی شاری هەولێر هاتووە لەگەڵ یەکجار باسی عەرەب و کورد و تورکمان کراوە ، ئەویش بۆ چەواشە کردنی کورد و گەنجی کورد .

کە زیاتر لە ۱۰۰ جار باسی ئالای ئێراقی کردیە ، ناوی علم والعرب و ئێراق و ، ئێراقی عروبە و ، بەغدادی عروبە و ، فەریقی عەرەب و عروبە و ، تاکو کۆتایی یاریەکە ... سەیر لەوە گەنجی کورد لە گەڵ سەرکەوتنی هەڵبژاردەی ئێراق ، ئاهەنگیان گێرا تاکو دوای کاتژمێر ۱۲ی شەو بە بەرگری کردنیان لە لە ئوومەی عەرەبی و ئێراقی عەرەب و بەغدای عروبە و ئالای عەرەب و ئالای ئێراقی عەرەب ... ئا ئەمەیە کورد و هەڵوێستی کورد بەرامبەر بە گەلانی دوژمنکار لە سەرتای بوونی کورد تاکو نوسینی ئەم هەوڵە .

۲۰۰۷/۷/۲۹ گرووپێکی چەکداری بە چوار ئوتومبێل مەزارگەی دانیاڵ پێغەمبەریان لە

ناحیـەی وەجیهیـەی سـەر بـە قـەزای مقدادیـەی باكووری ڕۆژهـەڵاتی باقوبـە تەقێندرایەوە و ، تەقاندنەوەكە لە ڕێگەی دانانەوەی بۆمبی چێندراو و دواتر تەقاندنەوەكـە ، كـە بـووە هـۆی هەڵوەشاندنەوە و ڕووخانـدنی زۆربـەی زۆری بەشەكانی مەزارگەكە لە ناوچەكەدا و ، دوای ئەوەش هێرشیان كردۆتە سـەر گونـدی وەجیهیـە و لـە ئـەنجام ٥ كەسـیان كوشـت و ١٣ كەسـیان ڕفانـدوە بـۆ جێگەی نادیار.

٢٠٠٧/٧/٣٠ گەورە دەرهێنەری سویدی -- ئینگمار بریگمـان -- لـە تەمـەنی ٨٩ ساڵیدا لە ماڵەكەی خۆی لە دوورگەی – فارۆ--ی سەر دەریای بەلیك كۆچی دوایـی كرد ... شایانی باسە بیگمان تا ساڵانی دوایی تەمەنی هەركاری دەرهێنەری و هونەری كردووە و توانیویەتی لە سنووری وولاتەكەیدا خۆی تێپـەڕێنێ و ببـێ بـە دەرهێنـەرێكی بـە ناوبـانگی جیهـانی ... هـەروا لـە درێـژەی چالاكیەكانی چوار خەڵاتی ئۆسكاری وەرگرتووە جگە لە چەندین خەڵاتی بایەخداری دیكە لە جیهان .

٢٠٠٧/٧/٣٠ ڕاپـۆرتی ڕێكخـراوی چاودێری مـافی مـرۆڤ -- هیومـان رایـش ووچ -- لـە ڕاپۆرتێكیـدا بـڵاوی كـردەوە ، كـە لـە سـەرەتای سـاڵی ٢٠٠٠ تـا ئـەمڕۆ ئیسلامیەكان ، لەوانە كۆمەڵەی ئەبو سەیاف ١٧٠٠ هاوڵاتییان لـە فیلیپین كوشتووە و برینـدار كـردووە ... بـە پێـی ئاژانسـی هـەواڵی فـرانس پـرێس ، ڕێكخراوی هیومان دووپاتی كردەوە . كە ئەم ژمارەیە زیاترە لە و كەسانەی لـە كـردەوە تیرۆریستیەكانی ئەندۆنوسیای دراوسـێی لـە توندوتیژیـەكانی بالی لە ساڵی ٢٠٠٢ كوژراون ... شایانی باسە ڕاپۆرتەكە لـە ٢٨ لاپـەڕە پێك هـاتبوو ، بـە نـاوی كوشـتنی خـەڵك لـە باسێكی تێروتەسـەلی توندوتیـژی لـە ناوچـەكان میـداناو باسـیلیان و چـەند دەرگەیـەكی دیكـەی فلیپینـی تێـدا ڕوونكراوەتەوە.

٢٠٠٧/٧/٣٠ ئیدارەی ئەمەریکا لە میانەی ستراتیژیەکانیدا لە پێناو رووبەرووبوونەوەی ئێران ، هەوڵی بنکەیەکی سەربازی گەورە لە دورگەی مەسیرەی عومانی لە



کەنداو دروست بکات ... بە پێی راپۆرتی هەواڵی ئەلخیمەی عومانی ولە سایتی -- دێ بکای -- ئیسرائیلی بلاوکراوەتەوە . کە ئەمەریکا لە ستراتیژیە نوێیەکەیدا بۆ رووبەرووبوونەوەی رژێمی ئێران ، پلانێکی گەورەی دارشتووە ، کە سێ رێرە و ، یان هێل لە خۆ دەگرێت .

یەکەمیان :- فراوانکردنی هێزی ئاسمانی سعوودیە بۆ ئەوەی بە قەدی هێزی ئاسمانی ئێران بێت .

دووەمیان :- زیاد کردنی ژمارە وقەبارەی سووپای سعوودیە و کوێت وعومان و ئەردەن وئیسرائیل .

هێلی سێیەم :- بنکە سەربازیەکانی ئەمەریکا لەو وولاتانە فراوان دەکات و بنکەیەکی سەربازی گەورە لە دوورگەی مەسیرەی عومان لە کەنداو دروست دەکات ... یەکەی سەربازی پیادەی دەریاوانی مارینزی ئەمەریکا ، بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە کوێت دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی نزیك بێت لە شاری بوشەهری ئێرانی ، کە کوورەی ناووکی لێیە .

٢٠٠٧/٧/٣١ بە پێی راپۆرتێکی رۆژنامەی نیۆرك تایمزی ئەمەریکی کە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لەم ماوەیەدا زیاتر گرنگی بە پلانی سیناتۆری ئەمەریکی -- جۆزیف بایدن -- دەدات سەبارەت بە دابەشکردنی ئێراق بۆ سێ قەوارەی ، کورد و ، سووننە و ، شیعە ، لە داهاتوودا سەرەرای هەرێمی باشووری کوردستان ، کە وەك کیانێکی سەربەخۆ لە باکووری ئێراقدا هەیە ... ئەم پلانەش لەلایەن شارەزایان لە رۆژهەلاتی ناوەراستیش گرنگی

پێدەدرێت .

ئەمەش بە هۆی شكست هێنانی ئاشتەوایی لە نێوان هەردوو مەزهەب شیعە و سوونە ی ئیسلامی عەرەب و ، بەردەوام بوونی كارە تیرۆریەكان و كێشە و گرفتی دیكە ... دوای ئەوە هەر وەك لە ڕاپۆرتەكەدا هاتووە هەرێمی شاری مووسڵ و ، بەغدا و ، كەركوك ، پێك هاتەی نەتەوەیی و تایەفی جیاوازیان تیادا دەژی و دەتوانن بچنە پاڵ یەكێك لەم كیانانەی كە پێك دەهێنرێت لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٧/٣١ بۆ یەكەم جارە ئێران ئەوەی دووپاتكردەوە ، كە بڕیاری لە سێدارەدانی بەسەر دوو ڕۆژنامە نووسی كورد سەپاندووە ... بە تۆمەتی ئەوەی كە گوایە ئەوانە دوژمنی خودان ... ووتە بێژ بە ناوی دادی ئێران عەلی ڕەزا جەمشیدی ڕایگەیاند ، كە دادگای مەریوان لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان لە٢٠٠٧/٧/١٦ . عەلی عەبدولواحید یوتیمار و عەدنان حەسەنپوری بە لە سێدارەدانی دادگایی كرد ، بە ناوی ئەوەی دوژمنی خودان لە هەڵوێستەكانیاندا .

بەڵام ووتە بێژەكە ئەو تۆمەتانەی روون نەكردەوە ... هەروا گووتی:- نازانرێ دادگای باڵا دادگاییكردنەكە پەسند دەكا یا نا .

جێگەی ئامازە پێكردنە كە ڕیكخراوی پەیامنێرانی بێ سنوور سەركۆنەی سەپاندنی بڕیاری لە سێدارەدانی بە سەر دوو ڕۆژنامە نووسەكەی كورد ، لە لایەن ڕژێمی ئیسلامی ئێرانەوە دەكات .

٢٠٠٧/٨/١ سەرەك كۆماری توركیا ئەحمەد نەژدەت سیزەر بە مەبەستی پیرۆزبایی لێكردن لە سەرجەم ئەو پارتانەی سەركەوتنیان لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٧/٧/٢٢ بە دەست هێنا تەنیا پیرۆزبایی لە – دەتەپە --نەكردو داوەتی نەكردن . لە مبارەیەوە پێشوازی لە هەریەك لە دینیز بایكال سەرۆكی chp و باخچەلی سەرۆك mhp كەوت و بڕیاریشدا چاوی بە سەرۆكەكانی دیكەش بكەوێ .

جێگەی ئامازەیە كە سەركەوتنی ٢٤ كورد لە كۆمەڵگای دیموكراتی كە سەركەوتنیان بە دەست هێنا جێگەی خۆشحاڵی ڕژێمی توركیا و پارتە رامیاری و نەتەوەیی و ئایینی توركیا نیە .

٢٠٠٧/٨/١ بە بۆنەی ٨٠ ساڵەی جەژنی سووپای چینی مللی ئاهەنگێکی بێ وێنە گێردرا ، حکوومەتی کۆمۆنیستی لەم ڕۆژەدا پەیمانی دا کە هێزەکانیان ببێتە گەورەترین هێز لە جیهان ... سەرۆکی چینی مللی خۆجینتاو لە بەردەم هەزاران کس لە جەماوەری چینی گووتی :- لە گەڵ بەرەو پێش چوونی باری ئابووری و بازرگانی وولات ، هەوڵ دەدەین هێزە چەکدارەکانمان بە هێز بکەین و ببێتە هێزێکی تاکیش لە کێشووەری ئاسیا .

شایانی باسە ژمارەی هێزی سەربازی چینی ٣,٢٠٠,٠٠٠ سێ ملیۆن و دووسەد هەزار سەربازە لە هەموو بوارەکانی سەربازیدا ... پیادە و ئاسمانی و دەریایی و ، بوودژەی بەرگریش ٤٥ ملیار دۆلارە و ژمارەی خەلکی چینیش ٨,١٧٪ . گۆی زەوی داپۆشیووە لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/١ هێزەکانی سووپای دانیمارك لە ئێراق ، ئەرکە سەربازیەکانی دابە دەست هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، دوای کشانەوەی لە ناو قەزای قورنەی سەر بە پارێزگای بەسرە لە باشووری ئێراق ... جێگەی ئامازە پێکردنە کە ژمارەی سەربازە دانیمارکیەکان لە ئێراق ٦٢٠ سەرباز بوو کە لەگەڵ هێزە بەریتانیەکان لە ساڵی ٢٠٠٣ هاتنە ئێراق ، جگە لە هێزی دیکەی فرە ڕەگەزی سەربازی بە ژمارەیەکی کەم .

٢٠٠٧/٨/١ لە دوای سەرهەڵدان و گفتووگۆی نێوان بەرەی تەوافق و حکوومەتی نوری مالکی و نەگەیشتنیان بە ڕێکەوتن لە سەر جێ بە جێکردنی داواکاریەکانی بەرەی تەوافق ، بە رەسمی کشانەوەی خۆی لە حکوومەتی نوری مالکی ڕاگەیاند ... سەرەڕای بەردەوام بوونی هەوڵەکان بە تایبەتی لە نێوان هەردوو مەزهەبی شیعە و سووننەی ئیسلامی عەرەب ، کە ئێستا هاوپەیمانی شیعە زۆربەی هەرە زۆری دەسەلات و بریارەکان لە دەست ئەوانە لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٨/٢ نووسینگەی ژمێریاری سەر بە هێزەکانی سووپای ئەمەریکا بێ سەر و شوێن چوونی ١٩٠ هەزار پارچە چەکی ڕاگەیاند ، کە لە ساڵی ٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ دراونەتە هێزە ئەمنیەکانی ئێراق .

لە ڕاپۆرتێکی نوسینگەی ناوبراو روونیکردەوە ، کە سووپای ئەمەریکا

ناتوانێت چارەنووسی ١١٠ هەزار پارچە کلاشینکۆف و نزیکەی ٨٠ هەزار دەمانچە و ١٣٥ هەزار گوللە بەند و ١١ هەزارخوودە دیاریکات ... کە لە ساڵی ٢٠٠٤ سووپای ئەمەریکا بە شێوەیەکی ڕێك وپێك لیستی ئەو چەکانە و بەرواری وەرگرتن وپێدانی ڕێکنەخستووە ، هەتا ئەو یەکانەی کە ئەم چەکانەشیان وەرگرتووە .

ئەم ووتانە بنەمای نیە و ئەمەریکا هەندە گێل نیە بە دیارنەبوونی ١٩٠ هەزار پارچە چەك و ، خۆی باش دەزانی بە کێی داوە و چۆن کاری پێدەکرێت لە ئێراق .

خەبات ژمارە / ٢٥٧٤.

٢٠٠٧/٨/٢ لە ئاکامی لێکۆڵینەوەی ١٥٠ زانا و پسپۆری ڕووسی لاهووت لە کۆنگرەیەکدا ، لە نهێنی تێکنەچوونی لاشەی ڕەبەنێکی بووزی کۆڵییەوە بە ناوی – ئیتیگیلۆڤ -- کە بەر لە ٨٠ ساڵ مردبوو . پرۆفیسۆر ڤیکتۆر زڤیکیان ، لە ناوەندی پزیشکی دادوەری لە وەزارەتی تەندروستی ڕووسیا گووتی :– لاشەی ڕەبەنەکە زۆر جیاواز نییە لە لاشەی کەسێك بەر لە ١٢ کاتژمێر مردووبێت .

زاناکان لەو کۆنگرەیەدا و بەر لەوەش هەوڵیان دابوو نهێنی ئەو کۆدانە یاخوود ئەو پێشبینیانە بدۆزنەوە ، کەوا بروایە ، کە ئەو ڕەبەنە لە ناو کتێبێکدا بە زمانی مەنگۆلی کۆن نووسیبووی . بە تەماشن ئەو کۆدانە یارمەتیان بدات لە دۆزینەوەی هۆی تێکنەچوونی لاشەکەی ... ئەم ڕەبەنەش لە ساڵی ١٩٢٧ مردووە ، ئەویش کاتی دانیشتنێکی ڕامان نوێژ بە شێوەی – لۆتست – لە کاتی یوگا کردن .

لاشەکەش خرابووە ناو تابووتێکی تەختەی سنەوبەر ، کە بە خوێ داپۆشراو ... ڕەبەنەکە بە هەمان شێوەی مردنی لەو سندوقە دانرابوو ... هەندێ بوزی وایان باوەرە کە مامۆستاکەیان گەیشتبووە پلەی ئەو پەڕی ڕاستی ، یاخوود پاکیی تەواوی لەش و گیانی .

هەفتەنامەی هەولێر بە ژمارە/ ٣٦ .

٢٠٠٧/٨/٥ هێزەکانی سووپای ڕژێمی تورکیا ، کە بە درێژایی سنووری نێوان هەرێمی باشووری کوردستان و خۆی بە هەموو جۆرە زرێ پۆش و تانگ و جۆرە

چەکێك کۆنترۆڵی کردووە و دەست بە بۆردمان کردنی ناوچەکانی قەزای ئاکریێ و زاخۆ و مێرگەسۆر ، بووەتە هۆی دەربەدەربوونی بە دەیا خێزان لە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان .

جێگەی ئاماژەیە کە سووپای تورکیا بە هەماهەنگی هێزەکانی سووپای ئێران ناوچەکانی هەرێم بە بەردەوامی بۆردمان دەکەن بە ناوی ئەوەی کە چەکدارانی پەکەکە لەو ناوچانە هێرش دەکەنە سەر ڕژێمی تورکیا لەو کاتەی ، کە جمووجۆڵی -- پەکەکە -- لە ناو قولایی خاکی تورکیا و باکووری کوردستان هێرش دەکەنە سەر دام و دەزگاکانی حکوومەتی تورکیا ، لە پێناو بەرگری کردن لە مافی ڕەوای گەلی کوردستان .

٢٠٠٧/٨/٥ ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا ، پرۆژەی یاسای سیخووری کردن لە سەر پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان لە کۆنگریس پەسند کرا .

شایانی باسە بەو پێیە دەزگا هەواڵگەریەکانی ئەمەریکا مافی سیخووریکردنیان هەیە لە سەر گشت پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان ، ئەمەش بە پێی دەقی یاسەکە ، کە بەشێکە لە لە پاراستنی ئەمن و ئاسایش و وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ... ئەو یاسایە وێنەیەکی هەموار کراوی یاسایەکی هاوشێوەی خۆیەتی ، کە لە ساڵی ١٩٧٨ دەرچوو بوولە لایەن ئیدارەی ئەمەریا .

جیاوازیەکەشی ئەوەیە کە یاساکەی ١٩٧٨ تەنها بە یاداشتنامەیەکی قەزاییەوە ڕێگای بە دەزگا هەواڵگەریەکان دەدا ، کە گوێ بە پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان بگرن ... بەلام ئەم یاسا نوێیە بە کۆی ٢٢٧ دەنگ بەرامبەر بە ١٨٣ دەنگی لە ئەنجوومەنی نوێنەران پەسند کرا.

٢٠٠٧/٨/٦ لە هەولێکی پزیشکی نەشتەرگری لە ئەڵمانیا , دکتۆرەکان توانیان لە ئەنجامی نەشتەرگری لە سەر خاتوو-- مارگریت فیگنیر-- ئەنجام بدەن بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەلمانیا .



جێگــەی باســكردنە كــە خـاتوو فیگـنیر لـە تەمەنی چوارســالیدا بــە هــۆی یـاریكردن بـە پێنووسـێك لـــە رووەمەتـــەكانی روو چـــووە بـــە درێــژی دوو ســــانتیمەتر و تـــا گەیــشتۆتە نــاو ئـامێری هەستیاری لـە سەریدا لـە رێگــەی ماســوولكەكانی سەر چاوی راستەیدا .

ئــەم كـارە نەشــتەرگەریەش دوای ٥٥ ســالْ بــۆی ئــەنجام درا بــە هــۆی تووشبوونی سەر ئێشەو كار لێكردن لە سەر هەست و هۆشیدا و بۆتە هۆی هاتنە خوارەوەی خوێن لە لووتەكانیدا .

ئەم كارە نەشتەرگەریەش لە لایەن دكتۆر -- هانس بیریووم -- ئەنجامدرا بـە سـەركەوتوانە و لــە راگەیاندنێكدا گـوتی:- خـاتوو فیگـنیر لـە مـەودوا تووشـی سـەر ئێـشەو ئـازار نایـەت سـەرەرای مانـەوەی ئـەم پێنووسـە بـۆ ماوەیەكی دوور و درێژ لە ناو سەریدا .

٢٠٠٧/٨/٦ لــە بلاوكراوەیــەكی سـایدی موحیـت دا ، كـە تیمێكـی زانـای رووسـیای یــەكگرتوو بــە سەرپەرشــتی پرۆفیــسۆر -- ئیگــۆ ئۆستریتــسۆف -- پرۆژەیەكی نویْ لە بواری وزەی ئەتۆمی جیْ بە جیْ دەكەن ، كە لە توانایدا هەیــە كێــشەی پاشمــاوە ئەتۆمیــەكان چارەســەر بكــات و رێگــەش لــە بلاوكردنــەوەی چـەكی ئـەتۆمی بگرێـت ، لـەو تـەكنۆلۆژیا نوێیـەدا بە هـۆی نیترۆناتــەوە ئەتۆمـە قورسـەكانی ، وەك ســودیۆم پارچـە پارچـە بكـرێن و هەلیدەوەشێنێتەوە و بەكار هێنانی ئەو نیتروناتە و وزە بەرزەش رێگە لە بە كـار هێنـانی ئـەو پرۆژەیـە دەگرێـت بـۆ دروسـتكردنی چـەكی ئـەتۆمی لـە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/٦ گەریـدەی ئـەلمانی -- كۆنـسەر هـۆلترۆف -- تەمـەن ٧٠ ســالْ لــە گــەلْ

کورەکەی ، کە دەرچووی لیژە گەیشتنە شاری هەولێری دێرینی پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە گەریدەی ئەلمانی هۆلترۆف لەگەڵ کورەکەی لە ساڵی ١٩٩٠ لە ئەلمانیا دەست بە گەشتێك دەکەن بە سورانەوەیان بە وولاتانی جیهان ، کە تاکو گەیشتنە خاکی کوردستان ١٤٠ وولاتیان کردبوو و گەشتەکەیان تاکو ساڵی ٢٠٠٩ بەردەوام دەبێت .

گەریدەی ئەلمانی هۆلترۆف لە لێدوانێکیدا گوتی:- لەو گەشتەماندا لە دوو وولات پێشوازی گەرمیان لێکردین و چایان پێداین ، یەکەم وولاتی عوممان و دووەمیش کوردستان بوو . بڕیاری ئەم گەشتەشیان لە ساڵی ١٩٨٨ بوو بە نێوو وولاتانی جیهان .

رۆژنامەی خەبات ژمارە /٢٥٧٩.

٢٠٠٧/٨/٦ لە دوای ٨ دانیشتنی نا ئاسیی پەرلەمانی کوردستان لە هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان و پاش گفتووگۆیەکی تێروتەسەلی یاسای نەوت و گازی کوردستان پەسند کرا .

شایانی باسە لە دوا دانیشتنی پەرلەمان ، کە تایبەت بوو بە پرۆژەی یاسای نەوت و گاز . ئەویش لە سەر لایەن و دەسەلاتەکانی ناو یاساکە و خستنە رووی تێبینی و سەرئەنجامەکان ، لە لایەن ئەندامانی پەرلەمان کە پێنج/٥ مادده لە پرۆژەی یاساکە لابردران و کۆی ماددەکانی دیکەش پەسندکران .

دوای ئەوەش لە سەر داوای ئەندامانی پەرلەمان وەزیری سامانە سروشتیەکان دوو مادده بۆ پرۆژە یاساکە زیاد کرا . کە یەکێك لەو ماددانە بریتی بوو لە دانانی بەشێك لە داهاتی نەوت بۆ خێزانە شەهید وکەمینە نەتەوەیی و نابیناکان و ژینگە تەرخان بکرێت ... بەلام ئەی...؟...!.

۲۰۰۷/۸/۷ لە ڕاگەیاندنێکی زانای شوێنەواری کوێت و یۆنانیەکان ، کە دەیانەوێ پشکنین لە دوورگەی -- فیلکە -- بکەن بە دۆزینەوەی دیوار و خانوو و کەرەستە شوێنەوارەکانی



ئەسکەندەری مەکدۆنی ، کە لەو کات کەوتبووە ژێر دەسەلاتی لە ئەنجامی داگیرکردنیدا.

جێگەی باسکردنە کە دوورگەی فیلکە جێگایەکی پێشکەوتووی سەربازی هێزەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بووە ، کە ئەو جێگایە دەکەوێتە سەر تێك کردنەوەی هەردوو زێی دیجلە و فورات و چوونە ناو دەریای کەنداو لە باشووری پارێزگای بەسرا و ناو سنووری دەووڵەتی کوێت , کە لەو کاتە هێزەکانی سووپای ئەسکەندەر توانی کێشووەری ئاسیا لە سەدەی چوارەمی پێش زایینی داگیر بکات و بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی ، کە دەسەلاتی ئەسکەندەری مەکدۆنی بگرە لە چین و هیندستان تاکو وولاتی میسری ئێستاکەو ژێر دەسەلاتی , کە لەسەردەمی ئەو بووژانەوەی ئابووری و بازرگانی گەشەی سەند بوو لەم کیشووەرانەدا.

ئەم هەوڵەش لە ئەنجامی ڕاگەیاندنی وەزیری ڕۆشنبیری یۆنانی هات ، کە لە سایتی - بی بی سی -- بلاوی کردبووەوە , کە تاکو ئێستا دروستکراوەکانی سەردەمی ئەسکەندەر لەم شوێنەدا ماوە لە دیوار و خانوو دروستکراوی دیوار و پەیکەر و چەندین کەل و پەلی دیکە . ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ساڵی ۳۵٦ پێش زایینی لە دایك بووە ، کە ئەو کات مەکدۆنیا سەر بە ئیمپراتۆریەتی یۆنانی بووە و لە تەمەنی ۳۰سی ساڵیدا سەرکەوتنی باشی بە دەست هێنا بوو ، بە درێژ کردنەوەی دەسەلاتەکەی لە میسرەوە تاکو هندستان .

دوای ئەو هەموو کارانەی لە تەمەنی سی وسیٚ ساڵیدا لە وولاّتی بابل ، کە دەکاتە پاریٚزگای حیلەی ئیٚستای باشووری ئیٚراق ، بە هۆی نەخۆشی گرانە ، تا کۆچی دوایی دەکات ... هەروا ووشەی فیلکە ووشەیەکی یۆنانیەو بە مانای جیٚگەی سەربازی پیٚشکەوتوو دیٚت . هەروا ئەم دوورگەیە بەر لە ئەسکەندەری مەکدۆنی لە لایەن شارستانیەتی – دیلموون -- ئاوەدان کراوەتەوە لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٨/٧ دوای ژمارەیەك کۆبوونەوە لە سەر چۆنیەتی پوختکردنی کارە سەرەتایەکان ، بە دامەزراندنی یەکیٚتی پەرلەمانتارانی کوردستان ، ئەویش بە ئامادە بوونی هەر حەوت ئەندامی دامەزریٚنەر لە تەلاری پەرلەمان ، بە ڕاگەیاندنی کۆتایی کۆتایی بە دامەزراندنی یەکیٚتی پەرلەمانتارانی کوردستان .

شایانی باسە ستافی دامەزراندنی پەرلەمانتارانی کوردستان لە ٤ ئەندامی پەرلەمانی پیٚشووی کوردستان و ٣ ئەندامی پەرلەمانی ئیٚستای کوردستان پیٚك هاتووە ... ئەم یەکیٚتیەش لە پیٚناو دروستکردنی پەیوەندی لە نیٚوان پەرلەمانی ئیٚراق و پەرلەمانەکانی دیکەی وولاّتانی جیهان ... هەروا ئەو ئەندامەی کە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بوون لە خوولی یەکەمی ساڵی ١٩٩٢ وخوولی دووەم ، کە کاری پەرلەمانتاری دەکەن و ئەو ئەندام پەرلەمانتارانەی ئیٚراق مافی بە ئەندام بوونیان لەو یەکیٚتیەدا هەیە لە ناو ئیٚراق و کوردستاندا .

٢٠٠٧/٨/٧ لە ئەنجامی گفتووگۆی چڕو دریٚژ خایەن لە نیٚوان ڕووسیا و ئەفگانستان ، لە ئاکام هەردوو لایەن بە سەرپەرشتی وەزیری دارایی ڕووسیا -- ئیکسی کودین -- و وەزیری دارایی ئەفگانستان -- ئەنوەر ئەلحەق -- لە ڕاگەیاندنیٚکیدا ڕایگەیاند ، کە ڕووسیا لە ٩٠٪ لەو قەرزانەی کە لە سەر ئەفگانستان هەبووە لیٚی خۆشبووە ، کە دەکاتە ١١,١٣ ملیار دۆلار .

شایانی باسە ئەو قەرزەش بەر لە حکوومەتی تاڵەبانی ئیسلامی و حکوومەتی دوای تالیبان بووە ، کە بە سەر کردایەتی حامد کارازای بەڵکو ئەم قەرزە لە کاتی دەسەلاّتی دوای داگیرکردنی سۆڤیەتی پیٚشوو دیٚت ، ئەویش بە دامەزراندنی حکوومەتیٚکی کۆمۆنیستی لەو وولاّتەدا تاکو ساڵی ١٩٨٩ ، لە دوای کشانەوەی هیٚزەکانی سووپای سۆڤیەت لە وولاّتەکەدا .

ڕۆژنامەی خەبات / ١٥٧٩ .

٢٠٠٧/٨/٧ سـەرەك وەزیرانـی ئێـراق -- نـوری مـالیکی -- و شـاندێکی یـاوەری گەیشتنە تورکیا و ، لە دوای پێشوازی لێکردن لـە لایـەن وەزیـری دەوڵـەتی تورکیا -- کۆرشات تۆزمەن -- لە فرۆکەخانەی ئەسەنیۆگا و دوای ئەوە لـە گـەڵ سـەرەك وەزیرانـی ڕژێمـی تورکیـا کۆبوونـەوەی هاوبەشیان ئەنجامـدا و گفتووگـۆی نێوانیـان لـە سـەر بـار و بـوونی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان پەکەکە بوو ، دوای ئەوەش لـە سـەر پەیوەندیـەکانی نێوان ئێـراق و تورکیـا بوو لە ناوچەکەدا .

شایانی باسە لە لێدوانێکیدا نوری مالکی پەکەکەی بە پارتێکی تیرۆر شـان بـە شـانی تـیرۆر لـە ئێـراق و ناوچـە و جیهـان ناوزەنـد کـرد . کـە ئەمـەش داهـاتووی پەیوەندیـەکانی تورکیـا و ئێـراق بەرامبـەر بە کورد و کاردانەوەی ناهـەمواری دەبـێ و دوای سـەردانەکەی بۆ تورکیـا بـەرەو ئێـران ڕۆیـشت بـۆ هەمان مەبەست لە ناوچەکەدا.

٢٠٠٧/٨/٨ ستیڤن ئەلکسندەر کە هاو وڵاتیەکی تەمەن ٤٣ساڵی ئوستراڵی دوای ئەوەی کە پشیلە خۆشەویستەکەی دەمرێت و بە دیاریەوە دادەنیشێ و دەگری ، دایك و باوکیشی گاڵتەی پێ دەکەن بەمە ستیڤن تورە دەبێ و باوکەکەی کە تەمەن ٨٨ ساڵ دەبێ و دایکیشی تەمـەن ٧٧ سـاڵ دەبـێ ، هـەردووکیان بـە تەور دەکوژێ و دوای ئـەوە پۆلیس دەستگیری دەکـات و لـە بەرامبـەر دادگـا دان بە تاوانەکەی دەنێ بە کوشتنی باوك و دایکەکەیدا .

٢٠٠٧/٨/٨ بۆ یەکەم جار لە هـەرێمی باشووری کوردستان ، کارگەیـەکی دروستکردن و لێکـدانی فرۆکـە دابمـەزرێت ... شـایانی باسـە حکوومـەتی هـەرێم مۆڵـەتی دامەزرانـدنی کارگەیـەکی تایبـەت بـە دروسـتکردنی فرۆکـەی شارسـتانی لـە شـاری هـەولێر بـدات ، یـەکێك لـە سـەرمایەدارەکانی کـورد بـە هاوبەشـی بـە ڕپرسانی کورد ، کە ئەم کارگەیەش لـە سـەر ڕووبـەری ٢٠٠٠ هـەزار مـەتر لـە ناوچـەی پیشە سـازی لـە هـەولێر دەبێـت و سـەرمایەی ئـەو کارگەیـەش ١٥٠ ملیۆن دینارە ... کە ساڵانە دەتـوانی ٢٤ فرۆکە بەرهـەم بێنـی بـە مەبەسـتی خزمەت کردنی بواری پیشەسازی و ئابووری و گەشتیاری و کشتووکاڵی لـە هەرێمەکەدا .



٢٠٠٧/٨/٨ دۆزینەوەی گەورەترین ئەستێرە لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر لە گەردوندا , ئەویش بە ڕاگەیاندنی ئەو هەواڵە لە لایەن گروپی زانایانی گەردونناسی نێودەوڵەتی ، بە دۆزینەوەی ئەستێرەیەکی زەبەلاح ، کە لە دەرەوەی بازنەی ئەستێرەی دیکەی بێجگە لە کۆمەڵەی خۆر دەسووڕێتەوە .

ئەستێرەی گواستراو , واتا ئەم ئەستێرەیە لە گەردوندا وەستاوە لە نێوان ڕۆژ و زەویدا ، کە گەورەترە لە ئەستێرەی مووشتەری بەڕێژەی ٧٠٪دا کە گەورەترە لە کۆمەڵەی خۆر . ئەو ئەستێرە هەیە لە دەرەوەی کۆمەڵە , لە کۆمەڵەی هرقلّ , و دە سووڕێتەوە لە دەووری ئەستێرە ، کە دووری لە کۆمەڵەی خۆر نزیکە ١٤٣٥ساڵی ڕووناکیە .

هەروا ئەستێرەی tres4 ئەوەندە دوور نیە لە ئەستێرەی دایك ، تەنیا -- حەوت ملیۆن -- کیلۆ مەتر نەبێت و پلەی گەرمی زۆر بەرزە ، کە دەگاتە ١٣٢٧ پلەی سەدی . هەروا سوورانەوەی خۆی لە دەووری ئەستێرەی دایك بە سێ ڕۆژ و نیوو تەواو دەکات .

٢٠٠٧/٨/٨ بە ئامادە بوونی چەند وولاتێك ، کە لە ناویاندا وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ، بەریتانیا و ، فەرەنسا ، کۆبوونەوە لە پێناو سەقامگیری ئاسایشی ئێراق ، لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا لە گەڵ وولاتانی سعوودیاو ، ئێران و ،ئەردەن و ، تورکیا و ، میسرو ، کویت و ، بەحرین و ، ڕووسیاو ، چین .

هەروا نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمکاری عەرەب ... لە پێناو یارمەتی دانی گەلانی ئێراق ، بۆ ئەوەی لەو تەنگژە نائارامی ونالەبارو رامیاری و ئابووری و بازرگانی وکۆمەلآیەتیەو شەڕ وپێکدادان ڕزگاریان بێت لە ناوچەکە کە تێیکەوتوون .

٢٠٠٧/٨/٨ لە ئەنجامی کارەساتە سروشتیەکانی مانگی / ٢٠٠٧/٧ . نزیکەی ٩٠٠ هاو

وولاَتی لە چینی مللی گیانیان لە دەست دا ، ئەمەش بە پێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی جاینا دەیلی لە ٨/٨ , بە بلاَوکردنەوەی بەیاننامەیەکی وەزارەتی کاروباری مەدەنی ، لە ئەنجامی زریان ولافاوەکانی ٧١٢ هاو ولاَتی گیانی لە دەست داو ١٦٣ هاو ولاَتیش بزرن ... سەرەرای ئەو ژمارەیەش زیاترلە ١٥ ملیۆن کەسیش بێ شوێن بوون و زیانەکانیش بە ١٤ ملیار دۆلار مەزەندە کرا .

شایانی باسە ئەم رووداوە سروشتیانە ، وولاَتەکانی بەنگلادیش و ، پاکستان و ، هیندستانیشی گرتەوە ، بەلاَم بە ڕێژەیەکی کەمتر لە چینی میللی لە هەرێمەکان و کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/٨/٨ پەسند کردنی یاسای نەوت و غاز لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کاردانەوەی نەریتی لە لایەن هەندێك لایەنی ئێراقی لێکەوتەوە ، لەوانە بەیاننامەی دەستەی بە ناو زانایانی ئیسلامی مەزهەب سووننە لە ئێراق و لەو بەیاننامەیە داوایان لە کۆمپانیا بیانیەکان کرد .



کە پڕۆژەکانیان لە هەرێمی باشووری کوردستان وەگەڕنەخەن و گرێبەستی کارکردن لە گەڵ حکوومەتی هەرێمی کوردستان مۆرنەکەن ، چونکە یاساکە نارەوایە و مافی دەرچوونی دەبێ لە لایەن حکوومەتی ئێراقەوە بێت و یاساکەیان بە هەڵوەشانەوە ناوزەند کرد .

شایانی باسە کە یاساکە لە چوار چێوەی دەستوور دەرنەچووە و کوردیش مافی خۆیەتی یاسای نەوت و غازی هەبێت ، کە لە بەرژەوەندی هەموو پێك هاتەکانی گەلانی ئێراق بێت ، نەك بە تەنیا کورد و نەتەوەکانی سەرخاکی کوردستان ، کە کورد خاوەنی دەووڵەمەنترین سامانی سروشتیە و لێی زەوت کراوە و بە دەیا ساڵە ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی ئێراق و ئێران

بەرهەمی دێنن و بە چەك و تەقەمەنی و موچەی دوژمنان کورد دەدەن ، لە پێناو لە ناوبردن و ڕەشکردنەوەی کورد و ناسنامەی کورد و خاکی کوردستان ، لە هەموو بوارە جیاجیاکان بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .

٢٠٠٧/٨/٨ لە دوای گفتووگۆکانی نێوان حکوومەتی تورکیا و سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی ، بەرپرسانی حکوومەتی تورکیا لە ئەنکەرەی پایتەخت ، بە گومان بوون لە جێ بە جێکردنی بەڵێنەکان مالکی بە دژایەتیکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری کوردستان – پەکەکە – لە هەرێمەکەدا .
لە کاتی گفتووگۆی نێوان سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی و سەرەك وەزیرانی تورکیا ڕەجەب تەییب ئۆردوگان . کە نوری مالکی چەندین بەلێنی بە حکوومەتی تورکیادا بە لێدانی پەکەکە و دانەوە دەستی بەرپرسانی پەکەکە بە حکوومەتی تورکیا ... ئەم ڕێکەوتن و بەڵێنانەی لە نێوان هەردوو حکوومەتی ئێراق و تورکیا پێویستی بە یارمەتی حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان هەیە و بە بێ ئەو ناتوانری هیچ کارێك ئەنجام بدرێت ، واتە ڕێکەوتنی سێ قۆلی لە نێوان سەرەك وەزیرانی ئێراق و ، تورکیا و ، ئێران ، بەردەوامە .
یەکەم :- لە پێناو لێدانی جوولانەوەی ڕزگاری کورد لە باکووری و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای کوردستان و لە بار بردنی ئەو بارو دۆخە و پرۆسە ئازادیەی کە لە هەرێمی باشووری کوردستان هەیە.
شایانی گووتنە هەر ئەگەرێکی نا لە بار بێتە پێش جوولانەوەی کوردو سەرکردایەتی کورد لێی بەر پرسیارە لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٨/٨ گرووپێك لە زانا فەرمیکان ڕایانگەیاند بە لە ناو چوونی – دۆلڤین – لە ئاوە زلکاوەکان لە چینی مللیدا ، کە جۆری دۆلڤینەکان سپی بوو بە ناوی – بای گی – کە لە ڕووباری – بانگ تسی –

دەژین لە رۆژهەلأتی چینی مللی .
ئەمەش بە هۆی زۆری سوورانەوەی بەلەمەكان لەو رووبارانەدا و پیسكردنی ئـاوی رووبارەكـان بـە شـێوەیەكی بـەردەوام و لـە هـەمان كـات بـە هـۆی دروستكردنی سیٚ بەنداو لـە سەر رووبارەكـەدا . هـەروا بە هـۆی راوكردنـی زۆری دۆلڤینەكان ، كە ئەمـەش بەشـێكە لە لێكۆلینـەوە لـە سـەر ئـەم بارەداو دیار بوونی هۆكارەكانی لە ناوچوونی ئەم جۆرە ماسیە بە ناوی دلڤین لـە ناوچەكەدا .
هـەروا ووتـە بێـژ بـە نـاوی رێكخـراوی ژینگـە ئـەوەی دووپـاتكردەوە ، كـە نـاتوانین بـە تـەواوی لـە ناوچوونی دلڤین بسەلمێنین بۆ مـاوەی ٥٠ سـالّی دیكە ، كە بە تەواوی بزر دەبیٚ ، كە دوا دلڤین – بـای گـی – لـە سـالّی ٢٠٠٤ دیتراوە ، هـەروا ئەندامی گروپـی لێكۆلینـەوەی بـەریتانیا – سـام تـوورمن – ئـەوەی راگـەیان كـە لـە ناوچـوونی دلڤینـی سـپی كارەسـاتە ، لـە بـەر ئـەوەی جۆرێكە جیا بۆتەوە لە هەموو جۆرەكانی دیكە .
ئەویش بۆ ماوەی ٢٠ ملیۆن سالّ ، و بزر بـوونی دۆلڤین كە كۆتـایی لڤێكـی تـەواوە لـە لڤـەكانی ژیـان لـە سـەر زەویـدا ، ئێمـەش بەرپرسـیار نـین لـەو رووداوانەی كە روو دەدەن لە سەر گۆی زەویدا .

٢٠٠٧/٨/٩ گرێدانی كۆبوونەوەیەكی گەورەی سەرەك هۆز و تیرەكـانی هـەردوو وولأتـی ئەفگانستان و پاكستان لە شاری كابولی پایتەختی ئەفگانستان ، بە ئامـادە بـوونی ٦٠٠ كەسـایەتی لـە هـەردوو وولأتـدا بـە سەرپەرشـتی سـەرۆكی ئەفگانستان حامد كارازای و بـە ئامـادە نەبوونی سـەرۆكی پاكستان پـەروێز موشـەرەف و بەشـدار بـوونی سـەرەك وەزیرانـی پاكستان شـەوكەت عـەزیز لەگەلّ شاندی وولأتەكەیدا.
لە وتەیەكی سەرۆكی ئەفگانستان بۆ كۆنگرەوانان لە ژێر خیوەتێكی زەبەلاح بە ناوی -- ئەنجوومـەنی شـووری هـۆزە بەشـدار بووەكـان -- جیرجا ووتـی :– كـە هـەردوو حكوومـەتی پاكسـتان و ئەفگانـستان بـە یارمـەتی ئێـووە دەتوانریٚ چەكدار و رێكخراوی قاعیدەی سەر بە تالیبـان و ئوسـامە بن لادن لە ناو ببرێن و كۆتایی بە كێشەكان بهێنرێت و هـەردوو وولأت بـەرەو ئـارامی و بە یەكەوە ژیان هەنگاو بنیٚ .

بەڵام لە لایەکی دیکە بەشدار نەبوونی سەرۆکی پاکستان پـەرویز موشـەرەف لەو کۆبوونەوە ، هـۆی سـەرنەکەوتنی بووە , لـە بەر ئەوەی هێزەکـانی هـۆزو تیرەکانی پاکستان لـە دوای گـەمارۆی مزگـەوتی سـوور هێرشیان کـردە سـەر هێزەکانی سووپای پاکستان و ئەو ئاگر بەستەی لە نێوانیان هەبوو لە لایـەن سـەرەك هۆزەکـان هەڵوەشـێندرایەوە و بـووە هـۆی پـەلاماردانی چـەکدارانی هۆزەکان لە هەرێمی وەزیرستانی پاکستاندا .

لەگـەڵ ئەوەشـدا چاودێران وای بـۆ چـوون ، کـە ئـەم کۆبوونەوەیـە هـەولێکی باشە بۆ ئارمکردنەوەی بارودۆخەکە ، گەر سـەرکەوتن بـە دەسـت بێنـێ بـەلام ئەمـە مەحاڵـە لەگـەڵ سـەرەك هـۆزو تیرەکـان و بـاری نـاوخۆ و دراوسـێیەتی هـەردوو وولات و کاریگـەری ڕێکخـراوی قاعیـدەش لـە سـەر بـاری هـۆزو تیرەکانی ئەم دوو وولاتەدا .

٢٠٠٧/٨/٩ لـە کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەوانیـدا سـەرۆکی ئەمـەریکا -- جـۆرج بـۆش -- هۆشداریدا بە سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی بەوەی کە ئاسانکاری بۆ رامیاریەتی ڕژێمی ئیسلامی ئێران دەکات لـە ئێـراق ,سەرەڕای ئـەوەش ، کـە ئێران بەڵێنی بە ئێراق داوە کە ئاسانکاری بۆ دەسەلاتی ئێراق بکات بە بەرە و باشبردی باری ئارامی و ئاسایش لە وولاتەکەدا .

ئـەم لێدوانـەی سـەرۆکی ئەمـەریکاش لـە دوای گفتووگـۆی نێـوان سـەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی و بەرپرسانی ئێران هـات لـە تارانی پایتـەختی ئێران . هەر لە ووتەکانی سەرۆکی ئەمەریکا گووتی:-

ئێمـە نامـەمان ئاراسـتەی حکوومـەتی ئێـران کـردووە لـە ڕێگـەی بـالوێزی ئەمـەریکا لـە ئێـراق -- رایـان کرۆکـەر-- بـەوەی کـە ئەگـەر ئێـران چـەك و تەقەمـەنی بـۆ تیرۆرسـتان و کەسـانی ئیـسلامی توونـدرەو رەوانـە بکـات لـە ئێراق ، دوا ڕۆژی بەرەو خراپی دەچێ لە ناوچەکەدا .

ئـەویش بـە کوشـتنی ئەمەریکیـەکان , هـەروا گـووتی :- رەوانـە کردنـی ئـەم چەکانە بۆ پارت و گروپە ئیسلامیە شیعەکان و سوونەکانی ئێـراق دەبێتـە هۆی زیاتر شێواندن و ئاڵۆزکردنی باری ناوخۆی ئێراق لە هەموو بوارەکاندا . لەوکاتەشـدا کـۆنگرەی -- لیژنـەی هاوکـاری و هەماهـەنگی ئاسایـشی وولاتانی دراوسێی ئێراق -- کۆتایی هاتبوو لە شاری دیمەشقی پایتـەختی

سووریا ، به بەشداری كردنی چاودێرانی هەر پێنج وولاّتی گەوورە ، بە ڕێكەوتن لە سەر هەنگاونانی بەرچاو لە نێوانیاندا ,بە گرێدانی كۆبوونەوەی شارەزایانی سنووری لە ئێراق و دراوسێكان , بە چاودێری سنووری لە ئێراق و لەگەڵ وولاّتەكانی سووریا و ، سعوودیە و ، كوێت و ، ئێران و ، توركیا ، لە پێناو ڕێگە گرتن لە نەچوونە ناو خاكی ئێراق و بەرەو باشی بردنی باری ئێراق لە هەموو بوارەكان ، بە تایبەتی لە بواری ئەمنیدا.

٢٠٠٧/٨/١٠ جێگری وەزیری بەرگری ڕووسیای یەككگرتوو -- ئەلیكسەندەر بیلوسۆڤ -- لە ڕاگەیاندنێكیدا گووتی :- حكوومەتی ڕووسیا پلانی داناوە بۆ ئەوەی تاكو ساڵی ٢٠١٢ چەكە كیمیاویەكانی خۆی لە ناو ببات .

هەروا گووتی :- حكوومەتی ڕووسیا بارێكی باش باشی بۆ ڕەخساوە بۆ ئەوەی لە قۆناخی یەكەمدا تا ساڵی ٢٠٠٩ ، ١٨,٥ تەن لە یەدەگی چەكە كیمیاویەكانی خۆی لەناو دەبات , كە ئەمەش ڕووسیا بەرەو بارێكی دیكەی باشتری سەربازی دەبات لە لایەن بوارەكانی دیكەی سەربازی سەردەمی لە وولاّتەكەدا .



٢٠٠٧/٨/١٠ دەست پێكردنی مانۆڕێكی سەربازی گەوورەی بێ وێنە لە نێوان ڕووسیای یەككگرتوو و چینی مللی ، لە ناو چوار چێوەی ڕێكخراوی – شەنگەهای – لە گەڵ ئەوەشدا چوار وولاّتی ئاسیایی بەشداریان تێدا كرد ئەویش:- ئۆزبەكستان و ، كازاخستان و ، كرگیزستان و ، تاجیكستان لە كیشووەرەكەدا.

لەم مانۆڕە سەربازیەدا نزیكەی ٦٠٠٠ هەزار سەرباز لە هێزەكانی سووپای ئەو وولاّتانە بەشداریان تێدا كرد , كە نزیكەی ٢٠٠٠ هەزار سەربازی ڕووسیا و ١٧٠٠ سەربازی چینی مللی ، بەشداریان تێدا كرد , بە بەكارهێنانی زیاتر لە ١٠٠٠ تانك و زرێ پۆش و فرۆكە و چەك و تەقەمەنی جۆراو جۆری دیكەی نوێی سەردەمیانە لەو مانۆڕە سەربازیە لە نێوانیاندا .

ئەم مانۆرە سەربازیەش لە ناوچەکانی شاری -- ئۆرۆمتش -- چینی وکەرتی -- تشیلیابینسك -- ی ڕووسیای یەکگرتوو ، بە بەردەوام بوونی تاکو ٨/١٧ی هەمان ساڵ . ئەم مانۆرە سەربازیەش بە ناوی مانۆری -- هەوڵەکانی ئاشتی /٢٠٠٧ ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەم مانۆرە سەربازییەی نێوان چین و ڕووسیا و هەر چوار ووڵاتی دیکەی ئاسایی بووە ، جێگەی ناڕەزایی ووڵاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی ئەمەریکا و تایوان .

جێگەی باسکردنە کە بە هەمان شێووە و شێواز یەکەم مانۆری سەربازی لە نێوان چین و ڕووسیا لە ساڵی ٢٠٠٥ ئەنجامدرا ، ئەویش بە مەشق پێکردنی سەربازەکان بە فێکردنی هەر شارێك و ناوچەیەك کە لە لایەن تیرۆرستان داگیر دەکرێت بە ڕزگار کردنی لە نێوانیاندا .

بەلاٌم ئەمەریکا ئەوەی وا ناوزەند کرد ، کە بە هێزکردنی ڕێکخراوی شەنگەهایە کە بە بەناوبانگترین ڕێکخراوی سەربازی دادەنرێت لە هەرێمەکەدا . ئەمەش لە دوای ڕێگە پێدانی ، ئێران و ، هند و ، پاکستان و ، ئەفگانستان و ، مەنگۆلیا ، بە بوونیان بە ئەندامی چاودێر لەو ڕێکخراوەیەدا .



٢٠٠٧/٨/١٠ سەرەك وەزیرانی کەنەدا لە ڕاگەیاندنێکیدا دووپاتی ئەوەی کردەوە ، کە خاوەنداریەتی جەمسەری باکووری بەستەڵەك خاوەنداریەتی هی ووڵاتەکەیتی , ئەمەش لەو کاتە هات کە سەرەك وەزیرانی کەنەدا -- ستیڤی هاربر -- سەردانی ناوچەکەی کردبوو لە دوای چەند ڕۆژێك بە هەمان هەنگاو ، کە ڕووسیای یەکگرتوو هەنگاوی بۆ نابوو لە ناوچەی جەمسەری باکووری بەستەڵەکیدا.

ئەم سەردانەی سەرەك وەزیرانی کەنەدا لە دوای کارەکانی ڕووسیا هات کە دەریاوانەکانی ڕووسیا توانیان ئالاٌی ووڵاتەکەیان بچێنن بە قووڵی ٤٢٠٠

مەتر لە ژێر بەفردا لە جەمسەری باکوور, کە ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی کێشەی گەرم لە نێوان ڕووسیا و کەنەدا .

هەروا لە لایەکی دیکە کێشە لە نێوان کەنەدا و ئەمەریکاش سەری هەڵدا لە بارەی داهاتووی ، بە ناوی ڕێگەی باکووری ڕۆژهەلات , کە ڕێڕەوێکی ئاوی بەستەڵەکیە و هەردوو زەریای ئەتلەسی و هێمن بە یەك دەبەستێتەوە و ئەمەریکا دەلێت ، ئەم تەنگەبەرە نێوو دەووڵەتیە , بەلاّم سەرەك وەزیرانی کەنەدا گووتی:- ئەم خاوەنداریەتیە هی کەنەدایە . سەرەرای ئەوەش ئەم ناوچە لە ژێر چاودێری بەردەوام دایە لە لایەن ئەو سێ وولاّتەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەم کێشەیەش لە دوای ئەوە دێت ، کە بەفرو شاخە بەفریەکان بە ڕێژەیەکی زۆر دەتوێتەوە بە هۆی گۆرانکاری لە باری کەش و هەوادا و دەرکەوتنی جێگەی بە پیت لەم ناوچەدا بۆ بواری ئابووری و بازرگانیدا .

٢٠٠٧/٨/١٠ لە ڕاگەیاندنێکی وەزارەتی نەوتی ئێراقدا ، ئەویش بە مۆرکردنی پەیماننامەیەکی نێوان ئێراق و ئێران ، لە سەر دروستکردنی لوولە نەوتێك بۆ گواستنەوەی نەوت و بەرهەمە نەوتیەکانی ئێراق بۆ ئێران ، لە بەندەری بەسرەی باشووری ئێراق بۆ بەندەری بەندەری عەبادانی باشووری رۆژئاوای ئێران . ئەویش لە پێناو پالاّوتنی و ڕەوانە کردنەوەی بۆ ئێراق ، بە بەرهەمەکانی بەنزین و نەوت و گاز و ڕۆن و چەندین بواری دیکە . لە نێوان هەردوو وولاّت ئەمەش بە هۆی باری نا لە باری ئێراق دێت لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٨/١٤ لە ئاکامی ئەو لافاوەی کە بە هۆی باران بارینی وەرزیەوە کۆریای باکووری گرتەوە ، بە سەدان هاوولاّتی ئەو وولاّتە گیانی لە دەستدا و شوێنبزر بوون ، لە هەمان کات زیانێکی زۆریش بە ژێرخانی ئابووری ئەو وولاّتە لە رووی وێستگەکانی وزەو تۆرەکانی گەیاندن و دار و درەخت کەوت و زیاتر لە ٣٠ هەزار خانووش ژێر ئاو کەوتن و چەندین بواری دیکەش وەك زیان لێکەوتنی ٨٠٠ باڵەخانە و ٥٤٠ پرد و ٧٠ هێڵی ئاسنینی لە وولاّتەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە کۆریای باکوور بە هۆی گەمارۆی ئابووری بە سەر سەپاندنی لە لایەن ئەمەریکا و کۆریای باشوور وولاّتانی هاوپەیمان لە بواری ئابووری و بازرگانی ، کاری کردۆتە سەر بە هۆی بوونی چەکی

ئەتۆمی ئەو وولاّتە و بوونی ڕژێمێکی کۆمۆنیستی و چەندین لایەنی دیکەی ڕامیـاری پەیوەنـد بـە نێـوو دەوولّەتیـەکان لـە دوورگـەی کۆریـا لـە کیشوووەرەکەدا .

٢٠٠٧/٨/١٤ لە دوای هەولّ و کۆششێکی زۆر لە ناو پارتی لیکودی ئیسرائیل و لە کـۆنگرەی پارتەکـەدا ، دووبـارە سـەرەك وەزیرانـی پێـشووی ئیسرئیل -- بنیامین نەتەنیاهۆ-- بە سەرۆکی پارتەکە هەلّبژێردرا بە ڕێـژەی ٧٣٪ . دەنگـی ئەنـدامانی پـارتی لیکـودی ئیـسرائیل ، بەرامبـەر بەرهەلّـسکاری موشـیە فیجلین -- بە ڕێژەی ٢٣ ٪. ڕای دەنگی ئەندامانی پارتی لیکودی ئیسرائیل .



جێگەی باسە کە بنیامین نەتەیناهۆ لە سالّی ١٩٤٩ لە شاری تەل ئەبیب لە دایك بووە . هەروا لە سالّەکانی ١٩٦٧--١٩٧٣ لە ڕیزی سەربازی خزمەتی کردووە , لە سالّی ١٩٨٤ بووتە بالّوێزی ئیسرائیل لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان , لە سالّی ١٩٨٨ بووەتە ئەندامی کەنیسەی ئیسرائیل , لە سالّی ١٩٩٦ بووەتە سەرەك وەزیرانی حکوومەتی ئیسرائیل , لە سالّی ١٩٩٩ لە هەلّبژاردن سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا ، لە سالّەکانی ٢٠٠٢-- ٢٠٠٣ بووتە وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل , لە مانگی/ ٢٠٠٣/٢ تاکو مانگی/ ٢٠٠٥/٨ بووەتە وەزیری دارایی ئیسرائیل .

دوای ئەوە لە مانگی/ ٢٠٠٥/١٢ بووەتە سەرۆکی پارتی لیکودی ئیسرائیل , هەروا پارتی لیکود لە ماوەی خەباتیدا لە ئیسرائیل توانیویەتی سەرکەوتن و هەلاّتن بە دەست بێنیّ بە پێی باری ناوخۆ و دەرەوەی دەوولّەتی جوولەکە لە ئیسرائیلدا .

٢٠٠٧/٨/١٤ لە ئەنجامی تەقاندنەوەی دوو ئوتـــــــــومبێلی مینرپێــژکراو لــە هــەردوو گونــدی -- گرعــوزێر ، سیپا شێخ خدر-- سەر بـە قــەزای شــەنگال لــە هـــــەرێمی باشـــووری کوردســـتان . کــە بــووە



هـۆی شـەهید کردنـی زیـاتر لـە ٨١٠ هـاو وڵاتـی و زامـدار بـوونی بـە دەیـا هاووڵاتی لەو هەردوو شوێنەدا .

جێگــەی باســکردنە کــە دوای ئــەم ڕووداوە دڵتەزێنــەی کــە بەرامبــەر بــە دانیـشتووانەکە کرا ، کە کوردن و هـەڵگری بڕوای ئاییني یەزیـدین و تـاکو ئێـستاش سـەر بـە پارێزگـای مووسـڵە و نـە گەڕێندراوەتـەوە سـەر هـەرێمی باشووری کوردستان .

هەر بە بۆنـەی ئـەم کارە نامرۆڤایەتیە ووتـە بێژی سـەربازی هێزەکانی فرە ڕەگـەزی لـە ئێـراق ڕایگەیانـد ، کـە ووڵاتـی سـووریا و ڕژێمـی بەعـسی لـە سـووریا دەسـتی بـەو کـارە تیرۆرسـتیە نـا مرۆڤایەتیـەدا هـەبووە ، لـە پێنـاو نانـەوەی ئاژاوە و جـێ بە جـێ نـەکردنی مـادەی/١٤٠ وئـاڵۆزکردنی زیـاتری باری ئێراق و نانـەوەی تەنگـەژە لـە نێـوان حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و حکوومــەتی ئێـراق و کـورد و عــەرەب و دەسـت تێـوەردانی لـە کـارو بـاری ناوخۆی ئێراقدا .

هەروا بە هـۆی ئـەم کارە دڵتەزێنە سـەرۆکی ئەمـەریکا جۆرج بـۆش لـە ٨/١٩ بروسـکەی ماتـەمینی بۆ گـەلی کورد و کوردە ئێزیدیەکان ناردو لە هـەمان کـات ڕەخنـەی لە دەسـەڵاتی سـەرەك وەزیرانـی ئێراق نوری مـالکی گـرت و بـەوەی ناوزەنـد کـرد ، کــە کەمتەرخەمــە لــە جــێ بــە جێکردنـی پڕۆگرامــەکانی لــە هەردوو بواری ئارامی و ئاسایش لە ووڵاتەکەدا .

هــەروا ئەمینــداری گــشتی ڕێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان لــە ٨/١٧ بروسـکەی ماتـەمینی بـۆ سـەرۆکی هـەرێم و سـەرەك وەزیرانـی ئێـراق ڕەوانـە

کرد و پشتگیری و هاوکاری ڕێکخراوەکەی دوپاتکردەوە بە ڕێگە گرتن لە تیرۆرستان لە ئێراقدا.

هەر بە هۆی ئەم کارەساتە سەرەك وەزیرانی ئێراق لە ٨/١٦ ، ٩٥٠ ملیۆن دیناری پێشکەش بە خانەوادەی شەهیدان و بریندارانی کارە تیرۆریستیەکە کرد ، لەو کاتەی کە سەردانی ئەو دوو شوێنەی کرد لە گر عوزێر و سیپان شێخ خدری سەر بە قەزای شەنگال لە هەرێمی باشووری کوردستان .

٢٠٠٧/٨/١٥ ڕێکەوتنی وولاتەکانی ، میسر و ، سووریا و ، ئوردن و ، لوبنان بە گۆڕینی بۆریە گازەکانی عەرەب بە بەستنەوەی بە تۆری عەرەب بە گواستنەوەی گاز لەگەڵ تۆری ئەورووپیدا لە دوای ڕەزامەندی ئێراق بە چوونە ناو ئەو تۆرە بە شێوەیەکی فەرمی .

دوای ئەوە وەزیرەکانی نەوت و گازی ، سووریا و ، لوبنان و ، ئوردن و ، میسر ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی کە شوێن و جێگەکان دیار بکەن و لە هەمان کات بە بەشداری وەزیری وزەی تورکیا , ئەویش بە هەناردەو هاوردەی گاز بۆ ئەو وولاتانە و بەستانەوەی هێڵی بۆری لە نێوان ئەو وولاتاندا ، بە پێی پێویست لە تۆری هێڵی بۆری ئەورووپیدا .

٢٠٠٧/٨/١٦ کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەی لووتکەی بالای سەرکردەکانی وولاتانی ئەندام لە ڕیکخراوی شەنگەهای لە شاری بەشکیك-ی پایتەختی کیرکیزیا , لە لایەن سەرۆکی ڕووسیا و ، کرکیزیا و ، چینی مللی و ، ئۆزبەکستان و ، تاجیکستان و ، کازاخستان . لە گەڵ سەرۆکی ئێران و ، ئەفگانستان . کە ئەم دوو وولاتە ئەندامی چاودێرن لەو ڕێکخراوەیەدا ، لە گەڵ هندستان و ، پاکستان و ، مەنگۆلیا . بە مۆرکردنی هەشت ڕێکەوتن ، لە بوارەکانی هاوکاری و ئارامی و ئاسایش وسەربازی , دوای ئەوە ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان لە بنیاتنانی جیهانێکی هەمە جۆری جەمسەری لە جیهاندا .

سەرکردەکانی ئەم وولآتانە هەوڵەکانیان لە پێناو بەهێزکردن و سەرکەوتن بوو ، لە پێناو بە جێ گەیاندنی ڕێکەوتنەکانیان سەرەڕای ڕەخنە لێگرتنیان لە لایەن وولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و وولآتانی دیکەی هاوپەیمانی ئەمەریکا لە جیهاندا . بە هۆی ئەوەی کە ئەم وولآتانە داوایان لە ئەمەریکا کردووە ، کە بنکە سەربازیەکانی لە هەرێمی ئاسیای ناوەند بکێشێتەوە لە دوای کارەساتەکەی ٢٠٠١/٩/١١ کە بەرامبەر ئەمەریکا ئەنجامدراوە ، هەر بەو هۆیەش ئەم بنکە سەربازیانەی دامەزراندووە لە کیشووەرەکەدا.

ڕاگەیاندنی سەرۆکەکانی ئەندام لە ڕێکخراوی شەنگەهای بە دیارکردنی هەشت بەڵگەنامە و ناوزەند کردنی ئەم کۆبوونەوە بە ڕاگەیاندنی بە شکیك ، کە ڕەخنەی لە یەك جەمسەری دەسەلآت گرت کە ئەمەریکا بەڕێوەی دەبات لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/١٦ لە ڕاگەیاندنێکی سەرۆك کۆماری فەنزویلا – هۆگۆشافێز--گووتی:- پلانێك لە بەر دەستدایە بە هەموارکردنی دەستووری وولآتەکە بۆ ئەوەی بتوانێ بۆ چەندین خوولی سەرۆکایەتی کردنی فەنزویلا خۆی هەڵبژێرێ .



جێگەی باسکردنە کە بە پێی دەستووری فەنزویلا هۆگۆشافێز دەبێ لە ساڵی ٢٠١٢ کۆتایی بە پۆستی سەرۆکایەتی بێ و خۆی هەڵنەبژێرێ بە سەرۆکایەتی وولآتەکە . بەلآم هەموار کردنی دەستوور چەندین مادده و بڕگە و خاڵ لە خۆ دەگرێ ، بە گرتنە دەستی سەرۆکایەتی کردنی شارەوانیەکان لە فەنزویلادا .

هەروا سەرۆکی فەنزوێلا شافێز ئەو ڕەخنە ئاراستکراوانەی کە ڕووبەڕووی ببووەوە ڕەتی کردەوە و گووتی:- داهاتویەکی ڕووناك بەرەو ئاییندەی فەنزویلا هەنگاو پێدەنرێت لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

هەروا گوتی:- ئەو هەموارکردنانە هەڵوەشاندنەوەی چەندین جارە بە خۆ

پالاوتنی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی فەنزویلا و زیادکردنی ماوەی دەسەلاتی سەرەك كۆمار لە ٦ ساڵ بۆ ٧ ساڵ و دیاریکردنی کاتی کاتژمێری کارکردنی ڕۆژانە بە ٦ کاتژمێر کارکردن بۆ کرێکاران لە دام و دەزگا حکوومیەکان و کەرتی تایبەت و تێکەڵاو لە فەنزوێلا و بە هێزکردنی دەسەلاتی دەووڵەت لە سەر باری ئابووری بوونی دەسەلات لە سەر کۆمپانیا تایبەتیەکان ، بەر لە مۆڵەت وەرگرتن لە دادگادا . هەروا ئەو ڕشاگەیاندنەی شافێز لە کاتی ووتارەکەی بوو بەرامبەر ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتیمانی فەنزوێلا , بە چاوەڕوانکردنی بە هەموار کردنی دەستوور لە چەند مانگی ئایندەدا .

لەو کاتەشدا بە هەزارا کەس لە لایەنگرانی شافێز لە بەردەم کۆمەڵەی نیشتیمانی پیرۆزباییان لە شافێز دەکردو یادی شۆڕشگێر و قارەمانی وولاتەکە پۆلیڤار بەر لە ٢٠٠٠ ساڵ دەکردەوە لە وولاتەکەدا.

٢٠٠٧/٨/١٦ لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق -- سەرەك كۆماری ئێراق جەلال تالەبانی و ، سەرۆکی هەرێمی کوردستان مەسعوود بارزانی و ، سەرەك وەزیرانی ئێراق نووری مالکی و ، جێگری سەرەك كۆمار عادل عەبدولمەهدی -- ڕێکەوتنی چوار قۆلیان مۆر کرد .



ئەم ڕێکەوتنامەیەش خۆی لە چەندین خاڵ گرتبوو لە پێناو بەرەو باشبردنی باری ئێراق ، لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ڕامیاری و ئابووری و بازرگانی و کۆمەلایەتی ، بە تایبەتی باری ئارامی و ئاسایشی ئێراق و هەماهەنگی بەردەوام لە پێناو جێ بە جێکردنی مادەی/ ١٤٠ ی دەستووری ئێراق ، لە پێناو ئاسایی کردنەوەی ناوچە کێشە دارەکان و یاساکانی نەوت وگاز و پێشمەرگە و هاوکاری زیاتر لە نێوان حکوومەتی فیدراڵی و حکوومەتی هەرێمی کوردستان .

ئەویش بە ڕێگە گرتن لە هەوڵە تیرۆریەکان و پەیوەندی لە نێوان ئێراق و

وولاّتانی دراوسیّ ، بە پێی بەرژەوەندیە گشتیەکان ، هەروا بەردەوام بوون لە سەر خزمەتکردنی گەلی ئێراق ، بە یاساکانی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی بە پێی دەستووری هەمیشەیی ئێراق , هەروا بەردەوام بوون لە کۆبوونەوەی هەفتانە و ، یاخوود خولی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی و سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران .

هەروا بە یەك بوونی هەلّویستی یەکگرتوو لە کاتی سەرهەلّدانی کێشەی زیاتر و لە پێناو بە ئامانجگەیاندنی گەلانی ئێراق بە مافە رەواکانیان لە مەزهەبە ئایین و نەتەوە و رەگەز و بەقەرارکردنی ئازادییە سەرەکیەکانی گەلانی ئێراق لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

بەلاّم دوای ئەوە لیستی بەرەی تەوافووقی ئێراق رەخنەی لەو رێکەوتنە چوار قۆلیەی نێوان هەردوو پارتی کوردی یەکێتی و پارتی و هەردوو پارتی عەرەبی ، پارتی دەعوە و ئەنجوومەن بالاّی شۆرشی ئیسلامی مەزهەب شیعە گرت لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٨/١٦ هێزەکانی سووپای رژێمی ئێران و تورکیا ناوچەکانی سەر سنووری نێوان تورکیا و ئێران و هەرێمی باشووری کوردستان بە هەماهەنگی هاوبەشیان بۆردومان دەکەن ، بە تۆپی قورس و درێژ هاوێژ ... بەر لەوەش هەردوو رژێمی داگیرکەری خاك و گەلی کوردستان بەردەوام بوونە لە بۆردمان کردنی دانیشتووانی ناوچەکانی پشدەر و قەندیل و قەلاّدزیّ و پێنجوین لە پارێزگای سلیمانی و ناوچەکانی مێرگەسۆر و ئاکریّ و زاخۆ لە پارێزگای دهۆك و لە هەمان کاتیش رژێمی سووریا بە شێووە و شێوازێکی دیکەی نویّ ناوچە کوردیەکانی ژێر دەسەلاّتەکەی بە عەرەبکردن دەکات ، بە پێی خواست و ویستی ئوومەی عەرەبی و ئوومەی ئیسلامی لە سەر خاکی کوردستاندا .

٢٠٠٧/٨/١٧ لە مانۆرێکی سەربازی هاوبەش لە نێوان رووسیای یەکگرتوو و چینی مللی ، لە ناوچە چیاکانی ئۆرالی رووسیا بە



بەشداری ٦٠٠٠ هەزار سەرباز بە چەك و تەقەمەنی نوێی سەردەمیانە لە هەموو بوارەكانی سەربازی ، بە ئامادە بوونی سەرۆكی ڕووسیا -- ڤلادمێر پۆتین -- و سەرۆكی چینی مللی -- خۆگینتاو -- لە گۆڕەپانی مانۆرە سەربازیەكەدا .

ئەم مانۆرەش یەكەم مانۆرە كە بەم جۆرە ئەنجام دەدرێت لە شارۆچكەیەكی كە گوایە یاخی بووەكان دەستیان بە سەر داگرتووە لە پێناو تاقیكردنەوەی توانای هێز و سەربازەكانی ڕووسی و چینی بۆ ئەگەری هەر ڕووداوێك لەم جۆرەدا . كە هاوكاری ڕووسیا و چینی گەیشتۆتە ئاستی ڕاستەقینە و دیاریدەیەكی بەرچاوە بەرامبەر بە وولاتانی جیهان ، بە تایبەتی پەیمانی ناتۆ لە نێوان وولاتانی سەرمایەدار لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/١٧ لە دوای جێهێشتنی و بەشداری نەبوونی هەردوو لیستی بەرەی توركمانی و گردبوونەوەی عەرەب لە ٣/٢٩ی هەمان ساڵ ، لە كۆبوونەوەكانی ئەنجوومەنی پارێزگای كەركوك , دوای ئەوەی هەوڵێكی زۆر درا بەگەڕانەوەیان و ئەوانیش مەرجێكیان دانا بە وەرگرتنی پۆستێكی سیادی لە كارگێری پارێزگای كەركوك ، كە پۆستە سیادەكانیش -- پارێزگار ، سەرۆكی ئەنجومەنی پارێزگا ، قائمقام .

كە ئەم پۆستانەش مافی ئەوانی پێوە نیە ، لە بەر ئەوەی هەردوو لیستی بەرەی توركمان و گردبوونەوەی عەرەب پۆستی جێگری پۆستە سیادەكانیان بە دەستە و تەنیا نانەوەی كێشە و گرفتە لە بەردەم چارەسەر نەكردنی كێشەكانی دیكە و بەرەو پێشبردنی باری پارێزگای كەركوك لە هەموو بوارەكانیدا .

٢٠٠٧/٨/١٧ تێپەڕ بوونی چارەگە سەدەیەك بە سەر دروستكردنی یەكەم كاسێت لە لایەن كۆمپانیای_فلیپس -- ی ئەلمانیا , كە ئەمەش



لە دوای شۆرشێكی مەزن كە جیهانی مۆزیكای هەژاند . ئەم كارەی

کۆمپانیای فلیپس بووە هۆی ئەوەی کە ٢٠٠ ملیۆن سیدی بفرۆشێت لە بازارەکانی جیهاندا و تاکو ئێستاش یەکەم ڕێگایە سەرەرای بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای نوێ لە جیهاندا .

جێگەی باسکردنە کە هەردوو کۆمپانیای فلیپس و سۆنی دەستیان کردووە بە پەرەپێدانی ئەو سیدیە لە ساڵی ١٩٧٩ . ئەم هاوکاریەی نێوان هەردوو کۆمپانیا بووە کارێکی لە ناکاو لە لایەن کۆمپانیای فلیپس و یەکەم کاسێت تۆمارگە لە سەر کاسێت لە مانگی ١٩٨٢/١١/ کەوتە ناو بازاڕ ئەویش بە تۆمارکردنی مۆزیکای کلاسیکی لە سەر ئەو کاسێتانە و بڵاوبوونەوەی بەرەو وولاتانی جیهان .



٢٠٠٧/٨/١٨ خاتوو -- تەسلیمە نەسرین - نووسەر و ڕۆژنامە نووسی بەنگلادیشی ، بە هۆی نووسینی کتێبی— شەرم -- کە باسی لە ئازار و ئەشکەنجەدانی ئافرەتان و توونـد و تیژی دەسەڵاتی بەنگلادیش دەکات و هەروا باسی لە نا دادپەروەری دەسەڵاتەکە دەکات ، لە جێ بە جێ نەکردنی مافی کەسە نەتەوایەتیەکان و مافی ئافرەت و مرۆڤ لە وولاتەکەیدا .

بەم هۆکارە حکوومەتی بەنگلادیش بڕیاریدا بە دادگایی کردنی بە دەرچوونی فتوا لە لایەن ، کەسایەتیە ئاینیەکانی ئیسلام لەم وولاتەدا و دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی کتێبی – شەرم -- بۆ ئەوەی لە بازاڕدا نەفرۆشێت .

جێگەی باسکردنە کە خاتوو تەسلیمە نەسرین لە دایك بووی ساڵی ١٩٦٢ لە شاری – میمتسینگك--ی بەنگلادیشە و ماوەی ١٠ ساڵە لە وولاتی هندستان ژیان بەسەر دەبات , بە هۆی نووسینەکانی کە لە ساڵی ١٩٩٣ دوا بە دوای زنجیرە گووتارێکی ڕۆژنامەوانی ، کە تیایدا ڕەخنەی لە شێوازی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئافرەتان لە ژێر سایەی ئاینی ئیسلامدا گرتبوو , هەر بەم هۆکارە بنەرەتخوازە ئیسلامیەکان فتوایان لە دژی دەرکرد , کە

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم خاتوونە روو لە ئاوارەیی بکات و دەرچێت لە وولاتەکەیدا .

٢٠٠٧/٩/١٩ لە هەڵبژاردنەکانی نوێنەران وسەرۆکایەتی لە کۆماری کازاخستان ، کە لە ڕۆژی شەمەی ڕێکەوتی ٨/١٨ ئەنجامدراو ئەنجامەکەی ئەمرۆ ڕاگەیاندرا بە سەرکەوتنی پارتی – نور ، ئوتان – بە سەرکردایەتی سەرۆکی کازاخستان -- نور سلتان نزار باییف -- بە ڕێژەی ٨٨٪ . لە کۆی دەنگدەران کە لە ٦٦٪ . لە دەنگدەرانی وولاتەکە دەنگیان بۆ دا .



جێگەی باسکردنە کە سەرەك کۆماری کازاخستان نزار باییف بۆ ماوەی ١٨ ساڵ دەسەلاتداریەتی کازاخستانی کرد و لە ساڵی ٢٠٠٩ دووبارە دەسەلاتی وولاتەکە بە دەست دەگرێتەوە ، لە دوای تەواو بوونی مۆڵەتی پۆستەکەی , ئەویش لە پێناو هەموار کردنی دەستووری وولاتەکەو زیاتر بەرەو پێشەوە بردنی باری دیموکراتی و بە هێزکردنی باری ئابووری و بازرگانی و بەرەو باشبردنی باری ژیان و کار لەو وولاتەدا .

هەربەم بۆنە لە شاری ئەستانەی پایتەخت ئاهەنگێکی گەوورە گێردرا بە هۆی سەرکەوتنی پارتەکەی سەرەك کۆمار. بەلام پارتە بەرهەڵستکارەکانی کازاخستان نەیانتوانی لە ٧٪ ی دەنگ زیاتر بە دەست بێنن بە مسۆگەر کردنی کورسی لە پەرلەمانی کازاخستان . لە گەڵ ئەوەشدا دانیشتووانی نژار ڕووسی زۆری تیایە ، زیاتر لە وولاتەکانی دیکەی ئاسیای ناوەند , کە پێشتر کۆمارێك بوو لە لە کۆمارەکانی پێك هاتەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران .

٢٠٠٧/٨/١٩ لە ژێر زنجیرە ووتارێکدا خوولی ڕۆشنبری بۆ وتار بێژی مزگەوتەکان لە لایەن کەسایەتی و پسپۆری ئایینی دکتۆر -- مستە فا زەلمی -- پێشکەش کرا و چەند لایەنێکی گرنگی بەرامبەر بە کەسایەتی و زاناکانی ئایینی عرەب

روونکـردەوە گـووتی:- زیـاتر لـە ٥٠ سـاڵە لـە نـاو عەرەبدا دەژیـم و بـۆ یـەکمجاریش گـوێم لێنـەبووە زانیـەکی موسـلمانی عـەرەب باسـی لـە مەزلومیـەتی گـەلی کـوردی موسـلمان بکـات و بلـێ ، ئـەوە بۆچـی ئـەو موسلمانانە ئەنفال و کیمیاباران و دەربەدەر دەکەن .

لە هەمان کات گووتی:- ئەمەریکا مەلائیکەت نیە و ٣ هەڵە و خیانەتی لە کورد کردووە ، لە کاتی تەنگانەدا بە جێی هێشتووە ، هەروا گووتی :- ئەگەر مەلا و شێخ و سەیدەکانی کوردستان لە سەردەمی شێخی نەمر مەحمود حەفیددا بەریتانیای بە کافری دانەنابایە . ئێستا زیاتر لە هەشتا ساڵ بوو کورد خاوەنی دەووڵەت بووە لە کوردستان .

٢٠٠٧/٨/١٩ لە کۆبوونەوەی سەرکردە رامیاریەکانی ئێراقدا و بەردەوامی کۆبوونەوەکان ، کە تایبەت بوون بە خستنە رووی ئەو پرۆژانەی کە لە لایەن لێژنەی ئامادەکاری درابووە سەرکردە رامیاریەکان .

کە دیارترینیان یاسای پارێزگاکان بوو و بڕیاری یەکلاکردنەوەی بۆ درا و دۆسیەکانی دیکەش وەك یاسای نەوت و گاز و داهاتی نیشتیمانی و پێداچوونەوەی دەستوور و چەندین بابەتی دیکە .

لە هەمان کات وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بێرنارد کۆشنەر لە سەردانەکەیدا بۆ ئێراق کۆبوونەوەی لە گەڵ سەرکردە رامیاریەکان کرد و گفتووگۆی گونجاویان ئەنجامدا ، کە سەردانی کۆشنەر کاریگەری و کاردانەوەی خۆی لە سەر بەرە و باشبردنی باری ئێراق و پەیوەندی نێوان پارتی و ڕێکخراوەکانی نەتەوەیی و نیشتیمانی و مەزهەبی و ئایینی و کۆمەڵایەتی دەبێت لە ئێراق .

٢٠٠٧/٨/٢٠ سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی بە سەردانێکی فەرمی گەیشتە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا و لە لایەن وەزیری دەرەوەی سووریا — ئەلمعەلم -- پێشوازی لێکراو ، دوای ئەوە دەستیان کرد بە گفتووگۆی نێوانیان ، ئەویش بە نوێکردنەوەی پەیوەندیە هەمەلایەنەکان ، بە تایبەتی پەیوەندی ئاسایشی ئێراق و ڕێگە گرتن لە تیرۆرستان و ، پەیوەندیەکانی ئابوری و بازرگانی و ڕامیاری و ئاوارەکانی ئێراق ، کە روویان لە سووریا کردووە ، بە هۆی باری نا لە باری ناوخۆی ئێراق و چەندین بواری دیکەی

نێوان حکوومەتی ئێراق و سووریا .

٢٠٠٧/٨/٢٠ بـە هـۆی بـەردەوامی شـەڕی نێـوان هێزەکـانی سـووپا و پاسـدارانی ئێـران ، لـە گـەڵ پارتی ژیانـەوەی کوردستان و لێکـەوتنی زیـانی مـاددەی و جەسـتە لـە نـاو ڕێزەکـانی



سووپای ئێران و بەردەوام بوون لە تۆپبـارانکردنی ناوچەکانی پشدەر لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کە لە ئەنجام بووە هۆی چۆڵکردنی زیاتر لە پێنج گوند و دەربەدەربوونی زیاتر لە دانیشتووی ١٥٠ گونـد ، کـە خـۆی زیـاتر لـە ١١٠٠ هـاولاتی کـورد لـە ژن و منـداڵ و گـەنج و پـیر دەگـرێ . حکومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵی کردنەوەی خیوەتگایان بۆ دەدا لە گەڵ دابین کردنی خۆراك نەك بەرگری کردن لە ناوچەکە بە شێوەیەکی رەسمی لە هەوڵە هەمە جۆرەکانی وەك ڕاگەیاندن و خۆپێشاندان و دەربرینـی نـاڕەزایی و ڕەوانە کردنی شاندی تایبەت لەم بارەیەوە بۆ ئێران .

٢٠٠٧/٨/٢١ دەست پێکردنی دانیشتنەکانی دادگـایی کردنـی تاوانبـارانی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکانی بە هـاری/ ١٩٩١ ی مەزهـەب شـیعەکان ، دەسـتی پێکـرد ... کـە ئـەم دادگـایی کردنـەش سـێیەمین کێشەیە کـە دادگـای



باڵای تاوانی ئێراقە و هەر یەك لە --- عەلی کیمیاوی و ، سولتان هاشم و ، حوسین ڕەشید و ، عەبدحەمید مەحمود و ، ئیبراهیم عەبدولستار و ، وەلید محەمـەد و ، ئـەیاد فـەتییح و ، سـەبعاوی ئیـبراهیم حەسـەن و ، عەبدوغەفورفلایح و ، ئەیاد تەها شەهاب و ، سابر عەبدولعەزیز ئەلدوری و ، چوار تۆمەتباری دیکەش لە دانیشتنەکانی دادگاکەدا بە تۆمەتی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و کوشتنی خەڵکی بێتـاوان دادگـایی کـرد لـە باشـووری

ئێستای ئێراق و ، هەرێمی باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .

٢٠٠٧/٨/٢١ هێزەکانی سووپای ئێران لە بەرزترین لوتکەی کوێستانەکانیان لە هەرێمی باشووری کوردستانی داگیر کرد ، کە بە مێرگە سێر ناسراوە .

کە بە پەرەشوت چەکدارەکانی کۆماندوزیان دابەزین و سێ شۆفەڵ بە پشتیووانی چەندین دەبابە و چەکداری پیادە لە شەگەلەوە ڕێگای ئوتومبێل دەگەیاندە مێرگە سۆر، لە هەمان کات هێزەکانی سووپای ئێران تۆمبارانی بناری شاخی قەندیلیان کرد و لە بەردە بانەش دوو کەسیان شەهید کرد .

لە هەمان کات لە ڕێگەی بلاْوکراوەیەکی هێزەکانی سووپای ئێران کە داوای لە دانیشتووانی گوندەکانی سەر سنووری هەرێمی باشووری کوردستانی لە گەڵ ئێران ، کە ناوچەکە چۆڵ بکەن ، ئەمەش لە ئاکامی شەڕی توندی نێوان هێزەکانی سووپای ئێران و پارتی بوژانەوەی کوردستان ، کە زیانێکی زۆر بە هێزی سووپای ئێران کەوتووە .

جێگەی ئاماژەیە کە پارتی بوژانەوە لقێکی -- پەکەکە --یەو لە ڕۆژهەلاْتی کوردستان و دانیشتووی ڕۆژهەلاْتن ، دژی ڕژێمی ئێران دەجەنگن لە سەر خاکی کوردستان .

٢٠٠٧/٨/٢٢ پارێزگاری کەرکوك و هەردوو بەڕێوەبەری سەرچاوە ئاویەکان و بیرە ئیرتوازیەکان پرۆژەی بەنداوی شارۆچکەی – ناحیە – ی لەیلان بەردی بناغەی بۆ دانرا .

شایانی باسە کە شارۆچکەی لەیلان دەکەوێتە ڕۆژهەلاْتی شاری کەرکوك لە هەرێمی باشووری کوردستان لە دۆڵی شیرین و بەنداوەکەشی بە ناوی شیرین دەستی پێکرد ، کە درێژیەکەی ٤٢٦ مەترە و توانای ئەمبار کردنی یەك ملیۆن مەتر چوار گۆشە ئاوی هەیە . ماوەی تەواو بوونی ١٣ مانگی خایاندو ، بڕی ٥ ملیار و ٣٠٠ ملیۆن دیناری ئێراقی نوێی بۆ خەرجیەکانی بەنداوەکە تەرخان کرابوو ... کە ئەم بەنداوەش سوودێکی لە بار و گونجاوی دەبێت بۆ بواری کشتووکاڵی لە پارێزگاکە و ناوچەکەدا



٢٠٠٧/٨/٢٢ بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگای کەرکوك لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هەفتە نامەی هاوولاتی ڕایگەیاند ، کە لە ماوەی مانگی/ ٢٠٠٧/٧ نزیکەی ٦٠٠٠ هەزار خێزانی عەرەب لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی پارێزگای کەرکوك نیشتەجێ بوون ، کە هەندێکیان بە ڕەزامەندی بەرپرسان بووە و هەندێکیان بە دزەکردن و یارمەتی دانیان بە پارە گەیشتوونەتە شاری کەرکوك .

تەعریب کردنی خاکی کوردستان ، بە تایبەتی پارێزگای کەرکوك بە شێووە و شێوازێکی دیکەی یاسایی و هاوکاری لە کاتی بەعس بەردەوامە و متشتومڕو کێشمە کێشمەی جێ بە جێکردنی مادەی/ ١٤٠ یش بەردەوامە ، بەلاّم سەرکردایەتی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان ... ؟...!...؟... سامان ... پارە ... کورسی ....؟.

٢٠٠٧/٨/٢٤ کۆچی دوایی سەرەك کۆماری ئێراق و ئەمینداری گشتی پارتی بەعس لە ئێراق و ئەندامی سەرکردایەتی شۆرش عەبدولرەحمان محەمەد عارف ، لە کۆمەڵگای حوسێنی پزیشکی لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردن لە تەمەنی ٩١ ساڵیدا .

شایانی باسە لە دوای مردنی عەبدولسەلام محەمەد عارفی برای لە ١٩٦٦/٤/١٦ تاکو ١٩٦٨/٧/١٧ سەرۆکاتی کۆمار ومارو لاباڵی چەپرەوەی پارتی بەعسی لە ئێراق گرتە دەست ، لە کودەتا سەربازیەکەی بەعس بە سەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حوسێن ١٧--٧/٣٠/ ١٩٦٨ لە دەسەلاّ ت لادرا و لەگەڵ خێزانەکەی ڕەوانەی دەرەوەی ئێراق کران .

٢٠٠٧/٨/٢٦ لە دوای زنجیرەیەك لە کۆڕ و کۆبوونەوەی نێوان سەرکردە ڕامیاریەکان لە پێك هاتەکانی گەلانی ئێراق و پارتە ڕامیاریەکان یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکلراتی کوردستان و ئەنجوومەنی بالاّی شۆرشی ئیسلامی و حزبی دەعوەی ئیسلامی و پارتی ئیسلامی ئێراق ، بەیاننامەی

کۆتاییان ڕاگەیاند ، کە لە دوو خاڵ پێك هاتبوون ، کە خاڵی یەکەم لە چوار برگە و ، خاڵی دووەم لە حەوت برگە پێك هاتبوو . ئەویش لە پێناو چارەسەر کردنی کێشە هەڵواسراوەکان و بەرەو پێشبردنی باری ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئاسایش و ئاوەدانکردنەوە لە ئێراق و ، پەیوەندیە ناوچەیی و هەرێم و جیهان.

رۆژنامەی خەبات ژمارە/٢٥٩٩

٢٠٠٧/٨/٢٦ بە هۆی تەشەنە کردنی نەخۆشیەکانی سکچوون و ڕشانەوە لە شاری سلێمانی ، بەڕێوەبەرایەتی خۆپاراستنی تەندروستی باری نا ئاسایی لە پارێزگاکە ڕاگەیاند ، کە شاری سلێمانی بە بارێکی نا ئارامی تەندرستیدا تێپەڕ دەپەرێت.

شایانی باسە باری نا لە باری تەندروستی هاووڵاتیانی پارێزگای سلێمانی و شار و شارۆچکەکانی دیکەی کوردستان بە هۆی هێنانی هەموو ئەو خواردنەمەنیانەیە ، کە کۆمپانیاکانی کوردستان بە هاوکاری بەرپرسانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەیهێننە ناو هەرێمی باشووری کوردستان و، ستۆك بوونە ، واتە ماوەی بە کار هێنانی بەسەر چووە لە رۆن و دەرمانچا و دەرمانی پزیشکی و خۆراکە هەمە جۆرەکان دیکە ، لە هەمان کات بە دەیا خاوەن کۆمپانیا دەستگیر کراون و دوای بە ڕێکەوتن ئازاد کراون و هاووڵاتی کوردستانیش بە چەند قۆناخێکدا تێدەپەرێ لە لایانی گرنگ نیە ....!...؟.

٢٠٠٧/٨/٢٧ هێزەکانی سووپای ئێران لە تۆبرانکردنی ناوچە سنووریەکانی نێوان هەرێمی باشووری کوردستان و دەسەڵاتەکەی بەردەوامە و زۆربەی گوندەکانی سیکەنە و سەرخان و سوێسنێ هەرچەند زیانی گیانی لێنە کەوتۆتەوە ، بەڵام ڕەز و باخ و دارستانەکان ئاگریان گرت و ، لە ئاکامدا زۆربەی زۆری سووتاندوە و دانیشتووانی ئەم گوندانە و گوندی دیکە ، ناچار بوون شووێنەکانی خۆیان جێ بهێڵن . لە لایەکی دیکە هێزەکانی سووپای ئێران لە سەر شاخەکانی کوێستانەکانی پرژی ڕادارێکی سەربازی جێگیر بکەن دەیروانیە سەر ناوچەی باڵەبیان . هەروا شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی سووپای ئێران و پارتی ژیانەوەی کوردستان بەردەوامە و

زیانی گیانی و چەك و تەقەمەنی بە هێزەکانی سووپای ئێران کەوتوون .



٢٠٠٧/٨/٢٧ لە دوای وتارەکەی سەرۆکی فەرەنسا نیکۆلای سارکۆزی لە بەردەم بالۆێزەکانی فەرەنسا لە جیهاندا ، سەبارەت بە رامیاریەتی دەرەوەی وولاتەکەی ، کە کۆمیسیۆنی یەکیەتی ئەوروپا لە ٨/٢٨ خۆشحالی خۆی لە سەر ئەو هەلوێستەی سەرۆکی فەرەنسا سەبارەت بە وەرگرتنی تورکیا لە یەکیەتی ئەوروپا دەربڕی .

لە وتارەکەیدا سەرۆکی فەرەنسا لاری نەبوونی خۆی ڕاگەیاند بە دەست پێکردنەوەی دانوساندنی نێوان یەکیەتی ئەوروپا و ڕژێمی تورکیا لە پێناو بوونی بە ئەندامی یەکیەتی ئەوروپا یا نا ... بە مەرجێك لە گەڵ ئاییندەی پەیوەندی نێوانیان بگونجێت .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە دانوستانی وەرگرتنی لە ٣٥ بەش پێك هاتووە کە پلە بە پلە یەك لە دوای یەك ئەم بەشانە دەکرێتەوە و لە هەر بەشێکیشدا رازیبوونی وولاتانی ئەندامی پێویست لە یەکیەتی ئەوروپا ... هەروا سەرۆکی فەرەنسا لە وتارەکەیدا گووتی:- کە فەرەنسا دەستە وەستان نابێت لەو کاتەی کە توندو تیژی تایفە گەری لە ئێراق درێژەی هەیە و مەترسی گەورەش لە سەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهان دروست دەکات و ڕێگە چارەی ڕامیاری باشترین ڕێگایە بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی ئێراق .

٢٠٠٧/٨/٢٨ لە دوای دوو خوولی هەڵبژاردن ، سەرەك کۆماری تورکیا , لە خوولی سێیەمی هەڵبژاردن سەرەك کۆماری تورکیا ، وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵلا گووڵ بە سەرەك کۆمار هەڵبژێردرا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە یەکەم سەرۆکە سەر بە ڕەوتێکی ئیسلامی بێت ، کە بگاتە کۆشکی سەرۆکایەتی تورکیای عەلمانی ، کە گوول لە کۆی ٥٥٠ دەنگی پەرلەمان . توانی ٣٣٩ دەنگ بە دەست بێنێ ... کە پارتی دادو و

گەشە پێدانی دەسـەڵاتدار تێیدا زۆرینەیـە ... بەوەش توانی بە ژمارەیـەکی کەمی دەنگەکان زۆرینەیەکی کەم بە دەست بێنێ بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی تورکیا .

کە هەردوو ڕکابەرەکەی گول ، چەکەك ئوگلو لە پارتی کاری نەتەوەیی ڕاسترەو ، حوسێن نیڤۆن نایجلی لە پارتی چەپ ڕەوی دیموکراتی توانیان ۷۰ بە ۱۳ دەنگ بە دەست بێنن ... کە سەرەك وەزیرانی تورکیا ڕەجەب تەیب ئوردگان ڕۆژی ۸/۲۹ کابینەی نوێی حکوومەتەکەی خستە بەردەم سەرۆکی تازە هەڵبژێردراوی کۆماری تورکیا .

۲۰۰۷/۸/۲۸ هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ئاگادار کردنەوە لە مردنی یەکێك لە مەزنترین نووسەر و ڕۆژنامە نووسی هاوچەرخی ئیسپانی -- فانسیسکۆ ئۆمیرال -- کە لە شاری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا ، لە تەمەنی ۷۲ ساڵیدا کتوپڕ بە وەستانی دڵ گیانی دەسپێرێت .

شایانی باسە ئۆمیرال لە مانگی/ ۱۹۳۵/۱۱ لە شاری مەدرید لە چاوی بە جیهان هەڵهێناوە و لە نەخۆشخانەی مۆنتیرنسیبی دی بوادیا دڵ مۆنتی دەوورووبەری مەدرید کۆچی دوایی دەکات ... کە ۸۰ هەشتا کتێبی بە چاپگەیاندوە ... لە وانە مۆرتال ئای ڕەسا لە ساڵی ۱۹۷۵ ، تریلۆخیادی مەدرید لە ساڵی ۱۹۸٤ ... هەروا بەرزترین خەڵاتی ئەدەبی لە ئیسپانیا بە دەست هێناوە ... لە وانە بنسبیی دی ئیستۆریاسی ئەدەبی لە ساڵی ۱۹۹٦ و خەڵاتی سرفانتس لە ساڵی ۲۰۰۰ .

ئەم کەسایەتیە لە ساڵی ۱۹۵۸ دەست بە نووسینی ووتار کردووە لە ڕۆژنامەی ئورتی دی لستیان هەرێمی ... دوای ئەوە کاتەکانی ژیانی بۆ کاری نووسینەکانی ئەدەبی تەرخان کردووە و بۆتە کەسایەتیەکی ئیسپانی و جیهانی لە بواری نووسینەکانیدا .



٢٠٠٧/٨/٢٨ لـە دوای تـەواو بـوونی قۆنـاخی یەکـەم و دووەمـی هەڵبـژاردن عەبدوڵلا گوول توانی لە قۆناخی سـێیەم ٣٣٩ دەنـگ بـە دەسـت بێنـێ لـە کـۆی ٥٥٠ دەنگـی ئەندامانی پەرلەمانی نیشتیمانی تورکیـا و بـە سـەرکەوتوانە پۆسـتی سـەرەك کۆمـار بگرێتـە دەسـت و پۆسـتی سـەرەك وەزیرانیش رەجەب تەییب ئۆردگان بگرێتە دەست لە وولاتەکەیاندا .

جێگەی روونکردنەوەیە کە -- رەجەب تەیب ئۆردگان و ، عەبدوڵلا گوول و ، بوڵند تەرنگ و ، عەبدوللە تیف شەتەر-- بە یەکەوە پارتی داد و گەشە پێدان لە سالی ٢٠٠١ دابمەزرێنن , ئەو چوار کەسە کوڵەگەی دروستکەر و داهێنەری ئەو پارتە بوون و -- ئۆردوگان -- بووە سەرۆکی ئەو پارتە و گـول و بڵنـد ئـەرنگ و عەبدوللـەتیف شـەنەر هەرسـێکیان بوونـە جێگـری ئۆردگـان ، لـە دوای ماوەیـەکی کـورت هەڵبـژاردنی گـشتی پـێش وەختـی پەرلەمانی گەورەی تورکیا بە هۆی نەخۆشی سەرەك وەزیرانی پێشوو بڵند ئەجەوید لە ٢٠٠٢/١١/٣ دا هاتە پێشەوە .

لەو هەڵبژاردنەدا پارتی داد وگەشەپێدان هەر چەندە تەمەنی دروستبوونی زۆر کـورت بـوو , بـەلام – ئۆردگـان و، گـول و ، ئـەرنگ و ، شـەنەر -- وەك یەك تیمی بە هێزی پارتی داد لەو هەڵبژاردنەدا گەورەترین سـەرکەوتنیان بە دەسـت هێنـاو لـە کـۆی ٥٥٠ ئەنـدام پەرلـەمان توانیـان ٣٦٥ کورسـی لـە پەرلەمان بە دەست بێنن ، کە دەکاتە ٣٤,٣٪ی تەواوی دەنگەکانی ئەو کاتی دەنگدەران .

ئەم سەرکەوتنەش بووە هۆی ئەوەی کە بتوانن حکوومەتی زۆرینـە بـە تـەنیا پێـك بێـنن . ئـەو کـات بـە هـۆی کێـشەی دادگـایکردنی پێـشوو , ئۆردگـان نـەیتوانی خـۆی بـۆ ئەنـدامی پەرلـەمان بپـالێورێ , بۆیـە هـەر وەك سـەرۆکی پـارتی داد بەردەوام بوو , بە پێـی دەسـتووریش سـەرۆکی وەزیـران دەبوایە

ئەندامی پەرلەمان بێت . بۆیە لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە گەورەیەش ئۆردگان نەیتوانی ببێتە سەرەك وەزیران .
بەڵام رەجەب تەیب ئۆردگان وەك وەفاداری بۆ عەبدوڵڵا گوول و دۆستایەتی بە هێزی نێوانیان و بڕوای تەواوی بە عەبدوڵڵا گول , ئەوە بوو گووڵی هێناو کردیە سەرەك وەزیرانی حکوومەتەکەی خۆی لە سەر تورکیا . هەروا بڵند تەرنگ بووە سەرۆکی پەرلەمان و عەبدوللەتیف شەنەر بووە جێگری سەرەك وەزیران و حکوومەتێکی بە هێزی بۆ عەبدوڵڵا گول پێك هێنا لە تورکیا .
لە ماوەی دەسەڵاتی عەبدوڵڵا گوول و سەرۆکی پەرلەمان ، توانیان چەندین بڕگە و مادده و خاڵ لە دەستووری تورکیا بگۆڕن ، لە پێناو بە هێزکردنی جێ پێگەی پارتەکەیان و پشتیوانی کردن ل داهاتووی رەجەب تەیب ئۆردگان لە سەر تورکیادا . دوای ئەوە بە هۆی واز هێنانی ئەندام پەرلەمانێك لە پارێزگای — سیرت — هەڵبژاردنیان لە پارێزگای سیرت دووبارە کردەوە و ئۆردگان لەو شارەدا خۆی بۆ ئەندام پالأوت و لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/٩دا هەڵبژاردن ئەنجامدرا و ئۆردگان لە شوێنی ئەو ئەندام پەرلەمانە ، وەك ئەندام پەرلەمانی سیرت هەڵبژێردرا و بووە ئەندامی پەرلەمانی تورکیا . بەم جۆرە بوو ، گوول ڕێگای بۆ ئۆردگان خۆشکرد و شوێنی خۆی کە سەرەك وەزیرانی تورکیا بوو بۆ ئۆردگانی جێ هێشت ...
ئەمەیە سەرکردایەتی ڕاستەقینە
ئا لێرەدا دەمەوێ شتێك روون بکەمەوە ، ئەویش بەراوردێکە لە نێوان حکوومەت و پێك هاتەی تورکیا و هەرێمی باشووری کوردستان .
تورکیا ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی ٧٢ ملیۆن کەسە و ٨١ پارێزگایە و پەرلەمانەکەشی ٥٥٠ ئەندامە و حکوومەتەکەی لە ٢٥ وەزیر پێك هاتووە
بەلأم لە هەرێمی باشووری کوردستان کە سنوورەکەی دانی پێنەنراو وولأتێکی سەربەخۆی نیە و لە هەموو لایەك گەمارۆدراوە و داهاتووی گەشی بینی نیە ، گەر بەراورد لە ڕابردوو ئێستای کوردستان و داهاتووی بکەی ، کە پەرلەمانەکەی ١١١ ئەندامە و حکوومەتەکەی ٤٥ وەزیرە و دەسەڵاتەکەشی لە سەر سێ پارێزگای ناتەواوە ، بە هۆی نەگەڕاندنەوەی ناوچە دابڕاوەکان لە پارێزگاکانی هەولێر و سلیمانی و دهۆك . کەچی

دەسەڵاتی هەرێمی باشووری کوردستان نیمچە دەسەڵاتێکی دان پێنراوە بە پێی دەستووری هەمیشەیی ئێراق , بەڵام تورکیا دەووڵەتێکی خاوەن سنوور و ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەندامی پەیمانی ناتۆ و ئەندامی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیە ، لە گەڵ چەندین ڕێکخراوی دیکە و دەووڵەتێکی کاریگەرە لە ناوچەکە و جیهاندا .

**تێبینی:-** زۆر شتی دیکە ماوە بیلێم ، بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ سەرکردەکانی کورد وەك دەڵێن :- ئەو کەسە کەسە ئەلفێکی بەسە ...!... ؟.

٢٠٠٧/٨/٢٨ لە ئاکامی ئاگر بەربوون لە دارستان و پارك و کێڵگە کشتووکاڵیەکان لە یۆنان لە ئەنجام بە دەیا هکتار زەوی ئاگری گرت و زەرەرو زیانەکان بە ملیارێك ونیوو یۆرۆ مەزەندە کرا . لە هەمان کات حکوومەتی یۆنان یەك ملیۆن یۆرۆی بۆ ئەو کەسەی و لایەنانە وەك پاداشت بەخشی کە ناوی ئاشکرا بکات .

جێگەی ئاماژەیە کە زیاتر لە ٦٤ هاووڵاتی گیانی لە دەست داو هەروا کاردانەوەی لە سەر باری ژێخانی ئابووری و باری ژیانی هاووڵاتیان کردەوە و لەلایەکی دیکەش هەرەشەی لە شوێنەوارەکانی ئۆلەمپیات و مۆزەخانەیەکی گرنگی تایبەت بە مێژووی کۆنی یۆنان لێیە و بەرپرسانی تیمەکانی فریاگوزاری بس دووپاتیان کردەوە ، کە ٦ فرۆکە و ٢ هەلیکۆپتەر و ١٥ ئوتومبێلی ئاگر کوژێنەوە و ٤٥ کرێکار خەریکی دابین کردنی سەلامەتی ئەو ناوە مێژوویانە بوونە لە ووڵاتەکەدا .

٢٠٠٧/٨/٢٩ کەسایەتی ناوداری ئەفەریکیا و جیهان -- نلسن ماندێلا-- لە ماوەی ژیانی لە خەبات و تێکۆشان بەردەوام بووە و هیچ کاتێك مل کەچی نەکردووە بۆ داخوازیەکانی ڕژێمی ڕەگەز پەرستی لە ووڵاتەکەی و لە کیشووەرەکەو لە جیهان ، هەموو کاتەکانی ژیانی



تەرخان کردبوو لە پێناو بنبرکردنی تیۆری ڕەگەز پەرستی لە وولاتەکەی و جیهان و لابردنی جیاوازی ڕەنگ و بیروو بۆ چوون و هەڵوێست ، ئەویش لە پێناو خزمەتکردن و یارمەتی دانی هەژاران لە هەر کوێەك بن لە سەر گۆی زەوی لە جیهاندا .

بە هۆی ئەم هەلوێستە بوێرانەی نلسن ماندێلا دەسەڵاتدارانی بەریتانیا هەڵسان بە دانانی پەیکەری نلسن ماندیلا لە گۆڕەپانی بەر پەرلەمانی گشتی بەریتانیا ، وەك ڕێزلێنانێك بۆ ئەم کەسایەتیە بێ وێنەو نەبوونی هاوتای لە جیهان ، لە تەك پەیکەرەکانی ناودارانی جیهان وەك :-ئەبراهام لینکۆن ، ئۆلیڤەر کرمۆیل ، ونستۆن تشرشل ، ئەوانی دیکەی کە مێژوویان دروستکردووە ، هەروا دادپەروەری و دیموکراتیان دروستکردیە و ، هەروا ئەوانەی ڕاستگۆ بوونە لەگەڵ پێنووسەکانیان لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/٢٩ سەرەك ئەرکانی هێزەکانی سووپای تورکیا یەشار بوبوك ئانیت لە ڕێوڕەسمی سووێند خواردنی سەرەك کۆماری نوێی تورکیا عەبدوڵلا گول ئامادە نەبوو ... بە پێچەوانەی ڕێوڕەسمەکانی پێشوو ، کە دەبێ زۆربەی بەرپرسانی ئەو وولاتە بەشداریان لە سووێند خواردنەکە بکردایە ... بەر لە یادکردنەوەی دامەزراندنی سووپای تورکیا سەرۆکی ئەرکان یەشار بویوك لە لێدوانێکیدا ڕاگەیاند بۆ ناوخۆ و دەرەوەی وولات ، کە لە ناوبردنی ڕژێمی عەلمانی لە مەترسیدایە و ڕایگەیاند ، کە سووپای تورکیا پشتگیری تەواوی سیستەمی ڕژێمی عەلمان دەکات لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

٢٠٠٧/٨/٢٩ سەرەك وەزیرانی تورکیا ڕەجەب تەیب ئۆردگان لە بەیاننامەیەکیدا گووتی :- دەمەوێ جەخت بکەمەوە سەر ئەوەی کە ئەمرۆ لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بەوەیە ، کە ناکۆکیەکانمان بەلاوە بنێن و ڕیزەکانمان یەکخەین و لە سەر بەهاکانی نەتەوەکان و بنەماکانی کۆمار و ئامانجە هاوبەشەکانمان کۆك بین .

جێگەی باسە کە ئۆردگان لە دوای هەڵبژاردنی عەبدوڵلا گول بە سەرەك کۆماری تورکیا ، ئەو نامەی ئاراستەی هێزەکانی سووپا و پێك هاتەکانی تورکیا کرد و لە نامەکەیدا گووتی:- ئەمرۆ تورکیا لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە یەك ڕیزی هەیە ... ئەمەش بەر لە ئاهەنگەکانی ٨/٣٠ دێت کە بە ڕۆژی سەرکەوتن ناو دەبرێت و بە بۆنەیەك دادەنرێت بۆ ڕێزگرتن لە

سووپای تورکیا .

٢٠٠٧/٨/٢٩ ڤیستیڤاڵی ٥٧٥ مین بۆ ٧٥ فیلمی نایابی جیهان لە شاری ڤینیسای ئیتالی نمایش کرا ... ڤیستیڤاڵەکە بە فیلمێکی دەرهێنەری ئیتالی – جورانت -- کرایەوە ، ڤیستیڤاڵەکە تاکو ٢٠٠٧/٩/٩ بەردەوام دەبێت ... خەڵاتی تایبەتی -- شێری زێرینی -- دەبەخشرێتە دەرهێنەری ناسراوی ئیتاڵی -- برناردۆ برتۆلنۆش -- تەمەن ٦٦ ساڵ ... ئەمەو جگە لە بەخشینی ٢٢ خەڵاتی دیکە بە سەر فیلم لە بازنەی پێشبرکێەکەدا لەم ڤیستیڤالەدا .

٢٠٠٧/٨/٢٩ لە ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتوو کە ڕێژەی ٩٥٪ مادده بێهۆشکەرەکانی جیهان لە ئەفگانستان بەرهەم دەهێنرێت ... شایانی باسە بە بەراوردکردنی لە گەڵ ساڵی ٢٠٠٦ ڕێژەی زیادبوونی لەگەڵ ساڵی ٢٠٠٧ ١٨٪ بووە و زۆربەی بەرهەم هێنانی ئەو ماددەیە لە ناوخۆی ئەفگانستان ، لە ویلایەتی هیلمندی باشووری ئەو وولاتەیە ، کە ژمارەیەکی زۆر چەکدارانی بزووتنەوەی تالیبان خۆیان تێیدا حەشارداوە و وولاتێکی ئیسلامی و هەردوو مەزهەبی شیعە و سووننەی تیایە و لە بارێکی توندڕەوی ئیسلامی دا دەژی و دژی هەموو بیروو بۆچوونێکی زانستی سەردەمین لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٨/٣٠ زیاتر لە ١٧٠ هەزار پەنابەری ئێراقی داوای مافی پەنابەریان لە وولاتانی جیهان کرد ، کە بە پێی ڕاگەیاندنی کۆمیسیۆنی باڵای پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ، ئەوانەی بە زۆر کۆچیان بۆ ناوچەیەکی دیکەی ناو ئێراق پێکراوە و ئەوانەی کە ناچاربوونە بە هۆی بارودۆخی ئەمنی ماڵ و حالی خۆیان جێ هێشتبووە گەیشتۆتە چوار ملیۆن و دوو سەد هەزار کەس .

هەروا کۆمیسیۆنی ناوبراو لە بەیاننامەیەکیدا گووتی:- لە سووریا و ئەردەن و میسر ... هەروا گووتی :- ئەم زانیارانە لە مانگی سووری ئێراقی وەرگێراوە و ئەوانەی ناو نووسکراون زیاترن لە ١٧٠ هەزار کەس بۆ ئەوەی سیفەتی پەنابەریان پێبدرێت لە وولاتانی جیهان .

٢٠٠٧/٨/٣١ سووپای تورکیا لە جەژنی سەرکەوتنیدا داوەتی هاوسەری سەرەك کۆماری نوێی تورکیا عەبدوللاَ گول نەکرد و لە هەمان کات داوەتی هاوسەری سەرەك

وەزیـران ڕەجـەب تـەیب ئۆردگـان نـەکرد ... بـە بـوونی ڕەوتـی ئیسلامیان و بـوونی خواسـتی سـەرپۆش بـۆ هـەردوو ئـافرەتی سـەرەك كۆمـار و سـەرەك وەزیران .

هەر لـەو کاتەشدا داوەتـی ئەنـدام پەرلەمانە کوردەکانی نـەکرد ، کە لـە نـاو پـارتی کۆمـەلگای دیمـوکراتی خۆیـانْ بـۆ بـە ئەنـدام بوونیـان لـە پەرلـەمان کاندید کردبوو ، کـە ئەمـەش کـارێکی شـۆڤینی و ڕەگـەز پەرسـتی و جـودا خوازیە لە لایەن هێزی سـووپای تورکیا ، لـە هـەمان کـات سـەرۆکی ئـەرکانی سووپای تورکیا ژەنـەراڵ یەشار بویوکانتی لەوتەکەیدا بەرگری تـەواوی لـە ڕژێمی عەلمانیەتی تورکیا کرد و گووتی :-

ماوە بە هیچ لایەنێك نادرێت دەست تێوەردانی و پێشێلی ڕژێمی عـەلمانی بکات بە هەر نرخێك بێت لە تورکیا .



٢٠٠٧/٨/٣١ ڕێکخـراوی پـەیامنێرانی بـێ سـنوور ، کـە بارەگاکـەی لـە پاریـــــسی پایتـــەختی فەرەنـــسایە ، ئـــەمڕۆ ڕایگەیانـد کـە لـە مـانگی/ ٢٠٠٣/٣ تـاکو ئـەمڕۆ ٢٠٠ ڕۆژنامــە نـووس لـە ئێـراق گیانیان لە دەست داوە ، بە هۆی کارە تیرۆریستیەکان و لـە کـاتی کـارکردنی ڕۆژنامە نووسان لە کاتی بە جێ گەیاندنی ئەرکی ڕۆژنامەوانی لە ئێراقدا . کـە کوشـتنی ئـەم ڕۆژنامـە نووسـانەش مەبەسـت دار بـووە , کـە تـەنیا سـاڵی ٢٠٠٧ ، ٤٩ ڕۆژنامە نووس لە شارە جیاجیاکانی ئێراق کوژراون .



٢٠٠٧/٨/٣١ لــە دوای هــەوڵێکی زۆر لــە لایـــەن شوێنەوارنناســـانی کـوردی و فارسـی لـە ئێـران تـــوانرا پێناســـە کردنـــی شـــوێنەواری مێـــژوویی تەپۆلکەی قەڵای – زەینـال –

- كە یەك كیلۆ مەتر لە گوندی -- مەرگە مووری -- دووره و سەر بە پارێزگای ئیلامە لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان .
جێگەی باسكردنە كە ئەم شوێنەوارە دەركەوت كە سەردەمی كۆنی ئەم ئەگەرێتەوە بۆ – كالكۆتیك -- مەفرەك و ئاسن و پاش سەردەمی هیخامە نشین .لە دوا پێناسە كردن و كۆتایی هاتنی قۆناخەكانی تۆماركردن , چووە ناو لیستی شوێنەوار و بەرهەمە نەتەوەییەكانی ئێران . هەروا ناوی تەپۆلكەی قەڵای زەینال لە ناوی یەكێك لە خانەكانی ناوچەیی بە ناوی -- زەینال خان -- هاتووە ، كە تەپۆلكەی مێژوویی دەشتی -- سەمیرە -- یە و قەڵای زەینال لە سەر ئەم تەپۆلكەیە هەڵكەوتووە , كە مێژووی دەگەرێتەوە بۆ ٣٠٠ ساڵ لە مەوبەر تایبەت بووە بە --زەینال خانی كەلانتەر -- هەروا ژمارەی شوێنەوار و بەرهەمە نەتەوەییەكانی پارێزگای ئیلام گەیشتۆتە ٣٥٧ بەرهەم و بەرە و زیادبووندایە لە داهاتوودا لەم پارێزگایەدا .

٢٠٠٧/٨/٣١ لە هەوڵە بەردەوامەكانی زانا شوێنەوارەكان لە هەموو جیهان لە پێناو گەیشتن بە زانیاری تەواو لە سەر چۆنیەتی بوونی مرۆڤ لە هەرێم و ناوچە جیاجیاكانی سەرگۆی زەویدا .



هەر لەو هەوڵانەشدا زاناكانی شوێنەوار توانیان لە گردی -- تەل بەراك -- لە ڕۆژ هەڵاتی باكووری سووریا ، كە خاكی ڕۆژئاوای كوردستانە ,شوێنەواری ئێسك وپروسكی بە دەیا كوڕ و كچی گەنج بدۆزنەوە ، كە وایان مەزەندە دەكرد ، كە ئەو ئێسك و پروسكانە لە ئەنجامی شەڕێكی خوێناوی بووە بەر لە ٦٠٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا لەم ناوچەیەدا . ئەویش لە دوو گۆڕی بە كۆمەڵ ، كە یەكەمیان لە نزیك گردەكە بووە كە

لاشەی ٣٤ کچ و کوڕی تیا بووە و , دووەمیان بە دووری چەند مەترێك لە گۆڕە لە کۆمەڵەکەی یەکەمدا ، کە لاشەی ١٢ کچ و کوڕی تیابووە لەو جێگایەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەم هەوڵەش لە لایەن زانای شوێنەوار -- ئوگوستا ماکماهۆن -- شارەزای شوێنەوار لە زانکۆی – کمبریرگ--ی بەریتانیا , کە دەڵێ :- ئەم شارە واتە -- تەك بەراك -- بەر لە ٣٠ ساڵ پێش ئێستا شوێنەوارەکەی دۆزراوەتەوە و هەوڵەکانی وەك ئێستا بەردەوام نەبووە . لە دۆزینەوەی شمکە شاردراوەکانی و دەرکەوتنی زانیاری زیاتر وەك ئێستا کە هەوڵی بۆ دەدرێت .

هەروا دەڵێ :- ئەو لاشانە بە رووتی دانراون لە دوای کوشتنیان و تاکو بۆگەن بوونە و تەنیا ئێسکەکانیان لە جێگەی خۆی وەك خۆی ماونەتەوە , کە ئەمەش لاشەی چەند کەسانێکە لە هەزاران لاشەی دیکە کە تاکو ئێستا نەدۆزراونەتەوە . ئەم هەواڵەش لە گۆڤاری -- ساینس --ی بەریتانی بلاْوکراوەتەوە .

٢٠٠٧/٩/١ مۆرکردنی رێکەوتننامە لە نێوان کومپانیای رینۆی فەرەنسا بە نوێنەرایەتی سەرۆکی ئەنجوومەنی کاگێری کومپانیاکە – کارلۆس گسن – و سەرەك وەزیرانی شانشینی مەغرب – ئیدریس جتوو – بە ناوی – پرۆترۆکۆڵی نوایا – ئەمەش لە پێناو دامەرزراندنی کارگەیەکی لێکدانی پارچەکانی ئوتوومبێلی رینۆ لە شاری – تەنجە – ی مەغرب ، کە شاری تەنجە دەکەوێتە رۆژئاوای مەغرب ، ئەم رێکەوتنەش بە بڕی ٦٠٠ ملیۆن یۆرۆ بوو ، کە دەکاتە ٨١٧ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی .

هەروا لە گەڵ ٣٥٠ ملیۆن یۆرۆ ، بۆ جێ بە جێکردنی پرۆژەکە لە قۆناخی یەکەمدا ، کە ساڵانە ٤٠٠ هەزار ئوتوومبێل بەهەم دێنێ ، بەلاْم لە قۆناخی یەکەم ٢٠٠ هەزار ئوتوومبێل بەرهەم دێنێ لە وولاْتەکەدا بۆ ساڵی ٢٠١٠ .

ئەم رێکەوتنەش دەبێتە هۆکاری رەخساندنی ٦٠٠٠ هەزار کار بۆ فەرمانبەر بە شێوەیەکی راستەوخۆ و ٣٠ هەزار کار بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ .

هەروا کومپانیای رینۆ جمووجۆلیەکی بەرچاوی لە وولاْتی مەغرب هەیە لە رێگەی لقەکانی ، وەك لقی / سۆماکا ، کە کومپانیای لۆساکا ئەم لقەی لە

شاری واری بیزا دامەزراندووە ، لە ساڵەکانی شەستەوەو هەروا لقی / لۆگان ، کە تایبەتمەندە بۆ ناردنە دەرەوەو ، هەروا لقی / کاسگۆ ، کە ئەمەش کارێکی وەبەرهێنانی هاوبەشە . لە لایەن حکوومەتی مەغرب و کومپانیای رینۆ ،کە هۆکارێکی کاریگەرە بۆ بتەو کردن و بە هێز کردنی ژێرخانی ئابووری وولاتەکە.

سەرچاوە :- . bbc . arabic . com

٢٠٠٧/٩/١ سەرەك کۆماری پۆلیڤیا – ئیفۆ مۆرالس – خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بریاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەر بری بەرامبەر بە دانیشتووانە رەسەنەکان لە جیهاندا .

شایانی باسە کە دانیشتووانە رەسەنەکانی پۆلیڤیا لە هۆزی ئیمارسی هندیە . ئەمەش بریارێکە بە پاراستنی مافلی دانیشتووانە رەسەنەکان لە جیهان . ئەمەش دان پێنانێکە لە لایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرامبەر بە دانیشتووەانە رەسەنەکان لە جیهان ، کە لە زۆربەی هەرە زۆری وولاتان مامەڵەی پلە دوو و سێی لە گەڵ دەکرا ، بە تایبەتی لە گەڵ گەلی کوردستان لەو وولاتانەی کە کورد و نیشتیمانەکەیان بە سەردا بەشکراوە وەك ، تورکیا ، ئێران ، ئێراق , سووریا . و وولاتانی دیکەی ، کە یەکیەتی سۆڤیەتی جارانی لێ پێك هاتبوو لە کێشووەرەکەدا .

بە تایبەتی لە کۆماری ئەرمینیا ، کە پارێزگای یەریڤان و تەواوی دەورووبەری خاکی کوردستانە . ئەمەش لە دوای گفتووگۆی چرو بە پێز لە لایەن ١٤٣ وولات رەزامەندیان لە سەر ئەم بریارە کرد ، بەرامبەر بە چوار دەووڵەت و دەنگ نەدانی ١١ دەووڵەت لە سەر بریارەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢ سەرەك کۆماری ئێران – مەحمودی ئەحمەدی نەژادی – لە راگەیاندنێکیدا گووتی:- ئێران سەرکەوتنی بە دەست هێناوە بە گەیشتنی بە ئامانجەکانی سەرەکی لە ناو پرۆگرامی ئەتۆمی و ، ئێستاکە ئێران ٣٠٠٠ هەزار ئامێری دەرکردنی مەڵبەندی هەیە ، ئەویش بۆ پۆلینکردنی یۆرانیۆم لە وولاتەکەدا ئەم راگەیاندنەش بەرامبەر کۆنگرەی دەیەمی یەکیەتی کۆمەڵەی ئیسلامی بۆ قوتابیانی زانکۆکانی ئێران هات و ئەوەشی راگەیاند:- کە ئێستا ئێران وولاتێکی ئەتۆمیەو ، ئەو کێشەیەش کۆتایی پێ هاتووە لە وولاتەکەدا .

سەرەرای چەندین جار هۆشداریدان بە ئێران ، لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ، ئەمەریکاو ، بەریتانیاو ، یەکیەتی ئەوروپا .
بەلأم حکوومەتی ئێران بە سەر کردایەتی ئحمەدی نەژادی لە هەڵس و کەوتەکانی لە بواری ئەتۆمی وولأتەکەی و بەرامبەر بە ئامۆژگاریەکانی وولأتانی جیهان بەردەوامە . کە ئەمەش کاردانەوەی ترسناکی دوا رۆژی دەبێ بۆ ئێران و هەرێم و ناوچەو هەتا جیهانیش ، بە تایبەتی کە ئێران دەست تێوەردان لە کاروباری ، لوبنان و ، فەلەستین و ، بە تایبەتی ئێراق ، لە کێشووەرەکەدا دەکات .

٢٠٠٧/٩/٢ سەرەك وەزیرانی تورکیا – رەجەب تەیب ئۆردگان – بەرامبەر بە پەرلەمانی تورکیا لە ووتەیەکیدا گووتی :– لە پێناو چوونە ناو یەکیەتی ئەوروپا و جێ بە جێکردنی ئەو خالأنەی کە لە سەری رێککەوتووین لە هەموو بوارەکانی چاکسازی و ئاوەدان کردنەوە و کەم کردنەوەی باجی دەرامەت و بەرز کردنەوەی باری ژیانی کۆمەڵگای تورکیا ،
هەروا بەردەوام بوونی لە جێ بەجێکردنی پرۆگرامی چاکسازی ئابووری و ئابووری بازار ... کە ئەمەش دەبێتە بە هێزکردن و بووژاندنەوەی ئابووری و کەمکردنەوەی بێکاری و هەلأوسان و بەرزکردنەوەی داهاتی تاك لە ٥،٥٠٠ هەزار دۆلار مانگانە بۆ ١٠,٠٠٠ هەزار دۆلار مانگانە .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە حکوومەتی پارتی داد و گەشەکردن لە تورکیا توانیویەتی هەلأوسان بەرەو کەمی هەنگاوی پێ بنێ بۆ خوار لە ١٠٪ . کە بۆ یەکەم جارە لە ماوەی ٢٠ سالی رابردوو . هەروا بەرز بوونەوەی بوژانەوە بۆ لە ٧٪ . لە گەڵ بوونی گرفتی دارایی لە ساڵی ٢٠٠١ .
هەروا باری دراوی تورکی ... لیرە توانی گرانی خۆی بۆ ٢٪ . بەهێز بکات بۆ ١,٢٩٧ بەرامبەر بە دۆلاری ئەمەریکی لە بازارەکان و لە نێوان بانکەکان ...
هەروا بەهێزکردنی یاسای دابین کردنی کۆمەلأیەتی . کە خەزنەی کاشی نێوودەوڵەتی داوایکردووە .
بە هەر حاڵ پارتی داد و گەشە پێدان کە دەسەلأتداریەتی تورکیا دەکا توانیویەتی لە هەموو بوارەکان هەنگاوی باش بنێ ، تەنیا لە بواری باری رامیاری و نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئازادیەکانی بیروو بۆ چوون نەبێت ، بە

تايبـەتيش بەرامبـەر بـە گـەلى كـورد و ئەرمـەن لـە بـاكوورى كوردسـتان و بەردەوامى بارى نا ئارامى لە هەريمەكەدا .

٢٠٠٧/٩/٣ بەرێوەبـەرى گـشتى پۆليـسى شـارى دەكـاى پايتـەختى بەنگلاديش – ئەنوەر حوسێن -- لە راگەياندنێكيدا . ئەويش بە دەركردنى فەرمانى دەستگير كردنى سەرەك وەزيرانى پێشووى بەنگلاديش خاتوو – خاليدە زيبا عەبدولرەحمان و كورەكەى – عەرەفات عەبدولرەحمان . دواى ئەوە رەوانەى دادگا كران ، كە بە تۆمەتى تێوەگلان لە گەندەڵى دارايى و چەندين هۆكارى ديكەى خرابووە پاڵيان .

شايانى باسە كە خاليدە زيبا سەرۆكى پارتى نەتەوەيى بەنگلاديشەو لە مانگى /٤/٢٠٠٧ رێگاى پێنەدراوە كە بە ئارەزووى خۆى هاتووچۆ بكات لە ناوەو دەرەوەى ووڵاتەكەيدا .

هەروا خاتوو خاليدە لە دوو خوولى سەرەك وەزيرانى بەنگلاديش پۆستى سەرەك وەزيرانى گرتۆتە دەست لە نێوان ساڵەكانى ١٩٩١ --- ١٩٩٦ و دوايى لە ساڵى ٢٠٠١ تا ٢٠٠٦ لە سەر ووڵاتەكەدا .

٢٠٠٧/٩/٣ سەركردەو سياسەتمەدارى كوردو جيهان و پەرلەمانتارى پێشووى پارتى رەنج و ديموكراسى ، لە پەرلەمانى توركيا ، خاتوو – لەيلا زانا – لە لقى/٦/ ى دادگاى سزاى گرانى لە شارى ديابەكر لە باكوورى كوردستان بە تۆمەتى پروپاگەندەى پارتى لە رێورەسمى ئاهەنگەكانى نەورۆزى ئەساڵ دادگايى كرا.

شايانى باسە كە خاتوو لەيلا زانا لە دانيشتنى يەكەمى دادگايى كردنەكەى بە هۆى نەخۆشى نەيتوانى ئامادە بێت ... بەڵام لقى/٦/ ى دادگاى تاوانى گرانى ديابەكر ، داوا دەكات كە خاتوو لەيلا پەرلەمانتارى پێشووى پارتى رەنج و ديموكراسى و ژنە سياسەتمەدارى كورد لە لێدوانەكانى نەورۆزى ٢٠٠٧ لە شارى ديابەكر لە باكوورى كوردستان ، پروپاگەندەى بۆ پارتى كرێكارانى كوردستان – پەكەكە – كردووە و بە پێى ياسايى دژە تيرۆر هەڵس و كەوتى لە گەڵ دەكرێ ، و داواى ٥ پێنج ساڵ زيندانيشى بۆ كراوە ... ئەگەر تۆمەتەكانى بە سەردا بسەلمێ ، بەڵام خاتوو لەيلا زانا نەك لە دادگا ، بەڵكوو لە هەموو دوژمنانى كوردو كوردستان بەهێزترە لە جيهان .



٢٠٠٧/٩/٦ گـۆرانی بێـژی گـەورەی ئـۆپرا – لۆژانۆ پەڤەرۆتی – سـەر لە بەیانی ئـەمرۆ لـە تەمـەنی ٧١ سـالێدا ماڵئاوایی کرد ... ئەم هونەرمەندە لە شاری مۆدەنا لە هەرێمی ئیمیلیا رۆمانیـا لـە بـاکووری ئیتاڵیـا لـە سـاڵی ١٩٣٦ چـاوی بـە جیهـان هەڵهێناوە .

هـەروا لـە سـاڵی ١٩٦٨ پەڤـەرۆتی دەستی کردووە بە هونـەری ئـۆپرا ، هـەر لـەو کاتـە جـەماوەرێکی زۆری بـۆ خۆی گلدایەوە ، کە هاورێکانی دەنگی ئەم هونەرمەندە بوون ... دوا ئۆپرای پەڤـەرۆتی لـە سـاڵی ٢٠٠٤ بـوو لـە سـەر شـانۆی – خانـەی ئـۆپرای میترۆبۆلینان – لە شاری نیورۆکی ئەمەریکا پێشکەشی کرد.

هەروا پەڤەرۆتی وەکوو گۆرانی بێژێکی ئۆپرا لە هـەموو وولاّتـانی جیهانـدا ناسـراوبوو ، بـە هـۆی دەنگـی رەسـەنی و تایبەتیـەکی بەخـشیبووە گۆرانیەکانی و ... جێگەی و ئاماژە پێکردنە کە پەڤەرۆتی لە ساڵی ٢٠٠٦ دووچـاری نەخۆشـی شـێرپەنجە ببـوو . لـە دوای ئەنجامـدانی چـەندین نەشتەرگەری نەتوانرا لـە نەخۆشیەکەی رزگاری بێت ... کۆچی دوایی ئـەم هونەرمەندە بووە هۆکاری دروست بوونی بۆشایەکی تەواو لە جیهانی ئۆپرا لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/٦ ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنێك لە لایەن ٨ هەشت فرۆکە لە جۆری – f 15 – ی هێزەکانی سووپای ئیسرائیلْ بۆ سـەر سووریا لـە دوای بەزانـدنی ئاسمـانی سووریا و بۆردمان کردنی جێگـەی مەبەست لە پارێزگـای – دێرەزوور – لـە سووریادا .

جێگـەی باسـکردنە کـە ... بـەر لـەو هێرشـە ئاسمانیـەدا هێرشـێکی لـە سـەر زەوی ئەنجامداوە بـۆ شارەزایی زیاتر لە بارەی شوێنە بۆردمانکراوەکە ... کە چەند سەر بازێکی کۆمادۆز لە یەکەی تایبەتی سووپا بە جلی سـەربازی سووپای سووریا توانیان لە سنوور دەربازبن و بەرەو دەزگا سـەربازیەکانی

سووریا برۆن لە پارێزگای دێرەزوور لە باکووری سووریا لە ئاکامدا توانیان چەندین بەلگە بۆ رازیبوونی واشنتۆن بێننە دەست . ئەویش بۆ بە ئەنجامگەیاندنی کارەکانیان .

هەروا هەردوو رۆژنامەی – سەندی تایمزی بەریتانی و نیورۆك تایمزی ئەمەریکا ئەوەیان ئاشکرا کرد لە سەر زاری چەند بەرپرسێکی هەردوو وولآت ، کە فرۆکەکانی تەلئەبیب چەند شوێنێکیان بۆردمان کردووە ، کە بە پێی زانیاریەکانی دەزگای هەواڵگەری ئیسرائیڵ یارمەتی بەرنامەی ناوەکی کۆریای باکوور دەدات .

ئەم زانیاریەش دوای تێکچوونی گفتووگۆکانی پەکین و ئیسرائیڵ روونبووەوە ... دوای ئەوەی کە چین رێگەی پێنەدا ... ئەم گفتووگۆیانەش دەربارەی پرۆگرامی ئەتۆمی کۆریای باکوور هات ، هەروا چاوەروانیش دەکرا کە بەرپرسە ئەمەریکیەکان ئەم پرسە بکەن ... ئەمە لە لایەك و لە چەندین لایەنی دیکە لە پەیوەندی نێوان سووریاو کۆریای باکوور و ، پەیوەندی نێوان کۆریا و ئێران و پەیوەندی نێوان ئیسرائیڵ و ئەمەریکا ، لە گەڵ سووریاو ئێران و هەروا لە گەڵ کۆریای باکوور ، کە چەندین لێدوانی دژ بە یەکتری و چەندین پرسیار لە کێشەو ململانێ و ئەو گفتووگۆیانە سەریان هەڵدا . ئەویش رووداوەکان وەلآمیان دەداتەوە لە داهاتووی هەر وەك لە ناوەرۆکی ئەم کتێبەدا هاتووە لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٩



سەرۆکی ئەفگانستان حامد کارازای لە کاتی خوێندنەوەی وتارێك لە بەرامبەر هەزاران هاوولآتیانی ئەفگانی لە یاریگای وەرزشی لە شاری کابوولی پایتەخت .

ئەویش ناچار بوو لە وتار خوێندنەوەکەی لە یاریگاکەدا دوور کەوێتەوە ، ئەویش بە هۆی

گوێبیستنی له دەنگی تەقەی چەك و ، دوای ئەوە بەرپرسێكی ئەفگانی لە وەزارەتی بەرگری نزیك لە سەرۆكایەتی كۆمار رایگەیاند ، كە تەقەی چەك نە بووە ، بەلكوو بەردی دەست هاوولاتیان بوو ، كە لە دەرگاكانی یاریگایەكەیان دەدا ، بۆ ئەوەی بچنە ناو یاریگاكە ، كە لەو كاتەی ئەو ئاهەنگە ماتەمینیە بۆ یادكردنەوەی شەشەمین سالیادی تیرۆركردنی سەر كردەی ئەفگانی – ئەحمەد شا مەسعوود – بوو

گەر هێزەكانی تالیبان بونایە دەیانتوانی حكوومەتەكەی حامد كارازای برووخێنن كە بە دەنگی بەرد گۆرەپان جێ بهێلێ . لە كابوولی پایتەختی ئەفگانستان .

٢٠٠٧/٩/٩ بەبۆنەی كردنەوەی پاركی یەشار كەمال لە ناوچەی باتمان لە باكووری كوردستان – سەباحەت تۆنجەلی -- پەرلەمانتار وەلامی ئەو داوایەی سەرەك وەزیرانی توركیا – رەجەب تەیب ئۆردگان – ی دایەوە ، كە داوای لە پارتی كۆمەلگای دیموكراتی كورد لە توركیا كرد بوو ، كە پارتی كرێكارانی كوردستان – پەكەكە – بە تیرۆرست بسەلمێنێ .

لە وولامدا گووتی :– نابێ هیچ كەس ئەوە بەسەر ئێمەدا بسەلمێنێ و چاوەروان بێت و براو كورەكانمان بە تیرۆرست بناسێنین و هیچ تاكێكی كورد ئەوە ناكات و ، گەر بشیكات ئەوە دوژمنی كوردو كوردستانە .

٢٠٠٧/٩/٩ رێكخەری حكوومەت بۆ كاروباری نەتەوە یەكگرتووەكان پێشوازی لە بەرپرسانی ١٠ دە رێكخراوی كۆمەلگای مەدەنی كرد ، كە نوێنەرایەتی ٢٢ بیست و دوو سەندیكاو یەكیەتی و رێكخراوی ناحكوومی و چەندین كەسایەتی سەربەخۆ لە هەرێمی باشووری كوردستان كرد .

ئەویش لە خۆپیشاندانێكی ئاشتیانە هاتبوونە بەردەم پەرلەمانی كوردستان ، بە مەبەستی دەربرینی نارەزایی خۆیان و جەماوەری كوردستان لە بەرامبەر ئەو تۆپبارانەی كە ئێران بۆ سەر خەلكی مەدەنی ناوچە سنووریەكانی ئێران و هەرێمی باشووری كوردستان دەیكات لە هەرێمەكەدا .

كە خۆپیشاندەران داوای پالپشتی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و كۆمەلگای مەدەنی و وولاتانی دۆستی كوردی كرد ، بۆ راگرتنی

تۆپبارانکردن و ڕێز گرتن لە مافی مرۆڤ و حکوومەتی هەرێمی کوردستان و ، لە کۆتایی خۆپیشاندانەکەدا ڕێکخەری حکوومەتی یاداشتێکی لە نوێنەرایەتی خۆپیشاندەران وەرگرت .

٢٠٠٧/٩/٩ بریار بوو هەرسێ تاوانبارانی ڕژێمی بەعسی ، وەزیری بەرگری سوڵتان هاشم و ، سەرۆکی ئەرکانی هێزەکانی سووپای بەعس لە ئێراق حوسێن رەشید و ، ئەندامی سەرکردایەتی بەعس لە ئێراق عەلی حەسەن مەجید لە سێدارە بدرێن .

بەڵام پارێزەرێك بە ناوی -- بەدیع عارف -- کە پارێزەری بەرگریکردن بوو لە سەرانی ڕژێمی بەعسی رووخێندراو لە لێدوانێکیدا رایگەیاند ، کە ئەمەریکیەکان رازی نەبوونی خۆیان راگەیاند بە نەدانە دەستەوەی تاوانباران بە حکوومەتی ئێراق ، بۆ ئەوەی بە پێی بریاری دادگا لە سێدارە کردنیان ئەنجام بدرێت و لە هەمان کات بە هۆی نەبوونی مەرسوومی کۆماری بەرامبەر بە تاوانبارانی ئەنفال لە سێدارە نەدران .

٢٠٠٧/٩/١٠ ڕژێمی ئیسلامی لە ئێران لە هەوڵەکانی بەردەوامە لە گەمارۆدانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە هەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لە هەردوو بواری نەتەوەیی و ، نیشتیمانی و ، مێژووی کورد ، کە لە بریارێکیدا رێگەی بە چاپگەیاندنی کتێبی جوولانەوەی کورد گرت بۆ چاپکردنەوەی ، کە یەکێکە لە گرنگترین کتێبەکانی ناو زانکۆکانی جیهان سەبارت بە مێژووی کورد .

شایانی باسە کە ئیبراهیمی یونسی نووسەرو وەرگێری بەناوبانگی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەلاتی ئێران ، ئەو کتێبەی وەرگێراوەتە سەر زمانی فارسی لە ئێران .

سەرچاوە :- رۆژنامەی خەبات ژمارە/٢٦١٣

٢٠٠٧/٩/١٠ بۆ پێك هێنانی لیژنەیەکی هەماهەنگی لە پارت و هێزە رامیاریەکانی ئێراق لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا کۆبوونەوە ، بە ئامادەبوونی نوێنەرانی ئەو لایەنە رامیاریانە کە ، نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان و ، نوێنەری پارتی کۆمۆنیستی ئێراق و ، ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراق و ، پارتی دەعوەی ئیسلامی لە ئێراق و ، یەکیەتی

ئیسلامی تورکمانی ئێراق و ، هاوپەیمانی دیموکراتی ئێراق .
ئەویش بە هەڵسەنگاندنی بارو دۆخ و رەوشی ئەمڕۆی ئێراق . هەروا ئەو گیروگرفتانەی کە دەبنە بەر بەست ، لە بەردەم چەسپاندنی یاساو بوونیاتنانەوەی دەووڵەتێکی دیموکراتی فیدراڵ .
کۆبوونەوەکە بەردەوام بوو لە سەر دەستووری هەمیشەیی و ماددەی/١٤٠ ی دەستوورو بە مەبەستی بوونیاتنانەوەی دەووڵەتی ئێراق و یاساو رێزگرتن لە مافی مرۆڤ لەم وولاتەدا .

٢٠٠٧/٩/١٠ دوای ٧ حەوت ساڵ لە ئاوارەیی سەرەك وەزیرانی پێشووی پاکستانی لادراو – نەواز شەریف – بە رێگەی کودەتای سەربازی لە لایەن پەرویز موشەرەفی سەرەك کۆماری ئێستای پاکستان و ، ئەویش بە هۆی لێکترازانی باری رامیاری و ئایینی و هۆزو تیرە و نەتەوەیی و کۆمەلایەتی لە رێگەی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا گەرایەوە پاکستان و لە شاری ئیسلام ئابادی پایتەخت لە فرۆکەخانە هاتە خوارەوەو لە لایەن ژمارەیەك لە لایەنگرانی لە دەرەوەی فرۆکەخانەکە پێشوازی لێکرا .



هەر لەوکات لە لێدوانێکیدا دوای دابەزینی لە فرۆکە گووتی :– هەست بە خۆشی دەکەم و ئامادەشم بەرەنگاری هەر هەڵوێستێك ببمەوە و لە هەمان کات لایەنگرانی نەواز شەریف هەوڵی چوونە ژوورەوەی ناو فرۆکەخانەکەیاندا و رووبەرووی پۆلیس بوونەوەو ژمارەیەك لە لایەنگرانی دەستگیر کران .
دوای ئەوە بە بریارێکی پێشووی دەستەی دەسپاکی بە تۆمەتی گەندەڵی دووبارە بۆ وولاتی سعوودیە رەوانە کرایەوە .
لە دوای لادانی شەریف لە پۆستی سەرەك وەزیران و زیندانی کردنی بە

هەتاهەتایە بە هۆی ناوزەند کردنی بە گەندەڵی و ، دوای ئەوە لە ڕێکەوتنێك بۆ ماوەی ١٠ ساڵ بۆ وولاتی سعوودیە دوور خرایەووە لە وولاتەکەی .

٢٠٠٧/٩/١٠ دەسەلاتدارانی تورکیا لە راگەیاندنێکیدا چاوەروانی وەلامی حکوومەتی ئیسرائیلی دەکرد ، دەربارەی ئەو دوو تانکیە بەنزینەی کە لە نزیك سنووری نێوان سووریاو تورکیا دۆزراوەتەوە و رەنگبێت ئەو دوو تانکیە لە فرۆکە کەوتبێتە خوارەوە .

وەزیری دەرەوەی تورکیا عەلی باباجان لە کۆنگریەکی رۆژنامەوانی هاوبەش لە گەڵ وەزیری دەرەوەی سووریا وەلید ئەلموعەلم ... کە ئەو پەرەسەندنە مایەی قبووڵ کردن نیە ... ئەمەش بۆتە هۆکاری دروست بوونی کێشەی زیاتر لە نێوان سووریاو تورکیا ، لە لایەك و کێشەی نێوان سووریاو ئیسرائیڵ لە لایەکی دیکە لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١٠ بۆ هەڵسەنگاندنی رەوشی ئێراق و ناوچەکە ، کۆنگرێسی ئەمەریکا گفتووگۆو پرسیارو وەلامی لە سەر هەردوو راپۆرتی فەرماندەی هێزەکانی فرەرەگەزەکان لە ئێراق – دیڤید پترایۆس – و باڵوێزی ئەمەریکا لە ئێراق – رایان کرۆکەر – کرد .

لەوکاتەش ژمارەیەك لە لایەن چەند کەسێکەوە لە هۆڵی دانیشتنەکە هەبوو ، کە پاسەوانان رەوانەی دەرەوەیان کردن ، لە سەرەتاوە پترایۆس ئاماژەی بەوەدا کە ستراتیژیەتی ئەمەریکا لە ئێراق ئامانجە سەربازیەکانی بە شێوەیەکی فراوان بەدی هێناوە ، بەلاّم بە کشانەوەی هێزەکانی زیان بە ئێراق دەگەیەنێ .

دوای ئەویش رایان کرۆکەر راپۆرتەکەی خوێندەوەو ئاماژەی بەوەدا کە سەر لە بەری دەزگاکانی سەردەمی سەدام نەماون و ئێراق کۆمەڵگایەکی ئازار دیدەیە و دەیەوێ رزگاری بێت

شایانی باسە کە راپۆرتی هەردوو بەرپرسی بالاّی ئەمەریکا لە ناوەرۆکی راپۆرتەکانیان ئاماژەیان بە چەندین لایەنی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و ئاوەدان کردنەوە و ئاسایش و پەیوەندیەکان کردووە . لە ناوەوەو دەرەوەی ئێراق و هەرێم و ناوچەو جیهان و ، پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو مەزهەب

شیعەو سوونەی عەرەب و ، کوردو ، باری تەواوی ئێراق و کاردانەوەی لە سەر دراوسێکان و ناوچەکەو دەست تێوەردانی دراوسێکان لە سەر باری ئێراق .

هەروا لەو کاتەش کۆبوونەوەی نێوان ئەمەریکاو بەعسیەکانی لابالی عزەت دووری لە بزێوانی سەرەك وەزیرانی پێشووی ئێراق – ئەیاد عەلاوی – بەردەوامە و چەند لایەنێکی رامیاری ئێراقیش بەوە رازی نین و ، لە هەمان کاتیش کورد چاوپێکەوتنی لە گەڵ لابالی عزەت ئەنجامد\اوە .

ئەم هەولانەش تاکو ئێستا نەیانتوانیە باری ئێراق و چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکان چارەسەر بکات . لە هەموو بوارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و ئابووری و بژێوی ژیانی گەلانی ئێراق و چەندین بواری دیکە ، بە تایبەتی لە بواری ئەمنی و ئارامی لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٩/١١ بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی سنوورو دیاریکردنی سنووری نێوان هەرێمی باشووری کوردستان و کۆماری ئیسلامی ئێران ، کە هەر لە سەر خاکی کوردستانە ، ... شاندێکی حکوومەتی ئێراق بە سەرکردایەتی محەمەد ئەنباری بەرێوەبەری گشتی سنوور لە وەزارەتی دەرەوەی ئێراق و بە ئەندامیەتی راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی حکوومەتی هەرێم لە باشووری کوردستان و نوێنەری ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێراق سەردانی خاڵی سنووری حاجی ئۆمەرانیان کرد لە هەرێمەکەدا .

ئەویش لە کۆمەڵگای گومرگی حاجی ئۆمەران لە گەڵ شاندێکی وەزارەتی دەرەوەی ئێران بە سەرۆکایەتی کازمی فروتانی سەرۆکی دەستنیشانکردنی سنوور لە وەزارەتی دەرەوەی ئێران کۆبوونەوە ... دوای کۆبوونەوەکە سەردانی چەندین ناوچەی سنووریان کرد ، کە کۆماری ئیسلامی ئێران بە خاکی خۆی دەزانێ و ، دوای ئەو سنوورانەوەش ، دووبارە دەستیان بە کۆبوونەوە کرد ، بە مەبەستی دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو لە نێوانیاندا . بەلام لە ئاکامدا نەگەیشتنە هیچ رێکەوتنێك .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ناکۆکیەکانی سنووری لە نێوان هەردوو رژێمی شایەتی لە ئێران و ، بەعس لە ئێراق ، دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٥ ، ئەویش لە ئەنجامی رێکەتنە شۆمەکەی ١٩٧٥/٣/٦ ی جەزائر بوو ، کە

رژێمی ئەوسای بەعس لە ئێراق بۆ دژایەتی کردنی شۆڕشی ئەیلول رووبەرێکی زۆری لە خاکی ئێراقی بە ئێران بەخشی ،... کە سنووری هەردوو وولاتی دروستکراو لە سەر خاکی کوردستانە ، بە پێی نەخشەی دارێژراوی پەیمانی سایکس بیکۆی ١٩١٦ و جیٚ بە جێکەرەکەی پەیمانی لۆزانی سالی ١٩٢٣ بوو ، بە دابەشکردنی خاك و گەلی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١١ سەرۆکی کۆمەلگای دیموکراتیك و ئەندامی پەرلەمانی تورکیا و نوێنەری پارێزگای ماردین — ئەحمەد تورك — لە لێدوانێکیدا گووتی :- گەر دەسەلاتدانی رژێمی تورکیا رێگەیان لێگرتین و رێگەی ئاشتی دابخەن ، ئەوا پەرلەمانتارە کوردەکان لە پەرلەمان دەکشێنەوە.



کە ئەمەش کاریگەری تەنها لە سەر — دەتەپە — نابێت ، بەلکو کاریگەری لە سەر هەموو لایەنەکان دەبێت . لە هەمان کات راشیگەیاند ، کە هەسیٚ پەرلەمانتاری کوردی ئافرەت خاتوو — ئایسك توگلوگ ، و ، ئایلا تاکات ئاتاو , سەباهەت تونگلٚ — لە لایەن دادگای نۆهەمینی شاری ئەستەمبوٚل دادگایی دەکرێن و ، ئەگەر لە سەر ئەوسیٚ پەرلەمانتارە هیچ کۆمەلێك هەبیٚ ئەوا لە ئەندامیەتی پەرلەمانی تورکیا دوور دەخرێنەوە و لەم رووەشەوە لە سەر فراکسیۆنی دەتەپە لە ناو پەرلەمان نامێنن .

کە دادگای نۆیەمی تورکیا پێشێلی دەستووری تورکیا دەکات ، لە بەر ئەوەی بە پێی ماددەو برگەکان و خالەکانی دەستووری تورکیا هیچ پەرلەمانتارێك نابیٚ دادگایی بکرێت لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١١ دانووستانێك لە نێوان هەردوو شاندی نووسینگەی سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری مالکی و ، بالوێزخانەی ئەمەریکا لە شاری بەغدا بەرێوە چوو ، ئەویش بە مەبەستی وەرگرتنی تاوانبار عەلی حەسەن مەجید ناسراو بە —

عەلی کیمیاوی – لە ئێراق و عەرەب و لە جیهاندا .

شایانی باسکردنە کە ئەمەریکیەکان بەر لەو کۆبوونەوەیە ئامادە نەبوون عەلی کیمیاوی رادەستی لایەنی ئێراق بکەن ، کە وەك پێشتر بریاری لە سەر درابوو . هەروا حکوومەتی ئێراق بریاری لە سێدارەدانی عەلی کیمیاوی داوەو هەرکاتێ ئەمەریکا ئەو تاوانبارە بداتەوە دەست حکوومەتی ئێراق راستەوخۆ لە گرتووخانەی کازمیە لە شاری بەغدا سزای لە سێدارەدانی بەسەردا جێ بە جێی دەکرێت لە لایەن دادگای ئێراق .

٢٠٠٧/٩/١١ سەرەك کۆماری هەڵبژێردراو لە پارتی دادو گەشەپێدان – عەبدوڵلا گووڵ – یەکەم سەردانی لە ناو وولاتی تورکیا بۆ پارێزگاکانی باکووری کوردستان بوو ، کە یەکەم سەردانیشی بۆ شاری وان بوو ، لە باڵەخانەی پارێزگا لە گەڵ نوێنەری رێکخراوی سڤیلەکان دیدارو کۆبوونەوەی ساز کرد لە شارەکەدا .

لەو کۆبوونەوەیە عەبدوڵلا گووڵ لە وتەکانیدا گووتی :– ماوەیەکی دوورو درێژە لە تورکیا لە نێوو سیاسەتدا کار دەکەم وەك هەر کێشەیەکی دیکە پێزانینم لە سەر کێشەی کورد هەیەو لەو کاتەشدا ئێمە ئەو کێشەیە دەخەینە ناو بەرنامەکان و هەوڵی چارەسەر کردنی دەدەین .

دوای ئەوە سەردانی باشکەلای سەر بە وان و جۆلە مێرگ و گەڤەریشی کرد ، و دوای ئەوانە سەردانی شاری ئەمەدی کردو لە لایەن سەرۆکی شارەوانی ئەمەد – دیاربەکر – ئوسمان بایدەمیر دۆسیەکی پێشکەش بە سەرەك کۆماری تورکیا کرد لە بارەی باری پارێزگاکەو هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١١ حکوومەتی سعوودیە رێکەوتنی کرینی ٧٢ فرۆکەی لە – بۆرنایتر – لە جۆری تایفۆن لە گەڵ کومپانیای – بی ئایەتی – مۆرکرد ، بە بری ٨,٨٤٠٠ ملیار دۆلار بەرامبەر ٤,٤٣٠٠ ملیار ژوونەی ئیسترلینی .

شاینی باسە کە ئەمەش بۆتە جێگەی گفتووگۆ و نووسینی بابەتی لە رۆژنامە بەریتانیەکان لە دوای راگەیاندنی وەزیری بەرگری سعوودیە بە کرینی ئەو فرۆکانە ، ئەمەش بە هۆی کێشەی نێوان سعوودیە و بەریتانیا ، کە کاتی خۆی چەندین رێکەوتن لەم شێوەیە مۆرکراوە لە ساڵی ٢٠٠٥ ، ئەویش بە وەرگرتنی یەك ملیار دۆلار بەرتیل لە پێناو مۆرکردنی

گرێبەستەکە بە ٤٣ ملیار دۆلار لە نێوان سعوودیە و بەریتانیا لە لایەن بالوێزو راوێژکاری سعوودی – ئەمیر بەندەر سوڵتانی کوری وەزیری بەرگری سعوودیە .

هەروا لە هەمان کات وەزارەتی دادی ئەمەریکا لە مانگی ٢٠٠٧/٦/ هەڵسا بە لێکۆڵینەوە لە سەر هەڵوێست و گرێبەستەکانی ئەم کومپانیایە و بەربەرەکانی کردنی گەندەڵی لە فرۆشتن و گرێبەستەکانیدا .

لە هەمان کات کۆمەڵگایەکی پیشەسازی کە کومپانیاکانی ، بەریتانیا و ، فەرەنساو ، ئیتاڵیا و ، ئەسپانیا ، کاری دروستکردنی فرۆکە جەنگیەکانی ئەوروپا دەکەن ، بە ناوی یۆرۆفایتر لە پێناو بەهێزکردنی باری سەربازی و فرۆشتنی بە وولاتانی دیکە لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/١٢ رۆژنامەی خەبات کە لە سایدی – a f p -- وەرگرتبوو بلاوی کردەوە کە رێکخراوی تەندروستی جیهان ٧٠٠٠ هەزار حالەتی تووشبوون بە نەخۆشی کۆلێرا لە کوردستان بەدیکردووە لە پارێزگاکانی سلێمانی و ، کەرکوك و ، هەولێر ، لە باشووری کوردستان .

کەچی ٢٩٠ حاڵەت لە تاقیگەکان دووپاتکراونەتەوە ، ئەمەش لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی ئاوی خواردنەوەی بۆری راکێشراو لە گەڵ ئاوی ئاوەرۆکان و ئاوی پیس و خواردنی ماوە بەسەر چوو ، کە لە رێگەی بازرگانەکانی کوردستان دەهاتنە ناو هەرێمی کوردستان .

٢٠٠٧/٩/١٢ گەوورە بازرگانی مادده بێ هۆشکەرەکان – دیگۆلیۆن مۆنتۆیا – لە ئۆپراسیۆنێکی سەربازی لە لایەن هێزەکانی سووپای کۆلۆمبیا دەستگیرکرا ، و دوای دەستگیرکردنی رەوانەی شاری بۆگۆتای پایتەختی کۆلۆمیا کرا .

شایانی باسکردنە کە ئیدارەی ئەمەریکا ماوەی حەوت ساڵ هەوڵی دەستگیر کردنی دیگۆلیۆن دەدات ، ئەم بازرگانە گەوورە جیهانیە لە چەندین وولات کێشەی جۆراوجۆری نابووەو هەر لە بەر ئەوەش ئەمەریکا بری ٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری بۆ ئەو کەسە تەرخان کردبوو ، کە زانیاری راست و دروست بداتە ئەمەریکا ، لە پێناو دەستگیر کردنی دیگۆلیۆن لە هەر وولاتێك لە وولاتەکانی جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/١٢ دادگای باڵای حکوومەتی فلیپین لە راگەیاندنێکیدا لە شاری مانێلای پایتەخت ، ئەویش بە زیندانی کردنی سەرۆکی پێشووی فلیپین – جۆزێف ئیسترادا – ئەویش بە تۆمەتی گەندەڵی دارایی ... چونکە لە ماوەی دەسەڵاتەکەی سەرۆك کۆماری فلیپین ئیسترادا بۆ ماوەی دوو ساڵ نزیکەی ٨٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری بە رێگەی نا یاسایی بە دەست هێناوە .

هەروا دادگا بریاریدا بەوەی کە هەرچی پارەو سامانی ناوبراو کە لە ناو بانکەکان هەیە بلۆك بکرێت ،... شایانی باسە کە لە ئەنجامی شۆڕشێکی مللی لە ساڵی ٢٠٠١ بە هاوکاری سووپا لە دەسەلات لادرا لە سەر وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١٢ دوای زنجیرەیەك لە کۆبوونەوەی نێوان هەردوو شاندی حکوومەتی ئێراق و حکوومەتی ئیسلامی ئێران ، بە ئامادەبوونی نوێنەری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان ، سەبارەت بە دیاریکردنی سنوورو بە فەرمیکردنی دەروازەی حاجی ئۆمەران ، وەك دەروازەیەکی بازرگانی لە نێوان حکوومەتی هەرێم و حکوومەتی ئیسلامی لە ئێران .

ئەویش بە مۆرکردنی رێکەوتن لە سەر بەفەرمی ناساندنی دەروازەی حاجی ئۆمەران وەك بازارێکی بازرگانی هاوبەش و . هەروا هاووڵاتیانی هەردوو لایەن دەتوانن بە رێگەی پاسەپۆرت هامووشۆ لە خاڵە سنووریەکان بکەن . بۆ ئێران و بە پێچەوانەشە .

٢٠٠٧/٩/١٣ ئاژانسی گەردوونی یابان – ژاپۆن – یەکەم مانگی دەستکردی بە ناوی – مسیار – ی گەردوونی بەرەو بۆشایی گەردوون رەوانە کرد ، ئەرکەکانی ئەو مانگە کارەکانی دۆزینەوەی رووی مانگە ... ئەو مووشەکەی کە مسیاری هەڵگرتبوو لە مەڵبەندی گەردوونی لە دوورگەی تاتیکاشما رەوانە کرد لە وولاتەکەدا .

مسیار هەڵدەستێ بە کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر بوونی مانگ و پەرەسەندنی لە ماوەی مێژووی لە ماوەی یەك ساڵدا ، ئەم کارەش زۆر گرانە کە بەر لەوەش ئاژانسی ناسای گەردوونی و پرۆگرامی ئەپۆلۆ ، بۆ دۆزینەوەی زانیاری لە ساڵەکانی ١٩٦٠ - ١٩٧٠ دا ، کە زاناکانی ئەم بوارە لە سەر مانگ هاتنە خوارەوە بۆ زانیاری وەرگرتن لە سەر رووی مانگ ...
گرانی ئەو مسیارە /٣ تەنە و هەڵگری ناوی - سیلینی - پێووەیە .
بەلآم ناوەکەی دیکەی بە ناوی ئافرەتێکە کە لە چیرۆکەکان باسی لێووە دەکەن بە ناوی - کاژۆیا - کە گوایە لە سەر رووی مانگ هاتتە خوارەوە ، بەر لەوەی مسیار لە سەر مانگ دەسووڕێتەوە لە ماوەی ٣٨٠ هەزار کیلۆ مەتر . لەو کاتە دێتە سەر مانگ ، دوو مانگی دەستکرد لێی جیا دەبنەوە بە دووری ١٠٠ کیلۆ مەتر لە سەر رووی مانگ .

٢٠٠٧/٩/١٤ بۆ یەکەم جار لە مێژووی وتار خوێنەکانی مزگەوتەکانی کوردستان بە تایبەتی لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستان ، داوا بکەن کە قوتابخانەو نەخۆشخانە دروست بکرێت لە جیاتی دروستکردنی مزگەوت ، ... ئەمەش بە هۆی جیاوازی رێژەی زۆری لە نێوان مزگەوت و قوتابخانەکان ، کە رێژەی مزگەوت زۆرترە و گەلی کوردستان پێویستی بە قوتابخانەو نەخۆشخانە زیاتر هەیە لە هەرێمەکەدا .
ئەمەش بە داواکردنیان - مەلا ئاینیەکان -- لە خاوەن سەرمایەکان و خاوەن کومپانیاکان و خێرخوازانی کوردستان ، کە دەست بکەن بە دروستکردنی نەخۆشخانەو قوتابخانە لە جیاتی مزگەوت لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١٦ زیاتر لە ٣٠ سیی رێکخراوی مرۆڤایەتی و مافی مرۆڤ لە ٥٠ پەنجا وولآت لە خۆپیشاندان کردنیانە رۆژی جیهان ، لە پێناو هەرێمی دارفوور لە سوودان ، بەلآم رێکخراوە سوودانیەکان دژی ئەو رێپێوان و خۆپیشاندانە بوون و وایان ناوزەند کرد ، کە ئەوە پیلانێکی ئیسرائیلیە و لە هەمان کات ، سەرەك وەزیرانی بەریتانیا گۆردن براون هەرەشەی سزادانی زیاتری سوودانی کرد ، بە هۆی نا لە باری و پێشێل کردن و تواندنەوەی نژادی و ئاینی و دەربەدەر کردنی دانیشتووانی هەرێمەکەو لە ناویاندا ناوچەی کوردڤان ، کە بە ناوچەیەکی کوردنشین ناوزەندە لە وولآتەکەدا .

ناوچەی کوردڤان لە کاتی دەسەڵاتی سوڵتان سەلاحەدین ئەیوبی برایەکی فەرمانرەوای ئەو ناوچەیە بووەو پاشماوەی دانیشتووانەکە لە کوردن . لە لایەکی دیکە یەکیەتی ئەفەریکیا لە راگەیاندنێکیدا بۆ تەواوی کردنی هێزی سەربازی پارێز گەیشتە ٢٦ هەزار سەرباز لە هەرێمەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١٦ لە ئاکامی کەوتنە خوارەوەی فرۆکەیەکی تایلەندی لە فرۆکەخانەی دوورگەی – ڤیوکیتی – تایلاندی ٨٠ هەشتا کەس بوونە قوربانی و ٤٠ کەسیش زامداربوون ... کە ١٢٣ کەس لە گروپی فرۆکەوانەکان ... لە کاتی هاتنە خوارەوەی فرۆکەکە هەلخلیسکا بە هۆی باوبارانێکی زۆرو بە هێز کە بووە هۆی ئاگر بەربوون لە فرۆکەکەدا .

هەروا فرۆکەکەش سەربە کومپانیای – وان تۆژوو – بوو ، کە لە شاری بانکۆکی تایلاندی و زۆربەی هاووڵاتیانی ناو فرۆکەکە تایلاندی نەبوون و فەرەنسی و ، بەریتانی و ، ئتالی و ، سوویدی و، ئێرانی بوون ، ئەمەش بە هۆی نەدیتنی فرۆکەوانەکە بە هۆی تەم و مژی و بارانبارین بوون و فرۆکەخانەو جێگەی هاتنە خوارەوەی فرۆکەکە .

٢٠٠٧/٩/١٧ بالوێزی پێشووی ئەمەریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان – جۆن بۆلتن – لە میانەی چاوپێکەتنێکی لە گەڵ کەناڵی ئاسمانی /١٠ی ئیسرائیلی گووتی :– بروام وایە ئەم نامە ئاشکرایە تەنها بۆ سووریا نیە ، بەلکوو بۆ ئێرانیشە و ئاگاداری دەکاتەوە ، کە لە بوونی چەکی ناوەکی ئێران دا بیّ دەنگ نابێت و تاکو ئێستا کە ئیسرائیل لە بۆردمان کردنی ناوچەیەکی گرنگی ناو خاکی سووریا بێدەنگە .

ئەمەش کە گوایە دامەزراوەیەکی ناوەکی بووەو کەلوپەلی تاقیگەی پیّ گەیشتووە ... بۆلتن روونیکردەوە . ئەگەر گرنگیەکی زۆری نەبوایە لە رووی هەوڵدان بۆ بەرهەم هێنانی چەکی ناوەکی لە لایەن سووریاوە ، ئیسرائیل ئەو هێرشە ئاسمانیەی ئەنجام نەدەدا لە ناوخاکی سووریا .

٢٠٠٧/٩/١٧ نوێنەری تایبەتی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئێراق ئەشرەف قازی سەردانی قەزای شەنگالی لە هەرێمی باشووری کوردستان کردو لە لایەن جێگری پارێزگای مووسڵ و دام و دەزگا پارتی و حکوومی لە قەزاکە پێشوازی لێکرا .

هەروا ئەشرەف قازی سەردانی شووێنە زیان لێکەوتووەکانی قەزاکەی کرد

و بەرپرسان و جەماوەرێکی زۆری قەزاکە یاداشتنامەیەکیان دەربارەی جێ بە جێکردنی ماددەی/ ١٤٠ ی دەستووری هەمیشەیی ئێراق و رەوشی کورد لــە دەڤەرەکــە دا پێــشکەشکرد ، نوێنــەری نەتــەوە یــەکگرتووەکان داواکاریەکانی خەڵکی شەنگالی بە گرنگ و بایەخ زانی و بەڵێنی گەیاندن و هەوڵی جێ بە جێکردنی یادلشتننامەکەیدا .

٢٠٠٧/٩/١٨ سـەرۆکی کۆمـاری فـەنزویلا – هۆگـۆ شـاڤێز – هەرەشـەی داخـستنی لـە قوتابخانە تایبەتیەکان کرد ، گەر بێتوو پرۆگرام و ئامانجی سۆشیالیستی نەگرنەبەر و لە هەمان کات گووتی :– پێویستە ئەو قوتابخانانەو خوێندنی تیادا لە پێناو بەرزکردنەوەی گیانی برایەتی و هاوکاری تیادا پیادە بکرێت لە وولاتەکەدا ... هەروا گووتی:–

رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی رابردوو نەیانتوانیە رابردووی وولاتەکەیان بگەیەننە گەلی فەنزویلا و لایەنێکی بنەرەتی لە رۆشنبیر کردنی گەل ، ... شـایانی باسـە کـە هۆگـۆ شـاڤێز برووبۆچـوون و هەڵوێـستەکانی رووەو رژێمێکی سۆشیالیستیە و دژ بە ئەمەریکایە .

٢٠٠٧/٩/١٨ حکوومـەتی ئۆکرانیـا رەزامەنـدی لـە سـەر داپۆشـینی وێـستگەی تشیرنۆبڵی ئەتۆمی کرد بە بەرگێکی فولازی ... ئەمـەش بـە هـۆی کارەساتە بێ وێنەکەی ئەم وێستەگیە دێت لە مێـژووی جیهانـدا . ئەم هەنگاوەش لە دوای ئەوە دێت ، کە وێستگەی ئەتۆمی تشیرنۆبڵ لە ساڵی ١٩٨٦ تەقیەوە و حکوومەتی ئۆکرانیا ماوەیەکە لە هەوڵەکانی بەردەوامە لە گەڵ کومپانیە فەرەنسیەکان ، لە پێناو بەرگ کردن و داپۆشینی دەزگاکان و کارگەکانی ئەم وێستگەیە بە فولازو خەرجی داپۆشینی مەزەندە دەکرێ بە ١،٤٠٠ ملیار دۆلار و ماوەکەشی ٥ پێنج ساڵ دەخایەنێ .

هەروا دوای ئەوە دەسەلاتدارانی ئۆکرانیا دەتوانن ئەم وێستگەیە هەنگاو بە

هــەنگاو هەڵوەشــێننەوە و وولاّتــانی یارمــەتی دەریــش بــەڵنی یارمــەتی حکوومــەتی ئۆکرانیایانــدا ، لەوانــە بــانکی ئــەورووپی ، لــە پێنــاو ئاوەدان کردنــەوەو گەشــەپێدان . بــۆ ئــەم بەرگــە داپۆشــراوە ، کومپانیــای نۆڤارکــای فەرەنسی بەو کارە هەڵدەستیّ بە شێوەی کەوانەیی بە درێــژی ٢٠٠ مــەتر و پــانی ١٩٠ مــەتر ... تــاکو ئێــستاش لــە ٩٥٪ . مــاددە ئەتۆمیــەکان لــە نــاو خەزنەکانــدا هــەر مــاوە . لــە هــەمان کــات کومپانیــای هــۆڵتکی ئەمــەریکا رێکەوتنی دروستکردنی کۆگای دانانی پاشماوەی ئەتۆمی کە لە وێستگەی تشیرنۆبلّ دەردەچێت مۆرکرد .

٢٠٠٧/٩/١٨ حکوومەتی کۆریای باکوور ئەو رەخنەو تاوانباریەتەی کە ئاراستەی کۆریــا کرابــوو لــە مەڕدامەزرانــدنی دەزگــای ئــەتۆمی لــە سووریا و هاوکــاری کردنــی سووریای لــەم بــوارەدا رەتکــردەوە ، ئەمــەش بــە هــۆی ئــەو بۆردمانــەی کــە لــە ٢٠٠٧/٩/٦ فرۆکــەکانی هێــزی ســووپای ئیــسرائیل بۆردمــانی ناوچــەیەکی گرنگی سەربازی کردبوو لە ناوخاکی سووریا ، ئەویش بــە بیانووی ئەوەی کە لۆریەکی گەورەی بارهەڵگری پڕ لە چەك و تەقەمەنی و بردنــی بــۆ پــارت و حزبوڵلاّی لوبنان .

لــە هــەمان کــات رۆژنامــەی تــایمزی ئەمــەریکی لــە راپۆرتێکیــدا پەیوەندیــەتی نهێنیــەکانی نێــوان کۆریــا و حکوومــەتی ســووریای بــلاّو کــردەوە لــە بــارەی دامەزراندنی دەزگای چەکی ئەتۆمی لە سووریا .

بــەلاّم کۆریــای بــاکوور ئــەو لێدوانــەی کــە لــە لایــەن بەرپرســانی ســەربازی و مەدەنی لە لایەن هەردوو حکوومەتی ئەمەریکاو ئیسرائیل رەتکردەوەو بە لە بار بردنی پەیوەندیە نێوو دەووڵتیەکانی نێوان وولاّتانی جیهان وەسف کرد لە جیهان و لە لایەن ئەمەریکادا .

٢٠٠٧/٩/١٨ رۆژنامــەی خــەبات لــە ژمــارە/ ٢٦٢١ بــلاّوی کــردەوە کــە وەزیــری دەرەوەی پێــشووی ئەمــەریکا – هنــری کــسنژەر – لــە بابەتێکیــدا ، کــە لــە رۆژنامــەی خەلیج تایمز بلاّوکراوەتەوە باسی ئەوەی کردووە ، کە کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق ، دەبێتە هۆی دروستبوونی جەنگێکی ناوخۆیی بەهێز لە ئێراقدا . کە تەنانەت رەنگە بگاتە ئاستی پاکتاوکردنی نــەژادی لــەو وولاّتەدا .

هەروا کیسنژەر نووسیویەتی ، کە پێشبینی ئەوەش دەکات کە لە کاتی کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ئێراق ، رەنگە ئێران و تورکیا جەنگێکی فراوان لە دژی کورد بەرپابکەن ، کە خوازیاری سەربەخۆیی وولاتەکەیانن لە ناوچەکەدا .

شایانی باسە کە کیسنژەر ئەو کەسە بوو کە ئامۆژگارو سەرپەرشتیاری رێکەتننامەکەی ١٩٧٥/٣/٦ ی جەزائر بوو لە نێوان هەردوو رژێمی ئێران و ئێراق دژ بە کورد و هەرەس پێهێنانی شۆڕشی ئەیلول لە باشووری هەرێمی کوردستان لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٩/١٨ حکوومەتی سعوودیە لە زاری وەزیری ناوخۆی – ئەمیر نایف – رایگەیاند ، کە حکوومەتی سعوودیە گرێبەستی دروستکردنی دیوارێکی ئەلکترۆنی و کۆنکریتی و پشت بەستن بە کامیرا ، بە درێژایی سنووری نێوان ئێراق و سعوودیە راگەیاند . کە خەرجی ئەو دیوارە هەمە لایەنە نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی تێدەچێ .

ئەمەش لە پێناو رێگە گرتن لەو تیرۆرستانەی کە لە سەر سنووری نێوان هەردوو وولات هاتوو چۆ دەکەن ، بە تایبەتی لە لایەنی سعوودیە بۆ ئێراق و رێگەگرتن لێیان بۆ ئەوەی بتوانرێ باری ئێراق و ناچەکە بەرەو ئارامی و بتەوکردنی ئاسایش بروات لە ناوچەکەدا.

٢٠٠٧/٩/١٩ وەقفی هێنرش یوبل نوێنەری رێکخراوی ئەڵمانی سەر پەرشتی کۆنفرانسێکی کرد بە ناوی کوردی تورکیا ... هێنرش لە راگەیاندنێکیدا باسی ئەوەشی کرد ، کە ژمارەیەکی زۆر لە زاناو شارەزایانی بواری کێشەی کورد لە ناوەوەو دەرەوەی تورکیا بەشداری لەو کۆنفرانسە کرد ، کە لە هۆڵێکی شارەوانی لە شاری دیاربەکر – ئامەد – لە باکووری کوردستان بەرێووەچوو . لەو کاتەشدا کە وەزیری دەرەوەی تورکیا عەلی باباجان لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا لە شاری واشنتۆنی ئەمەریکا گووتی:–

حکوومەتی تورکیا خوازیاری ئەوەیە کە یەکپارچەیی خاکی ئێراق پارێزراوبێت و سەرچاوە سرووشتیەکانی ئەو وولاتەش لە نێوو هەموو ئێراقیەکاندا بە یەکسانی دابەش بکرێت .

هەروا لە لایەکی دیکەش بە هۆی شەڕو پێکدادان لە نێوان پارتی کرێکارانی

كوردســـتان – پەكەكـە – و هێزەكـانی ســوپای توركیـا و جاشــە كـوردە خۆفرۆشـەكان ١٤٧ سـەربازی توركیـا و ٢٥ چـەكداری گـەریلاكانی پەكەكـە كوژراون لە مانگی ٢٠٠٧/٨/ . ئەویش لە ئەنجامی ٤٥ هێرشی سەربازی بۆ سەر چەكدارانی پەكەكە ، پەكەكەش ٥٨ چالاكیان لە ناو خاكی كوردستانی داگیركراو لە لایەن رژێمی توركیا ئەنجام داوە لە هەرێمەكەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٠ سـەرۆكی پـارتی گـەلی توركیـا – دنیـز بایكـال – دژایـەتی خـۆی پیشاندا بۆ ئەوەی ، كە پەروەردە بە زمانی كوردی لە توركیا سەربەست بكرێت ، بایكال لە لێدوانێكیدا گووتی :– ئەگەر هەر كەسێ بە زمانی خۆی ئاخاوتن بكات ، زۆری پێناچێت توركیاش وەك دەوڵـەتی یۆگسلافیای لێدێت و خاكەكەی پارچە پارچە دەكرێت .

شایانی باسە كە پارتی دادو گەشەپێدان چەند رۆژێك پێش ئێستا ، زمانی كوردی وەك زمـانێكی بیـانی لـە قەلەمـداوەو دووپـاتی كردۆتـەوە لـەوەی كـە دەكرێت وەكو زمانێكی بیانی مافی پەروەردە بە زمانەكەیان ئازاد بكرێت ... لـە گـەڵ ئـەم هەڵوێـستەدا كـە زیـاتر لـە ٢٥ ملیـۆن كـورد لـە باكووری كوردستانی داگیركراو لـە لایـەن رژێمـی توركیاو توركیـای عوسمـانی بـەر لـە ٥٠٠ ســاڵ داگیركــراوە . كــورد بــەر لــە ١٥٠٠ ســاڵ پــێش بــوونی تــورك نیشتەجێی سەر ئەم خاكە بوونە لە هەرێم و كێشوەرەكەدا

هەروا ئەرمەن لە هەرێمەكەدا .

دوای ئەوەش عەرەب و نەتەوەی دیكە و گەر بەراوردی بكەیت بە كۆی ئەو نەتەوانە نەتەوەی تورك كەمایەتیە لە هەموو بوارەكان لـە توركیـای ئێستاداو بۆ ساڵانی ٢٠١٥ تا ٢٠٢٠ رێـژەی ژمارەی دانیشتووانی كورد و بە رێـژەی ١٠٪ . لە تورك زیاتر دەبێت لە توركیا ، جەگە لە خاكی باكووری كوردستان

.

٢٠٠٧/٩/٢١ ئاهەنگ گێران لە شاری پەکینی پایتەختی چینی مللی بە بۆنەی دامەزراندنی – جۆزێف لی شان – یەکەم قەشەی کاسۆلیکی لە وولاتی چین ، ئەویش لە سەر



رەزامەندی پاپای فاتیکان لە ماوەی ٥٠ پەنجا سالدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە قەشەکان چ لە رێگەی هەڵبژاردن ، یاخوود بە دامەزراندن لە سەر کەنیسەکان ، یاخوود بە سەرکردایەتی کردنی کارە ئایینیەکان ، وەك رابەر ، یاخوود پێشەوا لە چین بێ ئەوەی رەزامەندی پاپای فاتیکان وەربگرن ، ئەویش بە هۆی پچرانی پەیوەندی لە نێوان حکوومەتی چین و فاتیکان لە ساڵی ١٩٥١ بە هۆی دان پێنانی بە حکوومەتی تایوان .

هەر بەم هۆکارەش پاپاش دوو لە قەشەکانی لە ساڵی ٢٠٠٦ دەرکرد ... هەروا ژمارەی هەڵگری مەزهەبی کاسۆلیك لە چینی مللی بە ١٢,٥ ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێت لە وولاتەکەدا .

ئەم ١٢,٥ ملیۆن مەسیحیە کاسۆلیکیەش بوونە دووبەش ... بەشێکیان پشتگیری لە حکوومەتی چین دەکەن و ، بەشەکەی دیکەیان بە نهێنی پەیوەندیان بە فاتیکان هەیە . ئەمەش لە دوای ئەوە هات ، کە پەیوەندی نێوان چینی مللی و فاتیکان بە شێوەیەکی فەرمی بووەو ئەویش بە دەست پێشخەری پاپا – بندکتووسی شانزەهەم – لە نێوانیاندا .

٢٠٠٧/٩/٢١ راپۆرتی دەرچوو لە کۆمەڵەی شانشینی ... کە باڵاترین دەزگای زانستیە لە بەریتانیا ... هۆشداریدا بە کۆکردنەوەی ماددەی بلوتنیۆم لە کۆگاکان ، کە ئەمەش کارێکی مەترسیدارەو ترسناکترین ماددەی ژەهراویە لە وێرانکردنی مرۆڤ و ژێرخانی ئابووری و خاوەنداریەتی کۆمەڵگاکان لە جیهاندا .



هـەروا راپۆرتەکە ئەوەی روونکــردەوە ، کـە ئـەو مادده کۆکەرەوە لە کۆگا تایبەتیــەکان لــە مــاوە دواییــەکانی ســەدەی بیــستەم ... دەتــوانرێ لــەم مــادده بلوتنیۆمــە ۱۰,۰۰۰ دە هــــــەزار بــــۆمبی ئـــــەتۆمی لێدروســت بکرێــت ، کـە هـەر بۆمبێـك بـە قـەدەی ئەو بۆمبە ئەتۆمیەیە کە ئەمەریکا لە ساڵی ۱۹٤٥ لە شاری ناکازاکی دا ، کە بووە هـۆی وێرانکردنـی شارەکەو ئەوەی لـە نـاو ئەو شارەدا هـەبوو لـە مرۆڤ و ئاژەڵ و گیانـەوەر و دارو درەخـت و کژوگیا و ئاووخاك .

سەرەرای ئەوەش ماددەی بلوتنیۆم کە بەکار دەهێنرێ بۆ کاری ئـەتۆمی لـەو وولاتـەدا . هـەروا ئامادەکاری راپۆرتەکـە – گیـوفری بۆلتـوون – کـە ئـەوەی روونکردەوە ، کە ٦ شەش کیلۆ لـە بلوتنیـۆم بەسـە بۆ دروسـتکردنی بۆمبی ئەتۆمی لە جۆری ئەو بۆمبەی کە لە شاری ناکازاکی درا . لـە لایـەن ئیدارەی وولاتە ئەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

هەرچەند حکوومەتی بەریتانیا لەو هەوڵە دایە کە ئەو ماددەیـە خـەرج بکـات لـە دەزگـا خزمەتگوزاریـەکان ، وەك بەرهـەم هێنـانی وزەی کارەبا و چـەندین کـاری دیکـەی خزمــەت کردنــی گــەلی بــەریتانیا و بــەهێزکردنی ژێرخــانی ئابووری و دوور کەوتنەوەی لەو مادد مەترسیدارە لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٧/٩/٢٢ حکوومەتی ئێران بۆ یەکەم جار مووشەکێکی نوێی بە ناوی – قەدەر – ی دوور هاوێژی تاقیکردەوە ، کە ئەو مووشەکە لە ١٨٠٠ کیلۆمەتر دەتوانێ نیشانەی دیاریکراو تێك بشکێنێ ...ئەمەش لەو کاتە هات کە هێزەکانی سووپای ئێران بە بۆنەی یادی ٨ هەشت ساڵەی شەڕی نێوان ئێراق و ئێران لە نمایشێکی سەربازیدا ، کە سەرۆکی ئێران مەحمودی ئەحمەدی نژادی لە وتەکەیدا گووتی :–

ئێران هێزێکی دەست رۆیشتووە لە ناوچەکەو لە جیهاندا . کە ئەو هێزە هەر لە خزمەتی ئاشتیدا بووە و بوونی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ناوچەکە هۆکاری سەرجەم ناکۆکیەکانە .

هەروا لە کۆبوونەوەی ئاژانسی نێوودەووڵەتی وزەی ئەتۆمیدا لە شاری ڤیەنای پایتەختی نەمسا ئەنجامدرا . بەرپرسانی ئێران و ئیسرائیلْ بە شێوەیەکی پێشینە یەکتریان تۆمەتبار کرد .

٢٠٠٧/٩/٢٣ وەزیری دەرەوەی فەرەنسا – برنارد کۆشنێر – لە بەر دەم بەشداربووانی کۆنگرەی ئاوەدانکردنەوەی ئێراق لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە شاری نیورۆکی ئەمەریکا . هەرێمی باشووری کوردستانی بە ناوچەیەکی ئارام ناوزەند کرد و داوای کرد کە لە کوردستانەوە دەست بە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی ئێراق بکرێت

هەروا لە وتەکەید لەو بارەیەوە کۆشنێر پێشنیازی ئەوەی کرد ، کە لە ناوچە ئارامەکانەوە دەست بە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە بکرێت و دوایی قۆناخ بە قۆناخ ناوچەکانی دیکەش بگرێتەوە و داوای کرد ، کە هەرێمی باشووری کوردستان ببێتە دەروازەیەك بۆ ئەو پرۆسەیە لە ئێراقدا .

٢٠٠٧/٩/٢٣ وەزیری دەرەوەی کۆماری بە ناو ئیسلامی لە ئێران لە ٩/٣ تۆپبارانکردنی

ناوچـە سـنووریەکانی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان رەتکـردەوە . بـەڵام ژەنەراڵ یەحیا رەحیمـی سـەفەوی راوێـژکاری تایبـەتی رێبـەری باڵای ئاینی کۆمـاری ئیـسلامی لـە ئێـران عـەلی خامـەنائی بـۆ کاروبـاری سـەربازی لـە لێدوانێکیدا بۆ کـەناڵی . پـاریس تیڤـی —ی ئێرانـی دووپـاتی کـردەوە ، کـە تۆپخانەی سەربازی ئێران چەکدارانی – پژاك – لە ناو خاکی ئێراق بۆردمان دەکات لە ناوچەکەدا .

هەروا گووتی :– لە بەر ئەوەی ئەوان دزە دەکەنـە نـاو خـاکی ئێران و بۆمب دەتەقێننـەوەو رەوشـی ئاسـایش تێـك دەدەن و لـە گـەڵ چـەندین هەڵوێستی دیکەی دژ بە کوردو خاکی کوردسـتان و پێشێل کردنـی مـافی مرۆڤ و مـافی نەتەوەو نیشتیمان لە ناو گەلانی ئێران و بە تایبەتی حکوومـەتی هەرێم لـە باشووری کوردستان .

جێگـەی باسـکردنە کـە رژێمـە یـەك لـە دوای یەکـەکانی فـارس بگـرە لـە ساسانیەکانەوە ، بە تایبەتی لە دوای رێکەوتننامـەی زەهـاوی سـاڵی ١٦٣٩ ی نێـوان ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و سـەفەوی فـارس زیـاتر لـە ٢٠٠,٠٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشـەی لـە خـاکی کوردسـتانی داگیر کـردووە لـە گـەڵ زیـاتر لـە ١٢,٠٠٠,٠٠٠ ملیـۆن مرۆڤـی کـورد و هـەموو مـافێکی مـرۆڤ و نەتەوەو نیشتیمان و زمـان و کـەڵتوورو داب و نـەریت و شـوێنەواری گـەمارۆ داوەو بـە خواسـت و نیـاز و ویـستی خـۆی مامەڵـە لـە گـەڵ کـورد دەکـات لـەو بەشـە کوردسـتانەی کـە لـە ژێـر دەسـتی دایـە و جگـە لـە نەتـەوەکانی دیکـەی ئەزەرو عەرەب ، کە بە ناو دەووڵەتی ئیسلامیە لە ئێران .

لـە گـەڵ ئەوەشـدا شـەڕو پێکـداداان لـە نێـوان چـەکدارانی پـژاك و هێزەکـانی سـووپاو پاسـدارانی ئێـران لـە شـارەکانی کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی ئێـران بەردەوامەو بەرەو بەرز بوونەوە هەنگاو دەنـێ دژ بـە رژێمـی بـە نـاو ئیـسلامی لە ئێراندا .

٢٠٠٧/٩/٢٣ کۆمیـسیاری ئـەورووپا لـە چـوار چـێوەی هەفتـەی ئـەورووپایی بـۆ جوولـە رایگەیانـد ، کـە لـە ١٣٠٠ شـاری وولاّتـانی ئـەورووپا بەشـداری لـە بۆنـەی رۆژێکـی بـێ ئوتومبێـل دەکـەن . دەسـتەی جـێ بـە جێکـردن لـە کۆمیـسیاری ناوبراو لە راگەیانەکەیدا ، کە چەند شارەوانیەك لـە وولاّتـەکانی – بـەرازیل و

، کەنەداو ، کرواتیاو ، ئەکوادۆرو ، تایلاندیش ، بەشداری لەم رۆژەدا کرد .
ئەویش بە پێی ئەو رێورەسمەی ئەو رۆژە هیچ ئوتومبێلێك نابێت بێتە ناو شەقامەکانی شار ، تەنیا بۆیان هەیە لە دەوورووبەری شار هاتوو چۆ بکەن و خەڵکیش بۆ هاتووچۆ کردن هۆیەکانی گواستنەوەی گشتی بە خۆرایی دەبێت و هەموو ساڵێك لەم رۆژەدا ئەم یادە دەکەنەوە لە وولاتەکانیاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٤ سەرکردەی ٨٠ هەشتا وولات لـــە جیهـــان دەســـــتیان بـــــە کۆبوونەوەیـــــەکی تایبـــەتی کـــرد ، ســـــەبارەت بـــــە بەرزبوونـــەوەی پلـــەی گـــــەرمی زەوی لـــــە بارەگای کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە شاری نیورۆکی ئەمەریکا . ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان – بان کی مۆن – بە ووتارێکی کردنەوەکەی دەست پێکرد .



ئەم کۆبوونەوەش دوای چەند رۆژێك لە راگەیاندنی راپۆرتێك لە لایەن زانایانی ئەم بوارەدا هات . کە ئەو چەندیە بەفرەی کە تووەتەوە لە ماوەی ئەم ساڵ لە جەمسەری بەستەڵەکی و زیاتر لە ماوەی مێژووی بوونی زەوی .
ئەم کۆبوونەوەش بە گەورەترین لوتکە دادەنرێت ، کە ١٥٠ وولات و ٨٠ سەرکردە بەشداریان تێدا کرد ، لە بەر رۆشنایی گۆرانی کەش و هەوا لە جیهان .

جێگەی روونکردنەوەیە کە گۆڕانی باری کەش و هەوا لە سەر گۆی زەوی هۆکارەکانی دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی سەرەکی و گرنگ و مەترسیدار لە جیهان ئەویش :–

١–زۆری کارگە هەمە جۆرەکانی بەرهەم هێنان ... جا بیناسازی بێ ، یاخوود لە پێناو بازرگانی پێکردن بێت .

٢– زۆری کارگەی بەرهەم هێنانی هەمەجۆری سەربازی ، وەك دروستکردنی

چەك و تەقەمەنی بە هەموو جۆرەكانی ... بگرە لە دروستكردنی گوللەی تاپر تا دەگاتە چەكی ئەتۆمی لە هەموو بوارەكانی سەربازیدا .

٣- بوونی شەڕی بەردەوام لە چەندین هەرێم و ناوچە لە وولاتە جیا جیكانی جیهان . وەك شەڕی ئێراق و ئەمەریكا ، شەڕی ئەفگانستان و ئەمەریكا . هەروا شەڕی ناوخۆی ئەم وولاتانە و وولاتانی دیكەی وەك ، شەڕی نیوان ئیسرائیل و فەلەستین ، هەروا شەڕی ناوخۆی سوودان و ، سۆماڵ و ، تشادو ، فلپین و ، سەریلانكاو ، چەندین جێگەی دیكە ، كە ئەمە هەمووی رووناكی و بۆنی ژەهراوی لێدەر دەچێت و دەبێتە هۆی پیس كردنی ژینگە ، جا لە ئاو بێت ، یاخوود لە دارو درەخت و زەوی لەم جێگایانە لە جیهاندا

٤- بلاوبوونەوەی زۆری دووكەڵی ئەو بۆریە گازانەی كە لە ئەنجامی بەرێكردنی نەوت دێت لە وولاتەكانی بەهەمهێنەری نەوت لە جیهان ,.

٥- زۆری ئوتومبێڵ لە جیهان كە ئێستا وامەزەندە دەكرێت كە بە ملیار ئوتومبێڵ بە هەموو جۆرەكانی كاری پێدەكرێت ، جگە لە ئوتومبێڵی سەربازی هەمەجۆر ،

بۆ نموونە :- لە كۆتایی ساڵی ٢٠٠٨ ژمارەی ئوتومبێڵ بە هەموو جۆرەكانی لە هەرێمی باشووری كوردستان - ئێراق ، دەگاتە نزیكەی یەك ملیۆن ئوتومبێڵ . كە ئەمەش هۆكاری ئەوەیە كە بەرامبەر ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزار بۆری نەوتی ئاگر تێپەر بوونەو كاردانەوەی ئێجگار زۆری هەیە لە سەر ژینگە . جگە لە كارەكانی دیكەی سووتەمەنی لە هەموو بوارەكانی سووتاندنی و بە كار هێنانی لە جیهاندا .

٦- زۆری پاشماوەی كەل و پەلی - شمكەكان - جەنگە یەك لە دوای یەكەكان ، بە تایبەتی چەكی ئەتۆمی و ماددەی كیمیاوی و ئەتۆمی و هی دیكە لە جیهاندا . بە تایبەتی لە وولاتانی ئەمەریكاو ، بەریتانیاو ، فەرەنساو ، رووسیاو ، ئەڵمانیاو ، كۆریای باكوورو ، چینی مای و ، هندستان و ، پاكستان و ، ئێران و ، چەندین وولاتی دیكە .

ئەمانە هەمووی هۆكاری پیس بوونی ژینگەن و كاردانەوەی لە سەر گۆڕینی كەش و هەوا و بەرەو گەرمبوونی و كەم بوونەوەی باری ساردی لە سەر

گۆی زەوی و تا دەگاتە چینی ئۆزۆنی و بەرەو هەورازتریش .

ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکە لە بواری کشتووکاڵی ، کە ئەویش بە هۆی گرنگی نەدان بەم بوارە گرنگە ، کە هۆکارێکی بنە رەتیە لە پاك و خاوێنکردنی ژینگەو دابین کردنی خۆراك بۆ کۆمەڵگاکانی سەر زەوی و بەرز بوونەوەی ئۆکسیدی کاربۆن بە پێچەوانەی بواری پیشەسازی لە هەموو بوارە جیا جیاجاکان ئەویش :-

١- وێرانبوونی بە ملیار هکتار زەوی بە هۆی پیس بوونی ژینگە و مردنی دارو درەخت و سووتاندنی ، بە تایبەتی لە ناوچە شەڕ لێکراوەکان و بەردەوام بوونی شەڕەکان .

٢- گرنگی نەدان بە کێڵگەی فراوان لە دروستکردنی دارستان و باخچەو چاندنی فریز لە رێگەی ئاو ئاودێر کردنی لەم بوارەدا .

٣- گرنگی نەدان بە پاك و خاوێنی شارەکان ، بە تایبەتی گەرەکە هەژارەکان لە رێگەی دروستکردنی شەقام و باخچەو پرکردنی شەقامەکان لە دارودرەخت و نەبوونی پەرژینی دارودرەخت لە چوار دەووری ئەم شارانەو جێگە دەشتایەکان ، کە بۆ چاندن سوود مەندنین و بۆ دارو درەخت سوود مەندن .

٤- کەمی دەریاچە و رووبارو جۆگەی ئاو دروستکردن ، کە ئەمەش هۆکارێکی گونجاوە بۆ پاك و خاوێن کردنی ژینگە .

بۆ نموونە :- وەك ئێستای لە هەرێمی باشووری کوردستاندا هەیە . لە گەڵ چەندین جێگەی دیکە لە جیهاندا . کە ئێستا هۆکاری پیس بوونی ژینگە بە رێژەی ٣٠٪ . زیاتر لەوەی کە ژینگە لە پیس بوونی بپارێزرێت .

ئا لێرەدا جیهانگەری لە رامیاریەتی وولاّتانی سەرمایەداری ، بە تایبەتی ئەمەریکاو هاپەیمانەکانی لە بوارەکانی سەربازی و رامیاری و ئابووری و بازرگانی و راگەیاندن و کۆمەلاّیەتی و پەیوەندیەکان نیە بە تەنیا ، هەتا بواری کەش و هەواو گۆرینی باری ژینگەشی گرتۆتەوە ، بە هۆی ململانێی سەربازی و ئابووری و هەمبارکردنی چەك و تەقەمەنی و ئامێر ، لە هەموو بوارەکان لە جیهاندا .

سەرمایەدار و ئیمپریالیزم نەك هەر ئاواتی پاوانکردنی سامان و داگیر

کردنـی داتـی ئـابووری و دارایـی و نەوتـە ، بـەلکوو دژی بـوونی ژیـانی بـە یەکەوەیە لە ئاشتی و ئارامی و کۆمەڵگای جیهان و کەش و هەواش بەرەو هەردێر دەبات لە هەموو بوارەکاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٤ هێزەکـانی سـووپای ئیـسرائیل سـایدێکی ئـەلکترۆنیان لـە تـۆری ئـەنترنێت دیـارکرد بـە نـاوی – سـایدی هۆشـداری پێشوەختە – بـۆ هـەر هێرشـێکی چاوەروانکراو ... ئەمـەش لـە دوای ئـەوە هـات کـە سـووپای ئیـسرائیل خاڵـە شکستەکانی لە جەنگی لە گەڵ حزب وڵڵای لوبنانی دیاریکرد ، ئەویش لـە پێناو دووبارە نەبوونەوەی ئەو خاڵانە لە جەنگەکانی داهاتوو ، یاخوود ئەو هێرش و پەلاماردانانەی کە چاوەروان دەکرێن لـە لایـەن ئێـران و سـووریا و لوبنان لە ناوچەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هێزێکی کۆماندۆی سووپای ئیسرائیل لە ٩/٦ لە هێرشـێکی ناکـاوی بـۆ سـەر رۆژهـەلاتی بـاکووری سـووریا لـە ناوچـەی دێرەزوور ئەنجامدا بە لێدانی بنکەیـەکی دروسـتکردنی چـەکی ئـەتۆمی ، دوای ئەوە بە دۆزینەوەی چەندین کەل و پەلی ئامادە کراو لـە بواری چـەکی ئەتۆمی و بەردەوامی پشکنین لە سەری ، کە دەر کەوت ئەمە لە لایـەن ئێـران و کۆریـای بـاکوور سـوودی لێـوەرگیراوە ، لـە پێنـاو دروسـتکردنی مـاددە ئەتۆمیـەکان ، جا لـە پێنـاو ئاشـتی و بـواری پیـشەسازی بێـت ، یـاخوود لـە پێناو کاری سەربازی و بەرگری بێت لە وولاتەکەیدا .

ئەمەش لەو کاتە دێت کە باری نێوان ئیسرائیل لـە گەڵ لوبنـان و سـووریا و هەتا لە گەڵ ئێران بە قۆناخێکی ترسناکدا تێدەپەری ، بە تایبەتی لە بواری سەربازی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٤ بـە هـۆی دەسـتگیر کردنـی ئەنـــدامێکی شـــاندی بازرگانی ئێران بە ناوی – ئاغـــای فـــەرهادی – لـــە هـوتێلی شـیرین پـالاس لـە شـــاری ســـلێمانی لـــە هـــەرێمی باشـــووری

کوردستان لە لایەن هێزێکی کۆماندۆی سووپای ئەمەریکا و گومان لێکردنی بە سیخوورەیەتی و بوونی لە موخابەراتی ئێران .

بەم هۆیە حکوومەتی ئیسلامی لە ئێران هەڵسا بە داخستنی هەر پێنج دەروازەی سنووری نێوان حکوومەتی هەرێم لە باشووری کوردستان و وولاتەکەیدا . سەرەڕای ئەوەی کە حکوومەتی هەرێم و سەرەك کۆماری ئێراق جەلال تاڵەبانی داوای بە پەلەی ئازاد کردنی فەرهادی لە هێزەکانی سووپای ئەمەریکا کرد . کە ئەمەش بووە هۆی وەستاندنی ئاڵووگۆری کارەکانی بازرگانی لە نێوان هەرێمی باشووری کوردستان و ئێران و ، کاردانەوەی لە گران بوونی کاڵاو شمکەکانی ، کە لە ئێرانەوە بەرەو هەرێمی باشووری کوردستان دەهاتن و بە پێچەوانەش بۆ ئێران .

٢٠٠٧/٩/٢٤ کۆچی دوایی گەورە هونەرمەندو ئەکتەری ئاماژەکاری – ئیمان – ی فەرەنسی – مارسێل مانگیلی – ناسراو بە مارسێل مارسۆن لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا . دوای ئەوەی کە ٦٠ ساڵی تەواو فرمێسکی قەتیسماری چاوەکانی لێیە وەستاوی راگرت .

شایانی باسکردنە کە مارسێل مارسۆن لە ساڵی ١٩٢٣ لە شاری ستراسبۆرگ چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... ئەم هونەرمەندە هەر لە منداڵیەوە ئارەزووی مۆزیکاژەنی و شانۆ دەبێ ، بە فلیمە بێ دەنگەکانی چارلی چاپلن و باستمکیتۆن و مارکس برازری کاردانەوەی کاری گەری کردۆتە سەر ، لە ساڵی ١٩٤٤ پەیوەندی بە ریزەکانی بەرگری کردن لە وولاتەکەی دەکات ، دژی داگیر کەرە نازیە ئەڵمانیەکان .

لە ساڵی ١٩٤٦ دەچێتە ناو تیپی – ونو ، پارۆ – ی هونەری لە شانۆ گەری باینست ... مارسۆن لە ماوەی کاروانی ٦٠ ساڵەی هونەریدا چەندین نازناوو خەڵاتی گەورەی پێ بەخشراوە لەوانە ، نازناوەکانی – پادشای ئاماژەکاری – گەورە ئەکتەری ئاماژەکاری – پیارۆی غەمبار – پاڵوان –– لە وولاتەکەیی و جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٥ بەرێوەبەری کارگێری گشتی بۆ بازرگانی دارایی لە بانکی ناوەندی سوودان – حەسەن یەحیا جنکوڵ – لە راگەیاندنێکیدا بڵاوی کردەوە کە حکوومەتی سوودان بریاریدا بە کارپێکردنی دراوی یۆرۆ لە بانکەکانی ناوخۆو




بازرگـانی نـاوخۆ و دەرەوەی سـوودان . لـه جیـاتی کـار پێکردنــــــی دراوی دۆلاری ئەمــەریکی لــە رامیاریــەتی وولاتەکەیدا .
مەبەســتیش لــەم بڕیــارەدا ڕێگـە گرتنـە لـە رامیاریـەتی ئەمەریکا لە بڕیارەکانی کە دژی وولاتـی سوودان و وولاتـانی دیکە بە سزا خستنە سـەر ئـەو وولاتانـەو بـە کارهێنـانی دۆلار بارێکی رامیـاری گـرنگ و سەرەکیە و وەك چەکێك بە کار دەهێنێ لە کاتی سپاندنی سزا بـە سـەر هـەر دەووڵەتێك ، گەر ئەو دەووڵەتە پاشەکەوتەکەی دۆلار بێت لـە بـە کـار هێنـانی لە بواری ئابووری و بازرگانی و پەیوەندیـە جیاجیاکـان لـە نـاوخۆو دەرەوەدا ، هــەر وولاتێـك لــە وولاتــانی جیهــان کــە دەسـتگیر نــەبێت بەرامیاریــەتی و هاوکاری نەکردنی ئەمـەریکا و هاوپەیمانـەکانی ، بە تایبـەتی لـە بوارەکـانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی لە وولاتە جیاجیاکانی جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٥ کۆنگرێسی ئەمـەریکا لـە بڕیارێکیـدا بـە کـۆی ٣٩٧ دەنـگ پەسـندی بـوونی پاسـەوانی شۆڕشـی ئیسـلامی لـە ئێـران کـردە ڕێکخراوەیـەکی تیرۆرسـتی و خستیە نـاو لیسـتی ڕێکخـراوە تیرۆرسـتیەکان لـە جیهـان ، بەرامبـەر دەنـگ نەدانی ١٦ ئەندام لە ئەندامەکانی کۆنگرێسی ئەمەریکا .
هــەروا دەنگــی لــە ســەر پرۆژەکــانی وەبەرهێنانــدا لــە پــرۆژە بیانیــەکانی وەبەرهێنان لە ئێران ، بە تایبـەتی لـە کەرتی ووزە ... ئـەویش بـە پێشـنیاری سـیناتۆری دیموکراتـەکان – تـۆم لانتـۆس – وا چاوەڕوانیش کـرا ، کـە ئـەو بڕیارە لـە لایـەن هاوپـەیمانانی ئەمـەریکا بـەر هەڵسـتکاری دەکرێـت لـە لایـەن وولاتان و کومپانیا گەورەکان لە بواری وەبەرهێنان لە جیهاندا .
هـەروا لـە لایـەکی دیکـە وەزیـری دەرەوەی فەرەنسا – برنـارد کۆشـنێر – لـە لێدوانێکیـدا ، داوای کـرد هـەر بڕیارێـك لـەم جـۆرە نـابێ وولاتـانی ئـەورووپا بگرێتەوە ، کە کاری وەبەرهێنان لە ئێران ئەنجام دەدەن .
جێگـەی باسکردنە کە هـەر یاسـایەك لـەم جـۆرە یاسـایانە دەبـێ سـەرۆکی

ئەمـەریکا پەسـندی بکـات ، گـەرنا نابێتـە یاسـاو بـە جێبـەجێکردنی لـە ئەمەریکاو دەستگیر بوونی لە لایەن وولاّتانی دیکەی جیهان ، بە تایبەتی لە لایـەن وولاّتـانی توانـاداری ئـابووری و خـاوەن تـەکنۆلۆژیای سـەردەم لـە بوارەکانی وەبەرهێنان لە جیهاندا .

ئەم پرۆژە یاسایەش لـە دوای راگەیاندنەکەی سەرۆکی ئێران – مەحمودی ئەحمـەدی نـژادی – هـات لـە سـەر کردنـی – مەحرەقـەی نازیـەکان ، ئەلهۆلۆکۆسـت – و دوو دڵـی لـە ناسـنامەی جـێ بەجێکـەری هێرشـەکانی کارەساتی ٢٠٠١/٩/١١ لە زانکۆی کۆڵۆمبیای ئەمەریکا .

دوای ئـەوە سـەرۆکی ئەمـەریکا جۆرج بۆش سـەردانی زانکۆکـەی کـرد و لـە گەڵ سەرۆکی زانکۆکە – لیی بۆلینگەر – تووشی دەمەتەقێ هاتن لە ئاکامی ئـەوەی کـە سـەرۆکی ئێـران ویـستی وتەیـەك بەرامبـەر قوتابیـانی زانکـۆ ئاراسـتەی قوتابیـان بکـات ... ئەمـەش بـووە جێگـەی مـشتوومڕیان لـە سـەر دۆسیەی ئێران لـە مەحرەقەی هۆلۆکۆسـت و پەیوەندیـەکانی نێوان ئێران و ئەمەریکادا .

٢٠٠٧/٩/٢٥ یەکیـــەتی ئـــەورووپا لـــە رێنمایـەکانی بڵاوی کـردەوە کـە نـاوی تورکیـا لـە سـەر دراوی یـــۆرۆی یەکیـــەتی ئـــەورووپا هەڵدەگرێ . کـە بریـارە لـە سـاڵی ٢٠٠٨ لە چاپی نوێی دراوەکە ، نـاوی تورکیـا لـە سـەر نەخشەی



سەر دراوەکە ، ناوی تورکیاو نەخشەی تورکیـا لـە سـەر دراوەکـە نـەمێنێ بـە هۆی جێ بە جێنەکردنی خاڵ و بەندەکانی رێکەوتنی نێوان تورکیا یەکیەتی ئەوروپا و جێ بە جێنەکردنی رێکەوتننامەکە بـە شـێوەیەکی گونجـاو لـە نـاو سنووری تورکیاو دەرەوەی تورکیا .

ئەویش لە پێناو بەرەو باش بردنی باری ناوخۆی تورکیـاو چارەسـەر کردنـی کێشە هەڵواسراوەکان ، بە تایبەتی لە بواری ئازادیەکانی بیروو بۆ چوون و نەتەوەیی و رامیاری و کۆمەڵایەتی لـە وولاّتەکـەدا ... لـەو کاتـەی کـە تورکیـا

هەمو هەوڵەکانی لە پێناو بوونی بە ئەندام لە یەکیەتی ئەورووپایە .

٢٠٠٧/٩/٢٥ بەردەوام بوونی نارەزایی و خۆپیشاندان لە شاری – رانگۆن – ی پایتەختی میانمار – بۆرمای پێشوو – و شارەکانی دیکەی ئـــەم وولاتـــە دژی دەســـەلاتی ســـەربازی داپلۆســـێنەر لـە لایـەن



هەڵگری بڕوای ئاینی بووزی لەم وولاتەدا . کە ئەمەش بۆ ماوەی دوو رۆژ بەردەوام بوو ، کە زیاتر لە ١٠٠ هەزار کەس بەشداری لەو خۆپیشاندانە کـردو حکوومـەتی ســەربازی لــە میانمــار بــە هێــزی ســووپا وەڵامــی خۆپیشاندەرانی دایەوە .

کە لەو کاتە شەقامەکانی پایتەخت و شارەکانی دیکە پڕکرابوون لە ئوتومبێـل و زرێپـۆش و تـانکی ســەربازی ... خۆپیـشاندەران وێنـەی ســەرکردەکەیان – ئـۆنگ ســان –ی کۆچـکردوو وبـاوکی ســەرکردەی بەرهەڵستکاری دەسەلاتی سەربازی کە لە بەندیخانەکانی دەسەلاتی میانمار گیانی لە دەست دابوو لەم وولاتەدا .

ئەنجامی ئەو خۆپیشاندانەش زیاتر لە ٣٠٠٠ هەزار خۆپیشاندەر گیانیان لە دەستدا ، کە ئەمەش لە ماوەی ٢٠ ساڵ کاری وا رووی نەداوە لەم وولاتـەدا ... وا چاوەروانیش دەکرێت ، کە حکوومەتی میانمار تووشی سزای هەمە لایەن بێت بە هۆی رامیاریەتی داپلۆسین و نەبوونی مافی مرۆڤ و ئازادی هاووڵاتیان لە وولاتەکەدا ، بە تایبەتی رێز نەگرتن لە بڕوای ئاین و ئەنجامدانی رێورەسمەکانی ئاینی لە وولاتەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٥ فەرماندەی هێزی پیادەی سووپای تورکیا و جێگری فەرماندەی گشتی سـەرۆکی دەســتەی ئـەرکانی ســووپا ژەنـەراڵ – ئیکلـەر باشـبگ – لـە لێدوانێکیدا لە ئەکادیمیای سەربازی هێزەکانی پیادەی وولاتەکەیدا گووتی –:

حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان زیاتر لە هەموو کاتێك بەهێزتر

بووه و کورد لە رووی ئابووری و رامیاری و دەروونی و سەربازیشەوە توانایەکی زۆریان پەیدا کردووەو لەوانەیە کوردەکانی تورکیاش لە داهاتوودا ئەو حکوومەتەی هەرێمی باشووری کوردستان بکەن بە مۆدیلێك بۆ خۆیان . و هەروا لە وتەکانیدا گووتی :-

هەر چەندە حکوومەتی تورکیا ناتوانێت ریگا لە پێشکەوتنی حکوومەتی کوردی بگرێت . بەڵام دەتوانێت کێشەی بۆ بنێتەوەو پێویستە ئەمەریکاش ئاگادار بکرێت لەوەی کە هیچ پلانێك لە ئێراقدا بەبێ رەزامەندی تورکیا سەر ناگرێت لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٥ وەزیری ناوخۆی ئێراق – جەواد پۆلانی – لە سەردانەکەیدا بۆ شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا و ، هەر لە فرۆکەخانە لێدوانێکیدا وەك پیشەی کۆنی سەرانی رژێمی بەعسی روخێندراو دژی کوردو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد هەڵوێست و نیازە شۆڤینیەکانی خۆیان دەردەخەن بێ ئەوەی بیر لە بارودۆخ و قۆناخ و هەستی مرۆڤایەتی بکەنەوە و گووتی:-

ئێمە لێرەین بۆ ئەوەی سەرجەم پرسەکانی نێوان ئێراق و تورکیا چارەسەر بکەین ، کە مومکین نیە رێگە بە هیچ کەسێك و لایەنێك بدەین تورکیا بکاتە ئامانجی خۆیی و خۆشی لە ناو ئێراق شاردبێتەوە – مەبەستی پەکەکەو بزووتنەوەی کوردە بە گشتی – ئەمەش بە پێی هەواڵی cnn-turk . هەروا پۆلانی لە سەردانەکەی بۆ چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەی تیرۆر ، چاوی کەوت بە سەرۆکی دەزگای هەواڵگەری و سووپا سالاری تورکیا .

شایانی باسکردنە کە لە مانگی ٢٠٠٩/٨/ ی رابردوو سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری کامل مالکی لە سەردانەکەیدا بۆ تورکیا یاداشتێکی لەیەکگەیشتنی لە گەڵ دەسەڵاتدارانی تورکیا مۆرکرد .

بەڵام رێکەوتنی کۆتایی یاداشتەکە بریار بوو دوو هەفتە دوای سەردانەکەی مالکی شاندێکی ئێراق سەردانی تورکیا بکات بۆ مۆرکردنی رێکەوتنەکە ، بەڵام بە هۆی هەندێ هەڵوێست راگەیاندنی دوور لەو قۆناخەی کە ئێراق پێیدا تێپەڕەری و بووە هۆی دواخستنی شاندەکە ... ئێستاش شاندەکە بە سەرۆکایەتی جەواد پۆلانی سەردانەکە ئەنجامدرا و هەمان هەڵوێست و بیروو بۆ چوون دەرخرایەوە ، کە ئەو رژێمانەی کە کوردو خاکی کوردستانیان پێلکێندراوە و داگیریان کردووە ، گەر

دەسەلاتیش بگۆڕێ جا بە هەر جۆرێك بێت لە مامەڵەكردندا .
بەلام هەلۆێست و بیروو بۆ چوونی شۆڤینی و ڕەگەزپەرستی و دوژمنكاری كردنی دژ بە گەلی كوردستان ناگۆڕێ لە هەر یەك لەو وولاتانە و هەموو كات رامیاریەتیان بەرامبەر بە كورد هاوسەنگ و هاوكێشە و هاوبەشە لە ناوچەكەدا دژ بە كورد و خاكی كوردستان .

٢٠٠٧/٩/٢٦ كردنەوەی پیشانگایەك دەربارەی باری ئافرەتان لە جیهان ، لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ... ئەم پیشانگایەش لە بواری بازرگانی كردن بوو بە ئافرەت بۆ كاری سێكسی لە



بەریتانیا ... پیشانگاكەش لە ژێر ناونیشانی – كاروان – بوو ، بە دەرخستنی باری دڵتەزێنی ئافرەتان و فراندنیان بۆ بەریتانیا لە ڕێگەی تیرۆرستی تاوانی ڕێكخستنەكان و ناچار كردنی ئافرەت لە چۆنیەتی كار پیكردنی لە كاری سێكسی نهێنیدا .
هەروا پیشانگاكەش لە -- ٧ حەوت حاویەی ئاسن –ی پێك هاتبوو بۆ كاری گواستنەوە لە ڕێگەی دەریا . هەر یەكێك لەو حاویانەش قۆناخێك لە قۆناخەكانی ئەم كارانە لە خۆی دەگرت . لە ژیانی ئافرەتانی ناچار كراو بە بە كار پێكردنیان لەو كارە نالەبارەدا .
حاویەی یەكەم ژیانی ئەو ئافرەتە لە خۆ دەگرێ ، كە لە وولاتی رەسەنی خۆی لە ئەورووپای رۆژهەلات و كۆتایی بە حاویەی حەوت ، بە دیاریكردنی باری ئافرەت لە یەكێك لە خانووەكانی نیشتەجێی لە بەریتانیا ... ئەم پیشانگایەش لە لایەن دەزگای – هێلین یامبر – ئەنجامدرا ، لە پێناو پشتگیری و یارمەتی دانی ئافرەت و بەرگری كردن لە ماف و پاراستنی داواكانی ئافرەت و دوور خستنەوەی لە كاری توند و تیژی بەرامبەر بە ئافرەت و بازرگانی نەكردن بە ئافرەت لە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندنیان بە هۆی نالەباری باری نەبوونی پێداویستیەكانی ژیان و ناچاربوونیان لەم بوارەدا و ، هەوڵدان لە پێناو باشكردنی باری ژیانی هەژاران لە جیهان و مسۆگەر

کردنی دادپەروەری لە ژیان و لە کار لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٦ ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا بە کۆی دەنگی/ ٧٥ دەنگ و دژە وەستانی ٢٣ دەنگ رەزامەندی لە سەر پلانی دابەشکردنی ئێراق بۆ سیٚ هەرێمی – کورد ، سوونە ، شیعە –




پەسند کرد ... ئەویش بە هۆی باری لێك ترازاوی پەیوەندیەکانی نێوان ئەو سیٚ لایەنە گرنگە لە ئێراقدا . ئەم قرۆژەیەش لە لایەن جۆزێف بایدەن لە پارتی دیموکرات بۆ رزگار کردنی ئێراق و هێزەکانی ئەمەریکا لە ئێراق . پێشکەش بە ئەنجوومەنی پیران کرد . بە سیٚ هەرێمی فیدراڵی لە ئێراقدا .

سەرەرای ئەوەی کە کورد و ، مەزهەب شیعەی ئیسلام لە ئێراق بەم پلانە رازیین . بەڵام مەزهەب سوونەی ئیسلام ئەم پلانەی رەتکردەوە ... ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە ، سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – تۆنی بلێر – لە وتەیەکی رۆژنامەوانیدا ، ئەوەی دووپاتکردەوە ، کە بریاری دابەشکردنی ئێراق بۆ سیٚ هەرێمی فیدراڵی لە خۆنەو بە خۆیان دەتوانن بە ئازادانە ئەم بریارەو هەر بریارێکی دیکە بدەن و کەس بۆی نیە دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی پێك هاتەکانی ئێراقدا بکات .

هەروا وتە بێژی کۆشکی سپی – تۆنی فرانۆ – گووتی :– ئەو پەسند کردنە لە سەر پلانی دابەشکردنی ئێراق بۆ سیٚ هەرێم ، ئەوەندە گرنگ نیە وەك هەندێك وای بۆ دەچن و کەس پابەند ناکات بە جیٚ بە جێکردنی لە وڵاتەکەدا . کەچی بریارەکە لە رۆژی ٩/٢٦ بوو . بەڵام رەتکردنەوەی لە لایەن ئیدارەی ئەمەریکا لە رۆژی ٩/٢٧ بوو .

ئەمەیە دیموکراتیەت لە وڵاتێکی کە لە سەدەی بیست و یەك سەرکردایەتی

جیهان دەكات لە هەموو بوارە جیا جیاكان لە جیهاندا...؟...!.



٢٠٠٧/٩/٢٦ وەزیـری بـەرگری ئەمـەریكا – رۆبـرت گێیـتس – داوای لــە كۆنگرێــسی ئەمــەریكا كرد بە رەزامەندی كردن لە سـەر ١٩٠ ملیـار دۆلار ، لە پێنــاو بــەردەوام بــوونی پاڵپــــشتی هەوڵـــەكانی جـەنگی ئەمـەریكا لـە هـەردوو وولاّتـی ئێـراق و ئەفگانـستان . ئـەم بـڕە پارەیــەش بــۆ مەشــق پێكردنــی ســەربازو كرینــی ئوتومبێــل و تانــك و پێداویستیەكانی جەنگ و مەشق پێكردنی هێزەكانی ناوخۆو سەربازەكانی ئێراق و ئەفگانستان .

سـەرەرای ئـەوەی كـە جـەنگی دژ بـە ئێـراق و ئەفگانـستان لـە لایـەن گـەلانی ئەمەریكا رەتدەكرێتەوە بە هۆی كاردانەوەی لە سەر باری ژێرخانی ئابووری و بژێوی ژیانی ئەمەریكیەكان .

جێگەی باسكردنە كە لـە دوای رووداوەكـەی ٢٠٠١/٩/١١ لـە ئەمـەریكا تـاكو ئەم رۆژە ئیدارەی ئەمەریكا زیاتر لـە ٦٠٢ ملیار دۆلاری وەك خەرجیەكانی جـەنگ خـەرج كـردووە لـە ئێـراق و ئەفگانـستان و وولاّتـەكانی دیكـە . ئـەم داواكاریـە و چـەندین كـاری دیكـە بۆتـە كێشە لـە نێـوان سـەرۆكی ئەمـەریكا جۆرج بۆش و ئەنجوومەنی پیران لە وولاّتەكەدا .

كـە زیـاتر لـە ١٦٨ هـەزار سـەربازی ئەمـەریكا و هـەموو پێداویـستیەكانی لـە ئێراق لە كاری جەنگی بە ناو دژ بە تیرۆر بەردەوامە ، جگە لە ئەفگانـستان و وولاّتانی دیكە لە جیهان .



٢٠٠٧/٩/٢٧ لـــە دوای تـــەواو بـــوونی سـەردانەكەی سـەرۆكی ئێـران – مـەحمودی ئەحمـەدی نـژادی – بۆ شـاری نیـورۆكی ئەمـەریكا و بەشــــداری كردنــــی لــــە كۆبوونەوەی ساڵانەی كۆمەڵەی

گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ، سەردانی وولاتی پۆلیڤیای کردو لە گەڵ سەرۆکی پۆلیڤیا – مۆرالیس – کۆبوونەوەو ڕێکەوتنی پیشەسازیان لە نێوان هەردوو وولات مۆرکرد ، ئەویش بە بڕی یەك ملیار دۆلار بۆ ماوەی پێنج ساڵ .

هەر لە کاتی سەردانەکەی سەرۆکی ئێران بۆ پۆلیڤیا بڕیاریدا یەك ملیار دۆلار وەك یارمەتی بدات بە حکوومەتی پۆلیڤیا ، لە پێناو بووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری ، بە تایبەتی لە بواری نەوت و گاز و دام و دەزگاکانی حکوومەت لە وولاتەکەدا . هەر لەو سەردانەی سەرۆکی ئێران لە گەڵ سەرۆکی پۆلیڤیا بە لێنیاندا بە نویٚ کردنەوەو بتەو کردنی پەیوەندی نێوان هەردوو وولاتی ئێران و پۆلیڤیا . لە هەمان کات بەلێنیاندا بە بنبرکردنی باری هەژاری لە وولاتەکانیان و چارەسەری کێشەکان .

جێگەی باسکردنە کە پۆلیڤیا وولاتێکی دەوولەمەندە لە بواری نەوت و سووتەمەنی ، بە تایبەتی یۆرانیۆم ، کە ئەویش لە پێناو بەکاهێنانی لە بواری ئەتۆمی ئاشتی و خزمەتگوزاری لە وولاتەکەیدا . بەلاَم ئەم وولاتە لە ڕووی دارایی و داهات کەم دەرامەتە و ، ئێران بەلێنی دا بە یارمەتی دانی دارایی لە پێناو کەمکردنەوەی باری دام و دەزگا و پرۆژەو کارگە هەمە لایەنەکانی لە وولاتەکەدا .

ئەم سەردانەی سەرۆکی ئێران بۆ پۆلیڤیا بووە جێگەی رەخنەو نارەزایی ئیدارەی ئەمەریکا و وولاتانی دیکەی هاوپەیمانی لە جیهاندا ... لە بەر ئەوەی پۆلیڤیا ڕووەو چەپ هەنگاو دەنیٚ شان بە شانی وولاتانی دیکەی ئەمەریکای لاتینی ، کە ئەمەریکا بە باخچەی دواوەی داهاتووی وولاتەکەی ناوزەند کردبوو لە کێشوورەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٧ بەرز بوونەوەی ڕێژەی بێکاری لە جیهان و بە زۆری ئەو بێکاریەش وولاتانی عەرەبی و ئیسلامی گرتۆتەوە ، ئەم ڕێژەیەش لە راپۆرتی سالأنەی ڕێکخراوی کاری نێوودەوولەتیدا هاتیە



. کە ژمارەی بێکاری لە جیهان کەم نەبۆتەوە سەرەرای بەرەو پێشەوە چوونی باری ئابووری لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی بە بەرزبوونەوەی دەر ئەنجامی ناوخۆیی و ماوە دان بە دۆزینەوەی کار بۆ بێکاران و کەمکردنەوەی باری هەژاری لە جیهاندا .

ئەوانەی کە بێکار بوون لە ساڵی ٢٠٠٦ گەیشتۆتە ١٩٥,٢٠٠ ملیۆن کەس ، کە دەکاتە ٦,٣٪ . لە کۆی هێزی کرێکار لە سەر ئاستی جیهان بە پێی راپۆرتەکە ، کە لە مانگی ٢٠٠٧/١/ بلاو کراوەتەوە ... هەروا بەرز بوونەوەی ژمارەی بێکاران لە کارکردن بە رێژەی ٣٤,٤٪ . ملیۆن کەس لە ساڵی ٢٠٠٦ بەرامبەر بە ساڵی ١٩٩٥ . کە گەیشتە ١٩٥,٢٠٠ ملیۆن کە لە ساڵی ٢٠٠٥ . ١٩١,٨٠٠ ملیۆن بێکار بووە ، بە زیاد بوونی رێژەی ٢,٢٪. ملیۆن لە ساڵی ٢٠٠٤ دا .

ئەوانەی بێکارن لە جیهان تەمەنیان لە نێوان ١٥—٢٤ ساڵ دەبێ ... هەروا لە رۆژهەلاتی ناوەراست و باکووری ئەفەریکیا ، کە وولاتانی عەرەبیش لە خۆ دەگرێ ، رێژەی بیکاری زیاترە لە سەر ئاستی جیهان ، کە دەگاتە ١٢٪ . لە کۆی گشتی هێزی کرێکار ... گەر چی لە رۆژهەلاتی ئاسیا دەگاتە ٣,٦٪. کە زۆر کەمترە ... هەروا رێژەی بێکاری لە لایەن ئافرەتان دەگاتە ٤٠٪. لە قەبارەی هێزی کرێکار لە جیهاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٧ دوای سەردانەکەی وەزیری ناوخۆی ئێراق – جەواد پۆلانی – بۆ تورکیا ، ئەمرۆ هەردوو وولاتی تورکیا و ئێراق لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا رێکەوتن لە سەر بەرەنگار بوونەوەی تیرۆرو رێگە گرتن و چارە سەری کێشەی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان – پەکەکە – لە باکووری کوردستان ، مۆرکرا ، کە سووپای تورکیا چەندین جار بە بیانووی هەبوونی چەکدارانی پەکەکە خاکی هەرێمی باشووری کوردستانی بۆردمان کردووەو خاکی هەرێمەکەی بەزاندووە .



ئەم ڕێکەوتنەش لە لایەن وەزیری ناوخۆی ئێراق و بەر پرسانی تورکیا مۆرکرا ، هەروا تورکیا چاوەڕوانی ڕەزامەندی لایەنی ئێراقی دەکات بۆ ڕاوەدوونانی چەکدارانی پەکەکە لە هەرێمی باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق .

جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە ڕژێمی تورکیا نەك هەر مەبەستی هێزی پێشمەرگەی پارتی کرێکارانی کوردستانە لە باکووری کوردستان ، بەڵکو مەبەستی لە ناوبردن و لە بار بردنی ئەو بارو دۆخەو پرۆسە ئازادیەی کە لە هەرێمی باشووری کوردستان هەیە ، بە بوونی پەرلەمان و حکوومەت و سەرکردایەتی هەرێم و پەیوەندیەکانی لە گەڵ جیهانی دەرەوەو ڕۆڵی کاریگەری لە سەر بەرەو باشبردنی باری ئێراقی داهاتوو لە ناوچەکەدا . و بە تایبەتی چاو برینی تورکیا لە پارێزگای کەرکوك و خەونە کۆنەکانی بەرامبەر بە ویلایەتی مووسڵ .

کە ئەم خەونەش خەونی حووشترەو تا ئەوان ماون نایەتەدی و کوردیش ئەمرۆنا بەیانی دەبێ ببێتە خاوەن دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی ، نەك لە باشووری کوردستان ، بەڵکو لە سەر خاکی کوردستان بە پشتیووانی ڕۆڵە بە وەفاکانی گەلی کوردستان .



٢٠٠٧/٩/٢٨ بەردەوام بوونی کێشە لە نێوان دەسەڵاتدارانی سەریلانکا و چەکدارانی – نموری تامیل – لە باکووری ڕۆژهەلاتی دوورگەکە ، لە پێناو بە دەست هێنانی دەوڵەتێکی سەر بەخۆ لە هەرێمی تامیلیەکان ، کە ماوەی ٢٠ ساڵ زیاترە ئەم کێشەیە لە نێوان هەردوو لایەن بەردەوامە و لە ئاکامی شەڕو پێکدادان لە نێوان هەردوو لایەن زیاتر لە ٧٠,٠٠٠ حەفتا هەزار هاووڵاتی لەو وڵاتەکە و لەو هەرێمەدا گیانیان لە دەست داوە .

لەوانەش ٥٠٠٠٠ پێنج هەزار هاو وڵاتی گیانی لە دەست داوە لە ماوەی

دوو ساڵی رابردوو . لەم رۆژەشدا شەڕێکی دژواری کەشتیە جەنگیەکانی هەردوو لایەن هەڵگیرسا لە هەرێمی نمورر لە باکووری سەریلانکا .
سەرەرای ئەوەش حکوومەتی سەریلانکا دان بە مافی نموورەکان نانێ ، کە زۆربەی دانیشتووانی لە سەنهالیەکانە و هەوڵی یەکگرتوویی وولاتی سەریلانکا دەدەن.

٢٠٠٧/٩/٢٩ بۆ یەکەم جار لە تورکیا ماوە بە گرێدانی کۆنفرانسێك بە ناوی کوردستان بدرێت لە شاری دیاربەکر لە باکووری کوردستان ، بە سەر پەرشتی ئەنجوومەنی شارەوانی



دیاربەکر کە – هاندریك بۆك – بە وتارێك کۆنفرانسەکەی کردەوە ... کە ٥٠٠ کەس لە کەسایەتی کوردو تورك و بیانی بەشداریان تێدا کرد لەم وولاتەدا .
خاڵەکانی کۆنفرانسگێران لە سەر چارەسەری کێشەی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان – پەکەکە – و دانانی چەك و کەوتنەناو گۆرەپانی رامیاری و رۆشنبیری , هەروا خاڵێکی دیکەی کۆنفرانسوانان لە بارەی حکوومەتی تورکیا بوو ، لە دەست تێوەرانی لە کاروباری حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان .
هەروا لە گەڵ چەندین تەوەری دیکە لە لایەن کۆنفرانسوانان لە پێناو چارسەر کردنی کێشەی کورد لە تورکیا و وولاتانی دیکەی کوردسنان پێووە لکێندراو لە ناوچەو کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/٩/٢٩ سەرۆکی ئەفگانستان – حامد کارازای – لە لێدوانێکیدا هەوڵەکانی خۆی ئاشکرا کرد ، بە ئامادە بوونی لە پێناو گرێدانی کۆبوونەوە لە گەڵ -- تاڵیبان ، مەلا عومەر ، و ، قەلبەدین حکمەتیار – سەرکردەی ئیسلامی ، کە یەکێکە لە کۆمەڵی دیکەی چەکدار دژی حکوومەتی ئەفگانستان بە هاوکاری



سەرکردەی ڕێکخراوی قاعیدە لە ئەفگانستان .
ئەویش لە پێناو گفتووگۆی ئاشتیانە بە بێ ئەوەی هیچ مەرجێك لە نێوانیاندا هەبێت ، بە کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەمەریکا و پەیمانی ناتۆ لە وولاتەکەدا ، ئەم لێدوانەی حامد کارازای لە دوای گەرانەوەی لە ئەمەریکا بە گفتووگۆ کردنی لە گەلّ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش هات ، هەروا گفتووگۆی لە گەلّ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان – بان کی مۆن – لە شاری نیورۆکی ئەمەریکا .
هەروا لە دوای ئەو لێدوانە رۆژنامەوانیەدا هەردوو سەرکردەی بەرهەڵستکار رەزامەندیان لە سەر بیروو بۆ چوونەکەی سەرۆکی ئەفگانستان دەربڕی . سەرەرای ئەوەی کە هەردوو سەرکردەی ئیسلامی مەلا عومەرو حکمەتیار لە لیستی داواکراون لە لایەن ئیدارەی ئەمەریکا . هەروا کارازای لە لێدوانەکەیدا بەڵێنیدا کە چەندین پلەو پایەی بالاّ تەرخان دەکریّ بۆ لایەنگرانی ئەو دوو سەرکردیە لە پۆستەکانی حکوومەتی ئەفگانستان لە دوای ڕێکەوتنیان بە کۆتایی هاتنی کێشەکانی نێوان حکوومەت لە گەلّ مەلا عومەرو حکمەتیار ، و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٩ دەتوانن خۆیان بپاڵێورن لە هەڵبژاردنەکەدا . لە لایەکی دیکە سەرۆکی ئەفگانستان گووتی :– بەردەوام دبین تا بارو دۆخەکە بە تەواوی ئارام دەبێتەوە و وولاّتەکە دەکەوێتە قۆناخی بنیاتنانەوەو ئاوەدانکردنەوە لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

٢٠٠٧/٩/٢٩ لــە دوای تەقاندنــەوەی هــەردوو مەزارگـــەی – عـــەلی هـــادی و ئیمـــام حەسەن عەسكەری – لـە شـــاری ســـامەرا لـــە باكووری ئێراقی سەر بە پارێزگای سەلاحەدین – تكریــت – لــە ســاڵی ٢٠٠٦ لــە لایــەن ئیــسلامە توونــدڕەوەكانی ئێــراق ، ڕێكخــراوی نەتــەوە یــەكگرتووەكان بــۆ پــەروەردەو زانــستی و ڕۆشــنبیری – یۆنسكۆ – بڕیاری چاكردنەوەی هەدوو مەزارگەكەیدا .



كە مەزارگەیــەكی گرنگــی مەزهــەب شــیعەكانە ، نــەك هــەر لــە ئێــراق بــەڵكوو مەزارگەیەكی گرنگ و پیرۆزە لە لایەن هەموو ئیسلام لە جیهاندا .

جێگــەی ئامــاژە پێكردنــە كــە ئیمــام عــەلی هــادی لــە ٨٦٨/١/١ كۆچــی دوایــی كردووە و كوڕەكەی ئیمام حەسەن عەسكەری لە ٨٧٤/١٠/١٦ كۆچی دوایی كردووە و تەرمی هەردوو ئیمام لەو مزگەوتە نێژراون لە شارەكەدا .

٢٠٠٧/٩/٣٠ كۆنگرەكـــــانی ١— كـــۆنگرەی نەتـــەوەی عــەرەب . ٢—كـۆنگرەی نەتـــەوەیی ئیـــسلامی . ٣—كـــۆنگرەی گـــشتی پارتە عەرەبیكان ... ئەم سێ كۆنگریـە لـە كات و ســاتێكدا بریــاری كۆنگرێــسی ئەمــەریكایان بــە دابەشــكردنی ئێــراق بــۆ ســێ هەرێمی – كوردی ، عەرەبی سوننەی ئیسلام ، عــەرەبی شیعەی ئیسلام – ڕەتكردەوەو بە پیلانێكی سەهیۆنیزمیان دانا .



كە كۆنگرەی نەتەوەیی عەرەب كۆمەڵێ كەسایەتی ڕامیاری و بیریە لـە لابـاڵی نەتــەوەی عــەرەبی ، بــەڵام نەتــەوەیی ئیــسلامی ، ئــەویش كۆمــەڵی هــەمان شێوازە ، كە نەتەوەی عەرەب و ئیسلام بە یەك كۆدەكاتەوە .

ئەو کۆنگرانە بڕیاری کۆنگرێسیان بە کارێکی شەڕ دانا لە سەر ئێراق و زامدار کردنی وولاّتانی دیکەی عەرەبی و ئیسلامیو بە برگەیەك لە برگەکانی رۆژهەلاّتی ناوەراستی گەوورەو ئەفەریکیایان داناو ، ئەم پیلانەش لە یەکەم کۆنگرەی سەهیۆنیزم لە ساڵی ١٨١٧ وە بەردەوامە تاکوو ئێستا بە لێك ترازاندنی هاوخەباتی یەکگرتوویی عەرەب و ئیسلام ، سەرەرای ئەوەی کە کورد و عەرەبی مەزهەب شیعەی عەرەب لە گەلّ بوونی هەرێمی فیدراڵین لە ئێراقێکی فیدراڵی یەککگۆتوو ، تەنیا عەرەبی مەزهەب سوننە نەبێت ... کە کورد بە پێی دەستووری ئێراق هەرێمێکی دانپێنراوەی فیدراڵیە لە هەرێمی باشووری کوردستانی بە زۆر لکێندراو بە ئێراق ، بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لە لایەن بەریتانیاو ، فەرەنساو ، رووسیاو ، ئەمەریکا ، لە هەرێم و ناوچەو کێشووەرەکەدا .

٢٠٠٧/١٠/١ لە بریارێکی رژێمی بەعسی لە سووریا ، ئەویش بە جیّ بە جێکردنی مافی مۆڵەت بۆ ئەو کەسانەی کە لە ئێراق بەرەو سووریا هەڵدێن بە هۆی باری نالەباری ئاسایشی ئێراق جێگەی باسکردنە کە دەسەلاّتدارانی سووریا لە ٢٠٠٧/٩/١ ماوەی بە ئێراقیە هەلاّتووەکاندا لە رێگەی مۆڵەت وەرگرتن لە سەر پاسە پۆرتەکان بۆ چوونە ناو خاکی سووریا



، لە بەر ئەوەی پەنابەرانی ئێراقی بە شێوەی لێشاو روو لەو وولاّتە دەکەن . ئەویش لە دوای ئەوە هات ، کە شانشینی ئوردنیش ماوەی بە پەنابەرە ، یاخوود خێزانە هەلاّتووەکانی ئێراق نەدەدا تاکوو ماوەی مۆڵەت لە پاسەپۆرتەکانیان دیاری نەکرێت بە شێوەیەکی فەرمی .
لە بەر ئەوەی زیاتر لە ١,٥٠٠ ملیۆن و نیوو لە ئێراقیەکان roویان لە وولاّتی سووریا کردووە بە هۆی نالەباری باری ئێراق ، جگە لە ئوردن ، کە ئەمەش

وایکـرد کـه رۆژانـه زیـاتر لـه ٢٠,٠٠٠ هـەزار هـاو وولاتـی ئێراقـی روو لـه هەردوو وولاتی سووریاو ئوردن بکەن .

٢٠٠٧/١٠/١ سەرۆکی ئەرکانی جەنگی سووپای تورکیا ژەنەراڵ – یەشار بویوکانیت – لـه لێدوانێکیـدا گـووتی :– سـووپای تورکیـا بـه شـێوەیەکی رێـك و پێـك و ئامادەباشی بەر پەرچی هەموو هەوڵێك دەدات دژی دوژمنانی لە ناوەوەی تورکیاو دەرەوەی تورکیا.

هەروا گـووتی :– سـووپای تورکیا دژی دامەزرانـدنی دەوولـەتی سـەربەخۆی کوردیـه لـه بـاکووری ئێـراق – واتـه هـەرێمی باشـووری کوردسـتان – کـه ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی خراپ نەك هەر لـە سەر ئاسایشی تورکیا بەلکوو بۆ ناوچەکەش ... هەروا ئەو ئامـاژە پێکردنـەی ژەنـەراڵی تورکیـاو سـەرۆکی ئەرکانی سووپای تورکیا مەبەستی گەلی کورد و پارتی دادو گەشه پێدانی دەسـەڵاتدارە لـه تورکیـا بـووە ، ئـەویش بـه هـۆی دژایـەتی کردنـی جیاکردنەوەی دەوولەت لە ئایینە لە تورکیادا .

گەر چی سووپای تورکیا زۆر دڵگرانە لە بارو دۆخەکە و هەوڵەکانی لە پێناو پاراسـتن و بـه هێزکردنـی دەوولـەت و دەسـەلاتی عەلمانیـه لـه تورکیـادا ... سـەرەرای ئـەوەش سـەرەك کۆمـاری تورکیـا عـەبوڵلا گـووڵ دژی ئـەو لێدوانـه بووەو نیـازی پـارتی دادو گەشـه پێدانـه لـه تورکیـاو لاوازکردنـی دەسـەلاتی عەلمانی نیە بۆ بەهێز کردنی دەسەلاتی ئیسلامی بەلکوو بە پێچەوانەوە .

جێگـەی روونکردنەوەیـه کـه هێزەکانی سـووپای تورکیـا لـه دوای سـاڵەکانی هەشـتا چـەندین جـار کودەتـای سـەربازیان ئەنجامـداوە دژی دەسـەلاتی مەدەنی ئیسلامی لە تورکیادا .



٢٠٠٧/١٠/١ کۆچـی دوایـی سـەرەك کۆمـاری سـرب بۆسـنه – کۆمـاری سربریسکا ، میلان یلیتش – به هـۆی نەخۆشـی دڵ ... جێگـەی باسـکردنه کـه سـەرۆك کۆمـاری بۆسنه سرب سەرەك کۆمارێکی شـەرەفی بـوو ، کـه لـه مانگی/١٠/٢٠٠٦ ئەم پۆستەی گرتبووە دەست ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەندامی پـارتی سوشیالیـستی دیمـوکراتی بـوو ، کـه پـارتی کۆمۆنیـست بـوو لـه

پێشوودا .
هەروا بۆسنە پێك هاتیە لە دوو کۆماری سربریسکا لە تەك یەکیەتی ئیسلامەکانی کۆماری کروات . هەروا کەسایەتیەکی کاری ئابووری بووە ، واتە بازرگانێکی بە توانا بووە لە وولاتەکەدا .



٢٠٠٧/١٠/١ دەقی نامەیەکی سیناتۆر – جۆزێف بایدەن – کە ئاراستەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆشی کردووەو تێیدا هاتووە کە دەڵێ :–
بەرێز جەنابی سەرۆك :–
چەند مانگێك بەر لە ئێستا پرۆژەی بریارێکمان پێشکەش کرد ، کە بانگەشە بۆ سەقامگیری باری رامیاری ئێراق لە سەر بنەمای فیدرالیزم دەکات . وەك دەزانن لە کاتی گفتووگۆ کردنی بریاردانی لیستی فیسکاڵی ساڵی ٢٠٠٧ ی بەرگری لە ٢٠٠٧/٩/٢٦دا . ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا بە ٧٥ دەنگ بەرامبەر ٢٣ دەنگ پشتیووانی لە پێشنیارەکەمان کرد ... ئەم دەنگدانە یەکەم ئاماژەدانی دوای ئەم چەند مانگەیە .
هەروا سەرجەم لایەنەکانی ئەم مشتوومڕە کۆك وتەبابوون ، کە کلیلی سەرەکی سەقامگیری لە ئێراق پێشڤەچوونی رامیاریە ، لە دوای دەنگدانی پێشنیارەکەم ، وەك رێگەی ئەو بەرەو پێشچوونە لە لایەن هەردوو پارتەکە و پابەند بوونێکی بە هێزی بە خۆیەوە بینی و بەشی هەرە زۆری هەڤاڵەکانمان پشتیووانیان لەو بیرۆکە کرد لە ئەنجوومەنەکەدا .
لە بەر ئەوەی باشترین دەرفەتە بۆ ئێراق دێنێتە ئاراوە ، بۆ ئەوەی سەقامگیر بێت و بە یێکەوەیی بمێنێتەوە و نەبێتە پەناگەیەك بۆ تیرۆرستان و هەرەشەش لە دراوسێکانی نەکات ... روخساری پێشنیارەکەمان دیارو روونە . بانگەشە بۆ سەقامگیری رامیاری لە سەر بنەمای پرەنسیپیەکانی فیدرالیزم دەکات ... کە لە دەستووری ئێراقدا دەنگی داوەتەوەو پەرلەمانی

ئێراقیش پەسندی کردووە لە وولاّتەکەدا .

هەروا تیشك دەخاتە سەر گرنگی پشتیووانی نێوو دەوولەتی لە ئێراقێکی فیدرالّ و یەکسانی دابەشکردنی داهاتی نەوت ، لە هەمووان گرنگتر داوا لە حکوومەت دەکات ، کۆنفرانسێك بۆ ئێراقیەکان ساز بکات بۆ ئەوەی بە سەقامگیریەکی گشتی رامیاریەوە بگەن لە بارەی فیدرالیزم و دوور لە بانگەشە کردن بۆ پارچەکردنی ئێراق ... وەك ئەوەی لە رۆژی ٩/٣٠ لە لێدوانی بالوێزی ئەمەریکا لە بەغدا خراوەتە روو . پێشنیارەکەمان بۆ رێگە گرتن لە پارچە بوونەو هەلّوەشاندنەوەی ئێراق باشترین دوا چانسە .. ئێمە دەمانەوێ دەربارەی پرۆژە بریاەکەمانەوە لە گەلّ کەسایەتی تۆ گفتووگۆ بکەین . ئەگەر هەر خراپ تێگەیشتنێك هەیە روونی بکەینەوەو گفتووگۆش لە بارەی ئەوەوە بکەین . کە چۆن دەتوانین سوود لەم دەرفتە بیۆێنەیە وەربگرین ، بۆ جێ بە جێکردنی ئەو پلانەی کە لە لایەن زۆرینەی هەردوو پارتەکە رەزامەندی لە سەر کراوە ... ئامادەی دیداری جەنابتانین لە نزیکترین دەرفەتدا .

٢٠٠٧/١٠/٣ تیپی مۆزیکی منداڵانی کورد لە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان ، دوای بەشدار بوونیان لە ڤیسڤالّی مۆزیکی جیهانی لە ئەمەریکا ، بە ئالاّی کوردستان و



مارشی ئەی رەقیبان چری ... دوای ئەوەی تیپی مۆزیکی منداڵانی کوردی دیاربەکر بە فەرمی لە لایەن بالوێزخانەی ئەمەریکا لە شاری ئەنکەرە بۆ ڤیستڤالّی مۆزیکی جیهانی بانگهێشت کران . کە ئەم هەولّەش لە مالّپەری کورد نێت و ئاژانسە تورکیەکان بلاّو کرایەوە.

جێگەی باسکردنە کە ئەم ڤیستڤالّە لە ١٠/٣ تا ١٠/٧ بەردەوام بوو ، ئەم تیپە کە لە سەر تەختەی شانۆ لە ئەمەریکا ناسێندران بە ناوی منداڵانی

کورد لە دیاربەکر ناسێندران بە – ئەی ڕەقیب – و بە چەندین گۆرانی دیکە لەم ڤیستڤاڵە بەشداربوون .

تیپی مۆزیکی منداڵانی کورد لە پارێزگای دیاربەکری سەر بە شارەوانی شاری ئامەدەو لە ١٥ ئەندام پێك هاتووەو بە ٨ هەشت زمان گۆرانی دەڵێن لەوانەش – کوردی ، تورکی ، ئینگلیزی ، ئەڵمانی ، ڕووسی ، و هەروا .

٢٠٠٧/١٠/٤ لە دوای ٥٠ پەنجا ساڵ لە پچڕانی پەیوەندی لە نێوان هەردوو کۆریای باکوور و باشوور ، بە هۆی جەنگی نیمچە دوورگەی کۆریا لە ساڵی ١٩٥٣ دا ... هەردوو سەرەك کۆماری کۆریای باشوور و کۆریای باکوور ڕێکەوتن لە سەر ڕاگەیاندنی بەیاننامەی هاوبەش بە دروستکردنی باری ئاشتی بەردەوام لە نیمچە دوورگەی کۆریا . لە دوای کۆتایی گفتووگۆی نێوانیان لە ماوەی ٣ سێ ڕۆژدا .



هەروا ڕێکوتنی هاوکای ئابووریان لە نێوانیان مۆرکرد بە گۆرینەوەی پێداویستیەکان لە ڕێگەی دەشتایی لە نێوانیاندا ، هەروا ڕێکەوتن کە بەردەوام بن لە گفتووگۆ کردن بە هاوکاری کۆماری چینی مللی و وویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، بە مۆرکردنی ڕێکەوتنی ئاشتی و کۆتایی هێنان بە کاری جەنگ و ناکاوی لە نیمچە دوورگەی کۆریا . کە بەردەوام بووە لە ساڵی ١٩٥٣ تاکو ئێستاکە .

هەروا ڕێکەوتن لە سەر دیاریکردنی جێگەی دەریایی بۆ ڕاوکردنی هاوبەش لە سنووری دەریای نێوانیاندا ، کە ئەویش کێشەی لە سەرە . ئەم ڕێکەوتنەش لەوکاتەدا هات ، کە کۆریای باکوور دەستگیری خۆی دووپاتکردەوە بە هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگاو بنکە ئەتۆمیەکان لە ماوەی ساڵێکدا ، ئەمەش بە پێی دیاریکردنی ڕێکەوتنەکە ، بە جێ بە جیکردنی لە لایەن شارەزایان لەم بوارەدا .

٢٠٠٧/١٠/٤ ئەمڕۆ ٥٠ پەنجا ساڵ بە سەر تەمەنی یەکەم مانگی دەستکرد تێدەپەرێ ،




کــه لــه لایــەن مــرۆڤ دروســـتکرا و بـــەرەو بۆشـایی دەرەوە هەڵـدرا لـــه لایـــەن شـــارەزاو پـــسپۆرانی یەکیـــەتی ســـۆڤیەتی جـــاران لـــه ١٩٥٧/١٠/٤ دا .

جێگــەی باسـکردنه کـه مــانگی دەســتکرد بـه نـــاوی – ســـپۆتنیك – دەستکەوت و بەرهەمێکی زانستی و تەکنەلۆژیای مەزن بوو ، لە هـەمان کات سـەرکەوتنێکی گـەوورە بـوو بـۆ یەکیـەتی سـۆڤیەت بـه جمووجۆلیـەکانی راگەیانــدن لــه مــاوەی شــەڕی ســارد ، لــه نێــوان هــەردوو جەمــسەری سوشیالیستی و سەرمایەداری لە هەردوو کێشوەری ئەوروپای رۆژهـەلات و رۆژئاواو لە جیهاندا .

هەروا هەڵدانی مانگی دەستکردی سپۆتنیك هۆشداریەك بوو لە پێناو کێ بڕ کێـی داگیرکردنـی گـەردوون ، لـه نێـوان سۆڤیەت و ئەمـەریکا و بـووە هـۆی ناوزەنـد کردنـی سـەردەمی گـەردوون ، یـاخوود بۆشـایی ئاسمـان ، هـەروا سەفەرەکەی سپۆتنیك بۆ گەیشتن بە چوار دەووری گۆی زەوی ماوەی ٩٨ چرکەی خایاند ، بە هـەڵگرتنی لـه سەر پشتی مووشـەکی نـوێ لـه جـۆری – ئار/٧ لە بنکەی مووشەکی لە – تیوارتم – لە کۆماری کازاخستان .

ئـەم پێشنیارەش لـه لایـەن ئەندازیار – کۆرولـف عـەلی مـورادە – لـه مـانگی ١٩٥٦/١/ پێشکەش بە سەرکردایەتی سۆڤیەت کراو رەزامەندی پێوەرگیرا لـه پێناو تەواو کردنی ئـەم کارەو پێشکەوتنی پێش ئەمـەریکا ، لـه بـەر ئـەوەی ئەمەریکاش لەو هەوڵە بەردەوام بوو ، بەڵام شارەزایان و پسپۆرانی سۆڤیەت تواناداتر بوون و دەستی خۆیان پێش ئەمـەریکا خست ، بە هەڵدانی ئـەم مانگە دەستکردە بۆ سوورانەوەی بە بازنەی گۆی زەویدا .



٢٠٠٧/١٠/٥ لـە هەوڵـە بەردەوامـەکانی پۆلیـــسی ئەســـکلەندی نێوانیان تابلۆی – ئەلعەزراء وەلمەعزەل –– بدۆزنەوە ، کە بەناوبانگترین تـابلۆن لـە تابلۆکـــانی هونەرمەنـــدی ئیتاڵی – لیۆناردۆ دافنشی – لـە دوای چـوار سـاڵ بـە سـەر پێپـەر بـوونی دزینـی ئەم تابلۆیە .

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـەم تابلۆیـە بـە ٣٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیـۆن ژوونـەی ئسترلینی خەملێنـدراوە ، لـە ماوەی گـەڕان بە دوای ئەم تابلۆیە لە شاری ژلاسکۆ ، ئـەم تابلۆیەش لـە لایـەن چوار لـە گەشتیاران لـە مـانگی/٨/٢٠٠٣ دزراوە لـە کۆشـکی دراملانگریـك کـە خاوەنداریەکـەی بـۆ بنـە ماڵـەی – رۆق بۆکلۆش – دەگەڕێتەوە کە لە مانگی/٩/٢٠٠٧ لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە ، هەروا ئەم تابلۆیەش لە سەدەی سانزەهەم لە لایەن دافنشی وێنـەی کێـشراوە بـە نـاوی – عـزراو مـەغزەل – لـە سـەر ئـەرکی وەزیـری دەرەوەی ئەو کاتی فەرەنسا – لویسی دوانزەهـەم –– . هـەروا وێنـەی کۆپی کـراوی ئـەم تابلۆیـەش لـە مۆزەخانـەی ئەمـەریکادا هەیـە ، ئـەم تابلۆیـەش بەرامبەر تابلۆی مۆنالیزایە ، کە لە مۆزەخانـەی لۆڤـەری فەرەنسیە لە شـاری پاریس لە فەرەنسا .



٢٠٠٧/١٠/٦ لــــە هەڵبژاردنـــــەکانی ســـەرۆکایەتی و هــــەردوو پەرلـــەمانی نوێنـــەران و پـــیران و پەرلــــــەمانی ویلایەتـەکانی پاکستان بە ســـەرکەوتنی ســـەرۆکی پاکـــستان – پـــەرویز

موشـەرەف – بـە ٢٥٢ دەنـگ لـە كـۆی ٢٥٧ دەنـگ لـە هـەردوو ئەنجوومـەنی نوێنــەران و ئەنجوومــەنی پــیران ، هــەروا ســەركەوتنێكی بــێ وێنــەی لــە پەرلەمانــەكانی هەرێمــەكان بەدەســت هێنــا ... واش بریــارە كــە لــە ١٠/١ ئەنجامی هەڵبژاردنە لەلایەن دادگای باڵای پاكستان بە شێوەیەكی فەرمی رایگەیاندرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا لـە كۆبوونـەوەی دەنگدان لـە پەرلـەمانی پاكستان ئەنـدامانی پارتی گـەلی پاكستان بەسەركردایەتی سـەرەك وەزیرانـی پێشوو خـاتوو – بـەنازیر بۆتـۆ – لـە پەرلـەمان كـشانەوە ، بـەهۆی بـوونی كێـشە لـە نێـوان پۆستەكانی سـەرۆكایەتی و ئەنجوومـەنی سـەربازی ، كـە پـەروێز موشـەرەف سەرۆكی پاكستان و سـەركردەی گشتی هێزەكانی سـووپای پاكستانە ، كـە ئەمەش لەگەڵ دەستووری ئەم وڵاتەدا ناگونجێت

هەروا سەركەوتنی پەروێز موشەرەف بۆ خوولی دووەمی وەرگـرتنی پۆسـتی سـەرۆكایەتی پاكـستان ، بـووە هـۆی زیـاتر قووڵبوونـەوەی كێشە لـە گـەڵ پارتی گەلی پاكستان و لایەنە رامیاری و ئایینی دیكە لە وڵاتەكەدا ، كە بە بارو دۆخێكی نالەبارو تەنگەژەدا تێدەپەرێت لە كێشووەرەكەدا .

٢٠٠٧/١٠/٧ سـەرۆكی دەسـتەی زانایـانی ئیـسلامی مەزهـەبی سـوننە لـە ئێـراق – حـارس ئـەلزاری – لـە چـاوپێكەوتنەكەیدا لەگـەڵ كـەناڵی ئاسمـانی ئەلجـەزیرە روونیكـردەوە ، كـە نزیكـەی ٩٠٪.ی ئەنـدامانی رێكخـراوی قاعیـدەی تیرۆرسـتی



ئیسلامی توونـدرەو ئێـراقین ، بۆیە رێكخـراوی قاعیـدە بەشێكە لـە ئێمـە و ئێمەش بەشێكین لە رێكخراوی قاعیدە .

هەروا ناوبراو لە درێژەی چاوپێكەوتنەكەدا گووتی :-

سـەرەرای ئـەوەی ئەنـدامانی رێكخـراوی قاعیـدە چـەندین جـار هێرشـیان كردۆتە سەر هاووڵاتیانی مەدەنی و ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی شەڕ لە نێوان قاعیدەو گروپە بەرهەڵستكارەكانی دیكە دروست بێت ، بەڵام پێویستە ئەو

گروپانە بەرەنگاری ڕێکخراوی قاعیدە نەبنەوە ، لە بەر ئەوەی شەڕ کردن لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدە لەلایەن ئێراقیەکانەوە ، تەنها خزمەت بە داگیرکەر دەکات لە ئێراقدا .



٢٠٠٧/١٠/٧ بە هۆی کوژرانی ١٣ سەربازی تورکیا لە ١٠/٦ لەلایەن چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان pkk لە ناوچەی سیرناك لە باکووری کوردستان ، کۆبوونەوەی حکوومەتی تورکیا بەسەرکردایەتی سەرەك وەزیران – ڕەجەب تەیب ئۆردوگان – ئەویش لە پێناوی تێکۆشان دژی چەکدارانی پەکەکە ، بە ناوی ئەوەی کە تیرۆرستن لە ڕۆژهەلاتی باشووری تورکیا .

جێگەی باسکردنە کە دەسەڵاتدارانی تورکیا لە سەر ڕامیاریەتی داپلۆسین و گرتن و کوشتن و دەربەدەرکردنی گەلی کورد بەردەوامن لە باکووری کوردستان بەهێزی سەربازی و شێواندن و ئاڵۆزکردنی بارو دۆخەکەو دەست تێوەردانیان لەکارو باری ناوخۆی هەرێمی باشووری کوردستان .

لە پێناو لە ناوبردنی ئەو پرۆسە ئازادیەی کە لەم هەرێمەدا بەرقەرار بووە ، لە دوای ڕاپەرینەکەی بەهاری / ١٩٩١ . چ لە ڕێگەی پیاوەکانیان لە بەرەی تورکمان و چ لە ڕێگەی سەربازی بە هاتنە ناو خاکی هەرێمی باشووری کوردستان بە ناوی ئەوەی کە لە پارتی کرێکارانی کوردستان دەدەن .

ئەمەش لە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتنی ئەمنی دێت ، لە نێوان هەردوو وەزیری ناوخۆی ئێراق و تورکیا لە مانگی /٢٠٠٧/٩ . بە هاوکاری و هاوبەشی لە لایەنی بەربەرەکانی کردنی تیرۆر ، بەڵام لایەنی ئێراق ئەوەی ڕەتکردەوە کە هێزەکانی تورکیا ماوەیان پێ بدرێت بێنە ناو خاکی ئێراق و لە هەرێمی کوردستان جمووجۆڵیە سەربازیەکان دژی چەکدارانی پەکەکە ئەنجامبدات لە هەرێمەکەدا .



٢٠٠٧/١٠/٧ توركیـا دووپـاتی ئـەوەی كـردەوە بـۆ سـووریا كـە پەیوەنـــدی ســـووریاو توركیا زۆر لەوە بەهێزترە ، كـە توركیـا مـاوە بـە ئاسمـانی خـۆی بدات بۆ لێـدانی سـووریا لەلایـەن فرۆكە جەنگیەكانی ئیسرائیل .
جێگـەی باسـكردن كـە فرۆكـە جەنگیـەكانی ئیـسرائیل لـە رۆژی ١٠/٦ هێرشـیان كـردە سـەر سـەربازیەكی سـووریا لـە قـوولایی خـاكی سـووریا ، لەوكاتشدا وەزیری دەرەوەی توركیا – عەلی باباجـان – سـەردانی سووریای كـردوو لـە گـەڵ سـەرەك كۆمـاری سـووریا – بەشـار ئەسـەد – كۆبـووەو لـەو كۆبوونەوەیەدا بۆ بەشار ئەسەدو حكوومەتی سووریای دووپاتكردەوە ، كە توركیـا مـاوە نـادات بـە فرۆكـە جەنگیـەكانی ئیـسرائیل لـە نـاو ئاسمـانی و خـاكی توركیـا پـەلاماری سـووریا بـدات ، هـەروا سـەردانی وەزیـری دەرەوەی سـووریا بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـووە كـە بـاری ناوچـەكە ئـاڵۆز نـەبێت و دوای ســەردانەكەی بــۆ ســووریا بــەرەو ئیــسرائیل بەرێكــەوت و هــەوڵی ئارامكردنەوەی باری ناوچەكە بدات ، لە گەڵ پەیوەندی و دۆستایەتی نێوان توركیـا ، لـە گـەڵ هـەردوو وولاتـی دژ بـە یـەكتری سـووریا و ئیـسرائیل لەناوچەكەدا .



٢٠٠٧/١٠/٨ كۆمپانیا توركیـەكانی كـە لــە هــەرێمی باشــووری كوردســـتان لـــە بـــواری وەبەرهێنان كاریان دەكرد ، دەسـتیان كـرد بـە كـــشانەوەیان لــــە هەرێمەكـەدا بـە هـۆی هێرشـە راگەیاندنـەكانی رژێمـی توركیـا بەهاتنـە نـاو خـاكی هـەرێمی كوردسـتان ، لـە پێنـاو پـەلاماردانی چـەكدارانی پـارتی كرێكارانی كوردستان – پەكەكە – بە هێزی سەربازی و بە یەكلایەنە .

جێگـەی باسـکردنە کـە کۆمپانیـا تورکیـەکان لـەدوای دەرچـوونی یاسـای وەبەرهێنان روویان لە هەرێمی باشووری کوردستان کرد ، بە دەستپێکردنی کاری وەبەرهێنان لە هەموو بورەکاندا ، کە ئەم کارە وەبەرهێنانـە بـە ٥ ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێت .

ئەمەش لە دوای کوژرانی ١٥ سەربازی هێزەکانی سووپای تورکیا دێت لە ئـەنجامی شـەڕی نێـوان سـووپای تورکیـا و چـەکدارانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان لـە رۆژهـەڵاتی باشـووری تورکیـا ، کـە باکووری کوردسـتانە لـە سەر سنووری نێوان ئێراق و تورکیا لەسەر خاکی کوردستان .

هەروا چەندین کۆمپانیا لە شارەکانی هەولێر – دهۆك – سلێمانی – زاخۆ – و شارۆچکەکانی دیکە کاریان دەکرد ، کە ببوە هۆی کارپێکردنی زیاتر لە ١٠ هەزار کرێکاری کورد لە هەرێمەکەدا .

هـەروا بـەو هۆکـارە وەزیـری بـەرگری ئەمـەریکا – رۆبـەرت گێیـتس – هۆشداریدا بەحکوومەتی تورکیا بە هێرشکردنە یەك لایەنەی بۆسەر هەرێمی باشووری کوردستان ، بە هۆی بۆردومان کردنی هێزەکانی سووپای تورکیا لە هەرێمی باشووری کوردستان ، لەگەڵ چەندین کار و هۆکاری دیکە چ لە لایەن تورکیا و هەرێمی باشووری کوردستان .




٢٠٠٨/١٠/٨ بە هۆی زریانی بە هێزی بـاو بـارانی – کرۆسـا – لـە باشـووری رۆژهـەڵاتی چـینی مللـی زیـاتر لـە ٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیـــۆن کــەس دەربــەدەربوون ، بــەر لــەو زریــان و بــاو بارانـە بـە هێـزە ، دەسـەڵاتدارانی چـینی مللـی توانیـان زیـاتر لـە ١٤٠,٠٠٠ هـەزار خێـزان بگوازنـەوە بـۆ ناوچـە ئارامـەکان و زیـاتر لـە ٢٧٠٠٠ هـەزار راو راوچییەکان لە ناوچەکە دووربخەنـەوە ، کـە خێرایـی بـاو بارانەکـە دەگـەیشتە ١٨٥ کیلۆمـەتر لـە کاتژمێرێکـدا . هـەروا بـووە هـۆی ئـەوەی کـە زیـاتر لـە ٢,٢٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەس بێ شوێن و جێگە بمێننـەوە لـە ناوچـەکەو هـەموو

پێداویستی ژیانیان لە سەر ببڕێ . هەروا بەر لە چینیش ئەم باو بارانە بەهێزە لە باکووری تایوان و ڤێتنامی دابوو ، کە بە هەمان شێوە زیانێکی زۆری بەدام و دەزگا و کارەبا و کێڵگە کشتووکاڵیەکان و خانوو و زەوی گەیاندبوو ، کە بە ملیار دۆلار مەزەندە دەکرا .

٢٠٠٧/١٠/٨ لە دوای چەندین جار لە داخستنی دەروازی سنووری نێوان حکوومەتی هەرێمی کوردستان و کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی چەندین کێشەی



رامیاری و سەربازی ، کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان و گەلی کوردستان لە باشووری کوردستان ، لێی بەرپرسیارنیە تەنیا دروستکردنی کێشەو گرفت نەبێ ، لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران و رەچاوکردنی هاوکاری و هەماهەنگی دۆستەکانی دژ بە کورد و کوردستان .
جێگەی باسکردنە کە دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی لە ئێران ، بەر لە دوو هەفتە سنووری حاجی ئۆمەرانی داخست و بووە هۆی کارلێکردن لە بازارەکانی هەرێمی باشووری کوردستان ، لە دوای هەولێکی زۆر توانرا ئەمرۆ ئەم دەروازە سنوورەی حاجی ئۆمەران بکرێتەوە ، بە رێکەوتن لە نێوان شاندەکانی ئێران و حکوومەتی هەرێمی کوردستان .

٢٠٠٧/١٠/٩ لە راگەیاندنی دەستەی بە خشینی خەلاتی نۆبڵ بۆ ساڵی ٢٠٠٧ بریار درا بە پێدانی ئەم خەلاتە بە هەردوو زانای سەرکەوتووی فەرەنسی – ئەلبیرفیرو



، ئـەلمانی – بیتـەر گرونبیرگ – بـە هـۆی دۆزینـەوەی بـەرگری موگناتیـسی مـەزن – چـی ئـم ئـار – بـە خوێندنـەوەی زانیاریـە کۆکراوەکـان لـە کاسـێتی بەهێزی ئامێری هەژماردن .

جێگـەی باسـکردنە کـە زانـای فەرەنـسی بـە ناوبـانگ و تەمـەن ٦٩ سـاڵ و لـە دایـك بـووی شـاری کاکاسـۆنە لـە فەرەنـسا و بەڕێوەبـەری زانـستی یەکـەی هاوبەشی فیزیایە لە مەلبەندی نەتەوەیی بۆ توێژینـەوەی زانـستی – تـاڵ لـە ئۆرسای لە دوای ساڵی ١٩٩٥ دا لە وولاتەکەدا .

هـەروا زانـای ئـەڵمانی بیتـەر گرونبیرگـی بـەناوبانگ و تەمـەن ٦٨ سـاڵ و مامۆسـتایە لـە پـەیمانگای فروشونگسنتوم بـولس لـە ئـەڵمانیا ، هـەروا لـە سـاڵی ٢٠٠٦ ئـەم خەلاتـە بەخـشرا بـە دوو زانـای نـاوداری ئەمـەریکا ، ئەوانیش – جۆن فاتر – و – جۆرج سموت – بوون بە پاداشت کردنیـان بـە هۆی هەڵسانیان بە کاری تایبەتی بە بنچەی ئەستێرەکان .

٢٠٠٧/١٠/٩ ووتـە بێـژی فـەرمی بـە نـاوی کۆشـکی سـپی وویلایەتـــــــــــــــە یـــــــــەکگرتووەکانی ئەمـــــەریکا – گـــۆردن گـــۆنرۆ – رایگەیانـــد و گـــووتی :– ئەمـــەریکا پابەنـدە بـە هاوکـاری و



پارمەتیـدانی تورکیـاو ئێـراق لـە سـەر بەرەنگار بوونـەوەی چـەکدارانی پـارتی کرێکارانی کوردستـان – پەکەکە – لە باکووری کوردستان .

هـەروا ووتـە بێژەکـە جـەختی لـە سـەر پابەنـد بـوونی ئەمـەریکا کـردەوە بـۆ پارمەتیدان و پشتیووانی لێکردنی لە هەردوو وولاتی تورکیاو ئێراق ، بە بێ ئـەوەی هـیچ روونکردنەوەیـەك لـە سـەر هەڵوێـستی کۆشـکی سـپی بـدات لـە بەرامبـەر بریـاری لەشکرکێـشی تورکیـا بـۆ نـاو خـاکی هـەرێمی باشـووری کوردستان ... هەروا گووتی :–

تورکیـاو ئێـراق ئارەزوومەنـدن لـە سـەر ئـەوەی کـە بـۆ چارەسـەر کردنـی کێـشەکان . واشـنتۆن هاوکاریـان بکـات ، کـە زۆرتـرین رێگـەی کاریگـەرو

گونجاویش لە پارێزگاری کردنی گیانی خەڵکی هەردوو وولاتە .

**تێبینــی :- ئەمــەریکا لــە هــەموو کــات و ســاتێك و وەختێکــدا بەرژەوەندیەکانی خۆی بە قوربانی کەس نەکردووە لە هـەموو بوارەکاندا ، لـە بـەر ئـەوەی ئەوەندە یارمەتیدەرە تـــا بەرژەوەنـدی پارێزراو بێـت و پێـچەوانەش راستە . لـە بـەر ئـەوەی ئەمـەرکا و وولاتـانی هاوپـەیمان لـە رژێمی ئیمپریالیەت هـــەموو شتێك لە پێناو پارەو سامانە و گـــەلانی جیهـانی ژێـر دەسـتەو هـەژار بـە تـاك و کۆمـەڵ دەکاتـە ســـووتەمەنی بەرژەوەندیەکانی خۆی ، بە تایبەتی لـە بوارەکـانی ئابووری و بازرگـانی و سەربازیدا لە جیهان .**

٢٠٠٧/١٠/٩ نووسـینگەی سـەرەك کۆمـاری تورکیـا لـە بەیاننامەیەکیـدا رایگەیانـد ، کـە عەبوڵلاّ گووڵ نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش کـردووەو لە نامەکەیدا هۆشداری لە بارەی ئەو زیانانەوە ، کە لـە ئەنجامی راگەیانـدنی یاسای تایبەت بە لە ناوبردنی ئەرمەنەکان لە ساڵی ١٩١٥ دروست دەبن .

جێگــەی روونکردنەوەیــە کــە لیژنــەی کاروبــاری دەرەوە لــە ئەنجوومــەنی نوێنەرانی ئەمەریکا لە رۆژی ١٠/١٠ پرۆژە بریارێکی تایبەت بە پاکتاوکردن و کۆمـەڵکوژی ئەرمەنـەکان لـە ١٩١٥/٤/٢٤ لـە سـەر دەسـتی دەسـەلاّتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بخاتـە دەستی ئەندامانی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئەمەریکا . لە گەڵ ئەوەی ئیدارەی جۆرج بۆش دژی ئەو بریارەیە .

بـەلاّم پـارتی دیمـوکراتی ئەمـەریکا لـە ئەنجوومـەنی نوێنـەران پاڵپـشتی لـەو بریارە دەکەن و سـەرۆکی ئەنجوومـەنی نوێنـەران – نانسی بیلوسـی – پـێش ماوەیەك بریاریدا ، کە ئەو پرۆژە یاسایە دەنگی لـە سـەر بدرێت ، هـەر بـەم هۆیەوە سەرەك کۆماری تورکیا گووڵ سوپاسی خۆی ئاراستەی جۆرج بـۆش بـەو هەڵوێـستەی کـە هیبـووە دژی بریارەکـە و لـە هـەمان کـات ، سـەرۆکی تورکیا گووتی :- ئەگەر بێتوو ئەو پرۆژە یاسایە سەرکەوتن بە دەست بێنـێ لە دەنگدان ، ئەوا تورکیا پاڵپشتیەکانی بۆ هێزەکـانی سووپای ئەمـەریکا لـە ئێراق دەوەستێنێت لە وولاتەکەدا .

لـە بـەر ئـەوەی بەشـی هـەرە زۆری پاڵپـشتیەکان بـۆ هێزەکتـانی سـووپای ئەمەریکا لە ئێراق لـە رێگـەی بنکـەی سـەربازی ئەنجەرلیکـەوە لە باشووری تورکیاوە دێن بۆ ئێراق لە هەموو بوارەکانی سەربازیدا .

٢٠٠٧/١٠/١٠ووتە بێژی فـەرمی کۆمیسیۆنی یەکیـەتی ئـەوروپا – کریـستیان نـاگی – بـۆ

کاروباری فراوانکردنی یەکیەتەکە گووتی :- یەکیەتی ئەوروپاو تورکیا بەردەوام پابەندو پەیوەستن بە سەروەری و یەکیەتی و سەلامەتی خاکی ئێراق . هەروا هیواشی خواست ، کە تورکیا بەردەوام رۆڵی باشی هەبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان و تووند و تۆلکردنی هاوکاری هەرێمی . لە هەمان کات سەرکۆنەی هێرشەکانی ئەم دواییەی چەکدارانی – پەکەکە –ی لە باکووری کوردستان کردو گووتی:-

ئێمە لە نیگرانیەکانی تورکیا دەگەین و پێویستیشە لە سەری رووبەرووی تیرۆر ببینەوەو رێگە لە هێرشی تیرۆرستی بگیرێت ... بەلاّم لە هەمان کات کریستیان ناگی گووتی :-

یەکیەتی ئەوروپا پێداگری لە سەر ئەوە دەکات ، کە پێویستە ئەنکەرە بە مەبەستی رووبەروو بوونەوە لە گەڵ ئەو کێشە رێگای هەماهەنگی و هاوکاری لە گەڵ دەسەلاّتدارانی تایبەت بەو بارە بدات لە ناوچەکەدا .

جێگەی گووتنە کە هەرچوار وولاّتی کوردستانی پێ لکێندراو ، تورکیاو ، ئێران و ، ئێراقی کۆن و نوێ و ، سووریاو وولاّتانی دیکەی عەرەبی و ئەوروپای رۆژئاوا ، تا راپەرینەکەی بەهاری/١٩٩١ کوردیان بە تیرۆر و باخی بوو دادەنا و بە هەموو جۆرە چەك و تەقەمەنیەك و بە ئاگرو ئاسن لە کوردیان دەدا ، لە رێگەی ئەنفال و کیمیا باران و وێرانکردنی گوندو شارەدێ و شارۆچکەو ، بە عەرەبکردن و بە تورککردن و بە فارسکردن و هەتا بە مەزهەب کردن بە شیعە لە مەزهەب سووننە بۆ شیعە بەردەوام بوونە لەو کارانە بە هاوکاری و یارمەتی و هەماهەنگی یەکتری دژی کورد و خاکی کوردستان لە ناوچەکەدا .

بەلاّم دوای راپەرینی بەهاری /١٩٩١ لە سووریا و ، تورکیا و ، ئێران ، هەتا لە ئێراقی نوێش بە هەمان شێووەو شێواز بەردەوامن لە تواندنەوەو رێگەگرتن لە مافەکانی کورد لە سەر خاکی کوردستان .

ئەمرۆش پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری کوردستان – پەکەکە – بە پارتێکی تیرۆرست و بەربەرەکانی دەکرێت ، کە لەو کاتەی تاکە پارتە شانی دابێتە بەر چەك و بەرگری لە کوردو کوردستان بکات ، سەرەرای کەموو کوریەکان و چەند هەڵوێستێکی ئاڵۆزی کاریگەر لێکراو لە لایەن رامیاریەتی نێوو دەووڵەتی و ناوچەو وولاّتانی داگیرکەر و رێگە خۆشکەر بۆ دژایەتی کردنی ئەم پارتە و پارتەکانی دیکەی تورکیا و ، سووریا و ، ئێران

بەڵام لە راستیدا خۆیان تیرۆرستن و داگیرکەرن لە هەموو بوارە جیا جیاکان ، بە تایبەتی لە رووی نەتەوەیی و نیشتیمانی و ویژدان لە هەستی ئەم دەسەڵاتە و پارت و گروپ و رێکخراوە کەسایەتیانە نیە ، کە بە کورد دەگووترێ تیرۆرست . هەتا گەر سەرکردایەتی کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان بێت و پێویستە کورد لەو هەڵ و مەرجەی دوای روخاندنی یەکیەتی سۆڤیەت و رژێمی بەعس لە ئێراق و هاتنە کایەوەی سەردەمی نوێی مافی مرۆڤ ، خۆی نەداتە بەر لەعنەتەکانی مێژوو ، چ لە رابردوو ، چ لە ئێستاو چ لە داهاتوو ، لە کوردستان . بەڵام کورد ....؟...!.



٢٠٠٧/١٠/١١ ئەمیندداری گشتی بزووتنەوەی مللی رزگاری لە باشووری سوودان – باجان ئاموم – رایگەیاند ، ئەویش بە دەست کێشانەوەی خۆیی و لایەنگرانی لە حکوومەتی نیشتیمانی هاوبەش لە گەڵ حکوومەتی سوودان و پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی دەسەڵاتدار لە سوودان .

جێگەی باسکردنە ئەم بزووتنەوەیە بە پارتێکی سەرەکی لە باشووری سوودان دادەنرێت و ماوەی زیاتر لە ٢١ ساڵ بەردەوام بوون لە شەڕو قێکداندان و ململانێ لە گەڵ حکوومەتی سوودان لە باکووری سوودان ، و دوای رێکەوتنی هەردوو لایان لە ساڵی ٢٠٠٥ بە رێکەوتنی ئاشتەوایی و کۆتایی هێنان بە کێشەی نێوانیان و بەشداریان لە دەسەڵات بە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان باکوورو باشوور لە هەموو بوارەکاندا .

بەڵام بە هۆی جێ بە جێنەکردنی ماددەو خاڵ برگەکانی رێکەوتنەکە لە لایەن حکوومەتی ناوەند ، ئەم هۆکارەی لێکەوتەوە لە گەڵ چەندین هۆکاری دیکە لە وولاتەکەدا .

<u>تێبینی:–</u> بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی ناوەرۆکی بەرگی سێیەم بخوێنیتەوە دەربارەی رووداوەکان لە سوودان .



١١/١٠/٢٠٠٧ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی ڕێکخراوە نا حکوومیەکان ، لە وانەش ڕێکخراوی – ئۆکسفام – ئەویش بە خەرجیەکانی کێشەی چەکداران لە کێشووەری ئەفەریکیا لە ماوەی ١٥ ساڵی رابردوو ، بە ٣٠٠ ملیار دۆلار خەملێندرا ، کە خەرج کراوە بۆ بنبرکردنی ئەم کێشانە ، ئەمەش یەکەمجارە ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەنجام بدرێت لە سەر کێشەی ململانێی چەکداری و شەڕو پێکدادان ، کە ٢٣ وولاتی ئەفەریکی لە ناو ئەو گیژاوەن لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٠ –٢٠٠٥ کە بۆ هەر ساڵێك زیاتر لە ١٨ ملیار دۆلار خەرج کراوە لەو پێناوەدا .

ئەمەش بە زیاد کردنی خەرجیەکانی سەربازی و ماندووبوونی باری ئابووری و بەردەوام بوونی تاکو چارەسەری بۆ دەدۆزرێتەوە . سەرەرای ئەوەش حکوومەتە جیا جیاکانی ئەم کێشووەرە هەنگاوی باشیان هاوێشتووە بۆ چارەسەر کردنی کێشە هەمە لایەنەکانی باری چەکداری و کۆتایی هێنان بە شەڕو ململانیٚ لە سەر هەموو بوارە جیا جیاکان .

هەروا راپۆرتەکە ئامارژە بەوەش دەکات ، گەر هاتوو ئەو برە پارەیەی سەرەوە لە بنیاتننانەوەی ئەو وولاتانە خەرج بکرێت ، بە دروستکردنی خان و باڵەخانە وقوتابخانەو نەخۆشخانەو بوارەکانی ئاو و کارەبا ، ئێستا باری ئابووری و بازرگانی و کۆمەلایەتی گەلانی وولاتانی ئەفەریکیا لە بارێکیدا خۆی دەدۆزیەوە ، نەك لە باری هەژاریدا بەردەوام بێت لە کێشووەرەکەدا سەرەرای یارمەتی دانیان لە بواری مرۆییدا لە لایەن وولاتانی تواناداری ئابووری لە ئەورووپا دا .

١١/١٠/٢٠٠٧ سەرکەوتنی نووسەری بەریتانی خاتوو – دوریس لیسینگ – بە پاداشتی خەلاتی نۆبلٚ لە ئاداب بۆ ساڵی ٢٠٠٧ بە هۆی کۆمەڵە کارەکانی لە ماوەی ٥٧ ساڵی رابردوودا .




جێگـەی باسـکردنە کـە خـاتوو – دوریـس – لـە مـاوەی ژیـانی لـە نووسـینەکانی توانیویـەتی چـەندین بەرهـەمی بـە پێـز بگەیەنێتـە ئـەنجام لەوانـەش :- نامیلکـەی زێرینـی ، یاداشـتەکان ، ئـەو هاوینـەی کـە هـاوینێکی تاریك بوو – هەروا خاتوو دوریس یانزەمین ئافرەتە ، کە خـەلاّتی نۆبڵی پـیّ ببەخشرێت لـە سـاڵی ١٩٠١ تـاکو ئێستا و دووەم نووسـەری بەریتانیـە بـە سـەرکەوتنی لـە وەرگرتنـی خـەلاّتی نۆبـڵ . کـە لـە سـاڵی ٢٠٠٥ نووسـەری بەریتانی – هارۆلد بیتەر – ئەم خەلاّتەی بە دەست هێناو ، لە ساڵی ٢٠٠٦ یش نووسـەری تـورکی – ئۆرهـان یاموك – ئـەم خەلاّتـەی بـە دەسـت هێنـا لـە جیهاندا .

٢٠٠٧/١٠/١١ کۆچـی دوایـی نووسـەرو رووناکبیری نـاوداری کـورد – محەمـەد ئـۆزۆن – لـە نەخۆشـخانەی – دیجلـە – لـە شـاری دیاربـەکر لـە بـاکووری کوردسـتان ، بـە هـۆی نەخۆشـی شـێرپەنجە ... جێگـەی روونکردنەوەیـە کـە نووسـەری نـاوداری کـورد ئـۆزۆن لـە سـاڵی ١٩٥٣ لـە شـاری – سـێورەك –ی سـەر بـە پارێزگای ئۆرفە – لە باکووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .



هـەروا نووسـەر لـە سـەرەتای سـاڵی هـەفتاکان بـە هـۆی نووسـین بـە زمـانی کوردی و تورکی ، لـە سـاڵی ١٩٧٧ لـە لایـەن رژێمی تورکیا دەستگیر کرا ، هـەروا محەمـەد ئۆزۆن لـەو سـاڵەی کـە بـە هـۆی نووسـین بـە زمـانی کـوردی و پەرەپێدانی دادگایی توانی بەرەو هەندەران خۆی دەربـاز بکـات و لـە وولاّتـی سووید جێگیر بوو ، لە مـاوەی مانـەوەی لـە وولاّتـی سـووید بـوو بـە ئەنـدامی رێکخراوی ئەدەبی – پەناکورد – و پلەی یەکیـەتی نووسـەرانی کـورد بـووە . هەروا نووسـەری نـاوداری کورد لـە سـاڵی ٢٠٠١ دا تـوانی خـەلاّتی torny

segersted وەرگرێت.
دوای ئەوە ئۆزۆن لە ساڵی ٢٠٠٥ گەرایەوە وولاتی تورکیا و لە شاری ئەستەمبوڵ نیشتەجێ بوو . هەروا لە کۆتایی ئەو ساڵەشدا لە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی باشووری کوردستان لە لایەن حکوومەتی هەرێم خەلاتی رێزلێنانی پێ بەخشرا . دوای ئەوەش لە ساڵی ٢٠٠٦ ئاشکرا بوو ، کە ئۆزۆن دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە بووە ، کە لە لایەن پزیشکانی سووید و ئەمەریکا چارەسەری بۆ نەکرا .
نووسەری ناوداری کورد محەمەد ئۆزۆن ، لە دوای خۆی چەندین بەرهەمی ئەدەبی بۆ نەتەوەکەی جێ هێشتووە لە وانەش :-
رۆژێك ژ رۆژێن عەڤدالێ زەینکێ ، لە ساڵی ١٩٨٧ بلاو کردۆتەوە . مردنی پیرە مێردیکی خۆشەویست ، لە ساڵی ١٩٨٩ بلاو کردۆتەوە ، سێبەری خۆشەویستی لە ساڵی ١٩٩٢ بلاو کردۆتەوە ... لە گەڵ چەندین بەرهەمی دیکەی لە دوای ساڵی ١٩٩٠ بلاو کردۆتەوە .



٢٠٠٧/١٠/١١ لە سەر بانگ هێشتی وەزارەتی رۆشنبیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان دکتۆر -- ئیبراهیم داقووقی -- نووسەر و رۆشەنبیر گەیشتە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی باشوری کوردستان , و کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی بۆ ساڤدرا , لەم کۆنگرەیەدا داقووقی باس لە تاقیکردنەوەکانی خۆی و رەوشەکان کرد کە لە سەری وەستاوە و لە نووسینەکانی ئاماژەی پێداون , لە وانە پەیوەندی نێوان کورد و تورکمان و مافەکانیان .
هەروا لە وتەکانیدا داقووقی تیشکی خستە سەر ئەو کارانەی کە پێی هەستاوە لەوانە ، کردنەوەی سەنتەری ئەکادیمی بۆ دیراساتی راگەیاندن ,

هەروا ئاماژەی بەوە دا ، کە یاداشتێکیان بۆ سەرۆك بارزانی بەرز کردۆتەوە لە ڕێگەی وەزیری رۆشنبیری بۆ کردنەوەی لقێکی ئەو سەنتەرە لە کوردستان.

هەروا لە سەر کێشەی کورد لە تورکیا ئیبراهیم داقووقی گوتی:- کاتێ من کتێبێکم لە سەر کێشەی کورد لە تورکیا نووسی ، جۆرەها تۆمەتم بۆ دروستکرا . هەروا گووتی :- هەندێك لە پارتە پێشکەوتووخوازەکان لە سالأنی هەشتاکانەوە لە گەڵ ئەوەن کە مافی کورد بدرێت ، ئەمەش بە هەولی نووسەری بە ناو بانگ -- عەزیز نەسینی -- سەری هەلدا ، کە پشتی بە بەلگە نامەیەك بەست بوو کە لە لایەن -- مستەفا کەمال ئەتا تورك -- دەربارەی بەشداری کردنی کورد لە مافەکانیان لە تورکیا نووسرا بوو .

بەلأم دوای مردنی دامەزرێنەری کۆماری تورکیا مستەفا کەمال ئەو بەلگە نامەیە سەرە نگوم کرا و لە لایەن ژەنەڕال و دەستەی ئەرکانی سەربازی تورکیا لە ناو بران . هەروا دەربارەی بۆ چوونی خۆی سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە داقووقی گووتی:- سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆردگان گەیشتە ئەو پۆستە و سەرکەوتنی لە سالی ٢٠٠٣ و هەلبژاردنی ئەم روایيەشی لە سەر ئەم بنەمایە بوو , پێموایە ئۆردگان سیاسیەکی باشە وبەرە بەرە ئەو کێشە چارەسەردەکات .

جێگەی باسکردنە کە ئیبراهیم داقووقی لە سالی ١٩٣٤ لە شارۆچکەی -- داقووقی- ی سەر بە پارێزگای کەرکوك چاوی بە جیهان هەلهێناوە و بە ڕەگەز تورکمانە...!. هەر لە کەرکوك خوێندنی تەواو کردووە و لە شاری بەغداش کۆلیژی یاسای تەواو کردووە ، چەندین جار لە سەر نووسینەکانی بەند کراوە و خاوەنی ٣٣ کتێبە لە نووسین و وەرگێران .

٢٠٠٧/١٠/١٢ سەرەك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئۆردگان لە لێدوانێکدا گووتی:- بۆ هێرش کردنە سەر هەرێمی باشووری کوردستان ، بە مەبەستی ڕاوەدوونانی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان - پەکەکە - لە باکووری کوردستان و سەر سنوورەکان , تورکیا ئامادەیە رەخنەکانی کۆمەلگای نێوو دەوولەتی بێنێتە سەر خۆی ، هەروا ئۆردگان گووتی :-

تورکیا رێز لە یەك پارچەیی ئێراق دەگرێت ، بەلأم ئێستا بە مەبەستی

قەدەخە کردن و ڕێگە گرتن لە چەکدارانی پەکەکە هیچ کارێکی نەکردووە ، هەر بۆیە ئەنکەرە خۆی ئەو کارە دەکات . وداوای لە پەرلەمانی تورکیا کردووە کە هەفتەی داهاتوو ڕێگە بە سوپای وولاتەکەی بدات بۆ هێرشکردنە سەر چەکدارانی پەکەکە لە سەر خاکی هەرێمی کوردستان .

دوای ئەم لێدوانانە و هەڕەشە کردنە کۆمەڵگای نێوو دەووڵەتی لەم بارەیەوە تورکیایان هۆشدالر کردەوە , لەوانە ڕێکخەری بالاًی سیاسەتی دەرەوەی ئەوروپا -- خافێر سۆلانە-- گووتی:- هەر ئالۆز کردنێکی دیکەی ڕەوشی ئێراق پێشوازی لێناکرێت . لە بەر ئەوەی ئالۆز کردنی باری ئێراق ، زیاتر ئالۆزکردنی باری ناوچەکەیە بە گشتی پەیوەندیەکان لە نێوان تورکیا و کۆمەڵگای نێوو دەووڵەتی بە تایبەتی یەکێتی ئەورۆپا .

هەروا لە لایەکی دیکە بە پێی هەواڵی ئاژانسی -- بی بی سی -- بەریتانیا ڕاگەیاندنەکانی سەر بە پەکەکە بلاًویان کردۆتەوە ، کە چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان بە نیازن ناوچە شاخاویە سنووریەکانی هەرێمی کوردستان -- تورکیا , بەرەو ناو خاکی تورکیا جیٚ هێڵن لە ناو تورکیا هێرش بکەنە سەردام و دەزگای دەووڵەتی تورکیا و پارتی داد و گەشە پێدان .



۲۰۰۷/۱۰/۱۲ ڕێکخراوی ڕاگەیاندن و ئاسایشی ڕۆژنامە نووسان لە ئیتاڵیا ڕایگەیاند ، کە خەڵاتی ئەمساڵی -- ئازادی ڕۆژنامە گەری ئیتاڵیا -- بە هەردوو ڕۆژنامە نووسی ڕۆژهەلاًتی کوردستان -- عەدنان حەسەن پوور ، و هیوا بوتیمار -- دەبەخشرێت کە بەر لە چەند مانگێك ئێران بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکرد .

خەلاًتی ئازادی ڕۆژنامە گەری کە بۆ ڕۆژنامە نووسە چالاکەکانی بواری کۆمەلاًیەتیە بۆ ئازادی ڕادەربڕین , کە پار ساڵ بەخشرا بە ڕۆژنامە

نووسێكی كورد و ڕۆژنامه نووسێكی ئاشووری .
ئەم هەواڵەش لە لایەن هەواڵەكانی ڕادیۆی فەرەدەی فارسی ، كە بارگاكەی لـە ئەمەریكایـە بـلاوی كـردەوە و ، بڕیـار وایـە ئـەم خەلاتـەش لـە مـانگی/ ۲۰۰۷/۱۱ ی داهتوو لە بارەگای شارەوانی شاری – سییەنای ، ئیتالیا -- ببەخـشرێ بـە بنەماڵـەی هـەردوو ڕۆژنامـە نـووس ، كـە ئێـستا لـە زینـدان ژیانیان بە سەر دەبەن و پێشتر دادگای باڵای ئێران بڕیاری لە سێدارە دانیان بۆ دەركردووە ، بە تۆمەتی ئەوەی كە ئەو دوو ڕۆژنامە نووسـە -- دوژمنـی خودان -- بەلام بە پێچەوانە .
دامەزرێنەرو بەڕێوەری ئەم ڕێكخراوە -- ئیستیڤانۆ ماجێلی -- دەربارەی بەخـشینی ئـەم خەلاتـە گـووتی :- هۆكـاری سـەرەكی هەڵبـژاردنی ئـەو دوو كەسە بۆ خەلاتی ئەمسالی ئازادی ڕۆژنامە گەری ئیتالیا , دژایەتی ئێمـە لە هەمبەر بڕیاری لە سێدارە دانی ئەو دوو ڕۆژنامە نووسە و پشتگیری ئێمە بۆ كوردەكـانی ڕۆژهـەلاتی كوردسـتانە كـە بـەم دواییانـە سـەركووت دەكـرێن . و ئەوان دەیانەوێ هاوكاری خۆیان لە گەڵ كوردەكان دووبارە بكەنەوە .

Id=2584 httb= www. Peymner. Com .



۲۰۰۷/۱۰/۱۲ سەرۆكی ڕووسیای یەكگرتوو – – فلادمێـر پـوتین -- لـە میانـەی كۆبوونـەوەی لـە گـەڵ هەریـەك لـە وەزیــــری دەرەوەی ئەمــــەریكا گۆنــــدالیزارایس و وەزیــــری بەرگری ئەمەریكا ڕۆبەرت كێتس ، لــە ووتەكەیـدا هەڕەشــەی لــە واشنتۆن كرد ، كە ووڵاتەكەی لە پەیماننامەی ڕێگرتن لە موشەكی مام ناوەندی لە ئەورووپا هەڵبوە شێنێتەوە .

سەرۆكی ڕووسیا لە بارەگای خۆی لـە -- نۆڤۆ ئوگـاریڤۆ – لـە كـەنارەكانی شـاری مۆسـكۆی پایتـەختی ڕووسـیا گـووتی :- بـۆ ئێمـە گرانـە لـە چـوار چێوەی ئـەو ڕێكەوتنـە بمێنینـەوە . هـەروا ئامـاژەیـدا ، كـە بـە بۆچـوونی

ڕووسیا پێویستە ئەو ڕێکەوتنەی نێوان ئەمەریکاو ڕووسیا گۆرانکاری تیا بکرێت و مۆرکێکی جیهانی وەربگرێت .

جێگەی ئامارژە پێکردنە کە ئەو ڕێکەوتنامەیە لە مانگی/ ١٢/١٩٨٨ لە نێوان ئەمەریکاو ڕووسیا مۆرکراوە و لە سالی ١٩٨٨ کەوتە بواری جێ بە جێکردنەوە ، کە ماوەکەی دیاری نەکراوە تیایدا لە ناوەرۆکی ڕێکەوتنامەکە ، کە ئەو موشەکەی بالیستیانەی ئەمەریکا و سۆڤیەت قەدەخەکراون ، کە دوایی لە نێوان ٥٠٠ تا ٥٥٠٠ کیلۆمەتر دبڕن لە جیهاندا .



١٢/١٠/٢٠٠٧ لیژنەی دابەشکردنی خەلاتەکانی نۆبڵ ڕایگەیاند ، کە خەلاتی نۆبڵ بۆ ئاشتوایی بۆ سالی ٢٠٠٧ بەخشرایە جێگری پێشووی سەرۆکی ئەمەریکا -- ئاڵ گۆر -- و دەستەی گۆرینکاریە کەش و هەواییەکانی سەر بە نەتەوە یە گرتووەکان . هەروا ئەکادیمیای دابەشکردنی خەلاتەکانی نۆبڵ لە ڕاگەیاندنەکەیدا ، ئامارژەی بەوەدا کە هەوڵەکانیان لە بارەی چاودێریکردنی بۆ گۆرینکاریە کەش و هەوییەکان دەگەرێتەوە .

ئاڵ گۆری جێگری سەرۆکی ئەمەریکای پێشوو -- بیل کلینتۆن -- و کاندید کراوی سالی ٢٠٠٠ بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی ئەمەریکا .

ئەو خۆی بە داکۆکی کەری کێشە کەش و هەواییەکان دەخاتە ڕوو . هەروا دەستەی گۆرینکاریە کەش و هەواییەکان ، کە سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانە زیاتر لە ٢٠٠٠ زانا و شارەزای هەیە , کە زیاتر کار لە سەر کاریگەری گەرما دەکەن لە جیهاندا .



۲۰۰۷/۱۰/۱۲ لـە چوار چێوەی کـار و چـالاکیەکانی کـەمبینی بــــە جیهـــــانکردنی شـــالاوەکانی ئـــەنفال و کیمیابـــارانی هەلەبجـــەو ناوچـــــەکانی دیکـــــەی هـــــەرێمی باشـــــووری کوردســـتان ... کـــە لـــە پێنـــاو بـــە جینـــۆ ســـاید ناسـاندنی ئـەو تاوانانـە دامـەزراوە ... ئەمـەش لـە سـەر پێشنیاری پـارتی ژینگـەی سـەوزی نەرویـژی milgoparnet de gromne لـە کۆنفراسـی سالانەی پارتە سەوزەکانی ئەوروپا ، کە لە شاری ڤێنیای پایتـەختی نەمسا گرێـدرا ، کـە سـەرجەم پارتـە سـەوزەکانی ئـەوروپا ، کـە ژمارەیـان ۳۳ پارتـە شالاوی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە یان وەك جینۆ ساید ناساند

کە فیدراسیۆنی پارتە سـەوزەکانی ئـەوروپا -- EGP-- بۆ یەکـەم جار لـە ساڵی ۱۹۹۳ لە میلاند دامەزراوە و سەرجەم پارتە سەوزەکان لە نەرویـژ و ، ماڵتـا و ، ئیرلـەنـدا و بـۆ جۆرجیا دەگرێتـەوە ... سـەرەرای ئـەوەش داوایـان کـرد ، کـە سـەرجەم ئـەو کارانـەی کـە چـەکی ژەهراویان بـە رژێمـی روخـاوی بـەعس لـە ئێـراق فرۆشـتووە دادگـایی بکـرێن و سـزا بـدرێن ... لـەو کاتـەش داوایان لە وولاتانی یەکیـەتی ئـەوروپا کـرد کـە سـەردانی هـەرێمی باشـووری کوردستان بکەن .

۲۰۰۷/۱۰/۱۲سەرەك كۆماری ئەرمینیا -- رۆبرت كۆجاریان -- پێشوازی لەو دەنگدانەی لێژنەكەی دەرەوەی سەر بە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریكا كرد , كە تیایدا كوشتنی نزیكەی ۱,٥۰۰ ملیۆن و نیوێك ئەرمەنی لە ۱۹۱٥/٤/۲٤ بە دەستی عوسمانیەكان بە كاری كۆمەڵ كوژی – جینۆساید-- وەسفكرد بوو.

هەروا سەرۆكی ئەرمینیا ئاماژەیدا ، كە توركیا ناتوانێت ڕێگە لە وولاتانی دیكە بگرێت كە دان بە كۆمەڵكوژی ئەرمەنەكان نەنێن .

هەروا گووتی :- ئەو وولاتانەی كە دان بە كۆمەڵكوژی ئەرمەن لە ئاستی حكوومەتەكانیان ڕەتدەكەنەوە ، لەوە دەترستن كە پەیوەندیەكانیان لە گەڵ توركیا ئالۆزی تێ كەوێت .

هەروا سەرۆكی ئەرمینیا ڕۆبرت كۆجاریان هیوای خواست ، كە دەنگدانی لێژنەیەكی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریكا برۆسی دان پێنانێكی بە تەواوی بێت لە لایەن ئەمەریكا ، سەبارەت بە وەی ئەو كارەی عوسمانیەكان كۆمەڵكوژی بووە لە ڕۆژهەلاتی باشووری ئێستای توركیا ، واتە باكووری كوردستان , لەو كارە كۆمەڵكوژیە زیاتر لە ۳۰۰۰۰ سی هەزار كوردیش بە هەمان شێووە و شێواز بەر ئەو كۆمەڵكوژیە كەوتوون لە هەرێمەكەدا.

۲۰۰۷/۱۰/۱۳ چەند بەرپرسێكی ئەمەریكا ڕایانگەیاند ، كە ئەگەر هاتوو توركیا لە سەر هەڕەشەكانی بەردەوام بێت و جێبە جێیان بكات ، ئەوا ئەمەریكا دەروازەیەكی یاخوود ڕێگایەكی دیكە دیكە دەدۆزێتەوە جگە لە

تورکیا بۆ ئەوەی پالیشتیەکان بۆ هێزەکانی سووپای لە ئێراق بنێرێت .
ئـەم ڕاگەیاندنـەش لـەو کاتـەدا هـات ، کـە لیژنـەی کاروبـاری دەرەوەی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی ئەمـەریکا دەنگی لـە سـەر پـرۆژە یاسـای قڕ کردنـی ئەرمـەکانی بڕیـاری لـە سـەر دا , هـەروا لـە سـەر هەڕەشـەکانی تورکیـا و بـەردەوام بـوون لـە بـەرەو ئالۆزکردنی بـاری ناوچـەکە بـە گشتی و ئێـراق بـە تایبەتی , کە ئەم ڕاگەیاندنەش لە پێناو دۆزینەوەی جێگەی لە بارترە ، کـە گوایە لە وولاتی ئوردنە و ئەویش چەند مانگێك دەخایەنێت لەم کارەدا.

٢٠٠٧/١٠/١٢بـە هـۆی بـەرەو تێـك چـوونی بـاری ئـارامی لـە نـاو خـۆ و دەرەوەی تورکیـا و پەیوەنـدی لـە گـەڵ ئەمـەریکا و بـارودۆخی چـەکدارانی پەکەکـە و هەڕەشـەی تورکیا بە هێرشکردنە سەر خاکی هەرێمی باشووری کوردستان .

ئەمڕۆ دوو بەر پرسی ئەمەریکی بەرە و تورکیا بە ڕێکەوتن ، کە ئەندام بـوون لـە شـاندی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمـەریکا بـە یـاوەری وەزیـری دەرەوەی ئەمەریکا کۆندا لیزا رایس بۆ مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای یەکگرتوو .
ئەم دوو بەر پرسەش , یەکیان بالوێزی ئەمەریکا بوو لە ئەنکەرە -- ئیریل ئـلـدرمان -- و یاریـدەدەری وەزیـری وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریکا -- ودان فرید -- بوون . لە پێناو گفتووگۆ کردن لە گەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا و بـەر پرسـانی دیکـەی تورکیـا ، لـە پێنـاو هێورکردنـەوەی بارودۆخەکـە چ لـە لایەن هەڕەشەکانی تورکیا بۆ سەر خاکی هەرێمی باشووری کوردستان ، بـە نـاوی ڕاوەدوونـانی چـەکدارانی پەکەکـە و چ بـە هـۆی تەنگـەژەی پەیوەنـدی نێـوان تورکیـا و ئەمـەریکا ، بـە هـۆی بڕیـاری کۆنگریـسی ئەمـەریکا بـە بـە جینۆساید ناساندنی کۆمەڵکوژیەکەی ئەرمەنەکان لـە سـاڵی ١٩١٥-- ١٩١٧ لە لایەن دەسەلاتدارانی عوسمانیەکان لەوکاتدا.
جێگەی باسکردنە کە ئەمەریکا هۆشداری دابووە تورکیا لـە بـارەی بۆردمـان

كردنی ناوچە جیاجیاكانی هەرێمی باشووری كوردستان . هەروا لە لایەكی دیكە توركیا لە دوای بڕیاری كۆنگرێس ، بالویزی خۆی لە واشنتۆن بانگ هێشت كردووە . هەروا لە لایەكی دیكەش توركیا مەڵبەندێكی گرنگە بۆ كارەی سەربازیەكانی ئەمەریكا ,سەردانی ئەم دوو بەرپرسەش ، لە پێناو چارەسەر كردنی ئەم كێشانە بوون لە ناوچەكەدا سەرەڕای بەردەوام بوونی توركیا لە هەڵوێستەكانی لە بەرامبەر ئەو كێشانەدا.



٢٠٠٧/١٠/١٤كۆچی دوایی تیرۆرست و كودەتاچیە بەناوبانگەی فەرەنسا -- بۆب دینار -- لە تەمەنی ٧٨ساڵیدا بە هۆی نەخۆشیە كوشندەكەی لە فەرەنسادا.
جێگەی باسكردنە كە بۆب دینار بە ناوبانگ بووە لە ڕەوشتە خراپەكانی بە سەركردایەتی كردنی كودەتاكان ، بە تایبەتی چوار كودەتای لە دوورگەی قەمەر ئەنجامدراوە ، دوا كودەتای لە ساڵی ١٩٩٥ دابووە . هەر بەم هۆكارەوە دادگای فەرەنسا تاوانباری كردیە بەشداری كردنی لەو كودەتایە لە وولاتی -- بەنین -- لە ساڵی ١٩٧٧ و دوورگەی قەمەر . هەروا دادگایكردنی لە ساڵی ١٩٩٥ بە بەشدار نەبوونی بە هۆی نەخۆشی . هەروا بەشداری لە كورەتاكانی ئەنگۆلا و نیجیریا و كۆماری كۆنگوی دیموكراتی كردووە . ئەم كودەتایانەش بە پاڵپشتی بەرپرسانی فەرەنسا بووە و بۆب دینار ڕۆڵی باڵای هەبووە و ناسراوە بە -- سەگی جەنگ-- لەم كیشووەرەدا .

٢٠٠٧/١٠/١٤گۆڤاری – ئیكۆنۆمیستی – ی بەریتانی لە بابەتێكدا بلاوی كردەوە ، كە بە ناونیشانی توركیا دۆستە دێرینەكانی خۆی لە دەست دەدا ، كە لەو ساڵانەی دواییدا توركیا پەیوەندیەكانی خۆی لە گەڵ دەوورووبەر ، بە تایبەت سووریا و ئێراق و فەلەستین توونـد و تۆڵ كردووە و دۆستایەتی ئەمەریكای لە بیركردووە ... لە هەمان كات روونیشی كردەوە :– ڕێگە دان

بــه گواســتنەوەی غــاز و نــەوتی ئێــران لــه خــاکی تورکیــاوه بــۆ ئــەوروپا بانگهێــشت کردنــی بزوتنــەوەی حــەماس بــۆ تورکیــا ... وای کــردووه کــه پەیوەندیەکانی نێوان ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا و واشنتۆنی پایتەختی ئەمــەریکا گــرژی و ئاڵۆزی تێکــەوێت و پەیوەندیــەکانیش لــه گــەڵ ئیــسرائیل بەرەو سارد بوونەوه هەنگاو بنێ .

هــەروا بــڵاوی کردۆتــەوه ئــەو گۆڕانــەی هەڵوێــستی تورکیا وای کــردووه کــه کۆنگرێــسی ئەمــەریکا کۆمــەڵکوژی ئەرمەنــەکان لــه ســاڵی ١٩١٥ لــه لایــەن دەووڵەتی عوسمانی وەك جینۆ ساید بناسێنێت و ، بۆیه چیدیکه ئەمەریکا و تورکیا متمانــەیان بە دۆستایەتی نێوانیان نــەماوه ، لــه بــواره گرنگەکانی سەربازی و ئابووری و بازرگانی و چەندین بواری دیکه له نێوانیاندا .





٢٠٠٧/١٠/١٧ له ئاکامی هەڕەشەکانی ڕژێمــی تورکیــا ، بــۆ ئــەوەی لەشکرکێــشی بکاتــه ســەر هــەرێمی باشــووری کوردســتان , بــەناوی ئــەوەی کــه ڕاوه دوو چــەکدارانی پــارتی کرێکــارانی کوردســتان PKK لــه بــاکوری کورردســتان دەنــێ , لــه ســەر ســنووری نێــوان هــەرێمی کوردستان و نورکیا به مەبەستی دەست تێوەردان له کاری ناوخۆی هــەرێمی کوردستان .

هەر بەم هۆکاره جەماوەری کوردستان له شارەکانی هەرێمی کوردستان لــه پارێزگاکــانی هــەولێر ودهــۆك وســلێمانی و شارۆچــکەکان خۆپیــشاندان ئەنجامدرا ، که له ڕۆژی ١٠/١٧ له پارێزگای دهۆك و له ١٠/١٨ له پارێزگای هەولێر و له ڕۆژی ١٠/١٩ له پارێزگای سلێمانی .

لــه گــەڵ ئەوەشــدا ئەمــەریکا و یەکیــەتی ئــەوروپا و چــەندین وولاّتــی دیکــه ، دژی بڕیــاری پەرلــەمانی تورکیــا و حکوومــەتی تورکیــا وەســتان لــه بەرامبــەر

لێدوانەکانی و ئالۆزکردنی باری ئێراق لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا ، کە لەو خۆپێشاندانە ٣٠ ڕێکخراو سەندیکا و یەکیەتی و ناوەندەکانی رۆشنبیری و مەدەنی و پیشەیی بەیاننامەیەك دەرکرا و پێشکەش بە نوێنەری حکوومەتی هەرێم و نوێنەری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و پەرلەمان و حکوومەتی تورکیا و یەکیەتی ئەوروپا کرا .

هەر لەو کاتەدا حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەڵوێستی فەرمی خۆی لە بەیاننامەیەك ڕاگەیاند ، لە بارەی کێشە دروست کراوەکان لە لایەن تورکیا و لایەنگرانی و بەرگری کردن لە مافەکانی گەلی کورد لە کوردستان .

٢٠٠٧/١٠/١٧ پەرلەمانی تورکیا بڕیاری لەشکرکێشی کردنە سەر هەرێمی باشووری کوردستانی پەسند کرد ... بۆ ڕاودونانی هێزە چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK ... کە ٥٠٧ پەرلەمانتار دەنگیان بۆ لەشکرکێشەکەدا و لە بەرامبەریشدا ١٩ ئەندام دەنگیان بۆ بڕیارەکە نەدا ... بە پێی ئەم بڕیارەی پەرلەمانی تورکیا حکوومەتی ئەنکەرە مۆڵەتی یەك ساڵی پێدراوە ، بۆ لەشکرکێشی کردنە سەر هەرێمی کوردستان ... بۆ نەهێشتنی بوونی پەکەکە لە ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی باشووری کوردستان ... بزن گەر ئەجەلی بێ نانی شوان دەخوات...!...؟.

لە هەمان کات وتە بێژی فەرمی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا -- باسکال ئەندریان -- لەڕاگەیاندنێکیدا گووتی :- گرژی و ئالۆزی نێوان تورکیا و ئێراق لە بارەی چالاکی چەکدارانی پەکەکە بووتە هۆی دروستبوونی مەترسی لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ... هەروا گووتی:-

ئەو بڕیارەی پەرلەمانی تورکیا بۆ ڕاودونانی چەکدارانی پەکەکە لە هەرێمی باشووری کووردستان و ئێراق ، جێگەی مەترسیە و ئەگەری ئەوەش هەیە ، کە کارەساتی زیاتر ڕووبەڕووی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بکاتەوە .

باسکال گووتی:- حکوومەتی فەرەنسا هیوادارە ئەو گرژی و ئالۆزیەکانی نێوان تورکیا و ئێراق لە کۆبوونەوەی داهاتووی وولاتانی دراوسێی ئێراق چارەسەر بکرێت و پێش بە هێرشکردنی سووپای تورکیا بگیرێت .

ئەمە و چەندین لایەنی دیکەی ڕامیاری و وولاتانی دیکەی جیهان و ، بە تایبەتی ئەمەریکا و بەریتانیا ویەکیەتی ئەوروپاش ، بە هەمان شێووە

هەڵوێستی حکوومەتەکانیان ئاشکرا کرد بە شێوەیەکی فەرمی ... بەڵام هەڵوێستە نهێنیەکان هەر خۆیان ...!...؟. لە ناوچە و هەرێم و جیهان ....لە بەر ئەوەی خواستیاری جیٚ بە جێنەکردنی چارەی کێشەی کوردن لە ئاسیا ، کە کێشەیەکی تەشەنەدارە لە کیشووەرەکە ، لە نێوان چوار وولاتی دروستکراوی داگیرکەر لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان لە لایەن بەریتانیا وئەمەریکا و فەرەنسا و ڕووسیادا .



٢٠٠٧/١٠/١٧ کۆماری لیبیا ڕەزامەندی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی بە دەست هێنا بە وەرگرتنی کورسیەك لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێوودەووڵەتی نەتەوە یەکگرتووکان ، ئەویش لە دوای ساڵێك بە سڕینەوەی ناوی کۆماری لیبیا لە لیستی ئەمەریکا بەرامبەر ئەو وولاتانەی پشتگیری لە ڕێکخراوە تیرۆرستەکان دەکەن .

هەر لەم کۆبوونەوەیەدا کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووکان کۆماری لیبیای بە ئەندامی نا هەمیشەیی هەڵبژارد بۆ ماوەی دوو ساڵ ، کە لە مانگی/ ٢٠٠٨/١ دەست پێدەکات , بە کۆی دەنگی ١٧٨ دەنگ لە کۆی گشتی ١٩٢ لە دەنگەکانی دەووڵەتەکان , ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کۆماری لیبیا بگەڕێتەوە گۆڕپانی ڕامیاری نێوو دەووڵەتی لە جیهاندا .

ئەو وولاتانەی کە ئەندامی هەمیشەیی نین و لە ناو ئەو ١٥ وولاتەن لە گەڵ پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووکان ئەوانیش :- بەلژیکا , ئەندۆنوسیا , ڤێتنام , ئیتالیا , باشووری ئەفەریکیا , پەنەما , بۆرکینا ڤاسۆ , لیبیا , کرواتیا , کۆستاریکا .

٢٠٠٧/١٠/١٧ کردنەوەی خووڵی ٥١ ی ڤیستیڤاڵی لەندەنی سینەمایی و بەردەوام بوونی تاکو ٢٠٠٧/١١/١ لەم وولاتەدا .



جێگـەی باسـکردنە کە ئەم ڤیستیڤاڵە لە سـاڵی ١٩٥٦ دامـەزراوە و سـاڵانە ئـەم ڤیـستیڤاڵە ئـەنجام دەدرێـت ، بەشداری هەموو وولاّتانی جیهان لە بواری سینەمادا بە هەڵواسینی فلیمە بەرهەم هێنراوەکانیان لە کێبرکێەکی بە هێزدا و بە سەرکەوتنی هەرفلیمێك خەلاّتی خۆی وەردەگریّ بە پێی دەرچوونی فلیمەکان .

ئەم خەلاّتانەش لە ساڵی ١٩٥٨ وە بە سەرکەوتنی باشترین فلیم دەبەخشریّ .

ئەم فلیمانەش لە ١٦ هۆلّ پەخش دەکرێن لە ناوەڕاستی شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا و لە مەڵبەندی سینەمای بەریتانیا لە سەر ڕۆخی باشووری کەناری زێی تایمز .

لەو ڤیستڤاڵەدا کە ٤٣ وولاّت بەشداری تێدا دەکات بە کورتە فیلم , لەوانە ٧ فیلم بۆ یەکەمجارە بەخش دەکرێت , هەروا ٢٩ فیلم بۆ یەکەم جارە لە ئەوروپا و ١٢٨ فیلم بۆ یەکەم جارە لە سەر شاشەکانی بەریتانیا هەڵدەواسرێن , واتە پەخش دەکرێن .

تێبینی :- بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە سەر bbc arabic لە ڕۆژی ٢٠٠٧/١٠/١٣



٢٠٠٧/١٠/١٧ لە ووتەکانی سەرۆکی ڕووسیای فیدراڵ -- فلادمێر پۆتین -- کە لە گەڵ سەرەك کۆماری ئێران -- مەحمودی ئەحمەدی نەژاد -- لە تارانی پایتەختی ئێران ئەنجامیدا ، بە دووپاتکردنەوەی پشتگیری ڕووسیا بۆ ئێران و ماوە نەدان بە پەلامارنەدانی ئێران ، بە هێزی

سووپا له لایەن ئەمەریکا و وولاّتانی هاوپەیمانی له جیهاندا.
جێگـــەی باســـکردنه کـــه ســـەرۆکی ڕووســـیا لـــه دوای لوتکـــەی نێـــوان سەرکردەکانی وولاّتانی دەریای قەزوین – ڕووسیا و ، ئێران و ، ئازربایجان و ، کازاخستان و ، تورکمانستان له کێشووەرەکەدا .
بەلێنیانـدا بـه مـاوه نـەدان بـه پـەلاماردانی ئێـران لـه سـەر ئاسمـان و خـاکی وولاّتەکانیان که ببێته هۆکاری ئەم پەلاماردانه بۆ سەر ئێران .
هـەر دوای کۆتـایی هـاتنی ئـەم لوتکەیـه سـەرۆکی ڕووسـیا پـۆتین سـەردانی ئێرانی کردوو چاوی کەوت به سەرۆکی ئێران و ڕابەری ئیسلامی ئێران – خامەنانی -- له تارانی پایتەختی ئێران .
ئـەم ووتانـەی پـۆتین لـه گـەلّ هەلّوێستەکانی ئێـران خۆیـان جـووتکرد , کـه لەوکاتـەی کێـشەی چـەکی ئـەتومی و پیتانـدنی یـۆرانیم ، بۆتـه کێـشەیەکی گـــەورەی نێـــوان ئێـــران و ئەمـــەریکا و یەکیـــەتی ئـــەوڕوپا ، لـــه ڕێگـــەی ئەمینداریەتی گشتی ئاژانسی وەزی ئەتۆمی سەر به نەتەوه یەکگرتووکان .
هەروا له لایەکی دیکه ئێران هاوکاری و یارمەتی له ڕووسیا وەردەگرێت بۆ تەواو کردنی بنکه ئەتۆمیه ئاشتیەکان له بنکەی بووشەهر له ئێراندا .

٢٠٠٧/١٠/١٨ وولاّتـــی چـــینی مللـــی بالوێزی خۆی لـه ئەمـەریکا بانگهێـــشت کـــردو ئـــەم بانگهێـشت کردنـەش وەك نارەزاییەکه ، که بەرامبەر بەو ئاهەنگه ڕێزلێنانەی که ئەمـەریکا لـه ١٠/١٧ بـۆ – دالای لامـا -- لـه شـاری



واشنتۆن سازیکرد و تیایدا مەدالیای زێرینی پێشکەش به دالاس لاما کرد ، کـه ئـەوەش گـەورەترین مـەدالیای ڕێزلێنـانی مەدەنیـه ، کـه کۆنگرێـسی ئەمەریکا له میانەی ئاهەنگی فەرمی دەی بەخشێت به جۆره کەسایەتیانه له وولاّتەکەدا .
هـەر لـەو کاتـەدا ووتـه بێـژی فـەرمی حکوومـەتی چین بانگهێشتی بـالوێزی

ئەمەریکا کلارك راندت و ، وەزیری دەرەوەی چینی کردو بە توندی رەخنەو نارەزایی چینی لە بەرامبەر ئەو کارە ئاراستەی حکوومەتی ئەمەریکا کرد ، هەروا وتە بێژی چین ئەو کارەی ئەمەریکای بە دەست خستنە ناوەوەی ئاشکراو روون لە کاروباری چین لە قەڵەم دا و گووتی:-
ئەو کارەی ئەمەریکا هەست و سۆزی گەلی چین بریندار دەکات و ئەگەری خراپی لێدەکەوێتەوە بۆ سەر پەیوەندی دوو وولاتی گەورەی وەك ئەمەریکاو چین .

جێگەی باسکردنە کە دالای لاما دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٩ بزووتنەوەی یاخیبووەکانی لە ناوچەی - تبت - ی وولاتی چین دامەزراند و ، دوای ئەوە بەرەو وولاتی هندستان رایکرد و ئێستا لە شاری - داراملا - لە باکووری هندستان نیشتەجێیە لە ناوچەکەدا .



٢٠٠٧/١٠/١٨ لە دوای ٨ هەشت ساڵ لە پەنا بەری سەرەك وەزیرانی پێشووی پاکستان و سەرۆکی پارتی گەلی پاکستان خاتوو - بەنازیر بۆتۆ - گەرایەوە پاکستان ، بە هاتنە خوارەوەی لە فرۆکەخانەی نێوودەوڵەتی لە شاری - کەراتشی - کە فرمێسکی خۆشی لە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوەو لەو کاتەدا زیاتر لە ٢٠٠ دووسەد هەزار کەس لە لایەنگرانی پێشوازیان لێدەکرد ، لە رێگەی فرۆکەخانە بە پێشوازیکردنی بەنازیر بۆتۆ لە ئەندامانی پارتەکەو لایەنگرانی و دۆستانی لە پاکستان .

جێگەی باسکردنە کە لەو گەرانەوەیدا زیاتر لە ٢٠ بیست هەزار سەرباز بۆ پاراستنی ئارامی و ئاسایشی شارەکەو رێگەکەی کە لە فرۆکەخانە تا ماڵەکەی پاسەوانیان لێدەکرد ، سەرەرای ئەنجامدانی دوو تەقینەوە ، کە بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٩٠ کەس و زامدار بوونی بە دەیا کەسی دیکە

لە شارەكەدا .

هەر چەندە بەنازیر بۆتۆ ژیانی لە هەندەران بۆ ماوەی ٨ هەشت ساڵ بردە سەر ، بەلاّم كەسایەتی و خۆشەویستی لە دەست نەدابوو ، بەلكو زیاتر جێگەی متمانەو بروا پێكردن بوو لە لایەن گەلانی پاكستان ، تەنیا ئیسلامیەكان نەبێت .

هەروا گەرانەوەی بۆتۆ لە سەر داوای سەرەك كۆماری پاكستان پەرویز موشەرەف بوو ، بۆ ئەوەی بتوانێ لە هەڵبژاردنەكان بەشداری بكات و دادگای ووڵاتەكە رێگەی پێبدات بە پێی دەستووری پاكستان .



٢٠٠٧/١٠/١٨ ئەمینداری گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان – بان كی مۆن – حكوومەتی توركیای لە هەر هەوڵێكی لەشكركێشیەك بۆ سەر خاكی هەرێمی باشووری كوردستان ئاگادار كردەوە و هۆشداریدا ، كە بارو دۆخی ناوچەكە بەرگەی تەنگەژەی زیاتر ناگرێت ... جێگەی باسكردنە كە هۆشداریەكەی سكرتێری گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان دوای پەسند كردنی بریاری لەشكركێشی توركیا بۆ سەر خاكی هەرێمی باشووری كوردستان دێ ، كە ئێوارەی ١٠/١٧ پەرلەمانی توركیا بە زۆرینەی دەنگ بریارەكەی پەسند كرد .

هەروا زۆر لە ووڵاتان ، حكوومەت و پەرلەمانی توركیایان لە مەر ئەم بریارە ئاگادارە كردۆتەوە و ئەو بەیاننامەشیان راگەیاندووە ، كە بەر لەوەی هانا وەبەر رێگەی سەربازی بەرێت پێویستە رێگەی دیبلۆماسی و دیالۆگ بگرنە بەر بۆ چارە سەر كردنی كێشەكان .

دوای ئەوە سەرەك وەزیرانی توركیا – رەجەب تەیب ئۆردگان – لە كۆنگریەكی رۆژنامەوانیدا لە ١٠/١٩ گووتی :– ئەو شتەی كە هەردوو لامان رازی دەكات ئەوەیە كە ئێراق دژایەتی پەكەكە بكات ، و چالاّكییەكانیان لە

ناو خاکی وولاتەکەی نەهێلێت و سەرکردەکانی پەکەکەش دەستگیر بکات و رادەستی تورکیا بکاتەوە ... هەروا سەرەك وەزیرانی تورکیا لە کاتی وتەکانی لە کۆنگرە رۆژنامەوانیەکەیدا ، هەڵوێستی وەزیری دەرەوەی ئێراق – هۆشیا زێباری – بەرز نرخاند ، کە داوای لە ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان – پەکەکە – کردووە بۆ ئەوەی ئێراق جیّ بهێڵن . ئەم لێدوانەی وشیار زێباری لە رۆژی ١٠/١٨ بوو ، لە پێناو پاڵپشتی کردنی رژێمی تورکیا دژ بە کورد و خاکی کوردستان .



٢٠٠٧/١٠/١٨ لە هەوڵەکانی تورکیا بۆ بەهێز کردنی جیّ پێگە و پەیدا کردنی لایەنگیری حکوومەتەکەی لە بارەی هێرشەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان -- پەکەکە -- و هێرشکردنە سەر هەرێمی باشووری کوردستان ، و بۆ ئەوەی هێرشی سەربازی بکاتە سەر بنکەو بارەگاکانی ئەم پارتە ، وەزیری دەرەوەی تورکیا -- عەلی باباجان – سەردانی وولاتی میسری کردو لە گەڵ وەزیری دەرەوەی میسر و سەرۆکی میسر محەمەد حوسنی موبارەك ، کۆبووەو هەڵوێستی تورکیای پیّ راگەیاند لە بارەی پلانەکانیان دژی – پەکەکە -- لە ناو خاکی باکووری ئێراق – واتە هەرێمی باشووری کووردستان .
بەلام هیچ لێدوانێك لە لایەن دەسەلاتی میسر دەر نەکرا بە هەڵوێستی میسر لەم پلانەی تورکیا بۆ چارەسەر کردنی کێشەی – پەکەکە – لە رێگەی کارە سەربازیەکان لە هەرێمی باشووری کوردستان .
هەر لەو کاتەدا وەزیری بەرگری تورکیا – وەژدی گوتول – لە گەڵ وەزیری بەرگری ئەمەریکا رۆبەرت گێتس کۆبوونەوە ، لە پێناو گفتووگۆ کردن لە سەر ئەو کێشەیە لە نێوان هەردوو وولاتی هاوپەیمان و ئەندام لە پەیمانی ناتۆدا ... ئەویش لە پەراوێزی کۆبوونەوەی لوتکەی مونتەدای نێوودەووڵەتی کە لە شاری کیڤی پایتەختی ئۆکرانیا دەستی پێکردبوو لەو

وولاتەدا .

٢٠٠٧/١٠/١٨ نووســەرو وەرگێــڕی کــورد ، لــە باشــووری کوردســتان و لــە شــاری هــەولێری پایتــەخت . مامۆســتا – ســلاح ســەعدوڵلا – ماڵئــاوایی لــە نووســـەرو رۆشـــنبیران و گـــەلی کوردستان کرد لە هەرێمەکەدا .



جێگـــەی ئاماژەپێکردنـــە کـــە مامۆستا سلاح لـە ساڵی ١٩٣٠ لە شــاری زاخــۆ چــاوی بــە جیهــان هــەڵهێناوە . ئەســتێرەیەکی گەشــی بــواری نووســین و وەرگێــران بــوو ... لــە کــاتی خوێنــدنی لــە بــەریتانیا هاوبەشــی دامەزرانــدنی لیژنــەی کــوردی لــە ئەورووپا کردووەو بە سەرۆکی ئەو لیژنەیە هەڵبژێردراوە ... هــەروا لــە ساڵی ١٩٧٣ بە سەرۆکی لیژنەی رۆشنبیری لە شاری کەرکوك هەڵبژێردراوە .

هــەروا ئەنــدامی ئەنجوومــەنی نیشــتیمانی بــۆ ئاشــتی و هاوکــاری کــردن لــە ئێــراق بــووەو بەشــداری لــە کــۆنگرەی هێزەکــانی ئاشــتی لــە ســاڵی ١٩٧٣ لــە شاری مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیا کردووە .

هــەروا یەکــەم کتێبــی لــە ســاڵی ١٩٥٨ بــە چــاپگەیاندووە ، کــە بــە نــاوی کوردستان بووە . لە دواییدا وەریگێراوەتە سەر زمانی کوردی و عەرەبی و ئــەڵمانی و ڕووســی ... لــە ســاڵی ١٩٥٩ بڕوانامــەی دبلــۆم لــە بــەریتانیا بــە دەســت دێنــێ و دەگەڕێتــەوە وولاّت و لــە بــواری نــەوت کــار دەکــات لــە وولاّتەکەدا .



۲۰۰۷/۱۰/۱۹لە بابەتێکی بلاوکراوەی رۆژنامەی – کریستیان ساینس مۆنیتۆر – ی ئەمەریکی کە تیایدا هاتبوو :–

ئەو رامیاریەتەی کە کۆماری چینی مللی لە پلانێکیدا گرتیە بەر لە بارەی پرۆگرامی یەك منداڵ بۆ هەر خێزانێك ئەویش کوڕ بێت ، ئەمەش بۆتە هۆی کاردانەوەی خراپ بۆ دوا رۆژی داهاتووی چین . لە بەر ئەوەی لە هەر شەش منداڵ کە کورن ، یەکیان کچە و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە داهاتوودا گەنجانی چینی مللی ناتوانن ژیانی هاوسەرگیری پێکەوە بنێن .

جێگەی باسکردنە کە ئەم پرۆگرامە بە ناوی – نارنجۆکی جیوسیاسی دانراو – ناو زەند کرا . سەرەڕای ئەوەی بیروو بۆچوون بە زیاد کردنی بوونی کور زۆر لە وولاتانی جیهان ، بە هۆی زیاد بوونی رێژەی بوونی مێینە و دروستبوونی کێشەی ئابروو لێك ترازاندنی باری کۆمەلایەتی و بلاوبوونەوەی لەش فرۆشی و کاری سێکسی و بەرەلا بوونی رەگەزی مێ زیاتر لە پیاوان و بازرگانی پێوەکردنیان لە زۆربەی وولاتانی ئەمەریکا و هندستان و بەریتانیا و چینی مللی و وولاتانی عەرەب و ئیسلامی و وولاتانی دیکە دا

ئەویش بە هۆی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی و شەڕەکانی دیکەی وولاتان ، بە تایبەت لە هەردوو کێشووەری ئەفەریکیا و ئاسیا و زۆربوونی رەگەزی مێینە و کەمبوونەوەی رەگەزی نێرینە لە لە جیهاندا .

بەلام بوونی پرۆگرامێکی گونجاو بۆ ئەم بیروو بۆ چوونە و نەبوونی بە تاوان و رێکخستنی باری کەسیەتی بە راستکردنەوەی باری پەیوەندیەکانی کۆمەلایەتی لە هەموو جیهاندا ، لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە هاوکاری وولاتانی پەیوەندار بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لە هەموو جیهاندا .

٢٠٠٧/١٠/٢٠ ســـەرەك وەزیرانـــی تورکیـــا -- رەجـــەب تـــەیب ئۆردگـــان -- لـــە چاوپێکەوتنێکیدا لە گەڵ کەناڵی ٢٤ی تورکی رایگەیاند و گووتی :- هەر کێشەیەکی رامیاری هەبێت پێویستە لە ژێر سایەی پەرلەمان چارەسەر بکرێت و یەك لایی بکرێتەوە ، ئەگەر پەکەکەش بتوانێت بڕیارێکی لەو جۆرە بدات و تیایدا سەرکەوتوو بێت ، ئەوکاتە بەرەو پارتێکی ڕامیاری دەگۆڕێت و ناوچەکەش سەقامگیر دەبێت .

هەروا لە درێژەی ووتەکانیدا گووتی :- ئەو دیوارەی کە لە ڕابردوو بەربەست بوو لە بەر دەم پێك گەیشتن و تێکەڵبوونی دەوڵەت لە گەڵ میللەت ، ئێستا ئەو دیوارە رووخاوەو نەماوە ، لەو ناوچانەی کورد تیایدا نیشتەجێن دەیانگوت قوتابخانە و نەخۆشخانەی تیا نیە ، بەلام ئێستا دەڵێن هەیە . و لە شارەکانی هەکاری و دیاربەکر و شەمزینان و چەندین جێگەی دیکە رێگا و بانی بۆ چووە و بەرە و ئاوەدان کردنەوە هەنگاو دەنێ .

هەروا سەرەك وەزیرانی تورکیا ئۆردگان ئەوەشی ڕەتکردەوە و گووتی :- پێویستە پارتی کرێکارانی کوردستان -- پەکەکە -- چەك دابنێت و رامیاریەتی خۆی لە پەرلەمان بکات ، ئەگەر هاتوو ئەو کارە بکات دەبێتە پارتێکی شارستانی و شاخ جێ دەهێڵێ ، ئەگەر بڕیارێکی لەو جۆرەی دا من لەو بڕوایەم کە لە وولاتەکەی ئێمەدا ئەوانیش ئامادەییان لە نێوو خانەوادەکانی خۆیان و ناوچەکەش بە خێرایی دەگاتە سەقامگیری و هەروا گووتی :- گفتووگۆ و رێگە چارەی رامیاریە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان لە وولاتەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە پارتی کرێکانی کوردستان پەکەکە چەندین جار بریاری یەکلایەنەی ئاگر بەست و وەستانی شەڕی راگەیاندووە . لە دوای دەستگیر کردنی دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی کوردستان عەبدوللا ئۆجەلان . بەلام دەسەلاتدارانی مەدەنی و سەربازی رژێمی تورکیا ئەو ڕاگەیاندنەیان رەتکردۆتەوە و زیاتر هەرەشەیان لە کورد کردووە لە هەرێمەکەدا .

هەروا دوای ئەوە لە ١٠/٢٢ پارتی کرێکارانی کوردستان پەکەکە بڕیاری

ئاگربەستى راگەیاند ، لە دواى ووتەكانى سەرەك وەزیرانى توركیا ئۆردگان . بەلاَم لە ١٠/٢٣ لە كۆنگرەیەكى رۆژنامەوانى هاوبەشى نێوان وەزیرى دەرەوەى توركیا عەلى باباجان و وەزیرى دەرەوەى ئێراق زێبارى ، عەلى باباجان ئەو ئاگربەستە یەك لایەنەى پەكەكەى رەتكردەوە و گووتى:-

ئێمە رێكەوتن لە گەلٚ دەوولَەت و حكوومەت دەكەین نەك لە گەلٚ پارتێكى تیرۆرستى و ، لە هەمان كات زێباریش پشتگیرى خۆى بۆ عەلى باباجان دووپاتكردەوە و پەكەكەى بە پارتێكى تیرۆرست ناوزەند كرد .

واتە لێرەدا چارەسەر نەكردنى كێشەكە بە كێشەكە خۆى لە مافەرەواكانى گەلى كورد لە كوردستان دەگرىٚ و دوژمنانى كورد نایانەوىٚ مافەكانى بە ئاشتیانە چارەسەر بكرێت لە هەرێمەكە و ناوچەكەدا ... ؟ ...!.

٢٠٠٧/١٠/٢٠ سەركەوتنى هەلٚبژاردەى باشوورى ئەفەریكیا بە جامى جیهانى لە وەرزشى - رەجەبى - كە لە شارى پاریسى پایتەختى فەرەنسا بە رێووە چوو .

ئەمەش بۆ دووەم جارە هەلٚبژاردەى باشوورى ئەفەریكیا ئەم جامەى بەدەست دێنىٚ لە پالَەوانیەتیەكە لە مێژووى یاریەكانیدا بەرامبەر هەلٚبژاردەى ئینگلیزى .

لە هەمان كاتدا سەرەك وەزیرانى بەریتانیا گۆردن براون و سەرۆكى فەرەنسا نیكۆلا ساركۆزى ئامادەى یاریەكان بوون و لە دواى سەركەوتنى هەلٚبژاردەى باشوورى ئەفەریكیا سەرۆكى فەرەنسا جامى جیهانى پێشكەش بە سەرۆكى هەلٚبژاردەى باشوورى ئەفەریكیا ویلیم ویب ئیلیس كرد .

٢٠٠٧/١٠/٢٠ سەرك كۆماری ئێراق و سكرتێری گشتی یەكیەتی نیشتمانی كوردستان جەلال تاڵەبانی رەخنەی توندی لە لێدوانەكانی سەرەك كۆمار و رژێمی بەعس لە سووریا بەشار ئەسەد گرد ، لە پشتگیری كردنی بۆ توركیا بە هاتنە ناو خاكی باكووری ئێراق ، واتە هەرێمی باشووری كوردستان ، و لێدانی بنكە و بارەگاكانی پارتی كرێكارانی كوردستان پەكەكە لە هەرێمەكەدا.

هەروا جەلال تاڵەبانی لە لێدوانێكیدا بۆ رۆژنامەی شەرق ئەوسەتی سعوودی كە لە لەندەن دەردەچێ گووتی :- لێدوانەكانی سەرۆكی سووریا بەشار ئەسەد هەموو هێڵەكانی تێپەراندووە و دەبوایە وەك ووڵاتانی یەكیەتی ئەوروپا و ئەمەریكا لێدوانەكانی رایگەیاندبایە نەك بەم شێوەیە .

لە بەر ئەوەی نە ئێراق و نە توركیاش بە هێزی سەربازی ناتوانن پارتی كرێكارانی كوردستان پەكەكە دەربكەن و شەڕیان لە گەڵدا بكەن ، بە هۆی سەختی ناوچەكە و بوونی شاخی بەرز و نالەباری باری كەش و هەوا لەم جێگە و شوێنەی كە چەكدارانی پەكەكەی تێدا بەرگری لە خۆیان دەكەن .

جێگەی باسكردنە كە پارتی كرێكارانی كوردستان داوای مافی ئۆتۆنۆمی دەكەن لە توركیا و لە چوارچێوەی سنووری توركیا ، وەك چۆن لە هەرێمی باشووری كوردستان هاتۆتە كایەوە و لە گەڵ پێدانی مافی نەتەوەكانی دیكەی توركیا و بەرەو ووڵاتێكی نوێ ، كە مافی مرۆڤ و نەتەوەكانی تیا مسۆگەر بێت لە زمان و مێژوو كەلتوور و داب و نەریت و بوارەكانی دیكەدا ٠



٢٠٠٧/١٠/٢١ لە ووتەكەیدا پاپای ڤاتیكان – بندیكتی شانزەهەم -- داوای لە سەركردە ئاینەكان لە جیهانكرد بە ناونەهێنانی خوا لە كاتی ئەنجامدانی تاوان و

کـاری نامرۆڤانـه و شـێواندنی بـاری پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی و پەیوەنـدی ئاینەکان لە جیهاندا ٠

جێگەی باسکردنە کە لوتکەی ئاشتی کە لە شـاری – نـاپۆلی – لە ئیتالیا بە رێوەچوو ، بە بە شداربوونی سەرکردە و رابەرانی ئایینەکانی مەسیحی و ئیـسلام و جوولەکـە و بـووزی و هندۆسـی و زەردەشـتی ، بـە سەرپەرشـتی کۆمەڵگای قەدیس ئیگیدیۆ ، کە رێکخراوەیەکی کاسـۆلیکی مەسـیحیەکان و جوولەکە و ئیسلام و بووزیەکان و زەردەشتیەکان بەشـداریان تێداکردووە ، ئـەویش بـۆ مـاوەی سـێ رۆژ بـەردەوام بـوو ، لـە پێنـاو جیهـانێکی بێـێ توندوتیـژی و ژیـانی ئاشـتیانەو چارەسـەر کردنـی کێـشەکان لـە رێگـەی کۆنگرە و دایلۆگ و سەرکردە ئاایینەکان ٠




٢١/١٠/٢٠٠٧لـە دوای هەڵبژاردنـەکانی پەرلـەمان لـە پۆڵەنـدا و سـەرکەوتنی پـارتی – منبـەری مـەدەنی – بـە سـەرپارتی یاسـاو دادی پارێزگـار بـە سـەرۆکایەتی باروسـلاف ککنـسکی لـە وولاتەکەدا .

هـەروا لـە دوای سـەرکەوتنی منبـەر بـە ٩٠٪ ی دەنگـەکان بـە سـەرکەوتنی بەسـەر پـارتی یاسـاو داد ، بـە جیـاوازی ١٠ خـاڵ لـە کـۆی دەنگـەکان . کـە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پارتی منبـەر دەتـوانێ حکوومـەت پێك بێنـێ و وولات بـەرەو گۆڕیـانی رامیـاری و پەیوەندیـەکان بباتـەوە و ، لـە هـەمان کـات لایـەنگیری یەکیـەتی ئەوروپایـە و هیـوای بـەهێز کردنـی پەیوەندیەکانـە لـە هەموو بوارە جیاجیاکان .

هـەروا پـارتی منبـەر دەتـوانێ حکوومـەت پێـك بهێنـێ لـە گـەڵ پـارتی جووتیـارانی پۆڵەنـدا ، کـە بـە ٣٥ کورسـی سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا لـە پەرلەمان ، کە دەکاتـە ٨,٩٪ دەنگـەکان ، حکوومەتی داهـاتوو ٢٤٠ کورسـی بە دەست هێناوە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی پۆڵەندا ، هـەروا پێشوازی کردن

لـە هەڵبـژاردن گەیـشتە ٥٣,٨٪ ی دەنگدەران ، کـە ئـەم ڕێژەیـەش بـەرزترین ڕێژەیە لە دوای هەرەس هێنانی دەسەلاتی کۆمۆنستی لە پۆڵەندا دا .

هەروا سەرۆکی لیستی پەرلەمانی منبەری مەدەنی – یوگدان زدروگفسکی – داوای لـە سـەرۆك کگنـسکی کـرد ، کـە داوا لـە سـەرۆکی پـارتی منبـەری مەدەنی – دۆناڵد ناسك – بکات بە پێك هێنانی حکوومەتی پۆڵەندا .

هـەروا لەلایـەکی دیکـە سـەرۆکی پێـشووی پۆڵەنـدا – لـیخ فالیـسا – لـە لێدوانێکیـدا گـووتی :– پێویـستە حکوومـەتی داهـاتوو پـشتیووانی لـە ئۆپۆزسـیۆن بکـات دژی حکوومـەتی ئێـستا و هـەوڵ بـدات پرۆگرامـەکانی خزمەتی گەلی پۆڵەندا بکات و سوود لە توانای یەکیەتی ئەورووپا وەربگرێت . هەروا ئەنجامی هەڵبژاردنی پەرلەمانی پۆڵەندا بەم شێوەیەی خوارەوە بوو لـە نێـوان پارتـە بەشـداربووەکان لـە هەڵبژاردنەکـەدا ... سـەرکەوتنی پـارتی منبەری مەدەنی بە ٤١,٤٪ لە دەنگەکان کە دەکاتە ٢٠٩ کورسی لـە پەرلـەمان کە لە ٤٦٠ کورسی پێك هاتووە . بەرامبەر بە ٣٢,٢٪ دەنگ کـە پـارتی یاسـا وداد بـە دەسـتی هێنـاوە کـە دەبـێ دەسـەلات بداتـە منبـەری مـەدەنی لـە وولاتەکەدا .



٢٠٠٧/١٠/٢٣ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا گۆندا لیزا رایس و وەزیری دەرەوەی بـەریتانیا دیڤیـد میلیبانـــد داوایـــان لـــە حکوومـــەتی ئێـــراق و حکوومـــەتی هـــەرێمی کوردسـتان کـرد ، کـە ڕێـوو شوێنی پێویست بگرنە بەر بۆ کۆتایی هێنان بە کێشە سەرەکیەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ناوچە سنووریەکانی هەرێمی کوردستان .

هـــەردوو وەزیـــری دەرەوەی ئەمـــەریکا و بـــەریتانیا لـــە بەیاننامەیەکـــدا رایانگەیاند :– کە هاکاری و هەماهەنگی لە نێوان ئێراق و تورکیا ڕێگایـەکی کارایـە بـۆ لـە نـاو بردنـی چالاکیەکانی پەکەکـە . هـەروا لـە بەیاننامەکـەدا جەختیان لە سەر ئەوە کردەوە ، کە پێویستە حکوومەتی ئێراق کار بکات لە

پێناو هێنانەوەی ئارامی و سەقامگیری ناوچەکە . و هەدوو بروایان وایە کە ئەو تەنگەژەیە بە ڕێگایەکی ئاشتی چارەسەر دەکرێت لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/١٠/٢٣ لە بەیاننامەکەی سەرۆك وەزیرانی ئێراق نووری مالیکی ڕایگەیاند ، کە هەموو نووسینگەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان –پەکەکە – لە ناو سنووری ئێراق دادەخات و ماوە نادات ئەو پارتە جمووجۆڵی لە ناو خاکی ئێراق ئەنجام بدا.

هەروا لە بەیاننامەکەیدا هاتووە کە پارتی کرێکارانی کوردستان پەکەکە ڕێکخراوێکی تیرۆرستیە و بریاری خۆمان داوە بە داخستنی هەموو نووسینگە و جێگە و شوێنەکانی کە کاری تیادەکەن لە ناو خاکی ئێراق ، هەروا گووتی :– ئەو پارتە زیان بە ئێراق و تورکیا دەگەیەنێ لە هەموو بوارەکاندا .

ئەم بەیانەش لە دوای چەند کاتژمێرێك هات کە وەزیری دەرەوەی تورکیا عەلی باباجان سەردای ئێراقی کردو لە گەڵ وەزیری دەرەوەی ئێراق وشیار زێباری کۆبوونەوە و دوایی لە گەڵ سەرۆك وەزیرانی ئێراق نووری مالکی و بەهەمان هەڵوێست زێباری ڕاگەیاندنەکانی دووپات کردەوە دژی پارتی کرێکارانی کوردستان .

بەلاّم وەزیری دەرەوەی تورکیا لە میانەی گفتووگۆی لە گەڵ بەرپرسانی ئێراقدا لە ووتەیەکیدا گووتی :– تورکیا دەتوانیٚ ڕێگەی گونجاو بگرێتە بەر بۆ چارەسەرکردنی بوونی تیرۆرستان و پارتی کرێکارانی کوردستان بە ڕێگەی دیبلۆماسی و ڕێگەی سەربازیش هەوڵێکی دیکەیە لە بەر دەستدا .



٢٠٠٧/١٠/٢٣ لـــه کێبڕکێیـــەکی ئاشکرا دا لـه هۆڵی – کریـــستی – لـــە بەریتانیا دانەیەك لـه قورئانی پیرۆز فرۆشا بـــه دوو ملیـــۆن و دووسەد و سی و یەك هـــەزار دۆلاری ئەمـــەریکی لـــە کێبڕکێیەکەدا .

جێگەی باسکردنه کە ئەم دانەیە لە قورئانی پیرۆز نووسینەکەی بە زێر نووسراوەتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٠٣ . هەروا ئەم دانەیە لە کاتی فرۆشتنی دەرکەوت کە دانەیەکی هونەری ئیسلامیە و هندیە و قازانجی گەیشتە ١٢ ملیۆن دۆلار ... سەرەڕای ئەوەی کە قورئانەکە بە زێر نووسراوەتەوە پەراوێزەکەی بە زیوو نووسراوە ، کە بە کۆنترین دانە لە قورئان دادەنرێت لە جیهانی ئیسلامیدا .

٢٠٠٧/١٠/٢٣ سەرۆکی بزووتنەوەی نەژاد پەرستی تورکیا – دەووڵەت باخچەلی – ڕەخنەی توندی ئاراستەی حکوومەتی وولاتەکەی کرد ، سەبارەت بەوەی کە دەست بەجێ لەشکرکێشی ناکاتە سەر هەرێمی باشووری کوردستان گووتی :– پێویست حکوومەتی تورکیا سەبارەت بە لەشکرکێشی کردنە سەر باکووری ئێراق و چاوەڕوانی ئەنجامدانی دیدارەکەی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش و ڕەجەب تەیب ئۆردگان نەکات ، کە بڕیارە لە ١٠/٢٥ ئەنجامی دەدەن .

هەروا گووتی :– کە سووپای تورکیا تا ئەو کاتەی پەکەکە بە تەواوەتی لە ناو دەبات لە باکووری ئێراق –– واتە هەرێمی باشووری کوردستان –– بمێنێتەوە پلانی لەشکرکێشیەکە بەم جۆرە ئامادە کراوە .




٢٠٠٧/١٠/٢٤کۆماری چینی مللی توانی بۆ یەکەم جار مانگی دەست کرد هەڵبداتە ئاسمان بۆ ئەوەی لە دەوری مانگ بسووڕێتەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ و بە دۆزینەوەی زانیاری و بەردەوام بوون لە کارەکانیدا .

هەروا مانگی دەست کردی چینی بە ناوی – تشانگ / ئر / ١ – لە بنکەی تیشانگ لە هەرێمی یشوان لە باشووری رۆژئاوای چینی لە کاتژمێر شەشی ئێوارە بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵدرا . ئەم هەوڵەی چینی مللیش لە پێناو بەردەوام بوونی لەو کارەدا تاکو ساڵی ٢٠٢٠ ، دەتوانێ شارەزا و زاناکانی بە مانگی دەست کرد ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان بکات .

هەروا چینی مللی لە ٢٠٠٣ بووتە یەکەم وولاّتی ئاسیایی لە بەکار هێنانی مووشەکێك لە بەرهەمی تایبەتی خۆی و بە کابتنێك بەرەو بۆشایی ئاسمان بڕوات .

٢٠٠٧/١٠/٢٤کۆماری ئیسلامی لە ئێران لە گەڵ کۆماری چینی مللی رێکەوتننامەیەکیان مۆر کرد کە لە ماوەی ساڵی داهاتوودا ٢٤ فرۆکەی شەڕکەر لەجۆری – ١٠ جی – لە چینی مللی بکرێت , کە ئەم فرۆکانە لاسایی شێوەی فرۆکەی – ١٠جی – ئیسرائیلی کراوەتەوە .

لەم بارەیەوە ماڵپەر– نۆڤۆستی – ڕووسی بلاّویکردەوە ، کە ئەو فرۆکانەی کە ئێران بە نیازە بیکرێت توانای گەیشتنی بۆ سەر ئاسمانی ئیسرائیل هەیە . هەروا پسپۆڕێکی ڕووسی بەناوی – کۆنستانتین ماکینکۆ – ئاماژەیداوە کە ئەم فرۆکانە لە پێناو پارێزگاریکردن لە وێستگە ناوەکیەکانی وەکو وێستگەی بووشەهر دەکرێت .

جێگەی باسکردنە کە ئیسرائیل مۆڵەتی بە کۆماری چینی داوە بە هەمان شێووە و ناوی جۆری – لافی – دروستیکات , هەر بۆیە چینی مللی لە ماوەی نێوان ساڵی ٢٠٠٤ و ناوەڕاستی ئەمساڵ نزیکەی ٨٩ فرۆکەی

جۆری – ١٠ جی – دروستکردووه . ئەم ڕێکەوتنەی نێوان ئێران و چین بووە هۆی زیاتر بەرزکردنەوەی کێشەی نێوان ئێران و ئەمەریکا و وولاتانی هاوپەیمانی بە تایبەتی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/١٠/٢٦ کۆنفرانسی کورد لە شاری میونخی ئەلمانیا بەڕێوەچوو , کە دووەم کۆنفرانسی شانۆکارانی کورد بوو لە ئەوروپا و دووەمین کۆنفرانسی



شانۆکارانی کورد بوو کە لە هۆلی–jugendgaesiehaus– بەڕێوەچوو .
جێگەی باسکردنە کە شانۆکاری و کۆنفرانسەکە بە چەند پارچە مۆزیکی کوردی و ئەمەریکی ژەنراو ، لە هەمان کات فلمێکی بەلگەنامەیی لە سەر کێشە و گرفتەکانی شانۆ لە شاری کەرکوك بە ناوی – سەکۆی سووری کەرکوك – نمایشکرا . کە میوانی شەوی یەکەمی کۆنفرانسی – دبالمە – سەرۆکی بەشی زانستی شانۆ لە شانۆی lmu لە شاری میونخ باسێکی دەربارەی شانۆ و ئۆپرای ڕۆژهەلات پێشکەش کرا .
هەر لە بەردەوامی کۆنفرانسەکە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و سمینار دەربارەی شانۆی ڕۆژهەلات و باشووری کوردستان پێشکەش کراو لە کۆتایی بەرنامەکان شانۆنامەی – ئازارەکانی ئەو دیوی پەنجەرەکان – لە نووسین و دەرهێنانی و پێشکەشکردنی – شوان کەریم – نمایش کرا .



٢٠٠٧/١٠/٢٦ ڕۆژنامەی تەلگرافی بەریتانیا ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ١٠ جێگە شوێنەواری لە جیهان بڵاوکردەوە , کە چیای نەمرووود لە چیاکانی باکووری کوردستان لە ناو لیستی ئەو ١٠ جێگەیەدا تۆمارکراوە .

جێگەی باسکردنە کە لە گووری نۆچەیەکدا دیارنامە , ساڵانە بە ملیۆنا کەس بە مەبەستی گەشت و گوزار سەردانی چیای نەمرووود دەکەن ، وەك شوێنێکی پیرۆز و شووێنەواری لە باکووری کوردستان.

هەروا چیای نەمرووود لە ساڵی ١٨٨١ سەردانی کراوە ، ئەو شووێنەوارەی لێ دۆزراوەتەوە کە بەرزی چیاکە ٢١٥٠ مەتر لە سەر ئاستی دەریا بەرزە .

ئەو شووێنەوارەش چەندین پەیکەری تیایە لە سەر مرۆڤ ، کە بەرزی ئەو پەیکەرانە لە ٨ تا ١٠ مەترە و پاشماوەی ئەو پەیکەرانە بۆتە جێگەی سەرنج ڕاکێشی گەشتیارانی لە ناوچەکەدا .

٢٠٠٧/١٠/٢٧ بە شێوەیەکی گشتی میدیا و ڕاگەیاندنەکانی ڕووسیای فیدراڵ باس لە هەڕەشەکانی ڕژێمی تورکیا بۆ سەر هەرێمی باشووری کوردستان دەکەن .

هەروا زۆرینەی ئەو بابەتانەی باسیان لەم مەسەلەیە کردووە لایەنگیری باشووری هەرێمی کوردستانیان پێووە دیارە .




هەروا لەلایەکی دیکە جێگری سەرۆکی پەرلەمانی رووسیا لە لێدوانێکدا بۆ کەناڵێکی رووسی ئاشکرای کرد ، کە بە دەستەکانی خۆی نەخشەی کوردستانی گەورەی کێشاوە . بەلاّم وەزارەتی بەرگری وویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم نەخشەیان لێ دزیووە .

دوای ئەوەی پەرلەمانی تورکیا یاداشتی لەشکرکێشکردنی بۆ سەر هەرێمی باشووری کوردستان پەسەند کرد ، بەشێوەیەکی گشتی میدیا دەزگاکانی راگەیاندنی رووسیا باس لە هەرەشەی تورکیا دەکەن و لەم بارەیەوە دەنووسن , بە تایبەتی لە رۆژنامەکانی – بیرسانت , ئیزڤیستیا , ئیزڤیستیا گازێتا – زۆرترین بابەتی لەم بارەیەوە روونکراوەتەوە ، کە زۆرینەی نووسەری ئەم بابەتانە هەستی دڵسۆزیان لەگەڵ کێشەی کورد هەیە ، کە بە نووسینەکانیانەوە دیار بووە .

هەروا لەم بارەیەوە کەناڵی – تی ڤی سێنتەر – ی رووسی چاوپێکەوتنی ٣٠ خولەکی لە گەڵ جێگری سەرۆکی پەرلەمانی رووسیا – ژیرینۆفسکی – سازدا , کە لە درێژەی ووشەکانی ژیرینۆفسکی زۆر بە هاودەردیەوە باسی کێشەکانی گەلی کورد کرد و گووتی :– من بە دەستی خۆم نەخشەی کوردستانی گەورەم کێشا بوو , بەلاّم وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا – بنتاگۆن – ئەو نەخشەیان لێدزیووم و ئێستا ئەوان باس لە کوردستانی

گەورە دەکەن .



٢٠٠٧/١٠/٢٨ کۆچی دوایی هونەرمەندی گۆرانیبێژی کورد - سەدیق زوهری - لە شاری سەقز لە رۆژهەلاتی کوردستان بە نەخۆشی گورچیلەکانی لە دوای ململانێیەکی زۆر لە گەڵ ئەم نەخۆشیەدا .

جێگەی باسکردنە کە هەنەرمەند سەدیق زوهری لە ساڵی ١٩٤٣ لە شاری سەقز لە رۆژهەلاتی کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە . قۆناخەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لە شاری سەقز تەواو کردووە و بڕوانامەی دیبلۆمی بە دەست هێناوە , دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٤ وەك مامۆستا دامەزراوە و بۆ ماوەی ٩ نۆ ساڵ لە قوتابخانەی گوندەکان وانەی گووتۆتەوە , دوای ئەوە لە قوتابخانەکانی شاری سەقز درێژەی بە وانە گوتنەوە داوە , تا لە ساڵی ١٩٩٣ خانەنشین کراوە .

ئەم هونەرمەندە کوردە لە ماوەی ژیانیدا بەردەوام بووە لە خزمەتکردنی هونەری گۆرانی کوردی لە رۆژهەلاتی کوردستان و باشووری کوردستان , کە لە گەڵ چەندین گروپی موزیکی بەشداری کردووە و لە چەندین کۆنسێرت گۆرانی گووتووە بە سەرکەوتوانە بە گۆرانیەکانی وەك - تروو‌کە تروو‌کەی بەفر , کوێستانانی گرتی , گوڵی بەهار , ئای لەو ناوچەوانەی , نەغمەی ئازادی - لە گەڵ دەیان گۆرانی دیکە کە خاوەنداریەتی کوردی پێوەوە دیارە لە کوردستان .

٢٠٠٧/١٠/٣٠ رێکخراوی - هیومان رۆچ - لە نامەیەکیدا بۆ حکوومەتی تورکیا داوای کرد کە میلیشیا چەکدارەکانی بە ناوی - نیزامی پاسەوانی گوند - هەڵوەشێنێتەوە . کە مەترسیدار و گەندەڵیە لە سەر باری حکوومەتی تورکیا و پێویستە رێورەسمی قەدەخە کردنیان بگرێتە بەر ... سەرەڕای ئاگادارکردنەوەی حکوومەتی تورکیا ... بەڵام حکوومەتی تورکیا هیچ

کــارێکی فــەرمی بەرامبــەر بــەو پاســەوانانە ئــەنجام نــەداوە ... چــونکە حکوومەتی تورکیا پێی وایە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا زەخیرەیەکی باشن بۆ دەنگدان ... جێگەی ئاماژە پێکردنەکە کە ئەو میلیشیا چەکدارانە کە بە پاسەوانی گوند ناو دەبرێن .

ئەمـەیان بـاش نیـە و ناویـان بە قاچاغچی مـاددە هۆشـبەرەکان و ڕفانـدن و کوشـتن بەسـتراونەتەوە ... ئەمـە و بـەپێی ئامـارە ڕەسمیـەکان – ٥ – هـەزار کەس لەوانە بە تاوانی کوشتن تاوانباران .

٢٠٠٧/١٠/٣٠ بەنــــداوی مووســــڵ گــەورەترین بەنــداوە لــە ئێـراق و چـوارەم بەنـداوە لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت ، ئـەم بەنـداوە دەکەوێتـە بـاکووری شـاری مووسـڵ بە دووری ٥٠ کیلـۆ مـەتر لە پارێزگای نەینەوا . کە دەکەوێتـە باشووری ڕۆژئاوای شـاری دهـۆك و لـە ناو خاکی هەرێمی باشووری کوردستانە .



جێگەی باسکردنە کە بەنداوی مووسڵ بەر لە ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی لـە ئێـراق بـە سـەرکردایەتی سـەدام حوسـێن ، نـاوی بەنـداوی سـەدام بـوو نـەك بەنـداوی مووسـڵ . کـە بـەر لـە ئێـستا ئـەم بەنـداوە بەرهـەمی وزەی کارەبـای ٣٢٠ مێگـاوات بـوو , بـەڵام لـەو بەنـداوەدا چـوار تـۆربین کاریـان دەکـرد و تۆربینێك ٢٠٠ مێگاوات لە وزەی کارەبا بەرهەم دەهێنا .

هـەروا ئـەم بەنـداوە لـە سـاڵی ١٩٨٣ لـە سـەر زێـی دجلـە دەسـتی بـە دروسـت کردنی کرا لە لایەن چەند کۆمپانیایـەکی ئـەڵمانیا و ئیتالیـا – جیمـوود – و دیزاینتـی ئـەم بەنـداوەش لـە لایـەن کۆمـەڵێك لـە ڕاوێـژکاری سویـسری – سـویس کونـسلتانتس گـروپ – ئەنجامـدراو لـە سـاڵی ١٩٨٥ تـەواو کـراو بەنداوەکە پڕ ئاو کراو بووە دەریاچەی بەنداوی مووسڵ .

هەروا ئەم بەنداوە لە سەر ڕووبەرووی ٣,٢٠٠ کیلۆمەتر و بەرزی ١٣١ مەتر دروسـتکراوە و زیـاتر لـە ١١,١٠٠ هـەزار و سـەد مـەتر سـێجا ئـاو دەگـرێ و

بەکار هێنانی ئەو ئاوەی کە بۆ وزەی کارەبا بەکاردێت ۸,۱۰۰ ملیار مەتر سێجا .

بەلاّم لە دوای ساڵی ۱۹۹۱ ئەم بەنداوە هیچ کاری لە سەر نەکراوە بە نۆژەنکردنەوەی بۆتە هۆی دروستبوونی مەترسی لە رووخانی ئەم بەنداوە و دەبێتە هۆی لە ناوبردنی شاری مووسڵ لە ناوچەکەدا .

۲۰۰۷/۱۰/۳۱هێزێکی زۆر لە سووپای تورکیا بە پاڵپشتی هەلیکۆپتەر و تانکە وە هێرشێکی فراوانیان بردە سەر چیای چوودی و لە ئاکامدا لە گەڵ هێزی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان p.k.k رووبەرووی یەك بوونەتەوە و لەو شەڕەدا هەلیکۆپتەرێك بە تەواوی سەرنشینەکانی کەوتە خوارەوە ، کە ٦ سەرباز کوژران لە گەڵ ئەفسەرێك بە پلەی نەقیب .

بەلاّم لەو شەڕەدا زانیاری لە بارەی زیانی چەکدارانی .p.k.k نەزانرا بە هۆی بوونیان لە سەنگەرە بە هێزەکانی ناو چیای چوودی لە باکووری کوردستان .

تێبینی:- ئەم کتێبە لە ۲۰۰۹/8/۳۰, لە کاتژمێر ۱۰ دەی ئێوارە تەواو بوو ... کە لە ۲۰۰٦/۳/۱ دەستکرا بە ووربین کردن و ووێنە دانان ، کە رۆژانە بە رێژەی پێنج کاتژمێر کاری لە سەر کراوە لەم ماوەیەدا

# سەرچاوەکان

١- میدیا (ئی - م- دیاکۆنۆف) دار الحکمة - لندن.

٢- چەند لاپەریەك لە مێژووی کورد- لازاریف.

٣- الثقافة الجدیدة- گۆڤارێکی مانگانەی پارتی کۆمۆنیستی ئێراقە.

٤- بیری نوێ- گۆڤارێکی وەرزی پارتی کۆمۆنیستی کوردستانە.

٥- کوردستان والکرد- جواد مەلا- وطن مقسم وامة بلا دولة.

٦- رادیۆی لەندەن- پرۆگرامی السائل والمجیب.

٧- رۆژ ژمێری - پانۆرامای کوردستان.

٨- چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی کورد بەشی /١-٢، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد.

٩- هەولْم داوە لەتەلەفزیۆن و گۆڤارو رۆژنامەکان کۆم کردۆتەوە لەگەلْ نووسینەکانی خۆم کە دەستنووس بوونەو بابەت لەدوای بابەتی جیاجیا بلاووکراونەتەوە.

١٠- کوردستانو کورد- شەهید دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملۆ.

١١- شۆرشی شێخ عووبێدوللای نەهری- محەمەد حەمە باقی .

١٢- شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران لەباکووری کوردستان.

١٣- کورد- باسیلی نیکیتین- وەرگێرانی: دکتۆر نووری تالەبانی .

١٤- المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط- د. حامد محمود عیسی .

١٥- سالْنامەی کوردستان- دانانی: عەلی کەندی - چاپی سێیەم - تاران- ٢٠٠٦.

١٦- تأریخ الدولة العثمانیة - مامۆستا محمد فرید المحامي ، چاپی نۆیەم - دار النفائس- بیروت .

١٧- سنتان فی کوردستان- ١٩١٨-١٩٣٢ - دیلبوە- آ- هی فەرمانرەوای رامیاری هەولێر- وەرگێرانی: فوئاد جەمیل -چاپی یەکەم- بەیرووت.

١٨- القانون الدولي العام - دکتور عصام العطیة - چاپی شەشەم- ٢٠٠١ - وەزارەتی بالای فێرکردنو توویژینەوەی زانستی- بەغدا.

١٩- رۆژنامەی (الحیاة) چاپی بەیرووت - ژمارەی سالەکانی ٢٠٠١-٢٠٠٢-٢٠٠٣-٢٠٠٤-٢٠٠٥- ٢٠٠٦ -٢٠٠٧ .

٢٠- رۆژنامەو گۆڤارەكانی هەرێمی كوردستان- خەبات - كوردستانی نوێ - گولان- رامان - كاروان - سەردەمی عەرەبی- رێگای كوردستان- گولانی عەرەبی- سەنتەری برایەتی.

٢١- فەرهەنگی ڕووداوەكانی كوردستانو ولاتانی جیهان- دانانی: عەلی كەندی - چاپی یەكەم- تاران - ٢٠٠٥.

٢٢- كەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی جەزیرە - پرۆگرامی ( في مثل هذا اليوم).

٢٣- اسرائيل الكبرى - دراسة في فكر التوسعي الصهيوني - دكتور اسعد زوق - دار الحمراء-بيروت. الطبعة الرابعة - ٢٠٠٣.

٢٤- تأريخ اوروبا في العصر الحديث- دانانی : ه. ا. ل. فيشر- دار المعارف- چاپی نۆیەم.

٢٥- قصة الحضارات - دانانی - ول ديورانت - وەرگێڕانی: محمد بدران- مصر- مهرجان القراة للجميع.

٢٦- معجم الحروب - دانانی : دكتور فردريك معتوق- چاپی یەكەم- بەیروت- لوبنان.

٢٧- لمحات اجتماعية عن تاريخ العراق الحديث - دكتور علي الوردي - توزيع مكتبة الصدر- تاران - ئێران.

٢٨- التاريخ الاسلامي - دانانی: دكتور محمد شاكر - المكتبة الاسلامية- چاپی هەشتەم- بەیروت - ٢٠٠٠.

٢٩- الارهاب الدولي وانعكاساته على الشرق الاوسط خلال الاربعين قرنا- دانانی سفير: دكتور حسين شريف- الهيئة المصرية العامة للكتاب- ١٩٩٧- میسر.

٣٠- دراسات في الحركة الكردية المعاصرة- ١٨٣٣ -١٩٤٦ دانانی: دكتور عوسمان عەلی- چاپخانەی رۆشنبیری حكومەتی هەرێمی باشووری كوردستان.

٣١- القاموس السياسي - ئامادەكردنی: احمد عطية - چاپی سێیەم- دار النهضة العربية -شارع عبدالخالق - قاهیرە - میسر.

٣٢- تاريخ الوزارات العراقية - دانانی : عبد الرزاق ئەلحوسنی - چاچی شەشەم- بیروت - ١٩٨٢,

٣٣- نەتەوەكانو دەوڵەتی سۆڤیەت - هیلین كاریردا كلوس- وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی: هزی عبود - بەیروت - چاپی یەكەم- ١٩٧٩.

٣٤- مقالاتی - شەهید سامی عەبدولرەحمان- باشووری كوردستان- هەولێر.

٣٥- عەبدولكەریم قاسم - رؤية بعد الشعرين- حسن العلوی- چاپی یەكەم- العراق..

٣٦- الحياة السرية لصدام حسين - دانانی: انيس الرغيدی- چاپی یەكەم -٢٠٠٤- میسر.

٣٧- راپەڕینی کوردە عەلەویەکانی دەریسم- هانز- لۆکای کبیسیر- ١٩١٩-١٩٢١ قۆچگیریێ- وەرگێرانی لەفەڕەنسیەوە - نەجاتی عەبدوڵلا.

٣٨- کوردستانی پشت قەفقاس- دکتۆر -ئەفرسیاو هەورامی - لەبلاوکراوەکانی - ژین- باشووری کوردستان- سلێمانی.

٣٩- تاریخ العراق بین احتلالین - پارێزەر - عەباس عەزاوی چاپی یەکەم- هەشت بەشەکە.

٤٠- شەرەفنامە -شەرفخانی بەدلیسی -وەرگێرانی هەژار - ١٩٧٣ لەلایەن کۆڕی زانیاری کورد بەچاپ گەیاندراوە- چاپخانەی نعمان - نەجەف.

٤١- کوردو کوردستان - بەرگی ١-٢-٣ محەمەد ئەمین زەکی - لە دار اسلامی بغداد بەچاپگەیاندراوە -١٩٣١.

٤٢- کوردو عەجەم - نەوشێروان مستەفا ئەمین - مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران - سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان-سلێمانی -٢٠٠٥.

٤٣- کورد - تورک - عەرەب- سیسیل جون ئیدمۆندی- وەرگێرانی حامد گەوهەری- دەزگا، چاپ و بڵاووکردنەوەی ئاراس- ٢٠٠٤.

٤٤- فی الاداب (ف. إ. لینین) - وەرگێرانی لە رووسیەوە- یوسف حلاق بڵاوکردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیری - دیمەشق -سوریا -١٩٧٢.

٤٥- مێژوو - دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد - بە یاریدەدەری ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری ولاوان چاکراوە -بەغدا ١٩٨٣.

٤٨- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد - دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- بەرگی دووەم- ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە- هەولێر - چاپی یەکەم - ٢٠٠١.

٤٩- یاداشتەکان - رەفیق حلیمی -بەشی یەکەم و دووەم - کوردستانی ئێراق شۆڕشەکانی شێخ مەحمود -چاپخانەی رۆشنبیری - بەغدا - ١٩٨٨.

٥٠- هەڵوێستنامە- عەلی کەندی - بەرگی یەکەم - چاپی یەکەم- هەولێر- ٢٠٠٦.

٥١- قصة الديانات -سلیمان مەزهەر - کتێبخانەی مەدبولی - چاپی دووەم - کۆماری میسر - ٢٠٠٣ .

٥٢- کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهان - دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد - وەرگێرانی بۆ عەرەبی: دکتور محەمەد مەلا عەبدولکەریم - چاپی دووەم - بەغدا - ١٩٨٤.

٥٣- راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران - ڕۆبەرت ئۆلسن -١٨٨٠-١٩٢٥ وەرگێرانی ئەبوبەکر خۆشناو- زەنجیرە کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم - سلێمانی - ١٩٩٩.

٥٤- تاریخ الاکراد- تۆماس بوا- وەرگێرانی - محەمەد تیسیر میرفات - دار الفكر المعاصر- بیروت -لوبنان - چاپی یەکەم -٢٠٠١.

٥٥-حول مسألة الاقطاع بين الاكراد - أ. شامیلیۆف- وەرگێرانی- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد - چاپی دووەم- بەغدا - ١٩٨٤.

٥٦- قضايا كردية معاصرة - كركوك والانفال -الكردو تورکيا - دکتور جبار قادر - دار ئاراس للطباعة والنشر - چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.

٥٧- کورد لەجەنگی رووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیا . پ. ی- ئەڤیریانۆف -وەرگێرانی لە رووسیەوە دکتۆر ئەفرسیاو هەورامی -سلیمان -٢٠٠٤.

٥٧- كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير - دراسة وثائيفة عن قضية الكردية في العراق - دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد= بەشی یەکەم - وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان -سلێمانی .

٥٨- المستبد - زهیر ئەلجەزائری - صناعة القائد - صناعة الشعب- چاپی یەکەم - بیروت -بەغدا -٢٠٠٦.

٥٩- عصر ناپلیۆن - تاريخ الحضارة الاوروبية ف ١٧٨٩-١٨١٥ - ول ديورانت - وەرگێرانی دکتۆر عەبدولرەحمان عەبدوڵلا شێخ - دار الجبل - بیروت -٢٠٠٢.

٦٠- تاريخ الرومان - دانانی نجيب ابراهيم طراد -تقديم دكتور محمد رينهم عزب - مكتبة ومطبعة القدر-١٩٩٧.

# کورتەیەك لە ژیاننامەی - نووسەر



گەر بەراوود لە نێوان ژیاننامەی نووسەران بکەینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ کە نووسەران، یاخوود دانەران ، جا لە هەر بووارێك بن ، بگرە لە نووسینەوەی مێژووو جووگرافیاو زمان وکەلتوورو داب ونەریت و شارستانیەتی هەر نەتەوەیەك لە سەر گۆی زەویدا .

کە ژیاننامەی نووسەران زۆر لە یەك دەچێ ، جا لە بوواری هەژاری و کەم دەرامەتی بێت ، یاخوود لە ئاستی بڕوانامەی خووێندن بێت ، یاخوود لە ئاستی پەیووەندیە کۆمەلاَتیەکان بێت .

بەلاَم سەرچاوەی بوونی تووانای نووسەر لە هەموو بووارە جیاجیاکاندا ، هۆکاری چ ئێش وئازار و نالەباری ئەو نووسەرەیە لە ناو پەیووەندیەکانی کۆمەلگاو لە نێوان کۆمەلگاو دەسەلاَتدا .

ئەویش بە هۆی چەوسانەوەو نەبوونی داد پەروەری لە دەسەلاَ ت و پەیووەندیەکان لە هەموو بووارەکانی ڕامیاری و ئابووری بازرگانی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەلاَیەتی و ڕۆشەنبیری و زمان و مێژوو داب و نەریت و و کەلتوورو شارستانیەت.

بەتایبەتی کۆمەلگای کوردو مێژووی چەوسانەوەی داگیرکردنی و لەت لەتکردنی لەلایەن ڕژێمەکانی دابەش کەر، لە پێناو پاراستن و بتەووکردن وبە هێز کردنی بەرژەوەندیەکانیان . بە دروستکردن و پێکهینانی دەوولەت لەسەر خاکی گەلانی دیکە لە هەرێم و ناوچەو جیهاندا ، لەوانەش گەلی کوردو خاکی کوردستان .

جا علی کەندیش یەکێکە لەو نووسەروو دانەرانەی کە بەو قۆناخە نا لەبارانە تێپەر بووەو بۆتە هۆی سەرچاوەی پێنووسەکەی بەنووسین و گەیاندنی پەیامەکەی بۆ کۆمەلگای گەلی کوردستان . کە ئەویش:-

ناوی تەواوی – عەلی عوومەر عـەلی فـەتاح - ە و ناسـراو بـووە بـە – عـەلی کەنـدی – و لەسـاڵی ١٩٥٣ لـە گوونـدی سـەر بەشـاخ ، کـە مەڵبەنـدی هـۆزی سـیانەو سـەر بەناحیـەی دیبەگەی سەربە قەزای مخموری پارێزگـای هـەولێرە لـە باشـووری کوردسـتان ، چـاوی بـە جیهان هەڵهێناوە ، لە بنەماڵەیەکی هەژاری جووتیار لەم گووندەدا .

هـەروا عـەلی کەنـدی بـۆ یەکـەم جـار لـە لای مـەلای ئـاینی ئیـسلامی دەسـتی کـردووە بـە خووێندن لە حووجرەی فەقێیان لە مزگەوتەکان .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٦٠ چـۆتە قوتابخانـە لـە قـەزای مـەخموور . جـا لەوکاتـە بـەهۆی هـەژاری خێزانـەکـەی و نـەبوونی تووانـای دارایـی بـاوکی ، لەگـەڵ خووێنـدن لـە پـشووی هاوینە کاری کردووە ، بە کاری بەرخەوانی و شووانی و کرێکاری دروێنە کردن و جـووت کردن و کاریدیکەی لە تووانایدا هەبووە ، لـە پێنـاو بـەرەو بـاش بـوونی بـاری گـووزەرانی ژیانی خێزانەکەو یارمەتی دانی باوکی لەم بووارەدا .

هەروا دوای تەواوکردنی قۆناخی خووێندنی سەرەتایشی بە دەرچوونی بە پلەی دووەم لە سەر ئاستی قەزای مەخموور لە خووێندن و بەهۆی باری رامیاری و بیروو بۆچـوونی ئـەو خێزانـەوە ، لە هەمان کات بە هۆی هەڵوویستی عەلی کەندی فـەرمانی دەسـت گـیر کردنـی لە مانگی/ ١٩٦٦/٧ لەلایەن داروودەستەکەی رژێمی بەعسی بۆ دەردەچێ لە قەزاکەدا .

هەر بـەم هۆکـارەش لـە ١٠/ ٩ / ١٩٦٧ ڕووی لەشـاخەکانی کوردسـتان کـرد بـە پەیووەنـدی کردنی بە پێشمەرگەی شۆرشی ئەیلولی مەزن لە لقـی پێـشمەرگەکانی پـارتی کۆمۆنیـستی ئێـراق لقــی / هــەرێمی کوردســتان ، لــە دەڤــەرەکانی ڕانیــە و قــەلادزێ و ڕەوانــدوزو پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێرو بە ردەوام بوونی تاکوو ٢٠ /٣/ ١٩٧٢ .

لەو ماوەیەشدا بـەهۆی خراپـی بـاری خێزانـەکـەی لـە کاتـە بەردەسـتەکانی کـاری کـردووە بۆئەوەی ژیانی خۆی و خێزانەکەی بەرەو باشتر ببات لەو کاتدا .

دوای ئەوە گەراوەتەوە پارێزگای هەولێرو چـۆتە قـەزای مـەخموور بـۆ کـاری پارتایـەتی و بۆتە کادیر لە قەزای مەخموورو بە بـەردەوام بـوونی لـە پایـەکانی لـە پـارتی کۆمۆنیـست تـاکوو ١٩٧٩/٣/١٢ ، کـە ئەنـدامی لیژنـەی نـاوخۆی پـارتی کۆمۆنیـست بـووە لـە لیژنـەی پاریزگای هەولێر لە باشووری کوردستان .

دوای ئەوە لە ١ / ٧ / ١٩٧٥ چۆتە شاری مۆسکۆی پایتـەختی یـەکێتی سـۆڤیەت ، ئـەویش بـە خووێنـدنی لـە پـەیمانگای زانـستە کۆمەلایەتیـەکان ، ی سـەر بـە ئـەکادیمیای زانـستی کۆمەلایەتیەکانی یەکێتی سۆڤیەت ، بۆ مـاوەی دوو سـاڵ بـە دەر چـوونی بـە پلـەی زۆر باشە لـە پیمانگایـەدا ، تـاکوو ١٥/ ٨ / ١٩٧٧ دا و دوای ئـەوە گەراوەتـەوە کــوردستان لـە

پارێزگای هەولێر قەزای مەخموور لە دەڤەرەکەدا .

دوای گەرانەوەی لە سۆڤیت لە ١٩٧٨/١٢/١٢ خێزانی پێك هێناوە و باوکی پێج کورە ، و هەموویانی بە ئامانجێکی باش گەیاندوو لە پلەکانی فەرمانبەریەتی و سێ لە کورەکانی خێزاندارن لە شاری هەولێردا .

هەر لە ١٩٧٩/٣/١٢ بە فەرمانبەر دامەزراوە لە بەرێوەبەرایەتی گەشت و گوزار لە هاوینە هاواری سەلا حەدین – پیرمام - لە کۆمەلگای سەرە ڕەش لە پارێزگای هەولێر ، بە بەردەوام بوونی کاری فەرمانبەرێتی . سەرەرای ئەوەش لە دوای سالی هەشتاکان بەهۆی مل کەچ نەکردنی بۆ داخوازیەکانی دارو دەستەکی بەعس لە کوردو عەرەب ، کە لە ١٩٨٢/٢/١٣ لەلایەن بەرێوەبەرایەتی ئەمی هەولێر دەست گیر کراوەو رەوانەی – الهیئة الخاصة – لە شاری کەرکوك زیندانی کراوەو بـــــــــۆ ماوەی حەوت مانگ گیراوە تاکوو ٦ / ٨ /١٩٨٢ . ئازاد کراوە بێ ئەوەی هیچ کەسێك لە ئەندامان و لایەنگرانی پارتەکان و کە سایەتیەکان تووشی ئێشوو ئازارو ئەشکەنجە بکات – واتە ئیعتراف نەکردن – و بە سەربەرزی لەو زیندانانەی شەقلاوەو مسیف سەلاحەدین وهەولێرو کەرکوك دەرچووە .

دوای ئەوە بۆ جاری دووەم لە ١٩٨٥/٥/١٩ لە لایەن پیاوانی موخابەراتی پارێزگای مووسڵ ، کە لەو کاتە سەرباز بوو لە مەدرەسە قتالی مووسل دەستگیر دەکرێ و رەوانەی موخابەراتی گشتی شاری کەکوك دەکرێت ، کە ئەم بەرێوەبەراتیە گشتیە بۆ هەموو شارەکانی کوردستان بوو وەك مووسڵ و کەرکوك و هەولێرو سلێمانی ودهۆك . کە فەرمانی دەست گیرکردنی لەلایەن بەرێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێرو ئەمنی باکوورو ئیستخبارات و موخابەرات لە هەردوو پارێزگای مووسڵ وهەولێری بۆ دەرچوو بوو .

لەئاکام لەم رۆژەدا دەستگیرکراو لــــــــە زیندانەکانی مووسڵ وکەرکوك مایەوە تاکوو ١٧ / ٩ / ١٩٨٥ بە ئازادکردنی لە دوای داد گایی کردنی ، کە هیچ بەلگەیەك نەیتووانی تاوانباری بکات بەهۆی دان نەنانی بە کارە نەهێنیەکانی کە لەو کاتدا ئەنجامی دەدا.

هەوا بۆ جاری سێیەم لە ٢٥ / ٩ /١٩٩٠ لە لایەن ئەمنی هەولێر دەستگیرکراوەتەوە لەسەر هەمان بیروو بۆچوو ن وهەلوویست . بەلام بۆ ماوەیەکی کەموو دوای ئەوە ئازاد کرا .

لە دوای ٣/١٢ /١٩٧٩ تاکوو راپەرینی گەلی کوردستان لە ١٩٩١/٣/٥ بە سەدان جار لەلایەن بەرێوەبەرایەتیەکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات لە پارێزگای هەولێر بانگ هێشت کراوەو لێکۆلینەوەی لە گەڵ کراوەو لە دوای ووتە ناشیرینەکانیان و ئیهانە کردنی عەلی کەندی ئینجا رێگەیان پێداوە لە بەرێوەبەرایەتیەکانیان دەرچێ .

سەرەرای ئەوەش بۆ دووجار لە ریزی سەربای سووپای ئیراق بووە بۆماوەی ٤,٥ چوارسال و نیوو ، بەلاّم ئەو كەسانەی كە كورد بوون و رەفیق حزبیی و ئەمن جاشی خۆ فرۆش ودووژمنی كوردو كوردستان بوون دژی مامۆستا عەلی كەندی بوون بە نووسینی راپۆرت لەسەری و بە زیندانی كردنی ...؟...! . كە ئێستاش لەجاران ڕۆلاّیان و باری ژیانیان باشترە لە هەمان دام ودەزگا ئەمنیەكان و حكوومەت و خاوەنی هەموو شتێكن ، لە حكوومەتی هەرێمی كوردستان و ، بەلاّم مامۆستا عەلی كەندی تا تەواو بوونی ئەم مێژوونامەیە خاوەنی – یەك سم زەوی نیە نەك لە سەر گۆی زەوی بگرە لەسەر خاكی كوردستانیشدا و ماوەی ژیانی لە كرێ چییایەتی بردۆتە سەر لەم بارو دۆخە تەنگەدا ، و عەلی كەندیش هەر وەك جارانە لە بیرو بۆچوون و هەلّوویستەكانی بەردەوامەو ڕۆژێك لە رۆژانیش مل كەچی هیچ لایەنێك نەبووە ، نە لەڕابردوو و ئێستادا ، بۆ سەلماندنی ئەم ووتان . نووسینەكان ودانراوەكانیشی شاهیدن بۆ ئەم ڕاستیانە .

## لە بەرهەم وبلاّكراوەكانی– دانەر – نووسەردا

لە گەلّ ئەوەشدا عەلی كەندی لە بارەی دەستكردنی بە نووسینەكانی كە دەگەرێتەوە بۆ سالّی ١٩٧٤ ، كە لەو كاتەی لە شاری بەغا بوو ، یەكەم بابەتی لە رۆژنامەی – تەریق ئەلشەعب – كە زمانحالی پارتی كۆمۆنیستی ئێراق بوو ، لە سەر باری رامیاری و نەتەوەیی بلاّوكردەوە لە رۆژنامەكدا . دوای ئەوە لە نووسین بەردەوام بووە بە پێی باروو دۆخەكانی رامیاری و نەتەوەیی و بووارەكانیدیكەدا . بەرهەمەكانیشی ئەمانەن :-

١- سالّنامەی كوردستان ، كە یەكەم بەرهەمی نووسینەكانە .
٢- فەرهەنگی رووداوەكانی كوردستان و وولاّتانی جیهان ، كە بۆ یەكەم جارە لە كوردستان – چاپی یەكەم /٢٠٠٥ .
٣- مێژوونامە – كە ئێستا لە بەردستدایە ، چاپی یەكەم / ٢٠٠٦ .
٤- زانین – كە فەرهەنگێكی – كوردی – عەرەبی – رووسیە ، كە ئەویش بەرەوە بە چاپكەیاندن هەنگاو دەنیّ .
٥- نەخشەی جیهان – بە زمانی كوردی بە ناونیشانی – كورد لە نێوو نەخشەی رامیاری جیهان – كە بۆ یەكەم جارە لە كوردستان . ئەم نەخشەیە ١٠٠٠٠ دە هەزار دانەی لیّ چاپكرا لە ئێران ، بەلاّم لە لایەن دەزگاكانی ئیتلاعاتی ئێران دەستگیر كرا . دوای ئەوە وەك هەدییە لە ٢٠٠٨/٨/٤ پێشكەش بە وەزارەتی پەروەردەی حكومەتی هەرێمی كوردستان كرا ، لە ریگەی بەرێووە بەری گشتی پرۆگرام و چاپەمەنیەكان – كاك

ئاراز نەجمەدین — لە هەولێر .

٦- سالنامەی کوردستان — بە شێوەی بچووك — تقویم مەنزەدی — کە بۆ یەکەم جارە لە کوردستان .

٧- هەڵوویستنامە — ٢٠٠٦ – بەرگی یەکەم ، کە ئامادەیە بۆ چاپکردن .

٨- ئینسکلۆپیدیای کوردستان و جیهان —چاپی دووەم /٢٠٠٨ .

٩- ئافرەت لە پەیووەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا ، هەنگاو دەنێ بەرەو بە چاپگەیاندن .

١٠- دەفتەری زانیاری — بەندە بە پارکی سامی عەبدولرەمان لە شێووەی — شریت — کە ٢,٥٥ مەتر درێژیەتی ،ئەویش بۆ یەکەم جار بووە لە کوردستان .

١١- بلاّوکردنەوەی زیاتر لە — ٧٥ — بابەت و لێکۆڵینەوە لە بووارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و جووگرافی وپەیووەندی کۆمەلاّیەتی و ئافرەت و تووێژی گەنج ، لە رۆژنامە وگۆڤارەکان ، لە سەر باروو دۆخی کوردو رووداوەکان لە گەڵ وولاّتانی داگیر کەری کوردو کوردستان و رامیاریەتی لە پەیووەندی نێوو دەووڵەتیدا .

١٢- لە دوای ئەوانە ، ئەوا ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکەتان بە چوار/٤ بەرگ کەوتە بەردەستتان وەك بڵێی هەگبەی مێژوو لە بەر دەستتان بێت لە هەموو بووارەکانی — رووداوو ، بە سەرهات و ، رێکەووتن و ، شەڕو ، ئاشتی و ، نەتەویی و ،نیشتیمانی و، رامیاری و ، جووگرافی و ، سەر بازی و ، ئابووری و ، بازرگانی و ، کۆمەلاّیەتی و ، رۆشنبیری و ، مێژوو و ، زمان و ، داب و ، نەریت و ، کەلتوور و ، شارستانیت , لە گەڵ رووداوەکانی پزیشکی و ، گەردوونی و ، وەرزش و ، رووداوەکانی فرۆکە و ، گرکان و ، گوومە لەرزەو ، ئاژەڵ و ، چەندین بوواری دیکە لە جیهاندا .

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٩ی
# بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
# بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٦٢ | البعد السياسي للمشكلات القومية "الكرد نموذجا" | د.خليل اسماعيل محمد | دراسة | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٦٣ | خۆری ئاراپخا کەرکوک و ژیانی عەبدولڕەحمانی نفووس | زانیار سەردار | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٦٤ | الاعلام... والصحافة | صابر محمود عبدالله | دراسة | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٣٦٥ | هەڵوێستەکان، دەسکەوتەکان و وتارو دیمانەکانی (سەرۆک مسعود بارزانی) | ئا: مستەفا سلیم | وتارو دیمانە | - | ٥٥٢ |
| ٣٦٦ | لە دەرزی هزرەوە | بەهزاد حەویزی | وتار | ١٥٠٠ | ٢٥٦ |
| ٣٦٧ | توانەوە | غەفوور سالح عەبدوڵڵا | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٠٤ |
| ٣٦٨ | مصباح القلوب و مفرج الكروب | ملا عبدالرحمان ملا طه | الجزء الاول | ٦٠٠٠ | ٧٨٤ |
| ٣٦٩ | مصباح القلوب و مفرج الكروب | ملا عبدالرحمان ملا طه | الجزء الثاني | ٧٠٠٠ | ٨٩٦ |
| ٣٧٠ | ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی | د. شێرکۆ بابان | لێکۆڵینەوە | ٣٠٠٠ | ٣١٢ |
| ٣٧١ | مێژووی هونەری فۆتۆ | د. فەرهاد پیرباڵ | لێکۆڵینەوەی مێژوو | ٣٠٠٠ | ٩٦ |
| ٣٧٢ | پەلکە زێرینە | سەعید مەولود بێخاڵی | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ٨٠ |
| ٣٧٣ | کێ پەنیری من ڤەگوهاست؟ | و:ناهیدا دری | چیرۆک | ١٥٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٧٤ | کانەبییان | ڕەزا سەید گوڵ بەرزنجی | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٣٧٥ | مناخس الالم | د.بشير الطوري | شيعر | ١٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٣٧٦ | مسرحيتان كوميديتان | عادل دنو | مسرحيه | ١٠٠٠ | ٤٨ |
| ٣٧٧ | چنینەوە | د. لەتیف محەمەد حەسەن | شیعر | ٢٠٠٠ | ٤٤٨ |
| ٣٧٨ | کورد و سیستمی نێو دەوڵەتی | د.عوسمان عەلی میرانبەگ | لێکۆڵینەوە | ١٥٠٠ | ١٥٢ |
| ٣٧٩ | ئاسمانی گەڵا بابردووەکان | نەرمین جەعفەر | شیعر | ١٠٠٠ | ١٢٠ |
| ٣٨٠ | گۆڤەندێك لە هەڵبەست | موسی زاخۆرانی | شیعر | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٨١ | کەلەپووری کوردەواری | عەباس چنارانی | فۆلکلۆر | ٣٠٠٠ | ٢٨٨ |
| ٣٨٢ | تراژیدیای کوردان | وریا ڕەحمانی | ڕاپۆرتی سیاسی | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٣٨٣ | بانگهێشتێك بۆ سەرهەڵدان | ئاشتی فەلەکەدین | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٣٨٤ | لە پێناوی تازەگەریی فیکریدا | نەجات حەمید ئەحمەد | گشتی | ٢٥٠٠ | ٥٤٤ |
| ٣٨٥ | ئاگرپژێن و بوومەلەرزەکان | و: ئەمیرە ئیسماعیل | زانستی | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٣٨٦ | ملحمة سيامند وخجه | مصطفى خۆشناو حمو | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ١١٢ |
| ٣٨٧ | گەشت و گوزار | قادر باوەجان | گشتی | ٥٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٣٨٨ | نامەیەك لە قوبرسەوە | ئازاد کەریمی | کورتە چیرۆك | ١٠٠٠ | ٨٠ |
| ٣٨٩ | چەند لایەنێك ژدیرۆکا ئیسلاما سیاسی | و. جەمال عەبدوڵا | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ٩٦ |
| ٣٩٠ | چالاکییەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری/٢٠٠٨ | ئا: ڕوقیە عەبدوڵا | چالاکی | --- | ١٦٠ |

